نـــاوی کتێـــــب: مێژووی ئەورووپا لە سەردەمی ڕێنسانس تاوەکو شۆڕشی فەرەنسی 1500–1789

نووسیـــنـــــــی: دکتۆر محمد محمد صالح

وەرگـــــــێڕانـــی: ئارام محمد

نـەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)

ســـاڵی چـــــاپ: 2011 ز

ژمـــــارەی سپـــاردن: (1973)ی ساڵی (2010)ی پێدراوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

website:www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com

تەلەفۆن: 2511982 66 (00964)

مۆبایل: 00964 7504064610

# مێژووی ئەوروپا لە سەردەمی ڕێنسانس

## تاوەکو شۆرشی فەرەنسی

## 1789-1500

نووسینی

دکتۆر محمد محمد صالح

وەرگێڕانی

ئارام محمد

پێشکەشە بە:

**باوکی دڵسۆزم، ئەو کەسەی بەو پەڕی توانا هاوکاری کردم.**

دایکم، کەمنی کردە مرۆڤێکی خاوەن ئامانجو پێی وتم:" بۆچی هاتوومەتەژیان... ! "

هەردوو خوشکم شەهلاو شادی کە تایپ کردنی پەرتوکەکەیان خستە ئەستۆی خۆیان.

## پێشەکی وەرگێڕ

دوای سوپاس‌و ستایش کردنی خودا، دەڵێم: بەڕاستی مێژووی ئەوروپا مێژوویەکی پڕ لەڕووداوو گۆڕانکاریە. مێژوویەکە پێویستە هەموو کەسێك کەم تازۆر خۆی لێ شارەزا بکات، چونکە مێژووی ئەوان تەنها بریتی نییە لە گێڕانەوەی جەنگ‌و کارو کردارەکانی پادشاو دەسەڵاتداران، بەڵکو بریتیە لەشرۆڤە کردنی گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگە بەهەموو کایەو لایەنەکانی. بریتیە لەگێڕانەوەی رەوتی گۆڕانە فکری‌و زانستی‌و ئابوری‌و ئاینی‌و فەلسەفی‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکان. وەبێ گوومان مێژووش بریتیە لەم شێوە میتۆدە. بەلاّم بەداخەوە مێژووی ئێمە زۆرزانانە یان نەزانانە کورتکراوەتەوە لە جەنگ‌و فەتح کردنی ولاّتان‌و مردنی دەسەلاّتداران‌و خەلیفەکان، بە شێوەیەك کەخوێنەر وادەزانێ ئێمەی ڕۆژهەلاّتی هەر خەریکی کوشت‌و بڕو هەڵکوتانەسەر یەکتری بووین‌و بەربەریانە ژیانمان گوزەراندووە. ئەمە لەکاتێدا ئێمەی ڕۆژهەلاّتی دەستێکی بالاّو ڕۆڵێکی گرنگمان گێڕاوە لەپێشخستنی کاروانی مرۆڤایەتی لەهەموو ڕووکارەکانی شارستانی‌و چەندان زاناو پیتۆڵ‌و فەیلەسوفمان پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە، بە شێوەیەك کە بەشێ لە پێشکەوتنی ئەوروپا دەگەڕێتەوە بۆ کاریگری شارستانیەتی ئیسلامی لەسەر ئەوروپا. دەخوازم لەخوای گەورەو، دواتر لە خمخۆرانیش دواکارم کەمێژوی ئێمەو خوێندنی مێژووی ئیسلامی لەزانکۆکان گۆڕانی بەسەردابهێنرێت‌و چیدی کورت نەکرێتەوە لە بەسەرهاتی دەسەلاّتداران‌و پەیمان‌و جەنگەکان.

ئەم کتێبەی د: "محمد محمد صالح" یش- باس لەهەموو کایەو گۆڕانە سیاسیو ئابووریو ئاینیو کۆمەڵایەتیەکان دەکاتو بەباشی شرۆڤەیان دەکات، بەشێوەیەك کاتێ باس لەلایەنی ئابووری دەکات خوێنەر وادەزانێ ئەو کاتە خەڵکی ئەورووپا تەنها خەریکی کایەی ئابووری بوون، وە کە دێتە سەرباسی لایەنی زانستی یان ئاینی خوێنەر هەمان تێڕوانینی بۆ دروست دەبێ. هەربۆیە حەزم کرد هەرچۆنێك بێت ئەم کتێبە نایابە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی. ئەوەندەی بۆشم کرابێ هەوڵم داوە بە زمانێکی سادەو ئاسان دایبڕێژمو بەدووری بگرم لە دەستەواژەی نامۆو هەموو جۆرە شێوە داڕشتنێکی ناڕۆشن. بەشێوەیەکیش وەرگێڕدراوە کە هەموو کەسێك دەتوانێ لێی تێبگاو سودی تەواوی لێ ببینێ.

لەکۆتایدا سوپاس بۆ خودای گەورەو دلۆڤان کە توانیم ئەم کتێبە نایابە وەگێڕمە سەر زمانی کوردی. وە دروودو سلاّو بۆگیانی پاکی پێغەمبەری پێشەواو سەروەری مرۆڤایەتی حەزرەتی "محمد" (درودی خوای لەسەر بێ). ئەو پیاوەی کە ڕەوڕەوەی مرۆڤایەتی خستەوە کار!.

ئارام محمد

شەوی (2710\9\9) (2010\11\29) ڕانیـــــە.

## پێشەکی نوسەر

ئەم کتابەی بەردەستت، شرۆڤەی مێژووی ئەورووپا دەکات لەسەردەمی ڕێنیسانس ەوە– تاوەکو شۆڕشی فەڕەنسی. تێیداجەخت لەسەرلایەنی سیاسیو هزری دەکات بەبێ فەرامۆش کردنی باری کۆمەڵایەتیو ئابووری. ئەم کتێبە بەشی یەکەمە لە زنجیرەی مێژووی ئەورووپای نوێ کەمێژووی ئەورووپای نوێی لەساڵی (1870–1914)ی لێ بەرهەم هات.

ئەم زنجیرەیە لەمێژووی ئەورووپا، بەپلەی یەکەم بەرهەمو دەستکەوتی ساڵانێکی خوێندنمە لەزانکۆی شیکاگۆو بیست ساڵی وانەوتنەوەمە لەزانکۆی بەغداد بۆهەمان بابەت. لەڕاستیدا ناگونجێ پسپۆڕی پەیدابکەین لەبابەتێکی وەك مێژووی ئەورووپا، مەگەربەخوێندنمان نەبێت لەزانکۆکانی خۆرئاواو مانەوەمان نەبێت لەکۆمەڵگەی خۆرئاوایی، وە لەنزیکەوە شێوازی بیرکردنەوەو دامو دەزگاو شێوەی ژیانیان نەبینین.

ئەم کتێبە تەواولە ئاستی ڕێبازی خوێندنی مێژووی ئەورووپایە لەسەردەمی ڕێنیسانسەوە تاوەکو شۆڕشی فەڕەنسی کە لە زانکۆی بەغداد دەخوێندرێ، خوێنەرانو ڕۆشنبیران دەتوانن سودی لێ وەرگرن بەمەبەستی شارەزابوونیان لە گەشەسەندنی شارستانیەتی ئەورووپی لە ڕووی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری، لەم ماوەیەی کە کتێبەکەی بۆ تەرخانکراوە.

دکتۆر محمد محمد صاڵح

**سەرەتایەك**

لەکۆتایی سەدەکانی ناوەراست دوو دامو دەزگای سەرەکی لە ئەورووپادا هەبوون وخاوەنی ڕیشەیەکی مێژوویی بوون، ئەمانیش خۆیان دەبینیەوە لە کلێسای کاسۆلیکی کە ناوەندەکەی رۆما بوو، وە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیرۆز. لە نێوانی ئەم دوو دام ودەزگایەدا نەك هیچ هەماهەنگیەك نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە، لەسەدەی یازدەوە لەململا نێیەکی بەردەوام دابوون لەسەر دەسەلآتی دنیایی، کە دواتر سەری کێشا بۆ لاواز بوونی هەردوو لایەنو چەکەرە کردنی دەوڵەتی نەتەوەیی. کلێسای کاسۆلیکیش بەهۆی شۆرشەکەی مارتن لۆسەر لەساڵی (1517) پارچە پارچەبوو و بەهۆیەوە کلێسای نەتەوەیی پرۆتستانتیو کاسۆلیکی سەریهەڵدا.

فکرو ئایدیا کۆنەکانو ئەوسیستەمانەی کە لەسەر ئەم شێوە فکرانە بنیات نرا بوون، بەهاتنی سەدەی شازدە کۆتایەکانیان بەدیار کەوتو بەرەو لێکهەڵوەشانەوە چوون. دەرەبەگایەتی بەرە بەرە لەسەر شانی خەڵکی قورس دەبوو، لە هەرەس هێنانیکی لەسەرخۆ دابوو، سوارەکانیش شان بەشانی رژێمە کۆنەکان بەرەو نەمان وئاواوابوون هەنگاوی دەنا. هەر بەهاتنی ئەم سەدەیە ژیانی شار نشینی بەرە بەرە بایەخی پەیدا دەکرد. لەلایەمی تریشەوە ئەوانەی دەرچووی زانکۆکان بوون لەشوێنە گرنگەکانی دەوڵەت دادەمەزران. ئەمەو جگە لەوەی کەبازرگانیو پیشەسازی گرنگی بێ وێنەیان پەیداکردو بوون بە کۆڵەگەی ئابووری ئەروپاو شوێنی کشتوکاڵیان گرتەوە. کۆیلەی زەوی کۆتایی پێهاتو جوتیارانی ئازاد لە بەشێکی زۆری

ئەورووپای خۆر نشین جێگایان گرتنەوە. هەموو ئەمانە لە کاتێکدا بوو کە حکوماتی نەتەوەیی بە سەرکردایەتی پاشا رەهاکان لە گەشەکردن دابوون. هەروەها هـزری نەتەوایەتی لەناو گەلانی ئەورووپا پەرەی دەسەندو داوای گوێرایەڵی تەواوی بۆ پاشاکان دەکرد، ئەو پاشایانەی توانیان هەرێمەکان یەك خەنو یەکیەتی نیشتیمانی بەدی بێنن.

لەگەڵ ئەوەی ئیمپراتۆریەت لاواز ببوو سیستەمو دام ودەزگاکەی دەچۆوە سەر سەدەکانی ناوەڕاست، وەلێ خەڵكو میرو خانەدانان لەژێرسایەی دامابوونو کەم تازۆر گوێڕایەڵی بوون.

## ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیرۆز:-

ئەم دوو دامەزراوانەی کە لەپێشەوە ئاماژەمان پێدان، دوو دامەزراوەی هەروا لاواز نەبوون لەسەرەتادا، بەڵکو لەسەدەکانی ناوەراست لەوپەری هێزوو گرو تین دابوون. ئەمانە مابوونەوە بۆ سەردەمێکی وەها، کەپڕیبوو لەگۆرانکاری نویۆ تازە. ئەم سەردەمەش خۆی دەبینێتەوە لە سەدەی شازدە کە هەردوکیانی ناچاردەکرد خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەم گۆرانکاریانە. داواکرانی دەسەڵاتی دنیایی هەروەك باسمان کرد لەلایەن پاپاوە، ململا نێکردنی لەگەڵ میرو ئیمپراتۆرەکان لە پێناوی ئەم دەسەڵاتە، خەریك بوو دەسەڵاتی کلێسا بەتەواوی لەناو بەرێ. بەڵام بەهۆی ئەم چاکسازیانەی کە لەنیوەی سەدەی شازدەدا ئەنجام دران کلێسای کاسۆلیکی لەداڕوخانێکی سەراپایی رزگاربوو. هەرچۆنێك بێت کلێسای کاسۆلیکی

خاوەنی دوو خاسیەت بوو کە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لێی بێ بەش بوو. ئەم دوو خاسیەتەش خۆی دەبینیەوە لە: هەبوونی سکرتاریەتێکی هەمیشەیی بۆ کڵێسا، وە هەبوونی ڕێکخستنێکی تۆکمەو فراوان لەسەراپای جیهانی کاسۆلیکی. ئەمە بەشێوەیەك بوو کە ئەگەرخودی پاپا کەسایەتیەکی لاوازوبێ دینیش بووایە، ئەوا ئەورێکخستنو سکرتاریەتیە سەرجەم کاروبارەکانی دەبرد بەڕێوەو فرمانەکانی بەجێ دەهێناو گوێرایەڵی مەلاین مەسیحی بەدەست دەهێنا[1]. وەنەبێ ئیمپراتۆریش خاوەنی هەمان خاسیەت بێت، بەڵکو ئەو بەهۆی ئەو ململا نێیەی کە دەیکرد لەگەڵ پاپاکان، توشی بێ هێزی بوو. هەروەك شکستیشی هێنا لە دەستخستنی فەرمانبەری شوێنکەوتەکانی کە خۆیان دەبینیەوە لە دەرەبەگو میرەکان. ئیمپراتۆریەت پێکدەهات لە ژمارەیەکی زۆر میرنشینو ئوسقوفەو شارە ئازدەکان. لاوازی ئیمپراتۆریەت لەو کاتەدا گەیشتبووە ڕادەیەك، کە ئەگەر ئیمپراتۆرێکی بەتواناش هاتبایە سەرتەخت، زۆر گرانبوو دەسەڵاتی تەواو بسەپێنێ بەسەر تەواوی میرنشینەکان. ئەمەو سەرەرای نەگونجاوی دەستوری ئیمپراتۆری.

ئیمپراتۆرپەرلەمانێکی هەبووپێی دەگوترا (دایت). ئەم پەرلەمانە پێکدەهات لە میرە سەرەکیەکانی ئەڵمانیا. وەلێ ئەندامانی دایت تەنانەت پابەند نەدەبوون بەو بڕیارانەی کەدەریان دەکرد. لەمەشدا ناهەقیان نەبوو، کاتێك دەبینین هیچ شتێکی وانەبوو ناچاریان بکات بڕیارەکان جێبەجێ بکەن. ئەمە وای کرد ئیمپراتۆر پشت بە خەتی تایبەتی خۆی ببەستێ لەناو

---

1 H.H. Green ،the Renaissance and reformation ،(Arnold 1977) ،pp. 100-102 ،ff.

دایـت. ئـەو دایتــەی کەئێمــە باســی لێــوە دەکــەین بریتــی بــوو لــە حــەوت هەڵبژێردراوەکــەو مــیری هەرێمــەکانو شــارەکانی ئیمپراتــۆر کــە لــە دوای ساڵی(1449) هاتنە ناوی. لەناو ئەم سێ چینەش حـەوت هەڵبژێردراوەکـە گرنگترینیان بوون، بەهۆی ئەوەی بەرپرس بـوون لـە هەڵبـژاردنی ئیمپراتـۆر. ئەمەش بە پێی فـەرمان (مەرسـوم)ی سـاڵی (1356ز). ئـەم هەڵبژێردراوانـە گوزارشت بوون لە (سەرکردەکانی ئوسقوفەی مینز، تریر، کولۆن) هەروەها ( میری هەرێمی پلانتینات لەسـەر رایـن)، (مـیری هـەیمی سەکسۆنیا)، (مـیری هـەرێمی براندن بـرنگ )، ( پادشـای بوهیمیـا). بـەلآم پادشـای بۆهیمیـا بـە بێگانە دادەندراو لەبەڕێوەچوونی گفتوگۆکان بەژدارنەبوو.

دایت هیچ کاتێ نەیدەتوانێ یارمەتی ئیمپراتۆر بدات بەخەرجیەکی تـەواو، یان بە سوپایەکی ڕێك وپێك، یاخود دەسەلآتێکی جێبەجێ کردنـی وەهـا کـە بەڕێوەبەرایەتیەت بگرێتە ئەستۆی خۆی . جا کاتێ ئیمپراتۆر نەیتوانی خۆی بگونجێنی لەگەڵ ئـەم گۆرانکاریانـەی کـەتازە بـوونو داوای بەرقـەرار بـوونی دەوڵەتێکی نەتەوەییان دەکرد. ئیمپراتۆریەت وەك دامەزراوەیەکی کۆنو بـێ هێزمایەوە.

مێژوو نوسان بیروڕای خۆیان دەربریـوە لـەبارەی ئیمپراتۆریـەت. ئـەوەتا لەبارەی لەناو چوونو کۆتایی هاتنی، چەند بیروریـەکیان هەیـە. هەنـدییێکیان دەڵـێن: کۆتــایی ســەدەی یــازدە ســەرەتای پەشـێویو داروخـان بـوو بـۆ ئیمپراتۆریەت. ئەمەش بە هۆی ململانێکردنی ئیمپراتۆر لەگەڵ پاپاکانو ئـەم ڕۆڵە خراپەی کە میرو خانەدانەکان بینیان لە لاوازکردنی ئیمپراتـۆرو بەسـتنی

هاوپەیمانیەت لەگەڵ پاپاکان. بەڵام هەندێکی تر وادەزانن، هۆکارەکانی لاواز بوونی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەت زۆر لە پێش سەدەی یازدەوە دەرکەوتووە. وەلێ لەراستیدا داروخانی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەت دە گەریتەوە بۆ ناوەراستی سەدەی سێزدە. ئەمەش دوابەدوای مردنی (فردریك) لەساڵی (1250).

فردریك بەوەناسرابوو کەحەزی بە ئەلمانیا نەدەهات، بەهۆی ئەوەی شەوەکانی تاریك بوو،زستانی درێژ بوو،ڕێگاکانی قورین بوون، بەرێوەبردنی گران بوو، دارستانەکانی چربوون. هەربۆیە ئەڵمانیای بەجێ هێشت بۆمیرەکان. خۆیشی زۆربەی ژیانی فەرمانڕەوایەتی خۆی لە ئیتاڵیا بردە سەر، بەهۆی ئەوەی زستانی سەخت نەبوو، سەروتو سامانی زۆربوو بەڕێوەبردنی سانابوو. ئەمجا فردریك چەندین بەربژار(ئیمتیازات)ی بەخشی بە میرەکانی ئەڵمانیا. لەوانە توانای ئەوەی پێدان کە دەسەلات بنوێنن بەسەر دادگادا، هەروەها مافی دەرکردنی دراوی پێدان، ئەمەو جگە لەوەی کە لە لایەن خودی خۆیەوە پشتگیری دەکردن بۆ دژایەتی شارنشینەکان، ئەوانەی کە هاوپەیمانی پاشایەتی بوون. بەڵام وەنەبێ فردریك توانیبێتی لەم سیاسەتەی سەرکەوتوبووبێ، بەڵکو هەر لەلایەن کورەکەی خۆیەوە دژایەتی دەکرا، بەهۆی ئەم سیاسەتەی کە بەکاری هێنابوو لەدژی ئەڵمانیا. جا لەبەر ئەوەی کورەکەی(هینری) شارەزاتر بوو بە کاروباری ئەڵمانیا بۆیە کەوتە دژایەتی کردنی باوکی. هەر بۆیە فردریك هەستا بە دەستگیر کردنی کورەکەی‌و بەندی کرد.

لـەپاش مردنـی "فردریـك" بـەهۆی بیـانی بوونیـان هـیچ یـەكێك لـەو ئیمپراتۆرانەی كەهەڵبژێردران نەیانتوانی قاچەكانیان لەسـەر ئـەرزی ئـەڵمانیا بچەسپێنن. ئەمەش وای كرد بۆ مـاوەی بیـست سـاڵ پەشـێوی‌و ئاڵۆسـكاوی ئەڵمانیا بگرێتەوە بەبێ هیچ سەرۆك وفەرمانڕەوایەك[1].

دوابەدوای ئەم پەشێویە ناهـەموارە كـە سـەراپای ئـەڵمانیای گـرت بـۆوە، میرەكانی ئەڵمانیا لەساڵی (1273) یەكێكیان لەنێوان خۆیان هەڵبژارد. ئـەم كەسە هەڵبژێردراوەش "رودولف هبسبرگ" بوو كـە لەسـەرجەم میرەكـان بـە هێزتـرو دۆڵەمەنـد تـر بـوو، هـەر ئەمـەش وای كـرد هەڵیببـژێرن بۆپۆسـتی ئیمپراتۆری. "رودولف" خـاوەنی بەشـێك لـە ئـەلازاس‌و بەرزایـەكانی روبـاری رایـن بـوو لەسویـسرا. بـەڵام "رودولـف" لەگـەڵ ئـەوەی خـاوەنی ئـەو هێـزو دەسەلاَت‌و سامانە بوو، وەلێ هەر نەشیتوانی سیاسـەتەكانی خـۆی جێبـەجێ بكات لە سەراپای ئیمپراتۆریەتەكەیدا. لەبەر ئەمە تەنها گرنگی بـە كاروبـاری ناوچەكانی خۆی دا.

"ڕودولف" توانی نەمسا دەسـت خـۆی بخـات‌و هـەرێمی سـتریای تـاوەكو خواروی خۆرهەلاَتی خستە ژێر دەستی خۆی. ئەم فراوان بوونەی ناوچـەكانی رودولف، بە ئاراستەی باشورو باشوری رۆژهەڵات بـوو لـە ئـەڵمانیا.سیاسـەتە فراوانخوازیـەكانی "رۆدۆلـف" بەئاراسـتەی خۆرهـەڵات لەسـەر بـەهێزكردنی پەیوەندیەكانی وەستا بوو لەگەڵ فەرەنسادا، چونكە بەرژەوەنـدی فەرەنـسا لەگەڵ ئیمپراتۆریەت تێكدەگیرا لـە سـەر سـنوری نێوانیـان . ئەمـە لەلایـەك،

---

1 daniel waley- ،later medieval Europe (long man 1968).pp. 75-76، ff

لەلایەکی ترەوە ململانێی توندی ئینگلیزو فەرەنسا لە جەنگی سەد ساڵە، دابەشبوونی ئەڵمانیا ی زیاتر کرد، چونکە هەردوو لایەنی بەشەر هاتووپشتیان دەبەست بە هێزەسەربازیەکان لە ئەڵمانیاو زەویە نزمەکان وراین. فەرەنساش فراوانخوازیەکانی لەسەر حیسابی ئەڵمانیابوو لە ناوچەکانی "لۆرین،برانگدیا،لیۆنی"[1].

ئەم فراوانخوازیانەی "رودۆلفی هبسبرگ" میرەکانی هێنابووە ترس‌و لەرز. لەبەر ئەمە کاتێك "رودولف" لەساڵی(1291)مرد، میرەکان کورەکەیان هەڵنەبژارد بە ئیمپراتۆر. هەر زووش لەنێوان "ئۆدۆلف ئۆف ناسا" کە بەئیمپراتۆر هەڵبێردرابوو لەگەڵ "ئێلبرت هبسبرگ" ململانێی توند دروست بوو. کێشەکەیان هەر بەردەوام بوو تا بەکوژرانی "ئۆدۆلف ئۆف ناسا" کۆتایی هات کە هەر بەدەستی رکابەرەکەی کوژرا لەساڵی(1298). لەدوای ئەمە "ئێلبرت هبسبرگ" خۆی خزاندە جەنگێك لە دژی بنەماڵەی پاشایەتی لە بۆیهیمیا.

لەساڵی (1308) "هنری لۆکسەمبۆرك" بەناوی هنری حەوتەم وەك ئیمپراتۆر خۆی هەڵبژارد. بەرزبونەوەی بنەماڵەیەکی سادەی وەك لۆکسمبۆرك، وایکرد هنری پشت بە میرەکان ببەستێ بۆ دەستهێنانی لایەنگیریان. هەروەها "هنری" دانی نا بە مولکەکانی بنەماڵەی هبسبرگ لە نەمساو ستریاو، توانی تەختی بۆیهیمیاو مۆراڤیا لە ڕێگەی هاوسەرگیریەوە دەستخات بۆ کورەکەی "جۆن" لە ساڵی(1313). هەر لە ماوەی

---

1 ibid;pp.78-79

دەسەڵاتیدا هنری چەند شالاۆێکی کردە سەر ئیتاڵیا بەڵام لە هەمویان بەشی شکستخواردن بوو، سەرەڕای بانگەشەکانی دانتی بۆ دەستگرتن بەسەریدا.

کاتێك "هنری" حەوتەم لەساڵی (1313) مرد، دیسان ململانیێ بوو بە بەشی ئیمپراتۆریەت. ئەمجارەیان کێبرکیێ کەوتە نێوان دوو پاڵێوراوی ئیمپراتۆری کە هەریەکەیان مزی خۆی خۆش دەکرد بۆ وەرگرتنی ئیمپراتۆریەت. ئەم دوانەش "فردریکی هبسبرگ و، لۆیس ئۆف پاڤیریا" بوون.لەو ململانییەشیاندا هیچ دەرەنجامێکی یەکلا کەرەوەی لێنەکەوتەوە سەرەڕای سەرکەوتنی لۆیس بەسەر فریدریك دا لەساڵی (1322). کاتێك "پاپا "جۆنی بیست ودووەم" هاتە سەر تەخت، خۆی وەك ئیمپراتۆرێك چەسپاند بەسەر ئیتالیادا. پاپا "جۆن" هەوڵی دا ئیمپراتۆرێکی لایەنگری فەرەنسا لە بنە ماڵەی هبسبرك بخاتە سەر تەختی ئیمپڕتۆری. لەلایەکی تریشەوە فەرمانی بێبەری کردن(حیرمان) ی لە دژی لۆیسی پاڤاری دەرکرد. هەربۆیە لۆیس وەك کاردانەوەیەك لە بەرامبەر پاپا لەساڵی (1325)رایگەیاند کە رکابەری خۆی بەژداری پێدەکا لە ئیمپراتۆریەتەکەیدا.جا کاتیێ فردریك مرد، لۆیسی پاڤاری بۆ باکوری ئیتالیا شالاۆی بردو شەش ساڵ تێیدا مایەوە. لۆیس بەمەبەستی هێنانەوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەت روی نەکردە ئیتالیا، بەڵکو بۆ کۆکردنەوەی ماڵو سامان لە سەردارانی شارەکانو میری هەرێمەکان رووی تێکرد. ئەمجا لویس ئەمەشی بۆ چووە سەرو توانی پاپایەکی تازەو لایەنگری ئیمپڕاتۆربخاتەسەر کار، هەروەها توانیشی (ترویل و،برانەبرگ و،مارج) بخاتە ژێر دەستی خۆی،

ئەمجا لەڕێگەی هاوسەرگیریەوەتوانی(هۆلاَندو، زیلانداو، فریزلاندو،هینول) بەدەستبێنێ[1].

لویسپاڤاری ئەوکەسە نەبوو کەبتوانێ ئیمپراتۆریەتەکەی زیندوویکاتەوە کە دەمێك بوو لاوازو بێ هێزمابۆوە، ئەم لاوازیەی دوابەدوای مردنی فردریکی دووەم بەدیارکەوت لە ساڵی(1250). هەروەك لەپێشتر ئامەژەمان پێدا کە ئیمراتۆرەکانی پاش فریدریك کەم توانا بوونو دەسەلاَتیان لەدەستی خۆیان دەرچوبووو کەوتبووە دەستی میرەکان. میرەکانیش ئیمپڕاتۆریان هەڵدەبژارد بە بێ ئەوەی پێویستی بە رازی بونی پاپا هەبێت. لە ساڵی(1346) میرەکان "چارلسی کوڕی جۆن"یان هەڵبژارد بە ئیمپراتۆر، کە نەوەی هنری حەوتەم بوو، بەو مەبەستەی جێگەی لۆیسی پاڤاری بگرێتەوە. گرنگی چارلس لەوەدابوو کەلەساڵی (1356) هەستا بەدەرکردنی فەرمانی زێرینی ئیمپزاتوری، کە تیایدا جەختی دەکردەوە لەسەر بەربژاری میرەکانو هەڵبژاردنی ئیمپراتور لەلایەن حەوت دەنگدەرەکە. هەروەها ڕێگە گرتن لە میرەکان بەوەی زەویەکانیان دابەشبکەن. بەلاَم چونکە ئیمپراتۆریەتیش لاوازببوو، هەرچەند هەوڵیشیان بۆ خستە گەڕ، بەلاَم هەوڵەکان بە مردوویی لەدایك دەبوون. ئەو فەرمانەش ئەوەندەی تر سەربەخۆی میرەکانی زیاتر کردو دەسەلاَتی ئیمپراتۆریشی لاواز کرد، بەشێوەیەك کە بووە هۆی ڕەخسانی دەسەلاَتی بەرفراوانی میرەکان لەناو هەرێمەکانیانو واشیان لێکدەدایەوە کە نەیا ری کرانیان خراپەو ناپەکیەکی

---

Ibid;p.80 1

زەبەلاحە دەرهەقیان. جگەلە ڕێگەگرتنیان لەهەر جۆرە دوبارە کردنەوەی سکالاّیەك لەدادگای خۆیانەوە بۆ دادگای ئیمپراتۆری [1].

مێژووی ئەڵمانیا لە دوای ئەم فەرمانە گوزارشت بوو لە مێژووی هەرێمەکانی ئەڵمانیا. لەساڵی (1378)چارلس گیانی سپارد. لەدوای ئەو چەند ئیمپراتۆرێکی لاواز جێگایان گرتەوە، کە یەکێکیان کوڕەکەی خۆی بوو کەتا ساڵی(1400) لە سەر دەسەلاّت مایەوە، هەروەها (ڕوپرت) یەکێ بوو لە ئیمپراتۆرە لاوازەکانو فەرمانڕەوای ناوچەکانی ڕاین بوو، تەنانەت لە دوای بوون بە ئیمپراتۆریشی نەیتوانی لەدەرەوەی ناوچەکانی خۆی فەرمانڕەوایەتی بکات.

ئەم بارە بەم شێوە ڕۆیشت تا لەساڵی (1410) میرەکان هەستان بە هەڵبژاردنی "سیگسمۆنت". ئەم بەسوار چاکێکی ئازا ناسرابوو. فەرمانڕوایەتەکەی "سیگسمۆنت" بیستو حەوت ساڵ درێژەی کێشا، واتا هەتا ساڵی (1437). لە کاتی ئیمپراتۆریەتەکەیدا شۆڕشی "جۆن هس" لە ئارادا بوو، هەر بۆیە زۆربەی کاتەکانی خۆی بە کپ کردنەوەی ئەم شۆڕشە بردە سەر. سیگسمۆنت جەختی لەسەر بەردەوامی دانیشتنەکانی کۆنگرەی کۆنستانس دەکردەوە. وە هەستا بە بەخشینی هەرێمی براندنبرگ بە "فردریك"ی میری نۆرمبرگ، کە هۆکارێك بوو بۆ سەرهەڵدانیبنەماڵەی

---

Ibid;p.81. 1

هـوهنزل*. لـەم سەروبەندانەشـدا سویـسڕاشێوەیەك لەدەسـەلاتی خـۆجێی دەستكەوت. سیگسمۆنت هەرچەندە ئەوەندە كەسێكی سیاسی نەبوو، بـەڵام ئەوەندە شارەزییە سیاسیەی كە هەیبوو بـەكاری هێنـا بـۆ دابەشـكردن‌و درز خـستنە نێـوان شـارەكانی ئـەڵمانیا. جـا كـاتێ مـرد، مێـردی كـچەكەی تـا ساڵی(1439) جێگەی گرتەوە، كە ناوی (ئەلبرت اوف ستریا)بـوو. لـە سـاڵی پاش ئەم مێژووە "فردریكی هبسبرگ" بە ناوی "فردریكی سێیەم" هاتەسـەر تەخت وتا سـاڵی (1493)مایـەوە.ئیمپراتۆریـەتی پـیرۆز لـە سـەردەمی ئـەم فریدریكـەدا زۆر لـە ناوچـەكانی لـە دەسـتدا.پۆڵنـدا، پروسـیای سـتاندەوە، هەنگاریا ناوچەكانی سیلسزیاو مۆرڤیای خستە دەستی خۆی، لەم نێوانەشـدا چارلسی چاپوك كە میری بۆرگەندیا بوو دەستی گرت بەسەر زەویـەكی زۆری ئیمپراتـۆرو خـستیە پـاڵ مـیر نـشینەكەی. سویـسڕاش كـە لەپێـشدا شـێوە سـەربەخۆیەكی هـەبوو، ئـەم جـارە سـەربەخۆی تـەواوی كەوتـە دەسـت. دانیماركیش دەستی بەسەر هۆڵشتاین داگرت. ئەڵمانیا لەسەردەمی فردریكـی سێیەمدا بارودۆخی تەواو تێكچووبوو، سكالآی خـەڵكی تونـدببوو لـە هەمبـەر ئەو باجە ناڕەوایانەی كە كلێسا وەریدەگرت‌و دەینارد بۆ پاپا. هەموو ئەمانـە

* ئەم بنەماڵەیە دواتر بەشێوەیەك بـەهێزدەبن، كـە لـەدواتردا براندنبرگ دەكـەن بەمیرنـشینێكی گـەورە بـەناوی پروسـیاو هەرئـەم پروسـیایەش دواتـر بووبـە بـەردی بناغـەی ئـەڵمانیای یـەكگرتو لەسـەردەمی بسماركو، یـەكێ لەكەسـەكانی ئـەم بنەماڵەیـە بـەناوی ئیمپرتـۆری ئـەڵمانی تـاوەكو تێكشكانی ئەڵمانیا لەكۆتایی جەنگی جیهانی یەكەم لەسەر دەسەلآت بوو، دوابەدوای ئەمە كۆتـایی بەدەسەلآتداری ئەم بنەماڵەیە هات. (وەرگێڕ)

لـەكاتی هـەبونی ئیمپراتـۆرێكی هەڵبـژێردراو دانپیـداهێنراو دابـوو، بـەڵام ئیمپراتۆرێكی بێ دەسەلات ولاوازو بێ سـەروەتو سامان. ئەمانەش بەهۆی ئەوەوە بوو كە میرەكانو شارنشینەكان ئەو ئەركانەیان جێ بـەجێ نـەدەكرد كـە لەسەرشـانیان بـوو، بۆیـە ئیمپراتـۆر بـێ داهـاتو سـەرمایە مایـەوە. جـا هەروەك وتمان جەنگو دووبەرەكی رووی لەزیادی كرد، چونكە هەموو كەسێ دەیویـست خـۆی فـەرمانڕەواو رەتكـەروە بێـت. ئـا لـەم كـاتو ساتەشـدا حكومەتێ نەبوو بتوانێ هێمنیو ئاسایش برقەراركات. هـەر بۆیـە ئـەم شـێوە بارودۆخە هەموجۆرە چاكسازیەكی زیندە بەچاڵدەكرد.

بەم شێوەیە حوكمی فردریك درێژبوویـەوەو بـووە هـۆی هـەرەس هێنـانی ئیمپراتۆری رۆمـای پـیرۆز. فردریـك خۆیشی خـەریك بـوو لەناوبـچێت، كـاتێ (ماسیوكورفیس)ی پاشای هەنگاریا لە ساڵی (1485) بەسەریدا سـەركەوتو هاتە ناو (ڤیەننا)، بەڵام بەخت یاوەری فردریكی كرد كاتێـك نەیارەكـەی كـت وپڕ گیانی لەدەستدا[1].

لەگەڵ هـەموو ئـەم بـارە سیاسیە شـڵەژاوەی كـە ئـەڵمانیا پیـادا تێپـەڕی دەكـرد. وەلێ لـەم كاتـەدا ئـەڵمانیا یـاوەری سـەردەمێكی پـڕ لـە گۆڕنكـاری وپەرەسەندنی دەكرد. سـەرهەڵدانی هەسـتی نەتـەوەیی ئـەڵمانی ، كـە لـەناو چـینی سـوارەكانو خـەڵكانی خوێنـدەوارو شارنـشینەكان چـەكەرەی دەكرد،لەملاشـەوە پەیـدابونی بازرگـانی لـە نێـوان شـارە ئەڵمانیـەكانو وەبەرهێنانی سامانو گەشەكردنی كارخانەكانی باشوری ئەڵمانیا، بووە هـۆی

1 Ibid;p.84،ff.

خەملێنی ئابووری‌و گەشەپێدانی سامان‌و داهاتی هەندێ شارەکانی ئەڵمانیای وەك: (فرانکفۆرت،ئۆکسبرك،لوبیك،بریمەن) هەر ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوونی ئیمپڕاتۆریەتی ئەڵمانی لەسەدەی داهاتوودا.

لەوانەیە گەشەکردنی ئابووری گرنگترین ڕووداو بێت کە ئەڵمانیای گرتەوە لەو کاتەدا. بەرز بوونەوەی نرخەکان لەپێش هێنانی زێڕ وزیو لە ئەمریکا، هۆکارێك بوو بۆ سەرهەڵدانی پەشێوی لەناو شارەکان، دەرەنجامەکەیشی ئەو دووبەرەکیە بوو کە لەنێوان دەوڵەمەندان وهەژاران کەوتەوە. لەلادێکانیش بارودۆخی جوتیاران باشتر بوو بەبەراورد لەگەڵ بارودۆخی خاوەن زەویەکان (دەرەبەگ). چونکە خاوەن زەویەکان لەڕووی ماددیەوە باریان کەوتبوە لێژی بەهۆی بەرزبونەوەی نرخەکان ونزم بوونەوەی ڕەنیوهانینی کشتوکاڵ. لەبەر ئەوە ویستیان باج‌و سەرانەی زێتر بسەپێنن بەسەر جوتیاران بەمەبەستی چاککردنی حاڵیان کە دەمێك بوو لە ڕوویماڵیەوە کزی تێکەوتبوو. بەڵام ئەوەی کە میروو دەرەبەگەکان دەیانتوانی بیکەن بۆچاککردنی حاڵی شەپرێوی خۆیان ئیمپراتور نەیدەتوانی بیکات.

ئەم تێماوی‌و هەژاریەی کە دەمێك بوو بەرۆکی ئیمپراتۆری گرتبوو هەندێ لە ئەڵمانەکان پێی ئاگادار بون. جا لەبەر ئەم حاڵەی ئیمپرتۆر هەندێ خەڵکی پێشنیاری چاککردنی دەستوری ئیمپراتۆریان کرد. ناودار ترینی ئەوانەی کە ئەم دەهۆڵیان دەکووتا(بروتولدهنبرگ)ی سەرۆکی ئوسقوفەی مینز بوو. هەرچەندە لە نیشتیمانپەروەری پرۆتولد گومان هەبوو، بەلاَم ئەو باوەڕی وابوو کە پێویستە حکومەت بەهێزو کارا بێت، لەمەشدا جگە لەمیری

پاڤاریا گشت میرەکانی تر پشتگیریان کرد. لە دایتی ئەڵمانی کە لە ساڵی (1485) کۆبوونەوەی لە فرانکفۆرت گرێدا، پرتوڵد جەختی کردەوە لەسەر یەکێتی دراوی ئەڵمانیو نەهێشتنی جەنگ لەنێوان هەرێمەکانی ئەڵمانیاو دامەزراندنی دادگایەکی باڵا بۆ شەڕفرۆشە گەورەکان، ئەوانەی کەناگونجێ دادگایی بکرێن لە دادگایەکی ئاسایی.بەڵام فردریک ی سێهەم خۆی بە بەرپرس نەزانی چاو بخشێنێ بەو چاکسازییانەو پشتگوێی خستن.

## ئەڵمانیا لەسەردەمی ئیمپراتۆر ماکسیمیلیان:ـ

بارودۆخ گۆرانکاری بەسەر داهات کاتێ ئیمپراتۆر ماکسیملیانی یەکەم لەساڵی 1493هاتە سەر تەخت. ئیمپراتۆری تازە زیرەکو چالاکو کارا بوو تاساڵی مردنی لە 1519لەسەرتەخت مایەوە. بەڵام وەك ئیمپڕاتۆرەکانی پێش خۆی بودجەی بەدەستەوە نەبوو تاوەکو بتوانێ ئامانجەکانی بەدیبێنێ. لەسەردەمی ماکسیمیلیانیشداپرۆتۆلدو یارانی هەستان بەپێشکەش کردنەوەی ئەو پرۆژەی کەداوای چاکسازی دەکردو فردریك ڕەتی کردبویەوە، کەتیایدا داوای دامەزراندنی ئەنجومەنی ڕاسپاردنی دەکرد، کەیەکێ لەکارەکانی دیاریکردنی سیاسەتی ئیمپراتۆرەو پابەند کردنی دەسەلاتی ئیمپراتۆر وخانەدانانە بەسەقامگیری ئەڵمانیا، هەروەها نەهێشتنی پەنابردنە بەر جەنگ لەناوخۆی وڵات بەمەبەستی پاراستنی ئاشتیو هێمنی. ئیمپراتۆر بەرامبەر ئەم بڕیارە بێ وەڵام نەبوو، بەڵکو چەند مەرجێکی پێشنیار کرد. لەوانە:ـ دامەزراندنی سوپایەکی ڕێکوپێك و هەمیشەیی بۆ ئیمپراتۆر، چاکسازی کردن لە داهات وخەرجیو ڕزگارکردنی لەکۆت وبەندی

میرو دەرەبەگەکان، ئەمەش بۆ بەردەوامی دان بە سوپا. بەڵام ئەوانەی داوای چاکسازیان دەکرد ترسان لەوەی کە ئەگەربێتو پێشنیارەکانی ماکسیملیان جێ بەجێبکەن، ئیمپراتۆر بەشێوەیەك بەهێز ببێ و وای لێبێت زۆر بەئاسانی خۆی ببوێرێ لەهەموو ئەو مەرجانەی کە بەسەریا دەسەپێنرێ. لەڕاستیداوە ئەوەی گومانیان بۆی چوبوو ڕاست دەرچوو. ئیمپراتۆر ئەمەی مەبەست بوو. لەبەرئەوە بڕیاریاندا بودجەو سوپا لەژێردەستی "دایت" یاخود لەژێرچاودێری ئەنجومەنی ڕاسپاردن دابێت.

هەردوو لایەن ئارەزوویان دەکرد کەحکومەتێکی ناوەندی بەهێز دابمەزرێنن، بەڵام پرۆتۆلد ومیرەکان دەیانویست خۆیان زاڵبن بەسەردەسەڵاتی باڵا. ئەوان زۆر بەگومان بوون لەمافی بنەماڵەی هاسبرگ، ئەو بنەماڵەیەی کە هەموو گرنگیدانێکی خستبووە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە نەمسا، هەروەها ئەو جەنگە بێ ئەنجامانەی کە لە ئیتالیا ئەنجامی دەدا، بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا، کەهیچ کات بۆ ئەڵمانیا سودێکی نەبوو. لەبەرئەوە ویستیان فراوان خوازییەکانی ماکسیملیان نەهێڵن، بەوەی کە ڕێگری بکەن لەماکسیمیلیان، سوپا بەبێ ڕەزامەندی ئەوان بۆ هیچ کارێ بەکار بهێنێ. لەبەرامبەر ئەمەدا ئیمپراتۆر وەڵامی دانەوەو ڕایگەیاند:" کە ئەو زۆر حەز بە یەککگرتنی ئەڵمانیا دەکات، چونکە گرنگترین شتێکە کە بەهۆیەوە ئیمپراتۆریەتەکەی دەپارێزێ لە دوژمنانی لە ناویشیاندا فەڕنسیو تورکەکان". هەروەها ئەوەشی ڕون کردەوە کە"ئەو لە دەسەڵات دانابەزێ بۆ میرەکان، ئەو میرانەی نیشتیمان

پـەروەرنین‌و هـەموو خـەمێکیان چەسـپاندنی دەسـەلاَتیانە بەسـەر ئـەو هەرێمانەی کە فەرمانڕەوایی دەکەن‌و هـەموو هـەوڵیان بریتیـە لـە پارێزگاری کردن لە سەربەخۆیی خۆیان".

هەردوو لایەن هەوڵیاندەداو ئارەزوو یـان دەکـرد بگـەن بەچارەسـەرێك بـۆ ئەو پرسەگرنگانەی کـە لـە سـاڵی (1495) لەشـاری "ورمـز" لەکۆبونـەوەی "دایت" پێشکەشیان کـرد، بـەلاَم دەرەنجامەکـەی ئـەوە بـوو کـە ئیمپراتـۆر کۆنگرەکەی جێهێشت‌و ڕۆیشت بۆ ئەو شـەڕەی کـە لـە ئیتالیـا بـە مەبەسـتی وەچنگ کەوتنی داهات هەڵگیرساندبوو. ئا ئەمە بارودۆخی کۆبونەوەکان بوو کەزۆربەیان بەمردوویی لەدایك دەبوون. کۆنگرە وەنەبێ بەڕۆیشتنی ئیمپراتـۆر دەستەوەستان بێت‌و داهێـزێ، بـەڵکو هەسـتا بـە دامەزرانـدنی دادگـای بـالاَو بڕیاری پاراستنی ئاشتی هەمیشەیی دا بۆئەڵمانیا. هەروەها بڕیاریدا ڕێگـە لـە هێرشی میرەکان بگرێ بۆ سەر یەکتری، لە هەمان کاتدا بڕیاریانـدا کـە سـوپا تایبەتیەکانی خۆیان تەسریح* بکەن. وەلێ کاتێ ئیمپراتۆر ڕەزامەندی نەنواند بۆ دامەزراندنی ئەنجومـەنی ڕاسپاردن، کـە دەسـەلاَتی ئیمپراتۆریـەتی کـۆت دەکـرد، کـۆنگرە شکـستی خـوارد. لەبەرئـەوە "دایـت" ڕەزامەنـدی نەنوانـد لەسەر سەپاندنی باجی تایبـەت بـۆ گەنجینـەی ئیمپراتـۆر. بـەلاَم هەرچـۆنێك بێـت بڕیـاردرا سـالاَنە کۆببنـەوە بەمەبەسـتی پێـشکەش کردنـی ڕاپۆرتـە

*تـسریح ئەگـەر بـۆ سـوپا بـەکاربێ ئـەوا مەبەسـت لێـی ناردنـەوەی سـوپایە، بـەلاَم دەسـتی لێ هەڵناگیرێ. واتا سوپا هەڵناوەشێتەوەو هەردەمێنێ. ( وەرگێڕ)

سیاسیەکانیان، ئەوەی کە ئیمپراتۆر بەڵێنی دابوو جێ بەجێیان نەکات بەبێ ڕەزامەندی ئەوان[1].

ئەو باجەی بڕیاربوو بسەپێنرێ، لەناو خەڵکیدا دەنگی دایەوە. سویسریەکان یەکەم کەس بوون کە نارەزایی خۆیان نیشاندا دژی ئەم باجەو وایان گوزارشت کرد کە ئەمە هەڕەشەیەکە بۆ سەربەخۆییان. هەرێمە بچوکە سویسریەکان کە بریتیبوون لە (یوری ، شوایز ، وانتروالدن)، لە سالی (1291) ەوە هەستابوون بەپێکهێنانی یەکیەتی فیدراڵی‌و دواتر هەندێ هەرێمی تریشی چووە پاڵ. ئەمانە زۆر نیگەران بوون لە هەوڵەکانی بنەماڵەی هابسبرگ، بەوەی کە دووبارە وڵاتیان بچێتەوە ژێر چنگی ئەم بنەماڵەیە. لەم نێوانەدا سویسرا لەهەموویان نیگەرانتر بوو، چونکە نوێنەری نەبوو لە "دایت". بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا توانیان چەند سەرکەوتنێك بەدەست بێنن لەجەنگەکانیان دژی ماکسیملیان‌و ناچاریانکرد دان بنێ بەسەربەخۆییان بەپێی ڕێککەوتننامەی (بال) لەسالی (1499).

لەگەڵ ئەوەی ئیمپراتۆر نەیتوانی ئەو ماڵەی کە پێویستی بوو لە"دایت" بە دەستی بخات، بەڵام هەر چۆنێك بێت سەرکەوتوو بوو لە پێکبەستنی موڵکەکانی بنەماڵەی هابسبرگ‌و لە یەك گرێ دانی هەرێمە جیاوازەکان هەتاوەکو ساڵی(1918)، هەروەها دامەزراندنی بەڕیو بەرایەتیەکی کارا لەنەمسای سەروو خواروودا هەم دیس لە کارەکانی ماکسیمیلیان بوو. ئەو هاوسەرگیریەی کە لەساڵی (1477) لەگەڵ "ماری کچی چارلسی چاپوك"

---

op. cit; pp. 102-108،Green 1

میری بۆرگەندیا ئەنجامی دابوو، هۆکارێك بوو بۆئەوەی کە شازدە هەرێمی دەوڵەمەند بخاتە پاڵ موڵکەکانی کە هۆڵنداو بەلجیکا دوو لەو هەرێمانە بوون. ماکسیمیلیان بۆ "فلیپ وەیسەم"ی کوڕی "جوانای کچی فرِدینانـدو ئیزابێلا"ی خواست، بەمەش توانی تەختی ئیسپانیاو سەرجەم موڵکەکانی کەنار دەریا بخاتە دەست خۆی. ئیتر لێرەوە موڵکەکانی هابسبرگ خەریك بوو چوار لای فەڕەنسا گەمارۆ بدات، بەمەش دوژمنایەتیەکی مێژووی لەنێوان بنەماڵەی پاشایی فەڕەنساو ئیمپڕاتۆریەتی هابسبرگ دروست بوو.

ئەگەر بە چاوێکی ئاسایی بڕوانین، دەبینین کە دەسکەوتەکانی ماکسیمیلیان کەمن، چونکە هەست دەکەین شکستی هێنا لە چاکسازیو نەیتوانی ئەو ماڵو سوپایەی گەرەکی بوو بە دەستی بهێنێ کە بۆ بەهێز کردنی ئیمپڕتۆریەکەی زۆر پێویست بوو. هەروەها یەکیەتی ئەڵمانیاشی بۆ نەهاتە دی، ئەمەو جگە لەو جەنگانەی لەئیتاڵیا هەڵگیرساندبوو کە جگە لە تێکشکان چیتر بەشی نەبوو. بەمەش فەڕەنسا ڕێگەی بۆ خۆش بوو خۆی بسەپێنێ بەسەر ئیتاڵیادا. بەڵام ئەگەر لەڕووی کردەییەوە سەیربکەین، دەبینین دەسکەوتەکانی کەم نین، کاتێ توانیویەتی موڵکی بنەماڵەی هابسبرگ فراوان بکات بەشێوەیەك کە هەموو زەویەنزمەکانو ئیسپانیا بگرێتەوە، هەروەها پێکبەستن دروست بکات لەنێوان موڵکەکانی بنەماڵەی هابسبرگ. وەلێ لە ڕووی سیاسیەوە ئیمپراتۆر نەیتوانی خۆی بگونجێنێ لەگەڵ ئەو تازەگەریانەی کە ئەوروپای گرتبویەوە. بۆیە ئیمپراتۆریەت لەسەردەمێکی گەشەسەندودا وەك دامەزراوەیەکی کۆنی سەدەکانی

ناوەڕاست مایەوە. پاش هەموو ئەوانەی کەباسمان کرد سەبارەت بە ماکسیمیلیان، لە کۆتایدا لەساڵی(1519) کۆچی دوای کرد.

## ناپوڵی:-

زۆر گرنگە پێش قسە کردنمان لەسەر شارەکانی ئیتاڵیا، سەرێك لە صقلّیەو ناپوڵی بدەین، کە زۆرجار بە دوو صقلّیەکە ناو دەبرا. ئەم وڵاتە لە سەدەی یازدە لە لایەن ئەسکەندەناڤیەکانەوە دامەزراو هەمیشە لەنێوانی پاپاو ئیمپراتۆر دەستاودەستی پێدەکرا، تا ئەوەبوو لەساڵی(1246) کەوتە ژێر چنگی فەڕەنسا. بەڵام لەساڵی (1282) شۆڕشێ بەرپابوو بەناوی شۆڕشی "سیسیلیان فبسپرس"کە بووە هۆی لێك جیاکردنەوەی "صقلّیەو ناپوڵی". ئیدی لەوەوە صقلّیە کەوتە ژێرڕکێفی بنەماڵەی ئەراگۆنی ئسپانی، لە کاتێدا ناپوڵی لەدەستی فەڕەنسادا مایەوە هەتا ساڵی (1442) کە لەم ساڵەدا بنەماڵەی ئەراگۆن توانی زاڵ بێتەوە بەسەر ناپوڵیداو لەگەڵ صقلّیەدا لەیەکیان گرێبداتەوە. ئیتر لەمەوە دوبەرەکیەکی توند لەنێوان ئیسپانیاو فەڕەنسا پەیدابوو، کە کۆتای پێنەهات تاساڵی (1504)، دوای ئەوەی لۆیسی دوازدە وازی لە ناپوڵی هێنا بۆ ئیسپانیا.

## هەرێمە پاپەویەکان:-

هەرێمە پاپەویەکان لە دەوروبەری ڕۆما دەرکەوتنو بە تێپەڕینی ڕۆژگار گەشەیان کردو فراوان بوون، تا بەشێوەیەکی دانپیاهێنراو بەموڵکەکانی قەشە پترۆس لەقەڵەم درانو کەوتنە ژێر دەسەڵاتی پاپا، ئەمەش کاتێ

ئیمپراتۆرەکانی ڕۆمان لەکاتی شالاّوەکانی هۆزە کێویەکان دەسەلاّتیان لەدەستدا. ئیدی پاپاکان هەوڵیاندا مولّکەکانیان فراوان بکەن لەناوەڕاستی ئیتالّیا، واتا لەنێوان ڕێژگەی روباری " تایبرو دەریای ئەدریاتیك". بەهاتنی سەدەی شازدەش، پاپاکانی ڕۆما وەك میرەکان خەریکی کاری سیاسی بوون لەسەر هەرێمەکانی خۆیانو کرداری وەك ئەوانیان دەنواند. ڕەنگە پاپا "ئەسکەندەری شەشەم" لەسالاّنی (1492- 1503 ) بەناو بانگترینیان بێت بۆئەم شەقلّە، بەهۆی هەولّە چرووپڕەکانی بۆ چەسپاندنی کوڕەکەی"سیزاربورجیا"، وەك فەرمانڕەوا بەسەر ئیتالّیا. جولیسی دووەم کە لەدوای ئەلیکسەندەر بەپاپا هەلّبژێردرا، لەوەی پێشووی خراپتر بوو، گرنگی زۆری بە لایەنی دبلۆماسیو سەربازی دەدا، هەروەك سەرقالّی هاوپەیمانی بەستن بوو لە دژی فەرەنساو میرنشینە ئیتالّیەکان. گرنگی دانی ئەم پاپایە بەلایەنی رامیاری زۆر زیاتر بوو لەگرنگی دانی بەئاین[1].

لەسەدەی شازدە ژمارەی خەلّکی ڕۆما دەگەیشتە (100 ) هەزار کەس. ئەم شارە سەرەڕای ئەوەی پایتەختی جیهان کاسۆلیکی بوو، شوێنەوارە ڕۆمانیەکانیشی لەخۆدەگرت. گەشتیارانو حاجیان لەهەموو بەشەکانی ئەوروپا روویان تێدەکرد. گەشتیارانو سەردانی کاران (حاجی) هۆکاریّ بوون بۆ زیادبوونی داهاتی ئەم شارە سەرەرای داهاتی کەنیسە، لەبەر ئەوە ئەم شارە لەسەر ئەم داهاتە دەژیا کەلەم دووسەرچاوەوە سەرچاوەی دەگرت.

---

Political and Cultural History of Modern Europe ‹ Carlton‹-Hayes 1 pp.3-46.‹1936)‹(New York

## شارەکانی ئیتاڵیا:-

باسی شارەکانی ئیتاڵیا دەکەین، ئەو شارانەی کە بەهۆی خۆشگوزەرانی وگەشانەوەی وێژەو هونەر تیایدا ناوبانگێکی مەزنیان پەیداکرد، بەشێوەیەك کە لە کۆتایەکانی سەدەکانی ناویندا هیچ جێگایەکی ئەوروپا ئەم ناو دێریەی نەبوو. ئەم شارانە پەیڕەویان لە دەسەڵاتێکی سیاسیو بەڕێوەبردنێکی سەربەخۆ دەکرد. بەهۆی ئەو هێرشانەی کە دەیانکردە سەریەکتری، دوژمنایەتیو نەیاریەتیان لەگەڵ یەکتری توندو سەختتر بوو، هۆکارێکیش بوو بۆ زاڵبونی دوژمنانیان بەسەریاندا، سەرەڕای وێرانکاریەکی زیانگەیەن کە بوو بە بەشی ئیتاڵیاو، یەکیەتی ئیتاڵیاشی چەند سەدەیەك دواخست. گرنگترینی ئەم شارانەش لەسەدەی شازدەدا، بریتی بوون لە (میلانۆ فلۆرەنسا ڤینیسیا جەنەوا).

## دۆقیەی میلانۆ:-

لێرە باسی دۆقیەی میلانۆ دەکەین، ئەو میلانۆیەی کە لەسەدەکانی ناوەڕاست سەر بە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیرۆز بوو، وە بنەماڵەی ڤیسکۆنتی فەرمان ڕەوایی دەکرد. جا کاتێك لەساڵی (1447) دواهەمین فەرمان ڕەوای ئەو بنەماڵەیە مرد کە لەسەرمیلانۆ فەرمان ڕەوا بوو، دەسەڵاتی میلانۆ بوو بە کۆماری. بەلاّم ئەوانەی ئەم کۆمارەیان بەرێوە دەبرد چونکە لێهاتوو نەبوون لە بواری سیاسیو ئیداری، "فرانسیسکۆ سفورزا"یان- وەك سەرۆك سوپا دیاری کرد بەمەبەستی جەنگان لەگەڵ ڤینیسیا. شایەنی باسە ناو براو یەکێ بوو لەوانەی خواستی جێگرتنەوەی بنەماڵەی ڤیسکۆنتی هەبوو. هەر

لەبەر ئەم ئارەزوە دەرونیەی کە نەیتوانی دەست بەرداری بێت، لەماوەی سێ ساڵدا هەستا بەکودەتایەکی سەربازیو پاش سەرکەوتنی، خۆی وەك سەرداری میلانۆ دیاری کرد. یەکێ لەکارەکانی بریتی بوولە کۆتای هێنان بەجەنگی ڤینیسیا و، بەپێی پیمانی"لۆدی". فرانسیسکۆ بۆخۆی پیاوێکی بەتواناو کارابوو وەك دۆق دانی پیاداهێنرا. سەرەڕای ئەوەی هەندێ لەدیاردەکانی حکومەتی کۆماری هێشتەوە، بەلاَم لە ڕاستیدا دیکتاتۆر بوو لە سەپاندنی بیرو ڕاکانیدا. "فرانسیسکۆ" هەستا بە کردنی هەندێ کاری گشتی لەڕووی مەدەنی وسەربازی، وە گوزارشتی بەوە بۆخۆی کرد، کە داواکاری سیاسەتو پارێزەری هونەرە. بەلاَم لەدوای هەموو ئەمانە لە سەردەمی کوڕەکەی "لودڤیکۆ سفورزا"، "لۆیسی دوازدە" بەناوی بنەماڵەی "ڤیسکۆنتی" دەستی بەسەر میلانۆ داگرتو تاساڵی (1512) تیایدا مایەوە. بەلاَم لەو ساڵەدا لەلایەن "کۆمەڵەی پیرۆز" لۆیسی دوازدە شاربەدەرکراو یەکێکیتر لە بنەماڵەی سفورزا بە فەرمانڕەوا دانرایەوە[1].

**فلۆرەنسا:-**

ئەم شارە، شاری "دانتیو داڤنشیو میخائیلو رەفائیلە"، کە بە گەشانەوەی وێژەو هونەرو دامەزراوە ئازادەکانی بەناوبانگە. شێوازی فەرمانڕەوایی تیایدا تاڕادەیەك دیموکراسیە. ئەم شارە دابەشکراوە بەسەر

---

1 Mayron p. Gilmore، The world of humanism (harper، 1962) pp. 108-107

چوار گەڕەکی گەورە، هەر گەڕەکێکیش دابەشکراوە بە گەڕەکی لەخۆی بچوکتر بەمەبەستی سانا کردنی بەڕێوە برانی. جا پالێوراوانی هەر یەك لەم گەڕەکانە، نوێنەرایەتی بیستو یەك سەندیکای ئەم شارەیان دەکردو ئەندامانی ئەنجومەنی سنیوری بالأیان هەڵدەبژارد کە فەرمانڕەوایەتی ئەم شارەیان دەکرد. دامەزراوە دیموکراسیەکانی تری کەمتر گرنگی هەبوو.

ئەنجومەنی "سنیوری" فەرمانڕەوای خستبووە ئەستۆی خۆی، کە پێکهاتبوو لە هەشت ئەندام، ئەم هەشت ئەندامەش نوێنەرایتی هەر چوار گەڕکەکەیان دەکرد، واتا هەر گەڕەکەی دوو ئەندامی لەم ئەنجومەنەدا هەبوو. دادوەریش لەم ئەنجو مەنەدا ئەندام بوو. لەمەوە سەرجەمی ئەندامانی دەبوو بەنۆ ئەندام. ڕێگەی هەڵبژاردنی ئەم ئەندامانە بە تیرو پشك بوو، ئینجا دوای تەواو بونی هەڵبژاردن، ئەنجومەنی هەڵبژێردراو بۆماوەی دوومانگ فەرمان ڕەوایی دەکرد، هەر لەبەر ئەوەش لەماوەی ساڵێکدا شەش حکومەت فەرمانڕەوایەتیان لەم شارەدا دەکرد. بۆ ئەم ئەنجومەنە دوو ڕاوێژکارو دوو یاریدەدەر هەبوون. هەروەها دوو ئەنجومەنی تریش هەبوون کە پێیان دەوترا "ئەنجومەنی گەل"و "ئەنجومەنی شارەوانی"، ئەرکی ئەم دوو ئەنجومەنە بریتی بوو لەڕەزامەندی نواندن لەسەر پێشنیارەکانی "ئەنجومەنی سنیوری" کە لەماوەی دو مانگی فەرمان ڕەواییدا پێشکەشی دەکرد. وە لە بارودۆخە ناهەموارەکاندا داوای کۆبونەوەی پەرلەمانی دەکرد. جا هەر لەکاتی بیستنی زەنگی گەورەی شار سەرجەم ئەنجومەنە نیشتمانیەکان کۆدەبونەوە. ئەمەش لە پێناوی دامەزراندنی دەستەیەك

کەهەڵبستێت بە چاکسازی گشتی، وە پەیڕەو کردنی دەسەلاتێکی فەرمان ڕەوایی لەکاتە پڕکێشەکاندا. سەرەڕای هەبوونی "ئەنجومەنی سنیوری"، کەچی لیژنەیەکی هەشت کەسیان هەبوو کە هەڵدەستا بە بەڕێوەبردنی پۆلیس. ئەمەو جگە لە هەبوونی دوو لیژنەی تر کە یەکیان لە شەش ئەندام پێکدەهاتو سەرپەرشتیاری کاروباری بازرگانی دەکرد، ئەوەی تریشیان لە دە ئەندام پێکدەهاتو بەرپرسیاری جەنگو ئاشتی بوو، شایەنی باسە ئەم لیژنە دە کەسیە لە کاتەکانی جەنگدا دادەمەزرا.

ئەمانە سەبارەت بە شێوازی فەرمانڕوایی شارەکە. لێرەوە باسی چەند گۆرانکاریەك دەکەین کە لەنیوەی دووەمی سەدەی پازدەهەم بەسەرحوکمی شارەکەدا هات، کە کاری تەواوی کردە سەر فلۆرەنساو دەورووبەری.

"کۆسمیۆ دی میدیدچی" سەرۆکی بنەماڵەی میدیدچی بوو، بەناو بانگ بوون بە بازرگانیو دراوگۆڕی. "کۆسمیۆ" توانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی پازدە، فەرمانڕەوایی فلۆرەنسا بگرێتە دەست، ئیتر لێرەوە ڕژێمی دیموکراسی ئەم شارە لە دیموکراسیەوە گۆڕا بۆ شێوازی فەرمانڕەوایی ئۆلیگاریکی. "کۆسمیۆ" هەستا بەدانانی رژێمی پشکنینو بژارکردنی لیستەی ناوەکان لەکاتی هەڵبژاردن، بەهۆی ئەمەشەوە توانی زاڵ بێت بەسەر دەسەلاتو توانی گەنجینەی فلۆرەنساو گەنجینەی بنەماڵەی خۆی بکات بەیەك . رۆژگاری"کۆسمیۆ" بەناو بانگە بەئۆقرەییو هێمنی. "کۆسمیۆ" تا ساڵی (1449) ژیا، لەپاش خۆی (پیرۆ)ی کوڕی جێگەی گرتەوە، بەلام ماوەیەکی کەم دەسەلاتداربوو، هەرزوو (لۆرینزۆ)ی کوڕی شوێنی گرتەوە.

"لۆرینزۆ" پێی دەوترا لۆرینزۆی گەورە، ئەوەندە گرنگی بەزانستو وێژەو هونەردا، ڕۆژگارەکەی بەسەردەمی زێڕین ناسرا[1].

لۆرینزۆ لە ساڵی (1469 – 1492) فەرمانڕەوایی کردو شێوازی کۆماری بۆ فلۆرەنسا هێشتەوە. لەپاش مردنیشی قەشەیەك بەناوی "سافۆنارولا" سەرپەرشتی شۆڕشێکی کرد. "سافۆنا ڕولا"بەمەبەستی دانانی سیستەمێکی گەورەو شیاو بۆ فلۆرەنسا، ڕێبەری گفتوگۆی یاسای دەکرد. لە ساڵی (1492)"چارلسی هەشتەم"ی پاشای فەرەنسا هەڵمەتی بردە سەر فلۆرەنساو بنەماڵەی میدیتچی لە فەرمان ڕەوایی دەرکرد. سافۆناڕۆلای قەشەش پێشوازی لێکردو لەڕوی مادیو مەعنەویەوە یارمەتی دا، بەهۆی ئەمەوە سافۆناڕولا توانی چوار ساڵ فەرمان ڕەوایی بکات. ئیدی هەرلەدوای گەڕانەوەی چارلسی هەشتەم، سافۆنارولا بە دەسیسەیەك لەلایەن دووژمنە فلۆرەنسیەکانی لەساڵی (1498) لە قەنارە درا.

دووبارە فەرەنسا بە سەرکردایەتی پاشای نوێ، لویسی دوازدەهەم ڕووی کردەوە فلۆرەنسا، سیستەمی کۆماری لە ژێر فەرمانڕەوایەتی فەرەنسا لەم شارەدا تاوەکو ساڵی ( 1512) بەردەوام بوو، کاتێك لەم ساڵەدا هاوپەیمانی پیرۆز لە نێوان پاپاو ئیمپراتۆر ماکسیملیانو فردیناندی پاشای ئیسپانیا پێکهاتو فەرەنسایان لە ئیتالیا دەرپەڕاند. ئیدی بنەماڵەی میدیتچی جارێکی تر لە فلۆرەنسادا گەڕایەوە سەر دەسەلات.

---

Ibid; pp. 111- 114– 1

**ڤینیسیا:-**

ئێرەشاری ڤینیسیایە. شارێکی بازرگانیەو دەکەوێتە سەر دەریای ئەدریاتیك، چینێك لە بازرگانان فەرمان ڕەوای دەکەن، هەر لەبەر ئەمەش شێوازی دەسەلاَتداریەتی تیایدا ئۆلیگاریکی بوو. ئەم ڤینیسیایە بەهۆی ئەوپێگەجوگرافیەی هەیبوو (کەوتبووە سەر دەریای ئەدریاتیك)، توانی ئیمپراتۆریەتێکی بازرگانی دابمەزرێنێ لەسەر کەنارەکانی ڕۆژهەلاَتی دەریای ناوەڕستو باکوری خۆرهەلاَتی ئیتالْیا. بەم شێوە دەستمایەی ڤینیسیا لەسەدەی شازدەدا گەیشتە (3000) کەشتیو (300) هەزار دەریاوانو سوپایەکی گەورەو دەسەلاَتێکی بەهێز. وە بەهۆی ئەو سەروەتەی کە لە سەردەمی جەنگی خاچیەکانەوە لە ڕێگەی بازرگانیەوە کۆی کردەوە، ناوبانگێکی گەورەی بەیداکرد، بوو بەخاوەنی پیشەسازی شوشەو کوتاڵی ئاوریشمو دروستکردنی زێڕو زیو.

دەسەلاَتی سیاسی لەڤینیسیادا درایە دەستی چەند سەرپەرشتیارێك کە دەسەلاَتی سیاسیان بەڕێوەدەبرد. لەوانە: -

1- "دوج" کە لەدوای هەلْبژاردنی، بەدرێژایی ژیانی سەرپەرشتی دەسەلاَتی جێبەجێ کردنو سەرۆکایەتی دەولْەتی دەکرد.

2 - ئەنجومەنی ناوەندی، کە لە دە ڕاوێژکار پێکدەهات، بەلاَم دوج سەرپەرشتی دەکردن .

3- ئەنجومەنی مەزن (گەورە) کەلەلایەن بازرگانانو خانەدانان سەرۆکایەتی دەکرا.

4ـ ئـەم بـارە هـەروا درێـژەی نەکێـشا، ئـەوەبوو لەسـاڵی (1454) سـێ پشکنەر (موفتیشین) زاڵ بوون بەسەر ڤینیسیا. بەشێوەیەکیش زاڵ بوون کە لـە توانایانـدا هـەبوو فـەرمانی لـە قـەنارەدان دەربکـەن‌و کـاری پێبکـەن، وە دەست بخەنە ناو گەنجینەی دەوڵەت‌و بەحەزی خۆیان یاسا دابڕێـژن. ئـەوان کۆمەڵێك لە سیخوڕو شوفارانیان بەکار دەهێنا بۆ گرتنی هەر کەسێکی گومان لێکـراو. ئـەوپردەی لاشـەی قوربانیانیـان بەسـەردا دەپەڕانـدەوە، کەپشکنەرەکان بە نهێنی کوشتبویان، بە ئاخ هەڵکێشان ناوی دەرکرد.

سەرەڕای هەموو ئەوانەی کە ڤینیسیا لە سەردەمی تۆقاندندا بینی، بـەڵام لەناوەخۆدا سەلیم بوو، لە کاتێدا شارەکانی ئیتاڵیا ببوونە گۆڕەپانی جـەنگ. هەرچۆنێك بێت ڤینیسیا یەکەم وڵاتی ڕۆژئاوایی بوو پـەیڕەوی کـرد لـەناردنی دیبلۆماسان‌و نوێنەران، بەهۆی ئەمـەش پێگەیـەکی سیاسـی گرنگـی دروسـت کرد لەناو وڵاتانی ئەورووپا.

سـەرەتاکانی پەشـێوی‌و داڕوخـان لەڤینیـسیا دەرکـەوت، دوای ئـەوەی عوسمانیـەکان بازرگانیەکـەیانی لـەناوبرد لەخۆرهـەڵاتی دەریـای ناوڕاسـتلەلایەکی تریـشەوە بـەهۆی ئـەوەی کـە ڕێگـەی بازرگـانی گـۆڕانی بەسەرداهات‌و لە دەریای ناوەڕاستەوە گوازرایەوە بـۆ زەریـای ئەتڵەسـی، وە لەئـەنجامی دۆزینـەوە جوگرافیـەکان بازرگانیەکـەی زیـانێکی گورچـك بـڕی بەرکەوت. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا ڤینیسیا وەك کۆمـارێکی سـەربەخۆ مایـەوە، تاوەکو ناپلیۆن لەساڵی (1797)دەستی بەسەردا گرت[1].

---

Ibid; pp. 115- 11 1

**جەنەوا :ـ**

جەنەواش وەك یەكێ لەشارەكانی ئیتالیا گرنگی خۆی هەبوو، لەڕووی بازرگانییەوە لەدوای ڤینیسیاوە دەهات و كێبڕكێیەكی بەهێز لەنێوانیاندا هەبوو. بەڵام جەنەوا توشی شكستێكی سیاسی بوو بەهۆی ئەوەی لۆیسی دوازدەی پاشای فەرەنسا لەساڵی (1499) شاڵاوی بردە سەرو توانی دەستی بەسەردابگرێت. جەنەوا بەم شێوەیە مایەوە، تا لەساڵی (1528) لەسەر دەستی یەكێ لە ڕۆڵەكانی بەناوی (ئەندی دوریا) لەدەستی فەرەنسا ڕزگاركراو كۆماری بۆ گەڕێندرایەوە.

سەبارەت بە شارەكانی تری ئیتاڵیا ئەوەندە هەیە كەبڵێین:شێوازی دەسەڵاتداری ئەوان زیاتر نزیك بوو لەشێوازی فەرمان ڕەوای میلانۆ. وەك لەهی فلۆرەنساو ڤینیسیا، زۆرینەی دەسەڵاتدارانیشیان بەسەریانەوە ستەمكار بون .

**ساڤوی :ـ**

ساڤوی دۆقیەك بوو كەوتبوە باكوری خۆرئاوای ئیتالیا لەناوچەكانی زنجیرەچیای ئەلپ. ساڤوی هیچ گرنگیەكی نەبوو تاوەكو سەدەی نۆزدە نەهات، ئەمەش كاتێ یەكیەتی ئیتالیا هاتەدی. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ساڤوی لەكۆتاییەكانی سەدەكانی ناوەڕاست خاوەنی پەرلەمانێك بوو كەبەشێوەیەك لەشێوەكان لەپەرلەمانی ئینگلیزی دەچوو، ئەمەولەپاڵ هەبوونی دۆقێك كە مەیلی دەسەڵاتی ڕەهای هەبوو. ئەگەرچی دۆق لە توانایی دانەبوو بەتەواوی كەڵك وەرگرێ لەدامەزراوە دیموكراتیەكانی[1].

---

Ibid; pp. 108-109 1

## زەویــە نزمەکــان:-

زەویەنزمەکان لەحەڤدە هەرێم پێك هاتبوون. ئەم زەویانە دەکەوتنە سەر کەنارەکانی خواروی دەریای باکور. ئەم زەویانە جگە لەهۆڵنـدە، بـەلجیکای باکوری خۆرهەلاتی ئەو کاتی فەرەنساشی دەگرتەوە. زۆرترینی خـەڵکی ئـەم ناوچـانە لەڕەگــەزی فلمنکــیو هۆڵنــدی پێکـدەهاتنو بـەزمانی فەرەنــسی دەدوان، ســەرەرای بەشــی باشــوری کــە لەڕەگــەزی ئــالوالونی بــوون، بەهامانشێوە بەزمانی فەرەنسی قسەیان دەکرد .

ئەم ناوچانە لە ڕابردودا لەژێر سـۆزی خانـەدانو دەرە بەگـەکان دابـوون، بەلاٚم بەتێپەڕینی ڕۆژگار لەنێوان سەدەکانی دوازدەو چواردە چـەند شـارێکی گرنگ سەریان هەڵدا. ئەم شارانە بەشێوەیەك دەوڵەمەنـد بـون، کەبەهۆیـەوە توانیان ئـازادیو سـەربەخۆیی لـەمیرو دەرەبەگـەکان بەدەسـت بێـنن، ئیـدی لێــرەوە بــوون بــەکۆماری ســەربەخۆو خــاوەن ئەنجومــەنی شــارەوانیو بەڕێوبەرایەتی تایبـەتیو دامـەزراوەی دیموکراسـی. لـەم شـارانە پیـشەسازی بەگشتی پەرەی سەند، بەتایبەت پیشەسازی کوتاڵو خـوری لەفلانـدروز، کـە لە بەریتانیا وئیسپانیاە دەیهاورد. گرنگترینی ئەم شـارانەش بریتـی بـون لـە: (برجس،ئەنتویرب، برۆکسل، لیج ، اتریختو ڕۆتردام).

بـرجس لـەگرینگترنی شــارە بازرگانیــەکانی زەویــە نزمــەکان بــوو کــە هیـسیەکان کردبویـان بەناوەنـدی خۆیـان. بـەلاٚم چـەند هۆکارێك بونـە هـۆی پەیدابونی پەشێوی لە کاری بازرگانی ئەم شارە. لەوانە هـەبونی نیـشتویەکی زۆر لـەناو ئـەو ڕوبـارەی کـە کەشـتیوانیان تیـادا دەکـردو دەبـووە تەگـەرە

لەبەردەم هاتوچۆی کەشتیەکان، هەروەها بازرگانە شارنشینەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە کۆتو بەندیان خستبووە سەر بازرگانیو ئامادەش نەبوون بیگۆڕن. ئیتر بەهۆی ئەمانەوە بازرگانی ڕووی کردە بەندەری ئەنتۆریب کە باشتر بوو بۆ کەشتیوانیو کاری بازرگانی، لە ئەنجامدا ئەم ناوچەیە بو بەناوەندی بازرگانی ئەوروپا لە سەدەی شازدەدا.

فەرمانڕەوا بۆرگەندییەکان لە سالی (1384)ەوە توانیان فراوانخوازیبکەن لەسەر حسابی زەویە نزمەکان، ئیدی ئەوەندەی نەبرد هەر حەڤدە کانتۆنەکانیان یەك لەدوای یەك خستە ژێر دەستی خۆیان. ئەم زالبوونەشیان لە ڕێگەی کڕینو هاوسەر گیریو هێزو پیلانو هاوکاری پیاوانی ئاینیو خانەدانەکان بۆ دەستە بەر بوو. ئەمە لەکاتێدا شارنشینەکان بەرهەڵستیان دەکردن. بازرگانی زەویە نزمەکان لە فراوانیو گەورەبون دابوو، لەو کاتەوەی کەوتە ژێردەسەلاتی میرە بۆرگەندیەکان لەسالی (1433) لەسەردەمی فیلپ. شایەنی باسە ئامانجی فلیپو کوڕەکەی چارلسی چاپوك، دامەزراندنی هەرێمی بۆرگەندیا بوو لەنێوان ئەلمانیاو فەرەنسا[1].

پەرلەمانی گشتی کە نوێنەرایەتی هەر حەڤدە کانتۆنەکەی دەکرد، لە سالی(1465) لەبرۆکسل کۆبوویەوە. پاش هەشت سال ئەنجومەنی دادوەری بالاپێکهات، کە هەڵدەستا بە ڕێکخستنی کاروباری دارایی. بەلام لۆیسی یازدە هەر خەریکی پیلان گێڕان بوولەدژی چارلسی چاپوك، کەبووە هۆی

---

120-121.،bid; pp.78-80 I

دروست نەبوونی ولاّتی بۆرگەندیا. دوای کوژرانی چارلس لە جەنگی "نانسی" لە ساڵی (1477)، لۆیس بۆرگەندیای بە فەرەنساوە گرێدا، لە کاتێکدا ماری کچی چارلسی چاپوك، ببوو بە خاوەنی زەویە نزمەکان. ماری لەهەمان ئەو ساڵەی کە باوکی کوژرا شوی کرد بە ماکسیمیلیان، (کەلەدوای ساڵی 1493 ببووبە ئیمپراتۆر)،ماریش لەساڵی (1482) کۆچی دوایی کردوو کوڕەکەی فیلپ بوو بە میر بەسەر زەویەنزمەکان، کاتێکیش فیلپی کوڕی ماری لەساڵی(1506) لەدنیا دەرچوو، کوڕەکەی چارلس بووبە میری ئەم ناوچەیە. چارلس هەوڵی دا بەدوای میرە بۆرگەندیەکان بکەوێ، کە خۆی دەبینیەوە لە یەکگرێدانی سەرجەم هەرێمەکانو کۆکردنەوەیان لەژێر چەتری حوکمەتێکی ناوەندی بەهێز. بەلاّم لەبەرئەوەی چارلس خەرجیە جەنگییەکانی خستبووە ئەستۆی شارنشینەکان، خەڵکی شارەکان ڕووبەڕوی بونەوە. شایەنی باسە خاوەن زەویەکانیش بەرهەڵستی چارلسیان دەکرد بەهۆی کەم بونەوەی داهاتو بەرزبەنەوەی نرخەکان. لەسەردەمی چارلس دا بارودۆخ شلەژابوو، میری هەرێمی گیلدر هەولیدا میرەکان والێبکات گوێڕایەڵی چارلس نەکەنو لە فەرمانەکانی دەربچن. ئەو شۆڕشەی کەمیری گیلدر هەڵیگیرساندبوو لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە بەردەوام بونی جەنگە درێژخایەنەکانی، کاریگەری خراپی کردە سەر ئابوری ولاّت. بەلاّم سەرەڕای ئەوانەش دانیشتوانی هۆڵندا دڵسۆزانە بۆ چارلس مابونەوەو گوێڕایەڵیان دەکرد، هەرچەندە سەرەتاکانی شۆڕش لە ڕۆژگاری ئەمدا لەدەرکەوتن دابوو.

لەناو موڵکەکانی شارلی پێنجەم، زەویە نزمەکان لەهەمویان پڕ داهات تربوو. چەند شارێکی بچوك دەرکەوتن کە کاری کردە سەر ڕێگەی

پیشەسازی قوماش‌و کانزای(خەڵوز وئاسن)ی لیج‌و نامور. شارە باکوریەکان خەریکی کاری کشتوکاڵ‌و بازرگانی بون، لەم لاشەوە شارە کەناریەکان بەهۆی ڕاوی ماسی‌و بازرگانی، ببون بەخاوەن سامان. لە لایەکی تریشەوە ئەنتۆریب بەهۆی هەبونی بەندەرێکی گەورەو گرنگ، پێگەیەکی بازرگانی بەرزی لە ئەوروپا بەدەستهێنا. شارە هوڵندیەکانیش خۆیان هەڵدەکێشا بە دامەزراوە ئازادو سەربەخۆکانیان‌و بێزارییان دەردەبڕی لە دەستێوەردانی ئیسپانیاو وڵاتە بیانیەکان لەکاروباری ناوخۆیان. لە ساڵی(1540) خەڵکی شاری غنت شۆڕشیان هەڵگیرساندو بێزاری‌و تورەیی خۆیان دەربڕی لە دژی سیاسەتەکانی (چارلس)ی ئیسپانی و، لەناوبردنی سامانیان‌و بەکارهێنانی بۆ پڕۆژە ئیسپانیەکان‌و ئەو جەنگانەی کە ئیمپڕتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز لەدژی فەڕنساو ئیتاڵیا هەڵیگیرساندبوو. ئەوان وایان گوزارشت دەکرد کە هەموو ئەوانە لە دژی بەرژەوەندیە ئابوریەکانی هۆڵندا تەواو دەبێ[1].

## حکومەتە نەتەوەییە نوییەکان

لەدوای ڕوخان‌و هەرەسهێنانی ئیمپڕتۆریەتی ڕۆمانی لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست، حکومەتە نەتەوەیەکان دروست بوون وچەکەرەیان کرد. ئەمەش لەدوای هەوڵی بێ وچانی پاشاکان کە بۆ فراوان کردنی دەسەڵاتیان و، زاڵ بون بەسەر دەسەڵاتی تردا لە هیچ هەلێك خۆیان نەدەبوارد. کاتێك سەدەی شازدەهەم هات، چەند گۆڕانکاریەك بەسەر ئەم حکومەتانە داهات و، دەسەڵاتی پادشاکان ڕووی کردە پادشایەتی ڕەها.

---

op. cit; 229- 232.،Green 1

لێرەدا چەند هۆکارێك باس دەکەین کە یارمەتیدەر بوون بۆ سەر هەڵدانی پادشایەتی ڕەها:ـ لەوانە:

1- لە سەدەکانی ناوەڕاست میرو دەرەبەگەکان لەمپەربوون لە بەردەم بەهێز بونی دەسەڵاتی پادشاو دەسەڵاتی ناوەندیو ئەمان دەسەڵاتی پادشایان کۆت کردبوو بە هۆی دامەزراندنی پەرلەمانو ئەوبەربەربژاریانەی کەوەریان گرتبوو. بەڵام ئەم بارە لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕست بە نسبەت میرو دەرەبەگەکان کەوتە لێژی، بەشێك لەوانە دەسەلآت وهێزیان لەدەستدا. هەندێکی تر لە میرو دەرەبەگەکان لە جەنگە خاچیەکان کوژران، هەروەها بەهۆی ئەو جەنگانەی کە لە گەڵ یەکترو لەگەڵ پادشاکان دەیان کرد، زۆریان بوون بە سوتەمەنی ئەو جەنگانە، بەشێکی تریان کۆچیان کردە خۆرهەلآت، هەندێکی تریشیان لە لادی یەوە ڕۆیشتنە شارەکان وخۆیان خەریکی بازرگانی کرد لەگەڵ خەڵکی شارەکانو بەهەویای پەیدابونی دەسەلآتێکی پاشایی ناوەندی بوون بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە ئابوریەکانیان. کەواتە ئەم هۆکارانە وای کرد کە میرو دەرەبەگەکان لەناوچنو دەسەلآتیان نەمێنێ، ئەوەیشی کەمابونەوە، پاشاکان بە زەبری هێز ملکەچی خۆیان کردنو کردیانن بە پاشکۆی خۆیان.

2- بە ڕاستی جەنگە خاچیەکان بووە هۆی گەشەپێدانی بازرگانی نێوان خۆرهەلآت وخۆرئاوا، لەلایەکی تریشەوە گەشتکردنی ئاسان کرد بۆ ولآتە دوورە دەستەکان. بەمەش چینی ناوەڕاست سەریهەڵداو گەشەی سەندو سەروەتو سامانیان زیادی کرد. ئەم چینە بۆ پاراستنی بازرگانیو سامانو

کاروانە بازرگانیەکانیان لە مەترسی گومرگو جەنگی نێوان میرەکان، حکومەتی ناوەندیان بەباشترین ڕزگارکار دەزانی، بۆیە هاوکاری تەواوی پاشایان کردو، لە هەوڵی بەهێزکردنی دابون.

3-جەنگی خاچیەکانو بازرگانی کردن، گۆڕانکاری گەورەی بەسەرکارو کردەوەی میروپیاوانی ئاینی داهێنا. میرو پیاوانی ئاینی لە سەرقاڵ بوون بە ڕامیاری ناوخۆوە، گواستەوە بۆخۆخەریککردن بە ئیشو کاری دەرەوە، وای لێکردن پرۆژەی پرقازانج لەووڵاتە دوورە دەستەکان دابمەزرێنن. ئەمەش بۆشاییەکی سیاسی دروست کرد، کەوای کرد پاشاکان ئاسانتر دەسەڵاتی خۆیان بەهێز بکەن.

4-خۆی لەخۆیدا کڵێسا دووژمنی سەرسەختی پادشایی ڕەها بوو، بەڵام لەوکاتەدا کەنیسە خۆی کرد بەنەیاری دەرەبەگەکانو لەهەوڵی لە ناوبردنی ئەو ئاژاوەو بەربەرییەتە بوو کەلەسەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوروپای گرتبووەوە. ئەمەش وای لێکرد لەگەڵ چینی ناوەڕاست پشتگیری پادشا بکەن، بە مەبەستی لەناوبردنی ئاژاوەو دەسەڵاتی دەرەبەگەکان. ساکاتێکیش پادشاکان لەسەرەتاکانی سەردەمی تازە دەستیان کرد بەسازکردنی هەڵمەت لە دژی کڵێساو پاپا، ئیدی پیاوانی ئاینی خۆیان بەلاوازی بینی بەهۆی ئەم دژایەتی کردنەی کەلەڕابردودا دەیانکرد لە دژی میروئیمپراتۆرەکانو هەڵگەڕاوە وهرتەقەکان، ئەم لاوازیەیان بەشێوەك بوو، کە لەتوانایان دانەبوو بەرەنگاری دەسەڵاتی پادشایەتی ببنەوە، هەربۆیە خۆیان ملکەچی دەسەڵاتی پادشاکان کردو بوون بە پشتیوانی پادشایەتی ڕەها. هەڵبەت

پیاوانی ئاینی بۆیە وا ملکەچ بون، چونکە بەم لاوازی وبێ توانایییەی خۆیان دەزانی. خۆیان وا بینی کەناتوانن بەرگری بکەن لە هەڕەشەی پاشاکان.

5- ڕەنگە هاوپەیمانی بونی چینی ناوەڕاست لەگەڵ دەسەلاتی پادشایی ڕەها، یەکێ بێت لە دیاردە هەرە گرنگەکانی سەردەمی گواستنەوە لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆسەردەمی تازە. چینی ناوەڕاست گەشەیسەندو سامانیان دای لەزیادیو خوێندەوەران زۆر بوون، دەرچووانی زانکۆکان کە ڕۆڵەی ئەم چینە بوون، زیادیان کرد. جاکاتێك پاشاکان ویستیان بەڕێوە بردنێکی کاراو چالاك بۆحوکمەتەکانیان دابمەزرێنن، چینی ناوەڕاستیان بەتایبەت خوێندەوارەکانیان بەباشترین خەڵك زانی بۆپێ سپاردنی کاروباری حوکمەتەکانیان کە دەیانویست بەشێوەیەکی تازە دایمەزرێنن. ئیدی لێرەوە فەرمانبەرانو ڕاوێژکاران لەخوێندەوارانی چینی ناوەڕاست پێکهێنران. ئەم چینەش لەڕێگەی باجەوە ماڵی بە دەوڵەت دەخشی بۆ تێچونەکانی کاروباری دەوڵەت و، ئەوجەنگانەی پاشاکان کە لەدژی دەرەبەگەکان سازیان دابوو. پاشاش لەبەرامبەرئەمە چەند بەربژاریەکی بەچینی ناوەڕاست بەخشی، لەڕووی بازرگانیو قۆرغکاریو یارمەتیدانیان بۆسازدانی پرۆژەی پرقازانج. هەروەها بەخششی ماڵی پێدەدان وپارێزگاری لەسامانی چینی ناوەڕاست دەکرد لەڕێگەی پاراستنی هێمنیو ئاسایش. ئەم چینە حکومەتیان کردە حکومەتو دامەزراوەیەکی تازە، لێرەوە پاشاکان بوون بەسەر پەرشتیاری دەوڵەتی نەتەوەییو چینی ناوەڕاستیش تیایدا گەورەترین ڕۆڵی بینی.

بەم شێوەیە بەهەماهەنگی نێوان پاشاو چینی ناوەڕاست یەككگرتنی نیشتیمانی دروست بوو، كەدەمێك بوو ئەم چینە بانگەشەی بۆ دەكرد. ئەمەو جگە لەزیادبوونی هۆشی نەتەوەیی، كەدواتر پادشاهێمای هەرە بەرزی بوو.

6- بەسەرهەڵدانی چەكی ئاگرینو تۆپ لەسەدەی یازدەمدا هۆیەكانی جەنگ پێ كردن گۆڕانی بەسەرداهات. ئەم گۆڕانە كاریگەری گەورەی هەبوو لەبەهێزكردنی دەسەڵاتی پاشاكان. پاشاكان بەهۆی هەبوونی سەروەت وسامان، توانیان سوپایەكی سیستماتیك دابمەزرێننو بەچەكی ئاگرین لەتۆپو تفەنگ بەهێزی بكەن، بە مەبەستی وێران كردنی قەڵای میرو دەرەبەگەكان. پاشاكان چیدی پشتیان بەسوپای دەرەبەگەكانو هێزی بەكرێگراوەكان نەدەبەست، بەمەش كۆڵەگەی حكومەتیان لەسەر بناغەیەكی بەهێز داناو پایەكانی حوكمەتیان لەناوخۆو دەرەوەدا قایم كرد.

7- دۆزرانەوەی یاسای ڕۆمانی لەكۆتایی سەدەكانی ناوەڕاست گرنگی گەورەی هەبوو لەبەهێز كردنی دەسەڵاتی پاشایی ڕەها. چونكە ئەم یاسایە ڕۆمانیەی كە(جۆستنیان)لەسەدەی شەشی زاینی دایِنابوو، شەرعیەتی دابوو بەپادشا كە بەحەزی خۆی یاسا بۆ دەڵەت دابنێ ورەفزی بكات. هەر بۆیە پادشاكان كەوتنە هاندانو یارمەتی دانی لێكۆڵینەوە لە یاسای ڕۆمانی. بیروڕای سەدەكانی ناوەڕاستیش دامەزرابوو لەسەرپەیوەست كردنی بچوك بەگەورە لەدەرەبەگیەكاندا، جا بۆڕزگار بوون لەوپەیوەست كردنە دەرەبەگیە كە پاشاكان خۆیان زۆر دژایەتی دەرەبەگیان دەكرد، پاشاكان هەستان بەهاندانی خوێندنی یاسا ڕۆمانیەكان لە زانكۆكاندا. ئیدی

لەسەرەتای سەدەی شازدە توێژێك لـە مافناسـان پەیدابوون کـە پـشتیوانی پادشایان دەکرد لەبانگەشەکانیان[1].

8-کتێبـە سیاسـیەکەی "نیکۆلـۆ میکـافیللی" پـشتگیری تـەواوی لـە پاشـایەتی ڕەهـا دەکـرد. میـاکیڤیللی ئیتـاڵی لەسـاڵی (1469-1527)لـە کتێبەکەی (میر) ڕۆڵی پاشایەتی ڕەهای بەسەر ڕژێمی پەرلـەمانی دەسـتوری بەرز دەنرخێنێ. ئەم کتابە جیـاوازی دەخاتـە نێـوان ڕەوشـتو سیاسـەت و، جەخت دەکاتەوە لە سـەر (ئامـانج ڕەوایـی دەدا بەهۆکارەکـەی*)، هـەروەها وای گوزارشت دەکرد کە پێویستە پاشا پابەندی هـیچ کۆتو بەنـدێك نـەبێت جا چ ئاینی بێت یان ڕەوشتی. وە پێویستە هـەموو هۆکـارێ بگرێتـە بـەر بـۆ بەرژەوەنـدی وڵاتەکـەی وبـەهێزکردنی پایـەی دەسـەڵاتی. هـەروەها هێـزو زیرەکی بەهۆکاری پاراسـتنی وڵات وبـەردەوامی دەسـەڵات دانـابوو، هـەروەك پێ وابوو پێویستە پاشا لە هێـزدا وەك شـێر بێـتو لـە تەڵەکـەو فێـڵ دا وەك

---

C. cit; pp. 23- 28.،Hays 1

* ئەمە بەو مانایا دێت کە هەر هۆکارێك بگریتە بەر بۆگەیشتن بەئامانج ئاساییە، ئیدی گرنگ نی یە بەزیانی خەڵکی تەواودەبێ یاخودنا. وە پاشایەك گەر مەبەستی بێت گـەلێك ملکەچـی خـۆی بکـات هەرچی بەکاری بێنێ بۆ ملکەچ کردنیان ئاساییە، مادام ئامانجەکەی بەدی دێنێ. لەڕستیدا وڵاتـانی ئەوروپی دەرهەق بەگەلانی خۆرهەڵات هەموو هۆکارێك دەگرنە بەر بۆزاڵ بـوون بەسـەریاندا. شـیاوی باسـە نـاپلیۆنو هیتلـەرو زۆرینـەی پاشـاکانی سـەدە نوێیـەکان کاریگـەر بـوون بـەم بیروڕایانـەی میکیافیللی. هەر خـودی سیاسـەتی عـەلمانیش لەسـەر ئەمـە هەڵچنراوە. وەلێ ئـەم دەقـە هەڵەیـە بەپێی سیاسەتی شـەرعی، چـونکە سیاسـەتی شـەرعی دەڵـێ: وەك چۆن ئامانجت ڕەوایـە دەبـێ هۆکارەکەیش ڕەوابێـت، ئـەگینا ئامانجەکـەیش بـەناڕەوا دادەنـدرێت. واتـا نـابێ بـۆ بـەدی هێنـانی ئامانجێکی حەڵاڵ، هۆیەکی حەرام بگریتە بەر. ( وەرگێڕ).

ڕێوی بچێت. شایەنی باسە ئەم کتێبە لەناو زۆرترین پاشایان بڵاو بویەوەو کاریان پێدەکرد.

هەموو ئەو هۆکارانەی کە باسمان کردن، هۆکاربون بۆ دروست بوونی کۆمەڵێ دەوڵەتی نەتەوەیی نوێی سەربەخۆ کە لەلایەن چەند پاشایەکی نەتەوەی سەرپەرشتی دەکران و گوێڕیەڵی گەلانیان بۆ خۆیان مسۆگەر کردبوو. ئەمانە توانیان زاڵ بن بەسەر دەرەبەگو کڵێسا. هەروەها توانیان خۆیان بکەن بە پێشڕەوو ڕێنمونیکاری گەلانیان و ڕێگەیان خۆش کرد بۆ نەتەوەیەتی نوێ. لەناو ئەو دەوڵەتانەی کە لە سەدەی 16 دەرکەوتن و تائەمڕۆش ماون {بەریتانیاو فەرنساو ئیسپانیا وپرتوگال و دانیمارک و سویدو ڕوسیا}ن، بەشێکیش لەو دەوڵەتانەی کە لەو کاتەدا دەرکەوتن و بەچەند بارودۆخێکی کارەسات ئامێزدا تێپەڕین، بریتین لە پۆلەندا وهەنگاریا، ئەمانە دووبارە لەسەدەی بیستەم توانیان دەربکەونەوە. سەبارەت بە ئیتالیاش ئەوەندە هەیە کە ئیتالیا دابەش ببو بەسەر چەند دەوڵەشارێک و نیشتمانی ناپوڵی و سقلیە. هەرچی ئەڵمانیاشە ئیمپراتورێک بوو گەشەی نەدەکرد. نەشبوو بەدەوڵەتێکی نەتەوەیی هەتا سەدەی نۆزدە.

### ئینگلتەرا :-

دوو دەسەڵاتی نەتەوەیی لە دەوروبەری ساڵی 1500 لە دوورگەی بەریتانیا دەرکەوتن. یەکەمیان خۆی دەبینیەوە لە ئینگلتەرا، دووەمیان بریتی بوو لە سکۆتلەندا. ئینگلترا لە سەدەی نۆی زاینیەوە وڵاتێک بوو، بەڵام نەبوو بە دەسەڵاتێکی نەتەوەی نوێ. پادشایە سەرەتاکانیان

ئەنگلۆساکسۆنی بوون و، ئەم وڵاتەیان بەموڵکی خۆیان دادەنا. پاشان ئەو نۆرمەندیە فەرەنسیانەی کە پێشتر توانیبویان باڵادەست بن بەسەر بەشێکی زۆری فەرەنسا، لە سەدەی یازدەدا توانیان دەستیش بەسەر ئینگلتەڕادا بگرن. هەروەها لەسەدەی دوازدە دەستیان بەسەرناوچەی( دبلن) ی ئێرلەندەدا گرتو لە سەدەی سێزدە میرنیشنی وێڵزیان خستە ژێردەستی خۆیان، هەر بەوەندەش نەوەستان، بەڵکو چەندین هەوڵی سەرنەگرتویان دا بۆ سەرکز کردنی سکۆتلەندا.

جەنگی "سەدساڵە" لە (1337 - 1453)، کە بەجەنگی دوو بنەماڵەی پاشای فەرەنسی‌و ئینگلیزی دەستی پێکرد، کۆتایەکیەکەی بەجەنگی نەتەوەیی‌و بەسەرکەوتنی فەرەنسیەکان کۆتایی هات، دوای ئەوەی توانی سەرجەم زەویەکانی بگێڕێتەوە دەستی خۆی. دوای ئەمە دەسەلاتی پاشای ئینگلیزی تەنها لە دورگەی بەریتانیاو ئێرلەندیدا مایەوە. لەم کاتەشدا گیانی نەتەوەیی‌و هەستە نیشتمانیەکان لەلای گەلی ئینگلیز گەشەی دەسەندو زمانی ئینگلیزی مۆرکێکی وێژەیی نەتەوەبی وەردەگرت‌و دامەزراوەکانی قالبێکی نەتەوەیان وەردەگرت. لە دوای جەنگی "سەدساڵە" ئەوەندەی نەبرد کە جەنگێکی خوێناوی لە پێناوی بەدەست هێنانی تەختی ئینگلیزی لەنێوان هەردوو بنەماڵەی "یۆرك ولانکستەر" هەلگیرساوبەجەنگی "جوتە گوڵ" ناسرا. ئەم جەنگە لەسالانی ( 1455- 1485) بەردەوام بوو، پاشان بە کوژرانی سەرکردە "ریچاردی سێیەم" لە پێکهەڵپرژانی

"بوسوروس" کۆتایی هاتو "هنری تیودور" بەناوی "هنری حەوتەم" لە ساڵی 1485 جێگەی گرتەوە.

هنری حەوتەم لەساڵانی 1485-1509 فەرمانڕەوایی کردو هەوڵی خۆی خستە گەڕ بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی بەهێز. بەڵام پەرلەمانی ئینگلیزی هەر لە سەدەی سێزدەوە دەسەلآتی پاشای کۆت کردبوو. جەنگی (جووتە گوڵ) کە لە ساڵی 1485 کوژایەوەو 30 ساڵ بەردەوامی دا، بە دووشێوە کاری کردە سەر کۆمەڵگەی ئینگلیزی. یەکەم: ژمارەیەکی زۆر لە خانەدانانی هەردوو بنەماڵەی لەناو برد، ئەمەش وای کرد هنری دەست بەسەر ماڵیان دابگرێ‌و دەسەلآتیان نەهێڵێ. دووەم: کاتێ کە ئەم ململانەیە درێژەی کێشا، خەڵکی تاسەر ئێسقان بێزار بوون لەم ئاژاوەیەو زۆر ئارەزومەندی ئاشتی بوون. چینی ناوەڕاست باوەڕی وابوو کە هێمنی‌و ئاشتی ناتوانێ سود بەخشبێت، تەنها کاتێك نەبێت کەدەسەلآتی پاشا بەهێزبێت لەسەر حیسابی خانەدانان.

هەر چۆنێك بێت هنری حەوتەم توانی پاشایەتییێکی بەهێز بچەسپێنێ، بەشێوەیەك توانی بەردەوامی بەخۆی بدا تا ناوەڕاستی سەدەی حەڤدە و، هەڵگیرسانی شۆڕشی ئینگلیزی.

هنری حەوتەم بەدەستێکی پۆلآین هەموو شۆڕشێکی یاخی بوونی سەرکوت دەکرد، هەروەها دادگای باڵای دامەزراند بۆ دادگایی ککردنی خانەدانەکان کە دواتر بە دادگای هۆڵی ئەستێرە ناونرا. هنری حەوتەم ئابووری ناس بوو، سیاسەتێکی ئابوریانەی لەناوخۆدا گرتەبەرو لەدەرەوە

پابەندی سیاسەتێکی ئاشتیانەبوو. هنری بڕی تێچونەکانی کەم کردەوەو، بڕیاری زیاد کردنی داهاتی وڵاتی دا لە ڕێگەی داچاندنی زەویەکانی پاشایی. هەروەها بڕیاری کۆکردنەوەی باجە دەرەبەگیەکان‌و سزامالیەکان‌و گومرگەکانی دەرکرد .

بەهۆی ئەمانەوە پشت بەستنی کەم بویەوە لەسەر بەخشینەکانی پەرلەمان، بەمەش دەسەڵاتی پەرلەمان دای لەکەمی، بەشێوەیەك کەلە هەموو ماوەی دەسەڵاتی هنری، تەنها پێنج جار کۆبونەوەی خۆی کردو بەدرێژایی ئەم ماوەیە ملکەچی فەرمانەکانی پاشا بووو هەموو ئارەزویەکی جێبەجێ دەکرد. هنری خۆی پاراست لەجەنگە دەرەکیەکان‌و هەوڵی دا بەرژەوەندی وڵاتەکەی برەوپێبدا. لێرەوە هەستا بەبەستنی ژمارەیەك پەیمانبەستی بە سود بۆ بازرگانی ئینگلیز. گرنگترینیان ئەو پەیمان بەستنە بازرگانیە بوو کەناسرا بە"ئاڵوگۆڕی گەورە". ئەم پەیمان بەستنە لەگەڵ میری بۆرگندیا بوو لە ساڵی 1496. بەپێی ئەم پەیمانبەستە میری بۆرگەندیا پەیمانی دا کە پێویستیەکانی زەویە نزمەکان بە کەلوپەلی ئینگلیزی پڕبکاتەوە. هنری شەریکاتە بازرگانیەکانی بەگەڕخست‌و هانی دان بۆ ئەنجام دانی بازرگانی درەوە، هەروەها"جۆن کابووت"ی- نارد بە مەبەستی دۆزینەوەی زەوی تازە لە جیهانی نوێ. "جۆن کابوت"یش توانی کەناری "نیوفاوندلاند" لە کەنەدای خۆرهەڵات بدۆزێتەوە. هنری بۆ بەرزو بەهێز کردنی بنەماڵەکەی، هەستا بەخواستنی "کاترین ئەراگۆن"ی کچی "فردیناردوئینرابیلا"ی-پاشای ئیسپانیا، بۆ "ئارسەر"ی- کوڕە گەورەی،

جا کاتێکیش "ئارسەر" بەچەند مانگێك دوای ئەم هاوسەر گیریە ماڵئاوایی لە ژیان کرد، هنری ئەم کچەی لە کوڕەکەی تری مارە کرد، بەناوی "هنریهەشتەم". هەروەها بە مەبەستی یەکانگیرکردنی تەختی ئینگلیزی وسکۆتلەدی لە داهاتودا، "ماری گریت"ی کچی دا بە"جیمسی چوارەم"ی پاشای سکۆتلەندا. بەم شێوەیە ئینگلترا لەسەدەی شازدەدا بووبە دەوڵەتێك کە دەسەڵاتی پاشایەتی رەها پشتبەستوو بەگوێڕایەڵی گەل تیادا دامەزرا، لە هەمانکاتیشدا دەسەڵاتی پەرلەمان دای لەکەمی.

**سکۆتلەندا:-**

سکۆتلەندا دەوڵەتێکی نەتەوەیی بوو لەدەوری ساڵانی 1500ز، بەڵام لە ئینگلتەرا لاواز تر بوو. پاشاکانیان لە بنەماڵەی "ستیورات"بوونو وەك پاشاکانی ئینگلترا بەخت یاوەری نەکردن لە سەرکەوتن بەسەر دەسەڵاتی خانەدانەکانو دەرەبەگەکان ودامەزراندنی دەسەڵاتێکی رەها بۆخۆیان. سەرەڕای ئەمە دوژمنایەتی کرانی لە لایەن ئینگلتەڕاوە، ناچاری کردبوون پشت ببەستن بە هاوکاریە دەرەکیەکان بە تایبەت فەرەنسا. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زمانی ئینگلیزی رەچەی بەست بۆ سکۆتلەنداو زاڵبوو بەسەرزمانی زۆرینە لە زۆربەی شوێنەکانی سکۆلەندا. هەرچۆنێك بێت، بنەماڵەی پاشایەتی سکۆتلەندا وەك داردەستو ئامێرێك بوون بەدەستی فەرەنساوە. ئەمەش لەدژایەتی ئینگلترا تەواو دەبوو.

**پەرلەمانی ئینگلیز:۔**

پەرلەمانی ئینگلیزی لە دەزگایەکی خانەدانان ولۆردداتەوە لە پێش ساڵی 1066 گەشەی کردوو ناونرا ئەنجومەنی گەورە. ئەرکی ئەم ئەنجومەنە بریتی بوو لە ڕوێژکاری کردن لەگەڵ پاشاو ڕێگری کردنی لەوەی باجی گران بسەپێنێ بەسەر خەڵکی. پادشاش گوێی بۆ دەگرتن بەبێ ئەوەی پەیوەست بێت بە ڕاو ڕاوێژیان. جگە لەمە بانگهێشت کردنیان لەلایەن پادشاوە لە کاتە دیاری کراوەکان بە تێپەرینی کات بووبە شتێکی تقلیدی و، وای لێهات پادشا نەتوانێ دەستبەرداری ئەنجومەن بێت لەهەمبەر پرسە گرنگەکان.

پەیمانی گەورە " مانگاناگارتا"یان- لەساڵی 1215 پێشکەشی شاجۆن کردو بەگوێرەی ئەم گەلاڵە نامەیە 1- دەسەلاتی شاجۆن لە بەڕێوەبردنی دادگا کۆت دەکرێت.2- داڕشتنی یاساو سەپاندنی باجو کۆکردنەوەی بووبە مافی نوێنەرانی گەل لە ئەنجومەنیکی تایبەتیدا. 3- ڕەوایی بوونی شۆڕشکردن لەدژی پاشایەکی ستەم کار. دوابەدوای ئەوە ئەنجومەن لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بۆ چاوگێڕانەوە بەسەر پیادەکردنی ماددەکانی مانگاناگارتا کۆدەبوویەوە. لەکۆبوونەوەکانی پەرلەمانی ساڵی 1254و 1258 پادشا ناچار بوو ڕێگە بدات هەر هەرێمێك دوو نوێنەر لەسوارەکان بنێرێت، هەروەها پەرلەمان دوای لە پاشاکرد کە ئەنجومەنێکی هەمیشەیی لە پەرلەمان هەڵبژێرێ بۆ بەڕێوەبردنی دامو دەزگای حکومەتو چاکسازی کردنی پێویست تیایدا. ئەو پەرلەمانەی لەساڵی 1295 کۆدەبوویەوە لەسەر شێوازی ئەنجومەنی چینەکانی فەرەنسا بوو کە پێکهاتبوو لەسێ هۆڵ. پاش

تێپەڕینی ماوەیەك بەسەر ئەم مێژووە پەرلەمان لەسەر ئەم شێوازە کۆدەبوویەوە. بەلام لەگەل داهاتنی سەدەی چواردە پەرلەمان ڕووەو سیستەمی دوو ئەنجومەنی گەشەی کرد. ئەمەش بە کۆبوونەوەی پیاوە ئاینیە گەورەکان لەگەل لۆردەکان بەبێ پیاوە ئاینیە بچوکەکان، واتا ئەنجومەنی لۆرداتە دینیو دنیاییەکان، ( ئەنجومەنی لۆردات) هەروەك سوارەکانی هەرێمەکانو نوێنەرانی دانیشتوانی شارەو نوێنەری پیاوەئاینیە بچوکەکان کۆبوونەوە بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی گشتی.

ئەنجومەنی گشتی لەماوەی سەدەی چواردەدا توانی بەربژاری زۆر بەدەستبێنێ. وەك :1- نەدەبوو دەنگ بدرێ لەسەر بووجە"میزانیە" ی دەولەت تا دواین دانیشتنی ئەنجومەنی گشتی، ئەمەش لەدوای جێبەجێ کردنی دواکاریەکانی ئەنجومەنی گشتی لەلایەن پاشاوە. 2- پێویستکرا لەسەرحکومەت کە لیستی حیسابات پێشکەشی پەرلەمان بکات بۆ زانینی داهاتو تێچونو خەرجی. 3-هیچ ماددەیەك هەلناوەشێتەوەو ڕەت ناکرێتەوە کە پەرلەمان ڕەزامەندی لەسەر دەربڕیبێ تەنها بەرەزامەندی ئەنجومەنی گشتی نەبێت. 1-پێویستکرا پەرلەمان ڕەزامەندبێت لەسەر دامەزراندنی وەزیرانی پاشا بۆ چاودێری کردنی ئەو خالانە. 5- ئەگەر هاتو پاشا ڕەزامەند نەبوو لەسەر سنوردار کردنو دیاری کردنی دەسەلاتی بەم شێوەیەی باس کرا، پێویست بوو لەسەر پاشا لەسەر تەخت بێتە خوار[1].

---

Monroe, D. The Middle Ages (new York, 1928) pp. 425- 426. 1

پێدانی خەرجی بە پاشا بە شێوەی باجی ڕاستەوخۆ ببوو بە کاری پەرلەمان. ئەنجومەنی گشتی پێداویستی پاشای بۆ خەرجی، کردە چەکێك بۆ دەستکەوتنی بەربژاری. لەمەوە دارشتنی یاساو دەرکردنی فەرمانبەری گەندەڵ بوو بە مافی ئەوان. یاسای پەرلەمانی بە شێوەی لیستە (لائیحە) لە سەدەی پازدە شوێنی یاسادانانی گرتەوە بەشێوەی (عریچە ). بەم شێوەیە پەرلەمان توانی بالادەستبێ بەسەر دامودەزگای حوکم لە ئینگلترا.

**فەرەنسا:-**

لە ساڵی 987 ز ئەو کاتەی کە "هیوکاپی" هاتە سەرتەخت، فەرەنسا بریتی بوو لە پاریس‌و دەوروبەری. یەککرتنی فەرەنسا بەچاوپۆشین لە گەشەسەندنە مێژوویەکان‌و لەناوبردنی جەنگو پیلان گێڕی دەرەبەگەکان، پێنج سەدەی خایاند. هەریەکە لە"فلیپ ئۆغستس، لۆیسی نۆهەم، فلیپی چوارەم" لەپاشایە مەزنەکان بوون کەڕۆڵی سەرەکیان بینی لە بەهێز کردنی فەرەنسا لە سەدەکانی یازدەو دوازدەو سەرەتاکانی سەدەی چواردە. بەمردنی لۆیسی چوارەم لە ساڵی 1314 بارودۆخ گۆڕنکاری بەسەرداهات. ئەم گۆڕنکاریەش شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، کاتێك بەشێوەیەکی سەیر هەرسێ کوڕی لۆیسی چواەرم {لۆیسی دەیەم ، فلیپی پێنجەم ، چارلسی چوارەم } یەك لەدوای یەك مردن. ئەمەش وای کرد کەهیچ کەسێ نەبێ جێگەی فلیپی چوارەم بگرێتەوە، لەبەرئەوە تەختی فەرەنسا گوازرایەوە بۆ "فلیپ ڤالوا"ی- کوڕی برای لۆیسی چوارەم.

ئیتر ئەمە بەس بوو بۆ هەڵگیرسانی جەنگ لەنێوان فەرەنساو ئینگلترا، چونکە "ئیدواردی سێیەم"ی پاشای ئینگلترا خۆی بە شایەنتر دەزانی بۆ تەختی فەرەنسی، وەك لەڤالوا. چونکە خۆی کوڕی ئیزابێللای کچی فلیپی چوارەم بوو. لێرەوە جەنگی سەد ساڵە هەڵگیرسا. هەرچەند کە یاسای فەرەنسی ڕێگر بوو لە گواستنەوەی تەخت بۆ ڕەگەزی مێینە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئیدوارد کەوتە جەنگ لەگەڵ فەرەنساو توانی دەست بگرێ بەسەر زەویەکی زۆری فەرەنسا. بەم شێوەیە نزیکەی یەك سەدە ململانێ بەشێوە پچڕپچڕ بەردەوام بوو. ژاندارکی کچە دێهاتی فەرەنسی توانی گیانی نەتەوەیی‌و هەستی نیشتمانی بخاتە گەڕ لەناو دەرونی فەرەنسییەکان. لە ساڵی1429 جاندارك داوای لە چارلسی حەوتەم کرد کە سەرپەرشتی سوپایەك بکات بۆ شکاندنی ئەڵقەی گەمارۆی ئینگلتلرا لە سەرشاری ئۆرلیان. ژاندارك بەسایەی ئازایەتی خۆی توانی سەرپەرشتی سوپای فەرەنسی بکات وجۆش‌و خرۆشیان تیا دابگیرسێنێ‌و بیانگەیەنێتە سەرکەوتن، بەڵام لەکۆتایدا جاندارك کەوتە ژێردەستی بۆرگەندیەکان‌و لەوانیشەوە کەوتە دەستی ئینگلیزەکان. ئەمانیش بەو پەڕی بێ ڕەحمانە لە ساڵی 1431 سوتاندیان. بەم شێوەیەجاندارك باجی ئازایەتی خۆی دا. سەرکەوتنی فەرەنسیەکان لە پاش ئەمە هەر بەردەوام بوو، تا ئەوەی ئینگلیزەکانیان بەتەواوی لە وڵات دەرپەڕاند. لە کۆتایی جەنگەکە لە ساڵی 1453ڕێککەوتننامە بەسترا لە نێوان هەردوو لایەنی شەڕکەر، بەبێ ئەوەی

چارلس لەکاتی ڕێکەوتنەکەدا گوێی لە هاواری جاندارك بووبێ، یان بەرگری لێبکات.

هەرچۆنێك بێت دەسکەتکەوتەکانی چارلس گەورە بوون، چونکە توانی کۆتایی بەجەنگی سەدساڵە بهێنێ‌و سوپا ڕێکبخات‌و خۆی باڵا دەست بکات بەسەر خانەدانەکان‌و پێشگیریان لێبکات لە دروستکردنی قەڵا، هەروەها ڕێگر بوو لەبەردەمیان لەوەی جارێکی تر بتوانن دەست بگرن بەسەر چەند دەڤەرێك‌و بیکەن بە ناوچەی دەرەبەگی. هەروەها باجی دەرەبەگی دیاریکردو سەروەری یاساو دەستوری حکومەتی چەسپاند وجێگەی دەستورە دەرەبەگیانی پێگرتەوە.هەروەك توانی خانەدانان بچوك بکاتەوەو بیانهێنێتە کۆشکی پاشایی لە ئیش‌و کاری حکومەتدا بیانخاتە کار، بەشێوەیەکیش هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردن، وەك هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ فەرمان بەران، نەوەکو هی پلەوپایەی خانەدان. بەڕاستی یەکانگیربونی دەوڵەمەندو خانەدانە بچوکەکان لەگەڵ پاشا، کاریگەری گەورەی هەبوو لە بوژاندنەوەی پاشایەتی فەرەنسا. جەنگی سەد ساڵە هۆکارێ بوو بۆ خراپ بونی بارودۆخی دارایی خانەدانان. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە چیتر نەتوانن لەسەر خەرجی خۆیان جەنگ ئەنجام بدەن، هەر ئەمەش وای کرد پشتگیری پاشا بکەن. بەلام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە گەورەخانەدانەکان‌و میری هەرێمەکان بوبن بەدارێك بەدەستی پاشاوە[1].

---

op.cit; pp. 140-160.،Wiley 1

دوای هەمووئەمانــە چـارلس لەسـاڵی 1461ز لــەدنیا دەرچــوو. بــەڵام هەرچـۆنێك بێـت وڵاتەكـەی دوای ئـەو وێرانكاریـە كـە توشــی هـات بـەهۆی جەنگــەوە، تــوانرا لــەڕوی ئابووریــەوە ببوژێنرێتــەوە. وەلێ حكومەتەكــەی هــەرلاواز بــوو، جـا ئــەوەی كەوتــە سەرشــانی كوڕەكــەی تــەواو كردنــی دەسكەوتەكانی باوكی بوو.

"لۆیسی یازدەم" كە كـوڕی چارلـسی حەوتـەم بـوو، لـە سـاڵی (1461-1483) دەســەڵات داربــوو. ئــەم یــەكێ بــوو لــە بــەناوبانگترین پاشــاكانی بنەماڵەی ڤالواو شوێن پێیەكی گرنگی جـێ هێـشت لـە فـەرمانڕەوایی كردنـی وڵاتەكەیدا. لۆیسی یازدە بـەهۆی ئـەوەی كـە توشــی نەخۆشــی پێـست هـات سەروسیمایەكی نامۆی بۆ ساز بوو، بەشێوەیەك هیچ سەرنج ڕاكێشیەكی تێدا نــەما. لــۆیس كەســێكی ترســنۆك نــەبوو، بــەلام هەمیــشە دڕدۆنــگ بــوو، بەشێوەیەك لە نزیكترین كەسی خۆیشی بەد گومان بوو. لـۆیس كەسـێكی دڵ ڕەق‌و بێ بەزەیی بوو، خــۆی‌و دەســت‌و پێوەنـدەكانی زۆر مانـدوكرد بـەهۆی كـاری بـەردەوام وگەشـتكردنی دوورەدەسـت بـەناو وڵاتەكەیـدا. لەگـەڵ ئـەو زیتەڵیەی كەهەیبوو كەچی ببو بەقوربانی وەهم‌و خەیاڵە پوچـەكانی. لۆیسی یــازدە سیاســەتی میكــاڤیللی جێبــەجێ دەكــرد پــێش نوســینی كتێبــە سیاسیەكەی میكاڤیلی بە پەنجا ساڵ. لەگەڵ ئـەوەی كـە ڕاسـتی نەدەناسـی بەلام هەستی بە ئەركی سەرشانی خۆی دەكـردو بەپێویـستیەكانی فەرەنـسا زانـا بـوو. بەڕسـتی شـایەكی بـەتوانا بـوو، بـواری بازرگـانی كـردن گەیـشتە شكۆفەی جوانی‌و هێمنی‌و ئاسیشی ئەو ناوبانگی پەیدا كرد.

سیاسەتی لۆیس لەسەر سێ خاڵ خۆی داکوتابوو کە ئەمانەن :ـ

1ـ ڕوخاندنی دۆقیەی بۆرگەندیاو بالآدەست کردنی فەرەنسا بە سەریدا.

2– لەناو بردنی ئەو دەسەلآتە ناوچەییانەی کە تا ئەوکاتە مابوونەوە.

3ـ کۆتایی هێنان بە خۆ هەڵقورتاندنی ئینگلترا لەکاروباری فەرەنسا .

بۆ هەموو ئەمانەش توانی سەرکەوتن بەدەستبێنێ .

لەبابەت خاڵی یەکەم دەتوانین بڵێین:ـ فلیپ میری بۆرگەندیا بوو، بەلآم نەك هەر میرێکی ئاسایی، بەڵکو گەورەترین میر بوو، بە شێوەیەك کە هیچی لە فەرمانداری بەریتانیا کەمتر نەبوو. هەڵسوکەوتی دەکرد وەك فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆ. لە باشورو ناوەڕاستی فەرەنساشدا ژمارەیەکی بەرچاو میرو دەرەبەگ هەبوون، وەك "بۆرۆن‌و ئۆرلیان ...هتد". گیروگرفت‌و کێشەی دەرەبەگەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست. پادشاکانی فەرەنسا هەریەك لە کاپی‌و ڤالوا هەولیان دەدا خۆیان ڕزگار بکەن لەدەسەلآتی دەرەبەگ‌و میرنشینەکان، ئەمەش بە فروان کردنی ئەو جێگایانەی کە لەژێر دەستی پاشا بوو، وەجێهێشتنی دەسەلآت ڕاستەوخۆ بۆپاشاو دەست‌و پێوەندەکانی‌و کەم کردنەوەی دەسەلآت لەدام‌و دەزگاکانی ترو خۆدەرخستن بەسیمای گەورەی خانەدانان‌و میران. بەلآم بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجانە پادشا ڕوبەڕووی نەیاریەکی توندی کلێساو دەرەبەگایەتی بویەوە.

کلێسا وەك دامەزراوەیەکی بەهێزی ئەوروپا، لە ململانەیەکی بەردەوام دابوو لەگەڵ پادشاکانی فەرەنسا، چونکە پاشایە فەرەنسیەکان ڕێگربوون لە

دەست تێوەردانی پاپاکان لە دانانی پیاوانی ئاینی فەرەنسی. (واتا پاشاکان خۆیان پیاوانی ئاینی دەستنیشان کەن، نەوەك پاپا لەڕۆماوە دەستنیشانی کات) . هەروەها ڕێگربوون لە ڕۆیشتنی زێری فەرەنسا بۆ کۆشکی پاپای ڕۆما. جا لەبەر ئەمانە ڕیککەوتن هاتە ئارا لە نێوان چارلسی حەوتەمو کلێسا لە ساڵی 1438، بەناوی ڕێککەوتنی"بۆرجز"، بەپێی ئەم پێکهاتنە دەسەلاتی ئەنجومەنی کلێسا بەرزتر دانرا لە پاپا، هەر بەپێی ڕێککەوتنەکە، پاپا چیدی دەستی وەرنەدەدا لەدیاریکردنی پیاوانی ئاینی بۆپۆستەکانی کلێسای فەڕەنسی. هەروەك ڕێگەگیرا لە دوبارە بونەوەی پێداچونەوەی سکالا لەڕۆما، هەروەها ناردنی دارایی بۆ گنجینەی پاپا بە پێی ئارەزووی پاشا دانرا. واتا:"پاپا فەرزی ناکات"، وە ئەگەر نا، وەك بەخشین ڕەوانی دەکات. بەڵام ئەمە بەردەوام نەبوو، چونکە کاتێ پاپا لە کۆنگرەی "فیرارە" سەرکەوت بەسەر ئەنجومەنی پاپا لە ساڵی(1449)، لەتوانادا نەبوو مادەکانی ئەم پێکهاتنە پڕاکتیزە بکات، لویسی پازدەش ڕازی بوو بەڕەفز کردنی مادەکانی پێکهاتنی بۆرجز. پاش ئەمەو لەدوای ئەوەی کە فەڕەنسوای یەکەم لەساڵی(1515)ز. توانی لەجەنگی "مارگینانۆ" سەرکەوێ بەسەر دژە کەیدا، لەگەڵ پاپا لیۆی دەیەم ڕێکەتنێکیان واژۆ کرد، بەپێی ئەمە پێویست دەبوو لەسەر پاپا ڕێگە بدات پادشا پیاوانی ئاینی لەسەر ئەرکەکانیان دابمەزرێنێت. لەبەرامبەردا داهاتی ساڵێکی(ساڵی یەکەمی دامەزراندن)ی، پیاوانی ئاینی بۆ پاپا بێت. بەهۆی ئەم پێکهاتنە کلێساو

دەوڵەتی فەڕەنسی بەشێوەیەك یەكانگیر بوون كە شۆڕشی پڕۆستانتێش نەیتوانی كاری تێبكات.

خانەدانەكان گرێ دەرونیەكی تری پادشا بوو كە زۆر توند تربوو لەكڵێسا بەلای پادشاوە. بەلاّم بەختی پادشا لەوە دابوو كەخانەدانەكان بەهۆی جەنگی "سەدساڵ"ەوە- توشی زیانێكی زۆر سەخت هاتبوون، ئەمەوجگەلە مردنی ژمارەیەكی زۆریان. لەلایەكی تریشەوە بەهۆی تێچونە جەنگیەكان، توانایەكی زۆری ماددیان بەهەدەرچوو. یاخود ئەو كاتەی دەبوون بەدیل بەپارەیەكی زۆر خۆیان دەكڕیەوە. سەرەڕای ئەمانە كەم بونەوەی ڕێژەی دانیشتوانیان بەهۆی جەنگو پەتای تاعون، وای كرد ڕوبەرێكی فراوان لەزەویەكانیان چۆڵ بێتو بەیاربمێنتەوە، ئەمەش كاریگەری خراپی كردە سەر باری ئابوری دەرەبەگەكان. لەگەڵ ئەوەی كەخانەدانە بچوكەكان لەگەڵ پادشا بوون، بەلاّم گەورە خانەدانەكان بەتایبەتی ئەو میرانەی كەدەچونەوە سەر بنەماڵەیەكی پادشایی وەك:"بۆربۆن، ئۆریلیان، ئەنجو" تا ئەو كاتەش دەیانویست سەربەخۆیی بەدەست بهێنن لەهەرێمەكانیانو هەولیان دەداسەربەخۆو بێ نیازبن لەپادشا. بەلاّم چارلسی حەوتەمو لۆیسی یازدە كۆششیان كرد بۆ ڕزگار بوون لەدەسەلاّتیانو كەم كردنەوەی بەربژاریەكانیان. هەروەها ڕزگاركردنی ئەنجومەنی پادشا لەدەسەلاّتی ئەوان ئامانجی سەرەكیان بوو. لۆیسی یازدە ڕێگەی گرت لەخانەدانەكان كە باج بستێنن بەبێ مۆڵەتی خۆی. وای لێهات لۆیس خۆی هەڵدەقورتاند لە دادواری دەرەبەگەكانو دەسەلاّتی دامو دەزگاكانو ئەنجومەنی ناوچەكانی كەم

دەکردەوە. چونکە ئەوان بەرژەوەندیەکانی دەرەبەگەکانیان دەپاراست. ئەنجومەنی چینەکان یەکێ بوو لەودەزگایانەی کەدەسەلاتی پاشای کۆت دەکرد. ئەم ئەنجومەنە شێوە دیموکراتیەك بوو کە لە سێ چینی کۆمەڵگای فەڕنسا پێك دەهات "پیاوانی ئاینی، خانەدانان، چینی گشتی گەل،(چینی سێیەم)". چینی گشتی نەیدەتوانی هەستێ. لەبەر ئەوەی دەنگدان بەگوێرەی ژمارەی تاك نەبوو، بەڵکو بەگوێرەی چینەکان بوو، هەر لەبەرئەوەش زۆر جار چینی خانەدانو پیاوانی ئاینی هاو بڕیار دەبوون لەدژی چینی گشتی گەل، واتا: "ئەو کات دەبوو بە دوو دەنگ بەرانبەر دەنگێك"*. پادشا پشتبەستوبوو بە ئەنجومەنی ڕاوێژکاری پادشایی و، داواکاری ئەنجومەنی چینەکانی کەم کردەوە، لە دوای ئەوەی توانی لە کۆبونەوەی ساڵی 1438 مافی سازکردنی سوپاو کۆکردنەوەی باج بۆ تێچونی سوپا لە ئەنجومەنی چینەکان دەستەبەر بکات. بەڕاستی دەسەلاتی پادشا ڕووی لە بەهێزی کرد، دوای ئەوەی کە ئەنجومەنی چینەکان شکستی خوارد لە گەشەپێدانی ڕژێمی پەرلەمانی نوێنەرایەتی، بەشێوەیەك کەوەك

---

*ئەگەر هاتباو دەنگدان بەگوێرەی کەسەکان بوایە، ئەوا بەهۆی ئەوەی ژمارەی چینی گشتی زیاتر بوو، کارەکان لە بەرژەوەندی چینی گشتی دەڕۆیشتن بەڕێوەو بڕیاریش لە بەرژەوەندی ئەوان دەدرا. بەلام ئەگەر بەگوێرەی چینەکان بوایە، ئەوا چونکە بەرژەوەندی پیاوانی ئاینیو خانەدانان بەیەکەوە بوو، ئەوان بەیەکەوە دەنگیان دەدا. ئیدی دەبوو بە دوو دەنگ بەرامبەر بە یەك دەنگ واتا" دەنگی دوو چین بەرامبەر یەك چین". دیارە ئەمەش لە بەرژەوەندی ئەوانە. (وەرگێڕ).

ئینگلتەڕا بتوانێ دەسەلآت بسەپێنێ بەسەر پادشا. سەرەڕای ئەنجومەنی تایبەتی هەرێمەکان، هەبونی چەندین ئەنجومەنی تر لە هەریەکە لە هەرێمەکان هۆکاری یەکەم بوو بۆ ئەم شکستەی کە ئەنجومەن خواردی. چونکە پادشا خۆی دنەی ئەم ئەنجومەنە ناوچایانەی دەداو هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەریەکەیان دەکرد وەك ئەنجومەنێکی تایبەتی، لەبری ئەوەی هەمویان لەگەڵ یەك کۆبکاتەوەو وەك یەك ئەنجومەن سەیریان بکات. بەهۆی ئەوەش کە خانەدانەکان لە باج دان بەخشرا بوون، ناوەندی ئەنجومەن لاوازی تێکەوت. چونکە خانەدانەکان بەپێویستیان نەدەزانی جەخت بکەنەوە لەسەر بەستنی کۆبونەوەی ئەنجومەنی چینەکان بۆپرسی سەرپاندنی باجو کۆکردنەوەی. بەهۆی ئەوەی باجیان نەدەدا، هەر لەبەرئەوەش(گوێیان پێنەدەدا). جا لەبەرئەوهۆیانەی کەباسمان کردن، خانەدانەکان بالآدەستی خۆیان لەسەر گەنجینەکان لەدەستدا، بەرامبەر بەمەش دەسەلآتی پادشایی دای لە زیادی. ئەنجومەنی چینەکان نەیتوانی پیادەی دەسەلآتی دادوەری بکات، وەك ئەوەی لەئیگلتڕا، کەئەنجومەنی لۆردات دەسەلآتی بالآی دادوەری بوو لە ولآت.

لۆیسی یازدە بەکەم کردنەوەی هاوردە، توانی پیشەسازی ولآتەکەی گەشەپێبداتو دنەی پیشەسازی نیشتیمانی وەك: ئاوریشم بدات لە لیۆن. هەروەها توانی پەرە بدات بە بەندەری "مارسیلیاو شیربرگو لی هافر".

لۆیسی یازدە لەدوای کوژرانی چارلسی چاپوك توانی دۆقیەی بۆرگەندیا بخاتە پاڵ ولآتەکەی. لە خۆرئاواو باشوری خۆرئاوای فەرەنساش ئانجو

وپرۆفنسی خستە سەر ولاّتەکەی. بەمانەش سنوری ولاّتەکەی لەباشورەوە گەیشتە شاخەکانی برانس[1].

لەسەردەمی چارلسی هەشتەم 1483–1498، بەهۆی ئەوەی چارلس هاوسەرگیری لەگەڵ خانمی بریتانی ئەنجامدا، ئەم هەرێمە هاتەوە سەر فەڕەنسا، بەهۆی ئەمەوە یەکیەتی نیشتیمانی فەڕەنسی بەتەواوی هاتەدی.

دامەزراوە سیاسیەکانی فەرەنسا بەرە بەرە گەشەی سەند، سەرەڕای هەبوونی نەریتە ناوچەگەریەکان لەسەر خاکی فەرەنسا، هەر ئەمەش وایکرد یەکگرتنی فەرەنسا ماوەیەکی درێژبخایەنێ. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرجەم ناوچەکانی فەرەنسا خەڵکی پاشایان بە سەرچەشمەی سەرەکی یاساو هێمنیو ئاسایشو پیادەکردنی دادگەری دەزانی. هەموو ئەمانەی کە باسمان کرد هۆکاربوون بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی نەتەوەیی، کە خاوەنی سوپاو دراوێکی سەرتاپاگیرو ئەنجومەنی چینەکان بوو. وەلێ ئەنجومەن گەشەی نەکردو توانای هیچی نەبوو.

فەرەنسای ئەو کات هیچ دەستەبەریەکی(چمنانەت)نوسراوی نەبوو، وەك ئەوەی کە لە ئینگلتراهەبوو بەناوی (المانگا ناگارتا). هەروەها خەڵکی فەرەنسا بەژداریەکی کردەیی نەبوو لەحوکمەتەکەیدا. لەدوای ئەوەی فەرەنسا بوو بە دەوڵتێکی یەکگرتوو، ئەوەندەی نەبرد دەستیکرد بە فراوان خوازی کردن لە دەوروبەری خۆی. چارلسی هەشتەم داوای تەختی ناپۆلی دەکردو لەساڵی 1494سەرپەرشتی سوپایەکی کردو هەڵمەتی کردە سەر

. Ibid;pp.232-45 1

ئیتاڵیا، بەمەش دەرگەی ململانێیەکی خوێناوی بۆماوەی چەند سەدەیەك کرایەوە. لەگەڵ ئەوەی چارلس لە ساڵی 1498 گەڕایەوە، بەلام لویسی دوانزە لە ساڵی(1498–1515) بەردەوامی دا بە سیاسەتی باوکیو داوای تەختی نیشتمانی ناپولیو میلانۆی کرد، وەلێ لە ساڵی 1504 ناچار بوو واز لە ناپولی بێنێ بۆ فردیناندی ئیسپانی.

هەرچۆنێك بێت فەرەنسا لەساڵی1500دەوڵەتێکی نەتەوەیی بوو،خاوەنیزمانو وێژەی نەتەوەییو حکومەتێکی ناوەندی بەهێز بوو،گەلی فەرەنسا فەرمانبەری پاشایان دەکردو بە هێمای نیشتمانیو نەتەوەیی خۆیان دەزانی.

**ئیسپانیا:-**

بە لاوازبوونی دەوڵەتی ئەندەلوس لەسەدەی یازدە، سەرەتای مێژووی تازەی ئیسپانیا دەست پێدەکات. میرنشینە مەسیحیەکان بەرەو هەماهەنگی دەڕۆیشتنو بە خۆپارێزیەکی وردەوە دەرفەتی ململانێکانی ناوخۆی ئەندەلوسیان دەقۆستەوەو بەرەو باشور ملیان دەنا.

ئەوەندەی نەبرد لە سەدەی یازدەدا میرنشینەکان دەستیان بەسەر شاری تولیدو ناوەڕاستی ئیسپانیادا گرت. پاشان لە سەدەی سێزدە دەسەلاتیان نواند بەسەر ئیشبیلیەو ئەندەلوسدا. قشتالەش لەژێر چنگی میرە مەسیحیەکان دابوو، میرانێك هەرکات بەرەو باشوردەکشان زۆربەی دانیشتوانە مسوڵمانەکان شارەکانیان چۆڵ دەکرد لە ترسی ئەم میرانە. بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار چوار میرنشینی مەسیحی هاتنە سەر شانۆی ڕوداوەکان،

ئەوانیش بریتی بوون لە:ـ (قشتالە، بەرشەلۆنە، ئەراگۆن، لیۆن). بەرشەلۆنەو ئەراگۆن کە دوو میرنشینی مەسیحی بوون، لەسەدەی دوازدەی زاینی یەکیان گرتو سەدەیەك دواتریش قشتالەو لیۆن بوون بەیەك. لە پاش ئەمانە، سەرجەم هەرێمەکان لە ژێربەیداغی دوو دەسەلآت خۆیان بینیەوە[1].

پاشاکانی قشتالە لاوازبوونو داهاتیان کەم بوو، لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵیان دەدا سنورێك دابنێن بۆ دەسەلآتی خانەدانەکان. ئەم لاوازییەی کە ئێمە ئاماژەمان پێدا لەسەدەی پازدەی زاینیو لەخودی "شا جۆنی دووەم"(1406-1454)و "هنری چوارەمی" کوڕی دەرکەوت، کە لە ساڵی(1454-1474) لەسەر تەخت بوو. لەم سەردەمەشدا جەنگی ناوخۆییو ئاشوب قشتاڵەی داگرتبوو، هەر لەبەرئەوەش فەرمانڕەواکانیان بۆ دەستخستنی پشتگیری هەڵدەستان بە بەخشینی زەویو پۆستو پلە وپایە. بەمەش زۆربەی زەویە بە پیتەکان کە سەرچاوەی بژێوی دەوڵەت بوون کەوتە دەستی گەورەخانەدانەکان. ئەم لاوازییەی کە حکومەت لە ڕووی ئابووریو سیاسیەوە تێیکەوتبوو، وای کرد دەولەت ببێتە دەوڵەتێکی لامەرکەزی، کەخانەدانان تیایدا بەهێزبوونو وایانلێهات هیچ پێویستیان بە مۆڵەتی پاشا نەبێ بۆ دامەزراندنی سوپاو ڕەتکردنەوەی باجەکانو جێبەجێ کردنی ئەرکەکان. شارانێکی زۆر بەربژاری وئازادیان بەدەست هێنا، چونکە

---

op.cit;PP.59-65،-Green 1

شارە چۆڵەکان ئەگەر بەربژاری فراوانیان پێ نەبەخشرابوایە لە بەڕێوەبردنی شارەکانیان‌و دەستگرتن بەسەر دێهاتەکانی دەوروبەری، مەسیحیەکان تێیدا نیشتەجێ نەدەبوون. بەسای ئەوەوە چەند شارێك لە قشتالە بەهرەمەند بوون‌و توانیان بەڕێوەبردنی شارەکانیان سەربەخۆ بکەن‌و ئەنجومەنی نوێنەران دابمەزرێنن بەناوی "کورێنز یان پەرلەمان". لە ڕۆژگاری پادشا لاوازەکان لەسەدەکانی سێزدەو چواردەدا، چەند هاوپەیمانیەتیەك بەناوی"هیرمنداد" واتا: "دەستەی برایان" لەنێوان شارەکان سازبوو. وەلێ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پادشاکان دەیانتوانی یاساکانیان بخەنە کارو باجەکانیان بسەپێنن، لەناو باجەکانیشدا ئەو باجەی کە لەسەر بازرگانی دانرابووبەناوی(کبالە).

میرنشینی ئەراگۆن بەگوێرەی هەڵکەوتە جوگرافیەکەی کە کەوتبوە سەر کەناری خۆرهەلاتی ئیسپانیا لەسەر دەریای ناوەڕاست، دەستی گرت بەسەر هەرێمەکانی باکوری خۆرهەلات. لەم نیوانەو لەسەدەی سێزدە دەستیگرت بەسەر "بالنسیە"و دوورگەی "بالیار". میرنشینی ئەراگۆن بە هاوکاری کاتلۆنیا کە دەکەوتە باکوری خۆی، توانی لە ڕووی بازرگانی‌و سەربازییەوە لە دەریای ناوەڕاستدا فراوانخوازی بکات. موسڵمانەکان لە ئەڕاگۆندا مانەوەو وەکو براکانیان لە قشتالە جێگەو مەنزڵی خۆیان جێ نەهێشت، بەمەش ژمارەی خەڵکی ئەراگۆن دای لەزیادی‌و بازرگانیەکەی لەگەڵ کەنارەکانی

دەریای ئەدریاتیكو ئەستەمبوڵو ئەسكەندەرییەو باكوری ئەفریقا قازانجی تێكەوت.

خانەدانەكان توانیان بەربژاری گەورە لە پاشای ئەڕاگۆن بەدەست بهێنن، لەوانە:

1- ئەركی سەربازی لە دەرەوەی وولاتەكانیان هەڵبگیرێ لەسەرگەورە خانەدانەكان.

2-كۆبوونەوەی ساڵانەی "كۆرتیز" كرایە ئەركو بەپێویست دانرا هەموو چینەكان نوێنەریان تیایدا هەبێت.3- تەنها لەڕێگەی ئەنجومەنی خانەدانانەوە، مافە دەرەبەگیەكان ڕەت بكرێنەوە. پادشا لەسەر هەموو ئەمانە ڕەزامەندی نواند. بەڵام لە كۆتاییدا لەئەنجامی ململانێی نێوان پادشاو گەورە خانەدانەكان بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەنجومەنی دادوەری باڵا لەسەدەی چواردە، ئەو بەربژاریانە هەڵوەشانەوە. شیاوی باسە ئەم ئەنجومەنە لەبەرژەوەندی پادشا، چاوی دەخشاندەوە بەسەر پەیمانەكانی پادشا.

لەساڵی 1410، مارتنی یەكەم كۆچی دوایی كرد، بەمەش بنەماڵەی ئەڕاگۆن كۆتایی پێهات، چونكە لەدوای "مارتن" كەسێك نەبوو جێگەی بگرێتەوە. بەهۆی ئەمەوە ئەڕاگۆنیەكان "فردیناندی كوڕی جۆنی یەكەم"ی پادشای قشتالەیان هەڵبژارد. لەدوای ئەویش كوڕەكەی خۆی "فونزوی پێنجەم" هاتەسەر دەسەلات لە 1416 تاوەكو 1458.

"جۆنی دووەم"ی پاشای ئەراگۆن، یەكێ لەكارەكانی بەئەنجام گەیاندنی هاوسەرگیری بوو لەنێوان ئیزابێلاو فردیناندی كوڕی. هنری چوارەم كە

پاشـــای قـــشتالە بـــوو لـــە ســـالانی(1458-1474)ز ئـــارەزووی دەکـــرد "فونزو"ی برای جێگەی بگرێتـەوە. بـەلام بـە پێچەوانەی ئارەزووی هنـری، لەسـالی 1468 "فـونزو" بـەرەو پـیری مـەرگ چـوو، ئیـدی لـەدوای ئـەوە "هنری" بڕیاریدا "ئیـزابێلای خوشکی فـونزو" بکاتـە جێنـشین لـە قـشتالە. بەلام خانەدانان لە ترسی یەکگرتنی ولات بەربـەرەکانی ئـەم بڕیارەیـان کـرد. "جـۆنی دووەم" دەیزانـی کـە "هنـری" پادشـای قـشتالە ڕازی نییـە بـە هاوســەرگیری نێــوان "ئیــزابێلاو فردینانــد"، بۆیــە هەســتا بــە کێــشانی نەخشەیەك، بەگوێرەی نەخشەکە، لـە دوای تـەواوبوونی بـووك گواسـتنەوە، ئیـزابێلا بـەنهێنیو بـە بـەرگێکی نەناسـراو بگەیەنرێتـە شـاری (بلوتولیـد). لەمەشدا سـەرکەوتن بەدەسـت دێنـێ. هنـری لـە سـالی 1474ز کۆتـایی بـە ژیانی هـات، بەمـەش "ئیـزابێلا" خـۆی وەك پاشـای قـشتالە ناسـاندو تـوانی سەربکەوێ بەسەر شالاوی پرتوغالی، کە کردبوویانـە سـەر قـشتالە بەمەسـتی داگیرکردنی.

"جۆنی دووەم " لە کانونی دووەمـی سـالی 1479ز کۆچـی دوایـی کـردو فردیناندی کوڕی جێگـەی گرتـەوەو بوویەپاشـای ئـەراگۆن. فردینانـد پێـشتر هاوکاری خێزانەکەی" ئیزابیلا"ی دەکرد بۆ دەرکردنی پرتوگالیەکان.

لەڕاستیدا یەکانگیر بوونی پادشایی، بـەمانای یـەکگرتنی ئیسپانیا نـەبوو، بەلکو لەڕاستیدا هەر دەسەلاتدارەو فەرمانڕەوایی سەرزەمینی خـۆی دەکـرد، فردیناند لە ئەراگۆنو ئیزابێلا لە قشتالە. ڕەنگیشە قشتالە بوونی فردیناند لە ڕووی ڕەچـەلەکەوە، کاریگـەری زۆری هـەبووبێت لەسـەریەکانگیری وولات.

فردیناند چونکە هەستی دەکرد کە خەڵکی قشتالەیە. شۆڕشی کاتلۆنیاش ئەم هەستەی زیاتر کرد، کاتێ وای لێکرد داوای تەختی قشتاڵە بکاتو کێبڕکێ لەگەڵ ئیزابێلا بکات بۆ سەرکورسی لەدوای مردنی هنری لە ساڵی 1474. بەڵام کاتێ داواکەی ڕەت کرایەوە، فردیناند ئەم حەزەی پشتگوێ خست.

قشتاڵە هەرێمێکی سەرەکیو فراوان بوو، وە لەگەڵ ئەراگۆندا یەکگرتنێکی شلوشۆقیان سازدابوو. هەردوو هەرێمەکە دامەزراوە سیاسیو یاساو سیستەمی دادوەریو بواری داراییو هێزی سەربازی خۆی دەپاراستو سەربەخۆی دەکرد لە ئەوەی تر. ئەمەش شتێکی سەیر نەبوو، چونکە لە پێشدا فردیناند بەڵێنی بەئیزابێلا دابوو کەخۆی لە کاروباری قشتاڵە هەڵنەقورتێنێ. ئیزابێلا خۆی کاروباری قەڵەمڕەوی خۆی دەبرد بەڕێوە. بەڵام پرسە گرنگو فەرمانەکان، لەلایەن هەردوولایەنەوە ڕەزامەندیان لەسەر دەردەبردڕا.

ئیزابێلا کەسێکی بەتواناو دیندار بوو. لە کاتێکدا فردیناند فێڵاویو چروك بوو، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا هاوکارێکی چاكو دڵسۆزی خێزانەکەی ئیزابێلا بوو، گوێڕیەڵیو خۆشەویستی لەنێوانیاندا بوو. هەردوولایان لەپێش چوونە سەردەسەلات توانستو زانستی بەڕێوەبردنی وولاتیان هەبوو، سیاسیو بەتوانا بوون. بەڵام لەگەڵ ئەم خاڵە ئەکتیڤانەی کە هەیانبو، وەلێ نەیانتوانی دەسەلاتێکی یەکگرتووی ناوەندی بەهێز دابمەزرێنن، بە هۆی هەبوونی دەسەلاتی بەهێزی دەرەبەگایەتیو داهاتی کەمو جیاوازی یاساو داب

ونــەریتی هــەردوو هــەرێم.شـیاوی باســە هــەردوولایان زۆر تونـدو تیـژبوون لەبەرامبەر مسوڵمانو جولەکەکان.

ئیـزابێلا بـە لـەناوبردنی تاوانکـارو ڕێگرانـی وولآت، یاســاو سیـستەمی گێڕایەوە ولآت. سەرکزکردنی خانـەدانان، کـاری هـەرە گـرنگ بـوو لەهەمبـەر ئیزابێلا، کە ئیسپانیا ڕوبەڕی بویەوە. چونکە خانەدانان دەسەلآتی بـەهێزیان هەبوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەی لەڕۆژگاری جۆنی دووەمـی پاشـای ئـەراگۆنو هنـری چـوارەمی پاشـای قـشتاڵە، هـەلی باشـیان بـۆ ڕخـسا بـۆ بـەهێزکردنی دەســەلآتیانو وەرگرتنــی بەربــژاری لەهەریەکــە لــەم دووپاشــایە لاوازە. فردیناندو ئیزابێلا دوژمنی سەرسەختی خانـەدانان بـوونو بـۆ لـە باربردنیـان درێغیان نەدەکرد، ئیدی بەرەبەرە کەوتنە لاوازکردنی خانەدانان. لـە میانـەی ئەو هەولآنەی کە بۆ ئەم مەبەستە خستیانە گەڕ، دەرکردنی فەرمانێك بوو کە بەپێی ئەم فرمانە پێویست بوو قەلآی خانـەدانان تێکبـدرێو بەربژاریـەکانیان هەڵبوەشــێتەوەو لەسەرپۆســتەکانیان لادرێــن. وە لەســاڵی 1480 کورتیز(پەرلـەمان)ی قـشتالە دەسـتورێکی دەرکـرد لەلایـەن پاشـاوەو تیایـدا داوای دەکرد سەرجەم زەویەکان ببنەوە هی پاشاو جەنگی نێـوان خانـەدانان بەری پێبگیرێو چیتر ڕێگەیان پێنەدرێ قەلآ بنیـات بنـێن. ئـەم دەسـەلآتەی خانەدانان هـەیانبوو بۆپادشـا سەرئێـشە بـوو، ئـەم دەسـەلآت داریـە بـەهۆی سوارەکانەوەبوو کـە هـەردەم وەك هێزێکـی سـەربازی لەخزمـەتیان دابـوونو خزمەتکردنیشیان بۆخانەدان لەدژایەتی پادشا خـۆی دەبینیـەوە. بـەلآم ئـەم ڕەوشە هەروا بەردەوام نەبوو، بەڵکو لەساڵی 1523ز پاپا فرمـانی دەرکـردو

بەپێی فرمانەکەی دامەزراوەی سوارەکان دەبوونەوە هی پادشا. بەمەش پادشای ئیسپانی بووە خاوەنی دەسەڵاتو سامانێکی فراوان لەماڵو لەزەوی. لێرەشەوە بەهێز بوون بە هێزێکی کاریگەر.

پادشا دەیویست خۆی بسەپێنێ بەسەر خانەدانو نینۆکەکانیان بقرتێنێو بۆ دەسەڵاتی خۆی سەرکزیان بکات. بەڵام بەوریاییەوە کاری دەکردو نەیدەویست وەك چینێکی تەواو لە ناویان بەرێ، بەڵکو بەرەبەرە پەلکێشی دەکردن بۆ کۆشکی پادشاو پۆستی ڕەمزیو لاوازی پێ دەبەخشین، لە بری ئەمانە چینی خوێندەوارو دەرچوانی زانکۆی دەخستە کارو کارگێڕی حکومەتی دەخستە سەرشانی ئەوان. لە گرنگترین ئەو چاکسازیانەی کە فردیناندو ئیزابێلا بۆ ئیسپانیا کردیانو شوێنەواری ئەکتیڤی بەجێهێشت، بریتی بوو لە ڕێکخستنی دامو دەزگای حکومەت.

هەریەکە لە هەرێمەکانی ئیسپانیا پەرلەمانێکی هەبوو لەسەرشێوەی پەرلەمانی ئینگلیزیو پێی دەوترا کورتیز. کورتیزی قشتاڵە لەسەروی هەموویانەوەبوو لە هەموویان گرنگتربوو. فردیناندو ئیزابێلا بۆ زاڵبوون بەسەرخانەدانان ولەباربردنی دەسەڵاتیان، کورتزیان خستەکار. جا کاتێ ئەم کارەیان تەواوکرد، کورتیز گرنگیەکەی لەدەستدا. پادشا کورتیزی فەرامۆش کردو هیچ کاتێ بانگهێشتی نەدەکرد، خۆ ئەگەر بانگهێشتیشی بکردبا، ئەوا بۆ ڕایی کردنی کارەکانی خۆی بوو، یان بۆ ئامادە کردنی خەرجی پێویست بوو، یاخود بۆ ڕەزامەندی نواندن بوو بۆئەو کەسەی کەجێگەی پادشا دەگرێتەوە لە دوای مردنی پادشا. لەگەڵ ئەوەی ئەرکی کورتیز پێشکەش

کردنی سکالآکان بوو بۆپادشا، کەچی بەرەبەرە خاسیەتی نوێنەرایەتی لە دەستدا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کورتیز بە ڕێکخستنێکی ڕێكو تازە بەردەوامی دابەخۆی ودەسەلآتێکی بەڕێوە بردنی دادوەری‌و یاسادانانی بەرفراوانی بەدەست وەگرتو بەرەبەرە خانەدانانی لە دانیشتنەکانی دوورخستەوە. لەساڵی 1494 پەرلەمانی ئەراگۆن لەسەر شێوازی کۆرتیزی قشتاڵە داندرایەوەو وردەوردە کۆبوونەوەکانی کەم بوویەوەو ئەندامەکانی تەنها لەنوێنەرانی شارەکان کورتکرایەوە.

"فردیناندو ئیزابێلا" توانیان فەرمانڕەوایی بکەن بەسەر ئیسپانیادا، لەئەنجامی هەرەسهێنانی هەژمونی خانەدانانو نەمانی سەربەخۆیی ئەنجومەنە شارەوانیەکانیان، وە لەڕێگەی نوێنەری حکومەت کە لەڕاستیدا ملکەچی پاشا بوون. پادشا دوو نوێنەری لەسەر هەمان شێواز، لەئەنجومەنی شارەوانی بۆ هەر شارێکی هەرێمی قشتاڵەدیاری کرد. ئەمەش لە دوای ساڵی 1480 کە وەك نوێنەری دەسەلآتی مەرکەزی کاریان دەکردو چاودێری بزاوتن وجموجۆڵی خانەدانانیان دەکرد.

پاپا"سکستسی چوارەم" لەساڵی1482، بالآدەستی ئاینی بەهەردووکیا بەخشی ومافی ئەوەی پێدان کە دەسەلآت بنوێنن بەسەر کلێساکانی ئیسپانیاداو خۆیان پیاوانی ئاینی لە پۆستە ئاینیەکان دامەزرێنن، لەبەرامبەر ئەوەشدا فردیناندو ئیزابێلا ئامادەبوون هاودەستی پاپا بکەن لەوسیاسەتە سەرکێشیانە(مغامرە)ی کە لەبەرامبەر ئیتالیا پیادەی دەکرد. پاپا

ئەسکەندەری شەشەمیش چەند دەسەلآتێکی تری پێدان‌و چارەسەری ناکۆکیەکانی نێوان ئیسپانیاو پرتوغالی کردو ڕێگەی پێدان سەروکاری باجی دەیەکی کلێسابکەن لە ئەمریکا"دوای دۆزینەوەی". دای ئەویش کاردینالٚ "گزیمیس" لەسەر ڕەچەی پێشینەکانی خۆی بەردەوام بوو، ئەمیش هاوکاری هەردوو شای ئیسپانیایی کرد لەسیاسەتیان لەدژی مسولْمانان‌و جولەکەکان‌و ڕێگری کردن لەبلآو بوونەوەی ئاینزای پرۆتستانتی لە ئیسپانیا. هەر بەمانەشەوە نەوەستا، بەلْکو یاریدەی دان لەفراوان کردنی تۆڕی "دادگاکانی پشکنین" بە مەبەستی ڕاوکردنی هەموو ئەوانەی کە نەیاری کلێسا بوون. دامەزراندنی پیاوانی سەربەم دادگایانەو داهاتی سزامالٚی‌و زەویە دەست بەسەر گیراوەکانیش کرانە مولْکی پادشا.

فردیناندو ئیزابێلا بۆ زیاتر بەهێز کردنی خۆیان، هەستان بە دامەزراندنی سوپایەکی بەهێزی مەشق دراو لەژێرسەرکردایەتی خۆیان، هەروەها سازکردنی سەرکردایەتیەکی بەهێز، کە یەکێ لەسیاسەتەکانی یەکپارچەکردنی وولآت بوو. جا بۆبەدیهێنانی ئەم ئامانجانە، فردیناند هەرچی کۆسپ هەبوو بە وردبینانە لای بردو هەرچی بەباشی زانی بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە درێغی نەدەکرد لە بە ئەنجام گەیاندنی. لەوانەش سیستەمی باج‌و کۆکردنەوەی باجی چاککردو ڕێکخست، هەروەها دراوی ڕێکخست‌و پێوانەیەکی سەرتاپا گیری بۆ دانا. لە دەرئەنجامی ئەمەشدا، داهاتی سالآنەی وولآت زیادی کردو گەیشتە ئەوپەڕی شکۆفەیی، بەشێوەیەك لە سالٚی1474 داهاتی لە"885000"وە گەیشتە 26ملیۆن ڕیالٚ. وە

لەساڵی "1504"، فردیناندو ئیزابێلا گومرگیان لەنێوان بەشەکانی وولات هەڵگرت وبایەخیان دا بەبازرگانیو وەبەرهێنانی ئەمریکا، هەروەها بایەخیان دا پیشەی بەمەڕداری بە مەبەستی بەرهەمهێنانی خوریو هەناردەکردنی بۆهۆڵندا. چونکە بڕوایان وابوو ئەمە داهاتی وولات زیاد دەکات. بەم شێوەیە ئابووری ئیسپانیا گەیشتە ئەوپەڕی جوانیو ڕەونەقی. شیاوی باسە لەو ساڵەی کە فردیناند لەسەرەمەرگدابوو، واتا ساڵی 1516، ئیسپانیا ئابووریەکی بەهێزو پەرەسەندوی هەبوو.

میرنشینی "غرناتەی ئیسلامی" لەباشوردا هەربەزیندویی مایەوە، لەگەڵ ئەوهەموو لاوازیو دوبەرەکییەی کە تێی کەوتبوو. ئیسپانیاش چاوەڕوانی ئەم دوبەرەکیانەی دەکرد، تائەوەبوو هەلی بۆ ڕەخساو لە2 کانونی دووەمی 1492، دای بەسەریداو دەستی بەسەرداگرت. لە پێش ئەم مێژووە جوتە شاکەی ئیسپانیا بەوریایی ولێزانیەوە چاوەڕوانی ئەم میرنشینەیان دەکرد. لەم ماوەیەشدا دووبەرەکی وجیاڕایی باڵی بەسەر ئەم میرنشینەدا کێشا بوو. هەریەکەیان دەیویست ببێ بە سەرداری ئەم میرنشینە، بەهۆی ئەمەشەوە دژایەتیو ناپاکی دروست بوو، کە ئاکامەکەی خۆ بەدەستەوەدانی ئەم میرنشینەی لێکەوتەوە لەوساڵەی ئاماژەمان پێدا. پێشتر لە ساڵی 1476 ئیزابێلا داوای سەرانەی لەمیری ئەم میرنشینە کردبوو، بەڵام میری غەڕناتە وەڵامی دایەوە بەوەی کە کارخەنەکەی دراوی زێڕی ڕاگرتوەو گۆڕیویەتی بە دراوی ئاسن، بەم بیانوە داوەکەی ڕەت کردەوە. جا لەدوای ئامادەکاری سەربازی بۆچەند ساڵێك، فردیناندو ئیزابێلا بە وریایی وبەرەبەرە بەرەو ئەم

میرنشینە پێشرەویان کرد، تا لەساڵی 1492 دەستیان بەسەردا گرت. لەگەڵ ئەوەی کە ڕێککەوتن کرا بە ڕێککەتنێکی دادوەرانە لە ڕوکەشدا، کەچی لەدوای رادەستکردنی میرنشینەکە، هەردوو پاشا داوایان لەموسڵمانەکان کرد یا مەسیحیەت پەسەندبکەن یا لەم وڵاتە بڕۆنە دەر. لە 12شوباتی ساڵی 1502ز، فردیناند فەرمانێکی داو بەپێی ئەم فەرمانە هەرکەسێ مەسیحیەت قبوڵ نەکات دەبێ کۆچبکات لەپێش هاتنی مانگی نیسان. تائەوەبوو مسوڵمانەکان لەکاتی جێهێشتنی وڵاتەکەیان توشی سەختترین وناهەموارترین بارو دۆخ بوونو زۆرێکیان ڕوبەڕووی مەرگ بوونەوە. ئەوانەیشی مانەوە ڕازی بوون بە ئاینی مەسیحی[1]. جولەکەکانیش وەك مسوڵمانەکان سیاچارەبوونو لە هەمان کاتدا دەرکران. لە ئەستۆگرتنی

---

* ئەگەر بێتو چاوێك بخشێنین بە مێژووی دەسەڵاتداریەتی ئیسلامی لەهەموو چاخەکانیدا، دەبینین موسڵمانەکان لەڕووی یەکتری قبوڵکردن وهەڵکردن لەگەڵ ئاینەکانی ترلەپێشەوەی هەموئاینەکانن. ئەو لێبوردە ئاینیەی کە بیریارانی ئەوروپی بانگەشەیان بۆدەکرد، بەمەبەستی نەهێشتنی ئەم هەموو کوشت وبڕەی نێوان ئاینزاکانی مەسیحیەت، لەسەردەمی پێغەمبەرەوە(د-خ)، بەکردەوە پیادەکرابوو. لەهیچ سەردەمێکی ئیسلامیشدا ستەم کاریەکی هاوشێوەی ئیسپانیا دەرهەق بەئاینەکانی تر نەکراوە. تەنانەت خۆرهەڵاتناس "بێرنارد لویس"لەم بارەیەوە لە کتێبی "بەریککەوتنی کلتورەکان"دان بەو ڕاستیەدا دەنێت" کە چۆن موسڵمانان لێبوردەیی ئاینیان پیادە کردوە لەهەمبەر ئاینەکانی تر. هەروەك دەڵێ:" لەکاتی ڕوخانی ئەندەلوسدا سوڵتانی عوسمانی فەرمانی دەرکرد کە مسوڵمانانو جولەکەکان بێ جیاوازی لەهەموو جێگەیەك دەتوانن بژین". مانەوەی ئەم هەموو مەسیحیانەش لەسەر ئەرزی ئیسلامی بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە. جگە لەمە بابای مەسیحی زۆر جار خاچێکی دەکرد بەملدا لەکاتێدا بەدرۆ خستنەوەی ئایەتێکی قورئان بوو بە زمانی حاڵ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەی لێنەدەگیرا. ( وەرگێڕ).

ئەم تاوانەش بەپلەی یەکەم لەئەستۆی ئیزابێلا دایە، ئەمجا گزیمنمسی ڕاوێژکاری. میرنشینی غرناتە بە قشتالە وە لکێنرا، لەبەرئەوەی سوپای قشتالە دەستی بەسەردا گرت.

بەم شێوەیە بەهاتنی سەدەی شازدە فردیناندو ئیزابێلا دەوڵەتێکی یەککرتوی دەوڵەمەندی خاوەن دەسەلاتێکی ناوەندیو بەهێزیان دامەزراند کە زاڵ بوو بەسەر هەموو بەشەکانی[1].

## سیاسەتی دەرەکی فردیناند:-

سیاسەتی دەرەکی فردیناند ڕووی لەفراوان خوازی بوو، وێڕای هەوڵدانی بۆبالأدەست بوون بەسەر گشت بەشەکانی ئیسپانیاداوپاشانیش زیادکردنی شکۆمەندی پادشا. ئەمەش لە پێناوی پارێزگاری کردن لە هاوسەنگی نێودەوڵەتی، بەوەی کە بیسەلمێنێ پادشایە بەسەر صقلیەدا. فردیناند ململانێیەکی توندو تیژی توش هات لەگەڵ پرتوگال، بەهۆی پەیوەندیە هەڵەکانی نێوان پرتوگالو قشتالە، وە بە دۆزینەوەی ئەمریکاش ململانێکە توندترو سەختتر بوو. هەروەها فردیناند لەگەڵ فەرەنسا هەم دیس کێشەیەکی قوڵو ترسناکی هەبوو، لەسەر هەرێمی ناڤارا کە دەکەوێتە باکوری ئیسپانیا، بەهۆی ئەوەی بەشێك لەم هەرێمە دەکەوتە ناو سنوری فەرەنسا. فردیناندیش دەیویست بیخاتەوە ژێر ڕێکێفی خۆی. جگەلەمە جێگرتنەوەی تەختی ئەراگۆنو قشتالە، ماوەیەکی زۆر سەری قاڵ کردبوو،

---

1 Ibid. 1

ئاکامەکەیشی بەجێمانی ململانێیەکی سەخت بوو لەنێوان بنەماڵەی هبسبرگو بنەماڵەی پاشایی فەرەنسا، کەچەند سەدەیەك بەردەوام بوو.

فردیناند گەرەکی بوو لەدوای مردنی، ئیسپانیا وەك ئیمپراتۆریایەکی بەهێزی یەکپارچە بمێنێتەوە. بۆ بەدیهێنانی ئەم مەرقاش هەستا بە دانانی سیاسەتێکی وردوڕێك. ئیزابێلاو فردیناند کوڕێكو چوار کچیان هەبوو، کوڕەکەی ناوی "جۆن" بوو، کچەکانیشی ناویان"ئیزابێلا، جوانا، ماریا، کاترین"بوو، تاکە کەسێ کەجێگەی ئومێدی فردیناندو ئیزابێلا بوو بۆئەوەی جێگایان بگرێتەوە، جۆنی کوڕیان بوو. فردیناند ویستی بەهۆی ئەم کوڕەیەوە خزمەتی بەرژەوەندی بنەماڵەی پادشایەتی ئیسپانیا بکاتو سامو هێزی وولاتەکەی پێ زیاد بکات، هەر لەبەرئەوە پاش چەندین گفتوگۆ "مارگریت"ی کچی ئیمپراتۆر "ماکسیملیان"ی هبسبرگی خواست بۆ کوڕەکەی، ئەمە لەکاتێدا بنەماڵەی هبسبرگ یەکێ بوو لە گەورەترین بنەماڵەی ئەوروپا. ئەمە لە لایەك، لەلایەکی ترەوە بۆ کچەکانیشی هەمان دەستکەلای لە دەستگرت. ئەوەبوو جوانای کچی دایە "فلیپ هبسبرگ"ی کوڕی "ماکسیملیان"، هەروەها ئیزابێلای کچە گەورەی لە "فردنانند عمانۆئێل" پاشای پرتوغال مارە کرد، ئەمەش بە مەبەستی ڕێخۆشکردن بۆ بەستنەوەی نیمچە دورگەی ئیبریا بە وولاتەکەی. "کاترین"ی کچیشی پێشکەشی "ئارسەر"ی کوڕی "هنری حەوتەم"ی پاشای انگلترا کرد. هەموو ئەم سیاسەتەی کە دەیبینین، ئەوەمان نیشان دەدات کە"فردیناند" ویستویەتی فەرەنسا لە هەرچوارلاوە گەمارۆ بدات. هەر بۆیە "لۆیسی

دوازدە" لەبارەی فردیناندەوە وتویەتی: فردیناند "دوو جار فێڵی لێکردم". بەڵام "فردیناند" لە وڵامیدا وتی: "ئەو درۆ دەکات، بەڵکو دەیان جار فێڵم لێکردووە".

لەساڵی 1497 "جۆن" لەدونیا دەرچوو، هەروەك خێزانەکەیشی منداڵێکی بەمردوویی بوو. بەمەش هیواو ئاواتی فردیناندو ئیزابێلا تێکشکاو ترسو دڵەڕاوکێ دایگرتنو لەوە دەترسان کە تەختەکەیان بگوازرێتەوە بۆ دەرەوەی بنەماڵەی خۆیان. واتا بۆیەکێ لە "منداڵەکانی کچی سێیەمیان". ئەوەندەی نەبرد ئیزابێلای کچە گەورەشیان مەرگ یەخەی گرت. لەدوای مردنی ئەویش عمانوئێلی هاوسەری "ماریای" خوشکی ئیزابێلای مارەکرد، بەو مەبەستەی کە ئیسپانیا بخاتە سەر پرتوگال. کەچی ئەمیشیان زۆری نەبردو لەساڵی 1517، ماڵئاوایی لە ژیان کرد. بەهۆی ئەمەش تەختی ئیسپانیا گواسترایەوە بۆ جوانای کچی فردیناند. عمانۆئێلیش "ئاینورا"ی خوشکی ئیمپراتۆرچارلسی پێنجەمی مارە کرد.

ئیزابێلای دیندار،پاشای ئیسپانیا لەساڵی 1504، کەوتە جێگەی مەرگ. ئیزابێلا ڕای سپارد کە تەختی پادشایەتی ببەخشرێتەجوانای کچیو دواتر کوڕەکەی. بەو مەرجەی تا لە تەمەنی منداڵی بێت فردیناند سەروکاری بکات، فردیناند ئەو ڕاسپاردەی بە تەواوی جێبەجێ کرد، سەرەڕای ئەوەی حەزی نەدەکرد کوڕی جوانای کچی ببێتەپاشای ئیسپانیا، چونکە پەروەردەو فامینی هۆڵندی بوو نەوەك ئیسپانی.

فردیناند بە مردنی "فلیپی کوڕی ماکسیملیان" ومێردی کچەکەی لە ساڵی 1506 لە دوژمنێکی سەر کەش ڕزگاری بوو، چونکە فلیپ لەبەڕێوەبردنی قشتاڵە کێبڕکێکی لەگەڵ دەکرد. سیابەختی فردیناند لەوەدابوو هیچ کوڕی نەبوو، تەنانەت کاتێکیش هاوسەرگیری کرد لەگەڵ "گیرمین"ی کچی خوشکی پادشای فەرەنسا "خانمی ناڤارا" لە ساڵی 1505 هیچ کوڕی لەپاش بەجێ نەما. چونکە ئەوکوڕەی لەم ئافرەتە بوو،پاش چەند کاتژمێرێك لەدوای هاتنە دنیای، کۆچی دوایی کرد. بەمەش تەختی ئیسپانی کەوتە دەستی "چارلسی کوڕی جوانا"ی نەوەی "مکسیمیلیان‌و فردیناند".

فردیناند کەسێکی سیاسی‌و دیبلۆماسی بوو، سیاسەتی میکاڤیللی ئەوسای پیادەکرد، هەتا ئومێدی ئاشتی هەبووایە پەنای بۆ جەنگ نەدەبرد. ساتێکیش فەرەنسا شالأوی بردە سەر ئیتالیا، فردیناند لەگەڵ "هەنری حەوتەم"ی پاشای ئینگلترا ڕێککەوت بەوەی هینری بچێتە ناو هەرێمی بریتانی. بەمەش چارلسی هەشتەم ی شای فەرەنسا ناچار بوو داوای ڕێککەوتن بکات‌و بەپێی پەیمانی "بەرشەلۆنە" لە ساڵی 1492فەرەنسا دەستبەرداری "روزولون، کارادگای" بوو بۆ ئیسپانیا.

فردیناند لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتیدا توانی کێشەی ئیتاڵیا لەبەرژەوەندی ئیسپانیا چارەسەر بکات‌و فەرەنسا ی لێ دوور بخاتەوە. هەروەها توانی سنورێك بۆ داواکاریەکانی پاپا دابنێ. هەروەك توانی نیشتمانی ناپۆڵی‌و صقلیە بخاتە ژێرچنگی خۆی‌و فەرەنسا ببەزێنێ وناچاری بکات بەپێی

ڕێککەوتنی "بلوا ناڤار"ی ساڵی 1504، دەستبەرداری ناپوڵی ببێت بۆ ئیسپانیا. هەروەها لەساڵی 1515، ناڤارای خستە ژێر ڕکێفی خۆی.

فردیناند لە ساڵی 1516 کۆچی دوایی کرد، دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتێکی فراوانی بنیات نا. ئەم ئیسپانیای لە دەولەتێکی بەش وپارچە پارچەوە کردە وڵاتێکی بەهێزو دەوڵەمەند،بەشێوەیەك کە لە ئەوروپادا وێنەی ئەونەبوو لەدەوڵەمەندی بەهێزیدا[1].

**پرتوگال:-**

ساڵی 1500، ئەو ساڵە بوو کە پرتوگال تیایدا بوبە دەولەتێکی نەتەوەیی، ئەمەش بەسایەی کۆششی پادشاکانی ودۆزینەوە جوگرافیەکان کە هنری دەریاوان پێی هەڵدەستاو بەهۆیەوە نەمری بەدەست هێنا. وێژەی پرتوگال پەرەی سەندو بووبە وێژەیەکی نەتەوەیی خاون شەقڵی خۆی، هەروەك وێژەی ئیسپانی بەهۆی زاڵ بوونی زمانی قشتاڵی بەسەر ئەراگۆندا گەشەی سەند. شێوازی فەرمان ڕەوایی پرتوگال ڕووەو پادشای ڕەها هەنگاوی هەڵگرت.

**سویدو نەرویج ودانیمارك:-**

ئەم سێ دەوڵەتە ئەسکەندەنافیانە لە سەدەکانی ناوەڕاست درووست بوون، ئەمش کاتێك ڤایکینگەکان ئایسلەنداو گرینلاندیان ئاوەن کردەوەو دەستیان گرت بەسەر فنلنداوڕوسیا. سێ گەلە ئەسکەندەناڤیەکە لەڕووی

---

Ibid1 1

زمان وڕەگەزوخونەریتە کۆمەلاّتیەکان لەیەك دەچون. ئەم سێ دەولّەتە بەسەرۆکایەتی پادشای دانیمارك وبەپێی پەیمانی {کلمر}ی سالّی 1397، یەکیەتیان پێکهێنا. بەلاّم ئەم یەکیەتیە بەلای گەلە ئەسکەندەنافیەکانەوە پەسندنەبووپێی پەست بوون، ئەمەش هۆکارێ بوو بۆئەوەی سوید شۆڕش بکاتو سەربەخۆی بەدەست بێنێو ببێتە دەولّەتێکە نەتەوەیی بەسەرۆکایەتی گوستافز فازا لەسالّی 1523-1560. هەلّبەت ئەمە تەنها سویدی گرتەوە ولاّتی نەرویج وئایسلەنداو گرینلاند لە ژێرچەپۆکی دانیمارکدا مانەوە.

هەریەکە لەپاشای سویدو دانیمارك هەولّیاندا بالاّدەست بن بەسەر کلّێساو زەویەکانیان فراوان بکەنو دەسەلاّتی پەرلەمانو خانەدانان کەم بکەنەوە. لەم ڕووەشەوە هەولّەکانیان بێ بەرهەم نەبوو، سەرکەتنی گەورەیان بەدەستهێناو بوون بە دەولّەتێکی پادشایی ڕەها.

چەند حکومەتێکی نەتەوەیی لەخۆرهەلاّتی ئەورووپا سەریان هەلّدا، کە بەشێکیان گرنگی خۆیان هەبوو لەسەدەی شازدە. گرنگترینان "بوهیمیا- هەنگاریا-پولندا- لیتوانیا- میرنشینی مۆسکۆ".

**بۆهیمیا:-**

بۆهیمیا لە سەدەی دوازدەوە دەولّەت بوو، خاوەنی زمانو وێژەی نەتەوەییو هەستی نیشتمانی خۆی بوو. لە کاتێکدا چیك لەسلاڤیەکان بوون ودەورە درابوون بەڕەگەزی ئەلّمانی. بۆهیمیا بەشداری دەکرد لە هەلّبژاردنی ئیمپراتۆر بۆئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز. بەڕستی بۆهیمیا شوێنێك بوو وەك

پەناگە بەکاردەهات بۆکۆچکردوە ئەڵمانیەکان. هەر لەبەرئەمەش مێژووەکەی لەگەڵ مێژووی ئەڵمانیا دایە. پادشایەتی لە بۆهیمیادا بە هەڵبژاردن بوو، لەم کایەدا خانەدانان بەزۆری کەسانی بیانیان هەڵدەبژارد. لە ساڵی 1471 میری پۆڵندا بەپادشای بۆهیمیا هەڵبژێردرا. پاش نۆزدە ساڵ لەم پاشایەتیە بە پادشای هەنگاریاش پەسند کرا، بەمەش بۆهیمیا کەوتە ژێردەستی بێگانە.

لە ساڵی 1526، پادشای بۆهیمیاو هەنگاریا لەجەنگی موهاکس کوژرا، کەلەدژی دەوڵەتی عوسمانی هەڵگیرسا بوو. دوای ئەم کوژرانەی پادشای بۆهیمیاو هەنگاریا، خانەدانان هەستان بەهەڵبژاردنی "فردیناند هاسبرگ" برای ئیمپراتۆ "چارلسی پێنجەم" بەپادشای بۆهیمیا. ئیدی لێرەوە بۆهیمیاو هەنگاریا بوونە بەشێك لە موڵکەکانی بنەماڵەی هبسبرگو کەوتنە ژێردەسەلاتی ئەم بنەماڵەیە.

**هەنگاریا:-**

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەنگاریا دەوڵەتێکی بەهێز بوو. دانیشتوانە مەجەریەکانی لەمەغۆلە کۆچکردووەکان بوون، کەزۆر بەوردیەوە پارێزگاریان لەخونەریتەکانیان دەکردو کیان ونیشتمانیان زۆر بەپەرۆشەوە دەپاراست، بەلام چینی خانەدان ودەرەبەگەکان دەسەلاتێکی گەورەیان هەبوو، بەهۆیەوە توانیان ئاستەنگی گەورە دروست بکەن لەبەردەم سەرهەڵدانی چینی ناوەڕاست لەبازرگان وسەرمایەداران. لەبەرئەمەش جوتیارانی مەجەڕی لەدژوارترین بارودۆخدا دەژیان کە هیچ کات جوتیارانی ئەورووپای خۆرئاوا لەم بارودۆخەدا نەگوزەرابوون. خانەدانان پادشایەتیان کردە پادشایی

هەڵبـژێردراو، ئەمـەش وای کـرد بـوار نەڕەخـسێ بۆسـەرهەڵدانی پادشـایەتی ڕەها.

هەنگاریا لەساڵی 1526ز، لەبەردەم سوپای عوسمانی لەجەنگی موهاکس خۆی نەگرتو تێکشکا، بەمەش نیشتمانەکەی لـەنێوان سـوڵتانی عوسمـانیو ئیمپراتۆری ئەڵمانیا دابەشکراو درایە فردیناند.

**پۆڵەنداو لیتوانیا:-**

پۆڵـنـدا لـە سـاڵی "1000ز"یـەوە- وڵات بـوو. بـەڵام بـوو بـە قوربـانی دابەشـبوونە نـاوخۆیو شـاڵاوە بیانیـەکان، بەتایبـەت ئـەڵمان. پۆڵـنـدا بـەم شـێوەیە مایـەوە تاسـەدەی چـواردە، کـە لـەو سـەدەیەدا خـۆی ڕزگـارکرد لەدەسەڵاتی ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز. ئیدی لە پاش ئەمە بووبـە دەوڵتێکـی سەربەخۆ. لیتوانیاش لە ساڵی 1250، وەك دەوڵـەتێك سـەریهەڵدا. لەسـاڵی 1386، پادشای لیتوانیا بەسەر پۆڵنداش هەڵبژێردرا، بەمەش ئەم دوو وڵاتە بوون بە یەك دەوڵەت. ئەم دوو وڵاتە فـراوان بـوون بەئاڕاسـتەی خۆرهـەڵاتو ناوەڕاستی ئەورووپاو فراوانخوازیان ئەنجامدا تـا لـە سـاڵی 1500ز بـوون بـە بەهێزترین دەوڵەتی ئەورووپا. بەڵام سەرهەڵدانی ناکۆکی ودووبەرەکی لەنێوان پۆڵەندی ولیتوانی لە لایەك، لەلایەکی تریش هەبوونی چینی دەرەبەگ کـەزۆر بـەهێز بـوونو هـەردەم سـووربون لەسـەر سیـستەمی پاشـایی هەڵبـژێردراو، هـەروەها بەخـشینەوەی بەربـژاری لەلایـەن پادشـاوە لـە پـێش هەڵبـژاردنی، لەسەرووی هەموویەوە نەبوونی هیچ بوارێك بۆ گەشەکردنی چینی ناوەڕاستو کارە دوژمنکاریەکانی ئەڵمان بەبەردەوامی، لـەم لاشـەوە مەترسـی دەوڵـەتی

عوسمانی لەباشور، هۆشداریدا بە ئاوابونی ئەستێرەی هەردوو دەوڵەتی یەکگرتوو لە ئاسمانی ئەوروپا. هەرچەندە ئەمە نزیکەی دوو سەدە دواکەوت.

**میرنشینی مۆسکۆو ڕوسیا:-**

ڕوسەکان لە سلاڤیەکانن، لە زۆر کۆنەوە لە زەویەکانی خۆیانداژیان دەگوزەرێن. ئەسکەندەناڤیە سویدیەکان لە سەدەی هەشتەمی زاینیەوە پەلاماری ئەم وولاتەیان داو یەکێ لەسەرکردەکانیان بەناوی (روریك) دەوڵەتێکی دامەزراند بەناوی(کییف). ئەم دەوڵەتە توانی بەردەوام بێتو بمێنێتەوە تا هاتنی مەغولەکان. مەغۆلەکان توانیان زاڵ بن بەسەر ئەم دەوڵەتەو ڕوسیاش بۆ ماوەی 200ساڵ لەژێر ئەم دەسەلاتەدا مایەوە.

ئیڤانی سێیەم(1462-1505)ی- میری مۆسکۆ توانی خۆی لەدەسەلاتی مەغۆلەکان ڕزگاربکات. ئیڤان لە بەرەبابی روریکی ئەسکەندناڤی بوو، دەوڵەتەکەی بە ئاڕاستەی باکورو باشورو خۆرهەلات فراوان کردو دەستی بەسەر نوڤگوردو ویسکوڤ داگرت، دەسەلاتی لە باکورەوە گەیشتە زەریا بەستەڵەکەکانی باکور، لەخۆرهەلاتیشەوە گەیشتە چیاکانی ئۆراڵ. ئیڤانی سێیەم هاوسەرگیری کرد لەگەڵ خانم صوفیا کە یەکێ لەنزیکەکانی ئیمپراتۆر "قصتنتین" ی یازدەم بوو. شیاوی باسە ئەم ئیمپراتۆرە کۆتا ئیمپراتۆری بیزەنتی بوو. بەهۆی کاریگەری خێزانەکەی، ئیڤان خۆی وەك شوێنگرەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی خۆرهەلات ناساند، دەسەلاتەکەیشی بوو بەدەسەلاتێکی ڕەها، پاشان نەوەکەی "ئیڤانی چوارم" لە ساڵی 1547، وەك قەیصەر یا ئیمپراتۆری ڕوسیا خۆی ناساند. بەم شێوەیە

دەوڵەتێکی نەتەوەیی پادشایی ڕەها لەڕوسیا سەری هەڵدا وشاری مۆسکۆش بوو بەپایتەختی ئەم دەوڵەتە.

### دەرکەوتنی نیشتمانپەروەری و نەتەوایەتی:-

هۆشیاری نەتەوەیی و گیانی نیشتمانی کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەر سەرهەڵدانی حکومەتە نەتەوەییە نوێیەکان لە ئەورووپای سەدەی شازدە. گەلانی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەزمانی جۆراوجۆر دەدوان، بەڵام کەم جار نەتەوەیەك بیری لەوە کردۆتەوە کە ئەم جیاوازە لە خەڵکانی تر لەڕووی زمان و ڕەگەزەوە. ئەو کاتێك گوێڕایەڵی بۆ ئیمپراتور یاخود پاشا یان بۆ میر یا بۆ کەنیسە هەبوو، گوێڕایەڵی نەبوو بۆ نەتەوەکەی خۆی.

بەڵام شەقڵ و سیمای نەتەوەکانی ئەورووپا دەستیان کرد بە دەرکەوتن و گیانی نەتەوەیی لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا گەشەی کرد. لە ڕاستیدا جەنگی خاچیەکان هۆکارێکی گرنگ بوو کە وای کرد هۆشی نەتەوەیی بلاوبێتەوە. ئەمەش بە کۆبوونەوەی چەند گەلێکی زۆرو نەتەوەیەکی لەیەکتری جیاواز. ئەمانە ماوەیەکی زۆریان بڕی بوو، سەرەڕای جیاوازی زمانیان لەیەکتری پەیوەندیشیان کرد بە گەلانێکی نامۆ بەخۆیان لەڕووی زمان و ڕەگەزەوە. لێرەوە هەر نەتەوەیەك شانازی دەکرد بە بنەڕەت و ڕەسەنایەتی نەتەوەکەی خۆی و هی نەتەوەکانی تری بەپوچ و بێ بایەخ تەماشا دەکرد.

جگە لەمە، ئەو نەتەوانەی کە بەژداریان کرد لە شالآوی خاچی، دەستیان کرد بە کێبڕکێ کردن لەگەڵ یەکتری. ئەم کێبڕکێو منافەسە لەنێوان ئینگلیزو فەرەنسیو ئەڵمانی بووە هۆی سەرهەڵدانو گەشەکردنی هەستی نەتەوەیی ئینگلیزیو فەڕەنسیو ئەڵمانی. هەروەها پێشڕەوی کردنی ئەڵمانەکان بەئاراستەی خۆرهەلات هۆیەك بوو بۆ جولآندنو وەخەبەرهێنانی سلاڤەکان بۆ ڕاگرتنی پێشڕەوی ئەڵمانەکانو بەربەرەکانی کردنیان. هەروەك دروستبوونی چەندین جەنگی خوێناوی لەنێوان سوارە تیۆتینیە ئەڵمانەکانو پۆلەندیەکان لەسەدەی پازدە، بووە هۆی پەیدابوونی دەوڵەتی بەهێزی پۆڵەندا. لەڕووی ئاینیەوە بانگەشەی "جۆن هس" لە بۆهیمیاو، هەوڵی ئەڵمانەکان بۆ بنبڕکردنی بە کوتەك، بووە هۆی ملکەچ بوونی بۆهیمیا بۆ ئەڵمانیا.

لەشالآوی خاچیەکانو شالآوەکانی تریش مەبەستە ئاینیەکان گۆڕانی بەسەرداهاتو بووبە مەبەستو ئامانجی نەتەوەییو نیشتیمانی. جەنگی سەد ساڵەی نێوان ئینگلتەڕاو فەڕەنسا کە بەجەنگێکی بنەماڵەیی دەستی پێکرد، کۆتایەکەی وەك جەنگێکی نەتەوەیی لێهاتو بە جەنگێکی نەتەوەیش کۆتایی پێهات کە ژاندارك ڕابەرایەتی دەکردو گیانی نەتەوەیی لەناو فەڕەنسیەکان دادەگیرساند بۆ دەرپەڕاندنی ئینگلیزەکان لە ولآت. لەمەوە فەڕەنسی زمانەکان لەژێر بەیداغی یەك پاشا یەکیان گرت، هەروەك ئینگلیزەکان لە ژێر ئاڵآی پاشای ئینگلتەڕا یەکیان گرت . لەمەشەوە پادشایەتی ڕەها گەشەی کرد، ئەو پاشایەتیەی کەپشتی دەبەست بە نیشتیمانیەتی گەلەکەیو

بەدەنگەوە هاتنی ئەوان لـە چارەسـەرکردنی پرسـە ناوخۆیـەکانو مەترسـیە دەرەکیەکان.

"نیشتمانیو نەتەوەپەروەری" بەمانای گوێڕایەڵی کردن بۆ پاشا زۆر زیاتر بێت لە گوێڕایەڵی کردن بۆ گەلو نەتەوە. ئەم هەسـتە یـان ئـەم پابەندبوونـە زۆر بەهێزبوو لەو ولاًتانەی کە پاشاکانیان کردبوویان بە یەكو دانیشتوانەکەی بەیەك زمان قسەیان دەکردو ملکـەچ بـوون بـۆ دەسـتورو یاسـایەکی گـشتیو هاوبەش. ڕەگەزی سەرەکی لە مەسەلەی نیـشتیمانیەتیو نەتەوایـەتی بریتـی بوو لەزمانو دابو نەریتی هاوبەش. گیانی نەتەوەیی بە گوێڕایـەڵی تـەواو بـۆ پاشا گوزارشتی لێدەکرا. پادشاکان ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕا لـە پەخـشانکردنو بەرزکردنەوەو بڵندکردنی هۆشی نەتەوەیی. بەهۆی ئەمە پادشا بووبە هێمـای یەکیەتی نەتەوەو سەربەخۆیی نەتەوە. پادشا خاوەنی سـەروەری نەتـەوەیی بوو. پادشا ئەو کەسە بوو کە جەنگی ڕادەگەیاندو پەیمانی دەبەسـتو بـاجی دەسەپاندو دراوی لێدەداو سوپای تـەیار دەکـردو بـەردەوامی پێـدەدا. دابو نەریت لەدەوری ئەم پاشایەتیە ڕەهایەدا گەشەی کـرد.تەنانـەت بەکاریگـەری پادشایە نەتەوەییەکان وێژەی نەتەوەی پەرەی سەند.

### وێـــژەی نەتەوەیـــی:-

سەرهەڵدانی زمانە ناوچەییەکانو وێـژەی نەتـەویی لـەکۆتایی سـەدەکانی ناوەڕاست کاریگەریەکی کارای هەبوو لەسەر بڵاوبوونەوەی هۆشـی نەتـەویی. پێشتر لاتینی وئیغریقی زمانی وێژە بوون بۆ گـەلانی ئـەوروپا. لاتینـی زمـانی گەلانی خۆرئاوای ئەوروپابوو، ئیغریقیش زمانی خۆرهەلاًتی ئەوروپا بوو. لـەم

نێوانە زمانە نەتەوەییەکان تەنهاو تەنها زمانی قسەکردن بوو. بەڵام خەڵکی بەرەبەرە دەستی کرد بەنوسینی نامەو نوسینەکانیان بە زمانی نەتەوەیی خۆیان لەجیاتی لاتینی.

لە پێش کۆتایی هاتنی سەدەی پازدە زمانە نەتەوەییەکان بوون بە زمانی بەکارهێنراو لەناو چینی ڕۆشنبیرین. خەڵکی دەستیان کرد بە نوسینی بابەتەکانیان بە زمانی نەتەوەییو ڕێزمانو بنچینەیان بۆ دانا. تا وای لیٚ هات هەمووو زمانێك بوو بە زمانێکی نەتەویی دیارو جیاکراوە. نوسەرە ئینگلیزەکان بە ئینگلیزی دەیاننوسیو هۆنراوەیان بە ئینگلیزی دەهۆنیەوە. هەمان هەنگاو فەرەنسیو ئەڵمانی ئیتالیەکانیش گرتیانەبەر. بەرەبەرە خاسیەتە نەتەوەییەکان گوزارشتیان بە هەستو نەستی نەتەوایەتی لێدەکرا. هەروەك لە کتێبەکانی میکافیللی ئیتالیو لۆسەری ئەڵمانی شکسپیری ئینگلیزیو سێرڤانتسی ئیسپانی هەستی پێدەکەین.

شانبەشانی سەرهەڵدانی وێژەی نەتەوەیی، هەستی پارێزگاریکردن لە نیشتمانو پابەند بوون بەنەتەوە سەریهەڵدا. ئەمەش کاردانەوەیەك بوو بۆ بەربەریەتو دەرەبەگایەتی کە پێشتر باو بوو.

سیاسەتی نویٚو نیشتمانپەروەری کە بەزمانی نەتەوەیی گوزارشتی لێدەکرا مەترسی دروستکرد لەسەر دامەزراوە کۆنەکانی ئەورووپای وەك:"دەرەبەگایەتی، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز، کلێسای کاسۆلیکی". تا ئەوەی لەپێش کۆتایی هاتنی سەدەی شازدە هەموو دەوڵەتێك بوو بەخاوەنی کلێسایەکی تایبەت بەخۆی. بە پێچەوانەشەوە بالآدەستی پاپا

بەسەر کڵێساکان کەم بوویەوە، تەنانەت بەسـەر کڵێـساکانی کاسـۆلیکیەکانی دەرەوەی ئیتالیاش بالآدەستی جارانی نەما. ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆزیش بـــەرەو لاوازیو پوکانـــەوە ڕۆیـــشت. لەملاشـــەوە پادشـــاکان هەســـتان بەقۆستنەوەی هەستی نەتەوایەتی بۆ خزمەتکردنی سودی ئابووریو برەودان بە بازرگانی نیشتیمانی.

## پێشکەوتنی هزرو ڕێنیسانس (بوژانەوە)ی ئەوروپی:

مەبەستمان لە(ڕێنیسانس)ی ئەوروپی چییە؟

مەبەست لە ڕێنیسانس ئەو گۆڕانە ڕامیاریو ئابوریو کۆمەڵایەتیو هزریە یە، کە لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست ئەوروپای گرتەوە {سەدەی یازدە تا سەدەی شازدە}. بزووتنەوەی زیندووکردنەوەو ژیاندنەوەی شارستانی کلاسیکی یۆنان وڕۆما کەپێی دەوترا:(Renassance)، لەئیتالیا دەستی پێکردوو زیاتر هونەرو مرۆڤبینی وئەو گۆڕانکاریانەی گرتەوە کە لەسەدەکانی (14-15-16) بەسەر ئەوروپادا هات. ئەم سەدانە بەسەردەمی گواستنەوە دادەنرێ لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆسەردەمی نوێ.

ئەوەی بەرچاوان دەکەوێ لە سەردەمی نوێ، زیاتر خۆی دەبینێتەوە لە بوژانەوەی ئابووری وسیاسی ولاتە ئەوروپا کە ولاتە خۆرئاواییەکانی ئەوروپاو باکوری شاخی ئەلپ پێشەوایەتیان دەکرد. بەڵام بزووتنەوەی هزری وهونەریو وێژەیی، ئیتالیا ڕابەرایەتی دەکرد. جیاوازییەك هەبوو لەنێوان ئیتالیاو ولاتە ئەوروپیەکان کە خۆی دەبینیەوە لە دیاردەی دەرەبەگایەتی، ئەمەش کاتێ دەبینین دەرەبەگی لەئیتالیا لە کاتێکی زوو دەرکرا. ئیتالیاش خۆی بەیەك ڕیزی نەدیتو قبوڵی حوکمی ئەڵمانیاشی نەکرد، بەڵکو بەپارچەپارچەیی مایەوە. هەروەها جولانەوەی قوتابخانەیی یاخود بزوتنەوەی سیکۆلائیستی(ڕێنیسانس لە سەدەی دوازدە) لەم ولاتە پەخش نەبوو، لەکایەی تەلارسازیشدا کاریگەر نەبوو بەشێوازی غوتی(کەوانەیی). لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەویە کە شێوازی فێرکردن لەئیتالیا جیاواز بوو لە چاو

ولآتانی تری ئەوروپا. چونکە فێرکردن لە ئیتالیادا دونیـایی بـوو{واتـە تـەنها ئـاینی نـەبوو بـەڵکو لایـەنی دونیایـشی تیـا بـوو}، بەپێـچەوانەوەی کایـەی فێرکاری بەشەکانی تری ئـەوروپا، کـە تـەنها کاریگـەری کڵێـسای کاسـۆلیکی لەسەر بوو. بەهۆی هەموو ئەمانەوە کە لەئیتالیادا هەبوو، نەریتی سەدەکانی ناوەڕاسـت لاوازو بـێ ڕمـێن مایـەوە. شـارەکانی ئیتالیـا بـەهۆی بەهرەمەنـد بونیـان لـە سـامانو سـەربەخۆیی و بـەبازرگانی کـردن لەسـەر پـاکی ئـەو شـوێنانەی دەسـتیان پێـی دەگەیـشت، توانیـان زاڵـبن بەسـەر لادێکـانو دەسـەڵاتی خانـەدانان قەلاچـۆ بکـەنو بـوونی ئـەم چـینە لەکۆمـەڵگا ڕەش بکەنەوە. شارە ئیتاڵیەکان توانیان لادێکان والێبکەن کە لەخزمەتی شاردابنو بیانخەنە پاڵ خۆیان. بە هەمان شێوە ئەزمونی وێژەو هونـەرو ڕامیـاری، وای کرد ئیتالیا شۆڕشی وێژەیی وهونەری بەرپا بکاتو بەهۆیـەوە کـار لەئـەوروپا بکات. ئیتالیـەکان توانیـان هونـەرێك بـۆ دروسـتکردنی کۆشـكو تـەلارو وێنـە کێـشانو چـێژی ئـەدەبو بنـەماکانی فێرکـاری بـە ئـەوروپا ئاشـنا بکـەن. لەبەرئەمە ئیتالیـا لـە ڕۆژگـاری گواسـتنەوە لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتەوە بـۆ سەردەمی نوێ قوتابخانەیەك بوو بۆ ئەوروپا [1].

**کاریگەری موسڵمانان و ئیسلام لەسەر بوژانەوەی ئەوروپا:ـ**

شارسـتانیەتی مـسوڵمانان دەکـشا بـەرەو خۆرئـاواو کاریگـەری گـەورەی دەکردە سەریان. ئەم کاریگەریەش لەکۆتاییەکانی سەدەی یـازدەوە دەسـتی

---

1 G.R.Story، E.H Herbision، main Stream of civiliziton (Newyork ، Har cant Bbrace)، (1947)

پێکرد. ئەم کشانە لە چەند ڕێگەیەکەوە ڕێچکەی بەست کە گرنگترینیان ئەندەلوس بوو. پاش ئەمیش دورگەی صەقلیەو دوای ئەویش جەنگە خاچیەکان. ئەندەلوس کە کاریگەرترینیان بوو، شارستانیەتی ئیسلامی تیایدا لە شکۆفەو گەشانەوە دابوو. دەوڵەتی ئەندەلوس لە سەدەی هەشتی زاینیەوە لەپێش چاوی ئەوروپیەکان بوو. جا ئەم ژیارە لەکایەکانی زانست وزانیاریدا کاری کردە سەر ئەورووپاو وایکرد خوێندکاران لە هەموو بەشەکانی ئەورووپاوە بەرەوئەندەلوس بچن‌و بەهرەمەندبن لەمەشخەڵی شارستانی ئیسلامی. ئەمان لەوێدا کەوتنە خوێندن‌و لێکۆڵینەوەو وەرگێڕانی پەرتوکەکانی "ابن سینا- ابن رشدو رازی وخوارزمی...هتد" بۆسەر زمانی لاتینی. زانستی پزیشکی "ابن سیناو رازی"، سێبەری لەسەر زانکۆکانی ئەوروپادا هەبوو تاهاتنی سەدەی حەڤدەو دەرکەوتنی زانستی پزیشکی نوێ. فەلسەفەی "ابن رشد" هەتا سەردەمی"تومای ئەکوینی" کاریگەری گەورەی هەبوو بەسەر کڵێسای مەسیحی دا. لە دەرەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەو وەرگێڕانانەدا، ئەوروپا بە هەژانێکی هزری هەژاو لەسەدەی سێزدەی زاینی بزوتنەوەی قوتابخانەیی دروست بوو، کە کاریگەری شارستانی ئیسلامی بەسەرەوە بوو. هەر بەهۆی ئەم بزوتنەوەیە بوو، ئەورووپیەکان توانیان پەیوەندی بکەنەوە بە شارستانی یۆنان وڕۆماو هەستن بەزیندوو کردنەوەی ئەم شارستانیەتە لەسەدەکانی چواردەو پازدە.

## دیاردەکانی ڕێنسانسی ئەوروپا

1-دۆزینەوەی چاپ‌و بلاوبونەوەی زانیاری.

2_ژیاندنەوەی شارستانی کلاسیکی کۆن وبلاوبوونەوەی کلاسیك وهیومانیستی (مرۆگەری).

3- پاك کردن‌و ڕۆشنکردنی هونەر، لەسەردەمی ڕێنیسانس.

4_گەشانەوەی وێژەی نیشتمانی ونەتەوەیی.

5_پێشکەوتنی زانستە سروشتیەکان ورەخنەی مێژوویی[1]

**داهێنانی چاپ:-**

تەمەنی چاپخانە لە (500)ساڵ تێناپەڕێ. کەواتە بەر لەم (500)ساڵە خەڵکی کتێبیان بەدەست نوسیوە. دەستکەوتنی کتێبیش لەتوانای هەموو کەسێکدا نەبوو، کتێبخانەکانیش تایبەت بوون بەدەوڵەمەندوخاوەن سامانەکان، ئەمەش هۆکارێ بوو بۆ ئەوەی زانستو زانیاری لەناو کۆمەڵێکی کەم لە خەڵکی قەتیس بمێنێ. داهێنانی چاپ لەسەردەمی نوێدا ڕۆڵی گرنگی هەبوو لەبڵاوکردنەوەی بیروبۆچونەکان. چاپکردن کارێکی ئاڵۆزبوو، بریتی بوو لەپیتە برۆکەکان، کەشوێنی خۆی لەسەر کاغەز جێدەهێشت. پێشکەوتنی کاغەزیش ماوەیەکی درێژی خایاند، بۆیە پێویستە بەتێروتەسەلی باسی لێوەبکەین.

**کاغەز( پەڕە ):**

مەرەکەب وکاغەز لەلایەن چینیەکانەوە داهێنراوە، وەهەر ئەوانیش یەکەم کەسانێك بوون لەسەدەی دووی زاینی کاغەزیان بەکارهێنا. ئەوان کاغەزیان لەئاوریشم دروست دەکردو بەکاریان دەهێنا. کاتێکیش دەستیان گرت بەسەر وڵاتی ئەودیو ڕوبار، فێری ئەم پیشەیە بوون وتوانیان لەجیاتی ئاوریشم لۆکە بەکار بهێنن لە دروستکردنی کاغەزدا. پاشان ئەمە گواسترایەوە بۆ یۆنانو

---

C.op. Cit; pp. ‹1Hoyes

ئیتالیاو ئیسپانیا، ئیسپانیەکانیش توانیان کەتان لەجیاتی لۆکە بەکاربهێنن لەدروستکردنی کاغەزدا، هەڵبەت لەپێش سازکردنی کاغەزدا، خەڵکی لەسەر گیای زەل نوسینەکانیان دەنوسی، کەگەلآیەکی ئەستورو لوسەو لەسەر کەنارەکانی نیل گەشەدەکات. لەسەدەکانی ناوەڕاستیش خەڵکی پێستیان بەکاردەهێنا بۆ نوسینەکانیان بەتایبەت پێستی ئاسك، ئەمەش بە گران لەسەریان دەکەوت . خەڵکی تاماوەیەکی درێژ ئەم جورە پێستەیان بە باشتر دەزانی لە کاغەز، هەتا تۆماری گرێبەستی هاتەئارا، کە ئەم جورە پێستەی تیا بەکار نەدەهات. لەنیوەی دووەمی سەدەی پازدەهەم، کاغەز جێگەی ئەم جۆرە پێستەی گرتەوە، چونکە چاپ جۆرە کەرەستەیەکی هەرزان‌و گونجاوی دەویست بۆڕەنگ دانەوەی پیتەکانی.

## چاپ :-

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەڵکەندنی پیتەکان لەسەر پارچە تەختەو بەردەکان کارێکی بەربلاوبوو، ئەم پیتانەش شوێنی خۆیان زۆر بەڕوونی بەجێ دەهێشت. میروپاشاکان واژۆکانیان لەسەر تەختەو پارچەکانزا هەڵدەکەند، بەمەبەستی واژۆکردنی بەڵگەنامەکانیان. ئەم شێوە بەکارهێنانە گەشەی سەندو بوو بەپیتە کانزاکان، وە بەشێوەیەك دارێژران کەتوانانی چاپ بوونی هەبوو، سودی ئەم پیتە بزۆکانەش لەوە دابوو کە دەتوانرا بەردەوام بەکاربێت‌و ڕێك‌و پێکی تیادا پیادە بکرێ.

ئێمە نازانین کەی چاپکردن لە لەوحەی دارەوە بووە بەپیتی بزۆك. وە زانیارشمان نییە کەیەکەم کەس کێ بوو پیتی بزۆکی دۆزیەوە.

وادەگوترێ:"لۆرنس کاتر"، دانیشتوی شاری "هارلم"ی هۆڵندا، یەکەم کەس بوو پیتی بزۆکی بەکارهێناوە، ئەمەش لەکۆتایی سەدەی چواردەو سەرەتای سەدەی پازدە دا. بەلاّم ئەمە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییەو هیچ شتێکی چاپکراویش لەناوبراوەوە جێ نەماوە کە بیسەلمێنێ ئەوخاوەنی ئەم دۆزینەوەیە. ئەوەی کەزانراو بێت ئەوەیە، کە "جۆن گۆتەنبەرگ"لەساڵی(1450)، یەکەم کەس بووە پیتی بزۆکی بەکارهێناوە بۆچاپ. "گۆتەنبەرگ" خەڵکی شاری"مینیز"ی ئەڵمانیا بوو. یەکەم شتێکیش کە چاپیان کرد بلیتی لێخۆش بوون بوو، هەروەها وەرگێڕانی ئینجیل بوو لەساڵی (1454)، کە گۆتەنبەرگ چاپی کرد.

**بلاّوبوونەوەی چاپگەری:۔**

هەر لەگەڵ دۆزینەوەی چاپ، زانست وزانیاری هەژانی گەورەی بەخۆیەوە بینی، ئەوەندەی نەبرد لە هەر یەکە لە"ئەڵمانیا، ئینگلترا، فەرەنسا، ئیتالیا" بلاّو بویەوە، مامۆستایانی زانکۆو پاپاکان پێشوازی گەرمیان لێکرد. دوای شازدە ساڵ لەدۆزینەوەی چاپ، پاپا چاپخانەیەکی لەڕۆما دامەزراند، بەهەمان شێوە شارە گەورەکان گرنگیان بە چاپگەری داو، بلاّوکردنەوەو فرۆشتنی کتێب بووبەپیشەیەکی بەرمێن. لە سەرەتای سەدەی شازدەدا"ئەلدەس مانوشیس"چاپخانەیەکی بایەخداری لەڤینیسا بەڕێوەدەبرد، تیایداچەند کتێبێکی بەنرخی چاپکرد، کەگوزارشت بوو لە شاکارێکی هونەری جوان. وە بەدامەزراندنی چاپخانە لە ولاّتی مەکسیك لە ساڵی 1536، چاپخانە بۆ یەکەم جار چویە جیهانی نوێ.

**دەرەنجامی دۆزینەوەی چاپ:**

ئەم دۆزینەوەیەو بڵاوبونەوەی، چەندین ئەنجامی گرنگی لێکەوتەوە کە لەسەدەی شازدەدا ڕەنگی دەدایەوە. لەوانە:-

1- زۆربوونی کتێبو نوسین بەهۆی دۆزینەوەی چاپ، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کەپێش دۆزینەوەی چاپ، ساڵانە دووکتێب یان زیاتر دەنوسران، لەکاتێکدا دوای دۆزینەوەی چاپ ساڵانە بەهەزران کتێب چاپدەکران لەسەدەی شازدەدا.

2- کتێبی چاپکراو لەبەر چاوان جوانو خەت ڕێك بوو، وە هەروەها هەڵەو کەمو کوڕی کەمتر بوو.

3- یەکێ لەدەرەنجامەکانی تری دۆزینەوەی چاپ، بڵاو بونەوەی زانستو زانیاری بوو، پاشان بەهۆی زیاد بوونی کتێبو هەرزان بوونی نرخەکەی، ڕۆشنبیریو زانیاری لەناو خەڵکی بڵاو بویەوەو داوکاری کتێب دای لەزیادی، بەشێوەیەك خانەدانانو چینی ناوەڕاستیشی گرتەوە، ئەمانە بەهۆی ئەوەی دۆڵەمەند بوون، توانیان کتێب خانە لەماڵەکانیان دابمەزرێنن.

4- زۆرینەی خەڵکی گەڕانەوە سەر خوێندنەوەی کتێب، ئارەزووی وێژەو ئەدەب لەناو خەڵکی دروست بوو، هەروەها نامیلەکەی پڕبابەتی جۆراوجۆرو هەرزان لەناوخەڵکی بڵاوبویەوە، وای لێکردن هەستن بە کۆکردنەوەی ئەم بابەتانە. هەروەك ئارەزووی فێربوونو چالاکی هزری تێدا زیندوو کردەوە.

## زیندوو کردنەوەی شارستانیەتی کلاسیکی:ـ

### کەلەپور( سامان )ی کلاسیکی:ـ

بەڕاستی چاپ هۆکارێکی کاریگەربوو لەبڵاوکردنەی زانیاری ومەعریفەتی باوی ئەوکات. ئەم بڵاوبوونەوەو زیندوبوونەوەیەش، بەبزوتنەوەی کلاسیکی یاخود ژیاندنەوەی شارستانی یۆنانیو ڕۆمانی ناسرا.

ئەوروپیەکان پەیوەندییانکردەوە بەشارستانیەتی یۆنانی و ڕۆمانی و،پێشینەکانیان بە هی ئەم شارستانیتە دەزانی. چەندین نوسەرو فەیلەسوفی ناسراویان هەبوو، کە لەم شارستانیەدا ڕۆڵیان گێڕاوە وەك:ـ "هۆراس، شیشرۆن، قەیصر". زمانی لاتینی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا زمانی کڵێسا بوو، سەرەڕای هەندێ گۆڕان کە بەسەری داهاتبوو. ڕۆشنبیران و پیاوانی ئاینی لە زانکۆکاندا ڕوویانکردە لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەرستۆو یاسای ڕۆمانی، وە لەمەشەوە فەلسەفەو لاهوت و یاسای کڵێسایان هەڵێنجا. هەروەها هەندێ شێوە بیر کردنەوە لەبارەی پزیشکیو کیمیاو مێژوو گەردوون لەیۆنانو ڕۆما وەرگێڕدران. جا هەندێ لەو بیرو بۆچونانە سەبارەت بە سروشتو بونەوەر ڕێك لەگەڵ تەفسیری ئایینی گونجاو بوو، بۆیە پێشوازی لێکراو هانی بڵاوکردنەوەی درا. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە شوێنەواری یۆنانیو ڕۆمانیەکان بەسەر ئەوروپیەکان لەحاڵی حازردا زاڵە، ئەمەش لەدروستکردنی کۆشكو تەلارو داتاشینوپەیکەرتاشی ئیتالیاو وڵاتی یۆنان ڕەنگ دەداتەوە، تەنانەت هەندێ لەوڵاتی تیبری ئەوروپیش لاسای ئەوان لەزۆر شتدا دەکەنەوە.

لە ماوەی ڕۆژگاری گواستنەوە لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ سەدەکانی نویٚ "سەدەی چواردە هەتا سەدەی شازدە"، ئەوروپیەکان توانیان پەی بەرن بەشارستانی کلاسیکی کۆنو لەژیانیاندا پیادەی بکەن، بەتایبەت کاتیٚ زانیان ئەم ژیارە بیری زانستی ڕاستودروست لەخۆدەگریٚو، دەتوانن خۆیانی لیٚ بەرهەمەند بکەن. بزوتنەوەی "سیکۆلائیستی" کە کاریگەر بوو بەشارستانی ئیسلامی، ڕۆڵێکی کارای گێڕا لەوهەولآنەی کەدران بۆپەیوەندی کردن بە کەلەپوری یۆنانو ڕۆمانی کۆن. بیٚ گومان مەسیحیەکان کتێبەکانی یۆنان و ڕۆمایان کە کتێبەکانی "ئەفلاتونوئەرستۆ"و فەیلەسوفانو بیریارانی کۆن بوون، لە عەرەبیەوە وەریان گێڕایەوە سەر زمانی لاتینی، سەرەڕای هەبوونی ئەو زیادەو ڕاڤەو شەرحانەی کە زاناو فەیلەسوفە مسوڵمانەکان خستبوویانە سەر. ئەم هەوڵو کۆششانە حەزی پەیوەندی کردنیان بە شارستانی یۆنانو ڕۆمای تیادا دروستکردن، بەلآم پەیوەندی کردنێک کە لەسەرچاوە ڕەسەنەکانی یۆنانو ڕۆماوە بێت، نەوەك لەڕێگەی ئەو کتێبانەی کە لەموسڵمانانەوە دەستیان دەکەوت. ئەمەش لەدوای دانانی سنورێك لەلایەن "تۆمای ئەکوینی" بۆکاریگەری فەلسەفەی"ابن الرشد"، لەسەرئاینی مەسیحی یەوە هاتە ئارا.

هەندیٚ لەبیریارانی وەك:"پترارك- یۆکاشۆ- سالیوتانی برونی"، واگوزارشت دەکەن کەسەردەمی گواستنەوە بریتییە لەگەڕانەوە بۆ شارستانی کلاسیکی، ئەمەش دوای سەردەمی تاریکی ئەنگوستە چاو. هەتا یەکیٚ لەوانە گوتی: "دووبارە ڕۆشنی گەڕایەوە، دوای چەندین سەدە

لـەتاریکی وخامۆشـی". مەبەسـتی "بڕۆنـی" لـەم وتەیـە ئـەوە نـەبوو کەسـەدەکانی ناوەڕاست بەگشتی تـاریکی بـوو، بـەڵکو مەبەسـتی دووبـارە گەڕانـەوەی کلاسـیکو هونـەرو وێـژەو مـرۆڤ بینـی بـوو، بەومانایـەی"مـرۆڤ" بونـەوەرێکی خـاوەن ژیانـەو لـەم دنیایـە دەژیو خـاوەنی سـەنگو قـەوارەی خۆیـەتی، بەپێـچەوانەوەی تێڕوانینـی پیـاوانی ئـاینی". مەبەسـت لەزینـدوو کردنـەوەی شارسـتانی کلاسـیکی، گێڕانـەوەی ڕێـزو ڕەنـدی بـوو بـۆمرۆڤ. بیریارانی سەردەمی گواستنەوە یاخود سەردەمی ڕێنیسانس، گەرەکیان بـوو خۆیـان ڕزگـار بکـەن لـەوکۆت وبەندانـەی کـەداب‌و نـەریتی سـەدەکانی ناوەڕاسـتو دامـەزراوەکانی ئـەم سـەدانە بەسـەریدا سـەپاند بـوون. وەك "کڵێسا– دەرەبەگ– دنیا نەویستی– خـۆ بـە سـوك بینین– ئامـادەگی بـۆ دواڕۆژ". ئـەوان هەسـتیان کـرد کـە شارسـتانی کـۆن، تێڕوانینـی لـە بارەی:"ژیان– مرۆڤ– جیهان" جیاوازە لـەو بارودۆخـەی کـە تیایدان، ئیـدی لەمەوە تام‌وچێژیان لەم شارستانیەوە وەرگرت و، هەسـتیانکرد کـەتێڕوانینی ئەم شارسـتانیەتە ڕاسـتو تـەواوە. بـە هەمانشـێوە هەندێ لـە بیریارەکـانی سەردەمی ڕۆشنگەری ئەو ماوەیان بـە شـۆڕش لـەدژی ئەقڵیـەتی سـەدەکانی ناوەڕاسـتو بەژیاندنـەوەی ژیرییـان دانـاوە، نـەوەك بەزینـدوو کردنـەوەی شارستانیەتی کۆن. لەمەشدا مەبەستیان ڕێنیسانس یان ژیاندنەوەی ئـەوروپا نی یە لەنوێیی[1].

---

1 Ernst Breisach ‹Renaissancnce Europe‹ 1300-1517 (newyork‹1973)‹pp.398-400.

لە سەردەمی گواستنەوەدا زیندوو کردنەوەی کلاسیکی لە ڕووی وێژەو هونەرو مرۆڤ بینیەوە، تایبەت بوو بە ئیتالیا، واتا هیچ پەیوەنیەکی بەو گۆڕانە سیاسیو ئابووریو کۆمەلآیەتیەی ئەورووپاوە نەبوو. وولآتە ئەوروپیەکان لە ڕووی سیاسیەوە گەشەیان سەندو ئابووریەکەیان پەرەی سەند، سەرەڕای هەندێ شکست کە بەسەریاندا هات. باری کۆمەلآیەتیش لە سەدەی یازدەوە یاخود پێش ئەم مێژووە گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، بەچاوپۆشی لە شارستانی کۆن. ئەم بزوتنەوەیەش لە لایەن ولآتانی ئەورووپای خۆرئاواو باکوری شاخی ئەلّپ پێشڕەوی دەکرا.

زیندوو کردنەوەی شارستانی کلاسیکی لەڕووی وێژەو هونەرەوە، یەکەم جار کورت هەلآت بوو لە لاسایی کردنەوەی کلاسیکە پێشینەکان لە کایەی نوسیندا. ئەم لاسایی کردنەوەش ئاسان کەوتبوو لەسەر ئەوانەی کە لاسایی پێشبینەکانیان دەکردەوە لە کتێب و ووتار، هەتا لە هەستو نەستو لێکۆلّینەوە فەلسەفیو ئەخلاقیەکانیشیاندا. واتا "لە هەموو ئەمانەدا شوێنی پێشینەکانیان کەوتبون". فەلسەفەی یۆنان کاریگەری بەسەر ئاینی مەسیحیەوە زۆر بوو، بەشێوەیەك کە زۆر لەبیریارانی وەك "مارسیلۆ ڤیسینیۆ، پیکۆدیلا، میراندولا...هتد"، لە هەولّی بەیەکەوە گونجاندنی فەلسەفەی "ئەفلاتونو مەسیحیەتدا" بوون، بەلآم شکستیان هێناو هەولّەکانیان بێ هودە بوو. دواتر ڕەخنەی زمانەوانیو مێژوویش پەیدا بوو. یەکێ لەو کەسانەی بۆ یەکەم جار ڕەخنەیی مێژویی گرت، "لۆرینزۆڤالا" بوو(1405–1457)، کەهەستا بە چاو خشاندنەوە بەسەر "پەخشی

قوستەنتین"ی گەورەو دەریخست کەئەم بەخشە کاری پاپاو قەشەکانەو لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ساختەیان کردوە. بەهەمان شێوە لەدوای بەراورد کردنی ئینجیلی لاتینی بەئینجیلەکانی ئیغریق، چەندین غەڵەتو پەلەتی لەناو ئینجیل دەرخست. جائەم شێوە ڕەخنە گریەو لێکۆڵینەوە مێژوییە، ئاسەواری بەسەر لێکۆڵەرانو پیاوانی زانست خوازی دواتر هەبوو، وەك"ئیرازمۆس، پیربیل، ڤۆڵتێر...هتد". هەرئەمەش هۆکارێك بوو بۆ سەرهەڵدانی لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەدەی شازدە.

## فرانسیسکۆ پترارك (1374-1306):-

زیندوکردنەوەی شارستانی کلاسیکی لەوێژەدا لەسەر دەستی "فرانسیسکۆ پترارك" پەیدابوو. "پترارك" ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ فێر بوون ووردبونەوە لەئەدەب. هەندێ لەپارچە شیعریەکانی بەزمانی ئیتالی هۆنیوەو هانی ڕۆڵەکانی ئیتالیای دەدا کەلێکۆڵینەوە بکەن لەسەر کلاسیکیو شێوازی زمانی لاتینیان چاك بکەن. "پترارك" ناوبانگی پەیدا کرد لە ناو هاوچەرخەکانی، یارمەتی ماددی لەلایەن پاپاوە پێدراو میرو پاشاکان لەڕێزگرتنو هاوکاری کردنی کێبڕکێیان دەکرد. ئەنجومەنی پیرانی شاری ڤینیسیاش ئازادی دانیشتنی پێدا لەو شارەدا. ناوبانگی بەشێوەیەك بوو، تەنانەت زۆرێك لە نوسەرانی ئەوروپای خۆرئاوا شوێن پێی ئەویان هەڵگرت .[1]

---

Ibid; pp. 341-344. 1

"جۆڤانی بۆکاشیۆ" (1313-1375) هانی پەترارکی دا بۆسوربوون لەسەر وێژەی لاتینی کۆن. "بۆکاشیۆ" وەك پەترارك نوسینەکانی بەزمانی لاتینی دەنوسی. کتێبەکەی کە بەزوبانی لاتینی نوسی بوو، ئەوەندەی نەبرد لەئیتالیاو پاشان لەکیشوەری ئەوروپا بڵاوبۆوە لەهەردوو سەدەی چواردەو پازدە. لەدوای ئەمە ئینگلتراو فەرەنساش کەوتنە گرنگی دان بەزمانی لاتینی.

لەدوای کەوتنی ئەستەمبوڵو گیرانی لەلایەن "محمد فاتیح"ەوە، چەندین مامۆستای زمانو وێژەی یۆنانی کۆچیان کرد بۆ ئەوروپا. ئەم کۆچکردنە هەر لەدوای دروستبوونی مەترسی عوسمانیەکان بەسەر بیزەنتیەکان دەستی پێکرد، ئەمەش لەدەوری ساڵی1400. لەناو کۆچکردوەکانی سەدەی پازدە "کراسولوس" لەهەموویان بەرچاوتر بوو. ناوبراو هەستا بەدامەزراندنی قوتابخانەیەك لەفلۆرەنساو تیایدا وێژەو فەلسەفەی یۆنانی دەوتەوەو دەرسی بە ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی دەگوتو لەسەر دەستی چەندین قوتابی پێگەیشت. بەهاتنی سەدەی شازدە لێکۆڵینەوە لەزمانو وێژەی یۆنانیولاتینی کۆن، بووبە کارێکی بەربڵاو لەئەوروپا. فێربوونی تازە شوێنی فێربوونی کۆنی گرتەوە، کەڕاوەستابوو لەسەر بزوتنەوەی سیکۆلائیستی.

### بڵاوبوونەوەی کلاسیك:-

فێربوونی تازە لەسەر لێکۆڵینەوەو فێربوونی زمانو وێژەی یۆنانیو ڕۆمانی وەستابوو. بەهۆیەوە سەردەمێکی تازە دەستی پێکرد، کە کلاسیکیەت تیایدا بڵاو بوویەوە، بەوپێیەی کەشارستانی کلاسیك بەرزترینو شکۆدارترین شارستانیەتە کەمرۆڤ پێی گەیشتبێ. شێوازی کلاسیکی لە

وێـژەو هونـەردا هـەتا سـەدەی نـۆزدە بـاڵی بەسـەر ئـەورووپادا کێـشابوو. چاوەڕوان دەکرا لەڕۆشـنبیرانی ئـەورووپی سـەرەرای شـارەزابوونیان لـەزمانو وێـژەی یۆنـانی و لاتینـی، دەسـتەواژەی کلاسـیکی لەنوسـینەکانیاندا بـەکاربهێننو نـاوە کلاسـیکیەکان بـەکاربێنن. کلاسـیك لـە شـێوازدا ڕێـڕەوی گرتو کۆشکی بەرزو جوانیان لەسەر شێوەی کلاسیکی دروست دەکرد کە بە پایەکانی پێشەوەی دەناسرا. هـەروەها گومبـەتی ڕۆمـانی دەڕازێنرایـەوە بـە وێنەی زەیتیو ئەو پەیکەرانەی لەسەر تەرزی پەیکەری یۆنانی کـۆن دروسـت دەکران.

## بزوتنەوەی مرۆگەری( هیومانسی ):-

بزوتنـەوەی مرۆگـەری یـەکێکی تـر بـوو لـە دیاردەکـانی بڵاوبوونـەوەو فێربـوونی کلاسـیکی کـە ڕاوەسـتا بـوو لەسـەر متمانـە بـوون بـە گـەورەیی شارسـتانی کلاسـیك. مـرۆڤ لـە زمـانی شیـشرۆندا بـە مانـای تێگەیـشتویو ئەدەبو گەشەی عەقڵو ژیری دەهـات، کـە هـەموویان کۆڵەگـەی پـەروەردە بوونی مرۆڤن بە پەروەردەیەکی گەورە. پەترارك یەکەم کەسێ بـوو بەکایـەی مرۆگـەری هەسـتا، ئەمـەش بـەهۆی ئـەو گـەرمو گوڕیـەی کـە بـۆ کتێـبو نوسینەکانی شیشرۆن هەیبوو، هەروەها ئەو پەیوەسـت بوونـە بـەهێزەی کـە هەیبو بۆ شیـشرۆن لـەدونیابینیو ژیانناسـی دا. ئەمـەو جگـە لـە هـەڵێنجانی لێکدانەوەکانیو شوێن هەڵگرتنی هەنگاوەکانی شیشرۆن. پەترارك بەشـێوەی کلاسیکی کۆن نوسینەکانی دەنوسیو شـێوەی لاتینـی بـەربڵاوی سـەدەکانی ناوەڕاستی بە سوك دادەنا.

فێربوونی نوێ لەم کاتەدا شارستانی بوو نەك شێوەی ئاینی یان خوداناسی. پەترارك پێداگری دەکرد لەسەر دونیاو گرنگدانی بە دواڕۆژ کەم دەکردەوە. گرنگی دەدا بەمرۆڤو ئارەزووەکانیو داوای دابین کردنی ژیانێکی خۆشی بۆ دەکردو گەشەی بە تواناکانی دەداو دونیا نەویستیو خۆماندوکردنو خۆ ئازاردانی لەپێناو دواڕۆژ بەبێ بایەخ لە قەڵەم دەدا[1].

ئەوانەی بایەخیان دەدا بەتوێژینەوە کلاسیکیەکان، دەیانبینی یۆنانیو ڕۆمانییە کۆنەکان، گرنگیان بە ژیانی دونیاو مرۆڤ دەدا زیاتر لە گرنگی دانیان بە دواڕۆژ. لەبەرئەوە هەموو ئەوانەی کەگرنگیاندەدا بەکلاسیكو شارەزابوون لێی، حەزیان دەکرد وەك ژیانی کلاسیکیەکان بژین.جا هەر لێکۆڵینەو لێ ورد بوونەوەیەك کە بتگەیەنێتە ئەو ئامانجانە پێیان دەووت لێکۆڵینەوە مرۆیەکانو بزوتنەوەکەش پێی دەوترا: بزوتنەوەی "مرۆگەری". لەم کاتەدا زمانو وێژەو فەلسەفەو مێژووی یۆنانیو ڕۆمانی گوزارشت بوو لەلێکۆڵینەوە مرۆییەکان، وە ئەوانەشی کە ئەو لێکۆڵینەوانەیان بەرەوپێشەوە دەبردو بەیۆنانیو لاتینی دەیاننوسی، بریتی بوون لەمرۆگەران. ئەوان دەیانویست لەژیانیاندا بەسەر ڕێڕەوی کلاسیکە پێشینەکانیاندا بڕۆنو هەموو

---

1-پێشتریش لەناو ئێمەدا تێڕوانینی زۆر هەڵە دەکرا بۆ چەمکی دنیاداریو دنیاویستی. لەئەنجامی حاڵی نەبوون لەئیسلام خەڵکی دنیایان بەشتێکی پوچو بێ بایەخ سەیر دەکرد. تەنانەت یەکێ لەهۆیەکانی دواکەتنی موسڵمانان لە ڕیردوو گرنگی نەدان بوو بەدنیاو بە فیڕۆدانی کات بوو. ئەمە لەکاتێدا ئیسلام دوادەکات تا ئەوپەڕی تواناماان هەوڵدەین دنیامان خۆش بکەین، چونکە بەبێ ژیانێکی خۆشو لەبار خواپەرستیەکی لەبارو تێرو تەواو ناکرێ. دنیا بەکەم گریش بەو مانایە نایەت کە دنیا بەهیچ نەگری، هەروەك وایان لێ فامی بوویەوە. بەڵکو بەمانای ئەوە دێت کە بەهۆی دنیاوە لە دواڕۆژ بێ ئاگا نەبی. هەروەك علی کوری ابو تالیب لەبارەی دنیا بەکەمگریەوە دەڵێ: دنیا بەکەم گری بەمانای ئەوە نایەت کە تۆ هیچ شتێکت نەبێت، بەڵکو بەمانای ئەوە دێت هیچ شتێك تۆی نەبێت. ( وەرگێڕ).

شێوەوشـێوازی ژیانیـان لـەوان وەرگـرن. وەهەرلـەم کاتـەدا زانکۆکـان زۆر گرنگیان بەلێکۆڵینەوە مرۆییـەکان دەداو زمـانی یۆنـانیو لاتینـی چـووە پـاڵ پرۆگرامی زانکۆ لەزانکۆکانی ئەوروپا[1].

**بەسوك سەیر کردنی سەدەکانی ناوەڕاست:۔**

جەخت کردنەوە لەسەر شارستانی کلاسـیكو لێکۆڵینـەوە لێـیو بەمـەزنو گەورە دانانیو بەهیومانیست سەیرکردنی لێکۆلەرانی ئەم شارستانیەتە، بـوو بەهۆی بەسوك سەیرکردنی سەدەکانی ناوەڕاست لەلایەن مرۆ گەرانو بەکەمو نابوت سەیرکردنی ژیارەکەی. ژیاری سـەدەکانی ناوەڕاسـت ڕەتدەکرایـەوەو سـەردەمەکەی بـە شـەوگارێکی تاریـك دادەنـراو وا گوزارشـتی لێ دەکـرا کـە نەزانیو بەرەبریەت باڵی بەسەر ئەم سەردەمەدا کێشاوە، تەنانـەت شـێوازی غوتی"کەوانەیی" لە دروستکرنی بیناو قەڵای میرەکـان بـەهێمای بەربەریـەت دادەنراو بزوتنەوەی سیکۆلائیستی بەبزوتنەوەیەکی نەخۆش لەقەڵەم دەدراو زمـانی لاتینـی کـارپێکراو لـە کڵێـساکان لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتدا بـەزمانی قەشـەو ڕەبەنـەکان دادەنـرا. بـەم شـێوەیە هـەموو دیاردەکـانی سـەدەکانی ناوەڕست بە هێماو نیشانەی نەزانیو پڕوپوچی پیشان دەدرا.

**بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیر (سەقافە)ی نوێ:۔**

فێرکاری نوێ هۆیەك بـوو بـۆ گـەڕان وپـشکنینو گرتنـی ڕەخنـەی هـزریو سەقافی. نوسەرانو بیریـاران لـە نوسـراوە کۆنـەکانیان دەکۆڵیـەوەو لـەدێرو شوێنە چۆڵ بووەکانو کتێبخانەی کڵێساو کتێبخانە تایبەتیەکانی دۆڵمەندانداا

---

Op. Oit; pp. 350-301. ‹Straeyer -1

بەدوای ئەم نوسراوو پەڕاوە کۆنانەدا دەگەڕان. لەئەنجامی ئەمەدا چەندین نوسـراوی ونبوویـان دۆزیـەوە کـە پێـشتر لەبەرچـاوان دیـار نـەبوون. وەك نوسـراوەکانی "کونتلیـانس" لـەبارەی وتاربێـژیو کتابـەکانی "شیـشرۆن"و "مێـژووی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی"هـی مێژوونوسـی بـەناوبانگی ڕۆمـی "تـاکیتس"، هـەروەها بیرکاریەکـەی "ڤێمـیکس"و کتابـەکانی "ڤیـزوڤیس" لەبارەی ئەندازیاری بیناسازی. ئەمەو سەرەڕای هەزاران نوسـراوی تـر کـەهی بیریارانی کلاسیکی کۆن بوون. کۆکردنەوەی نوسراوە کۆنەکان بووبە پیشەی زۆرێك لەبیرمەنـدان، تەنانـەت هەنـدێ لـە دەوڵەمەنـدان بۆخـودی خۆیان لـە کتێبـە کلاسـیکیەکان کتێبخانـەیان دروسـتکرد. شـان بەشـانی کۆکردنـەوەی نوسـراوە کۆنـەکان، پڕۆسـەی کـڕینو فرۆشـتن وبلاّوکردنـەوەی هاتـە نـاو، بەشـێوەیەك بووبـە بازرگانیـەکی بـەقازانج. بـۆ ئـەوەی ئـەم نوسـراوانە بلاّوبکرێنەوە، نوسەران هەستان بە بەراورد کردنـی هەنـدێکیان بـە هەنـدێکی تریان. ئەمان نوسراوەکانیان دەخستە بەر ڕەخنەو تەشـەر. بـەهۆی ئەمـەوە ڕەخنـەی مێـژوویی‌و شـێوازەکانی نوسـینی مێـژوو هاتـەئارا، وەك پێناوێـك بۆدەرخستنی هەڵەی ئەوانـەی کتابـەکانیان نوسـیبوویەوە، یاخود لەبـەریان نوسیبێوە. هەروەها بـۆ مەبەسـتی ڕوون کردنـەوەی ڕاسـتیو سـاغی یاخود سـاختەی ئـەم نوسـراوانە. بـەم شـێوەو ڕێگەیـە "لـۆرینزۆ ڤـالا" بەڵگـەی ساختەی "بەخشی قوستەنتین"ی دەرخست.

لەسەدەی شازدە کلاسیکیزمو مرۆگەری لەناو چینی ڕۆشنبیرانی ئـەوروپا بـــەخێرای بـــلاّو بویـــەوە. ئوســـتازو مامۆســـتایان بـــە دوای ڕۆشـــنبیری

تازەدەکەوتن‌و زۆرێک لەزانکۆو دامەزراوە نوێیەکان جەختیان دەکردەوە لەسەر لێکۆڵینەوەکردن لەکلاسیکیەت‌و مرۆگەری. ئەمەش بەزۆری لەئەڵمانیاو زەویەنزمەکان‌و سویدو سکۆتلەندە بەدی دەکرا. "لۆرینزۆی گەورە"سەرۆکی بنەماڵەی "میدیتچی" لە فلۆرەنسا، لە ڕووی ماددیەوە هاوکاری مرۆگەرانی دەکردو کتێبخانەیەکی لە فلۆرەنسادا دامەزراند، کە ژمارەیەکی زۆر لە کتێبەکانی یۆنانی‌و ڕۆمانی لەخۆدەگرت. هەروەها "فرانسوای یەکەم"ی پاشای فەرەنساش کۆلێژێکی دامەزراند بۆ لێکۆڵینەوە مرۆگەریەکان‌و، هانی هونەرمەندان‌و بیرمەندانی دەدا بۆ کۆچکردنیان لەئیتالیەوە ڕووەو فەرەنسا، بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی زانیاری ومەعریفەت لەناو فەرەنسیەکان.

## گرنگی ڕۆشنبیری نوێ:-

بزوتنەوەی مرۆگەری بزوتنەوەیەکی زانستی‌و وێژەیی‌وفەلسەفی‌و کۆمەڵایەتی بوو. مرۆگەران هەستان بەژیاندنەوەی کلاسیکی کۆنی لاتینی‌ویۆنانی‌و چینی دەسەڵاتدارانیان والێکرد کە زۆر بەگەرم‌و گوڕیەوە پێشوازی لەم مەعریفەو کایە زانستیە تازەیە بکەن. مرۆگەران بەهۆی ئەمەوە شۆڕشێکیان بەرپا کرد لەڕووی تیۆرە فێرکاریەکان‌و پیادە کردنیان. هەروەها توانیان ئەقڵ‌و خەیاڵ‌و تێڕوانینیان ڕزگاربکەن لەتەوقی سەدەکانی ناوەڕاست، ئەمەش بە لێکۆڵینەوە وێژەیی‌و فەلسەفیەکان‌و گرنگی دانیان بە بیرکاری‌و وازهێنانیان لە شێوازی فێرکاری کۆن، کەپیاوانی ئاینی پیادەیان دەکرد لەسەدەکانی ناوەڕاست. لەئاکامی ئەمانەدا چینێکی ڕۆشنبیر

سەریهەڵدا کە کلاسیکیان بەرەو پێشەوە دەبردو لەسەر شێوازی کلاسیکەکان دەیاننوسیو دەیانخوێندەوە. ئەوان بەم لێکۆڵینەوە مرۆگەریانە بەهرە بەرزەکانیان گەشەپێداو هزریان لە کەلەپچەی سەدەکانی ناوەڕاست ڕزگارکرد. بەلآم بەداخەوە ئەم بزوتنەوەیە لەناو چینی ئۆرستوقراتیو ژمارەیەکی کەمی خەڵکی چەقی بەستبوو، هەرئەمەشە لایەنی نێگەتیڤی ئەم بزوتنەوەیە بوو.

**جەختکردنەوە لەسەر خودگەری، تاك (الفردانية):-**

پێداگری کردن لەسەر تاك، یەکێ بوو لە تایبەتمەندیەکانی ڕۆشنبیری نوێو کۆمەڵگەی نوێ. مرۆگەران زۆر جەختیان دەکردەوە لەسەر باوەڕبوون یاخود متمانە بوون بەخود، وایان لێکدەدایەوە کە مرۆڤ تاکێکی جودایەو خاوەنی کەسایەتیو بەهرەی تایبەتی خۆیەتی، کە دەتوانێ گەشەیان پێبداتو بەهۆیەوە خزمەتی خۆیو دەرو بەری بکات. جا ئەم شێوە تاکگەریە، گوێڕایەڵی بۆ گەورەو دەرەبەگو سەندیکا ڕەت دەکردەوەو دانی نەدەنا بە ئیمپراتۆرو پاپاو پاشا، بەڵکو تەنها دانی بەگەورەیی خودی تاکدا دەنا. واتا(مرۆڤ خۆی گەورەی خۆیەتی). هەروەها بە قێزەون سەیرهەموو ئەو هۆکارانەیان دەکرد کە مرۆڤ لە حەزەکانی دەگێڕێتەوەو ڕێگرە لەبەردەم ئارەزووەکانی. مرۆگەران پیاوانی ئاینیوسەدەکانی ناوەڕاستیان بەبێ بایەخ لەقەڵەم دەدا. بەلآم وەنەبێ ئەمانە بەتەواوی پیادە کرابن، بەڵکو لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا زۆربەیان پابەند بوون بەئاینەکەیانو نیشتمانی خۆیان خۆشدەویستو بۆ دەسەلآتی ولآتیان دڵسۆز بوون. بۆ نمونە ئەوانەی کە

هەستان بە پرۆسەی دۆزینەوە جوگرافیەکان وەك: "کولّمبس، دیان، ڤاسکۆدێگاما، بیزار، ماجەلان"، پابەند بوون بە ئاین و دلّسۆزی حکومەت بوون، لەگەلّ ئەوەی جەختیان دەکردەوە لەسەر خود.

بەڕاستی زیندوو کردنەوە شارستانی کلاسیکی و بزوتنەوەی مرۆگەری لە سەدە نوێیەکان، زۆر گرنگ بوو، لەبەرئەوەی گۆڕانی هێنا بەسەر بیرکردنەوەی خەلّکیدا. لەکاتێکدا بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست بالّی بەسەر خەلّکی دا کێشابوو.

لەدوای سەردەمی ڕێنیسانس کاریگەری کلاسیکی بەرەبەرە کەم بویەوە، هەروەها ئارەزووی لێکۆلّینەوە کردن لەیۆنانی و ڕۆمانی دای لەکەمی و شێوازو ئامرازی زانستی جێگەی شێوازی بەربلاّو(شائع)ی گرتەوە لەلێکۆلّینەوە زانستی و مێژوویەکاندا. تێڕوانینی بیریاران لەدوای سەردەمی ڕێنیسانس لەمەڕ سەدەکانی ناوەڕاست گۆڕانی بەسەرداهات، چونکە لەدوای ئەم سەردەمە بیریاران تێڕاوانینێکی دادگەرانەیان هەبوو سەبارەت بەسەدەکانی ناوەڕاست. لەدوای ڕۆژگاری ڕێنیسانس ئەوان سەدەکانی ناوەڕاستیان بەقۆناغێك لەقۆناغەکانی گەشەسەندنی شارستانی ئەورووپا لێکدایەوە، کاتێك لەدوای ئەم سەردەمە سەردەمی‌نویێ دەستپێدەکات. هەروەها سەدەکانی ناوەڕاستیان وا لەقەلّەم نەدا کەبێ بەش بێت لەهەموو دیاردە وخەسلّەتێکی شارستانی، هەروەك خەلّکی لە سەردەمی ڕێنیسانس وەها بیریان لێی دەکردەوە[1].

---

1Ibid: PP.349 1

**کاریگەری کلاسیك بەسەر ئاینی مەسیحی:-**

مەسیحیە توندڕەوەکان دژایەتی فێرکاری تازەیان نەکردو دەسەڵاتی کڵێساش ڕێگری نەکرد. وەلێ لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ لە پیاوانی ئاینی دژایەتی بزوتنەوەی کلاسیکیان دەکرد، بەو بڕوایەی کە شێوازێکە لە بت پەرستی، ئەمەوجگە لە ترسانیان لە دزەکردنی بت پەرستی بۆ ناو خەڵکی. بەڵام ئەو لێبوردەییەو فراوانیەی کە دەسەلآتی ئاینی پەیڕەوی کرد، وای کرد ئەمە بەمەترسی نەزانرێ. نەك هەرئەمە بەڵکو پاپاکان لە هاندەرانی کلاسیك بوون‌و برەویان پێدەدا، بەتایبەت پاپا نیکولآی پێنجەم، کە دەستێکی کارای هەبوو لە بلآوبوونەوەی کلاسیکداو چەندین خەلآتی گرانبەهای دەبەخشی لەم بوارەدا. هەروەها ژمارەیەکی زۆر کتێبی کلاسیکی لە کتێبخانەی ڤاتیکاندا کۆکردەوەو گەورەترین خەلآتی تەرخان کرد بۆ ئەو کەسەی کە جوانترین وەرگێڕان بکا بۆ "ئیلیازەو هۆمیرۆس". هەروەها پاپا "پیوسی دووم" لە پێش ئەوەی بگات بەپۆستی پاپەوی، ناوبانگێکی گەورەی دەرکرد لە کلاسیکدا. "لیۆی دەیەم"یش وەك ئەوانی تر هاوکاری هونەرمەندان‌و مرۆگەرانی دەکرد، ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەو حەزوئارەزوەی بوو بۆ هونەرو مۆسیقاو پارچە ئەدەبیە جوانەکان.

مەسیحیەکان وایان دەبینی کە لێکۆڵینەوە کلاسیکیەکان خزمەتی شارستانیەتی ئەورووپا دەکات‌و دەیگەێنێتە پلەی جوانی. بەڵام بەپێچەوانەی ئەمانەوە کاریگەری کلاسیك بەرەبەرە ڕووی وەرچارخاندو بەرەو ناکۆك بوون ڕۆیشت لەگەڵ ویست ومەبەستی کلێسا. ئەمەش کاتێ ڕەخنەکانیان بۆ سەر

کڵێسا دای لە زیادیو مرۆگەران دژایەتی هەندێ لەدروشمو سروتی ئاینیان کردو لە گەورەییو گرنگی لاهوتیان کەم دەکردەوەو ژیانی ڕەبانیەتیو ئارەزوو گرتنەوەیان دایە بەر ڕەخنە، کە ئەوەندەی تر ڕەوشەکەی لەبارکرد بۆ شۆڕشی ئاینیو چاکسازی ئاینی[1].

**بەناو بانگترین پیاوانی فێرکاری نوێ:-**

ژمارەیەك لە نوسەرانی ئەوروپی بە بەناوبانگترین پیاوانی فێرکاری نوێ دادەنرێن. لەوانەش "جۆن دیکلین"ی شارەزا لە ئەدەبی یۆنانی، کە خەریکی پێگەیاندنی فرزەندەی میرو خانەدانان بوو. بەهەمان شێوە برازاکەی "فلیب میلانگتن" مامۆستای زمانی یۆنانی لەزانکۆی وێتەنربگ لە ئەڵمانیاو هاوڕێی مارتن لوسەر هەم دیس یەکێکی تر بوو لە پیاوانی فێرکاری نوێ. هەروەها "جۆن کۆلێت" یەکێکیتر بوو لەوانەو لە ئینگلتڕادا ناوبانگی دەرکردو وتاربێژێکی بەناودێر بوو. ناوبراو ڕاگری کەتدرائیەی سنتپۆل بوو لە لەندەن.

مرۆگەران لەخۆرئاوای ئەوروپا ڕوویان کردە باشکردنی باری کۆمەڵایەتیو ناشیرین کردنی داب ونەریتی بەربڵاوی ئەوسا.

"سێرتۆماسمۆر"(1535-1427) ژمارەیەك کتابی مێژووی وسیاسی بەزمانی لاتینی بڵاوکردەوە. لەناویاندا ژیانی "ڕیچاردی سێیەم". لە بەناوبانگترین کتێبەکانیشی کتێبی یۆتۆپیایە، کە بەزمانی لاتینی نوسیویەتیو بەهۆیەوە ناوبانگی لەئەوروپادا پەیدابوو. نوسەر لەم کتێبەدا لەسەر شێوەی کۆماری ئەفلاتون باس لە وڵاتێکی خەیاڵی دەکات کە

Ibid; p. 350 1

دانیشتوانەکەی بە بەختەوەرانە ژیان بەسەردەبەن. لەم ولاّتەدا هەموو تاکێك کاردەکات وسودمەند دەبێتو دەرفەتی خوێندنەوەو خەوتن ونوسین هەیە. لایەنی ئابووری ژیانی هیچ کەسی تەنگ نەکردووە. چونکە دراوێك نییە ئالّوگۆڕ بکرێ لە نێو ئەم ولاّتەدا. پادشایەتی قۆرغ کراو لەم ولاّتەدا بوونی نییەو جەنگو دووژمنایەتی تیادا نییە. ئەمەش بەهۆی لەباری سیستەمەکەی کە وای کردبوو هەموو تاکێك خاوەنی خۆی بێت. "تۆماس مۆر" لەم کتێبەیدا باسی لە کۆمەڵگەش کرادبوو. کۆمەڵگەی ناو ئەم ولاّتە خالّی بوو لە تاوانبارانی ناو زیندان، پەرستش کردن بە ئازادی دەکراو جەنگ تەنها پارێزگاری بوو نەك هێرش.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا "تۆماس مۆر" چارەسەری بۆ کێشەکانی سەردەمی خۆی دانەنا، هەرچەندە بەشێوەیەکی تەواو ئاماژەی بەلایەنە گرنگەکاندا بۆ کێشەکانی کۆمەڵگە لە سەردەمی خۆیدا. ڕاوێژکار بوونی "تۆماس مۆر" بۆ "هنری هەشتەم"ی پاشای ئینگلترا هۆیەك بوو بۆ خۆ بەدوورگرتنی لە دانانی چارەسەر بۆ کێشەکانی سەردەمی خۆی.

هەرچەندە چەندین نوسەرو مامۆستا لە دانیمارکو فەرەنسادا هەبوون، بەلاّم دیارترینیانو ڕێبەرو ڕابەری مرۆگەران لەم سەردەمەدا "ئیرازمۆس" بوو.

## دیسیدریرس ئیرازمۆز 1466-1536:

ڕەنگە بتوانین ئیرازمۆز بەدیارترین نوسەرو ڕۆشنبیری سەردەمی گواستنەوە دابنێین. ئیرازمۆز بیریارێکی مرۆگەربوو، لە شاری ڕۆتردامی هۆڵندا لەدایك بووە. بەلاّم زۆربەی ژیانی لە نێوان فەڕنساو ئینگلتڕاو

ئەڵمانیاو سویسراو ئیتاڵیادا بردۆتەسەر. ئیرازمۆز ماوەیەك سەرۆکی زانکۆی پاریس بوو. لە بواری لاهوتدا پسپۆڕو شارەزابوو، تا دواتر تیایدا بووبە قەشە. بەلاّم ئەم زۆر شەیدای خوێندنەوەو موتالاّکردن بوو، ژمارەیەك کتابی نوسیو لەنێو مرۆگەران وەك مامۆستاو بیریار ناسراو لەسەر ئاستی ئەوروپا بە پلەو پایەکی وەها گەیشت کە پاترارکیش پێچی نەگەیشت لە پێش ئەودا. هاوڕێی باوەڕپێکراوی تۆماس مۆرو جۆن کۆلێت ولیۆی دەیەم بوو، هەروەك پەیوەندی هەبوو لەگەڵ "چارلسی پێنجەم" وپاشاکانی فەرنساو ئینگلتراو، لای ئەوانیش جێگەی ڕێزومتمانە بوو.

"ئیرازمۆز" ڕاستیو لێبوردەییو ئازادی دەویست. ئەم ویستەشی زیاتر لەکایەی ئاینیدا بوو نەوەك کایەی سیاسیو ئابوری. بۆ هەموو ئەم مەبەستەناش چەندین نوسینی تەرخان کرد.

ئیرازمۆزی بلیمەت وەك پیاوێکی ئیماندار بەمەسیحیەت مشت ومڕی نەدەکرد لەمەڕ دەسەلاّتی پاپاو کلێسا. وەك پیاوێکی مرۆگەریش نیگەران بوو لەوخورافیاتە باوانەی کە باڵی بەسەر لاهوتو کلێساو مەسیحیە توندڕەوەکاندا کێشابوو. هەروەك دووژمنی نەزانی وکالّفامی بوو. ئیرازمۆز لەماڵی هاوڕێکەی تۆماس مۆر لە ساڵی 1511، کتابێکی لەژێر ناونیشانی"ستایشی دێوانەیی"دا بلاّو کردەوە. ئەم لەم کتێبەیدا ڕەخنەی توندی گرت لەرەبەنوپیاوانی ئاینیو تاوانباریکردن بەوەی ئەوان ئاین کورت دەکەنەوە لەبەئەنجام گەیاندنی حەج بۆزەوی پیرۆزو پاڕانەوەو لالاّنەوە لەقدیسان بەپیرۆز سەیرکردنی پاشماوەکانیان. ئیرازمۆز ئەم شتانەی لەسەر زاری ئافرەتێك گوزارشت کرد بە ناوی "فوولی"کە کەسایەتیەکی سەرەکی ناو کتێبەکەی بوو. جگەلەمە ئیرازمۆز ئینجیلی لە ئیغریقیەوە وەرگێڕایە سەر

زمانی لاتینی. ئەمەوئەم وەرگێڕانە جیاوازی زۆری تێدا بەدی دەکرا لەگەڵ وەرگێردراوی ڕسمی کڵێسا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئیرازمۆز پشتگیری شۆڕشی نەکرد، کاتێ لەلایەن مارتن لۆسەرەوە لەدژی کڵێسا بەرپاکرا. ئەم پشتیوانی خۆی بۆ پاپا دەربڕیو ڕەخنەی لەلۆسەر گرت لەسەر دەرچونی لەفەرمانی پاپا.

بزوتنەوەی مرۆگەری لەنیوەی دووەمی سەدەی شازدەدا ڕوبەڕووی ئاستەنگ وناڕەحەتیەکی زۆر بوویەوە. وەلێ کلاسیکیەت هەتاوەکو کۆتایی سەدەی هەژدە بەردەوامی بە خۆی داو کاریگەری هەبوو لەسەر وێژەو هونەرو پێکهاتەی بیرو هزری نوێی تایبەت بەزانستە نوێیەکان.

## هونەر لە ڕۆژگاری ڕێنیسانس:-

هونەرمەندانو وێژەوانان ئارەزوو شەیدایەکی زۆریان تیادا دەرکەوت بۆ شارستانیەتی کلاسیك. هونەر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕەنگدانەوەی ئاینی مەسیحی بوو، کاتدرائیەکان لەسەر شێوازی کەوانەیی بنیات دەنران. بەلاَم مرۆگەران هونەرێکیان نیشانی خەڵکیدا کە دەگەڕایەوە بۆ پێش سەدەکانی ناوەڕاست. ئەم هونەرە بە سانایی وجوانیو کەم مەسرەفی جیادەکرایەوە، بەلاَم کاریگەر بوو بەکلاسیەکیەتی کۆن.

### کلاسیكو هونەر:-

لە هەریەك لە سەدەکانی پازدەو شازدە گەشەکردنی هونەرەکانی ئەوروپا لە ژێر کاریگەری کلاسیکدا بوو. لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لەڕووەکانی شارستانی سەدەکانی ناوەڕاست مابوون، بەلاَم لەزیندوو کردنەوەی هونەری کلاسیکی سودی زۆر بینرا. وینەکێشەکانو پەیکەرتاشانو بیناسازان، بەشێوەیەکی بەرچاو هاوکاری دەکران، بەمەبەستی ئافراندنی نمونەیەکی بایەخدار لەسەر

شێوەی هونەری یۆنانیو ڕۆمانی کۆن. هونەری مەسیحیو هونەری کلاسیکی بەشێوەیەکی لەسەرخۆ تێکەڵبوون، ئەمەش بە بەکارهێنانی هونەری کلاسیکی لەپرسەکانی ئاینی مەسیحی دا. لەئەنجامی ئەم تێکەڵ بوونەش هونەرێکی مەزن هاتە کایەوە کەخۆی دەبینێەوە لەهونەری سەردەمی ڕێنیسانس. ئەم هونەرە مەزنەش لەنێوان بیری کلاسیکیەتو مەسیحیەتدا پەیدابوو. بەم شێوەیە کلاسیکیەت لە هونەرەکانی تەلارسازیو داتاشینو نیگرکێشانو پەیکەرتاشیو مۆسیقادا بلاوبوویەوە.

**بیناسازی:-**

شێوازی کەوانەیی، کە لە دروستکردنی بینادا بەکاردەهات، بەهاتنی شێوازی یۆنانی ڕۆمانی کۆن بەرەبەرە گلۆڵەی کەوتە لێژیو شێوازی یۆنانی وڕۆمانی بۆ هەمان بوار شوێنی گرتەوە. کەوانە"قەوس"ی یۆنانیو گومەزی ڕۆمانی، شوێنی کەلو "بورج"ی نوك تیژی گرتەوە. هونەری کلاسیکی تازە، کە بە ئاسانوسانا ناسرابوو، لە سەردەمی ڕێنیسانس لە سازکردنی هەموو بیناو کۆشکێکدا دەخرایەکار. دیارترین نمونە بۆئەم بیناسازیە نوێیە، بینای کلێسای"قدیس برتس"ە لەڤاتیکان، کە لەدروستکردنیدا دیارتینو باشترین هونەرمەندانی وەك:" برامانتی، رفائیل، میخائیل ئنجیلو، بلادیۆ"، کاریان تێداکرد. ئیتالیا ناوەندی زیندوکردنەوەی بیناسازی کلاسیکی یۆنانیو ڕۆمانی بوو، ئەم زیندوو کردنەوەیە لە ژێربالی میروخانەدانانو دەوڵەمەندان گەشەی دەکرد. پاشان ئەمە بلاوبوویەوە لە بەشەکانی تری ئەورووپا. هەر

چەندە ئیتالیا بەهۆی جەنگەوە لەڕووی سیاسیو بازرگانییەوە شەپڕێوو تێکشکاو بوو، بەلاّم توانی لەڕووی هونەرییەوە ئەوروپا داگیربکات.

فەرەنسا لە سەردەمی "فرانسوای یەکەم"و ئیسپانیا لە سەردەمی "فلیپی دووەم" هونەری بیناسازی کلاسیکیان تیادا بلاّو بوویەوە. بەلاّم لە ئەلّمانیاو هۆلّەنداو ئینگلترا ئەم هونەرە درەنگ بلاّوویەوە تا کۆتایی سەدەی شازدە.

**داتاشینو پەیکەرتاشی:۔ ( نحت ، تماپیل )**

لە سەدەی چواردەدا بزوتنەوەی کلاسیکی لە داتاشیندا سەری هەلّدا، سەرەڕای هەبوونی جوداییە کۆنەکان، کە لە ئیتالیادا بەربلاّوبوو. بەهەمانشێوە چالاکی دۆزینەوەی ئاسەوارەکان لەسەدەی پازدە، کاریگەری کردە سەر بنەمالّەی مدیتچی لە فلۆرەنسا هانی هونەری داتاشینو پەیکەرتاشیان دەداو ئارەزووی کۆکردنەوەی پارچەو نمونەی کۆنو سەنج ڕاکێشیان هەبوو. لاسایی کردنەوەی کلاسیك لە بواری داتاشین، گەیشتە ڕادەیەك کە پارچەیەکی داتاشراو لە ئەسینای سەدەی چوارو پێنجی پێش زایین، تەواو بەپارچە هونەریە داتاشراوەکانی سەدەی پازدەو شازدە دەچوو.

"لۆرینزۆ گیبریتی" 1378-1455، پێشەنگی پەیکەرتاشان بوو لەسەردەمی ڕێنیسانس. وێنەی پاپا "پاپیستری" لەفلۆرەنسادا داتاشیو بەشێوەکیش سازیکرد کە"میخائیل ئەنجلۆ" لەبارەیەوە دەلّێ:"جێگەی خۆیەتی ئەم داتاشراوە لەبەردەم دەروازەی بەهەشت دابنرێ". هەروەها

هونەرمەنــد "دونــاتيللو" 1383-1466، بەيــەكێ لــە بــەناوبانگترين هونەرمەندانی ســەردەمی ڕێنيـسانس دەژمێـردرێو تـوانی پەيكـەری "سـنت مارك" بەشێوەيەكی سەرنج ڕكێشانە لەڤينيسيا دابتاشێ. هەروەك "لوكـاديرا ڕوبيا" 1400-1482، بەناوبانگ بوو بەلاسايی كردنەوی كلاسيكی سـادە. "روبيا" قوتابخانيەكی دامەزراند بۆ داتاشـينو نەخـشاندنی زەخرەفـە لەسـەر گۆڕەكان. ئەم هونەرە لەسەدەی شازدەدا، لە نەخشاندنی زەخرەفەی گـۆڕی دامەزرێنـەری بنەماڵـەی ڤيـسكونتی لـە ميلانـۆ گەيـشتە چڵپۆپەی جـوانی. بەهەمان شێوە "ميخائيل ئەنجلۆ" يەكێكيتر بوو لەهونەرمەندەكانو ناوبـانگی لەبواری داتاشـينو بيناسـازیو وێنەكێـشاندا دەركـرد. پەيكەرەكـەی ئـەو بـۆ پێغەمبەر "داود" لە فلۆرەنسا،پارچەيەكی هونـەری جـوانو سـەرنج ڕاكێـشە لەهونەری كلاسيكيدا. بەم شێوەيە هونەری كلاسيكی كۆن سەريهەڵدا.

هونەری داتاشين بە بەراورد لەگەڵ هونەری بيناسازی زياتر لـە دەرەوەی ئيتاليادا بلاوبوويەوە. هەريەكـە لـە "هنـری حەوتـەم"و "فرانـسوای يەكـەم" بەمەبەســتی داتاشـــين و ســـازكردنی پەيكـــەری خۆيـــان بانگهێـــشتی پەيكەرتاشـانيان دەكـرد. لـەپێش هـاتنی "لۆسـەر"، داتاشـينی كلاسـيكی لەئـەڵمانيا سـەريهەڵدا. پاشـان لەئـەوروپای خۆرئـاوا لەسـەدەی شـازدە بلاوبوويەوە.

### تابلۆو نيگاركێشان:-

هونەری وێنەكێشان زياتر لـە داتاشـين گەشـەی سـەند. لەپێـشتردا وێنـەو تابلۆكـان لەسـەر ديـواری خـانوو كۆشكوكڵێـساكان، يـاخود لەسـەر قومـاش دەكێشرانو ڕەنگ دەكران بەڕەنگە ئاوييەكانو پێيان دەوترا:"فريـسكۆس". بـەلام ئـەم ڕەوشـە هـەروا نەچـووە پـێش، بـەڵكو لـە سـەدەی شـازدەدا

وێنەکێشان لەسەر لەوحو قوماش، لەگەڵ وێنەکێشانی سەر دیوارەکان جیابوویەوە. بە بەکارهێنانی ڕەنگی زەیتی لە هونەری وێنەکێشاندا گەیشتە پلەی کەماڵو تێرو تەواوی.

لەڕاستیدا هیچ نمونەیەکی کلاسیکی بۆ هونەری وێنەکێشان نەبوو. ئەو وێنانەش کە لەسەر دیواری خانوو بینا کۆنەکان کێشرابوون لەناچوبوون. شوێنەواری شاری "پومپی" تا ئەو ساش هەردارو پەردو بوو، تاکۆتایی سەدەی هەژدە نەدۆزرایەوە. ئەمەش وای کردبوو وێنەی سەر دیوارەکانی لەم کاتەدا ناسراو نەبن. کاتێکیش هونەرمەندان نمونەی وێنەی کلاسیکی کۆنیان لەلانەبوو، ناچاربوون بەردەوام بن لە پەیڕەوکردنی شێوازی مەسیحی.

ژمارەیەك وێنەکێشی مەزن پەیدابوونو لەناویاندا چواریان لەسەدەی شازدەدادە ژیان. بەهۆی ئەوەی ئەوانە لەهونەردا گەیشتنە پلەی کەماڵ. ئەمانیش برتیبوون لە:"لیوناردۆ داڤنشی- میخائیل ئەنجلۆ- رفائێل- تیتان".

**لیۆناردۆ داڤنشی: 1452-1519:**

ئەم بلیمەتە لە فلۆرەنسا لەدایك بووەو هەر لەوێشدا پێگەیشتووەو لەژێر چاودێری هەردوو بنەماڵەی "سفورزا"ی میلانۆ وبنەماڵەی "میدیتچی"فلۆرەنسادابوو. خوانی خودایی"عیشاءالربانی" لە بەناوبانگترین وێنەکانی بوو، کەجارجار پێیان دەووت: "خوانی پیرۆز"، ئەمەش بریتیبوو لە کۆبوونەوەی مەسیح لەگەڵ حەواریەکان لەسەر خوانی

ئێوارە. هەروەها داڤنشی وینەی "مۆنـالیزا"ی کێشا کـە وێنـەی کـچە لاوێـك بوو. ئەم دوو وێنەی ئاماژەمان پێدان جوانترین داهێنانەکانی لیوناردۆ بـوون. تەنانەت وێنەی مۆنالیزا بەیـەکێ لـە وێنـە نایابـەکانی لیونـاردۆ دەژمێـردرێ. ئەمـەش بـەهۆی هونـەری ڕەنگکردنـیو دروسـتکردنی سـێبەرو ڕونـاکی بەشـێوەیەکی زیرەکانـە. وێنـەکان لەچڵەپۆپەی جـوانیو سـەرنج ڕکێـشی دابوون. وەك باسـکراوە لیونـاردۆ وێنەکێکشێك بـوو میکـانیزمی زانستی لـە وێنەکردندا بەکاردەهێنا بەهۆی شارەزابوونی لەزانستی توێکاریزانیدا ئەمـەش لە لەوحەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. لیوناردۆ وەك ئەندازیارێك کـەناڵێکی بنیـات ناو شـورایەکی لـەدەوری میلانـۆدا دروسـت کـرد. ئـەم کەڵەهونەرمەنـدە وەك میکانیکیـەكو نەخـشەسازو مۆسـیقاژەن وفەیلەسـوفێك کـاری دەکـرد. ئـەم بلیمەتـە ناوازەیـە نوسـینێکی زۆری نوسـیوەو چـەندەها قوتـابی هـەبووە. کۆتـایی تەمەنیـشی لەفەڕەنـسادا بەسـەربردو لەوێـشدا هـانی بڵاوکردنـەوەی وێنەکێشانی دەدا.

**میخائیل ئەنجلۆ 1475-1562:-**

ئەمەش وەك لیوناردۆ ناوبانگێکی زۆری هـەبوو. لـە زۆرێـك لەهونەرەکانـدا لێوەشاوەییو بەسەلیقەیی تێدادەرکەوت. میخائیل لەشاری فلۆرەنسا لـەدایك بـووەو پەیکەرتاشـێکی مـەزنو ئەنـدازیارێکی تەلارسـازو وێنەکێـشێکی هەڵکەوتووبوو. تەنانەت گـوتراوە:"شـاعیرو فەیلەسوفیش بـووە". میخائیـل کاتـەکانی خـۆی لـەنێوان فلۆرەنـساو ڕۆمـادا بەسـەردەبرد، واتا"هەرکاتەولەشارێك بوو". ئەم خزمەتی ژمارەیەك لەو پاپایەنەی کـرد کـە

هونەریان خۆشدەویست. ئەم هەڵکەوتوە کەسایەتیەکی جێگیری هەبوو، دەستی دەگرت بە ئەخلاقە نەتەوەیەکان و خۆشەویستی زۆری هەبوو بۆ فلۆرەنسا. جوانترین داهێنانەکانی پەیکەری نەبی داود وپێغەمبەر موسی و کلێسای قدیس پترۆس بوو لە ڤاتیکان. هەروەها نیگارو تابلۆی تۆفان وڕۆژی دوایی بوون، کە لەسەقف و بنمیچ و دیواری کلێسادا نەخشاندبوونی و، بە نیگارە دەگمەنەکانی جیهان هەژمار دەکرێن.

**ڕەفائێل** 1483-1520 :-

هونەری نیگارکێشان لەسەردەستی ئەم هەڵکەوتەیە گەیشتە لوتکەی کەماڵوجوانی. ڕەفائێل لەهونەری وێنەکێشاندا لەسەرووی ئەنجلۆوە بوو، پیاوێکی سەرنج ڕاکێش بوو، لە خزمەتی پاپا جولیسی دووەم ولیۆی دەیەم دابوو، وەك ئەندازیارێك لە دروستکردنی کلێسای "قدیس پترۆس" کاری کردووە. ڕەفائێل ئارەزووی پەیکەرسازی وئاسەواری هەبوو، بەلاّم بلیمەتیەکەی تەنها لە نیگارکێشاندا ڕەنگی دایەوە. لە بەناوبانگترین لەوحەکانیشی تابلۆی مەریم وعیسی ی فرزندەیەتی(د–خ).

**تیتیان** 1477-1576 :-

تیتیان خەڵکی ڤینیسیا بوو، لەوێشدا سەرپەرشتی قوتابخانەیەکی نیگارکێشانی دەکرد. لەڕەنگە زەیتیە پڕشنگدارەکاندا ناوبانگی پەیداکرد. تیتیان بەهۆی پەیوەندی هەبونی بەئیمپراتۆر "چارلسی پێنجەم" و"فیلپی دووەم" ناوبانگێکی مەزن وسامانێکی زۆری پێبڕا. لە نیگارە زەیتیەکانیدا

شکۆمەندی وگەورەیی بەدیدەکرا، ئەم خاسیەتەش لەهەریەکە لەتابلۆی چارلسی پێنجەم وفیلیپی دووەم ڕەنگی داوەتەوە.

لەئەوروپای خۆرئاوادا هونەری نیگارکێشانی ئیتالی پەخشان بوو، هەریەکە لەفرانسوای یەکەم وفیلیپی دووەم، بۆ فێرکردنی خەڵکی ولاتەکانیان هاوکاری ماددی هونەرمەندانیان دەکرد. لەئیتالیادا نیگارکێشێکی یۆنانی کارتێکراو بەتیتیان پەیدابوو، ئەم نیگارکێشە ناوی "گریکۆ" بوو، تابلۆکانی ئاینی بوون وئێش وژانیان تێدا بەدی دەکرا. لە ئەڵمانیاشدا دوو نیگارکێشی مەزن سەریانهەڵدا، بریتی بوون لە:"بریخت دووری"1471-1527، کە دانیشتوی شاری نورمبرگ بوو، بەهونەرمەندانی ئیتالیا کاریگەر بوو. پەیکەرەکانیﻨﻤﻮنە بوون لەجوانی دا، "دوری"وەك پەیکەرسازو نیگارکێشێك ناوبانگی دەرکرد، تابلۆی "سوارو مردن" لە نیگارە بەناوبانگەکانی بوو. دووەمیان "هانزهۆلبین"بوو، کە لەسالانی 1497-1543 ژیاوە. هۆلبین لەشاری "ئۆکسبرگی" ئەڵمانیادا ژیانی دەبردەسەرو، سەربە خانەوادەیەکی نیگارکێش بوو، ماوەیەکیش لە شاری "بالی" سویسرا نیشتەجێ بوو. سالانی کۆتایی تەمەنیشی لەئینگلتراو لەخزمەتی هنری هەشتەم دا بەسەربرد. هۆلبین ناوبانگی دەرکرد بەکێشانی وێنەی هنری هەشتەم وخێزانەکەیو وێنەی ئیرازمۆز وتۆماس مۆرو فلیپ میلانگتن. شیاوی باسکردنە هۆلبین هونەری ئەڵمانی هۆڵندی لێوان لێو بە بیری مرۆگەری تێکەڵ بەیەکتری کرد.

**مۆسـيقا:۔**

نـاكرێ بلـێین: مۆسـيقا وەكـوو كايـەو هونەريـەكانی تـر، كەوتۆتـە ژێـر كاريگەری كلاسيك. ئەمەش بەهۆی ئەوەی هيچ ئاسەوارێكی مۆسيقی يۆنـانی وڕۆمانی كۆن لەوێدا بوونی نەبوو. مۆسـيقا لەسـەدەی شـازدەو لـە مۆسـيقای باوی كۆتـايی سـەدەكانی ناوەڕاسـتەوە گەشـەی كـرد. لەسـەدەی شـازدەدا، مۆسيقا گۆڕانی بەسەردا هاتو توانرا هاوئاهەنگی بكرێ لەنێوان ئاوازەكانيداو بەيەكەوە بيانگونجێننو ڕێكيان بخـەن. هـەر لـەم سـەدەيەدا ئـامێری تـازەی مۆسيقی وبيركردنەوەی تازە سەبارەت بەمۆسيقا هاتەكايـەوە. مۆسـيقاژەنان بە ئەوروپاداو بەتايبەت بە ئيتالْياو هۆلْندادا بلاْوبونـەوە. هـەروەها ژمارەيـەك مۆسيقاژەن لەئيسپانيا وفەڕنسادا هەبوون، لەئينگلتڕاش "جۆن پـۆل، وليـەم بيرد، ئورلاندگيپسن" وەك مۆسيقاژەنانی دەرباری پاشا ناوبانگيان دەركـرد. لەئەلْمانياشـدا ژمارەيـەك شـێوە ئـاوازی تايبـەت بـە بـواری ئـاينی لـەژێر سەرپەرشتی مارتن لۆسەردا بلاْوبويەوە.

لـەئيتالْيا "پاليـسترينا"1524-1594، مـەزنترين مۆسـيقاژەن بـوو لەسـەدەی شـازدەدا. پاليـسترينا لــە ڤاتيكانـدا مۆسـيقايدەژەنیو تێـرو تـەواوترينو جـوانترين مۆسـيقای ئـاينی بەرهـەم هێنـا. لـەئيتالْيادا شـانۆو داسـتانی ئـاينی لاواندنـەوە لـەژێرناوی "ئواتوريـو" سـەريهەلْدا. لـەم كاتـەدا ئيتالْيا ناوەندی ئاوازی مۆسـيقی بـوو. "جيۆڤانیگـابريلی"1557-1613، يەكێكبوو لەدامەزرێنەرانی "ئۆكسترا"ی نوێ. ڤينيـسياش بووبـە ئەوشـارەی بۆ يەكەم جارو لەسالْی 1501، ئاوازی مۆسيقی چاپ كرد.

**وێــــژەی نەتەوەیــــی**

زمانــە نەتەوەییــەکان لەســەدەکانی ناوەڕاســتدا بــەرەو دروســبوونو گەشــەکردن دەچــوون. هــەروەها هەنــدێ پارچــەی ئــەدەبی نایــاب بەزمانــەکانی "ئیتــالی- فەرەنسی- ئیسپانی- ئـەڵمانی- ئینگلیـزی"پەیـدا بــوون. بــەڵام زینــدوو کردنــەوەی شارســتانی کلاســیکی لەســەدەکانی چـواردەوپازدەو زۆرپێـداگری کردنـی لەسـەر زمـانی لاتینـی وایکـرد نوسـین بەزمانی نەتـەوەی پێشکەوتن بەخۆیەوە نەبینێ. ژمارەیەکی زۆر لـە ئـەدیبو لێکۆڵیــاران وبیریــاران بــەزمانی لاتینیویۆنــانی دەیاننوســی. "پــتراركو ئیرازمۆس" لەنێوئەو کەسانەدابوون کـە بـەم زمانەنوسـینەکانیان دەنوسـی. ئەمانە دەستەواژەکانیان لە"فرجیلو هۆراسو شیشرۆن" هەڵدێنجا.

وەلێبــارودۆخ لەســـەدەی شــازدەگۆڕانی بەســـەرداهات.ململانــێ نەتەوەییــەکانو دۆزینــەوە جوگرافیــەکانو پێــشکەوتنی ئــابووری وڵاتــە ئەورووپیەکانو پێویستی زۆرینەی خەڵکی بـە زمـانی نـاوخۆییو بـەکارهێنانی لەژیانی ڕۆژانەدا، پاڵی نا بە زانایانو لێکۆڵیاران کـە گرنگـی بـدەن بـە زمـانی نەتەوەییو هەوڵی دانانی فەرهەنگ وڕێزمان بدەن بـۆ هەریەکـە لەزمانـەکانی "ئینگلیــزیو فەرەنــسیو ئــەڵمانیو ئیتــاڵی هۆڵنــدیو ئیــسپانی". زانــای ئەڵمانی"کۆنبراد فۆن جیسنر"،پـەیامێك یـاخود نوسـینێکی نووسـی لەسـاڵی 1453، کە تیایدا وەسفی سەد زمانی نەتـەوەیی کردبوو. شایەنی باسە ئەمە یەکەمین هەنگاو بوو سەبارەت بەلێکۆڵینەوە کـردن لەزانستی بـەراوردکاریو

جیاوازی. ئیدی دانانی فەرهەنگو ڕێزمان بوونە هۆیەك بۆ دانانی بناغەی چەمك ودەستەواژەی ئەدەبی زمانەئەوروپیە نوێیەكان.

لەڕاستیدا بابەتە ئەدەبیە بلاّوكراوەكانی ئەم سەردەمە بابەتی ئاینی بوون، وەك نوسینی صەلاواتو وەرگێڕانی ئینجیل. بەشێكیش لەوانە دادەنرێن بەمەزنترین پاچەی ئەدەبی نەمر لەهەگبەی وێژەی ئەڵمانیو ئینگلیزیو فەرەنسی. وەك وەرگێڕدراوە ئینجیلەكەی ئەڵمانی كەلەلایەن مارتن لۆسەرەوە وەرگێڕدرا. هەروەها نوسینەكەی ئوسقف كرامر بۆ سەلاوات بەزمانی ئینگلیزی. ئەمەو جگە لەدەستورە ئاینیەكەی كالڤن، كەدادەندرێت بە گەورەترین پارچەی ئەدەبی نەمر لەوێژەی ئینگلیزیو ئەڵمانی وفەڕەنسی. مێژووی ژیانی "قدیس تریزا"ش كە لەلایەن خۆیەوە نوسراوە، لەجوانترین نوسراوەكانە كە بەزمانی ئیسپانی نوسرابێت. سەرهەڵدانی پرۆستانتیو چاكسازیو پاكسازی ئاینی، كاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر پەرەسەندنی زمانی نەتەوەییو گەشەسەندنی. ئەمەش بەهۆی دانرانی كتێب و بلاّوكراوەیەكی زۆر لەدژی كاسۆلیكی، یاخود بۆ پارێزگاری كردن لەكاسۆلێكی وەك دژە كاردانەوە لەبەرامبەر پرۆتستانتەكان. لەهەردوو لایەنیشدا خەڵكی ناچار بوون موتالاّی بكەنو بیخوێننەوە. ئیدی هەموو ئەمانەی باسمان كردن ڕێگەیان خۆشكرد بۆ نوسین بەزمانی نەتەوەیی

بەرهەمی وێژەیی لەسەدەی شازدەدا شەقلّ وخاسیەتی نەتەوەیی هەبوو. بەشێكی گەورەی بەرهەمەكانیش لەلایەنی سیاسیو مێژوویو ئاینی خۆی دەبینیەوە، بەشێكیش لەم بەرهەمەی سەدەی شازدە گەیشتە دەرەجەیەكی

زێـده بـەرز لــە جوانیـدا. وەك كتـابی "مـیر" و "مێـژووی فلۆرەنـسا"ی میكافیللی و "ژیانی دوو هونەرمەندەكە لە ئیتالیا" كە "ڤێزار"ی نوسی بووی. هـەروەها كتـابی "یۆتۆپیـا"ی سـێرتۆماس مـۆرو "مێـژووی ئیـسپانیا"ی "جیزوت ماریانا" و كتێبی "كۆمار"ی "جان بوودان" لە فەلسەفەی سیاسیدا. شیاوی باسە هەموو ئەم كتێبانە لەبەرهەمە جوان و نایابەكان دەژمێردرێن [1].

لەڕاستیدا بەرهەمـە ئەدەبیـەكانی سـەردەمی ڕێنیـسانس مـۆركێكی بتپەرسـتانەی كلاسـیكی و مرۆگـەری وەرگرتبـوو. جـەختی دەكـردەوە لەچـێژوەرگرتن لـەژیان. بەشـێكی ئەمانـە نمونەیـەك بـوون لـەزیرەكی و بەهرەداری ئەدەبی. نوسەری كۆمیدی فەرەنـسی "ڕابێلـی "1490–1553، خاوەنی كتێبی "گاراگـانتو یانتـاگرول"، یەكێكـە لـەو نوسـەرانە. نوسـەر لـەم كتێبـەدا نمایـشێكی گاڵتـەجاڕی پیـشاندەدات سـەبارەت بـەژیانی سیاسـی و كۆمەڵایەتی و ئاینی. بەشێوەیەكی ئـەدەبی گاڵتەجاڕانـە ڕەخنـە لـەبارودۆخی كۆمەڵایـەتی خـراپ و بۆگـەن دەگرێـت و پێـداگری لەسـەر ئاقـاری مرۆگـەری دەكـات. هــەروەها "مایكـڵ دی مۆنـت "1513–1592 كـە لـەباوكێكی فەرەنسی و دایكێكی جولەكەبوو، كتێبێكـی نوسـی بـە نـاوی "وتارەكـان" كـە بریتی بوو لە كۆمەڵـە وتـارێكی ئـەدەبی. ئـەم كتێبـە جـۆرێكی تـازە بـوو لـە ئـەدەب، كـە بەشـێوەی بابـەت بابـەت نوسـرابێت. هـەموو بابەتـەكان شێوەپەخـشان ئـامێزێكی جـوان بـوون و جـەختیان دەكـردەوە لەسـەر

---

1 Jouis Go ttschalk; Earope the Modern World(Chicago، 1951)،V.l، PP.140-144.

لێبـوردەیی‌و ئـازادی‌و سەربەسـتی بیرکردنـەوەو تێگەیـشتن لـە کێـشەکانی ئادەمیزاد کە کۆتاییان پێ نایەت. ڕۆشنبیری ڕاستەقینە لە ڕووانگەی ئـەودا، تەنها لە ڕێگەی پرسیارکردنی ڕاست‌و ڕەوان‌و تێگەیشتن لە کێشەکانی مـرۆڤ بەدەسـتدەهات. هـەروەها ڕای وابـوو کـە وەڵامـەکان جێگـەی دڵنیـایی نـین، ئەمەش بەهۆی ونبوونی معریفەی مرۆڤایـەتی. "مایکـڵ دی مۆنـت" دوودڵـی‌و گومانکردنی لە دەستوورو بڕیار، یان لە هەموو بڕیارو یاساکاندا بە گەورەترین بەرهـەمی مرۆیـی دادەنـا. دی مۆنـت دەڵـێ:"بـێ گومـان ئێمـە لـە نەفـسی خۆمانەوە یان لەشتەکانی ترەوە ڕاستیەکان نـازانین، لەبـەر ئەوەیـە زۆربـەی جار بڕیارەکانمان ناتـەواون، ئێمـە دڵنیـانین لـەبیرو بۆچـونمان سـەبارەت بـە شتەکان، لەبەر ئەوە ناگونجێ بکەین بە ڕاسـتی". هـەروەها دەڵـێ: " مـادام مرۆڤ گوماندارە سـەبارەت بـە شـتەکان، کەواتـە نـاگونجێ بکاتـە ڕاسـتی لـە ڕێگەی ئەقڵ‌و هەستەکان، لەکاتێکدا ئـەم دوو لایەنـە مـرۆڤ لـە گومـان ڕزگـار دەکەن. بۆیە پێویستە باوەڕێکی قوڵی هەبێ بە ئایین.

"سێرڤانتس"ی ئیسپانی کە لەنێوان ساڵی "1547_1616"ژیاوە. ئـەم لەڕووی ئەدەبیەوە لە لوتکەی بەهرەداری دابوو. لەکتێبی "دۆنکی شـۆت"دا گاڵتە بە ژیانی سەدەکانی ناوەڕاست دەکات، ئەمە لەکاتێکدا ئیـسپانیا ڕووی لەسـەردەمی ڕێنیـسانس‌و مرۆگـەری وەرچـەرخاندبوو بـەرەو سـەدەکانی ناوەڕاست هەنگاوی دەنا. سـێرڤانس یـەکێ بـوو لـە مرۆگـەرەکان. یـەکێ لـە کتێبـە پڕچـێژە ئەدەبیـەکانی کتـابی"ژیـانی بینیڤینتـۆ چـیلینی"ە

1500_1517، کە تیایدا بە شێوەیەکی سەنج ڕاکێشانە باسی ڕەوشی باوی ئەو کات و کارە سەرکێشیەکان دەکات.

**داستان و دراما:-**

ڕەنگە بتوانین داستان و دراما بەدیارترینی ئەو بوارانە دابنێین کە هونەرو ئەدەب لەسەدەی شازدە پێیگەیشتووە. بەرهەمی ئەو دوو بوارە کاریگەری کلاسیکی و مرۆگەری بەسەرەوە بوو لەڕووی بابەت و جۆرەوە. کەس و شوێنەکان ناوی کۆنیان بۆ دادەنرا. تەنانەت ئەگەر بابەتێکی کلاسیکی نەبوایە ئەوا ئیتاڵیایان دەکردە شانۆیەك بۆ داستان و چیرۆکەکانیان و بە گیانێکی نەتەوەیی نوێ دەچوونە ناویەوەو خۆیان لەگەڵی تێکەڵ دەکرد. شیاوی باسە زۆرینەی ئارەزومەندانی دراما لەچینی خوێندەوار بوون.

بەناوبانگترین ئەدیبە ئیتالیەکان بریتی بوون لە "ئۆرلاندۆو ئاریستۆ" 1474_1533، کە بە شێوەیەکی کلاسیکی گوزارشتی دەکرد لەخۆشەویستیەکی ڕۆمانسی. هەروەها "تاسو"(1544_1585) بە شێوەیەکی داستان ئامێز لەسەر شێوازی فێرجێل باس لەڕزگارکردنی "بیت المقدس"دەکات و گوزارشت لە سۆزی خاچیەکان دەکات. هەروەها لەپرتوگال "لویسو ئۆف کاموین" 1562_1635، داستانێکی نەتەوەیی نوسی لەبارەی گەشتی "ڤایسکۆ دیگاما" بۆهیند. بەهەمانشێوە"لوپ دی ڤیکا" 1562_1635 چەند بابەتێکی نیشتیمانی لە مێژووی ئیسپانیا نوسی. جگەلەمانە لەفەرەنساش "پیردی ڕونسارد" هەبوو 1525_1585، کە ڕابەری کۆمەڵێ لە شاعیرانە، هەستا بە گرتنە بەری ڕێڕەوی

کلاسیکی.ڕونسارد لەژێر کاریگەری یۆنانی‌و ڕۆمانی دابوو، هەستەکانی لەخۆشەویستی‌و سروشتدا خۆی دەبینیەوەو هەستێکی قوڵ‌و خەیاڵێکی داهێنەرانەی نمایش دەکرد. هەروەها "ئەندمۆند سبنسر"ی ئینگلیزی 1552_1599، لە بەرهەمەکەی دا بەناوی "شوان" گەیشتە قوڵی هەستی شیعری، بە شێوەیەك لەشعری کەسی تر ئەمە بەدی ناکرێت‌و جۆرێکە لەئەدەبی دێهاتی. ئەمەو جگە لەنوسینی داستانی "شاجوانی پەریەکان (حۆری)" لەسەر شێوەو شێوازی ئەرستۆو تاسۆ. "کریستۆفر مارلو" 1564-1593، بەهۆی شانۆی "تەیموری لنگ، فاوست، ئیدواردی دووەم ، جولەکەی مالتا"، دەرگەی درامای خستە سەر گازی پشت. مارلو لەزانکۆی کمبرج کلاسیکی خوێندووەو هاوڕێ‌و هاوچەرخانی پێی سەرسام بوون. شعرەکانی لە چلەپۆپەی قەشەنگی‌و سەرنج ڕاکێشی دابوون .[1]

**ولیەم شکسپیر1564_1616:-**

ئەم هەڵکەوتە ناوازەیە لە دایك‌و باوکێکی ئینگلیز، لە 26_نیسانی_1564 لە شاری ستراقورد لەدایك بووە. سەرەتای ژیان‌و خویندنی سەرەتایی لەم شارە بووەو لەگەڵ کچێکی ئەم شارەش لەتەمەنی هەژدە ساڵی هاوسەرگیری پێکهێناو کچێکی بوو بەناوی "سوزانا". شکسپیر وەك نوسەرێکی شانۆیی لە لەندەن لەساڵی 1584 پڕشنگی داو بە بەردەوامی تیایدا مایەوەو بەهرەمەند بوو لە ژیان‌و ناوبانگ‌و سامان، هەروەك

1 Koehgsberger and Mosse، Europe in the 16th century (new york)19 PP.317-320;also Gotts chalk، op.cit;pp.138-139

ئەندامێك لە شانۆی سەرەكی لەندەن. شكسپیر لە ساڵی 1610 بۆ شوێنی لە دایكبوونی خۆی گەڕایەوە "ستراڤۆرد" و وەك كەسێكی ناسراو ژیا، هەتا لە 23_نیسانی_ 1616 چاوی لێكناو لە دونیا دەرچوو. نازانرێ شكسپیر كەی دەستی بە نوسینە شانۆیەكانی كردووە، كە ساڵانە دوو شانۆی دەردەهێنا. "بین بونسن"هەستا بەكۆكردنەوەی شانۆكانیو لەساڵی 1623، بڵاوی كردەوە. هەروەها شعرەكانی "سونیت" كە 154 پارچە بوونو لەساڵی 1609 بڵاو كرانەوە.

شكسپیر دوو چیرۆكی شیعری نوسی، بەناوانی "ڤینوسو ئەدینۆیس، زەوت كردنی لۆكریس". بەناوبانگترین شانۆكانیشی "هاملیت" بوو. هاملیت بریتی بوو لە ململانێی نێوان خۆشەویستیو تۆڵە سەندن. هەروەها "ڕۆمیۆ وجولیت" چیرۆكی دوو گەنج بوو كە شكستیان هێنا لەئەڤینی. "یۆلیۆس قیصر"یش كە درامایەك بوو، بریتی بوو لەململانێیەكی ویژدانی لەنێوان ئارەزوی دڵو ئەركی نیشتمان. هەروەها "پادشای لیر"، كە خۆی دەبینیەوە لەخۆشەویستیو ڕق لێبوونەوەی لە ناو خێزانێكدا. چیرۆكی "ڕیچاردی دووەم" باس لەهەستی نەتەوەیی گەشەسەندووی ئینگلتەراو دڵسۆزی بۆ ئەو پارچە زەویە مەزنو پایەدارە دەكات، واتا خاكی ئینگلترا. لەمانەدا شكسپیر پێداگری لەسەر تاكگەرایىو نەتەوەیی دەكرد. هەروا چەند شانۆیەكی تری هەبوو كە تراژیدیو شۆخی ئامێزو مێژووی بوون، لەناویاندا "بازرگانی بندەقیە- چۆن خۆشی دەوێی- خەوبنین لە نیوەشەوی هاویندا-

گەردەلول- ئەنتۆنی و کیلۆ پاترا- شەوی دوازدەهەم"، لەگەڵ چەند شانۆیەکی تر، کە دواتر ڕۆژگارگەورەیی و مەزنی و نەمری دەرخستن.

شکسپیر کەسێکی مەزن بوو، ئەوەندە بەسە کە ڤۆڵتێر لەبارەیەوە دەڵێت: "ئەگەر شکسپیر تەنها شعرەکانی "سونیت"ی هەبووایە ئەوا بەسی بوو بۆ ئەژمارکردنی وەك مەزنترین شاعیری نەمر". هەروەها "بین جۆنسن" لەبارەیەوە دەڵێت:"شکسپیر نوێنەری جێلێ ناکات، بەڵکو بۆ هەموو جیلەکانە".

مرۆگەران باوەڕیان وابووگەشەسەندنیتەواوی تاك، هۆیەکە بۆ چاککردنی کۆمەڵگە. لەبیرو بۆچونی مرۆگەراندا ئەوە دەخوێنرایەوە، کە خەڵکی لێوان لێوە لە"شەڕ_ نەزانی_ ستەم_خراپ کەڵکوەرگرتن لەدەسەڵات". پێیانوابووهەموو ئەمانە پێویستە چارە بکرێن بە فەزیلەت و ڕۆشنکردنەوە وهەست کردن بە بەرپرسیاریەتی و ڕاستی.[1]

### بەراوردێك لە نێوان سێرڤانتس و شکسپیر:ـ

سێرڤانتسی ئیسپانی و شکسپیری ئینگلیزی، لەیەك ڕۆژدا مردن. واتا:هەردووکیان لەبەرواری 23-نیسانی-1616مردن. "سێرڤانتس" تەمەنی 69 ساڵ بوو، شکسپیریش تەمەنی 52 ساڵ. ڕەنگە نەتوانین بڵێین: کە ئەم دووانە یەکتریان ناسیوە یاخود ناوی یەکتریان بیستووە، هەرچەندە شکسپیر بەشی یەکەمی دۆنکیشۆتی بەزمانی ئینگلیزی خوێندوەتەوە. هەرچۆنێك بێت

1 Go ttscholk، pp. 138-139

ئـەم دوو پیـاوە گـەورەبوون بـە گـەورە بـونێکی نائاسـودەیی‌و نـاجێگیری لەسـەرەتای ژیانیانـدا. بـاوکی سـێرڤانتس(جـەراح) نـوژدارێکی فاشـیل بـوو، لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر بـۆ بـەخێو کردنـی حـەوت منداڵەکـەی لەهاموشـۆ دابوو(ئەم شارو ئەو شاری دەکرد). شکسپیریش منـداڵی زۆر بـوو، هەمیـشە قـەرزار بـوو. قـەرزەکان بـە شـێوەیەك بـوون، کـە لـە دادگـادا سـکاڵای زۆری لەسـەر تۆمـار دەکـرا تـا مایـە پـوچ بـوو ئەندامیـەتی خـۆی لـە ئەنجومـەنی شـارەوانی لـە دەسـتدا. هـەر لەبەرئەمـەش بـۆ هـیچ کـام لـەم دوو نوسـەرە دەرفەتی خوێنـدنی زانکۆیـان بـۆ نەهاتـەپێش. هەریەکـەیان پێـچەوانە بـوون لەگەڵ داب‌و نەریتی کۆمەڵایەتی، شکسپیر کچێکی زەوت کرد کە هەشت ساڵ لەخۆی بچوکتر بوو، ناچاری کرد شوی پێبکات. لـەم لاشـەوە سـێرڤانتس لـە زۆران بازیەکـدا پیاوێـك دەکـوژێ‌و بەهۆیـەوە نـەفی دەکـرێ بـۆ دەرەوەی ئیسپانیا.

لەڕاستیدا ژیانی هەردوو لایان جیاوازی تێدا هەبوو، سێرڤانتس کەسێکی سەرکێش بـوو، زۆرگەشـت وگـەڕانی دەکـرد. بەخۆبەخـشانە چـووە نـاو ئـەو سوپایەی کە ئیتالیـا ئامـادەیکرد بەسـەرکردایەتی "دون جۆن" بـۆ جـەنگان لـەدژی دەوڵـەتی عوسمـانی لـە سـاڵی 1570. سـێرڤانتس تیایـدا پێکـراو سینگ‌و قـۆڵی برنـداربوو، ئـەو برینداریـەی قـۆڵی بـە درێـژایی ژیـانی لەگـەڵی مایـەوە. هـەر لەسـوپادابوو کاتێـك کەوتـە دەسـتی چـەند چـەتەیەك وپـاش چوارساڵ بردیـان بـۆ جـەزائیر. سـێرڤانتس چـەندین جـار هـەوڵی ڕاکردنـی دا بەشێوەیەك ئەوانەی دەستگیریان کردبوو، لێی بێزار بووبـوون‌و سـەریان لێـی

سورڕمابوو. سێرڤانتس بە ژێردەستەیی مایەوە تا لەساڵی 1580 ئازادیان کرد. ئەو خۆی سەبارەت بە جەنگی لیبانتۆ دەڵێ:" گەورەترین ڕوداوبوو لەمەڕ ڕابردوو ئێستاو داهاتوو". کاتێکیش گەڕیەوە بەرەو ئیسپانیا، هاوسەرگیری کرد لەگەڵ ئافرەتێکی ڕێزدار، ئەمە لەکاتێکدا کچێکی هەبوو لەئافرەتێکی تر. سێرڤانتس بەهۆی زۆری قەرزاریو نەتوانینی دانەوەیان، سێ جار کەوتە زیندان لە نێوان ساڵانی 1592-1602. قەرزەکانی بەشێوەیەك زۆربوون، تەنانەت کتابی "دۆنکی شۆت" کە لەساڵی 1605 دەریکرد، لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە گەورەی بەدستیهێنا سودێکی ئەوتۆی بەقەرزەکانی نەگەیاند.

دێینەوە سەر باسی شکسپیر. شکسپیر هەنگاو بەهەنگاو بەدوای ژیانی خۆیدا دەڕۆیشت. دوای ئەوەی لە ساڵی 1584 کۆچی کرد بۆ لەندەن، ژیانی خۆشتر بوو بوژایەوە. کاتێ چویە لەندەن جگە لە بەهرەی زیرەکی کە خوا پێی بەخشی بوو، هیچی تری لەگەڵ نەبوو. سەرەتا وەك ئەکتەرێك دەستی بەکار کرد، پاشان بوو بە نوسەری شانۆ بۆ سێ شانۆی گرنگی لەندەن. بەهاتنی ساڵی 1594 شکسپیر بوو بەسەرۆکی کۆمپانیایەك کە خۆی خاوەنی بوو. هەروەك بوو بەهاوڕێی ژمارەیەك کەسایەتی لەدەرباری "ئیلیزابێس". شعرەکانی (سونت)ی بە گۆرانی دەوتەوە. یەکێ لەڕەخنە گرە دیارەکان دەڵێ:"گیانی شیرینی ئۆڤید لەسەر زمانی شکسپیر دەژی". بەم شێوەیە شکسپیر بوو بە خاوەنی سامانێکی زۆرو کۆمپانیایەك کە پێکهاتبوو لەچەند سەرشانۆیەك لە لەندەن. لەهەمان ئەو کاتەی سێرڤانتس

لە زیندان ژیانی بەسەر دەبرد بەهۆی ئەو قەرزانەی ببونە ملۆزمی ژیانی[1]. شکسپیرببوو بە شێوە خانەدانێكو هەستا بە سازکردنی ساختامانێکی گەورە لەسترافۆرد لەساڵی 1602.

لەکاتێکدا شکسپیر شانۆی نەمری "هاملیتو ماکبیسو ئۆتیلیۆ"ی دەنوسی، سێرڤانتس سەرقاڵی نوسینی ڕۆمانە کلاسیکیەکەی"دۆنکیشۆت"بوو، کە بەشێوەیەکی دڵخۆشکەرو سەرنج ڕاکێشو هەست بزوێن دەینوسی. ناوەڕۆکی ئەم کتێبە گاڵتەدەکات بە سەدەکانی ناوەڕاست، کە ئەوروپا لێی تێدەپەڕی وئیسپانیا تێیدا مابوویەوە.

## پێشکەوتنی زانستی

گرنگی پێشکەوتنی زانستی لە سەدەی شازدە، کەمترنییە لە دۆزینەوە جوگرافیەکانو ژیاندنەوەی شارستانی کلاسیك. ئەم پێشکەوتنە بەپلەی یەکەم زانستی "ئەستێرناسی"و گەردونناسیو ماددە"ی- گرتەوە. هەروەها پەرەسەندنێکی گەورە ڕویدا لە بواری فیزیاو پزیشکیو زیندەوەرناسیو بیرکاریو زانستی کۆمەلآیەتی.

### 1ـ ئەستێرە ناسی:ـ

ئەستێرەناسی سەدەکانی ناوەڕاست باوەڕیان وابوو کە زەوی جێگیرەو ناوەندی گەردونەو خۆرو مانگو ئەستێرکان بەدەرویدا دەسوڕێنەوە

---

1 Marvin R. Oconnell ‹the counter Reform ation ( newyork‹1974)‹ PP.363_366.

بەخێراییەکی لەڕادە بەدەر لەماوەی 24 کاتژمێر. ئەمەش هەمان بیروڕای بەتلیمۆس بوو کە لە سەدەی دووی زاینی لە ژیاندا بوو. ئەم تیۆرە کڵێساش گرنگی پێداو پشتیوانی لێ کردو وای کرد خەڵکی بەگشتی باوەڕی پێ بهێنن. چونکە لەگەڵ ئینجیلدا هاوڕا بوو هاوکات سەرنجی ڕۆژانەی خەڵکیش بە هەمان شێوە لەگەڵی دا بوو. لەگەڵ ئەم تیۆرەشدا چەند تیۆرێکی ترهەبوون سەبارەت بە فەلەکو ئەستێرە کە لەبیرچووبوونەوەو لەهزرو بیری خەڵکیدا نەمابوون. لەناویاندا تیۆرەکەی "فیساگۆرس" کە دەڵێ:"خۆر سەنتەری گەردونە". جا کاتێکیش شارستانی کلاسیك لە سەدەی پازدە بەدیارخرا، ئەم تیۆرانەش دۆزرانەوەو کۆپەرنیکۆس بوو بە بەناوبانگترین پاڵەوان تێیدا.

## کۆپەرنیکۆس1473-1543:-

کۆپەرنیکۆس قەشەیەکی پۆڵندی بوو، کاتەکانی خۆی لەنێوان کاروباری ئاینیو لێکۆڵینەوە لەکلاسیكو بیرکاریو ئەستێرەناسی دا دابەش کردبوو. نیکۆس لەئیتالیا دەساڵ مایەوەو لەوێدا خەریکی لێکۆڵینەو وخوێندن بوو لەبواری پزیشکیو یاساکانی کڵێسا. پاشان مرۆگەرانی ناسیو لەوانیشەوە ژمارەیەکی زۆر لە ئەستێرەناسە کۆنەکانی ئیغریقی ناسی، لەهەمان کاتیشداگومانی هەبوو لە تیۆرەکەی بتلیمۆس. ئەم زانایە لە ڕێگەی بەدواداچونو ئەزمونو ئەو ئامێرانەی کە لەبەردەستیدا بوون، توانی بە لێکۆڵینەوەو سەرنجدان، ئەزمونوسەرنجو تێبینیەکانی لەبارەی ئەستێرەناسیەوە بنوسێتەوەوبە زمانی لاتینی چاپیان بکات. نیکۆس لەکتێبەکەیدا باسی جوڵانی تەنە ئاسمانیەکانی کردبوو لە ساڵی 1543چاپ

کرد، کە هەر لەو ساڵەش کۆچی دوایی کرد. نیکۆس کتێبەکەی پێشکەشی پاپا "پۆلی سێیەم" کرد. لە کتێبەکەیدا ئەوەی ڕوونکردەوە کە زەوی هەسارەیەکە لەهەسارە گەڕۆگەکانو بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. هەروەها ئەوەشی خستەڕوو کە زەوی سەنتەری گەردوون نییە. بەمەش زەمینی لەپیرۆزیو گرنگی داماڵی. ئەمەش وادەکات مرۆڤ ناوەندو سەنتەربوونی لەناو دروستکراوەکان لەدەست بدات. تیۆرەکەی نیکۆس لەئەوروپادا دەنگی دایەوەو بەزوویی لەناو پشتگیرکارنیو نەیارانی داپەخشان بوو.

## تیکۆ براهمی1546_1601:-

ئەستێرەناسە ئەوروپیەکان لەنیوەی دووەمی سەدەی شازدە ڕوویانکردە هاوکێشە بیرکاریەکان وپەرەپێدانی ئامێرە فیزیاییەکان، ئەمەش بۆ لێکدانەوەی تێڕوانینەکەی کۆپەرنیکۆس. ئەستێرەناسی دانیمارکی"تیکۆ براهمی"، یەکێ بوو لەو زانایانەی کەپاشای دانیمارك فردریکی دووەم، لەڕووی ماددیەوە هاوکاری کرد بۆ دامەزراندنی تاقیگەیەك لەو دورگەی کەوتبووە نێوان دانیمارکو سوید لە دەریای بەڵتیك. هەروەها لێنۆڕ وئامێرو کتێبخانەو هەموو ئەو پێداویستیانەی کەپێویست بوون بۆی لە کاغەزو چاپ بۆی دابین کرد. براهمی ماوەی بیست ساڵ سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوو لەگەردوونو لە هەوڵی پێکبەستنو پێکهێنانی تیۆری نیکۆسو بەتلیمۆس دا بوو. بەلآم بێ سەروبەرەییو لەخۆبایی بوونی، بووبە هۆیەك بۆ تێکچونی پەیوەندیەکانی لەگەڵ فردریك. بۆیە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی لە خزمەتی ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز لە"پراگ"بەسەربرد. تیۆرەکەی براهمی وای

لێکدەدایەوە کە ئەستێرەکان بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، هەروەها خۆرو کەهکەشانەکانیش بەدەوری زەویدا دەسوڕێنەوەو زەویش لە جێگەی خۆیدا جێگیرە.

هۆکاری شکستی تیکۆبراهمی تاڕادەیەك دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خۆی سەرقاڵ کردبوو بە ئەستێرەو ئەستێرەناسی، بەلاّم هۆکاری سەرەکی شکستهێنانی نەگرتنەبەری ئەم ڕێگەیە بوو کە کۆپەرنیکۆس گرتبوویەبەر [1].

کیپلەر1571-1630:-

لە کۆتایی سەدەی شازدە دوو زانا سەریان هەڵداو پشتگیری "کۆپەرنیکۆس"یان- دەکردو بەلێکۆڵینەوەکانیان دەیان چەسپاند. ئەمانیش کیپلەری ئەڵمانیو گالیلۆی ئیتاڵی بوون. "کیپلەر"هاوڕێی تیکۆبراهیمی بوو. لێکۆڵینەوەی لە گەردوون دەکردو لەیەکێ لەزانکۆکانی ئەڵمانیا لەم بارەیەوە دەیخوێند. کیپلەر لەبیرکاریو گەردوونناسیو بۆچوونە فەلسەفیەکان لەمامۆستاکان زیرەکتر بوو. لەگەڵ باوەڕبوونی بەو خورافە باوانەی ئەم سەردەمە، بەلاّم سەلماندی کە زەویو هەسارەکان بەدەوری خۆردا لە هێڵێکی هێلکەیی دا دەخولێنەوە نەوەك هێڵێکی بازنەیی، ئاماژەشی بەوە کرد کە خێرایی هەسارەکان زیاد دەکات بەگوێرەی نزیکیان لەخۆرەوە. دووری نێوان هەسارەی گەڕۆكو خۆر هاوئاهەنگە لەگەڵ تێکڕای کاتی سوڕانەوەی هەسارەکان بەدەروی خۆردا.

---

1 Coenigsberger، eurpe in the 16th century . (newyork،1968) ،PP.356-358.

## گالیلۆ 1564-1642:-

گالیلۆ زاناو پیتۆڵێکی مەزن بوو، لە زۆر بواری وەك بیرکاری‌و میکانیك و فیزیاپسپۆر بوو، بەتایبەت لە بواری ڕوناکی‌و گەردبینیدا. سەرەڕای ئەوانە، گالیلۆ مۆسیقاژەن بوو، لەکلاسیکدا شارەزابوو،ئەمەو جگەلەوەی‌کە نوسەرێکی بەهرەمەندیش بوو. گالیلۆ لەزانکۆی پادوا لەنێوان سالآنی 1592-1610، هەستا بە بلآوکردنەوەی تیۆرەکەی کۆپەرنیکۆس. لێکچەر "محاچرە"کانی گالیلۆ بەشەوق‌و زەوق بوون، بەشێوەیەك لەهۆڵێکی 1000کەسیدا وانەی دەوتەوە. گالیلۆ توانی بتەلیسکۆپ وپەرەپێدان‌و باشکردنی لەساڵی 1609، توانی بەڵگەی ئەوە بهێنێ کەخۆر بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە. گالیلۆ هەوڵیدا کلێسا قەناعەت بەڕاستی تێڕوانینەکەی بهێنێ، بەلآم بەپێچەوانەوە کەوتە دووبەرکی‌و ناکۆکیەکی بەردەوام لەگەڵ کلێسا. تا لەساڵی 1616 "دادگاکانی پشکنین" تیۆری گالیلۆو هەموو ئەوانەیشی بڕوایان وابوو خۆر چەقی گردوونە، بەپوچ‌و بێ بنەما لەقەڵەم دا وبەپێچەوانەی تێکستی کتابی پیرۆزی دانا. بەهەمان شێوەش تێروانینی ئەوەی کە گوایە زەوی هەموو ڕۆژێك بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، وەك تێڕوانینەکەی پێشوو، بەپوچ‌و بۆشی ناوزەدکرد، چونکە لەگەڵ ئایندا پێچەوانەیە. ئەمجا لەساڵی 1632، گالیلۆ لەبەردەم دادگا تاوانبارکرا بەوەی برەوی بەو تیۆرە داوە کە پێچەوانەی ئاینە. لەبەرئەمە گالیلۆ لە دە ساڵی کۆتایی تەمەنی خرایە ژێر چاودێری.

**بیرکاری:ـ**

زانستی بیرکاری پێشکەوتنێکی گەورەو مەزنی بە خۆیەوە بینی. زانا بیرکاریەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ژمێرەو لێکدانەوەو ئەندازەی یۆنانیەکانو ڕۆمانیەکانیان بە میراتگرت. هەروەها لە مسوڵمانەکان جەبرو ژمارە عەرەبیەکان فێربوون. پاشان ئەوانەیان کردە بناغەو زۆری تریان خستەسەر. مەبەستی بیرکاریزانەکان ڕوونکردنەوەی تیۆرەکەی کۆپەرنیکۆس بوو، لەڕووی چەندیەتی ڕاستو هەڵەی. هەروەها چاکسازیکردن لەڕۆژمێرودووری ڕۆیشتنی گوللەتۆپ لەتۆپخانەوە. جگەلەمە دروستکردنی قەلای جەنگی پتەو بەکەمترین تێچونو ئاسانکردنی کاری ژمێریاری ئەوکەسانەی کاری بانكو بازرگانیو سەرمایەیان دەکرد. لەسەدەی شازدەشدا توانیان ئەم ئامانجانە بەدی بهێنن. بەڕاستی بیرکاریزانەکان هەوڵو کۆششێکی زۆریان داو سەرکەوتنێکی سەرسوڕهێنەریان بەدەستهێنا لەهەریەکە لەم ئامانجانەی گەرەکیان بوو.

دوو زانای ئیتاڵی بەناوبانگ لەکێبڕکێدابوون بۆ شیکارکردنی هاوکێشەی سێجاکان. ئەم دوو زانایەش بریتی بوون لە "تارتا گلیا"1506–1559و "کاردان"1501–1576. تارتاگیلیا چەند بابەتێکی زانستی لە بارەی تۆپو بورجو قەلاوە نوسیو پاشان پێشکەشی "هنری هەشتەم"ی پاشای ئینگلترای کرد. "کاردان"یش پزیشکێکی بە برشتو زیرەك بوو، پاپاو پاشاکان هاوکاریان دەکرد، بەتایبەت پادشای دانیمارك. لە هۆڵنداش "ستیڤینس"1548–1620. ستینڤینس بڕەوی بەکەرتی دەیی داو

زۆرشتی لە بواری سەبازیدا داهێنا. ئامرازەکانی نوسینەوەی ژمێرەو دەفتەرداری لەهۆڵەندا جێبەجێ کرا، پاشان حکومەتی فەرەنسی خستیە کارەوە. لەهەمان کاتدا زانایانی بیرکاری هەوڵێکی زۆریانداو توانیان هێمای ژمارەو لێکدانەوە بخەنە ناو بیرکاریەوە وەك {×، \، =، ()، +،−،>} . هەروەك توانیان جەدوەلی سێگۆشەو لێکدانەوە کەرتیەکان دابنێن. زانایبیرکاریزانی سکۆتلەندی "جۆن نپیر"1550-1617، بۆ یەکەم جار لەساڵی 1614 "لۆگاریتم" ی داهێنا وتوانی هێمای فاریزە بۆ یەکەم جار لە کەرتی دەییدا بخاتەکار.

**میکانیك و فیزیا:-**

فیزیاو میکانیك بەهەمانشێوەی ئەوانیتر لەسەدەی شازدە پێشکەوتنی گەورەیان بەخۆوەبینی. (پرتا)ی ئیتالی1540-1615، فانۆسی سیحری داهێنا، هەروەها "جانس" لەساڵی 1590، توانی میکۆسکۆبێکی ڕێك و تەواو دروستبکات.

تەلیسکۆب لە هەریەکە لەئینگلتراو ئیتالیاو هۆڵندا دا پەیدا بوو.گوتراوە: کە "لیوناردۆ دیگس" لە ئینگلترا تەلیسکۆبی داهێناوە. هەروەها "ولیم گیلبرت"ی ئینگلیزی 1540-1603 توانی تاقیکردنەوە لەسەر تەنەموگناتیسەکان بکات و وشەی ئەلیکتریك"کارەبا"ی بۆ یەکەم جار بەکارهێنا. لەگەڵ هەموو ئەمانەی کە باسمان کرد، بەڵام گالیلۆی ئیتالی بەناوبانگترین و مەزنترین زانای فیزیایی سەدەیشازدە بوو. ئەم زاناو پیتۆڵە چەندین داهێنانی کردو خستیە خزمەتی مرۆڤ. ئەوەندە بەسە ئامارە

بەهەندیێ لە داهێنان و دەستەکەوتەکانی بکەین. لەوانە: گالیلۆ توانی گەرمی پێوو تەرازووی شلەمەنی دابهێنێ، هەروەها پەرەپێدانی تەلیسکۆب و چاککردنی و دروستکردنی سعاتی فەلەکی لە دەستکەوتەکانی ئەوبوون، ئەمەو جگە لەلێکۆلیەنەوە کردن لەدیاردەکانی جوڵەو دەنگ. جگە لەهەموو ئەمانە گالیلۆ ئەوەی ڕوونکردەوە کەدەنگ لەوشەپۆلانەی لەهەوادا تێدەپەڕن. لەبارەی "ئاواز"یشەوە ووتی: ئاواز لەئەنجامی جیاوازی لەدرێژی شەپۆلە یەککگرتووەکان پەیدادەبێ. تیۆرەکەی ئەرستۆشی هەڵوەشاندەوە، کە دەڵێ:"تەنەکان دەکەونە خوارێ بەخێراییەك، کە هاوڕێکە لەگەڵ قورسیەکەیان". لەکتێبە بەناوبانگەکەی بەناوی "بابەتەبیرکاریەکان" ڕوونکردنەوەی دا لەسەر دوو زانستی تازە. گالیلۆ توانی بناغەی میکانیك و دینامیك"جوڵە" دابڕێژێ.

**کانزاکاری( تعدین ):-**

سەرمایەداری نوێ، گرنگی گەورەیدا بە کانزاکاری و بەکارهێنانی کارگە لە بوارێکی بەرفراواندا. دواتر ئەمە سەری کێشا بۆ سەرهەڵدانی کانزاکاری. ئەگریکۆلای ئەڵمانی(1490–1555) یەکەم کەسێ بوو خۆی سەرقاڵ کرد بەم زانستە. "ئەگریکۆلا" لەسەرەتای ژیانیدا دەستیکرد بە بەدواداچوون لەبارەی زانیاری تازەو لێکۆڵینەوە کردن لەیۆنانی و زانستی وشەسازی. دواتر بۆی دەرکەوت کەتەنها زانست ئارەزوی تێردەکات، نەوەك کلاسیك. ئەم هەستکردنە وای کرد لێکۆڵینەوە بکات لەبارەی "پزیشکی و فیزیا و کیمیا" لەئیتاڵیا. پاش ئەمە "ئەگریکۆلا" دەستیکرد بەکارکردن لەژینگەی دەوری

کارگەکانی پاڤاریاو بۆهیمیا، لەهەمان کاتیشدا چارەسەری نەخۆشی دەکردو بایەخی دەدا بەلێکۆڵینەوە وپشکنین لە زانستی کانزا. ئەگریکۆلا هەستا بەنوسینی کتێبێکی بەناوبانگ بەناونیشانی "دوازدە بەرگ لەبارەی کانزا"و تیایدا بۆ یەکەمجار باسی بەرهەمهێنانی ماددەی کانزایی کردبوو، ئەم بەرهەمهێنانەش بە گۆڕینی ئاسنی خاو بۆ پلێتی ئاسن ئەنجام دەدرا، ئەمەش بە تێکەڵکردنی لەگەڵ ماددەیەکی تواوەدا لە فرنیەکی وەرگێڕدراو بە ماددەی ئۆکسێنراو. ئەم ڕێگەیەش ناسراوە بەڕێگەی فرنی وەرگێڕدراوە.

**پزیشکی:-**

لەسەدەی شازدەدا پزیشکی پێشکەوتنی گەورەی بەخۆیەوە نەبینی، بەهۆی ئەوەی پێشکەوتن لەم بوارەدا لەسەدەکانی ناوەڕاست دابوو، وە بەهۆی ئەوەش کە پزیشکەکانی سەردەمی ڕێنیسانس گرنگیان دەدا بەکلاسیكو میکانیزمەکانی کلاسیکی کۆن. ئەوان میکانیزمەکانی "ئەبی قراگ"و "جالینیۆس"یان خستبوویە کار لەبواری پزیشکیدا. "ئەستاشیو، فالوپیو"ی ئیتالی زۆری تریان خستەسەر زانستی توێکاریو کارئەندامزانی نوێ. هەروەها "میخائیل ڤیتس" باسی سوڕی خوێنی سیپەلاکی کرد. "فراسکاتور"ی ئیتالیش باسی نەخۆشیەکانی کردو ڕای وابوو: کە نەخۆشی بەهۆی تەنە بچوکەکانەوە پەیدادەبن، ئەم تەنانەش توانای زاوزێو بڵاوبونەوەیان هەیە. بەڵام بەهۆی نەبوونی مایکرۆسکۆبەوە فراسکاتور نەیتوانی ئەم تێڕوانینە بچەسپێنێ. هەروەها "سانتوریو"ی ئیتالی بە

بەکارهێنانی گەرمی پێوی گالیلۆ توانی پلەی گەرمی لەشی مرۆڤ دەربخاتو ئامێرێکیشی دۆزیەوە بۆ پێوانەکردنی تێکڕای خێرایی لێدانی دڵ.

لەئەڵمانیاش هەندێ پزیشك سەریانهەڵداو نەیاری باوەڕکردن بوون بە کایەی پزیشکی یۆنانیو هێرشیان دەکردە سەر کلاسیك. بەناوبانگترینی ئەوانەش "سیوفراتس هونهایم"بوو، کە ناسراو بە پاراسیلس 1493-151. ئەم ڕەخنەی دەگرت لەجالینیۆسو ڕوونی کردەوە کە پزیشکی بریتییە لەزانستێك جەخت لەسەر ئەزموونو تەجروبەی زانستی دەکاتەوەو ئەمەش پەیوەندی نێوان کیمیاو پزیشکیە. هەروەها جەختی لەوە کردەوە کەکاری نوژداری تایبەتمەندییەکی کیمیاییە. باوەڕیشی وابوو کانزاو ئاوی کانزایی دڵی کایەی پزیشکییە. "ئەندرفیزالیس"ی هۆڵندی 1514-1564، یەکێکیتربوو لەوانەی نەیاری باوەڕکردن بوو بەپزیشکیەتی "ابی قراگ،جالینیۆس".

"فیزالیس" پزیشکی لەزانکۆی لوڤێنو پاریسو پادوا خوێندو لێکۆڵینەوەی لەم بوارەدا دەکرد، دواتر بوویە مامۆستای زانکۆی پادوا. ئەم پزیشکە سەرەتا کاریگەر بوو بە جالینیۆس، بەڵام چەندەها هەڵەی لەکتێبەکانی جالینیۆس گرت. فیزالیس باوەڕی وابوو کە لاشەی مرۆڤ پێوەرێکی ڕاستە بۆ لێکۆڵینەوە لەزانستی توێکاری، نەوەك کتێبە کۆنەکان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاریدا پشتببەستێ بە ئەزمونی تایبەتیو وردبونەوەکانی خۆی. ئەندرڤیزالیس نەیتوانی لەسەر لاشەی مرۆڤ توێکاری بکاتو بەتەواوی تاقیکردنەوەکانی لەسەر ئەنجام بدات، بۆیە پەنای بردە بەر لاشەی سەگو لەزۆر بوارە مەترسیدارەکان توێکاری لەسەر ئەنجام دەدا.

ئەم زانایە کتێبێکی نوسی لەبارەی توێکاریو لەساڵی 1543 چاپی کرد. فیزالیس لەم کتیبەدا باسی موو دەمارەکانی خوێنو شادەمارەکانی خوێنهێنانو کۆئەندامی هەرسو هەناسەدان وسیپەلاکو مێشکو دەماخی کردبوو. فیزالیس پزیشکێکی مەزن بوو، بەهۆی لێهاتویی لەبواری پزیشکیدا، بووبەپزیشکی تایبەتی لەدەرباری "چارلسی پێنجەم" تا ئەوەبوو لەساڵی 1504 لەڕێگەی "بیت لموقدس" گیانی لەدەستدا.

### ولیم هارڤی1578-1657:-

لەکۆتایی سەدەی شازدە، "ولیم هارڤی" ئینگلیزی سەریهەڵدا، زانستی پزیشکی بەهۆی دۆزینەوە مەزنەکانی پێشکەوتنو گەشەسەندنی بەخۆیەوەبینی. هارڤی لەزانکۆکانی "کمبرج-پادوا" دەیخوێندو لەساڵی 1602پلەی دکتۆرای لەبواری پزیشکیدابەدەستهێنا. کاتێکیش گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی، بوو بە مامۆستای پزیشکی لە لەندەن ولەوێدا پزیشکان سەردانیان دەکرد. هارڤی شەیدای لێکۆڵینەوەکردن بوو لەسەر دڵو خوێن، تا ئەوەی توانی پرۆسەی سوڕی خوێن بدۆزیتەوە، کە لەدڵەوە دەردەچێ بۆ شادەمارەکانو لەشادەمارەکانەوە بۆ خوێنبەرەکانو لەوێشەوە بۆ دڵ دەچێتەوە. پێشترجالینیۆس بە شێوەیەکی سادە سوڕی خوێنی ڕوون کردبۆەووە، بەڵام هارڤی ئەمەی دۆزیەوە کە خوێن دوبارە دەگەڕێتەوە بۆ ناو دڵ. هەروەها لە هۆڵندا پزیشکێ بەناوی"ڤان هیلمۆنت" لەساڵی 1577-1644، ناوبانگی دەرکرد. "هیلمۆنت" هەستا بەلێکۆڵینەوەکردن لەکیمیاداو گوتی: "گازەکانی ناو کەش جیاوازن لە هەوا"و یەکەم کەس بوو

بۆ یەکەم جار ناوی "گاز" دابهێنیێ. پاشان گازی دووانە ئۆکسیدی کاربۆنی دۆزیەوەو بۆی دەرکەوت کەماددە لەناوناچێت.

**ڕووەک ناسی وگیانەوەرناسی"حیوان":-**

لەسەدەی شازدەدا ژمارەیەك پزیشك، لێکۆڵینەوەیان دەکرد لەسەر زانستی توێکاریو بەراوردکاری وتونیان بناغەی زانستی "گیانەوەرناسیو ڕووەکناسی" دابڕێژن. "ئەندری سزالیپینۆ" پزیشکی پاپا "کلیمنتی هەشتەم"و مامۆستا لە زانکۆی پیزا، لێکۆڵینەوەیەکی سەبارەت بە ڕووەكو ڕووەك ناسی نوسی. هەروەها پزیشکی فەرەنسی "بیربیلون" کاری پشکنینو تاقیکردنەوەی لەسەر سەدان جۆر لە باڵندەو ماسی ئەنجامدا. وەلێ مەزنترین زانا لەم کایەدا لەسەدەی شازدەدا، "کونراد فون جیسنر"1516-1565، بوو. جیسنر پلەی دکتۆرای لەبواری پزیشکی لەیەکێ لەزانکۆکانی فەرەنسا پێ بەخشرا. ئەم زانایە مەزنە ژیانی خۆی لەسویسرا بردەسەرو مومارەسەی لەسەر پیشەکەی دەکرد، لەهەمانکاتیشدا لێکۆڵینەوەی دەکرد لەبواری ڕووەكو گیانەوەرو سەرقاڵی پۆلێن کردنیان بوو ئەمەو جگە لە لێکچەردانیلە بواری فیزیادا. جیسنر توانی نەخشەیەك لەسەر ڕووەكو شینایی دابنێ، هەروەك کتابێکی چوار بەرگی نوسی لەبارەی مێژووی گیانەوەران.

**زانستە کۆمەڵاتیەکان:-**

شێوازی زانستی لەمێژوودا بە کۆکردنەوەی بەڵگەنامەو دەستنوسە مێژووییەکان و ڕخنە لێگرتنیان دەستی پێکرد. ئەمەش سەرەتای پێشکەوتنی زانستە کۆمەڵایەتیەکان بوو، بەتایبەتی کایەی مێژوو. بووژانەوەی شارستانی کلاسیك کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەرئەم بوارە. زانستی سیاسیش بە نوسینەکانی "میکافیللی وجانبودان" دەستی پێکرد. هەروەها "کۆنرادڤۆن جیسنر" بنەمای زانستی وشەسازی داڕشت. بەهەمانشێوە لێکۆڵینەوە لەبواری ئابووری لەسەر بنچینەیەکی زانستی جێبەجێ کرا. ئەمەش بەهۆی ئارەزووی خەڵکی لەفێربونی تیۆرەکانی دەرامەت و دەستهاتە نەتەوەییەکان، لە کۆتایی سەدەی شازدە.

**جوگرافی:**

بەڕاستی جوگرافیا لەسەدەی شازدە هەنگاوی گەورەی بەرەو پێشەوەبرد، ئەمەش بەهۆی دۆزینەوە جوگرافیەکان و، بازرگانیە بەرفراوانەکان. دیارترین جوگرافیناسی ئەم سەردەمە "گرادفۆن کریمر"ی هۆڵندی بوو، کە ناسراوە بە "میرکتر". میرکتر لەزانکۆی لۆڤێن لەهۆڵندا خوێندویەتی و، هەر لەوێدا تاقیکردنەوەیەکی جوگرافی سازکردو چەند نەخشەیەکی ئامادە کرد بۆ "چارلسی پێنجەم"، بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتە سەربازیەکانی. بەمەش هاوکاری چارلس و میرەکانی ئەڵمانیای بۆخۆی دەستەبەرکرد. گەورەترین بەرهەمە جوگرافیەکەی ڕزگارکردنی ئەوروپیەکان بوو، لەکۆت و بەندی جوگرافی ناسە یۆنانیەکان، ئەمەش بە دروستکردنی

ئامێری نوێو نەخشەو وێنەی ڕوونو نوێ، کە بەجوانترین نەخشە دادەنرێن. لەهەموو ئەمانەگرنگتر، دۆزینەوەی ڕێگەیەکی تازەبوو بۆ کێشانی نەخشە، کە ناسراوبوو بە "میرکتر پورو جیکسن". بەم ڕێگەیە توانی کاری نەخشە بۆ تەواوی زەوی ئەنجام بدات، یاخود نەخشەی بەشێکی زەوی بە درێژکردنەوەی هێڵە تەریبەکانو هێڵە پانیەکان لەسەر پەڕەی لاکێشەیی بنەخشێنێ.

**فەلسەفەی نوێ :-**

فەلسەفەی نوێ لەنێو هەژانە فیکریەکانو شۆڕشە ئاینیەکانی ئەورووپا دەرکەوت. فەیلەسوفەکان زانستی تازەیان داناو چاویان بڕیە شیکردنەوەیان. یەکەم فەیلەسوفی نوێ "جۆریدانوبرۆنۆ" 1548-1600) بوو لەئیتالیا. برۆنۆ قەشەیەکی دۆمنیکانیبوو، بەڵام کەوتە ژێرکاریگەری هەموو کایە تازەکانو شۆڕش وجولانەوە نوێیەکان. برۆنۆ پشتگیری کۆپەرنیکۆسی کرد لەبورای ئەستێرە ناسیدا وتەوڕاتی بە خورافە لەقەڵەمدا، هەروەك خورافەی یۆنانیە کۆنەکان،و معجیزە (دەرئاسا)ی بە فێڵی سیحری ناوزەد کرد. بەڵام فەلسەفەی بەیەکیەتی بوونو پەرستراوی گەردوون دادەنا. لەبەرئەمە بە چاوێکی پیرۆز سەیری سروشتی دەکرد، چونکە بەلایەوە گوزارشت بوو لەپەرستراویەتی. برۆنۆ پێی وابوو بونەوەر چەند یاسایەکی نەگۆڕو چەسپاو بەسەریدا باڵا دەستە. لەڕاستیدا فەلسەفەی برۆنۆ تێکەڵاو بوو لەزانستی نوێو ئاینی تازە، کە زۆر بەزەحمەت لەلایەن هاوچەرخانی قبوڵدەکرا. برۆنۆ لە ڕۆمادا ژیانێکی ڕەبەنیو گۆشەگیری هەبوو. پاش ئەمەپەنای بردە بەر وڵاتە

بیانیەکانو ماوەیەك لەژێر سایەی پاشای فەرەنسی مایەوە. لەم ماوەیەدا لەزانکۆی تۆلۆز لێکۆڵینەوەی لەگەردوون دەکردو لیکچەری لەزانکۆی پاریس دەگوتەوە، دوو سالیش وەك بالۆێزی فەرنسا لە لەندەن ماوەتەوە. بەلام لەهیچ شوێنێك ئۆقرەی نەدەگرتو دانەدەگیرسا،بەلکو پاش ماوەیەك دەڕۆیشت. ئەوەبوو لەندەنیشی جێهێشتو کۆچی کرد بۆ سویسرا. لەسویسراش کالڤنیەکان دەریانکرد، ونەشیتوانی هاوکاری لۆسەریەکانی ئەلمانیا دەستەبەر بکات. بەمەش ناچار بوو بگەڕێتەوە ئیتالیا. کاتێ گەیشتەوە ئیتالیا، دەستبەسەر کراو حەوت سالێ لەزیندان توند کرا، پاشان لە نێو بلێسەی ئاگردا لاشەکەی کرا بە سوتماك.

فرانسیس بیکۆن:1626–1561:ـ

"فرانسیس بیکۆن" زانایەکی ئینگلیزی بوو، لەزانکۆی کمبرج خوێندنی تەواو کردو بووبەپارێزەر. پاشان بوو بەڕاوێژکاری شاجیمسی یەکەم. کاتێك خوێندکاری زانکۆ بوو، ئارەزووی زانستە سروشتیەکانی تیادا چەکەرەی کرد.

بیکۆن فەلسەفەی ئەرستۆی بەکەم دەگرتو گاڵتەی پێدەهاتو بڕوای وابوو تەنها لە ڕێگەی وتووێژو گفتوگۆوە دەتوانرێ چاکبکرێ. بڕوای وابوو هەر هۆیەك ببێتە هۆی پێشخستنی زانستە سروشتیەکانومعریفەتی حەقیقی، پێویستە بەدەست بهێنرێو کەلکی لێ وەربگیرێ. هەولو کۆششێکی زۆریدا بۆ بەدەستهێنانی ماددەو ناوبانگو پلەوپایە.

بیکۆن هەستا بەنوسینی سێ کتێب لەژێرناوی "گوتارەکان و، پێشکەوتنی زانستو، نیوئەنتلاس". لە نیوئەنتلاسدا باس لەکۆمارێکی

خـەیاڵی دەکـا، کـە حکومـەت فەلـسەفەی نـویێ پیـادە دەکـات. هـەروەك دەڵێ: "پێویستە فەلسەفەی نوی بکرێتە هەڵسەنگاندێکی تاقیکاری بەسـودو بەکەڵك، کەڕاوەستابێت لەسەر دۆزینەوە نوێیەکانی لەزانستە سروشتیەکان. ئەو زانستانەش ڕزگاربووبن لەوەردەکاری وتاقیکردنەوەی تاقیگـەو ئامـانجی ڕاستەقینەشـی کـاروکردەوە بـێ". هـەروەها دەڵـێ: "بەڕاسـتی زانـستەکان گـرنگترین شـتن بـۆ فەلـسەفە وپێکهێنانـەری ڕاسـتەقینەی داهـاتووە. وە بێگومان زانست، سنوری هێزو مەزنی مرۆڤ فراوان دەکات".

وەلێ پێشکەوتنی زانست لەسەدەی شازدە بەم شـێوەیە نـەبوو کـەبڕۆنۆو بیکـۆن بـۆی چـووبن. ئـەمان نـەیانتوانی بالآدەسـتبن بەسـەر بیرکردنـەوەی خەڵکیو کردەوەکانیان. لەسـەدەی شـازدەدا خـەڵکیو تەنانـەت بیرمەنـدانو مرۆگەرانیش لاقرتێو تانەیان دەدا لەسەدەکانی ناوەڕاست وبەکەمو بێ بایەخ سەیریان دەکـرد.ئـەمان ئاگادارنـەبوون لەبـەردەوامی گەشـەکردنو ڕەخنـەی زانـستیو پێـشکەوتنی مەعریفـەتو زانـستی سـەدەکانی ناوەڕاسـت. دەبـێ ئەوەش لەبەرچاوبگرین کـە پیـشکەوتنو گەشـەکردنی زانـستی لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتدا لەسـەرخۆو سـست بـوو، بـەلاّم لەگـەڵ ئەوەشـدا مرۆگـەرانی سەردەمی ڕێنیسانس ئەم پێشکەوتنەیان نەبینیو بەخێرییئەم شێوە بڕیارە خراپەیان لەبەرامبەر سەدەکانی ناوەڕاستەوە داو دەیـانگوت: هەرشـتێ نـوێ بێ چاكو مەزنە[1].

1 White. the origin of modern Europ (Newyork)! (1966)،pp.496-576.

**پاشماوەی سیحرو خورافات:ـ**

زۆرێک لەو زانایانەی کەپێشتر ئاماژەمان پێدان، باوەڕیان بەکاری جادوگەریوخورافات هەبوو. هەریەکە لە"تیکۆبراهمیو کیپلەر" بۆ بەدەستهێنانی ماددەو سامان، گەردونناسیوبیرکاریان لە جادوگەریو ئەستێرەدا بەکاردێنا. باوەڕبوون بە بورجو ئەستێرە لەناو خەڵکیدا بەربڵاوبوو، زۆرینەی خەڵکی باوەڕیان پێی هەبوو.تەنانەت زۆرێک لەخەڵکی باوەڕیان وابوو کە دەتوانرێ ماددەی بێ بایەخو هەرزان بگۆڕدرێ بۆ زێڕ. هەروەها باوەڕیان وابوو کە بەردی بەنرخ، زاڵە بەسەر داهاتوی خەڵکیو ئەستێرەکانیش کاریگەریان هەیە بەسەر داهاتوی مرۆڤ، بۆیە دەیانگووت: پێویستە لەسەر هەرکەسێ، پێش ئەنجامدانی هەر کارێک ڕاوێژ بە ئەستێرەناسێ بکات. هەریەکە لەچارلسی پێنجەمو فرانسوای یەکەم ئەستێرەناسی تایبەت بەخۆیان هەبوو، کە پشتیان پێدەبەستن بۆ دیاری کردنی کاتی بەختەوەری بۆ ئەنجامدانی گەشت، یان بۆ جەنگو ئاشتیو ڕێککەوتنو پەیمان بەستن.

جادوگەری لەنیوەی دووەمی سەدەی شازدە تاوەکو نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەم، بەردەوام لەناوخەڵکی بڵاو دەبویەوە. بەشێوەیەک لەپێش ئەو کاتە هیچ کات وێنەی نەبووە. هەرچەندە کڵێسا لە جادوو دەگەڕانو دەیسوتاندن.

هەرچۆنێکبێت پێشکەوتنی زانستی کەمتر نەبوو لەپێشکەوتنی بوارەکانی تر لەلایەنی زانیاری ومەعریفەت.

## کۆمەڵگای ئەوروپی لە دەوروبەری ساڵی (1500) ز:ـ

لەپێش ساڵی 1500 زۆرینەی ئەوروپیەکان بە کشتوکاڵەوە خەریك بوون‌ولەلادێکان نیشتەجێ بوون. بەهۆی بارودۆخی ناجێگیرو نەبونی ئارامی‌و ئاسایش لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی پچڕنی ڕێگە بازرگانیەکان، ئەو شارانەی کە لەناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆزدا هەبوون، لەپێش سەدەی یازدەوە بەرەو نەمان‌و چۆڵ بوون ڕۆیشتن، جگە لەهەندێ لە شارە ئیتاڵیەکان‌و ئەو شارانەشی کە کەوتبوونە سەر شوێنگەو پێگە گرنگەکان. کە ئەمانە توانیان بەردەوامی بدەن بەخۆیان‌و بمێننەوە.

کۆمەڵگەی دێهاتی هیچ کات هانی نیشتەجێ بوونی نەدەدا لە شارەکاندا، ئەمەش بەهۆی پیادە کرانی دەسەڵاتی لامەرکەزی لە گشت شوێن و ناوچەکاندا. ناوەندی فەرمانڕەوایی خۆی دەبینیەوە لە قەڵای میرو دەرەبەگەکان کە لەناوچەکانی ئەوروپادا بەپەرت وبڵاوی فەرمانڕەوایان دەکرد. بازرگانی ناوەخۆش یا نەبوو، یائەوەتا بەهۆی تێچونی زۆرو نەبوونی هیچ پاڵنەرێك بۆی، بە شێوەیەکی خاوو سست دەڕۆی بەڕێوە. سەرەڕای ئەونەی باسمان کرد، نەبوونی نرخ وبایەخ‌و کار لەسەر مەوادی خواردن، ئەوەندەی تر بارەکەی خراپتر کرد بوو. جا بۆ بەردەوامی دان بە کۆمەڵگەیەکی فراوان، شار نرخ‌و کاری خۆبەخۆ بەکاردەهێنا.

لەو کاتەوەی سەرەتاکانی سەدەی یازدە وەکو خۆر پڕشنگی دا،ئەوروپیەکان لەدێهاتەوە بۆ شارەکان دەستیانکرد بە کۆچکردنو بارودۆخیان بەهۆیەوە گۆڕا. بەم کۆچ کردنە شارەکان فراوان بون‌و

خەڵکەکەی زیادی کردو چەندین شاری تر لەسەر پێگەی گرنگ بنیات نران. وەك: باکوری ئیتاڵیا وزەویەنزمەکانو حەوزی ڕوباری ڕوونو ڕاینو کەنارەکانی خۆرهەلاتی ئیسپانیا. کە ئەمانە یاردەدەر بوون بۆ بازرگانی کردن لەگەڵ شوێنە دوورەکان.

ژمارەی دانیشتوانی شارەکان بەردەوام زیادی دەکردو نرخەکان بەرزدەبوونەوەو بەهای زەوی بەرەو بەرزبوونەوە هەنگاوی دەنا. بەلام لەگەڵ هاتنی سەدەی چواردە بەهۆی برسیەتیو نەخۆشی لەناوبەری وەك نەخۆشی تاعون، ژمارەی خەڵکی دای لە کەمی.

لەماوەی چارەکی یەکەمی سەدەی ناوبراو بەهۆی خراپهێنان لەدەسکەوتی کشتوکاڵ، واتا:"نەهاتی" برسیەتی لەزۆرێك لەناوچەکانی ئەوروپادا بلاوبۆوە. لەم لاشەوە لە نیوەی یەکەمی سەدەی چواردە(1348-1350) نەخۆشی تاعون بلاو بۆوەو خەڵکێکی زۆری دروێنە کرد. نەخۆشی لە ناوبەری وەك: مەلاریاو سفلس-یش تا کۆتای سەدەی پازدەش ناوە ناوە بەرەو ڕووی خەڵکی دەهات .

## ئابوری دێهات:-

وەك پێشتر ئامەژەمان پێدا، زۆرینەی ئەوروپیەکان لەپێش سەدەی شازدە لەلادێکان دەژیانو بە کشتوکاڵەوە سەرقاڵ بوون. واتا: لەهەمان ئەو بارودۆخە دابوون کەپێش سەدەی چواردە تێیدا بوون. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا هیچ گۆڕانێك لەکرۆکی ژیانی لادێ ڕووی نەدا. لە زۆربەی ناوچەکانی ئەوروپا دەرەبەگایەتی بنەمای ئابوری بوو. میر یاخود خان سودی ئابوری

هەرێمەکەی خۆی دەدووریەوە. "کۆیلەی زەوی" بە زەویی دۆڵەمەندو خانەدانەکان پەیوەست بوو. جوتیاران "کۆیلەی زەوی" سەرەڕای ئەوەی کە لە کێڵگەی خانەدانەکان کاریان دەکرد، لەهەمان کاتیشدا لەژێر نیری بێ گاریو ئەنجام دانی هەندێ ئەرکوپێدانی هەندێ باج دابوون بۆ خانەدانەکان. ناوچە بێ بەرهەمو کەم بەروبومەکانیش نەدەبوونە هۆی خڕبوونەوەی خەڵك لەسەریان.وەك ناوچەکانی سکۆتلەنداو ئەپینایین وصقلّیە.

لە سەدەی یازدەوە شارستانی بوونو سەقامگیری لەشارەکانو کۆچکردن لەلادێکانەوە بۆ شارەکان بەرەبەرە زیادی کردو ئەمان لەئابوری دێهاتدا هاوبەشیان دەکرد. لەم نێوانە چەند هۆکارێك بوونە هۆی ئەوەی شارەکان هاوبەشی ئابوری لادێ بکەن، بەتایبەت شارەکانی باکورو ناوەڕاستی ئیتاڵیاو ئینگلتراو زەویەنزمەکان "هولندا ، بلجیکا". ئەم هۆیانەش بریتی بوون لە:-

1- بەکارهێنانی ئەو سامانەی کە لەشارەکاندا کۆبووبۆوە. ئەم سامانەش لەم زەویانەدا خۆی دەبینیەوە کە کێشمەکێشمی فرۆشتنو بەکرێدانی درێژخایەنی لەسەربوو. جا ئەم زەویانە سەرچاوەیەك بوون بۆ هێمنیو سەقامگیریو شکۆمەندیو بە دەستهێنانی سودو قازانج بۆپاشا. بۆیە هەوڵی دەستخستنی دەدرا. .

2- کۆچکردنی بەردەوامی خەڵکی لەلادێیەوە بۆ شار، ژمارەی خەلکی لادێیەکانی کەمکردەوە. ئەم کۆچکردنە کێشەی "زۆری خواستی"ی درووست کرد، چونکە ئەم کۆچکردووانە هەموویان بوونە بەکاربەر، لەکاتێکدا پێشتر بەرهەمهێن بوون. ئەمەش زیادکردنی بەرهەمی لادێی پێویست کرد بە تایبەت

دانەوێڵە. جا بە مەبەستی ڕووبەڕووبونەوەی زۆری خواست، پێویست بوو لەسەر خەڵکی لادێ بەرهەمەکانیان دوو قات زیاد بکەن.

3ـ شارەکان بوون بە هێزێك کە توانیان دەسەلآت بەسەر لادێکاندا بنوێنن‌و بەرهەمی کشتوکاڵ دابەشبکەن لەناوەندی بەکاربەرە نوێیەکاندا. کەلوپەلی بەکاربەری وەك:"مەوادی خواردن" بەمەبەستی فرۆشتن دەگوازرایەوە بۆ بازاڕەکانی شار. سکالآی لادێکان لەدەست زاڵ بوونی شار بەسەریاندا زیادی کرد. بەتایبەت لەشارەکانی ئیتاڵیادا.

بەمەبەستی دورخستنەوەی چینی قورغکار، شارەوانی شارەکان خۆی بالآدەستکردو چەند مەرج‌و شەرتێکی دانا لەسەر جوتیاران لە هەمبەر فرۆشتنی دەستکەوت‌و دیاری کردنی شوێنی فرۆشتن. چونکە قورغکارەکان بەرهەمی خەڵکی دێهاتەکانیان یاخود هی بازاڕی شاریان دەکڕی وپاشان بۆئەوەی نرخی بەرزبێتەوە لە عەمبارەکانیان عەمباریان دەکرد، ئەمەش بارودۆخی شاری بەرەو نالەباری بردبوو.

لە سەدەی چواردەدا گۆڕانکاری گەورە ڕویدا لە کشتوکاڵ‌و بە موڵك کردنی زەوی. برسیەتی‌و تاعون ونەخۆشی...هتد لە نیوەی یەکەمی سەدەی چواردە تەشەنەی سەندو بووە هۆی کەم بوونەوەیەکی گەورەو مەترسیدار لە ژمارەی دانیشتوان، بەتایبەت لەناوچەی لادێ نشینەکانی ئەوروپای خۆرئاوا باکورو باشور. هەربۆیە لەسەریان پێوست بوو هەستن بە هەڵوێست وەرگرتنێکی چارەساز، بەتایبەت لەو ناوچانەی کە دانیشتوانیان سودمەند دەبوون لە دانەوێڵەو ماددەی خاوی ئەو شوێنانەی تیایدا نیشتەجێ بوون.

کاتێکیش برسیەتیو تاعون دەستی کاری لەباربرد، کارکەران وجوتیاران کەم بونەوە، بەتایبەت لە ناوچە لادێنشینەکاندا. کۆچکردنی بەردەوام لەم ناوچەنەوە بۆ شارەکان، بووبە هۆی زیاد کردنی ژمارەی کرێکاران لە شارەکانداو نزم بونەوەی نرخی زەویەکان. زۆر لەزەویەکان نرخو بایەخیان کەم ببۆوە، مەگەر زەویەکی بە پیت وبەبڕشت، کە هەر ئەمەش وای کردبوو بۆ کشتوکاڵ بە کاریان بێنن.

لەم کاتەدا "یەك بەرهەمی کشتوکاڵی" لەبازاڕەکاندا بەڕمێن کەوتبوو، بەپێچەوانەی جاران کە جۆراوجۆریەتی هەبوو لە کشتوکاڵدا، وەك بەرهەمهێنانی گەنمو جۆ وپەقلیات(فاسۆلیا،لۆبیا،پاقلە). جا ئەم بەرهەمانە بەگوێرەی پێویستی خەڵکی بوو بۆیان. لەم لاوە ڕووبەری فراوان دابین کرا بۆ ئاژەڵداری وبەخێوکردنیان، وەك: "پەز،ڕەشەوڵاخ" کە بەرهەمیان بریتی بوو لە خوری وگۆشت وپێست کە لەم کاتەدا بەڕمێن کەوتبوو. کەم بوونەوەی جوتیاران لەلایەك، داچاندنی کشتوکال لە زەویە بەپیتەکانداو تایبەتکردنی بەم زەویانە، نرخی کرێی بەرزکردەوە.

لەئەنجامی بەڕمێن کەوتنی خوری، پرۆسەی پەرژین کردن لە ئینگلتڕا سەریهەڵدا.ئەم پرۆسەیە خۆی دەبینیەوە لە پەرژین کردنی زەویەکانو کردنی بە جێگای بەخێو کردنی ئاژەڵ. لە کاتێکدا پێشتر ئەم زەویانە جوتیاران کشتوکاڵیان تیادا دەکرد. ئیدی ئەم پرۆسەیە وای کرد ناوچەیەکی بەر فروان لە کێڵگەوە بگۆڕدرێت بۆ لەوەڕگە. بازرگانی خوری کە خاوەن زەویەکان دەستیان پێکردبوو، ببوو بە سەرچاوەیەکی تری داهاتی دەوڵەت.

هەرلەبەرئەوە حکومەت دەستی نەدەخستە ناو کاروبارەکانیان، چونکە دەیتوانی باج لەسەر قازانجیان دابنێت. وەنەبێ ئەمە تەنها لە بەریتانیا کورت هەلاتبێ‌و ولآتانی تر لێی بێبەش بووبن. بەڵکو دەبینین ولاتێکی وەك ئیسپانیا بەهۆی نزیکی لەشارە ئیتالیەکان، بارودۆخێکی هاوشێوەی بەریتانیای هەبوو. بەشێوەیەك خوری ئیسپانیا منافەسەیەکی بەهێزی خوری بەریتانیای دەکرد.

کەمبوونەوەی دەستی کار، کرێی کارکردنی بەرزکردەوەو، لەسەربەدەست هێنانی دەستی کار منافەسەیەکی گەورەی دروستکرد لە نێوان خاوەن زەویەکان. هەموو ئەمانەش لەبەرژەوەندی جوتیاران دابوو. خاوەن زەویەکان شکستێکی گەورەیان خوارد لە بەکۆیلەکردنەوەی جوتیار بۆ ئەرزەکەی (پەیوەست کردنی جوتیار بەزەوی)و سەپاندنی ئەرکەکان بەسەریاندا. هەروەك چۆن لە پێشدا لەئارادابوو. خاوەن زەویەکان زیاتر بە کۆچکردنی خەڵکی لادێکان بۆ شار باریان کەوتبووە لێژی، چونکە خەڵکی شارەکان پێشوازیان لە کۆچی بەردەوامی دێهاتیەکان دەکردو لەپیشە جۆربەجۆرەکان دایاندەمەزراندن. جوتیارانیش توانیان بە پێدانی بڕێك پارە یان ماڵ بە خانەدانان، خۆیان ڕزگاربکەن. ئەم دیاردەیەش لە سەدەی دوازدەوە دەستی پێکردو گۆرانی گەورەی بەسەرداهاتو لەسەدەی چواردە بەردەوامیدا بەخۆی تا سەدەی دواتر. لەدوای ساڵی 1300، بە مەبەستی لەدەست نەچوونی جوتیاران خانەدانان هەندێ کرێ یان بۆ جوتیاران ڕەت کردەوەو دەستیانکرد بە کەمکردنەوەیئەرکەکان لەسەریان. لە ناوەڕاستی

سەدەی چواردەوە لە باکورو ناوەڕاستی ئیتاڵیا کۆیلایەتی زەوی کۆتایی پێهات‌و ئینگلتراش لەدوای ئەو کۆتایی بەم دیاردەیە هێنا،و پاش ئەمیش باکوری فەرەنساو بەشێکی گەورە لەئەڵمانیای باشورو خۆرئاوا کۆیلایەتی زەویان تیاداکۆتایی پیچهات. بەڵام جوتیارانی ئەڵمانیای خۆرهەلات (ناوچەی دەریای بەلتیق‌و پروسیا) هیچ سودێکیان لەم گۆڕانکاریانە نەدی. ئەمەش بەهۆی سەپاندنی هێزو بەکارهێنانی کوتەك بەرامبەریان‌و خستنەکاری جوتیاران لە کارەکانیان، بەمەبەستی دەستخستنی کاری هەرزان‌و قازانجی زۆر لە بازاڕەکانی خۆرئاوا.

بەگشتی بەهاتنی سەدەی پازدە جوتیارانی ئەورووپا ڕزگاریان بوو لە کۆیلەیی زەوی. وەلێ ئەورووپای خۆرهەلات لەم حالەتە بە دوور بوو.

هەر لە سەرەتاکانی سەدەی چواردە دیاردەی بەکرێ گرتنی زەوی پەیدابوو. خاوەن زەویەکان بۆئەوەی جوتیاران لەدەست نەدەن، هەستان بە ڕێککەوتن لەگەڵیان‌و لە دەستکەوتدا هاوبەشیان پێدەکردن. جوتیارو کەشاوەرزەکان لەبەرامبەر نیوەی بەرهەم یان سێ یەکی بەرهەم بۆچەند ساڵێك یاخود بۆ مانەوەیان لەسەر زەویەکە بە درێژایی ژیانیان، خۆیان بە زەویەکان خەریك دەکرد. (ئەمە بەپێی ڕێککەوتنەکە لەنێوان خاوەن زەوی‌و جوتیار، ماوەی مانەوەی جوتیار لەسەر زەویەکە دیاری دەکرا بەڕەزامەندی هەردوولا). لەسەدەی پازدە کاتێ نرخی بەرهەمی کشتوکاڵی بەرز بۆوە، جوتیاران زەویان لە خاوەن زەویەکان وەردەگرت‌و دایاندەچاند، لە بەرامبەردا بڕێ پارەی دیاریکراویان دەدا بە خاوەن زەویەکان. خراپی

ئەمەش لەوەدابوو ئەگەر بەروبومی جوتیار باشبایە یان خراپ (ساڵەکە هاتی بوایە یان نەهاتی) ئەوا جوتیار دەبوایە کرێی زەویەکە بدات. لەبەرئەوە زۆرجار جوتیار ناچار بوو پارە قەرز بکات بۆ دانەوەی بڕە پارەکە بە خاوەن زەویەکە.

لەگەڵ ئەوەی جوتیاران و کۆیلەی زەوییەکان ئازادییان بەدەستهێنابوو، بەڵام لە زۆرێك لە شوێنەکان بارودۆخیان ئەگەر خراپتر نەبووبێ لە پێشوتر باشتر نەبوو. ئەمەش بەهۆی نەمانی پارێزگاری خانەدانەکان و گەورە پیاوان لە سەریان. چونکە پێشتر پارێزگاریان لێدەکردن و بە نەمانی ئەم پارێزگارییە جوتیاران ئاوەلابوون لە بەردەم هێرشی چەتەکان و بەکرێ گیراوەکان.

هەرچۆنێك بێت بەهاتنی سەدەی شازدە لادێکانی ئەوروپا گۆڕانی گەورەیان بەسەرداهات. دیاردەی کۆیلەیی زەوی هەڵوەشایەوە و زەوی کشتوکاڵی دای لە زیادی و شێوازی کشتکاری گۆڕانی بەسەرداهات. ئەم گۆڕنەش خۆی دەبینیەوە لەوەی کە خاوەن زەوی بڕێ پارەی وەردەگرت لە جوتیار، لەبری ئەوەی زەویەکەی پێدابوو، یان خاوەن زەویەکان جوتیارانیان لەسەر زەویەکە دادەنا لە بەرامبەر هاوبەشی پێکرانی لە بەرهەمدا، یاخود کرێکارانیان بەکرێ دەگرت بە کرێیەکی ڕۆژانە.

## پیشەسازی و بازرگانی:-

ئابووری لادێ هەر لە سەرەتاکانی سەدەی ناوەڕاست تا سەدەی یازدە لەسەر ئابووریەکی خۆبژێوی ڕاوەستا بوو. بازرگانیش کە ئەگەر بریتی بێت لە بازرگانی دەرەوە بۆ شوێنە دوورەدەستەکان ئەوا هەربوونی نەبوو، جگە

لە شارە کەنارییەکانی سەر دەریای ناوەڕاست کە بازرگانی دەرەوەی تیادا ئەنجام دەدرا. جوتیار لەژێرسیستەمی دەرەبەگی دابوون و لە ماڵەکانی خۆیاندا هەڵدەستان بە سازکردنی ئەو کەلوپەلانەی کە لەژیانی ڕۆژانەدا پێویستیان پێهەبوو. وەك:ـ ئامرازەکانی کشتوکاڵ و کەلوپەلی پێویستی ناوماڵ و پۆشاك و کانزاسازی...هتد. ئەمەش بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەکانی خانەدانان لەو شتانەی کە پێویستیان پێهەبوو.

بە پەرەسەندن و گەشانەوەی شارەکان ئابووری لادێ گۆڕانی بەسەرداهات و ئابووری نوێ سەریهەڵدا، کە لەسەر بنەمای دابەشکردنی کار ڕاوەستا بوو. لێرەوە شارولادێکان بوون بە تەواوکەری یەکتری. کاری لادێ تەنها لەبەهەمهێنانی خواردەمەنی و سازکردنی کەلوپەلی سەرەتایی خۆی دەبینیەوە. شارەکانیش بوون بە جێگەی پیشەسازی و کارەکان لەسەر بنەمای کاردابەشکردن ڕێکخران. واتا هەریەکە خەریکی ئەو کارە بوو کە تیایدا بەهرەمەند بوو. وەك:ـ قەساب، نانەوا، چەك ساز، ئاسنگەر ، کەوش ساز، بەرگ دروو. ئەمانە هەریەکەیان سەرقاڵی کاری خۆی بوو. رەوتی کارکردن و دابەشکردنی کار بەشێوەیەك چووە پێشەوە، کە پێویستی کرد یەك پیشەش دابەشکردنی تیا ئەنجام بدرێ. وەك ئەوەی پیشەسازی چنین دابەشبوو لەنێوان(پەرەچی، ڕستن، چنین). ئەم دیاردەیە بەشێوەیەك پەرەی سەند، کە لە شوێنێکی وەك فلۆرەنسا، تەنها لە سەدەی چواردە ژمارەی کرێکارانی گەیشتە سی هەزار کرێکار. ئەم ژمارە زۆرە کاریان دەکردو بەرهەمی ساڵانەیان دەگەیشتە 1200000فلۆرین.

فلاندروز لە زەویەنزمەکانو ئیتاڵیا، ناوبانگیان لە خوریدا پەیداکرد.بەلاّم ئیتاڵیا لەم ڕووەوە بەناوبانگتربوو. ئیدی ئەم دوو ناوچەیە بوونە مەکۆی پیشەسازی خوریو خوریان لە ئیسپانیا(ارگۆن)و ئینگلترا هاوردە دەکرد.

**سەندیکاکان:**

سەرهەڵدانی بازرگانی پیشەسازی ودابەشکردنی کار،بووبەهۆی پەیدابوونی سەندیکای بازرگانیو پیشەیی. کاری ئەم سەندیکایانە خۆی دەبینیەوە لەهاوسەنگکردنی پیشە ئالۆزەکان وبیروباوەڕە کۆنەکانی سەدەکانی ناوەڕاست. بەو مانایەی"ئایە مرۆڤ چۆن کارە ئابوریەکانی بەڕێوەبەریَ؟.

سەندیکا بەمانای ئەوە نایەت کەهەموو بەرهەمێکی ئابوری دەگرێتە خۆی. بەڵکو زۆرێك لە بەڵێندەرەکان خۆیان دوور دەخستەوە لەسەندیکاکان، لەملاشەوە بەشێکیتریان بەهۆی گرێبەستەکانیان بەسەنیکاکانەوە بەسترابوونەوە. ئەوەی ماوەتەوە بڵێین: ئەوەیە کە توانای سەندیکاکانو ڕێکخستنیان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنیکی ترو لەولاّتێکەوە بۆ ولاّتێکی تر جیاوازبوو. بۆنمونە ڕێکخستنی سەندیکایی هۆڵندی جیاوازبوو لەڕێکخستنی سەندیکایی فلۆرەنسی یان میلانۆیی.

**ئەرکی سەنیکاکان:**

لەڕاستیدا چەندین ئەرکی کۆمەلاّیەتیو ئاینی لەدامەزراوە کۆنەکانەوە بۆ سەندیکاکان بەجێما. سەندیکاکان بەسەرپەرشتی هەندیَ قەشە دامەزران، بۆ مەبەستگەلی وەك گرنگیدان بە نەخۆشو پەککەوتەو بیَ نەواو ئامادەبوون

لەپرسەو بردنی تەرمەکان، وە ئەو ئاهەنگانەش کە بەبۆنەی جەژنەکان بەڕێوە دەبران (یاخودجێبەجیٚ کردنی کاری بازرگانی لەکاتی گرێدرانی بازاڕدا). ئەم سەندیکایانە بەهرەمەند بوون بەدەسەلاٚتێکی بەر فراوانو چەندان ئەرکی جۆراوجۆری لەسەرشان بوو لەسەدەکانی ناوەڕاست. لەوانە ڕێکخستنی بازاڕە ناوخۆیەکانو دیاری کردنی کەلوپەکانو دانانی نرخ لەسەریان بەشێوەیەکی دادگەرانە. هەروەها کۆتکردنی ئەوانەی کە دەیانویست سود لە بازاڕە ناوخۆیەکان وەربگرن،بەبیٚ ئەوەی لەکارەکانی سەندیکا بەشداری بکەنو توشی ئەو ماندووبوونە ببن کە ئەندامانی سەندیکا توشی دەبوون. سەندیکا ڕێگەی دەگرت لەناردنە دەرەوەی هەر کەلوپەلێك کە لە ناوخۆدا زیاد نەبووایە. واتا تا خەڵك پێویستی بووایە نەیدەهێشت بچێتە دەرەوە. سەندیکاکان باجیان دەخستە سەر ئەو کەلوپولانەی کە لەدەرەوە دەهاتنە ناوخۆ. بۆئەوەی کەلوپەلی دەرەوە نەتوانیٚ منافەسەی بەرهەمی ناوخۆ بکات. خەڵکی لەو بڕوایە دابوون کە سەندیکاکان ڕێگەیەکی شەریفانە پەیڕەو دەکەن لەمامەڵەکردنو چاودێریو ڕێگریەکانی ڕێگریەکانی لە غەش کردن ولەهەمبەر ئەو فرۆشتنانانەش کە لە دەرەوەی بازاڕی ناوخۆیی دەفرۆشران.

سەندیکاو دەسەلاٚتی شار هاوکاری یەکتریان دەکرد لەبەڕێوەبردنو ئاسانکردنی کاروبارو قەدەغەکردنی قۆرغکاریو بەرزکردنەوەی نرخەکان.هەموو ئەمانەش لەڕێگەی یەك سەندیکا یاخود کۆمەڵیٚ سەندیکا بەئەنجام دەگەیەنرا. بەڕاستی سەنیکاکان دەسەلاٚتێکی سیاسی گەورەو

گرانیان لەزۆرێك لەشارەكانی ئەروپادا پیادە كرد. بەڵام ئەم پیادە كردنە سیاسیە بەگوێرەی شوێنەكان جیاواز بوو. لەهەندێ شاردا سەندیكاكان لە ئەنجومەنی شارەوانیدا خۆی دەنواند وەك "فلۆرەنسا" كە سیاسەتی ئابووری تیادا پەیڕەو دەكرد. لەهەندێ شاری تر سەرپەرشتیاری سەندیكاكان فشاریان دەخستەسەر بەڕێوبەرێتی شار، بۆ جێبەجێكردنی پرۆژەو پیادەكردنی سیاسەتەكانیان.

**سەندیكاكان بە گشتی دوو جۆر بوون:-**

1ـ سەندیكا سەرەكیە گەورەكان. ئەمانە ئەندامەكانیان بەهرەمەند دەبوون لەو دەسەڵاتە گەورەیەی هەیانبوو.

2ـ سەندیكا پیشەییە بچوكەكان. ئەمانە لاواز بوون ولەماوەیەكی كەمدا نەبێت دەسەڵاتێكی فراوانیان نەبوو.

سەندیكا پیشەییەكان پێداگریان دەكرد لەسەر تایبتمەندی كارو بەردەوامی پیشەسازیو هەناردە كردنی بەرهەم بۆبازاڕەكان. ئەوانەی سەر بەسەندیكاكان بوون لەپێناوی فێربون وشارەزابوون لەكار وپیشەدا، بەشداریان دەكرد لە خولی تایبەت. بەشداربووی خول لەسەرەتادا لەخولی شاگردی دابوو.ئەم خولەش ئەم كەسانەی دەگرتەوە كە لەتەمەندا بچوك بوون. ئەمانە بە مەبەستی فێربوون حەوت تا هەشت ساڵ بەكارێكەوە سەرقاڵ دەكران بەبێ ئەوەی هیچ كرێیەكیان پێبدرێت، تەنها ئەوەندە نەبێت لەلایەن خاوەنكارەوە ژیانیان دابین دەكرا. پاش تەواوكردنی ئەم خولە، بەژداربوو دەبوو بە كرێكارێكی ئازادو كاری بەكرێ دەكردو لە هەركوێ

یەکیش مەبەستی بوایە کاری دەکرد. ئەمجا لەدوای ئەمەسەندیکا دانی پیادادەناو دەبوو بەکارمەندێکی پسپۆڕ کەمافی دانانی دوکان یاخودکارگەی هەبوو. هەروەك دەیتوانی ڕاستەوخۆ بەرهەمەکەی بەرێتە بازاڕەکان‌و بیفرۆشێ.

ئەندام بوون لەسەندیکا پیشیەکان دیاری کراو بنچینەو بنەما داندرا بۆ دەستنیشان کردن ودیاری کردنی جۆری کەرەستەو ڕێگەی دروستکردنی.

لەوکارەکۆمەلآیەتیانەشی کەسەندیکا بەهاوکاری دەسەلآتی شارەکان ئەنجامی دەدا، بریتی بوو لەهاندان ورێخۆشکردنی کۆچکردن لە لادێکانەوە بۆشارەکان. ئەمەشی بەمەبەستی لاوازکردنی خانەدانان‌و پەیداکردنی دەستی کار دەکرد. ساکاتێکیش منافەسەو کێبڕکێ لەنێوان خانەدانان‌و شارەکان گەرمبوو، سەندیکاکان بەهاوکاری دەسەلآتی شارەکان هەستان بەپاراستنی جوتیاری کۆچکردوو، لەملاشەوە خانەدانان دەیانویست جوتیاران دووبارە بگێڕنەوە سەر کێلگەکان. زۆرێك لەشارەکان هەستان بەدارشتنی چەند یاسایەك، کەبەگوێرەیان: جوتیاری ڕاکردوو ئەگەر بۆماوەی سالێك ویەکرۆژ توانیبێتی لە شار بمێنێتەوە، ئەوا ئازادبوو نەدەبوایە بگێڕدرێتەوە بۆ سەر کێلگە. هەروەك سەندیکاکان بەهاوکاری لەگەلّ حکوماتە شاریەکان، ئەندامەکانی لەدزی وڕاو وڕووت دەپاراست. هەروەها لەکاتی گیران‌و زیندانی کرانیشی، ئامادە بوو پێناو "فدیە" بدات بۆ ڕزگار کردنی.

سەندیكای شاربۆ دوورخستنەوەی ئەندامەكانی خۆی لەو زەرەرو زیانانەی كە ڕووبەڕوویان دەبۆوەو توشیان دەبوو، وە بۆ زیادكردنی چالاكی بازرگانی، لەگەڵ دەسەلاتی شارانی ترو سەندیكای تر كەوتە وتوویژ.شیاوی باسە سندیكا جگە لەم ئەركانە، بەرپرسیاریش بوو لەقەرزی ئەندامەكانی.

**لەناوچونی سەندیكاكانی بازرگان وپیشەسازان:-**

كاتێ بازرگانیو پیشەسازی لەماوەی هەردوو سەدەی چواردەو پازدە فراوانی بەخۆیەوە بینی، سەندیكا بازرگانی وپیشەوەریەكان لەتوانایاندا نەما خۆیان بگونجێنن لەگەڵ بارودۆخی نوێ.پێشتر بەرهەمهێنان لە جوغزی ناوچەیەكدا بوو، سەندیكاكان كاروبارەكانیان هەڵدەسوڕاند. كاتێكیش بەرهەمهێنانی ناوخۆیی بەهۆی بەرەوپێشچوونی پیشەسازیو سەهەڵدانی ئامێری تازە، دای لەزیادی وفراوان بوو، وەك (ئامێری پیشەسازی ڕستنو چنینو كانزاسازی وبەكارهێنانی هێزی ئاوی بۆ هەڵسوڕاندنی ئەم ئامێرانە، بەتایبەت بەكارهێنانی لە پیشەسازی ڕستن وچنین،كانزاسازی). چیتر لەتوانای پیشەوەرە ناوخۆییەكاندانەما كێبڕكێ بكەن لەگەڵ بەڵێندەرەكان. ئەو بەڵێندەرانەی كە لەدەرەوەی سەندیكاكان بوون وبەو سامانە زۆرەی كە خاوەنی بوون دەیانتوانی كارەكانیان باشتركەن وبەرهەمیان زیاتربكەن. بەهەمانشێوە بازرگانی دەرەوەش گۆڕانی تێكەوتبوو، بەوەی كە پشتی دەبەست بەبەرهەمهێنان لەسەر پشتێنەیەكی بەرفراوان. لەلایەكی تریشەوە بەڵێندەرەكان لەتوانایانداهەبوو ماددەی خاو لەخوری وكانزاكان بكڕن، یاخود ماددەی خاو دابەشبكەن بەسەر پیشەوەرە جۆراوجۆرەكاندا

بەمەبەستی دروستکردنی شتومەکی خواست لەسەر. کە لەبەرمبەردا کرێیەکی ڕۆژانەیان دەدا بە پیشەوەرەکان وکەلوپەلە دروستکراوەکانیشیان بە قازانجێکی زۆرتر دەفرۆشتەوە. ئەم ڕێگەیەش پێی دەوترا: ( putting out system).

سەندیکاکانیش پارێزگاریان لە خۆیان دەکردو دژی هەموو جۆرە نوێکاریو نوێگەریەك بوون کە بەسەر پیشەسازیدا هاتبایە. هەروەها پێداگریان دەکرد لەسەر یەکە پیشەوەریە بچوکەکان، هەروەك کە لە پێشوو باوبوو. لە ڕاستیدا هەر سەندیکاکان دژی نوێکاری نەبوون، بەڵکو کرێکارانیش بەهۆی ئەوەی ئامێری نوێ ئەوانی بێکاردەکرد بەربەرەکانی نوێکاریان دەکرد.

بەداهاتنی سەدەی شازدە سیستەمی سەندیکایی بازرگانیو پیشەوەری پوکایەوە. بەشێك لە سەندیکا پیشەوەریەکان کاریگەربوون بە فکرەی نوێ. سەندیکا کۆنەکان لە ژێر دەسەلاتی خاوەن پیشەیەکی دەوڵەمەند دابوون، یاخود لە ژێر دەستی کۆمەڵێك لە بەڵێندەران دابوون کەخۆیان کۆمپانیای بازرگانیان ڕێکدەخست بۆ بەڕێوەبردنی بازرگانی کردن بە کەلوپەلێکی دیاریکراو بە کۆ(جملە)، بەبێ ئەوەی خۆیان بەشداری بکەن لە دروستکردنی ئەو کەلوپەلەدا. کریکاریو شاگردی بە شێوەیەك دابەزی کە کرێکاری دەکرا بۆ بازرگانە سەرمایەدارەکان لە ژێر سیستەمی کەرتی تایبەت. هەر ئەم سیستەمەش دواتر بووە هۆی لەناوبردنی سەندیکاکان.

## شۆڕشی بازرگانی:-

فراوانبوونی شارەکان، هۆکارێك بوو بۆ پەرەسەندنی پیشەسازیو بەرفراوانبوونی بازرگانی. لەهەندێ لە شارە گرنگەکانی ئەوروپا بازاڕە وەرزیەکان گرێ دەدران بەمەبەستی خستنە ڕووی کەلوپەلو ئاڵوگۆڕکردنی ئەم کەلوپەلانەو بازرگانی پێکردنی. سا کاتێکیش بازرگانی بەرفراوان بوو، خرانەڕووی شتومەکی زیاتر لە شارە جیاوەزەکانو بازاڕی گەورە، بووبە پێویستیەکی ڕۆژگار. "برۆفنسو ترویو شامین" چەند ناوچەیەکی گرنگبوون کە دواتر بازرگانان لە هەموو شوێنەکانی ئەوروپا تیایدا کۆدەبوونەوە بۆ کارو ئاڵوگۆڕی بازرگانی. بەلاّم لە سەرەتای سەدەی چواردەوە گۆڕان بەسەر بارودۆخەکەداهات، ئەمەش بەهۆی ئازدبوونی بازاڕەکان نەمانی باج لەسەریان.

فلیپی چوارەمی پاشای فەرەنسا، هەستا بە سەپاندنی باجی قورس لەسەر بازاڕەکان، بەمەش بازرگانان لە بازاڕەکانی شامینو پروفنس دوورکەوتنەوەو ڕوویان کردە جنێفو سویسراو برجس لە هۆلّندا. بەلاّم ئەمەش هەروا نەڕۆی، بەلّکو کاتێ لەنیوەی سەدەی پازدە (1463)،لۆیسی یازدە هاتە سەر تەخت مەرکەزی گرێدرانی بازاڕەکان گەڕایەوە لێونی فەرەنسا.ئەمەش بەهۆی برەودانی بە بازرگانی حەریر.

## ڕێگە بازرگانیەکان:-

ڕێگەی سەرەکی بازرگانی بۆ شوێنە دوورەکان گوزارشتی دەکرد لە ڕێگەی دەریای ناوەڕاست کە شارە ئیتالیە گرنگەکانی دەبەستەوە بە هەندێکیان و، وە بە ناوەندە پڕ بایەخەکانی نیشتمانی ئیسلامیو ئاسیای بچوكو بەرشەلۆنەی گرێ دەدان. لەپێش جەنگی خاچیەوە شارە ئیتالیەکان

پەیوەندی بازرگانیان لەگەڵ خۆرهەلاتی دەریای ناوەڕاست پێکهێنا بوو. بەلاّم لەدوای جەنگی خاچی ئەم بازرگانیە چالاکترو گەشاوەتر بوو لە نێوان ئیتالیاو هەریەکە لە ناوەندەکانی خۆرهەلاّت. ئیتالیا ئاوریشمو خامی لە چین دەهێنا، بەردی بەنرخو بەهاراتیشی لەولاّتی عەرەبیو هیندەوە وە چنگ دەکەوتو لە ڕێگەی (میصرو دەریای سور)ەوە دەیهاورد. بە هەمانشێوە شارەکانی سوریا بەهۆی بازرگانی هیندەوە، بە ئیتالیا بەسترابوونەوە. هەر یەکە لە جەنەواو ڤینیساش ناوەندی بازرگانیان لە هەریەکە لە ئەستەمبوڵ - ئەزمیر - شارە یۆنانیەکان - نیمچە دوورگەی قرم - باشووری ڕوسیادا دامەزرندبوو.

ڕێگەی دووەم کە کاری بازرگانی تیادا بە جموجۆڵ بوو، بریتی بوو لە ڕێگەی باکور. کە بە ئینگلتراو زەویە نزمەکان (شارەکانی باکوری ئەڵمانیا)و شارەکانی سەر دەریای بەلتیق تێدەپەڕیو ڕوسیاو هەندێ جاریش ئەستەمبوڵی دەگرتەوە. ئەو کەلوپەلانەی کە ئاڵوگۆڕیان پێدەکرا، بریتیبوون لە: گەنم، کەلە باکوری ئەفریقاو باشوری ڕوسیاو صقلّیە دەگوازرایەوە بۆ ئەوروپا، هەروەها دارو تەختە لە ڕوسیاو باکوری ئەوروپاوە دەگوێزرایەوە بۆ ولاّتانی ئەوروپا، ئەمەش بەهۆی بێ توانایی ئەوان لەبەرهەمهێنانی ئەم پێداویستیانە.

تا هاتنی نیوەی سەدەی چواردە بریتانیا کارگەی چنینو قوماشی خوری دانەمەزراندبوو،هەربۆیە خوری بۆ هەریەکە لە زەویە نزمەکانو ئیتالیای دەنارد، ئەمە لەکاتێدا ئیسپانیاش خوری دەناردە شارەکانی ئیتالّیا. بەلاّم

دوای ئـەم مێـژووە بـەریتانیا نـاردنی خـوری قەدەغـەکرد.هـەروەها مـاددەی (شەب)زاخ–یان لە باشووری ڕوسیاو ئاسیای بچوکەوە دەهاورد.ئەم ماددەیە بەمەبەسـتی خاوێنکردنەوەوچەسـپاندنی ڕەنـگ لەسـەر کوتاڵـە پیـشەسازیکوتاڵو گلێنەسـازیدا بـەکاردەهات. ئیتالیـا لـە بەرامبـەر ئـەم هاوردانـەدا، کوتـاڵی ئاوریـشمو خـوریو پۆشـاكو چـەکی دەنـاردە ئـەوروپا. ناوەندە گرنگـەکانی ئیتاليـا بریتـی بـوون لـە: لۆمباردیـاو لۆکـاو فلۆرەنـساو ڤینیسیا. هەروەك لە زەویـە نزمەکانیشـچەند ناوەنـدێکی گرنگـی پیـشەسازی هـەبوون، وەك: (بـرجس - ییـرس - کمپـریو لیـل) کـە بـەناوبانگ بـوون بـە پیشەسازی خوریو لەدوای نیوەی سەدەی چـواردە خوریـان لـە ئیـسپانیاوە هاوردە دەکرد. دوای ئەمە بەهۆی کەمی دەستی کارەوە بازرگـانی کـردن بـە کەلوپەلی ئامادە نەکراو دەکرا.

شـاری ئـەنتۆریپ لـە سـەدەی پـازدەدا ناوبـانگی بـە پیـشەسازی کوتـاڵی خوری دەرکرد. کوتاڵی چنراو لە بەندەری بسکای بە ئاسنی خـاوی ئیـسپانیا دەگۆڕدرایەوەو بەکەشتی هۆڵەندی ئینگلیزی فەرەنسی دەگوێزرایەوە.

### کۆمەڵەی هنسی:-

ناوچەکانی باکوری ئەوروپا لەهەردوو سەدەی چواردەو پازدە ناوچـەیەکی سـەرەکی بازرگـانی بـوون. بـە مەبەسـتی پاراسـتنی دەسـتکەوتەکانیانو بەربژاریەکانیان کە لەلایەن دەسەڵاتەوە بە بازرگانـان بەخـشرابوو، کۆمەڵـەی "هنسی"یان– پێکهێنا. سەرەتا ئەم کۆمەڵەیە بریتـی بـوو لـە ڕێککـەوتنێکی سـادە کـە لـە نێـوان بازرگانـەکانو بـە شـێوەیەکی تاکتـاك بەسـترابوو. ئـەم

بەربژاریانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، بریتی بوو لە سوککردنی باج‌و ئەرکێك کە لەسەریان بوو، سەرەڕای پارێزراویان لە یاساکان.

لەدوای سالّی 1350ز کۆمەڵەی هنسی گۆڕانی بەسەرداهات‌و لە ڕێککەوتنی نێوان بازرگانانەوە بووبە ڕێککەوتنی نێوان شارەکان. هەر تاکێك لە تاکەکانی ئەو شارانە بەشداربوون لە کۆمەڵەی هنسی وسودمەند بوون لە سودەکانی بازرگانی. هەریەکە لە شارەکانی (لوبیك‌و کولون‌و بریمن‌و هامبرگ) بالآدەست بوون بەسەر کۆمەڵەی هنسی‌و لەنێوانیاندا یەکیەتیەکی بەهێزەبوو کە پێکەوەی گرێی دەدان. نوێنەرانی شارە ئەندامەکان کۆدەبوونەوەو بریارەکانیشیان گوزارشت بوو لە شارە ئەندامەکان. بەڵام خۆ هەموو شارەکانیش وەنەبێ بەشدار بووبن لەم کۆبونەوانە. هەروەها هەموو کاتێك بڕیارەکان بێ ئەو کۆبونەوانەش جێبەجێ نەدەکران وبە بەردەوامی ململانێ هەبوو لە نێوان شارە سەرەکیەکانی کۆمەڵەی هنسی. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەم کۆمەڵە مایەوەو بەردەوام بوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە ئەندامەکانی سودێکی زۆریان دەبینی لە مانەوەی ئەم کۆمەڵەیە.

سەرچاوەی سەرەکی دارایی‌و داهاتی کۆمەڵەی هنسی، بریتی بوو لە لێشاوی هێنان‌و بردنی کەلوپەل لەنێوان شارەکانی نوفگوردی ڕوسیا(نزیك لینیگرادی ئەمڕۆ)و شاری لوبیك‌و هامبرگ‌و لندن‌و برجس. وە هەر لەم ڕێگەیەشەوە ڕێگەیەکی تر بەرەو ئەسکەندەنافیاو ڕوسیاو ئەستەمبوڵ دەڕۆیشت. کەلوپەلی بازرگانی پێوەکراو، بریتی بوو لە "ماسی‌و مێوو تەختەو خوری‌و دانەوێڵەو کانزاو هەنگوین‌و عەنبەرو قەتران" لە خۆرهەڵات،

لە خۆرئاواشەوە گۆشتی فەرەنساو پۆشاکی هۆڵەنداو کەلوپەلی دروستکراوی تریان ڕووەو خۆرهەلآت دەبرد. کۆمەڵەی هنسی هەروا نەڕۆی، بەڵکو کاتێ کێبڕکێ توندبوو لەنێوان دەوڵەتە تازەکان دەسەلآتی لەدەستداو لەنیوەی سەدەی شازدەشدا ئەم دەسەلآتەشی ڕۆیشت.

شتومەکەکانی ئیتالیاو باشووری ئەوروپا لە ڕێگەی شاخی ئەلپەوە دەهێندرانو لەوێش لەگەڵ کەلوپەلی خۆرهەلآتو باکوری ئەوروپا لە ئەڵمانیاو هۆڵنداو لە بازاڕە وەرزیەکان ئاڵوگۆڕدەکران. شیاوی باسە بازاڕە وەرزیەکان لەناوەڕاستیئەوروپا لە باشوری ئەڵمانیاو سویسڕا دەکرانەوە.

**سەرهەڵدانی دراوو بانكو سەرەتای سەرمایەداری:-**

دراو لەسەدەی دوازدە زاینی لە ئیتالیا سەریهەڵدا. دراوی زیو لەلایەن بنەماڵەی میرۆفنجی بەکار دەهات. وەلێ دراوی زێڕ بۆ یەکەم جار لە ناپولیو صقلیه بەکارهێنرا. ئیمپراتۆر"فردریکی دووەم" ئەمەی لە نورماندیانە وەرگرت کە پێشتر حوکمی هەردوو صقلیەیان دەکرد. پاش ئەمە لە ئیتالیاو لەسەدەی سێزدە ئەم دراوە بلآو بویەوە. بەلآم فلۆرەنسا فلۆرینی وەك دراوێکی زێڕ بەکاردەهێناو ڤینیسیاش دۆکی بەکاردەهێنا. پاش هەموو ئەمانە ئینجا دراو بلآو بویەوە لە سەرجەم ناوچەکانی ئەوروپای خۆرئاوا، بەهەمانشێوە "خانەی سامان" وەك سەرەتایەك بۆ بانك سەریهەڵداو بەرامبەر بە وەرگرتنی سوو قەرزی بە خەڵکی دەدا. لەپاشاندا بانك لە ئیتالیا پەیدابووو هەڵدەستا بە ئاڵوگۆڕی دراوو قەرزی دەدا بە بازرگانانو پادشاو میرەکان. ئەم بانکانە توانیان چەندین لق لەسەرجەم شوێنەکانی ئەوروپادا

بکەنەوەو سودی گەورە وەچنگ خۆیان بخەن. هەروەها چەندین بنەماڵەی دەوڵەمەند سەریهەڵداو بوونە خاوەنی بانك. وەك بنەماڵەی میدیچی وفوگر. ئەمانە بوون بە دەوڵەمەندترین بنەماڵەی ئەوروپا لە هەردوو سەدەی پازدەو شازدە .

**بازرگانی نێوان ئەوروپاو ئاسیا:-**

لەدوای ڕمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کۆنو هێرشی هۆزە بەربەریەکان لە سەدەی پێنجی زایینی، بازرگانی نێوان ئەوروپاو ئاسیا وەستا. ئەم وەستانە لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست هەر بەردەوام بوو، بەهۆی جەنگو ئاژاوەی نێوان میرەکانو ئەو پەشێویەی کە لەو کاتەدا ئەوروپای‌داگرتبوو.شارەئیتالیەکان کە کەوتبوونە سەردەریای ناوەڕاست چالاکی بازرگانی خۆیان گەڕاندەوەو بەهۆی جەنگی خاچیشەوە زیاتر گەشەی کرد. شارە سەرەکیەکانی ئیتالیا هەستان بە بنیاتنانی ناوەندی بازرگانی لە ئەسکەندەریەو سوریاو کەنارەکانی ئاسیای بچوك (تەرابزون،ئەزمیر،ئەستەمبوڵ).

لە ڕاستیدا عەرەبەکان بازرگانی گەورەبوون، کە بەدرێژایی کەنارەکانی سوریاو باکوری ئەفریقا تاوەکو چین بازرگانیان تیا دەکردو توانیبوویان زاڵبن بەسەر بازرگانی ئاسیادا. ئەوان شتومەکی جۆراوجۆری وەك بەهاراتو ئاوریشمو بەردی بەنرخیان لە چینو هیندو باشوری خۆرهەلاتی ئاسیاوە دەهێنا. لەم لاشەوە بازرگانە ئیتالیەکان، کەزۆربەیان بندوقیو ڤینیسی بوون، ئەم شتومەکانەو هەندێ لە بەرهەمەکانی تری ولاتانی ئیسلامیان

دەکڕیو دەیانگواستەوە ئیتالیا. بازرگانە مسوڵمانەکانیش لە هیندەوە کەلوپەلیان دەبردە بەسرەو لەوێشەوە بەهۆی کاروانە بازرگانیەکانو لەڕێگای بیابانەوەبۆ دیمەشقو حەلەبو شارە کەناریەکانی تری سوریایان دەبرد، یاخود لە بەسرەوە بەرەو بەغداو موصلو دیاربکرو تەرابزونیان دەبرد. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا ڤینیسیەکان ئەم کەلوپەلانەیان لەو شارە کەناریانە دەکڕیو پاشان بەرەو ئیتالیایان دەگواستەوە.

لە حاڵەتی دووەمیشدا بازرگانانی مۆسکۆو ئەوروپای باکورو خۆرهەڵات، هەموو ئەم کەلوپەلانەیان دەگواستەوە بۆ بەشەکانی باکورو ناوەڕاستی ئەوروپا. ڕێگەیەکی تریش کە کەمتر نەبوولە ڕێگای یەکەمو ڕێڕەوی بازرگانی بوو، بریتی بوو لە دەریای سور. کەشتیە بازرگانیەکان کە لەهیندو باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیاوە دەهاتنو لە جدە یاخود لە عەدەن لەنگەریان دەگرتو لە سوێس بارەکانیان دادەگرت.وەبەهۆی کاروانە بازرگانیەکانیش ئەم شتومەکانەیان بەرەو قاهیرەو ئەسکەندەریە دەگواستەوە. بازرگانە ئیتالیەکانیش ئەم کەلوپەلانەیان دەکڕیو بەرەو ئیتالیایان دەبرد. بەڵام بەهۆی گومرگو ئەو باجە قورسانەی کە لەلایەن میرو پاشاکان لێیان دەسەنرا کاتێك بە سنوری ئەواندا تێدەپەڕین.ئەم شتومەکانە زۆربەگران دەکەوت لە سەر ئەوروپیەکان.

سوڵتانو دەسەڵاتی مەمالیك باجی زۆر قورسیان دەخستە سەر ئەو شتومەکانەی کە بە وڵاتی ئەواندا تێدەپەڕین. دەسەڵاتی مەمالیك سێیەکی ئەو کەلوپەلانەی بۆخۆی وەردەگرت کە بە سنوری ئەودا ڕەت دەبوو.وە

بەهەمان ئەو نرخە لێیانی دەکڕی، کە بازرگانان لە هیند کڕیبوویان، واتە هیچ حسابێك بۆ تێچونی ئەم کەلوپەلانە نەدەکرا کە بازرگانان خەرجیان کردبوو، بەهۆی بارکردنو داگرتن وتێچوونی ڕێگە. بازرگانان جگە لەم باجانەی کە لە سوێسو شارە میسریەکان لێیان دەسەنرا، بەهەر ولاتێکی تریشدا تێپەڕیبان هەمان باجو گومرگیان لێ دەسەنرا.

جگە لەهەموو ئەمانە، بازرگانان بەهۆی ئەوەی کە کەشتیەکانیان توانای بەرگەگرتنیان نەبوو لە بەرامبەر مەترسیەکانی دەریاو شەپۆلە توندەکانو هەروەها هێرشی چەتە دەریایەکان بۆسەریان، توشی باری سەختو نالەبار دەهاتن وتەنگوچەڵمەی زۆریان دەهاتەڕێ. ڕێگەی وشکانیش لە ڕێگەی دەریا باشتر نەبوو، بەهۆی ڕێگرو چەتەی سەر ڕێگەکان. لەلایەکی تریشەوە گەشتی بازرگانانی لەم ڕێگەیەدا کاتێکی زۆری دەویستو سەختو دژوار بوو، کە جاری واهەبوو چەند مانگو ساڵی پێدەچوو سەرەڕای هەموو ئەو چەرمەسەریانەی کە ڕووبەڕویاندەبوویەوە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بازرگانی فراوان بوو، چالاکی بازرگانی گەشانەوەی بەخۆیەوە بینیو شارەکانی ئیتالیاو ئەڵمانیاو هۆڵندا بەرەو شکۆفەی پەرەسەندن ڕۆیشتن.

کەلوپەلی هاوردە لە ڕێگەی ئەڵەپەوەدەگەیەنرانەشارەکانی ئەڵمانیاو هۆڵندا. لەوێشدا لەگەڵ کەلوپەلەکانی باکورو خۆرهەڵاتو ناوەڕاستی ئەورووپا ئاڵوگۆڕیان پێدەکرا. ئەم کەلوپەلانە بریتی بوون لە: کانزا، پۆشاکی خوری، پێستەو فەرو، دارو تەختە...هتد. شیاوی باسە ئەم شارانەی کە ئەم پرۆسەیەی تیادا تەواودەبوو، بریتی بوون لە: بەندەری دانزگر لەسەر دەریای

بەڵتیك، لوبیل، هامبرگ، بیرمن، برجس، ئەنتۆریب. هەروەها شاری بندقیەش لە ئیتالیا ناوەندی سەرەکی بووبۆهێنانی کەلوپەلی ئاسیاوی بۆ ئەوروپا.

پێش هاتنی سەدەی شازدە ناوەندە بازرگانیەکانی ئیتالیاو ئەڵمانیا بوونە شوێنکەوتەی کۆمەڵەی هنسیو نەیانتوانی بەرەنگاری فراونبوونی بازرگانیو خواستەکانی ببنەوە. ئیتالیا بوو بە گۆڕەپانی جەنگو کێشەو ناکۆکی نێوان شارە دەوڵەمەندەکان، کە لەگەڵ خۆیدا کارەساتی هێنایە سەرئەم شارانە.

بە هەمانشێوە کۆمەڵەی هنسی توشی لاوازیو شلۆقی هات. بەهۆی دووبەرەکیو جیاخوازی شارە ئەندامەکان لەگەڵ یەکترو نوشستی ئیمپراتۆری ڕۆمای پیرۆزو سەرهەڵدانی دەوڵەتی سلاڤی[1].

## دۆزینەوە جوگرافیەکان

### هۆکاری دۆزینەوە جوگرافیەکان:-

لە سەدەکانی کۆنو ناوەڕاست پەیوەندی ئەوروپاو ئەوپەڕی خۆرهەلات لاواز بوو یاخود هەر نەبوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوروپا پشتی بەستبووبە ئاسیاو جیهانی ئیسلامی. بەلام لەدوای جەنگی خاچیەوە ئەم پەیوەندیە لاوازە وردە وردە بەرەو بەهێزی ڕۆیشتو چالاکی بازرگانی بە جموجۆل بوو.بەهۆی ئەوەی کە ئەوروپا لەم کاتەوە پێویستی بە کەلوپەلی ئاسیاوی هەبوو کە لەناوخۆیدا وەچنگی نەدەکەوت. گرنگترینی ئەم پێداویستیانەش

---

1 Ibid: Also. Op.cit;g5-113; Gilmore, M.p.
The World of Humanism. 1453-1517 (New york,1962) pp.43-70

بریتی بوون لە: "کوتاڵی لۆکەو ئاوریشمو کەتانو گۆزەو گلێنەو زێڕو زیوو بەهاراتو بەردی بەنرخ وتەختەو، بیبەر" بەتایبەتی. شارە ئیتالیەکان بەتایبەت ڤینیسیا، هەستا بە دامەزراندنی ناوەندی بازرگانی لە میسرو سوریاو ئاسیای بچوک. لە پەیوەندی بازرگانی بەردەوامیش دابوو لەگەڵ بازرگانە موسڵمانەکان. ئەمان پێداویستیەکانی خۆیان دەکڕیو پاشان بە قازانجی زۆرەوە بۆ ئەوروپایان دەگواستەوە. بەلآم بە هاتنی تورکە عوسمانیەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەو باڵادەست بوونیان بەسەر وڵاتی بەلقانو خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست لە هەردوو سەدەی پازدەو شازدە لە لایەك، لەلایەکی تریشەوە باجی قورسی دەسەڵاتی مەمالیك لەسەر ئەو کەلوپەلانەی بەلایدا دەڕۆیشت،وای کرد ئەم ڕێگە بازرگانیە تەگەرەی تێکەوێت لە مەڕ ئەوروپیەکان. بەمەش نرخی کەلوپەلەکان بەشێوەیەك بەرزبوونەوەکە زۆرێك لە ئەوروپیەکان نەیاندەتوانی بەدەستی بخەن. ئیدی لێرەوە ئەوروپیەکان کەوتنە بیری دۆزینەوەی ڕێگەیەکی تازە، کە بەهۆیەوە بگەنە خۆرهەڵاتی دوور بەبێ ئەوەی بەناو وڵاتی عوسمانیدا تێپەڕن.[1]

سەرەڕای ئەوانەی باسمان کرد، هۆگەلی تریش هەبوون یاریدەدەر بوون لە چالاك بوونی دۆزینەوە جوگرافیەکاندا.وەك پێویستی ئەوروپیەکان بۆ کەلوپەلە ئاسیاویەکان. هەروەها ئارەزوی کلێسای کاسۆلیکی بۆ دەستگرتن بەسەر ناوچە دوورە دەستە بت پەرستەکان، کە وای کرد کلێسا دنەی ئەم

1 Hayes,Op.47-95

هەڵمەتــە بــداتو لەگەڵیــدا چــەندان قەشــەو ڕەهبــان بنێــرێ بــە مەبەســتی بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی لەم ناوچانە.

بەڕاسـتی زانیـارە جوگرافیـەکانیش هاوکـاری گـەورەی چـالاکی دۆزینـەوە جوگرافیەکانی کرد. ئەم زانیارانەی کە ئەوروپیەکان لەیۆنان وڕۆمانەوە بۆیان جێمابوو، وەئەوەشی کە لەموسڵمانانەوە دەستگیریان ببوو، لە پاڵ ئەزمونی دەریاوانانی خۆیان کـە لەئـەنجامی گەشـت وگـەڕان بـەناو دەریـاو زەریاکـانی دەوروبەری ئەوروپا بە دەستیان هێنابوو. جا هەموو ئەم زانیاری وئەزمونانـە بەرچاو ڕوونی زیاتری پێ بەخشین بۆ ئەنجامدانی ئەم چـالاکیە مەزنـە. جگـە لە هەموو ئەوانەی باسمان کرد، لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا پاپاکان چـەندین نمایندەی خۆیـان هـەناردەی خۆرهـەڵاتی دوور کردبـوو، کـە ئەمـەش دیـسان گرنگـی گـەورەی هـەبوو لـە کۆکردنـەوەی زانیـاری لەسـەر ئـەم ناوچـانە. لـە بەناوبانگترین ئەو زانیاریانەی کە لەم ڕێگەیەوە بە دەستهێنرا، ئەو زانیاریانـە بوون کە مارکوپۆلۆی ئیتالی هاوردەی ئەوروپای کـرد. نـاوبراو ماوەیـەکی زۆر لــە چــین مایــەوەو کــاتێکیش گەڕایــەوە (لــە کۆتــایی ســەدەی ســێزدە) دەوڵەمەنــدیو خۆشــنودی ئــەم ناوچــانەی باســکرد کـــە بینیبـــووی. ئەوروپیــەکانیش بـــە حـــەزێکی زۆرەوە نوســینەکەیان دەخوێنــدەوە. لـــە بەناوبانگترین خوێنەرانی کتابەکەی مارکوپۆلۆ،"کریستۆڤەر کولمبس"بوو.

هـەروەها ئـەو بیروباوەڕانـەی کـە لـە نـاو خـەڵکی داهـەبوو سـەبارەت بـە گەشتکردن لەناو دەریادا "لە سـەدەکانی ناوەڕاسـت" بریتـی بـوو لـە تـرسو بیمو دڵەڕاوکێ. خەلکی لەو بڕوایـە دابـوون کـە ئاوەکـانی ئیـستیوائی "هێڵـی

یەکسانی" لە پلەی کوڵان دایەو پڕی شەیاتینو خێوو دێوو درنجەو ئەم ناوچەیە شوێنی ژیانیانە. هەروەها پێیان وابوو زەوی لە شێوەی بانێکی پان دایەو تەختە. بەلام وەنەبێ ئەم بیرە پڕوپوچونە هەر بەم شێوە مابنەوەو هەر ئەمە بیروڕا بووبێتو خەڵکی هەرلەسەرئەمە چەسپاو بووبن. بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەم بیروڕایانە بەرەبەرە بەرەوئاوابوون چوون. ئەمەش سەرەتا لەناو چینی ڕۆشنبیران سەریهەڵدا، کە لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست چینی ڕۆشنبیران باوڕیان بەوە هێنا کە زەوی خڕەو هەرکەسێ لە خۆرهەڵاتەوە بڕوات لە خۆرئاوا دێتەوە، هیندیش دەکەوێتە کەنارەکانی خۆرئاوای زەریای ئەتلەسی، لەمەشەوە بڕوایان وابوو کە دەگونجێ لە خۆرئاواوە بگەیتە خۆرهەڵات. بەڵام فراوانی زەریای ئەتڵەسی پێویستی دەکرد کورتترین ڕێگە بدۆزنەوە، ئەمەش یا بەئاڕاستەی باکوری خۆرئاوای ئەورووپا، یاخود بەسوڕانەوە بەدەوری کیشوەری ئەفریقا.

بەمەبەستی گەیشتنیان بە چینو هینددەریاوانو کەشتیوانەکان لەسەدەی پازدە نەخشەو نەخشەسازی ڕوونیان خستەکارو هەستان بە چاککردنو بەکارهێنانی قیبلەنماو توانیشیان بەهۆی ئوستوڕلابەوە هێڵەکانی پانیو درێژی دابنێن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا گەشتکردن بۆ ناو زەریایەکی پانو پۆڕی وەك زەریای ئەتڵەسی، پێویستی بە ئازاییو بوێریەکی بێ وێنە بوو کە بە کەشتیەکی قایمو پتەو سازبکرێ.

بەم شێوەیە دەبینین کە هۆکارەکانی ئابووریو ئاینیو زانیارە جوگرافیەکان کە لەلای ئەورووپیەکان هەبوو، یاریدەدەربوون بۆ هەستان بە

دۆزینەوە جوگرافیەکان. شایەنی باسە ئەم دۆزینەوە جوگرافیانە لەلایەن حکومەتە نەتەوەییەکانەوە بایەخیان پێ دەدراو هاندەدران. بەهەمانشێوە کڵێسای کاسۆلیکی بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی ئەم کایەی گەرم دەکرد.

ئەوەی ماوەتەوە بڵێین: ئەوەیە کە دەریاوانە ئیتالیەکان هەستان بەم کارە سەرکێشیانە (دۆزینەوە جوگرافیەکان)،وەلێ وڵاتانی خۆرئاوای ئەورووپا ئەرکی دۆزینەوە جوگرافیەکانیان گرتە ئەستۆو بەماڵو سامان پشتگیریان کرد.

## دۆزینەوەکانی پرتوگال:

پرتوگالیەکان یەکەم خەڵکانێ بوون کە دۆزینەوەی جوگرافیان خستە ئەستۆ. پرتوگالیەکان دەستیان بە هونەری دەریاوانی گەیشتو فێری دروستکردنی کەشتی بەهێزو گەورە بوون، کە بەهۆیەوە لە دەریاکانی جەنەوە هاتو چۆیان دەکرد. دەتوانین بڵێین: خەڵکی جەنەوا یەکەم خەڵکێ بوون کە هەوڵیاندا بسوڕێنەوە بەدەوری کەناری ئەفریقیادا.

بەمەبەستی گەڕان بەدوای ڕێگەیەکی تازەی دەریایی بۆ گەیشتن بە هیند، لە مانگی مایسی ساڵی 1291 "گلینودی ڤیڤاڵدو" بە دوو کەشتی گەورەوە گەشتی دەریای دەست پێکرد، بەڵام بەخت یاوەری نەکردو کەشتیەکانی لە کەناری ئەفریقیادا تێکشکاو سەرجەم سەرنشینانی بوون بە خۆراکی ماسی. لەدوای ئەوە هیچ کەسێ زاتی نەکرد کارێکی لەم شێوە سەرکێشیە ئەنجام بدات تا سەدەی پازدە.

هنــری دەریــاوان(1394 -1460)ی کــوڕی پادشــای پرتوگــال(جــۆری یەکەم) بـە مەبەسـتی فێرکردنـی کەشـتیوانان، یەکـەم کـەس بـوو بـیری لـە دامەزرانـدنی قوتابخانەیـەکی دەریـاوانی لـە لیـشبۆنە کـردەوە. بـۆ دنـەدانی ئەمەش هنری بەشداری کرد لەو هەڵمەتە دەرياييەی کە باوکی ئامادەی کـرد بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر بەندەری سەبتەی سەر گەرووی (جبل گـاریق). پاشان خۆی بوو بەسەرداری ئەم شوێنە لە ساڵی 1415ز. هەروەها لەسـاڵی 1436ز هەوڵیـدا زاڵبێـت بەسـەر تەنجـەد، بـەڵام کارەکـەی سـەری نـەگرتو شکستی خوارد. هنری بەخەونی ئەوەوە بوو دەستبگرێ بەسـەر کـەنارەکانی مراکیش (مەغریبی عربی) لەسەر زەریای ئەتڵەسی. چونکە دەوڵەمەندی ئـەم ناوچەیەی بیست بوو، هەر ئەمەش وایکرد زۆر سور بێـت لەسـەر دەسـتگرتن بەسـەریدا. لەڕاسـتیدا هنـری دەریـاوان نـەبوو، بـەڵکو ئـەو دەیویـست لـەم ڕێگەیــەوە زانیــاری کردەیــی جــوگرافی دەســتبکەوێ، بەتایبــەت دوای ئـەوەی(دون پـدرو)ی مـارکۆپۆلی کـڕی. هنـری لـە پـشت ئەمـەوە دەیویـست ئابووری پرتوگال گەشەپێبداتو ئـاینی مەسـیحی بڵاوبکاتـەوە. هـەر ئەمـەش بوو وای لێکرد قوتابخانەیەکی دەریایی بکاتەوە لە پرتوگالو بەهرەمەنـدترین دەریاوانـانی ئیتـاڵیو بـەناوبانگترین جـوگرافی ناسـانی ئـەم سـەردەمەی بـۆ کەمەندەکێش بکات. هنری زۆر تێکۆشا بۆ چاککردنی کەشتیو سازکردنی بە شێوەیەکی چاك، وە توانی کەشتیەك بخاتـەناو دەریـا کـە توانـای هـەڵگرتنی 80-100 تەنی هەبوو.

پرتوگالیـەکان دوای ئـەوەی دوورگـەی (مـایراو ئـازرووس)یـان دۆزیـەوە، داگیریان کردو کشتوکاڵی قامیشی شەکرو مێویان بۆ بـرد. هـەروەها لەسـاڵی 1446ز گەیشتنە ڕێژگەی ڕووباری سەنیگالو دواتر توانیان بگەن بە سـەری سـەوزو وڵاتـی غانـا. بازرگانـان ئەمـەیان بـە هـەلو دەرفـەت زانـی بـۆ خـۆ دەوڵەمەند کردن. ئەوەبوو دەستیان کرد بە ڕاوکردنی خـەڵکی ڕەسـەنی ئـەم ناوچـانەو بـە کۆیلـەکردنیان.ئـەمان ئـەم خەڵکانـەیان دەگواسـتەوە بـۆ بازاڕەکانیـانو لەوێدا وەك کۆیلـە دەیانفرۆشـتن. پرتوگالیـەکان بـەهۆی ئـەم بازرگانیـە کـە مـووی سـەری مرۆڤـی خـاوەن ویـژدانی لەگـەڵ گـرژ دەبێـت، قازانجێکی خەیاڵیان دەستکەوت.

پرتوگالیەکان چەندین قەڵایان لە ناوچـە کەناریـە جیاجیاکـان دروسـتکردو وەك ناوەنـدێکی جـەنگیو بازرگـانی بەکایانـدەهێنا. بـە تێپـەڕینی ڕۆژگـار هۆکاری ئاینیو ئابووری تێکهەڵکێش بـوونو وای کـرد پرتوگالیـەکان بکەونـە گەرمـەی دۆزینـەوەی ڕێگـەی ئـاوی، ئەمـەش بەمەبەسـتی گەیـشتن بـە هینـد(سـوڕانەوە بـە دەوری ئـەفریقیا). دەریاوانـە پرتوگالیـەکان لەسـاڵی 1471ز هێڵـی یەکسانیان بـڕیو لـە سـاڵی 1473ز گەیـشتن بـە ڕێژگـەی ڕووباری کۆنغۆ.

دیــــاز:-

"پرسـلیمۆدیاز" لـە سـاڵی 1488ز تـوانی بگاتـە کۆتـایی باشـووری کیشوەری ئەفریقیا. ئەمەش بە ڕۆیشتنی بـە لاکـانی کـەناری خۆرئـاوای ئـەم کیشوەرەدا. دواتر ناوی لێنا سەری گێژەڵوکە. "دیاز" کـاتێ لـە گەشـتەکەی

بەردەوام بوو، بینی کەناری ئەفریقی بەرەو لای چەپ دەڕوات، لەمەشەوە زانی کە کەنارەکە ڕووەو باکور پێچ دەخواتەوە. بەڵامبەهۆی ڕازی نەبوون و هەڵگەڕانەوەی هاوڕێکانی ناچاربوو بگەڕێتەوە. سا کاتێکیش گەیشتەوە لیشیۆنە ڕاپۆرتێکی سەبارەت بە دۆزینەوەکانی پێشکەشی جۆنی دووەمی کرد. ئەم ناوەی کۆتایی باشوری ئەفریقا گۆڕانی بەسەردا هات و بوو بە لوتکەی ئاوات.

**ڤاسکۆ دیگاما:-**

دوای ئەوەی پرتوگالیەکان ماوەیەك لەم پرۆسەیە ساردیان نواند، دەستیان کردەوە بە کاری گەڕان و دۆزینەوە. پادشای پرتوگال ئیمانۆئێلی دووەم لەساڵی 1497 بە ڕابەریەتی ڤاسکۆ دیگاما هەستا بەناردنی سەدوپەنجا دەریاوان. ئەمانە بە چوار کەشتی بەڕێخران و ئیمانۆئێل خۆی لە بەندەرەوە بەڕێکردن. دیگاما هەمان ئەو ڕێگەیەی گرتەبەر کە "دیاز" دەساڵپێشتر گرتبوویەبەر.

دیگاما لە مانگی تەموزی ساڵی 1497 کەشتی دەستپێکردو لە مانگی ئازاری ساڵی 1498ز، توانی بگاتە کەناری خۆرهەڵاتی کیشوەری ئەفریقا لە نزیك مۆزەنبیق و زنجبارو دورگەی مالیندی لە زەریای هیندی کە ئێستا سەر بە وڵاتی کینیایە. دیگاما بە ڕێنمونی ئەحمەدی کوڕی ماجد لە مایسی 1498گەیشتە "کلیکۆت" و سێ مانگ لە شاری "کلیکۆت"دا-مایەوە. ناوبراو لە مانگی ئابی هەمان ساڵدا لە ڕێگەی مالیندیەوە گەشتی گەڕانەوەی دەستپێکردو لە مانگی ئەیلولی ساڵی 1499ز گەیشتەوە زێدی خۆی. دیگاما

بە بڕی شەست ئەوەندەی تێچونی گەشتەکەی کەلوپەل‌و دیاری هێنایەوە. ئەم لە ڕێگەی سوڕانەوە بە دەوری کیشوەری ئەفریقادا توانی بگاتە هیند.

پرتوگالیەکان ناوەندیکی بازرگانیان لە هیند بە تایبەت لە شاری گوام دامەزراندو حاکمێکی گشتیان وەك سەرپەرشتیاری کاروباری بازرگانی‌و پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان دامەزراند. بەهەمانشێوە ناوەندێکی بازرگانیان لە سەیلان‌و سومەتراو جاواو دورگەی بەهار(ئەندەنوسیا)جێگیرکرد. پرتوگالیەکان لە ساڵی 1517 گەیشتنە بەندەری کانتۆن لە چین‌و لە ساڵی 1524 چونە ژاپۆن. شایەنی باسەپرۆسەی دۆزینەوەی جوگرافیەکان بەمەبەستی بلاْوکردنەوەی ئاینی مەسیحی، لەگەڵ خۆی چەندەها نێردراوی مژدەدەری مەسیحی دەبرد بۆ ئەو ناوچانەی کە بت پەرست بوون. ئەمە بەشێوەیەك کاریگەری هەبووکە لە پێش کۆتایی هاتنی سەدەی شازدە دووسەد هەزار ژاپۆنی بوون بە مەسیحی، تەنانەت لە ولاْتی هیند ئەم ڕێژەیە زۆر زیاتر بوو. لەگەڵ ئەوەی زاڵ بوونی بازرگانی پرتوگالی کاتی بوو بەلاْم دەرگەی ڕۆژگارێکی نوێی والاْکرد بۆ داگیرکاری ئەوروپی لە ئاسیا.

### دۆزینەوەی ئیسپانیەکان:-

ناوناوبانگی ئیسپانیا لە دۆزینەوە جوگرافیاکاندا، کەمتر نەبوو لەهی پرتوگال. چونکە ئەگەر پرتوگالیەکان ڕێگەیەکی تازەیان دۆزیبێتەوە بۆ گەیشتن بە هیند لەڕێگەی سوڕانەوەیان بە دەوری ئەفریقیا، ئەوا ئیسپانیەکانیش هەولّیاندا ڕێگەیەك بدۆزنەوە بۆ گەیشتن بە چین‌و هیند بە

ئاڕاستەی خۆرئاوا. کریستۆڤەر کۆلۆمبسیش یەکەم کەس بوو ئەو ناوبانگەی بە ئیسپانیەکان بەخشی.

کریستۆڤەر کۆلۆمبس 1446–1506:-

کۆلۆمبس خەڵکی شاری جنەوای ئیتالیا بوو، سەرقاڵ بوو بە کەشتیوانیو بە هۆیەوە زانیاریەکی زۆری بە دەستهێنا لە بارەی جوگرافیا. کۆڵمبس وەك تەواوی ڕۆشنبیران ئەوسا باوەڕی بە خڕیەتی زەوی هەبوو، باوەڕی وابوو هەرکەسێ لە خۆرئاواوە بڕوات لە خۆر هەڵاتەوە دەگەڕێتەوەو ئاسیا کەوتوەتە خۆرئاوای ئەوروپا. ئەم فکرەیەش ئەوەی خستە کلێشەی سەری کە بە دەریاکانی خۆرئاواداڕێگەیەکی نوێ بدۆزێتەوە بۆ گەیشتن بە چینو هیند. کۆلۆمبس پاش بەدەستهێنانی شارەزاییەکی کردەیی لە کەشتیوانیو دەریاوانیدا لە دەریای ناوەڕاستو دەوروبەری دورگەی بەریتانیا، چووە خزمەتی شا (جۆنی دووەمی پاشای پرتوگالو داوای لێکرد هاوکاری بکات لە جێبەجێ کردنی ئەو پرۆژەیەی کە لە هزریدا چەکەرەی کردوە، بەوەی تێبپەڕێ بەناو زەریای ئەتڵەسی. وەلێ پاشا بەهۆی گرنگی دانی بە ڕێگایەکی نوێ بە دەوری قاڕەی ئەفریقیا، ئەمەی بە دڵ نەبوو وڵامێکی دڵخۆشکاری نەدایەوە. ئەمەش وای کرد کۆلۆمبس ڕووی وەرچەرخی بەرەو لای فردینانەو ئیزابێلا. پاش کۆششو هاتوچۆیەکی زۆر بۆلای هەردوو پاشا، بێ ئومێد بوو لێیان. هەوڵدانی کۆلۆمبس بۆ گەیشتن بۆ لای پاشای فەرەنسا یا ئینگلترا، ئیزابێلای والێکرد ئامادەکاری گەشتەکەی بۆ سازبکات. ئەوەبوو لە 3\ئابی\ 1492، کۆلۆمبس لەبەندەری "سنتپلوز"ەوە لەگەڵ سێ کەشتیو

"هەشتاوحەوت" دەریاوان بە ئومێدی هێنانەدی خەونەکەی ڕێگەی بێ ئامان‌و پان‌و پۆڕی زەریای ئەتلەسی گرتە بەر. کۆلۆمبس لەگەڵ خۆی نامەیەکی شاژنی پێبوو بۆ خانی گەورەی چین. پاش تێپەڕینی چەند هەفتەیەك‌و نەگەیشتنیان بە ئامانج، کەشتیوانە هاوڕێکانی لێی هەڵگەڕانەوە، بەڵام کۆلۆمبس ڕێنمونی کردن. هەرچۆنێك بێت، لە 12/تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ توانیان بگەن بە دورگەی سان سلڤادۆر. پاشان لە کوباو هایتی دابەزین. دوای ئەوە چەند مانگێك لە دورگەی کاریبی هاتوچۆی دەکرد، ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەم ناوچانە موڵکی ئیسپانیان. دوای ئەمە لە مانگی ئازاری ساڵی 1493 بەرەو وڵاتی خۆیان ڕێگەیان گرتە بەرو لەگەڵ خۆیاندا بارێك لە دارو تەختەو زێڕو ژمارەیەك لە هیندیە سورەکانیان ڕاپێچ دان. لە ئیسپانیاش جەماوەر بە گەرمیەوە پێشوازیان لێکردن‌و شاژنی ئیسپانی نازناوی ئەدمیڕاڵی وەك پاداشت بە کۆلۆمبس بەخشی.

کۆلۆمبس پاش ئەنجامدانی گەشتەکەی، هەستا بە ئەنجامدانی سێ گەشتی تر، کە بەهۆیانەوە توانی دورگەکانی دەریای کاریبی‌و کەنارەکانی ئەمریکای ناوەڕاستی نزیك پەنەما بدۆزێتەوە. لە گەشتی دواهەمیندا کۆلۆمبس بە هۆی باسکرانی بە خراپەو لێداوان لەبارەیەوە بە لێدوانێکی پڕ لە ئێرەیی"هەڵبەسترانی بوختان بۆی"، بە کۆتکراوی بە زنجیری ئاسن گەڕایەوە ئیسپانیا، بەڵام کاپتنی کەشتیەکە کەسێکی بەڕێزبوو نیگەرانی ئەو پیاوە مەزنە بوو، کاتێك بەو شێوەیە مامەڵەی ڕەقی لەگەڵدا دەکرا. هەربۆیە فرمانیدا زنجیر لە دەست‌و قاچی کۆلۆمبس بکرێتەوە، وەلێ کۆلۆمبس ئەمەی

ڕەت کردەوە. کاتێکیش گەڕانەوە بۆ ئیسپانیا شاژن ئیزابێلا فرمانی لێخۆشبوونی بۆ دەرکرد. بەڵام ئەم ڕوداوە لە مێشکیدا تا کۆتایی تەمەنی مایەوە، هەر ئەمەش وای کرد کە ئەم زنجیرەی پێی کۆتو بەند کرابوو لەلای خۆی بیپارێزێ. دوای ئەوەش ئیزابێلا مرد لە ساڵی 1504، شان وشەوکەتی کۆلۆمبس فەرامۆشکرا، بەمەش کۆلۆمبس توشی خەمۆکی بوو لەناو دەرونی خۆیدا پەنگی دەخواردەوەو دابڕاوو گۆشەگیر بوو بەهۆی داخو حەسرەت هەڵکێشانیبۆ ئەو چارەنوسەی بەرۆکی گرتبوو. پاش ئەم ئازارە زۆرە لەساڵی 1506 کۆچی دوایی کرد. بەڵام پێش ئەوەی بمرێ زنجیری پێ کۆت کراوی لەبیر نەکرد، بەڵکو ڕای سپارد لەگەڵ خۆیدا بیخەنە ناو گۆڕ.

کۆلۆمبس مرد، بەبێ ئەوەی بزانێ کیشوەرێکی تازەی دۆزیوەتەوە. ئەم ناوچەیە ناونرا هیندی خۆرئاوا، بەو بڕوایەی ئەم دورگەی دۆزراوەتەوە نزیك بە کەنارەکانی هیندە. ئەمەش وای کرد دانیشتوانە ڕەسەنەکەی بە هیند بناسرێنو دواتر ناوی هیندە سورەکانیان بەسەردابڕا.

واگومان دەبرێ خەڵکانێ هەبن لەپێش کۆلۆمبس لە زەریای ئەتلەسیەوە تێپەڕی بن. بەڵام نەگەڕاونەوە تاوەکو بە خەڵکی بڵێن کیشوەرێکی تر هەیە. ئەوان لە ئەمریکادا ونبوونو هیچ شوێن پەنجەیان بەجێ نەهێشت، بەڵام کۆلۆمبس خاوەنی گەورییو مەزنیە چونکە کیشوەرێکی تازەی دۆزیەوە.

جۆن کابوت:ـ

کەشتیوانی ئیتالی جۆن کابوت خەڵکی جەنەوا بوو. بە فرمانی هنری حەوتەمی پاشای ئینگلترا، هەستا بە سازکردنی گەشتێکی دەریایی. لەم گەشتەدا کابوت توانی کەنارەکانی نیوفاوندلاند لە خۆرهەڵاتی کەنەدا لە ساڵی 1497ز بدۆزێتەوە.

گابراڵ:-

لەساڵی 1500ز، کاتێك پیدروگابراڵ بەمەبەستی گەیشتن بە هیند ڕابەرایەتی کەشتیگەلێکی دەکردو بە کەنارەکانی ئەفریقیاو لوتکەی ئاوات ڕێگەی دەریای تەی دەکرد،گەردەلولو تەوژمی شەپۆلی دەریایی توشیان هاتو بە هۆیەوە کەشتیەکانی بەرەو لای کەنارەکانی ئەمریکای باشور ڕامالدران. کە هەرئەمش وایکرد بەشێکی گەورە لەم کیشوەرە بدۆزرێتەوە، دواتر ناوی لێنرا بەڕازیلو بوو بە موڵکی پرتوگال.

ئەمریکۆ:-

ئەوەی کۆڵمبس دۆزیەوەو ناوی لێینا ئاسیا، هەر بەم شێوەیە نەمایەوە، بەڵکو پاش ماوەیەك بۆ خەڵکی دەرکەوت ئەم شوێنە تازانە هیچی ئاسیا نین، بەڵکوو کیشوەرێکی تازەی زەویە. لەساڵی 1503 یەکێ لە سەرکێشەکانی فلۆرەنساو دانیشتووی ئیسپانیا (وەك نوێنەری بنەماڵەی میدیتچی لەئیسپانیا کاری دەکرد)، نامەیەکی نوسیو ئەمەی ڕوون کردەوە کە ئەم جێگایەی کۆڵمبس پێی زانیوە کیشوەرێکی تازەیە. پاش ئەمە یەکێ لەجوگرافی ناسە ئەڵمانیەکان لەساڵی 1507 ناوی لێینا ئەمریکا، بەهۆی ئەوەی ئەمریکۆ یەکەم کەسێ بوو هەستی بەم ڕاستیەکردوو زانی ئەم شوێنە کیشوەرێکی تازەیە.

بالبۆ:-

لەساڵی1513، یەکێ لە دۆزەرەوانی ئیسپانیا لەئەمریکا بەناوی (بالبۆ)، گوێبیستی ئەوەبوو کە دەریایەکی مەزنو بەرفراوان دەکەوێتە خۆرئاوای کیشوەری نوێ. لەبەرئەوە بالبۆ لەپەنەماوە بە ئاراستەی خۆرئاوا ڕێگەی گرتەبەر. پاش ماوەیەك گەیشتە دەریای ئارامو ئەو زەریایەی دۆزیبوویەوە ناوی لێینا زەریای باشور.

ماجـــەلان :ـ

یـەکێ لەدەریاوانـە پرتوگالیـەکان بـەناوی "فردیناندماجـەلان" کـە لـە خزمـەتی پاشـای ئیـسپانیادابوو، لـە سـاڵی 1519 بەمەبەسـتی دۆزینـەوەی ڕێگەی خۆرئاوا لە ئەمریکاوە بۆ ئاسیاگەشتێکی دەریایی سـازکرد. ماجـەلان بەپێنج کەشـتی لەئیـشبیلیەوە بەڕێکـەوتو لـە زەریـای ئەتڵەسـی پەڕیـەوەو بەدەوری ئەمریکای باشوردا سوڕایەوەو بـە تەنگەبـەری ماجەلانـدا تێپـەڕی. ماجەلان توانی بە نەوەت وهەشـت ڕۆژ زەریـای ئـارام ببڕێو بگاتـە دورگـەی گوام، پاش ئەمە گەیشتە دورگەی فلیپین. ماجەلان بە هۆی بەشداری کردنـی لـە جـەنگێکی نێوخـۆی ئـەم ناوچـەیە کـوژرا. شـیاوی باسـە تـەنها یـەکێ لەکەشـتیەکان تـوانی لەسـاڵی 1522 بگاتـەوە ئیـشبیلیەو بـسوڕێتەوە بەدەوری ئەفریقادا.

لە ڕاستیدا گەشتەکەی"ماجـەلان" یەکـەم هـەوڵێك بـوو بـۆ سـوڕانەوە بـە دەوری گۆی زەوی. بەم هەوڵە ڕێگەیەکی نـوێ دۆزرایـەوە کـە لـە خۆرئـاواوە دەڕۆیشتو دەگەیشتەوە ئاسیا. بەمە خەونی دێرینـی ئەوروپیـەکان هاتـەدی لە گەیشتنیان بە ئاسیا لە ڕێگەی خۆرئاواوە.

کاتێك پرتوگالیـەکان ناوەنـدە بازرگانیـەکانیان لـە کـەنارەکانی ئـەفریقاو هیندو چینو دورگەی بەهار بەکاردەهێنا لـەماوەی نیـوەی یەکـەمی سـەدەی شـازدەدا، ئیـسپانیەکانیش بـەردەوام بـوون لـە دۆزینـەوەکانیانو توانیـان دورگــەی کــاریبیو فلۆریــداو مەکــسیكو ئــەمریکای ناوەڕاســتو بەشــێکی گەورەش لە ئەمریکای باشور بدۆزنەوە. فەرەنساش لـەم پرۆسـەیە بـێ ئاگـا نـەبوو، بـەڵکو فرانـسوای یەکـەمی پاشـای فەرەنـساش هەسـتا بـە نـاردنی

دەریاوانی ئیتالی "جۆن ڤارازانو" بەمەبەستی کاری گەڕان و سوڕان بەناو دەریاکاندا. فرازانو توانی کەنارەکانی نوڤاسکوشیاو نیوئاینگلاند لە کەناری خۆرهەلاتی ئەمریکای باکور بدۆزێتەوە. بە دە سال دوای ئەمە فرانسوای یەکەم بەمەبەستی دۆزینەوەی ڕێگەی باکوری خۆرئاوا بۆ بۆ ئاسیا، دەریاوانێکی تری بەناوی "جاك كارتر" نارد. بەلام کارتر ئەم ڕێگەیەی نەدۆزیەوە، بەلکو دۆلی ڕوباری"سنت لۆرنس" تاوەکو شاری مۆنتریالی کەنەدایی دۆزیەوە. بەم شێوەیە بە تێپەڕینی نیوەی سەدەی شازدە، ئەوروپیەکان زانیاریەکی زۆریان سەبارەت بە جیهان و شوێنی زەریاکان و کیشوەرە سەرەکیەکان بەدەستهێنا. بەم دۆزینەوانە دوو ڕێگەی بازرگانی پەیدا بوون، یەکەمیان بە دەوری کیشوەری ئەفریقیا بۆ ئاسیا، دووەمیان ڕێگەی خۆرئاوا بۆ ئەمریکا.

سەرەتای بەکارهێنان و قۆستنەوەی بازرگانی خۆرهەلات لەلایەن ئەوروپیەکان دەستپێکردو کیشوەری ئەمریکا بوو بە داگیرگەی ئەوروپیەکان و سەرەتای دامەزراندنی ئیمپراتۆرە داگیرکاریەکان دەستی پێکرد.

## ئیمپراتۆرە داگیرکارەکان

ئیسپانیاو پرتوگال ئەم دوو دەولەتە بوون سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لە فراوانکردن و فراوانخوازی ئەوروپیەکان، ئەمەش لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدەو نیوەی یەکەمی سەدەی شازدە. پاپا لە سالی 1480 قورغکردنی بازرگانی خۆرهەلات و زالبوون بەسەر ولاتی کافرانی بەخشی بە پرتوگال. واتا لە کەناری خۆرئاوای ئەفریقا تاوەکو دورگەی هیندی خۆر هەلات.

بەهۆی کێبڕکێی داگیرکاری نێوان ئیسپانیاو پرتوگال خەریك بوو جەنگ لە نێوانیان هەڵبگیرسێ. بەڵام پاپا ئەسکەندەری شەشەم بەسەرباروودۆخەکەدا ڕاگەیشتو مافی بازرگانی وداگیرکاری لەهێڵی خەیاڵی جەمسەری باکور کە درێژ دەبێتەوە تاکو جەمسەری باشور بە ئیسپانیا بە خشی، کە لە خۆرئاوای دورگەی ئازۆرس لەزەریای ئەتلەسی 100 فەرسەخ دووره ( ئەم هێڵە بە 100 فەرەسخ دووره لە خۆرئاوای دورگەی ئازرۆس). بەم شێوەیە ئاسیاو ئەمریکا لەنێوان ئیسپانیاو پرتوگال دابەشکرا. بەمەش بەرازیل کەوتە ژێر دەستی پرتوگال لەکاتێکدا ناوچەی دەسەلاتی ئیسپانیا بوو، لەم لاشەوە فلیپین کەتە ژێردەسەلاتی ئیسپانیا لە کاتێکدا ناوچەی دەسەلاتی پرتوگال بوو.

## ئیمپراتۆریەتی بازرگانی پرتوگال:-

ئیمپراتۆریەتی پرتوگال لەخۆر هەلات ئیمپراتۆریەتێکی بازرگانی بوو. پاشای پرتوگال لە ساڵی1505ز (مادیا)ی هەڵبژارد وەك حاکمی گشتی بەسەر داگیرگەکانیدا. مادیا توانی زاڵبێ بەسەر هەندێ لە میره هیندیەکان لە هەرێمەکانی باشوری هیند. هەروەها لە ساڵی 1509 توانی سەرکەوێ بەسەر کەشتیگەلی میسری‌و هیندی. پادشای پرتوگالی لەساڵی 1510 لەجێگەی "مادیا"، "فونزوبوکرك"ی وەك حاکمی گشتی بەسەر ناوچە داگیرگراوەکاندا دەستنیشان کرد.حاکمی تازە توانی ناکۆکی نێوان هیندەکان بقۆزێتەوەو دەستبگرێ بەسەر شاری گوادا.کە دواتر قایمی کردو کردی بە پایتەختی ئیمپراتۆریەکەی. پاشان هەندێ شاری سەرکەناری لە هیند

داگیرکردو توانی دەستی بەسەر دورگەی هورمز دابگریّ، ئەم دورگەیە شوێنێکی قایمو دەروازەی(مدخل) کەنداوی عەرەبی بوو. لەسەردەمی ئەم حاکمەو جێگرەوەکانیشیدا حکومەتی پرتوگال توانی بالادەستی بنوێنیّ بەسەر کەنارەکانی خۆرئاوای هیند "کەناری مالا بار". بوکرك هانی هاوسەرگیری دەدا لەنێوان پرتوگالیەکانو خەڵکی ناوچە دگیرکراوەکانو ناچاری دەکردن بە زمانی پرتوگالی بدوێن، هەروەك هەوڵی بلاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی دەدا لەنێو خەڵکی ئەم ناوچانە. بەمانە دەرگەی بازرگانی بۆ پرتوگالیەکان لە هیندو چینو یابانو ملایو کەوتە سەر گازی پشت. پرتوگالیەکان نەیانتوانی کاریگەری دروستبکەن لەسەر شارستانیەتی ئاسیا، هەروەك چۆن نەیانتوانی قاچەکانیان بچەسپێنن لە ئاسیا، ئەمەش بەهۆی بەرفراوانی ئەم کیشوەرە. لەلایەکی تریشەوە ئەم کیشوەرە خاوەنی شارستانیەتێکی قولو دانیشتوانێکی زۆربوو، کە ئەمە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی پرتوگالیەکان نەتواننبە داهاتە سنوردارەکەیان ئەم شارستانیە بشکێنن. هاوکات لە جیهانی ئیسلامیشدا مسوڵمانان لە دژی پرتوگال دەستیان کردە بەربەرەکانی کردنیان. جگە لەمە پرتوگالیەکان نەیاتوانی دەسەلاتیان بنوێنن بەسەر چینو یابانو دورگەی هیندی خۆرهەلات، لەبەرئەوە تەنها بە ئەنجامدانی بازرگانی لە ناوەندە بازرگانیەکانیان ئۆقرەیان گرت. پرتوگالیەکان چەند ناوەندو وێستگەیەکی بازرگانیان لەسەر کەنارەکانی ئەفریقیادا دامەزراند. وەك: مۆزەمبیق لەساڵی 1520ز، ساوپاولو لە ساڵی 1576. هەروەها چاودێری خۆیان بەسەر حەبەشەدا

سەپاند. ئەم ناوەندە کەناریانە گوزارشتی دەکرد لە وێستگەی گەشەپێدانو ناوەندی بازرگانی نێوان ئاسیاو ئەوروپا. وە بۆ ئەم بازرگانیە زێڕو عاجیان بەکاردەهێناو بازرگانی کۆیلەیان دەرکرد. بەلاّم پرتوگالیەکان نەچوونە ناو کیشوەری ئەفریقاو مولّكو مالّیان دای لە کەمی. لەسالّی 1666 لەحەبەشە دەرکران. وەلیّ گواو مۆزەنبیقو ئەنگۆلا تاماوەیەکی درێژ وەك داگیرگەی پرتوگالی مانەوە. لەناوەراستی سەدەی بیستەم گواو مۆزەبیقو ئەنگۆلا توانیان سەربەخۆیی بەدەستبێن "گوا لە سەرەتاکانی شەستەکان چوو پالّ هیند، لەناوەڕاستی حەفتاکانیش مۆزەبیقو ئەنگۆلا سەربەخۆبوون" . بەلاّم بەرازیل لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدە سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێنا. بەڕازیل تاکە داگیرگەیە کە خەلّکە سەرەتاکەی پرتوگالینو زمانی ئەمڕۆیان پرتوگالیە. پرتوگالیەکان چەند شارێکی گەورەیان بنیاتنا وەك:"باهیا، ساوپاولو، ریودی، جانیرۆ". ئەمەیان لە سالّی 1558 دروستکراو بوو بە پایتەختی بەڕازیل لە سالّی 1567.

پرتوگالیەکان توانیان قازانجێکی زۆر دروێنە بکەن لە ڕێگەی بازرگانیو لیشبۆنەش ماوەیەك بوو بە ناوەندی بازرگانی ئەوروپا. بەلاّم ئەوروپیەکان بە چاوی ئێرییەوە سەیری داهاتی پرتوگالیان دەکردو دانیان نەهێنا بە بڕیاری پاپا سەبارەت بە قۆرغکردنی بازرگانی داگیرگەکان لەلایەن ئیسپانیاو پرتوگال. هۆلّندا دەستی کرد بە ناردنی کەشتیگەلی بۆ سەر کەشتیگەلی بازرگانی پرتوگال. ئەوەبوو کەشتیگەلی بازرگانی و جەنگی لیّ شکاندنو کۆلّەگەی سیاسەتی پرتوگالی لە داگیرگەکاندا هەلّتەکاند. کاتێکیش لە

سەرەتاکانی سەدەی حەڤدە کێبڕکێی ئەوروپیەکان بەهێزو سەخت بوو، پرتوگال قۆرغکاریە بازرگانیەکەی لە دەستداو نەیتوانی ڕوبەڕوی دوژمنکاری ئاسیاو بەربەرکانی ئەوروپا بوەستیّ. بەمەش ئیمپراتۆریەکەی تێکشکاو پایەکانی دارما.

## ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا:-

کاتیّ کۆلۆمبس ئەمریکای دۆزیەوە ئەم کیشوەرە بیّدانیشتوان نەبوو، بەڵکو خاوەنی خۆی هەبوو، کە بریتی بوو لە هیندە سورەکان ئەمانە لە سەرەتاکانی شارستانیەتی دابوون. پێشوازی هیندەسورەکان لە ئەوروپیەکان جیاواز بوو، بەشیّ بە باشی پێشوازی کران، چونکە ئەوان بەجوانی کردەوەیان دەنواندو حیکمەتیان دەخستەکار، بەمەش ئیسپانیەکان لەگەڵ ئەوان تێکەڵبوون، بەلاّم بەشێکی تریان دژی کۆچکردووەکان وەستانو لەگەڵیان هاوبەشیان نەنواند، بەڵکو چەندین جەنگ لە نێوانیان هەڵگیرسا کە لەو پەڕی خەستیو خۆڵی دابوو.

کۆرتیز مەکسیك دەکاتەوە:

ئیسپانیا زاڵ بوو بەسەر هیندی خۆرئاوا، دوای ئەوەی کۆلۆمبس ئەمریکای بینیەوە. دورگەی سانت دومینگو، یەکەمین دورگەیەك بوو، کە ئیسپانیا کردی بە داگیرگەی خۆی. لەوێشەوە بالاّدەستبوو بەسەر هەموو دورگەکانی دەریای کاریبی. لە ساڵی 1519 "هێرناندکورتیز" سەرکێشی ئیسپانی، توانی لە کەناری مەکسیك دابەزیّ، کورتیز پێش ئەوەی لەویّ بگیرسێتەوە، لە خزمەتی حاکمی ئیسپانیا بوو لە کوبا.

ئیمپراتۆری ئەزتیك كە لە مەكسیك بوو، بەهۆی ناكۆكیو ناتەبایی ناوخۆ ڕووەو هەڵوەشانو لێكترازان دەچوو.كۆرتیز لەكاتی چوونی بۆ ئەم ناوچەیە دە كەشتیو هەژدە ئەسپو ژمارەیەك كەشتیو ژمارەیەك تۆپی لەگەڵ خۆی برد، تۆپێك كە لە كاتی تەقاندنی دا بەدەنگی بەرزی ورەو هێزی هیندیە سورەكانی دەڕوخاند. كۆرتیز سودی لە جیاوازیو دووبەرکی ئەمان وەرگرتو ڕووی كردە شاری مەكسیكۆو ژمارەیەكی زۆری لە هۆزە نەیارەكانی ئیمراتۆری ئەزتیكی بەلای خۆیدا كەمەندەكێش كرد. ئیمپراتۆر یەكەمجار پێشوازی لە ئیسپانیەكان كرد، بەڵام كوژرانی ژمارەیەك لە هیندە سورەكان بەدەستی ئیسپانیەكان، ئیمپراتۆری والێكرد ژمارەیەك ئیسپانی بكوژێ.وەلێ ئەمە هەروا بە سانایی بە سەریدا نەڕۆیی، بەڵكو "كورتیز"لە تۆڵەی ئەمەدا بڕیاری دەستگیركردنی ئیمپراتۆر دەركرد. جا پاش ئەوەی زیندانی كرد، لە بەرامبەر بڕێك زێڕی پوخت ئازادی كرد، هەروەها وای لێكرد دان بنێ بە سەروەری ئیسپانیەكان بەسەر مەكسیكەوە. بەڵام ئیمپراتۆر لە دوای ئازاد بوونی هیچ خۆشیەكی نەبینی، بەڵكو مەكسیكیەكان بە تاوانی ناپاكی لێی ڕاپەڕینو توانیان دەستگیری بكەنو بیكوژن.

هەرچۆنێك بێت "كورتیز" توانی زاڵ بێت بەسەریانداو دەستی بەسەر شارەكاندا گرتو باڵی بەسەر زەویەكانیاندا كێشا. پاش ئەمەش بەندەری "ڤیراكروزی" لە ساڵی 1520ز دروستكرد.

## دۆزینەوەی پیرۆ:-

ئەوەی کۆرتیز پێی هەڵسا لە مەکسیك، "فرانسیسکۆ"ش- لە پیرۆ پێی هەڵسا. فرانسیسکۆ شان بەشانی بالبۆ لە دۆزینەوەی زەریای ئارام بەشداربوو. ئەو پێش ئەوەی بگاتە ئەم ناوچەیە گوێبیستی هەبوونی ئیمپراتۆریەتی ئەنکا ببوو. ئیدی لە ساڵی 1531ز بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر "پێرۆ"و بردنی سەروەتو سامانی ئەم ناوچەیە لە پەنەماوە لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە سەرباز ڕووی تێکرد. فرانسیسکۆ توانی سەرکەوتن بەسەر هیندەسورەکان بەدەستبێنێو بەسەر پایتەختیاندا زاڵ بێت. پاش ئەمە لە ساڵی 1535ز شاری "لیما"ی دروستکردو کردی بە پایتەختی پیرۆ. بەم شێوەیە دۆزەرەوەکان یان هێرش بەرەکان دەستیان بەسەر مەکسیكو پیرۆ داگرتو سەروەتو سامانێکی زۆری وەك زێڕو زیوو بەردی بەنرخیان دەستخست، هەروەك دەستیانگرت بەسەر چەندین کانو چەندین هەرێمی بەرفراوان. پیدرۆ یەکێ بوو لە خانەدانەکان لە چینی ئەرستۆکراتی، توانی بەربژاریەك لە پادشای ئیسپانیا وەربگرێ، بەوەی ڕوبەرێکی فراوانی لە کەناری خۆرهەڵاتی ئەمریکای باشور دەستبخات، بەمەش بناغەی ئەرجەنتینو پاراگوای بۆ داهاتوو درێژرا. پیدرۆ شاری "بۆینس ئایرس"ی لە ساڵی 1535 دروستکرد کە لە دواتر بوو بە پایتەختی ئەرجەنتین. بەهەمان شێوە شاری "ئاسان سیون"ی- دروستکرد لە ساڵی 1536 کەئەمیش دواتر بوو بەپایتەختی پاراگوای.

یەکێ لە فەرماندەکان بەناوی "پیزراو""دۆزەرەوەی پیرۆ" لە ساڵی 1541 توانی دەست بەسەر شیللی دابگرێو شاری "سانتیاگۆ" بنیات بنێ لەسەر زەریای ئارام، دواتر بووبە پایتەختی شیللی. لە هەنکاتیشدا ئیسپانیەکان ئیکوادۆریان لە ساڵی 1535 دروستکردو کۆلۆمبیاشیان لە ساڵی 1538دروستکرد. بەم شێوەیە هێشتا ساڵی 1517 بە کۆتا نەگەیشتبوو، کە ئیسپانیا بەسەر ئەمریکادا زاڵ بوو،وە ژمارەی خەڵکی ئیسپانیا لە جیهانی تازەدا گەیشتە 175هەزار کەس"32هەزار خێزانی ئیسپانی".

ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا لە جیهانی تازەدا، پێکهاتبوولە دوو ناوچەی کارگێڕیو هەر ناوچەیەو حاکمێکی گشتی بەسەریدا زاڵ بوو. حاکمی گشتی یەکەم ناوەندەکەی کوبا بوو، لەوێشەوە فەرمانڕەوایی دورگەکانی کاریبیو مەکسیكو ئەمریکای ناوەڕاستو بەشی باکوری ئەمریکای باشوری دەکرد. بەڵام حاکمی گشتی دووەمفەرمانڕەوایی پیرۆو شیللیو ئەرجەنتینو ئیکوادۆری دەکرد. دەستەو کۆمەڵە ئاینیەکانیش هەڵدەستان بە پەخشان کردنی ئاینی مەسیحی لەناو بتپەرستەکان. لە ساڵی 1542 ئیسپانیا باڵی بەسەر دورگەی فلیپیندا کێشاو شاری مانیللای دروستکرد، کەە دواتر لە ساڵی 1571 بوو بە پایتەختی ئەم وڵاتە، هەروەها خەڵکی ڕەسەنی ئەم ناوچەیە وەك چۆن ئاینی مەسیحیان قبوڵکردو باوەڕیان پێهێنا، بەهەمانشێوە زمانی ئیسپانیایان کردە زمانی خۆیانو ئەم زمانەبووبە زمانی ڕەسەنی ناوچەکە.

ئەم سامانەی لە جیهانی تازەوە بۆ ئیسپانیا دەچوو کەمبوو، ئەگەر بێتوو بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەو سامانەی کە لەبازرگانی خۆر هەڵاتەوە بۆ پرتوگال دەڕۆیی. هەر لەبەرئەوە ئیسپانیا دەیویست پرتوگال بخاتە پاڵخۆی. جا کاتێك لە ساڵی 1580 پادشای پرتوگال کۆتایی بە ژیانی هات، فلیپی پادشای ئیسپانیا بوو بە پادشای پرتوگالیش واتا یەکانگیری لە نێوان ئیسپانیاو پرتوگال دروستبوو. ئیمپراتۆریەتی بازرگانی پرتوگالو ئیمپراتۆریەتی داگیرکاری ئیسپانیا بوون بەیەك.بەڵام ئەم یەکگرتنە زۆری نەخایاندو دوای شەست ساڵ لەم یەکگرتنە پرتوگال جیابوویەوە. وەلێ ئەم ئیمپراتۆریەتە لەماوەی یەکگرتنیدا لەبری سودو کەڵك وەرگرتن زیانی بەرکەوت،بەتایبەت بەهۆی ئەوەی کە وڵاتە ئەوروپیەکان لە دژی ئسپانیاو پرتوگال هاتنە ناو ململانێی داگیرکاری. کەشتیەکانی هۆڵندا هێرشیان دەکردە سەر کەشتیەکانی ئیسپانیاو پرتوگالو داگیرگەکانیان، وە بەهۆیەوە زەرەرو زیانی قورسیان پێگەیاندنو داگیرگەکانیان ڕووەو وێرانیبرد. سا کاتێکیش ئەم پێکەوەییە کۆتایی پێ هات، پرتوگال بازرگانیەکەی لەدەستچوو بوو، هەروەك زۆرینەی داگیرگەکانیشی لەدەستدا.

## سەرهەڵدانی سەرمایەداری نوێ

"هۆسین" ئابووری ناسی ئینگلیزی لە پێناسەی سەرمایەداریدا دەڵێ:"بریتییە لە ڕێکخستنی کاروبار، لە پانتایەکی بەرفراوان، لەلایەن خاوەن کار یان کۆمەڵێ لە خاوەن کارەکان". ئەوانە خاوەنی زۆرێك لە سامانن، کە بەهۆیەووە ماددەی خاوو ئامێر دەکڕنو کرێکاران بە کرێ دەگرن، بەمەبستی بەرهەمهێنانی بڕێکی زۆرترو زیادکردنی قازانجو

سامانیان[1]. هەروەها زانای ئەڵمانی "ماکسوبیر" دەڵێ:" سەرمایەداری سیستمێکی دێرینە لە مێژوودا ئەگەر بێتو بریتی بێت لە پڕۆژەی گەورە، کە بەهۆیەوە بالآدەستی سەرمایەدار بەسەر سەرچاوەی دارایی گەورە دەستەبەر دەکاتو سامانێکی زۆر بۆ خاوەنەکەی وەبەردێنێ، کە لە ئەنجامی قەرزو پڕۆژەی بازرگانیو جەردەییو دزیو جەنگەوەپەیدا دەبێ. بەلأم سەرمایەداریەت وەك سیتمێکی ئابووری ڕاوەستاوە لەسەر ڕێکخستنو بەکرێ گرتنی کرێکاری ئازاد، لەلایەن سەرمایەدار یان بریکاری سەرمایەدار[1]".

چونکە پێشتر مەبەستی بەرهەمهێنان خۆژیاندن بوو نەوەك زیادبوونی بەرهەمهێنان واتا "ئابوری سروشتی بوو، نەوەك ئابووری کالآیی". هاوکات ئاینی مەسیحیش سوی حەرام کردبوو. بەلأم بەرەبەرە بەهۆی گەشەسەندنی بازرگانی لەنێوان خۆرهەلأتو خۆرئاواو گەشانەوەی ئەم بازرگانیە لە کاتی جەنگی خاچیدا، گۆڕانکاری ئابووری ئەوروپای گرتەوە. ئەم گۆڕانکاریەش لەسەدەی دە بۆ سەدەی یازدە دەستی پێکرد. ئیدی شارەکان سەریان هەڵداو بەرەو گەشەکردن ڕۆیشتنو داهاتیان دای لە زیادی. حکومەتی نەتەوەییو پادشا ڕەهاکان هانی بازرگانیو خاوەن سامانیان دەداو پارێزگاری تەواویان لێدەکردنو هێمنیو دڵنیاییان بۆ دەستەبەردەکردن.

1 J.A. hobson, Erolution of Modern Capitalism(London, 1954)pp. 1
1- Moxweber, protestant Ethics and the spirtof Capitism(Newyork)1950, pp.1

بەمەش چینی ناوەڕاست گەشەیکردو سامانیان زیادی کرد. کە دواتر هەر ئەم سامانەیان لە پڕۆژەی پڕبەرهەم دەخستەکار. هێشتا سەدەی شازدە تێنەپەڕی بوو، سیستەمی دەرەبەگیو سەندیکاکان بەرەو لەناوچوونو هەڵوەشانەوەیەکی گەورە ڕۆیشتن. خاوەن موڵك داوای دراوی دەکرد لەبری پیدانی بەشەشمەك. سەندیکای بازرگانو پیشسازان توشی کێبڕکێیەکی بەهێز بوون لەگەڵ سارمایەدارەکانی دەرەوەی سەندیکا. ژمارەیەکی زۆر لە شوێنکەوتەکتنیان بوونە کرێکار لای سەرمایەدارانی دەرەوەی سەندیکا. هەندێ لە سەندیکاکان هەلیان قۆستەوە بۆ زیادکردنی سەروەتو سامانیانو هەستان بە بەکارهێنانی شاگردەکانیان بە بەکارهێنانێکی خراپو نەشیاو.

سەرمایەدارانو خانەکانی سامان"بیوت الّموال"و دارایی هەڵدەستانبە پێدانی قەرز بە بازرگانو خاوەن پڕۆژەکان، کە ئەوانە پێویستیان بە خەرجی هەبوو، قەرز پێدانیشیان لە بەرامبەر قازانجێکی زۆرو بێ ویژدانانە بوو. هەروەها خانەدانو خاوەن زەویە گەورەکان لە شارەکاندا نیشتەجێ بوونو دارایی خۆیان لە پڕۆژەی جۆراوجۆرادا لە بازرگانیو پیشەسازی وەبەردێنا. لەملاشەوە کارمەندانی دەوڵەتو پیاوانی ئاینی پۆستەکانی خۆیان بەکاردەهێنا بۆ بەدەستهێنانی سامانو وەسەریەکنانی سەرمایە. بەم شێوەیە بازرگانی فراوان بوو، نرخی زەوی بەرەو بەرزبوونەوە ڕۆیشتو سەروەتو سامان پەرەی سەندو سەرمایەداری هاتە گۆڕێ[1].

1 Hosbon, op. Cit; 3-24.

**بازرگانی ئیتاڵیا وبنەماڵەی میدیتچی:-**

شارە ئیتاڵیەکان یەکەم شارانێك بوون لەناو شارە ئەورووپیەکان کە دەستیان بەبازرگانی کرد لەگەڵ خۆرهەلاَت وناوەندی بازرگانیان لە هەریەکە لە:ئەسکەندەریەو کەنارەکانی سوریاو لوبنان‌و ئاسیای بچوك دامەزراند. ئەم بازرگانیەش لەکاتی جەنگی خاچی‌و پاش جەنگەکەش فراوانبوون وگەشەسەندنی بەخۆیەوەبینی.

سەرمایەداریەت پەرەی سەند، بەتایبەت لەشارەکانی جەنەواو ڤینیسیاو فلۆرەنسا. خانەی سامان‌و دراو وەك پێداویستیەکی ئەو ڕۆژگارە سەریهەڵداو دواتر بەتێپەڕینی کات بوون بەبانك. خاوەنی ئەم بانکانە لە بەرامبەر قازانجێکی زۆرداقەرزیان دەدایە میرو پاشاو پاپاو بازرگان‌و خاوەن پرۆژەگەورەکان، بەمەش قازانجی زۆریان وەچنگ دەخست وسەرمایەیان بەگەشەسەندێکی گەورە گەشەی دەسەند.

بنەماڵەی میدتچی کە لە فلۆرەنسا نیشتەجێ بوون، یەکێ بوون لەوانەی خاوەنی خانەی سامان ودراو بوون‌و لەسەدەی شازدەدا بوون بە یەکێ لەگەورەترین خاوەن بانکەکانی ئەورووپا. ئەم بنەماڵەیە لە سەندیکایەکی بچوکەوەلەسەدەی چواردەدا گەشەی کردو بووبە یەکێ لەگەورەبنەماڵە دەوڵەمەندەکانی ئەورووپاو لەهەردوو سەدەی پازدەو شازدە دەسەلاَت‌و نفوزیان ڕووەو زیادبوون دەڕۆی. ئەم بنەماڵەیە بووبە خاوەنی چەند بانك‌و صیرفەیەك، کە قەرزیان دەبەخشی بەپاشاو میرو دەوڵەتانی ئەورووپا. سەروەت وسامانی خۆیان لەپڕۆژەی گەورە لەناوەو دەرەوەی کیشوەری

ئەوروپادا خستبووەگەڕ، وەبۆ بانکەکانیان چەندین لقیان لەشارە هەرە گرنگەکانی ئەوروپا دامەزراندبوو بەتایبەت لەناوەندە بازرگانیەکان. دەتوانین ئەم بنەماڵەیە وەك نمونەی سەرمایەداری نوێ سەیر بکەین.

## سەرمایەداری و پەرەسەندنی ئەوروپا :ـ

سەرمایەداریەت بەم شێوەیەگەشەی نەدەسەند، ئەگەر تەنها پشتی بەئەوروپا بەستبوایە. چونکە زۆر لەسەرچاوەکانی سەروەت وسامان لەئەوروپادا بوونی نەبوو. لەڕاستیدا سەرمایەداریەت لەئەنجامی بازرگانی خۆرهەڵاتو دۆزینەوە جوگرافیەکانو سازبوونی پەیوەندی ئەوروپا بە ئاسیاو ئەفریقاو ئەمریکا، پاشان زاڵ بوونی ئەوروپا بەسەریانداو خستنەگەڕی ئەم ناوچانە لەلایەن ئەوروپیەکانەوە گەشەی سەند. چونکە هەر سەرچاوەیەك لای خۆیان کەم بوایە، ئەوان لەناوچەکانی تر هاوردەیان دەکرد بۆخۆیان. هەروەها بۆ دەرکردنی دراو، زێڕو زیوی ناوچە دۆزراوەکانیان بە تالآن دەبرد. ئەوەش دەزانین کە دراو کۆڵەگەی گەشەسەندنی سەرمایەداریەتە. ئەوروپیەکان سەرچاوەی سامانی سروشتیو ماددەی بە نرخیان لە هەریەکە لە ئەمریکاو ئاسیاو ئەفریقیا بەدەستهێنا، ئەم بەدەستهێنانەش بە جۆرەها ڕێگەی وەك دزیو ڕاوو ڕووت دەستەبەرکرا. ئەم کارە قێزەونە زیاتر لە دۆزەرەوە ئیسپانیەکان ڕەنگی دەدایەوە کە لە مەکسیكو پیرۆ و هیندی خۆرهەڵات پیادەیان دەکرد، هەروەها لە ڕێی چەتەگەریو سەپاندنی سەرانەو باج بەسەر دانیشتوانی داگیرگەکان بەدەستیاندەهێنا، بازرگانیو

کۆیلەو ڕژێمی کۆیلەگەریش لەلایەکی ترەوە ئەوەندەی تر قازانجی زۆری خستە سەر سامانی ئەورووپیەکان.

لە ڕاستیدا سیستەمی کۆیلەگەری لە ماوەیەکی زووەوە کۆتایی پێ هاتبووو سیستەمی کۆیلەی زەوی جێگەی گرتبوّوە. ئەم سیستەمەش (کۆیلەی زەوی)ی لە ئینگلترا هەندێ ناوچەکانی ئەورووپای خۆرئاوا توایەوە، تاوەکو سەدەی شازدە لە زۆربەی زۆری ناوچەکانی ئەورووپای خۆرئاوادا کۆتایی پێهات. بەلاّم لە ئەورووپای خۆرهەلاّت سیستەمی کۆیلەی زەوی مایەوە تاکو سەدەی نۆزدە. خەلّکی ئەورووپا لەگەلّ ئەو هەژارییەی کە تیای دابوون، بەلاّم توانیان بەهرەمەندبن لەو ئازادییە تایبەتییەی کە بەدەستیانهێنابوو.

کاتێك ئەورووپیەکان هەستان بە دۆزینەوە جوگرافیەکان، لەسەریان گرانو زەحمەت بوو لە ناوچەکانی هێلّی یەکسانیو خولگەیی کاری کشتوکالّی ئەنجام بدەن، لەبەرئەوە هیندییە سورەکانیان خستەکار لە کارگەو کێلّگەو هەموو ئەو کارانەی کە جەستەی مرۆڤ شەکەتو ماندو دەکەن.

ئیدی لە ئەنجامی ئەمەدا خەریك بوو هیندیە سورەکان لە کیشوەری ئەمریکادا قڕانیان تێبکەوێتو قەلاچۆبن، چونکە هیندیەسورەکان کاری لەم جۆرە قورسو ماندوکارەیان بۆ نەدەکرا کە ئەورووپیەکان پێیان ئەنجام دەدان، "فێری ئەم کارە قورسانە نەبوو بوون". ئەمەش وایکرد مرۆگەرەکان دەنگی خۆیان بەرز بکەنەوە لە دژی ئەم کارە دڕندانەیە کە مرۆڤێ پیادەی

دەکات لە دژی برا مرۆڤەکەی[1]. ئەمەش وایکرد ئیسپانیەکان‌و پرتوگالیەکان ناچاربن دەست لەمکارە دڕندانەیە هەڵگرن، بەڵام وەنەبێ کارێکی باشتریان هەڵبژاردبێ‌و وازیان لە چەوساندنەوەی مرۆڤهێنابێ. بەڵکو هەستان بە گۆڕینی هیندیەسورەکان بە زنجیەئەفریقیەکان، زنجیەکان یان ئەفریقیەکان لە تێڕوانینی ئەواندا گونجاوترن لە هیندیە سورەکان بۆ سەرجەم کارەکان. ئیدی هەستان بە دامەزراندنی چەند ناوەندێکی گرنگ لەسەر کەنارەکانی ئەفریقیا بۆ ڕاوکردنی زنجیەکان. حکومەتی ئیسپانیا لەساڵی 1517 هەستا بە بەخشینی بەربژاریەك بە یەکێ لە بازرگانە هۆڵندییەکان بۆ ئەنجامدانی بازرگانی کۆیلە، کە ساڵانە 4000 کۆیلەی بەرەو هیندی خۆرئاوا ڕاپێچ دەدا. ئەم بازرگانە هەستا بە فرۆشتنی ئەم بەربژاریە بە بازرگانێکی ئیتالی لە جەنەوا، ئەمیش کۆیلەی لە پرتوگالیەکان دەکڕی‌و بە ئیسپانیەکانی

---

1 ئەوروپا هەتا ئەمڕۆش وازی نەهێناوە لە کوشتن‌و برسی کردنی گەلانی جیهان‌و بە کۆیلە کردنیان. ئەگەر پێشتر بەناوی پەیامی پیاوی سپی‌و بردنی شارستانیەت جیهانیان داگیر دەکرد. ئەمڕۆش لەژێرناوی هەناردەکردنی دیموکراسیەت وڵاتان داگیر دەکەن ودانیشتوانەکەی دەکەن بەکۆیلە. هەر لەدەرنجامی ئەوەش بوو کە دوو جەنگی جیهانیان هەڵگیرساندو دەیان ملیۆن مرۆڤیان کردە قوربانی. هەموویشی لەژێرناوی دیموکراسیەت ئەنجام دەدەن. لەهەموویشی سەیرتر ئەوەیە چەکی ئەتۆمی بەرهەم دێنن‌و دوای پاراستنی مافی مرۆڤیش دەکەن" لەڕاستیدا ئەوان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە ئەگەر لە سیاسەتیاندا بەرژەوەندی‌و ئەخلاق لەگەل یەك تەبابوون ئەوە ئامادەن پابەند بن بە ئەخلاقی مرۆیی، خۆئەگەر بەرژەوەندی‌و ئەخلاق دژی یەکتر بوون لەسیاسەتدا ئەوا پشت لە ئەخلاق دەکەن‌و دەست بە بەرژەوەندیەکانیان دەگرن" هەروەك ئەمە لە هیرۆشیماو ناکازاکی ڕوویدا کاتێ بەرژەوەندی‌و بەکارنەهێنانی بۆمبی ئەتۆمی بووبە ئەم دوو ڕیگەیەی کە پێویست بوو لایەك هەڵبژێرن، هاویشتنی بۆمبی ئەتۆمیان هەڵبژاردو ئەخلاقیان وەلانا. "وەرگێڕ"

دەفرۆشت لە ئەمریکا. بەم شێوەیە بازرگانی کۆیلە لە نێوان ئەفریقاو ئەمریکا بوو بە دامەزراوەیەکی ڕێکخراوو دانپێداهێنراو لەلایەن ئەوروپیەکان. ئیدی بەهۆی ئەمەوە بە هەزاران کۆیلە بەبێ ڕۆژانەو کرێ کاریان دەکرد لە کێڵگەکان.

## سەرهەڵدانی سەرمایەداری لە ئیسپانیاو پرتوگال:-

شتێکی چاوەڕوانکراوە کە ئیسپانیاو پرتوگال قازانجبکەن لە بازرگانی خۆرهەڵاتو بازرگانی کۆیلەو داگیرگەکانی ئەمریکا. بەڵام لە ڕاستیدا گەلی ئیسپانی نەیتوانی سود لەم سامانە ببینێ کە لە ئەمریکا وە ڕێچکەی گرتبوو بەرەو وڵاتەکەیان. جوتیارو خانەدانی ئیسپانی لەسەر زەویو کێڵگەکانیان مانەوەو بەرهەمیان دەستدەکەوت لە بەروبومی کشتوکاڵو ئاژەڵداری، یاخود بەرهەمو دەستکەوتەکانیان چنگ دەکەوت بەهۆی ناردنە دەرەوەی خوری بۆ پیشەسازیە قوماشە خوریەکانی فلاندروز. ئەو کەمینیەی کە سودیان بینی بریتی بوون لە پاشای ئیسپانیاو پرتوگالو دەستو پێوەندەکانیانو بازرگانانو هەندێ لە خانەدانان. ئەوانە توانیان ناوەندی بازرگانی دابمەزرێنن لە ئیشبیلیەو لیشبۆنە، کە هەر لەوێشدا سامانی ئەمریکاو بازرگانی خۆرهەڵات کەڵەکە ببوو، لەوێشەوە دەڕۆیشتە وڵاتە ئەوروپیەکان. بەمە ئەم دوو شارە جێگەو شوێنی ڤینیسیا وجەنەوایان گرتەوە. ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم دەرگەی ئاوەڵا کرد بۆ بازرگانانی ئەڵمانو هۆڵندا کە سامانیان وەبەربێنن لە پرۆژەی زەبەلاح لە ئیسپانیاو ئەمریکا. سامانو قازانج لە ئیسپانیاوە گوازرایەوە بۆ زەویە نزمەکانو شاری "ئەنتۆریب" بوو بە

پایتەختی بازرگانیو سەرمایەداریەتی ئەوروپی. ئەوانە قازانجو سودیان پێبڕا لە بازرگانیو سامانی ئیسپانیو پرتوگالی، کە یەکەم جار خاوەن سامانو بازرگانی ئیتالیەکان بوون. لەم نێوانەدا بنەماڵەی میدتچی ئیتالی بریکاریان لە مەدریدو لیشبونەدا هەبوو. بەڵام لە ماوەی یەکەمو دووەمی سەدەی شازدە ئەڵمانیو هۆڵەندیەکان لە گۆڕەپانی صیرفەو وەبەرهێنانی سەروەتو سامانی ئیسپانیو پرتوگالی کە لە خۆرهەڵاتو جیهانی نویێ وە دەهات کێبڕکێیان دەکرد لەگەڵ ئیتاڵیەکان.

کایەی بازرگانی ئیتالی توشی داڕمانو هەرەسهێنان هات بەهۆی زاڵ بوونی عوسمانیەکان بەسەر دەریای ناوەڕاستو پەیدابوونو بەکارهێنانی ڕێگەی نویێ بۆ ئەمریکا یان ڕێگەی لوتکەی ئاوات بۆ خۆرهەڵات لەلایەن ئەوروپیەکانەوە، بەمەبەستی دەستکەوتنی کەلوپەلی خۆرهەڵاتیو هاوردەی ئەمریکی. بازرگانی ئەوروپیەکان بەرەو ئیشیبلیەو لیشبۆنە ڕوووی وەرچەرخاند. تێکچونی بازرگانی ئیتالیو تێکچونی پیشەسازی بووە هۆی تێکچوونو هەرەسهێنانی سیستەمی ئاڵوێری ئیتالی. بالآدەستی سەروەتو دارایی لە بانکی ئیتالیەوە گوازرایەوە بۆ ئەڵمانیو هۆڵندیەکان. ئەمانە بەهۆی یەککگرتنی سیاسی نێوان ئەڵمانیاو ئیسپانیاو زەویە نزمەکان لە ژێرباڵی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم، بوونە پێشەنگی فراوانبوونی ئابووری ئەوروپیو سودی گەورەیان بینی بۆ بەهێزکردنی ئابوریان.

## بنەماڵەی ڤیگوری سەرمایەداری:ـ

بەڕاستی بنەماڵەی ڤیگور ڕونترین نمونـەی سـەرمایەداری ئەڵمانیایـە. ئـەم خانەوادەیـە بنەماڵەیـەکی جولاّبـوون لـە شـاری ئۆکسبرکی ئـەڵمانیا. ڤیگـور تـوانی بـبێ بـە ڕابـەری سـەندیکای بازرگـانیو پیـشەسازی شـاری نـاوبراو. ساکاتێکیش لـە سـاڵی 1408 لـە دونیـا دەرچـوو بـڕی 300 جنیـەی زێـڕی جێهێـشت. بـواری فراوانکردنـی سـەروەتو سـامان بـۆ کوڕەکـەی ڕەخـسا. ئەوەبوو لە سەدەی پازدە لە ژێر چاودێری خۆی"یعقوب ڤیگـور" هەسـتا بـە وەبەرهێنانی کارگـە زیوەکـانی لـە ترویـل مـس لـە هـەنگاریا. شـایەنی باسـە یعقوب ڤیگور لە ڤینیسیا فێری ئەم پیشەیە بوو. جگە لەمە بازرگـانی دەکـرد بە خوریو ئاوریشمو بەهارات لەگەڵ هەموو بەشەکانی ئەوروپا. سـامانی ئـەم بنەماڵەیە لە کۆتایی سەدەی پازدە گەیشتە 200 هەزار جینەی زێڕ. ئـەوان قـەرزیان دەبەخـشی بـە پاپـاو ئیمپڕاتـۆر چارلـسی پێنجـەم. سـامانی ئـەم بنەماڵەیە بەشێوەیەك زیادی کرد کـە لـە سـاڵی 1527خـاوەنی یـەك ملیـۆن جینەی زێڕبوون. بەڵام ئەم سامانە هەروا زیادی نەکرد، بەڵکو لە ناوەڕاستی سەدەی شازدە دای لەکەمیو لاوازی تێکەوت.

### بایەخی ئەنتۆریب

بنەماڵەی ڤیگور تێبینی گوێزرانەوەی ناوەندی بازرگانیان کرد لە ئیتالیاوە بۆ کـەنارەکانی زەریـای ئەتلەسـیو ناوەڕاسـتی ئـەوروپا. لەبەرئـەوە لەسـەر بەنـدەری ئـەنتۆریب لـە زەویـە نزمـەکان، چـەندین لقیـان بـۆ بانکـەکانیان دامەزرانـد. ئـەم بەنـدەرە ناوەنـدێکی بازرگـانی پڕبایـەخ بـوو لـە ئـەوروپا،

بەتایبــەت لــە کۆتاییــەکانی ســەدەی پــازدە. ئــەم بەنــدەرە جێگــای شاری(برجس)ی گرتەوە، کە شارێکی بازرگانی بوو لە فلاندروز. بازرگانی لـە ئنتۆریـب گەشـەی کـردو سـەروەتو داهـاتی دای لـە زیـادی، بەشـێوەیەك ئەنتۆریب بوو بە ناوەندێك بۆ بـازاڕی دارایـیو ئـالۆیر لـە ئـەوروپا لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی شـازدە. بـەهۆی گرنگـی ئـەنتۆریب لـە ڕووی بازرگـانیو ماڵیەوە، سامانی یعقوب ڤیوگر لە ساڵی1525 خۆی لە یـەك ملیـۆن جنیـەدا بینیـەوە. بەهــەمان چەشــن بنەماڵــە ســەرمایەدارەکانی تـری ئـەڵمانیا وەك بنەماڵـەی ڤیـوگر چـەند لقێکیـان لەسـەر ئـەم بەنـدەرە جیهانیـە دامەزرانـد. بایـەخی ئـەم بەنـدەرە گەیـشتەڕادەیەك کـە بەهـەزاران بازرگـانی بیـانی لـە ئەوروپای خۆرهەلاتو ئەسکەندەنافیاو باشوری ئەوروپاو خۆرئـاوای ئـەوروپا تیایدا کۆدەبونەوە.ئەم بەندەرە بازاڕێکی بـەڕمێن بـوو بۆکالاکـانی ئینگلتراو پرتوگالیــــەکانیش بەمەبەســــتی دەستخــــستنی ئــــەوبڕەزێڕەی کەلــــە ئەڵمانیادەردەهێنرا، ناوەندێکی بازرگانیان بۆ بازرگانی بەهارات لە ئـەنتۆریب دامەزراند.گوتراوە: کە ژمارەی ئەو کەشتیانەی باریان بۆ ئەنتۆریب دەبرد لـە ڕۆژێکـدا 400 کەشـتی دەبـوون، ئەمــەو ســەرەڕای ئــەوەی بــە هــەزاران گالیسکەش بار دەکرانو ڕێگەی وشکانیان تەی دەکرد.

چەندین دامەزراوەی دارایی نـویٚ لەئـەنتۆریب دامـەزرا،وەك:ـ بورصـە بـۆ ئالوێری دراو وەبەرهێنانی سامان، هـەروەها دامـەزراوەی ڕهـنو حەواڵـەکاری یـان دڵنیـایی دان لەسـەر ژیـان ئـەو سامانەشـی خراوەتـە کـار بەتایبـەت لـە هەمبەر شوێنەدوورە دەسـتە دەریایـەکان کـە مەترسـیداربوون. مـیرو پاشـاو

دەڵاڵە"جامباز"[1] کان پارەیان قەرز دەرکرد لە بورصەی ئەنتۆریب. بەم چەشنە بە تێپەڕینی نیوەی سەدەی شازدە ئەنتۆریب بوو بە بازاڕێکی بازرگانیو ئاڵوێر، بەشێوەیەك کەنەوەك تەنها لە ئەوروپا بەڵکو لە هەموو جیهان وێنەی نەبوو. وەلێ لەساڵی 1549 ڕەوشەکە گۆڕانکاری بەسەرداهات، بەوەی کە پرتوگالیەکان بەمەبەستی بەدەستهێنانی زێڕی ئەمریکی هەرزان، ناوەندە بازرگانیەکانیان بۆ بەهارات داخست. ئەمەش وایکرد کانە زێڕەکانی ئەڵمانیا نەتوانن وەك جاران بە پێشەنگی بمێننەوەو کێبڕکێی زێڕی ئەمریکی بکەن. بەهەمان شێوە ئەو بازرگانە ئەڵمانیانەی بەهاراتیان لە ئەوروپا دابەشدەکرد ناوەندی خۆیان گواستەوە بۆ لیشبۆنەو ڤینیسیا. ئەمەش کاریگەری دروستکرد لەسەر بازرگانی ئەنتۆریب، بەشێوەیەك ئەنتۆریب نەیتوانی لە نیوەی دووەمدا چالاکی خۆی بگێڕێتەوە وەك چۆن لە نیوەی یەکەمدا هەیبوو.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەنتۆریب بە دەوڵەمەندی مایەوە، بەڵام چەند هۆکارێکی تر چالاکی بازرگانیو ئاڵوێری ئەنتۆریبیان ئیفیلج کرد. وەك جەنگە بەردەوامەکانی نێوان فەرەنساو ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم، هەروەها ئەو قەرزە کەڵەکەبووانەی کە ئیسپانیا لەسەری بوون، پاشان هەڵوەشانەوەو ڕەتکردنەوەی ئەوقەرزانە ناوبەناو. یاخود ئیسپانیابەزۆرو بەسوی5٪ قەرزەکانی دەدایەوە. ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە فەرەنساش بەکاری ئیسپانیا هەڵساو ئەوەندەی تر شکستی بە ئابووری ئەنتۆریب هێناو دواتر

---

1 کەسێك لە نێوان چەند کەسێکدا کار بکاتبەعەرەبی(مماسیر)ی پێدەڵێن.

داڕوخانی ئابوریو هەرەسهێنانی بانکەکانی لێکەوتەوە لەپێش کۆتایی هاتنی سەدەی شازدە. شۆڕشی زەویە نزمەکانیش دیسان هۆکارێك بوو بۆ ئەم ڕەوشە، کە لەساڵی 1566 هەلگیرساو کاری کردە سەر داڕوخانی ئابووری. دزیو ڕاوڕووتی سەربازە ئیسپانیەکانیش لە سەروەتو سامانی شارە هۆڵندیەکان، لەناویشیاندا بەندەری ئەنتۆریب لە ساڵی 1576 هۆکارێکی تری نشوستی هێنانی ئەنتۆریب بوو. هەرچۆنێك بێت ئەنتۆریب توانی وەك ناوەندێکی بازرگانیو سەرمایەداری ئەوروپی بمێنێتەوە لە ماوەیەکی درێژی سەدەی شازدە.

### کاریگەری سەمایەدای لەسەر کشتوکاڵو پیشەسازی:-

بەڕاستی سەرمایەداری نوێ لەماوەی سەدەی شازدەدا بەشێوەیەکی لەسەرخۆوهێواش گۆڕانکاری گەورەی هێنا بەسەر دامەزراوەو ڕژێمی کۆمەلاّیەتیو شێوەی کۆمەلگەی ئەوروپی. دامەزراوە دەرەبەگایەتیەکان بەرەبەرە ئەستێرەیان ئاوا دەبوو( کۆتایی پێدەهات)، سەندیکاکانیشیان ڕووەو نەمان ملیاندەنا یاخود گۆڕانی بەسەردا دەهات. بەلاّم ئەگەر گۆڕانکاریەکان لەسەرەتای سەدەکان بەرەبەرەبووبێ ئەوا لەکۆتاییەکەیدا بووبە گۆڕانێکی شۆڕش ئاسا. سەرمایەداری نوێ گورزێکی کوشندەو گورچکبڕی لە ڕژێمی دەرەبەگیو کشتوکاڵی دا. خانەدانەزلەکان کەتاوەکو ئەوکاتیش بەهرەمەنددەبوون لەداهاتی گەورەی زەویەکانیان، لەم کاتەدا خۆیان خزاند بووە شارەکانو بە بازرگانیەوە خۆیان سەرقاڵکردبوو، زەویەکانیشیانبە پارەیەکی زۆر بەکرێ دابوو داهاتیشیان لە بازرگانیدا بەکار

دەهێنا وخۆشیان ببونە خاوەنی مولکی غائیب. هاوکات جوتیارانیشببوونە کرێکاری کشتوکاڵیو بەڕۆژانە کاریان دەکرد. هەروەها جوتیاران هەندێ لە سامانی خۆیان لەگەڵ گەشەپێدانی کشتوکاڵیدا بەکاردەهێنا. ئەمەش بە خستنە کاری چەند ئامێرێکی نوێی وەك هەوجار"کە ژمارەیەك ئاژەڵ ڕایاندەکێشا". بەڵام هەندێ لە خانەدانەداکان زەویەکانیان دەکردە پەرژینو تیایدا مەڕیان بەخێو دەکرد، خۆشیان بە بازرگانی خوری خەریك دەکرد. کە هەر ئەم بازرگانیە پڕ قازانجو بەڕمێنە هاندەری سەرەکی بوو بۆ سەرهەڵدانی پرۆسەی پەرژین لە ئینگلترا. سەبارەت بەپیشەسازی سارمایەداری نوێ دەتوانین بلێین: کە سەرمایەداری نوێ سەندیکاکانی لەباربرد. ئەم سەندیکایانە لەسەرەتای سەدەی شازدەوە لەداڕوخانو هەرەسهێناندابوون، ئەمەش بەهۆی ئەوەی لەسنورێکی بەر تەسکدابوونو دەسەلاتێکی ئەوتۆیاننەبوو کە بەهۆیەوە بتوانن ڕوبەڕووی خواستو خستنەڕووی جیهانی ببنەوە کە لەسەر شتومەکە پیشەسازیەکان هەبوو.

کەرتی تایبەت لە پیشەسازیدا سەریهەڵدا، بەمەبەستی دروستکردنی کەلوپەلی خواست لەسەربە کرێیەکی دیاریکراو. ئەمەش خۆی دەبینیەوە لە هەستانی سەرمایەدار بە کڕینی ماددەی خاوو دابەشکردنی ماددە خاوەکە بەسەر پیشەوەرەکاندابە مەبەستی دروستکردنی کەلوپەلو دواتر فرۆشتنی بەرهەمەکان بەنرخێکی بەرز. بەگوێرەی ئەم سیستەمە سەرمایەدارییە دەتوانرێ ژمارەیەکی زۆر لە پیشەوەران لەبەرامبەرکرێیەکی دیاریکراوو کەم لە پیشەی جیاوازدا کۆبکرێنەوەو پاشان ماددەی خاوی جۆربەجۆریان بەسەردا دابەشبکرێت.بۆ نمونە خوری دەدرایە جۆلا، ئاسن

بەئاسنگەر،پیستە بۆ کەوش ساز. پاشئەمە سەرمایەدار سەرجەم ئەم کەلوپەلە سازکراوانەی کۆدەکردەوەو بە قازانجێکی زۆر دەیفرۆشتەوە. سەرمایەدار پابەند نەبوو بەهیچ یاساکی سەندیکا چونکە هیچ لایەنگری بۆ ئەو نەبووەو شوێنکەوتەی نەبوو، بەڵکو ئەو مەبەستی کۆکردنەوەی سامانێکی زۆر بوو کە بە ڕێگەیەکی نویێو لەسەر بنەمای بەرهەمهێنان لە بوارێکی بەرفراوان دەهاتە دەستی.

لە دەرەنجامی ئەمانەدا جیاوازییەکی گەورە دروستبوو لەنێوان خاوەن کارو کرێکار. پەیوەندی سۆزو بەزەیی لە نێوان سەرمایەدارو کرێکاردا نەماو کێبڕکێیەکی توند لەنێوان سەرمایەدارو کرێکار سەریهەڵدا. سەندیکاکان نەیانتوانی کێبڕکێیەکی سارمایەداری نوێ بکەن لە پیشەسازیدا. بۆیە سەندیکاکان دوو ڕێگەیان لە بەردەم بوو، یان ئەوەتا خۆیان خستبوایە نێو ئەم کێبڕکێیە لەگەڵ سەمایەداران، یاخود دەبوو سەرمایەدار بە ئەندامی سەندیکا پەسند بکەن، لەم کاتەشدا سەرمایەدار هەڵدەستا بە ڕێکخستنی سەندیکا بە گوێرەی سیستەمی تازە. لە هەندێ بارودۆخیشدا سەندیکا مایەوەو لەگەڵ سەرمایەدار سەرقاڵ بوو. کرێکاریش لە کاردا لە بەرامبەر کرێیەکی دیاریکراو کە لەسەری ڕێککەوتبوون لە ژێر سایەی کەرتی تایبەتیدا کاری دەکرد.

### ڕێباز"مەزهەب"ی بازرگانی:-

مەبەست لە ڕێباز"مەزهەب"یبازرگانی، ڕێکخستنی کاروباری ئابوورییە لەلایەن حکومەتەوە لە بورای پیشەسازیو بازرگانیدا. بەلام لەسەدەی شازدە هیچ شتێکی لەم شێوەیە نەبوو، کاتێ دەبینین شارە ئیتالیەکان چەندین سەدە ئەرکی باری ئابووریان ڕێکدەخستو سەرپەرشتیان دەکرد. بە

هەمانشێوەش سەندیکاکانیش ئەم سیاسەتەیان پیادەدەکرد. بەلاَم شتێکی نوێ کە لەسەدەی شازدەدا سەریهەڵدا، بریتی بوو لە فراوانی ئەم سیاسەتەو پیادەکردنی لەلایەن حکومەتە نەتەوەییەکانو پاشایە ڕەهاکان، بەتایبەت لە سەدەی دواتردا ئەمە باشتر ڕەنگی دایەوە. ڕێبازی بازرگانی پێداگری دەکرد لەسەر زێڕو زیو، بەوەی کە کۆڵەگەی سەروەتو سامانە بۆ دەوڵەتو خەڵك، بۆیە پێویستە بڕێکی زۆر لە زێڕو زیو پەیدابکرێو لە گەنجینەی دەوڵەتو لەلای خەڵك بوونی هەبێت. چونکە ئەمە شانو شکۆی دەوڵەت زیاد دەکاتو توانای پێدەداتو هۆکارێکە بۆ بلاَوکردنەوەی خۆشنودیو هێمنیو ئاسایش لە ولاَتدا. زێڕو زیو دوو ماددەی سەرەکین لە لێدانی "دراو"دا کە یەکەی سەرەکی ئالوێرە. هەروەها هۆکاری پێدانی موچەی فەرمانبەرانەو هۆی هەڵسان بە پڕۆژەی ئابووریو دامەزراندنی سوپای هەمیشەییو بەهێزکردنی سوپاو بنیاتنانی کەشیگەلی جەنگی بۆ پارێزگاری لە ولاَت. جا زۆرو کەمی ئەو دوو ماددەیە لە هەموو ئەو بوارانەدا دەوردەبینێ. ناتوانرێ پارێزگاری لە سامانی نەتەوەیی بکرێ بەبێ ئەوەی دەوڵەت بازرگانیو پیشەسازی ولاَت ڕێکنەخاتو سەرپەرشتی بازاڕ نەکاتو برەو بە پیشەسازی ناوخۆ نەدات. ئەم برەودانەش بەباج خستنەسەر شتومەکی هاوردە دەبێ، چونکە شتومەکی هاوردە کێبڕکێ دەکات لەگەڵ بەرهەمی ناوخۆ. هەروەها یارمەتیدانو هاندانی کەشتی ناوخۆ(نیشتمانی) بۆ هێنانی کەلوپەلو بەکارنەهێنانی کەشتی بیانی و، دامەزراندنی داگیرگە بۆ زیادکردنی ماددەی خاو لە ولاَت بە مەبەستینەکڕینی ئەو ماددانە لە ولاَتە بیانیەکانو فرۆشتنی

کاڵای بەرهەمهێنراو لە داگیرگەکاندا لەوانە بوون کە ڕێبازی بازرگانی جەختی لەسەر دەکردەوە. ئیدی بەمانە سەروەتو سامانی وڵات زیاد دەکاتو کۆسپ دروستدەبێ لەبەردەم دەرچونی کانزای بەنرخ(زێڕو زیو) بۆ دەرەوەی وڵات. وەبە زیادکرنی ناردەنیو کەمکردنەوەی هاوردە پارێزگاری دەکرێ لە تەرازووی بازرگانیو دراوی نیشتمانیش لە وڵاتدا دەمێنێتەوە.

بەمەبەستی یەکانگیرکردنی ئابووری نیشتمانیو ڕێکخستنی بازاڕی وڵات، ڕێبازی بازرگانی بە پێویستی دەزانی کە گومرگی ناوخۆیی هەڵبگیرێ، هەروەها داوای دەکرد بازرگانی وڵات وەك پایەکی سەرەکی ئابووری وڵات سەیربکرێ لەلایەن دەوڵەتەوەو گرنگی پێبدرێو ڕێکبخرێ ئەمەش لە پێناو (ئیکتیفای زاتی) خۆژیاندنو ئامادەکاری جەنگ.

لایەنگرانی ئەم مەزهەبەپێگریان دەکرد لەسەر داگیرگەکانی ناوچەی یەکسانی، ئەمەش بەهۆی هەبوونی شەکروچاو تەختەو بەرهەمەکانی تر کە لەوێدا هەبوونو لە کیشوەرەکانی تر دەستنەدەکەوتن. هەروەها داوای دەکرد کە ئابووری داگیرگەکان لەگەڵ ئابووری وڵات بکرێتە یەكو بکرێنە بازاڕی ساغکردنەوەی کەلوپەلەکان. ڕێبازی بازرگانی بەهۆی جۆراوجۆری وڵاتەکانو پیادەکردنی ئەم سیاسەتەو بەرژەوەندی چینی دەسەڵاتدارەکان، شێوەی جۆراوجۆری وەرگرت. لە ئینگلترا شێوەی ئابووری لە بەرژەوەندی حکومەت دابوو. حکومەتی ئینگلیز وەڵامدەرەوەی داواکاری خاوەنکارو بازرگانان بوو، بەڵام لەهەڵەداین گەر بڵێین: ئینگلیز ئابووریەکەی لە بەرژەوەندی دەوڵەتدابووە بەگشتی یان لەبەرژەوندی خاوەنکارو بازرگانان

دابوویێ. بەلأم لە فەرەنسادا ڕێبازی بازرگانی بەمانای سیاسەتی ئابووری ولأت دەهات. دەولەت کاروباری ئابووری هەلدەسوڕاندو بواری بۆ تاکەکەس نەدەرەخساند. خەلکیش هەستیان کە دەولەتدەستی بەسەر ئابووری ولأتدا گرتووە. وەلێ ولأتانی تریش هەمان ڕێرەوی فەرەنسایان گرتەبەر، کە خۆی دەبینیەوە لە سەرپەرشتیکردنی تەواوی کایەکانی ئابووری ولأت.

زەویە نزمەکان کە کۆماریێ بوو لە سەدەی حەڤدە، ڕەنگدەرەوەی خاوەنکارەکان بووو ئەوان نوێنەرایەتیان دەکرد. بەرژەوەندی ئەوان لەگەلێ بەرژەوەندی ولأت هاوڕێکبوو. ئەوان زالبوون بەسەرسیاسەتی ئابوری ولأت. ئیسپانیاو پرتوگالیش داگیرگەکانی ئەمریکاو بازرگانی خۆرهەلأتیان بۆخۆیان قۆرخکردبوو ڕێگریشیاندەکرد لەولأتە ئەوروپییەکان کەبازرگانی بکەن لەناوەوەی ئیمپراتۆریەتەکەیاندا.ئەمەش وایکرد کە فەڕەنساو ئینگلتراو هۆلندا پەنابەرنە بەر چەتەگەری دەریای‌و هێرش کردنە سەر کەشتیەکانی ئیسپانیاو پرتوگال لەناو دەریاداو پاشان بە تالأن بردنی هەموو ئەو سامانە، بەمەبەستی بەدەستهێنانی کانزا بەنرخەکان. ئەم ولأتانە هەولیاندا داگیرگەو ئیمراتۆریەت بۆخۆیان دابمەزرێنن. هەموو ئەمانە وایانکرد بەدرێژایی سەدەی حەڤدەو هەژدە ململانێیەکی توندوتیژ سەرهەلبدات لەنێوان ئەم دەولەتانە. دواتر سەریکێشا بۆ لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیاو پرتوگال.

### کاریگەری سەرمایەداری لەسەر کۆمەلگەی ئەوروپی:-

سەرمایەداری نویێ هانی پاشاو حکومەتە نەتەوەییەکانی دا کە بزاڤی گەڕان‌و دۆزینەوەکان بە جولەبخەن‌و داگیرگە لە پشتەوەی دەریاکاندابمەزرێنن. بازرگانی گۆڕانی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی لەڕووی

ئاڕاستەو بەڕێوەبردن و برەکەیەوە "چەندیەتی کەلوپەلی بازرگانی پێوەکراو". بازرگانی لە ئاڕاستەی ڕۆیشتنیدا گۆڕانی بەسەرداهات. ئەمەش خۆی دەبینیەوە لە گوێزرانەوەی ڕێرەوی بازرگانی لە باشورو باشوری خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوای ئەوروپا. لەدەریای ناوەڕاستەوە بۆ زەریای ئەتلەسی. وە بەڕێوەبردنی بازرگانی دیسان گۆڕانی بەسەرداهات. ئەم گۆڕانەش بریتی بوو لە بەڕێوەبردنی کاری بازرگانی لەلایەن دەوڵەت یان حکومەتە نەتەوەییەکان. چونکە پێشتر دەسەڵاتی شارەکان بە پرۆسەی بازرگانی هەڵدەستان.

هەروەها لە بواری برو چەندیەتیەوە گۆڕانی بەسەردا هات. لەدوای سەرهەڵدانی سەرمایەداری نوێ، کەشتیەکان گەورەترو تیژڕەوتر بوون و کەلوپەلی جۆراوجۆرو برێکی زۆرتری باردەکرد. لەئەنجامی ئەمانەشدا ئەوروپا فراوان بوو سەرمایەداری گەشەی سەند، کەمالیات و فەنتازی ئاسیا خرۆشا وپەلی هاویشت ڕووەو ئەوروپا. پێشوازی ئەوروپیەکان لە هەمبەربەرهەم و ماددەی ئاسیا زۆر گەرم و گوڕبوو، بەتایبەتبەرهەمی وەك: "بەهارات بەهەموو جۆرەکانیەوە، لۆکە، ئاوریشم، شەکر، قاوە، چا، عاج، سەندەڵ، دارو تەختە،...هتد"، کە ئەمانە لەو بەرهەمانە بوون کەلەلای ئەوروپیەکان وەچنگ نەدەکەوت. "زێڕو زیوو توتیا وپەتاتەو کاکاوو داری ماگۆنی-یش" لە ئەفریقا هاوردە دەکرا.ئەوروپیەکانیش لەبەرامبەردا "ئەسپ و مانگاو

میوەی وەك: زەیتون، تریێ، سەوزەوات، زەلی شەکر،میوە مزرەمەنیەکانیان، هەناردە دەکرد بۆ ئەمریکا. سەرەڕای ئەمانەش بەرهەمی پیشەسازی خوریو لۆکەو باروتو دروستکراوە کانزاییو فەخاریەکانیان دەناردە دەرەوە.

## شۆڕشی ئاینی و چاکسازی نێو ئاین:-

گۆڕانی سیاسیو ئابووریو کۆمەلآیەتی، بوونە هۆی ئەوەی دامەزراوە کۆنەکان نەسازێنو توانای ڕوبەڕووبوونەوەی پێداویستیە تازەکانیان نەمێنێت. ئیدی ستەمو یاخی بوون بلآوبوویەوەو ئاژاوەو شلەژاوی هەموو لایەکی گرتبویەوەو بارودۆخ تەواو ناهەموار ببوو. بێ گومان شۆڕش بەبێ ورووژاندن ڕونادات، کاتێکیش وەکو بورکان تەقیەوە، تۆڵەی ڕابردو دەکاتەوەو ئەوچارەسەریانە بەدەستدەهێنێ کە بۆ کێشەکانی کۆمەڵگە چارەسەرن.

بەڕاستی سەردەمی شۆڕشو چاکسازی ئاینی سەردەمی ئەو گۆڕانە بەرفراوانە بوو کە سەرجەم لایەنەکانی گرتبۆوە. شۆڕشی ئاینی دەرەنجامی گەلێ هۆکار بوو. سەرەڕای هۆی ئاینی، هەریەکە لە هۆشیاری نەتەوەییو هەڵپەی بنەماڵە پاشایەتیەکانو ناکۆکیەکانیان و، بزوتنەوەی هزریو مرۆگەریو دۆزینەوە جوگرافیەکانو پێشکەوتنی ئابووریو سەرهەڵدانی چینی ناوەڕاستو سەرمایەداریەتی نوێ، لەو هۆکارانە بوون کە لەپاڵ هۆی ئاینی، زەمینیەی شۆڕی ئاینیان خۆش کرد.

خەڵکی هەستیان دەکرد کە گەندەڵیەکی گەورە کڵێسای داپۆشیوە. ئەم گەندەڵیانە گەلێ زۆربوون. خراپەکاری قەشەو پیاوانی ئاینیو سەپاندنی باجی زۆر بەناوی ئاینو دواکەوتوویی تەعالیمی ئاینی بەبەراورد لەگەڵ پێشکەوتووی کۆمەڵگەی ئەورووپی لەنیشانەکانی گەندەڵ بوونی ئەم کڵێسایە

بــوون.هەریەکــە لەمانــە بوونــە هــۆی ئــەوەی خــەڵکی بــیر لــە گــۆڕان بکەنەوەلەسیستەمی ئاینی.

توانجوپلار لە کڵێسا دەدرا وەك دامەزراوەیـەکی ئـاینی، نـەوەك لـە دژی هەنـدێ پیـاوی ئـاینی گەنـدەڵکار[1]. لەملاشـەوە مرۆگـەرو ڕۆشـنبیران کـە ڕەخنەیان لەکڵێسا دەگرت، خاوەنی یەکیەتی نەبوون، بەڵکو چەندین گروپو کۆمەڵەی جیاجیا بـوون لەکۆمەڵگـەدا. ئەمـە لەکاتێکدا هـەموویان داخـوازی چاکسازی بـوون لـە جـوغزی کڵێـسادا. دەسـەڵاتی پادشـاش لـەم کاتـەدا دەسەڵاتێکی بەرفراوان بوو، زۆرجـار بـەبێ لەبەرچـاوگرتنی هەسـتو نەسـتی خەڵکی ئەم دەسەڵاتەی بەکاردەهێنا. کڵێسا لەم کاتەدا بەشێوەیەك بوو، کـە زۆر لەچـینو توێـژەکان بەکۆسـپی سـەر ڕێگـەی خۆیـان دەزانـی. ئـەوەتا: مرۆگەران گازەندەی ئەوەیان لەکڵێسا دەکرد، کە لەگەڵ پێـشکەوتنی فیکـرو هزردا ناڕواتو لەگەڵی هەڵناکات. بەهەمانـشێوە چـینی بۆرجـوازی هەسـتیان دەکرد کە پیاوانی ئاینی دەست لە کاروبـاری ئـابووریو زانـستیو بوارەکـانی تر وەردەدەن، لەکاتێکدا ئـەم بوارانـە پەیوەنـدی بـە دونیـاوە هەیـە، نـەوەك پەیوەنـدی هـەبێت بـە داموو دەزگـای کڵێـسا. لـەم لاشـەوە پادشـاو مـیرو خانەدانـەکان ئێرەییـان بـە پاپـاو پیـاوانی ئـاینی دەبـرد، کـاتێ دەیـانبینی خاوەنی ئەم دەسەڵاتە بەرفراوانەنو بەهۆیـەوە سـامانێکی زۆر کۆدەکەنـەوە بەناوی باجی "قدیس بترسو باجی تەوبەو هاوسـەرگیری.....هتـد"، لـە پـاڵ

---

1 Louis Gottschalk Europe and Modern World Chicago، 1951، pp. 149-151.

هەمووئەو بەخشش‌و خەڵاتانەش کە بۆیان دێت‌و خەزێنەکانیانی پێ سیخناخ دەکەن.

بەکورتی گشت خەڵکی لەم کاتەدا دەسەلاتی بەرفراوانی کلێسایان دەبینی‌و هەستیان دەکرد ئەم دەسەلاتە لەگەڵ کۆمەڵگەی ئەوروپی ناگونجێ، کاتێك کۆمەڵگەی ئەوروپی ڕووی کردبووە پێکهێنانی حکومەتی نەتەوەیی یەکگرتووی خاوەن سەروەری، کە لایەنگری چەندان دین‌و مەزهەبە[1]. کلێسای کاسۆلیکیش خاوەنی دەسەلاتێکە کە سنوری جوگرافی ناناسێ.

## کلێسای کاسۆلیکی لە سەدەکانی ناوەڕاست

کلێسای کاسۆلیکی لەژێر سایەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی سەریهەڵداو لەهەناوی ئەودا گەشەی کرد. پاش ئاوابونی ئەم دەوڵەتە مەزنەش، کلێسای کاسۆلیکی لەڕۆمادا شوێنی گرتەوە. کلێسا بە شێوەیەکی هەرەمی ڕێکخرا، کە پاپا لە لوتکەی هەرەمدا بوو لەلایەن ئەنجومەنی کاردینالەوە هەڵبژێردرا. ئەوانەشی لەخوار پاپاوە بوون لەپلەی کاردینالڵ دابوون. پاشان سەرۆکی ئوسقوف، ئەمجا قەشە، کە ئەمانە هەڵدەستان بە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کلێساو موڵکەکانی. لەبەر ئەوە بە فەرمانبەرانی کلێسا یاخود مۆزەفە دونیاییەکان ناودەبران. هەروەها بەشێك لەمانە حوکمی هەندێ شارو هەرێمیان دەکرد. چینی ژێرەوەی ئەمانە خزمەتکارانی کلێسا بوون‌و بریتی

1 IB ID.

بوون لەپیاو وئافرەتە ڕەبەنەکان. ئەمانە وازیان لە دونیا هێنابوو زیاتر خەریکی خواپەرستی بوون بۆ ڕۆژی دوایی، یاخود ئامۆژگاری کردنی خەڵکی. هەروەها پێیان دەوتن: پیاوانی ئاینی * . لەمەوە شێوازی ڕێکخستنی کڵێسا لەگەڵ ڕێکخستنی ئیمپراتۆری لەیەك دەچوو، کاتێ دەبینین پاپا هاوشانی ئیمپراتۆرەو، ئەنجومەنی کاردینالێ هاوئاستی ئەنجومەنی پیرانە، کە بەرپرس بوون لە هەڵبژاردنی ئیمپراتۆر، ئەوانەشی سەرۆکایەتی ئوسقوفەکانیان دەکرد، هاوشێوەی دەسەلاتداری هەرێمەکان بون. لەمەوە ئەوە دەردەکەوێ کە کڵێسای کاسۆلیکی ویستویەتی شوێنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بگرێتەوە لە سەرجەم لایەنەکاندا.

کڵێسای کاسۆلیکی خاوەنی زەویەکی بەرفراوان بوو لە ئەورووپا، هەروەها یاساو دادگای تایبەتی خۆی هەبوو، چاودێری پێکهێنانی هاوسەرگیریو میراتو ڕاسپاردەکانی مردوی دەکرد. لەملاشەوە لەڕێگەی فەرمانبەرانی

---

-* پلەو پایەکانی کڵێسا بەم شێوەیە بوو: 1 پاپا گەورەی هەموو مەسیحیەکان بوو.2-کاردینالێ سەرۆکی چەند کڵێسایەك بوو لەهەرێمێکدا، وە لەهەڵبژاردنی پاپا بەژداری دەکرد. 3-ئوسقف سەرۆکی چەند کڵێسایەك بوو لە ناوچەیەکداو لەخوار کاردینالەوە بوو.4-قەشە سەرۆکی کڵێسایەك بوو.5- خزمەتکارانی کڵێسا خۆیان تەرخان کردبوو بۆ دوارۆژ. جائەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە ئافرەت بۆی نەبوو بگاتە پلەو پایەکانی کڵێسا جگەلە پلەی پێنجەم نەبێت، واتا چوار پۆستەکانی تر تایبەت بوون بە پیاوان، هەربۆیە لەئەورووپادا بە کەسێکی ئاینیان دەوت: پیاوی ئاینی. لەناو ئێمەشدا ئەم دەستەواژەیە "پیاوانی ئاینی" بەهەڵە بەکاردەهێنرێ لەهەمبەر زانایانی ئاینی دا، چونکە لەئاینی ئیسلامدا ئافرەتو پیاو وەك یەك دەتوانن خۆیان پرزانست بکەنو هەرکامیان زانابێت دەتوانێ فەتوا بدات. پێشم وایە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە هەڵەیە، کاتێك دەبێتە هۆی تایبەت کردنی زانستە شەرعیەکان بەپیاوان. وەرگێڕ

کڵێساوە سەرپەرشتی قوتابخانەکانو زانکۆو پەناگەو نەخۆشخانەکانیان دەکرد. لە هەموو ئەمانەشدا کڵێسا سودمەند بوو لە دەسەڵاتێکی سیاسی مەزن، کە بەهۆیەوە باجی بەسەر خەڵکدا دەسەپاندو دەستی لە کاروباری دەوڵەت وەردەدا. لە خۆرئاوادا پاپا سەرۆکی کڵێسای کاسۆلیکی بوو، سەرۆکی ئەنجومەنی کاردینالْ بوو. ئەم ئەنجومەنە پێکهاتبوو لە گەورەپیاوە ئاینیەکانی کاسۆلیکی.

کتێبی پیرۆز بەشێوەیەك پارێزگاری لێدەکرا، کە لە توانای هیچ پاپاو ئەنجومەنێك دانەبوو، دەقێك لەدەقەکانی کتێبی پیرۆز یان دەقێکی پەرتوکی قدیسە پێشینەکان دەستکاری بکات، وە هیچ کات نەیاندەتوانی یاسایەك دابڕێژن کە لەگەڵ دەقێکی ئینجیل پێچەوانە بێت.

## هەوڵەکانی کۆتکردنی دەسەلاتی پاپا:-

لەسەرەتای سەدەی پازدە هەندێ لەپیاوانی ئاینی شانبەشانی هەندێ لەڕۆشنبیران هەستان بە سازدانی جولانەوەیەك بەمەبەستی کۆتکردنی دەسەلاتی پاپاو زیادکردنی دەسەلاتی ئەنجومەن، بەشێوەیەك کە ئەنجومەن سەرچاوەی یاسادانان بێت لەجیاتی پاپا. هەردوو کۆنگرەی کونستانس 1414–1418، گوزارشت بوون لەو هەولانەی کە دەدران بۆ ئەوەی کڵێسا زیاتر بە دیموکراتیزە بکرێت. بەلام پاپا لەدژی هەموو ئەو هەولانە وەستا کە دەبوونە هۆی کۆتکردنی دەسەلاتەکەی. لە کۆنگرەی سێیەمیش کە لەفلۆرەنسا بەسترا لەسالانی 1438–1442 ئەندامانی کۆنگرە ناڕەزاییان

دەربڕی، وەلێ سەرکەوتنی کۆتایی بۆ پاپا بوو کە پاپا بە ئۆتۆکراتیانە پیادەی دەسەلاّتێکی ڕەهای دەکرد.

**دەسەلاّتەکانی پاپا:-**

دەسەلاّتەکانی پاپا خۆی دەبینیەوە لە :-

1- پاپا، بریتیە لە دەسەلاّتی هەرەبەرز سەبارەت بە دەرکردنی هەر بڕیارێکی تایبەت بە کلّێسا. هەروەها هیچ دەسەلاّتێکی ئەوسا نەیدەتوانی مەراسیمەکانی پشتگوێ بخاتو هیچ ئەنجومەنێکیش نەیدەتوانی بەبێ ڕەزامەندی ئەو هیچ یاسایەك دابڕێژێت. دەسەلاّتی پاپا بەشێوەیەك فراوانبوو کە مەگەر کەسێك سەرپێچییەکی ئاینی ئەنجام دابایە، ئەگینا پاپا دەیتوانی لە هەرکەسێك خۆشبێت گەر گەرەکی بوایە، هەرچەندە تاوانەکەی گەورە بوایە یاخود سەرپێچییەکی گەورەی یاسایی بوایە.

2- پاپا حاکمی هەرە بالاّی جیهانی کاسۆلیکی بوو، دادگای پاپەوی پێی دەوترا "بیکریا" کەوەك سەرچاوەی هەرە بالاّ بوو بۆ تەواوی دادگاکانی تر لە جیهانی کاسۆلیکدا.

3- پاپا سەرۆکی بەڕێوەبردنو روحی بوو بۆ کلّێسای کاسۆلیکی، هەر ئەویش سەرجەم کارمەندانی گەورەی کلّێسای دادەمەزراندو دەیگواستنەوە. ڕەبەنە ئاساییەکان ڕاستەوخۆ بەخۆیەوە پەیوەست بوون. ئەم ڕەبەنانەشی دەنارده کۆشکی پاشاکان بۆ جێبەجێ کردنی کارەکان.

4- هەندێ لەئیمپراتۆرەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز، وەك:- "چارلسی پێنجەم(1529)، شارلمان، ئۆتۆی مەزن...هتد"، بە ڕەزامەندی

پاپا تاجی ئیمپراتۆریان خستە سەر. بەشێکیشیان بەبێ هیچ کارێکی پێش وەخت ڕەزامەندیان بەدەستهێناوەو تاجیان خستۆتە سەر. هەندێ لە ئیمپراتۆرەکانیش، وەك: "هنری چوارەم، فردریکی دووەم، لویسی پاڤاری"، لەلایەن پاپاوە فەرمانی بێ بەری بون (تحریم)یان بۆ دەرکراوە. پاپا وەك پاشایەکی ڕەها لە ڕۆماو دەوروبەری حوکمی دەکردو لە دەسەلاتی داهەبوو هەر جۆرە یاسایەك ڕەتکاتەوە کە لەگەڵ بەرژەوەندی کڵێسای کاسۆلیکی نەسازێت، جا لە هەر دەوڵەتێ بوایە.

5- پاپا دەسەلاتێکی دارایی هەبوو دەیتوانی تێچونەکانی کڵێسا بە باجی دەیەكو هەندێ باجی تر کە لەبەرامبەر خزمەتگوزاری ڕۆما وەردەگیرا پڕبکاتەوە. ئەمەو جگە لە باجی قدیس بترس کە لە هەموو خێزانێکی کاسۆلیکی وەردەگیرا.

**پەیامی کڵێسای مەسیحی:-**

لە تەعالیمەکانی کڵێسای مەسیحیدا هاتووە، هەروەك کڵێساش بانگەشەی بۆ دەکرد بەوەی کە مەبەست لەکڵێسای مەسیحی بەگوێرەی ئاینی مەسیحی ڕزگارکردنی مرۆڤە لە سەرپێچیو سزای تاهەتایی، وە هیچ کەس ڕزگاری نابێت لەو سزایە جگە لە کەسێك کە سەر بە کڵێسای مەسیحی بێت.

لێرەدا پێویستە لێکۆڵینەوەیەك بکەین لەبارەی "لاهوتو نهێنیە پیرۆزەکان"و تارادەیەك بیانخەینە بەرباس. "لاهوت" لێکۆڵینەوەو خوێندن بووسەبارەت بە خودا. بریتی بوو لەلێکۆڵینەوە کردن لەبارەی پرسە گرنگەکانی، وەك بۆچی مرۆڤ ئافرێنرا؟ پەیوەندی مرۆڤ چی یە بەخودا؟

چارەنوسی مرۆڤ لە داهاتوودا بەچی دەگات؟ بەناوبانگترین فەیلەسوفی ئەم بوارەش، "توماس ئەکویناس" بوو، کە لە ئینجیلو تەوراتو یاساکانی کڵێساو فەلسەفەی "ئەرستۆتالیس" لێکۆڵینەوەی کردو لەژێر ڕۆشنایی ئەم لێکۆڵینەوانەدا بناغەی ڕەوشتی بۆ کڵێسا دانا.

نهێنیە پیرۆزەکانیش بەشێبوون لەلاهوتو تاکە هۆکاری ڕزگاری مرۆڤ بوو لەسزای تاهەتایی. لەبەرئەوە کڵێسا بە پەرۆشەوە ئەم نهێنیانەی پیادە کرد. ئەم نهێنیانە بەوە ناسرابوون کە پەیوەندیەکی ڕواڵەتیەو "عیسا" مەسیح لەپێناوی دەستخستنی چاودێریو ڕەحمەتی خودا داینـاون. نهێنی پیرۆز بریتی بوون لەحەوت نهێنی بەم شێوەیەی خوارەوە:-

1- ڕاگیرکردن:- شۆردنی منداڵ بوو بە ئاوی پیرۆز، بەمەبەستی خاوێن کردنەوەی منداڵ لەتاوانی یەکەمو هەموو ئەو سەپێچیانەی کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات لە ژیانیدا. هەروەها منداڵ لەپاش ڕاگیرکردن دەبووە مەسیحی. شایەنی باسە قەشە ئەنجامدانی کاری ڕاگیرکردن یان خاوێنکردنەوەی لەئەستۆ بوو.

2- چەسپاندن:- ئوسقوف هەڵدەستا بە شۆردنی گەنجی مەسیحی بە زەیتی پیرۆز، بۆ ئەوەی گیانی پیرۆز لەناو لاشەیدا جێگیربێت. ئیدی لەدوای ئەمە دەبوو بەئیمانداریکی بەهێز.

3- نهێنی تەوبە:- ئەمە گرنگترینی نهێنیەکان بوو لەئاینی مەسیحیداو مەبەستیش لێی بەدەستهێنانی لێخۆشبوون بوو لەبەرامبەر ئەو تاوانانەی کە مرۆڤ لەدوای ڕاگیرکردن توشی بووە. پێویست بوو لەسەر تەوبەکار دەرونو

ویژدانی خۆی بخاتە ژێر لێکۆڵینەوەو بە ڕابردووی خۆیدا بچێتەوە، هەروەها هەست بەئازاری ویژدان بکاتو سەرکۆنەی نەفسی خۆی بکات، پاشان بڕیاربدات چیدی لەفەرمانی خودا دەرنەچێ. لەپاش ئەمە لەسەر دەستی قەشە تەوبەی دەکردو دانی بە گوناهەکانی دا دەنا، بەمەش لێخۆشبونی لەقەشەوە مسۆگەر دەکرد. جا بۆ ئەوەی تەوبەکەی گیرا بێت, پێویست بوو لەسەری سەردانی کڵێسا بکاتو هەندێ پاڕانەوە بکات. لەدوای ئەمانە بڕێ بەخششو سەدەقە بدات بەو شێوەی کە قەشە لەسەری پێویست دەکرد. هەموو ئەم کارانەش بە کارە پەسەندو باشەکان ناوزەد کرابوو.

4- نهێنی تێکەڵکردن"خوانی خودایی":- بریتی بوو لە تێکەڵکردنی "نانو مەی" بە ئامادەبوونی ئوسقوف یان قەشە کەبە "خوانی خودایی"ناسرابوو. ئەم نانو مەی یە تێکەڵکراوە لەکاتی ئاماژەدانی قەشە یان ئوسقوف، دەگۆڕا بۆ خوێنو گۆشتی مەسیح "د-خ"."ئەم گۆڕانە شتێکی مەعنەوی بوو نەوەك بەرهەست" . ئەم پەرجووە(معجیزە)یە ناسرابووبە: Transubstantiation.

5- سڕینەوەی پیرۆز، بریتی بوو لە چەورکردنی لاشەی نەخۆش کە لەسەر لێواری مردن بوو. قەشە بەم ڕۆنە چەوری دەکرد بۆ بەهێزکردنی ئیمانی.

6- نهێنی قەشە:- بریتی بوو لەپیرۆزبایی کردنی ئوسقوف لەپیاوی ئاینی، کە تازە پۆستی ئاینی وەردەگرت، بەمەبەستی بەسەرا ڕژانی فەڕو ڕەحمەتو توانا لەجێبەجێ کردنی ئەرکە ئاینیەکانیدا.

7- نهێنــی هاوســەرگیری:ــ مــارە بــڕین نهێنیــەکی پــیرۆز بــوو. بــە یەکگەیشتنێکی تاهەتایی بوو لەنێوان پیـاو ئافرەتـداو بـە هۆکـارە مرۆڤیـەکان هەڵنەدەوەشایەوە[1].

ئەمانە چەند بنەمایەکی ئاینی مەسیحی بوون لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتداو هیچ کەسێك بۆی نەبوو گومانی لە ڕاستیو دروستیان هەبێت، یـاخود هـەوڵی گـۆڕینو دەسـتکاری کردنیـان بـدات. وەڵێ ئـەم بارودۆخـە بـە بڵاوبوونـەوەی بزوتنـەوەی کلاسـیکیو مرۆگـەری(هیومـانیزم)و فێرکـاری تـازە کـە لەسـەر شارسـتانی یۆنـانیو ڕۆمـانی کـۆن وەسـتابوو، هـەروەها بـەهۆی دۆزینـەوە جوگرافیەکانو پێشکەوتنی ئـابووریو سـەرهەڵدانی سـەرمایەداریەتی نـویێو گەشە کردنی چینی ناوەڕاست لەلایەك، لەلایـەکی تریـشەوە هەڵپـەی بنەماڵـە پاشایەتیەکانو ناکۆکیەکانیانو پەخشان بـوونی هۆشـی نەتـەوەیی، گـۆڕانی بەسەرداهاتو بوونە هۆی گۆڕینی سروشتو شێوازی بیرکردنـەوەی خـەڵکی. ئیـدی ئارەزوویـەکی زۆر لـەناو خەڵکیـدا پەیـدابوو بـۆ شارسـتانیەتی بـت پەرستی، هەروەها حەزیان دەکرد چێژ لەژیان وەرگرنو نـەریتی مەسـیحیەت لابدەن کە ڕاوەستابوو لەسەر دونیا نەویستیو خۆگرتنەوە لە خۆشیەکان.

زۆرێـك لـە مـیرو پاشـاو خـاوەن سـەرمایەو بازرگانـان ڕۆچـون لـە چـێژو ئـارەزودا. زۆرێکـیش لـە پیـاوانی ئـاینی لـەم چـێژو ئارەزوبازیـە تێـوەگلان. تەنانەت هەندێ لە پاپاکان کاروباری ئاینیەکانیان فەرامۆش کردبوو.

---

1 Hayes، op. cit; pp. 136-219

## گەندەڵیەکانی کلێسـا

گەندەڵی سیاسی:ـ

لـەماوەی سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا کلێـسای کاسـۆلیکی لـەپاڵ دەسـەڵاتە ئاینیەکەی پیادەی دەسـەڵاتێکی سیاسـی بـەرفراوانی دەکـرد. فەرمانبـەرانی کلێساو پاپـاو ئوسـقوفەو قەشـەکان ڕێکخـستنێکی ئـاینی تۆکمـەیان دەبـرد بـەڕێوە، کـە لـق وپۆپـەکانی لەسـەرجەم ناوچـەکانی ئـەوروپای خۆرئـاواو ناوەڕاسـتدا بڵاوبووبوویـەوە. ئەمانەسـەربەخۆبوون‌و بانگەشـەی بـەرزی "گـەورەیی" خـۆی دەکـرد بەسـەر دەوڵـەت‌و هـەموو جـۆرە دەسـەڵاتێکی سیاسیدا. کلێسا خاوەنی ڕوبەرێکی بەرفراوانی زەوی‌و زار بوو کە داهاتەکەی بۆخـۆی بـەکاردەهێنا.ئـەم سیستەمە ملکەچـنەبوو بـۆ باجـەکانی دەوڵـەت‌و باجی خۆیشی سەپاند بوو بەسەر شـوێنکەوتەکانی، ئەمـەو جگـە لەهـەبوونی دادگای تایبەت بە خۆی.

کلێسا بەشێوەیەك توشی گەندەڵی‌و بێ سەروبەرەیی ببوو، کە لـەکۆتایی سـەدەی پـازدەو سـەرەتای سـەدەی شـازدە ناتـەواوی‌و ئـابڕو چـونەکانی لەسەرانسەری ئەوروپادا بڵاوببوویەوە. پاپا ئەسکەندەری شەشەم (1492-1503) یەکێکە لەو پاپایانەی کە لـە خراپـەو بـێ ڕەوشـتیدا نغـرۆ ببـوو لـە داوێـن پیـسیدا گەیـشتبووە لوتکـە. "ئەسـکەندەری شەشـەم" هـەوڵی خـۆی چڕکردبۆوە لەکۆکردنەوەی سەروەت‌و سامان، جا بەهەر هۆیەك بۆی لوابایـە، ئەمەش بۆ مەبەستی دەستخستنی میرنشین بۆ کـوڕە ناشـەرعیەکەی"سـیزار بورجیـا"و کـچەکەی"لیکـریس بورجیـا". ئـەم گەنـدەڵی‌و ئابڕوچـوونە لـەناو

زۆرێك لەپاپاكاندا تەشەنەی سەندبوو. ئەوەتا دەبینین، "جۆلیسی دووەم" كە لەسالآنی 1503–1513 لەپۆستی پاپەویەت دابوو، هەمیشە ئارەزوی جەنگی دەكردو سامانو مەملەكەتەكانی پاپەوی بەهێزدەكردو زۆر هەولّی دەدا فەرەنسیەكان لە ئیتالیا دەربكات. لەبەر ئەوە سەرقالّی سازكردنی پیلانو نەخشە بوو لەگەلّ میرەكانی ئیتالیاو ولآتانی بیانی. ئەمەش وای لێكردبوو زۆر بە سیاسەتەوە سەرقالّ بێت. وەلیّ پاپا "لیوی دەیەم"ی كوڕی لۆرینزۆی مەزن1513–1521، وەك ئەوانی پێش خۆی نەبوو، بەلّكو ئەوگرنگیدا بە بزوتنەوەی هزریو فێركاری نویّو دنەی هونەرو ئەدەبی دەدا. بەلآم بەهەموو شێوەیەكیش هەولّی كۆكردنەوەی داهاتو سامانی دەدا بەمەبەستی نۆژەنكردنەوەی كلّێسای "قدیس بترس" لە ڤاتیكان.

پیاوانی ئاینیش شوێنی پاپاكان كەوتنو وەك ئەوان لەسەر حسابی كلّێسا كەوتنە هەلّپەی كۆكردنەوەی سامانو هەولّدان بۆ خۆشگوزەرانیو ڕۆچون لەئارەزووەكان. زۆرێك لەوان بە گەورەو بچوكیان بەدوای دنیاداریدا بوونو هیچ گرنگیان بە كاروباری ئاینی نەدەدا، بەلّكو لەبری ئایینداری بون بە سیاسەتوانێكی پیلانگێڕ، یاخود بوون بەكەسانێكی سامان ویستو بە هۆكاری جیاجیا كەوتنە كۆكردنەوەی مالّو دارایی، ئەمجا لە ئارەزووەكانیاندا سەرفیان دەكرد. بەلآم لەگەلّ ئەمانەشدا كلّێسا بەتالّ نەبوو لەپیاوی دلّسۆزو دلگەرم كە هەمیشە ڕەخنەیان لە گەندەلّیەكانی كلّێسا دەگرتو بە ڕاپۆرتی سالآنەیان پاپایان لەم گەندەلّیو بیّ سەروبەرەییانە

هۆشداری دەداو پێویستی چاکسازیان بە ئەرکی گرنگ دەزانیو پاپایان لێ ئاگادار دەکردەوە.

## گەندەڵی لەڕووی ئابووری:-

کڵێسای کاسۆلیکی خاوەنی زەویەکی بەرفراوان بوو لەئەوروپا، ئەم زەویانەش لە باج دان بەخشرا بوونو هیچ باجێك نەیدەگرتنەوە. پیاوانی ئاینیش هەر لەسەر ئەم زەویانە داهاتی ساڵانەی پێدەدرا. یەکێ لەبنەما باوەکانی کڵێسا لەم کاتەدا ئەوەبوو کە پیاوی ئاینی لەسەری پێویست بوو لەساڵی یەکەمی دامەزراندنیدا هەندێ لەداهاتی خۆی ببەخشێ بەو کەسەی کە لەسەرووی خۆی بوو، یاخود دەبوو ڕاستەوخۆ بە پاپای بەخشیبایە. شایەنی باسە ئەم بنەمایە لەقەشەوە بۆ پاپا بوو. لەپاڵ ئەمەشدا هەندێ لەئوسقوفەکان برێ لەپۆستەکانی کڵێسایان بۆ خۆیان قۆرغکردبوو، بۆ ئەوەی لەپشتیەوە داهاتێکی زۆر بۆخۆیان بدرونەوە. لەدەرەوەی ئیتاڵیاشدا زۆرێك لەپیاوانی ئاینی لەگەڵ ئەوەی کە داهاتی کڵێساشیان هەبوو، بەلاّم لە شوێنەکانیاندا کاریان نەدەکرد. سەرەڕای هەموو ئەمانەش باجی کڵێسا لە سەرجەم جیهانی کاسۆلیکی کۆدەکرایەوەو بەرەو ڕۆما بەڕێ دەخرا، ئەمەو جگە لەو دیاریو خەلاّتانەی بۆیان دەچوو. بەلاّم وەنەبێ خەڵکی بێ ئاگا بێت، یان لەم بارودۆخە نالەبارە ڕازی بووبن، بەڵکو زۆرێك لەخەڵکی ئەوروپا توانجیان لەپاپا دەگرتو تاوانباریان دەکرد بە بەکارهێنانی مەسحیە خاوەن ڕێزەکانی دەرەوەی ئیتاڵیا بۆبەرژەوەندی ئیتاڵیا گەندو بەدڕەفتارەکان.

هەر لەم سەرو بەندەدا سەرمایەداری بەرەوخەملّین و پەرەسەندن دەچوو. چینی ناوەڕاست و خانەدانەکانیش بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان شوڵیان لێ هەڵکێشا بوو، زۆر بە تاسەی سەروەت و سامانی زۆری کڵێساوە بوون و چاویان تێبڕی بوو، کە تەنها گەورە پیاوانی ئاینی سودیان لێ دەبینی. ئەمەو جگە لەو زەویە بەندکراوانەی کە کڵێسا خۆی خاوەنی بوو. ئەمانە لە دەوڵەتیان دەویست کە دەست بەسەر سەروەت و سامانی کڵێسادا بگرێ و لەپڕۆژەی پڕبەرهەم بیخاتە گەڕ. لەم نێوانەشدا چینی ناوەڕاست پشکی شێری بەرکەوت. میرو پاشاکانیش وەك چینی ناوەڕاست و بگرە لەوان زێدەتر لەهەوڵی دانانی سنورێك دابوون بۆ دەسەڵاتی سیاسی وئابووری کڵێسا، ئەمەش لەپێناوی چەسپاندنی دەسەڵاتی پاشاو دەستێوەردانی دەوڵەت لەکاروباری کڵێساو دەستگرتن بەسەر سەروەت و سامانیدا. لەمەوە دەتوانین بڵێین پیاوانی کارو سەرمایەدار ڕێگەخۆشکەر بوون بۆ شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکانی سەدەی شازدە، سەرەڕای شۆڕشی ئاینی. پادشاو میرەکان نەوەك هەر لەدژ بەرهەڵستکاریەکانی کڵێسا ڕانەوەستان، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی خۆیان زیاتر گرنگیان پێداو گەرم و گوڕتریان کرد. وە لەهەمان کاتیشدا هەوڵی گوێزانەوەی دەسەلاتی ئابووریان دا لە پیاوانی ئاینیەوە بۆ سەرمایەداران. دەتوانین ئەمەبە یەکێك لە ئاکام وهۆکارەکانی سەرهەڵدانی سەرمایەداری نوێ دابنێین.

لەگرنگترین ئەو مەترسیانەی کە لەسەر کڵێسا بوو، توانج و پلاری بیرمەندان و مرۆگەران و سکاڵای جوتیاران و پیشەوەران بوو، کە هەموویان بۆنی شۆڕشێکیان لێدەهات و زەنگی هەڵگیرسانیان لێدەدا.

هەر لەسەدەی شازدەدا ململانێی سیاسی گەیشتە لوتکە. پادشاکان ئەوانەی توانیان دەرەبەگایەتی لەناو بەرنو حکومەتی نەتەوەیی دامەزرێنن، هانی بلاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیان دەداو هەوڵی بەهێزکردنی دەسەلاتو زۆرکردنی داهاتی نەتەوەییان دەدا. ئەوانە کەمتەرخەم نەبوون لەسەرکزکردنی کڵێساو دەستگرتن بەسەر سەروەتو سامانیداو دابەشکردنی بەسەر شوێنکەوتوەکانیاندا، وەخستنە پاڵی کڵێسا بۆ سەر دەسەلاتی خۆیان. بەشێك لەپادشاکان لەترسی ئەوەی چاکسازی هەڵپەو هەوڵی ئەوان بۆ بەدەستهێنانی سامانی کڵێسا لەکاربخات، خۆیان خستە ڕیزی پێشەوەی شۆڕشگێڕانی دژ بە کڵێسا.

## بەرهەڵستکاریە ئاینیەکانی پێش لۆسەر:-

بەڕاستی بەرەنگاریو بەرهەڵستکاری "ئاریۆسی" لەسەدەی چواری زاینی، لەڕوانگەی کاسۆلیکیدا مەترسیدارترین بەرهەڵستی بوو کە کڵێسا ڕوبەڕووی بوویەوە. لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا جیاوازی نێوان کڵێسای کاسۆلیکیو ئەرسەدۆکسی زیاترو قڵشی نێوانیشیان فراوانتر بوو. هیچ هەوڵێکیش نەبوو بۆ نەهێشتنی ئەم قڵیشە. کاتێك کڵێسای ئەرسۆدۆکسی پاپای کاسۆلیکی بەزەوتکەری دەسەلاتی ئیمپراتۆر دادەنا. هاوکات پاپاکاسۆلیکی کلێسای خۆرهەلاتی تۆمەتباردەکرد بەگوێڕایەڵی کردنی بۆئیمپراتۆری بیزەنتی وپاشکۆکردنی کڵێسا بۆدەولەت. بەم شێوەیە جیاوازی وکەلەبەری نێوان خۆرهەلات وخۆرئاوا فراوانبوو، وە بووبە هۆی لێك ترازانی یەکیەتی ئاینی مەسیحی.

لە ناو کڵێسای کاسۆلکیش بارودۆخ باشترنەبوو، بەڵکو ئەویش لەماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا چەندین گروپو تاقمی جیاجیای لێجودابویەوە. بەجیابونەوەشیان یەکسەر تۆمەتباردەکران بە "هەرتقە"، ئەمەش بەهۆی ڕەت کردنەوەی هەندێ لەبیروڕاکانی کڵێسا. بەناوبانگترینیان بریتی بوو لە "والیدینسە کانی ئیتاڵیاوئەلبیجینسەکانی باشوری فەرەنسا" ، هەروەها "جۆنوێکلف" لە ئینگلتراو "جۆن هس" لەبۆهیمیا. لەلایەکی تریشەوە ململانێی نێوان پاپاو ئیمپراتۆرەکان، یان پادشاو پاپاکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، یەکێکی تر بوو لەو دووبەرەکیانەی کە ئەوەندەی تر کڵێسای کاسۆلیکی لاواز کرد.

هەرچۆنێك بێت، سەرەڕای ئەو هەموو شۆڕشانەی کە لەدژی کڵێسا سازکران، بەڵام کڵێسا توانی بەسەریاندا سەربکەوێتو سەرکوتیان بکات، ئەمەش بەهۆی بەتوانایی کڵێساو پشتیوانی خەڵکی بۆ کڵێساو گوێڕایەڵیو باوەڕداریان. وەلێ لەسەدەی شازدە بەهۆی سەرهەڵدانی پاشایەتی ڕەهاو دەوڵەتی نەتەوەییو پەخشان بوونی هۆشی نەتەوەییو بزوتنەوەی هزریو شارستانی کلاسیکیو دۆزینەوە جوگرافیەکانو سەرهەڵدانی سەرمایەداریەت، بارودۆخەکە زۆر گۆڕانی بەسەرداهات. هەموو ئەمانە بوونە هۆی وریابونەوەی خەڵکی لەگەندەڵیەکانی کڵێساو خەڵکی والێکرد داواکاری چاکسازی بن، یان ئەگەر هاتو ملی بۆ چاکسازی کەچ نەکرد، ئەوا شۆڕشی لەدژ سازکەن.

**مارتن لۆسەر 1483-1546:-**

"مارتن لۆسەر" لەساڵی 1483 لەشاری "ئایزل بین"ی ئەڵمانیا لە دایك بووە. سەرەتای خوێندنی لەلای کۆمەڵەیەك بوو کە ناوی خۆیان نابوو"برایانی ژیانی هاوبەش"لەشاری "مگدبرگ". پاش ئەمە لە زانکۆی "ئیرفۆت" لەبواری لاهوتو مرۆیی دەستی بە خوێندنکردو لەساڵی 1505 وەك ڕاهیب دەرچوو. پاشان ڕووی کردە شاری "وتن برگ"و لەزانکۆدا بە مامۆستای وانەی لاهوت دامەزرا.

"لۆسەر" لەناو خوێندکارەکانیدا جێگەی خۆی کردبوەوەو خۆشەویست بوو لەلایانو گوێ بۆ وتەکانی ڕادەگیرا. "لۆسەر" لە ڕادەبریندا ڕاشکاوانە قسەی دەکرد وچاو نەترس بوو. وە لەگەڵ ئەوەی ڕەوانبێژ نەبوو، بەڵام بەهۆی بەهێزی لۆژیکیو بەرزی ئاستی ڕۆشنبیرەکەی، کەسایەتیەکی بەهێزی هەبوو کە بەهۆیەوە بەسەر ڕکەبەرکەیدا زاڵ دەبوو. لەگەنجیدا بێ هیچ دوودڵیو گومانێك باوەڕی بەبیروباوەڕو دروشمەکانی کڵێسای کاسۆلیکی هەبوو. وە کاتێك "مارتن لۆسەر" وەك کەسێکی"زاهید" دونیانەویست لەساڵی 1511 سەردانی ڕۆمانی کرد، تۆوی شۆڕشی لەلای خۆی نەشاردبۆوە.

هەرچەندە لۆسەر کەسێ بوو کە سەرجەم دروشمو ئەرکەکانی بەباشی پیادە دەکردو نوێژو ڕۆژووی ئەنجام دەداولەپاڕانەوە بەردەوام بوو، بەڵام گومانی هەبوو لەوەی ڕەزامەندی خودا بەدەستبهێنێو ڕزگاری بێت لەسزای هەمیشەیی. لەگەڵ ئەوەی لەزانکۆ ئەرستۆو تۆماس ئەکیوناسو هەموو ئەو

شتانەی کە بزوتنەوەی "سیکۆلائیستی" جەختی لەسەر دەکردەوە، دەیخوێند. لۆسەر دوای ئەوەی ناوبانگی پەیدا کرد، دەڵێت: "ئەگەر هاتباو ڕەبەن تەنها بە ڕەبەنیەکەی لێخۆشبوونی دەستگیر بووایەو بەهەشتی بەدەست هێنابایە، ئەوا من دەمێك بوو بەدەستم هێنابوو". ئەم هەروەکو تاوانبار سەیری خۆی دەکرد، تائەو کاتەی یەکێ لەمامۆستاکان ئامۆژگاری کردو ڕای سپارد کە "سنت ئوگستین" بخوێنێتەوە. ئیدی لەوێدا ئەوەی بینیەوە کەتەوبەکار لەڕێگەی باوەڕ بە خودا، ڕەزامەندی خودا بەدەستدێنیێو ڕزگاری دەبێت لەسزای هەمیشەیی. ئەم دڵنیایەی لۆسەر بوو بەهۆی ئەوەی بتوانێت شۆڕش لەدژی کلێسا هەڵبگیرسێنێ. لۆسەر پێداگری دەکرد لەسەر بەزەیی خوداو لێخۆشبونی بەتەنها، لەکاتێکدا کلێسا سوربوو لەسەر باوەڕو کرداری چاكو ئەنجامدانی هەندێ ئەرکی وەك: دان پێداهێنانو خێرو حەج کردن بۆ ڕۆما[1].

شۆڕشەکەی:-

یاخی بونی لۆسەر لەکاسۆلیکیەت بە شێوەیەکی لەسەرخۆو هێواش هێواش بوو، تا ئەو کاتەی ڕەخنەی توندی گرتە "تێتزل"ی نێردراوی پاپا لێوی دەیەم، کە بەمەبەستی فرۆشتنی بلیتی لێخۆشبوون ڕەوانەکرابوو. شیاوی باسە بەهۆی ئەم بلیتەوە، یا ئەوەتا مرۆڤ لێخۆشبونی دەستگیر دەبوو، یان سزای سوك دەکرا.

1 Gott shalk، p. 153.

تیتزل بە فرۆشتنی بلیتی لێخۆشبوون پارەو ماڵی کۆدەکردەوە بۆ بنیاتنانەوەی کلێسای قدیس بترس لەڤاتیکان. جا دوای ئەوەی لۆسەر لەگەڵ تیتزل تێکگیرا، بەیانێکی 95 ماددەیی لەبەر دەرگەی کلێسای "وتن برگ" هەڵواسی‌و تیایدا هێرشی تەواوی کردە سەر کلێسای کاسۆلیکی‌و زۆر لەپایە بنەڕەتیەکانی هەڵوەشاندەوە. لەو ماددانەدا هاتووە کە کلێسا ناتوانێ هیچ کەسێ ڕزگار بکات لەسزاو ئەشکەنجەی خودا. هەروەها کەسی مەسیحی لە ڕێگەی باوەڕی تەواو بەخودا، لێخۆشبوونی خودا بەدەست دەهێنێ‌و هیچ پێویستی بە کرداری چاك نییەو کلێسایەکیش لە ئارادانییە بەو شێوەیەی کە ببێتە گەیەنەری پەیوەندی نێوان بەندەو خودا. چونکە تەوبەکاری ڕاستەقینە لێخۆشبونی خودای دەست دەکەوێ، بەبێ ئەوەی لێخۆش بوونی کلێسای دەستکەوێ. پاپا "لیۆیی دەیەم" ویستی بانگی لۆسەر بکات بۆ ڕۆما، بەمەبەستی پۆزش هێنانەوە سەبارەت بەو کارەی کە ئەنجامی دابوو لەکلێسای وتن برگ، "هەڵواسینی 91 ماددە لەسەر دەرگای کلێسا". بەلام فردریکی میری سەکسۆنیا پاپای لەم بانگهێشتە پاشگەز کردەوە[1].

لە ساڵی 1519 لۆسەر لەشاری "لایبزیك" لەگەڵ یەکێ لەزاناکانی بواری لاهوت گفتوگۆ دەکات‌و لەم گفتوگۆیە دەردەکەوێ کە لۆسەر هەبوونی دەسەلاتی یەزدان لەدەستی پاپا، یاخود ئەنجومەنی پاپەوی لەهەمبەر لێکدانەوەی ئینجیل دا ڕەت دەکاتەوە، وە هەبوونی دەسەلاتێکی لەم شێوەی بە درۆ لەقەڵەم داوە. هەندێ لە بیروڕاکانی لۆسەر لەگەڵ بیروڕاکانی

---

1 -Ibid ; pp. 154-156.

"جۆنهس" چوونیەك بوون، بەتایبەت پرسی هەبوونی پەیوەندی مرۆڤ بە خودا بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ. چونكە جۆنهس و لۆسەر یش باوەڕیان وابوو كە مرۆڤ پەیوەندی ڕاستەخۆی بە خوداوە هەیەو ئەم پەیوەندییە پێویستی بە نێوانی كلێیسا نییە. بەم شێوەیە هیچ پەیوەست بوونێك لەنێوان لۆسەرو كلێسای كاسۆلیكی دا نەما، جگە لەلێك جودایی نەبێت. جیابوونەوەش تەنها پێویستی بە هەنگاوێك بوو، ئەم هەنگاوەشی هەڵنا لەساڵی (1520) .

تێزە شۆڕش ئاساكانی لۆسەر:-

لۆسەر بە بوێرییەكی بێ وێنە لەهەرسێ تێزەكەیدا هێرشی كردە سەر كلێسای كاسۆلیكی. لە تێزی یەكەمدا كە بۆ میرەكانی گەلی ئەڵمانیای نوسی بوو، دەڵێت: "هیچ شتێك نییە داوای پیرۆز بوونی سیستەمی كەهەنوتی بكات. پێوستە پیاوانی ئاینی لەسەرجەم بەربژاریەكانیان دابماڵرێن". هەر لەم تێزەدا لۆسەر بانگی میرو خانەدانەكانی ئەڵمانیا دەكات كە "خۆیان لە دەسەلاتی بێگانە ڕزگار بكەن". هەروەها میرانی ئەڵمانیای وشیار كردەوە "لەپێویستی دەستبەسەرداگرتنی سامان و موڵكی كلێساو ئەوەشی بەمافی ڕەوای ئەوان لە قەڵەم دا". لەتێزی دووەمیدا بەناونیشانی "دیلی بابلی" ، لۆسەر كلێسای بەدیلی ژێردەستی پاپاكان لەقەڵەمداو، دەیچواند بە جولەكەكانی سەردەمی "بەختو نەصر"ی بابلی، كە لەژێر دەستی ئەم پاشایە دیل كرابوون. لۆسەر هەر بەمە نەوەستا، بەڵكو هێرشێكی توندی كردە سەر پاپەویەت و حەوت نهێنیەكە. لەتێزی سێیەمیشدا بەناوی "ئازادی مرۆڤی مەسیحی" دەڵێ: "ڕزگاربوون لە سزا بەهۆی حەوت نهێنیەكەو كرداری

چاکە بەدەست نایەت، بەڵکو لەڕێگەی نائومێدی تاوانبارەکەو دان پیدانانێکی دەرونی(خودی) بە گوناهباریو پاشان خۆ خستنە ژێر سۆزو میهری خودا دێتەدەست، دوای ئەوەی پەشیمان دەبێتەوەو تەوبە دەکاتو ناچێتەوە سەرتاوانو خراپە".

بێبەری کرانی لۆسەرو ئامادەبوونی لەبەردەم "دایت"ی ئەڵمانی لەشاری ورمز 1521:ـ

پاپا "لیۆی دەیەم" لەسەرەتادا ئەم ڕوداوەی تەنها بەدەمەقاڵەی نێوان ڕەبەنەکان لێکدایەوەو باوەڕی وابوو کە بە شێوەیەکی دیبلۆماسی چارەسەر دەکرێت. بەڵام دواتر ئەوەی دەرکەوت ئەوەبوو کە لۆسەر هەستاوە بە بەربەرەکانێی پاپاو هێرش کردنە سەر دەسەلآتی پاپاو ڕەتکردنەوەی بنەماکانی کلێسای کاسۆلیکی. ئەم کارەی ئەو کارێکی هرتقیو هۆیەك بوو بۆ نانەوەی دووبەرەکی. دوو مانگ دانرا بۆئەوەی لۆسەر پەشیمان ببێتەوە، ئەگینا فرمانی بێبەر کرانی بۆ دەردەکرا. پاپا ئەم "فەرمان"ەی بە مۆری ڕەصاص مۆرکرد"ئەو مۆرەی تەنها لەکێشە مەترسیدارەکان بەکار دەهێنرا". بەلآم وەلآمی لۆسەر بۆئەم هۆشداریە زۆر توندتربوو، کاتێك لەبەردەم ئاپۆڕای خەڵكو لەناو دەنگ وسەدای هوتافەکانیان هەستا بە سوتاندنی فەرمانەکەو هەندێ لەنوسراوەکانی یاسای کەنەسی.

لەساڵی 1521 مارتن لۆسەر بانگهێشتکرا بۆ ئامادەبوونی لەبەردەم دایتی ئەڵمانی، کە لەشاری ورمزی ئەڵمانیا بە سەرۆکایەتی "چارلسی پێنجەم" کۆبوویەوە بەمەبستی دادگایی کرانی. نوێنەری پاپا داوای لە

لۆسەر کرد لە هەموو ئەو کارانەی کە پێی هەڵساوە تاکو کاتی ئامادە بوونی لە بەرامبەر "دایت" پاشگەز ببێتەوەو داوای بەخشین بکات. بەلاّم لۆسەر لە بەرامبەر ئیمپراتۆرو سەرجەم ئەو میرانەی کە لەم کۆبونەوەیەدا بەشدار بوون، ئەم داوایەی ڕەت کردەوەو گوتی: "ویژدانم ئەسیرە لای خودا، ناتوانم لە هیچ شتێك ئافەرۆز بکەمو پەشیمان ببمەوە. ڕەوانیە مرۆڤ کارێك بکات پێچەوانەی ویژدانو قەناعەت بێت، لەخودای گەورە داواکارم دەستم بگرێو هاوکاریم بکات". لۆسەر بەم چەند وشەیە کاریگەری لەسەر هەندێ لە میرەکان دانا جگە لە ئیمپراتۆر، کە لەسەر ئەم قسانەی داوای لێکرد هۆڵەکە جێ بهێڵێ. "فردریك"ی میری سەکسۆنیا سەبارەت بەم قسانەی لۆسەر گوتی: "وتەکانی دکتۆر مارتن لۆسەر کاریگەر بوون". لۆسەر بەهۆی ئەوەی ئیمپراتۆر لە ماوەی دادگایکردنەکەیدا دڵنیاییو ئەمانی پێدا، توانی بگەڕێتەوە سەکسۆنیاو لەنێوان ورمزو سەکسۆنیا هاموشۆ بکات.

خۆئەگەر ئیمپراتۆر دڵنیایو ئەمانیشیی بە لۆسەرنەبەخشی با، دەستگیر کرانو سزادانی هەروا ئاسان نەبوو. خەڵکێکی زۆر هوتافیان بۆدەکێشاو زۆرێکیش لەمیرەکان پشتگیریان دەکرد. سوارەکانیش لەئەڵمانیادا فەرمانی بێ بەریبوون "حیرمان" ی مارتن لۆسەریان سوتاندو لە قەلاّی "واتنبەرگ" لە سەکسۆنیا پارێزگاریان لێکرد. سا کاتێکیش ماوەی دڵنیایی کۆتایی پێهات کە ئیمپراتۆر دایبابوو، دەستورێ دەرکراو تیایدامارتن لۆسەر لە دەرەوەی یاسا دانرا. هەروەك دەستگیر کرانیشی بە مردووی یاخود بە زیندوی بە پێویست داندرا. بەلاّم میری سەکسۆنیا بۆئەوەی مارتن لۆسەر بپارێزێ

لەسـزای ئیمپراتـۆر هەسـتا بـە پارێزگـاری لێ کـردن. وە لـەم ماوەیـەی لەژێرچاودێری میری سەکسۆنیادابوو، توانی ئینجیل وەرگێڕێتـە سـەر زمـانی ئەڵمانی، واتا لەساڵی "1522". ئەوەرگێرانەبووبە سەوقاڵێکی[1] جوان لـەناو ئەدەبی ئەڵمانیادا.

ئەوسەرچاوانەی کە لەژێر دەستماندان باس لەوە ناکەن کـە مـارتن لۆسـەر کاریگەری بوبێت بە عوسمانیەکان، یاخو قورئـانی خوێندبێتـەوەو کاریگـەری بـووبێیپێی .بـەلاَم "دولانـدبینتون" لەپەرتوکەیـدا"مێـژووی ژیـانی مـارتن لۆسەر" ئاماژە دەکات بەوەی کەمارتن لۆسەر لە کاتی گفتۆگۆکردنیدا لەگەڵ "جون ئیك" گوتویەتی:"تورکەکان یاسایەکی مـەدەنی یـاخود کلێـسایی یـان نییە، وە تەورات‌و ئینجیل دەناسن، بەلاَم کـاری پێناکـەن. دەسـتوری ئـەوان قورئانەو حکومەتەکەشیان باشترین حکومەتە لەسەر زەوی"[2].

بلاَو بونەوەی لۆسەریزم:-

بەهۆی پەرتوکەکانی لۆسەر لەساڵەکانی دواییـدا، لۆسـەریزم لەئـەڵمانیادا بـلاَو بویـەوە. زرنگـی‌و لێوەشـاوەیی مـارتن لۆسـەر لەکەمەنـدەکێش کردنـی خـەڵکی بـەلای خۆیـدا بەدیارکـەوت. مەسـیحیە ئیمانـدارەکان بـەهۆی گەندەڵیـەکانی کلێـسا شـوێنی کـەوتن. لـەم لاشـەوە نیـشتیمانیەکان بـۆ ڕزگاربوونیان لە دەسەلاَتی پاپاو نەدانی باج بە پاپـای ئیتـاڵی‌و دادگـا، بوونـە

---

1 سەوقات - پەرۆ- تحفە

2 Raland H. Bajnton، Here 1 stand: The life of Martin Lother New york، 1956; pp. 185-196.

شوێن کەوتەی. خانەدانانو چینی ناوەڕاستیش بەهۆی ئەوەی سامانو دەسەلآتیان بۆ دەگەرایەوە لەسەر حسابی کلێیساو سەروەتو سامانە زۆرەکەی، بوونە شوێنکەوتەی لۆسەر. ئیمپراتوریش بەهۆی سەرقاڵ بوونی بە جەنگەکانی لەگەڵ فەرەنسا لەئیتاڵیادا، وە لەگەڵ عوسمانیەکان لەڕۆژهەلآتی ئەوروپا، نەیتوانی هەڵبستێ بەبنبڕکردنی لۆسەریزم.

سەبارەت بە میرەکانی ئەڵمانیا دەتوانین بڵێین: جگە لەوەی ئیمان بویە هۆی قبوڵ کردنی لۆسەریزم لەلایەن میرەکانەوە، بەلآم دەستگرتنی ئیمپراتۆر بە کاسۆلیکیو بڕیاردانی لەسەر پارێزگاری کردن لەم کلێیسایە، وە ئارەزووی میرەکان بۆ سەربەخۆبوونو ڕزگاربوون لەبالآدەستی ئیمپراتۆر، کە ئەمەیان هۆکارێکی زۆرکاریگەرتر بوو بۆ پەسەند کردنی لۆسەریزم، سەرەڕای حەزکردنی ئەوان بە دەستگرتن بەسەر سامانی کلێیسا. هەموو ئەوانە هۆکاری بلآوبوونەوەی لۆسەریزم بوون لەناو میرو خانەدانەکان[1].

لۆسەر لە کەسایەتیە سەرنج ڕاکێشەکەی بەهرەمەند بوو، ئەمەش وای لێکرد سەرکردایەتی کردنی لەلا سانا بێت. لۆسەر بە ئازایەتیەکی بێوێنەو بەتواناو ورەیەکی بەرزەوە تێزەکانی بلآو کردەوە، بەشێوەیەك کە قەڵەم ناتوانێت گوزارشتی لێ بکات. مارتن لۆسەر توانایەکی گەورەی هەبوو، بەهۆیەوە توانی چەندان کۆمەڵی جیاجیا بکاتە یەك دەستە. خانەدانانو پیاوانی ئاینیو جوتیارانو چینی ناوەڕاست دەستیان خستە ناودەستی یەك بۆپشتگیری کردنی لۆسەرو پارێزگاریلێی کرنی. هەموو ئەمانە لە دژی

---

1 Koem Igsb erg، and moss، op. p. 118

کڵێسای کاسۆلیکی شۆڕشیان کردو دەستیان بەسەر موڵكو سامانی داگرتو ڕێوڕەسمو تقوسەکانی کاسۆلیکیان ڕەت کردەوە. بەم شێوەیە بانگەوازەکەی لۆسەر بە پەخشان بونێکی گەورە پەخشان بوو، وە لەگەڵیدا گەلی ئەڵمانی بە تەواوی پێکهاتەکانی لەکاسۆلیکی هاتنە دەر.

لەساڵی 1525 جوتیاران شۆڕشیان لەدژی خانەدانانو پیاوانی ئاینی هەڵگیرساند، بۆ ڕزگار بوون لە باجی قورسو بێ گاریو سزای "کیفی". لۆسەریش هانی ئەو شۆڕشەی دا، چونکە ئەم شۆڕشە بە زیانی موڵكو ماڵی کڵێسا تەواو دەبوو. سا کاتێکیش شۆڕش کەوتە ناو زەوی میرو خانەدان و مەترسیان لەسەر جوڵانەوەکەی دروست کرد، ئەمەی بە مەترسی زانی لەسەر خودی خۆی، بۆیە لەبەرەی خانەدانەکان ڕاوەستاو پشتگیری ئەوانی کرد لەسەرکوت کردنی شۆڕشەکە. هەروەك لە بەشی داهاتو ڕونی دەکەینەوە.

دامەزراندنی کڵێسای لۆسەری:-

بەهۆی ئەوەی کە لۆسەریزم لەڕووی بیروباوەڕەوە لەگەڵ ڕۆما لێك جودابویەوەو زۆر لە شارەکان یاخود هەموویان بوون بە لۆسەری، کڵێسای تایبەت بەخۆیان لە شارەکانی ئەڵمانیادا دامەزراند. "مارتن لۆسەر" بۆخۆی سەرپەرشتی دامەزراندنی کڵێسای تازەی دەکردو لایەنگرە دڵسۆزەکانیشی هاوکاریان دەکرد. لۆسەر ئافەڕۆی لەبنچینە سەرەکیەکانی کرد، تەنانەت لەحەوت نهێنیەکەش تەنها سیانی هێشتەوە کە بریتی بوون لە: "نهێنی تەوبەو چەورکردنی نەخۆشو ڕاگیرکردن". "شامی خودای"شی- دەستکاری کردو ڕەبەنیو پاپەویەتو ڕژێمی کەهەنوتیڕەت کردەوە. میرەکانی ئەڵمانیا

لەجیاتی پاپا بوونە سەرۆکی کڵێسای پرۆتستانتیو "منستر" جێگەی قەشەی گرتەوە لەبەڕیوەبردنی کاروباری کڵێسا، هەروەها زمانی ئەڵمانیا لەجیاتی زمانی لاتینی لە وتارە ئاینیەکان خرایە کار. لۆسەر کرداری چاکی وەك: "حەجو ڕۆژوو ئافرەتی ڕەهیبەو قدیسەکانو بلیتی لێخۆشبوون"ی هەڵوەشاندەوە. وەرگێڕدراوەکەی ئینجیل بۆسەر زمانی ئەڵمانی لەلایەن لۆسەرو هاوەڵانی، بوو بەسەرچاوەی سەرەکی پرۆتستانتی.

هەر لەو کاتەوەی خانەدانان جوتیارانیان شەپڕێوکرد، بڵاوبوونەوەی لۆسەر توشی وەستان هاتو دەسەڵاتی مارتن لۆسەر دای لەکەمی. میرەی کاسۆلیکیەکانیش لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە، بەهۆی ئەوەی لۆسەریزم هۆیەك بوو بۆ ئەوەی شۆڕش لە دژیان سازبێت. ئەمە لەکاتێکدا خەریك بوو باوەڕ بەلۆسەریزم بکەن. پاش ئەمە دەسەڵاتی خانەدانان دای لەزیادیو بارودۆخی جوتیاران زۆر بەرەو خراپی ڕۆیشتو شەپڕێو تر بوون لە ساڵانی بەر لە شۆڕش، "جگە لە هەردوو هەرێمی بادنو تیرول" کە ڕەوشەکەیان کەمێ باشتر بوو لە هەرێمەکانی تر.

کاتێکیش دایتی ئەڵمانی لەساڵی 1526 لەشاری "سپایر" کۆبۆوە، میرەکان بوونە دوو بەش. بەشێکیان کاسۆلیکیو بەشەکەی تر بوونە لۆسەری. ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەمیش لە کاتێکی زۆر ناسك دابوو، کاتێك سوپای عوسمانی بەسەرکردایەتی سوڵتان "سلێمانی قانونی"پێشڕەوی کردبوو، توانی بووی بگاتە مەجەڕ. لەلایەکی تریشەوە جەنگ لەنێوان خۆی فرانسوای یەکەمی پادشای فەرەنسا لە هەمان کاتدا دەستی پێکردبوویەوە. لەبەر ئەمانە ئیمپراتۆر ناچار بوو ملبدات بۆ داواکاری لۆسەریەکان. دایتی

ئەڵمانی بڕیاری دا" هـەموو میرێـك شـیوەیەك ڕەفتـار بنـوێنێ، کەلەبەرامبـەر خودا بەرپرسیاربێت". بەڵام لە کۆبونەوەی ساڵی 1529 کە لە هەمان شاردا ئەنجامیاندا، بارودۆخ شێوەیەکی تر بوو، چونکە لەو کاتەدا ئیمپڕاتۆر کۆتایی هێنابوو بە جەنگی نێوان خۆیو فرانسوای یەکەم، وە توانی بووی دەسەڵاتی خـۆی بەسـەر ئیتالیـادا بـسەپێنێ، لەملاشـەوە ئیمپراتـۆری عوسمـانی پاشەکشەی بە سوپاکەی کردبوو. جا ئەم بارودۆخـە گونجاوە توانـای دا بـە ئیمپراتـۆر کـە ویـستی خـۆی بـسەپێنێ. لەبەرئەمـە وتـی: یاسـا لـەدژی هەرتەقەیـەو پێویـستە لەبەرامبـەر لۆسـەریەکانیش پیـادە بکـری، هـەروەها داهـاتی کلێـسای لۆسـەریەکانی قەدەغـە کـرد. ئیـدی لـەو کاتـەدا مـیرە لۆسەریەکان ناڕەزایەتی خۆیان دەربڕیو داوایان لە ئیمپراتۆر کرد بگەڕێتەوە سەر بڕیارەکانی ساڵی 1526، کە دایتی ئەڵمانی تێیدا کۆبوویەوە.

ئـەوەی لـەبڕیارەکانی ئـەو سـاڵەدا هـاتبوو بریتـی بـوو لـە "گوێڕایـەڵی بەرامبەر خودا نەوەك لە بەرامبەر ئیمپراتۆر". شیاوی باسـە ئـەم ناڕەزایـەتی دەربڕینە بوو ناوی پرۆتێست "Protest"ی بەسەر پڕۆتستانتیەکاندا بـڕی. پڕۆتستانتیەت لەپرۆتیست وەرگیراوە، واتا نارەزایی.

**بـڵاو بوونـەوەی لۆسـەریزم لەهەنـدێ لەویلایەتـەکانی ئـەڵمانیاو ئەسکەندەنافیا:ـ**

یەکێ لەهاوڕێیانی مارتن لۆسەر بەناوی "فلیپ میلانکتن"، کـە یـەکێ بـوو لەمرۆگـەران لـەزانکۆی وتـن بـرگ، هەوڵیـدا پێکهێنانێـك بکـات لـەنێوان لۆسەریزمو کاسۆلیکیەت. "مـیلانکتن" بـۆ ئـەم مەبەسـتە هەسـتا بـە دانـانی بنەمایەکی دینی لۆسەری لە خاسیەتدا، کە دەگونجـا لەلایـەن کاسۆلیکەکان پەسند بکرێت، بەهۆی ئەوەی هەندێ لە شتەکانی لەگـەڵ بنـەماکانی لۆسـەر

جیاواز بوون. پاشان لە ساڵی 1530 پێشکەشی دایتی ئەڵمانی کرد کە لە "ئۆکسبرگ" کۆبووبۆوە. بەڵام دایت ڕەتی کردەوەو بڕیارەکانی "ئۆکسبرگ" بوو بە بیروباوەڕێك کە لەلایەن لۆسەریەکانەوە جێبەجێ کرا.

ئیمپراتۆر بە بڕیارکانی "ئۆکسبرگ" ڕازی نەبوو، وە بڕیاری دا سزای هرتقە بداتو لۆسەریزم بە زەبری هێز لەئەڵمانیا لەناو بەرێ. لەبەرئەوە میرە لۆسەریەکان بۆ پاراستنی خۆیان، کۆبونەوەیەکیان ئەنجامداو کۆمەڵەیەکیان پێکهێنا بەناوی کۆمەڵەی "شمولکالڵد".

لێرەولەوێ جەنگی پچڕپچڕ لەنێوان کاسۆلیکو پرۆتستانت بەردەوام بوو، بەبێ پچڕان لەسالآنی 1546–1555 جەنگێکی بەردەوام لەئارادابوو. بەم شێوەیە ئەڵمانیا بوو بە گۆڕەپانی جەنگی ناوخۆیی. پادشای فەرەنسا بەهۆی بەرژەوەندی سیاسییەوە هاوکاری پرۆتستانتیەکانی دەکرد. شایەنی باسە ئەم جەنگە بە ئاشتەوایی ئۆکسبرگ کۆتایی هات و لەسەر ئەم خالآنە ڕێککەوتن:-

1- میرە ئەڵمانیەکان ئەو ئاینە هەڵدەبژێرن کە ئارەزووی دەکەنو دەتوانن بەسەر ژێردەستەکانیاندا بسەپێنن.

2- پرۆتستانتیەکان سەرجەم موڵکەکانی کڵێسایان بەدەستەوە دەمێنێت کە لەپێش 1552 دەستیان بەسەرا گرتووە.

3- پێویستە ڕێگە نەدرێ جگە لەپرۆتستانتی لۆسەری، هیچ ئاینزایەکی تر بلاو بکرێتەوە.

4- لە ولآتە کاسۆلیکەکان نابێت لۆسەریەکان ناچاربکرێن دەستبەرداری ئاینزاکەیان بن.

5- ئەگەر پیاوی ئاینی کاسۆلیکی، ئاینزای پرۆتستانتی بۆ خۆی پەسەند کرد،پێویستە دەستبەرداری پۆستەکەی بێت.

بەم شێوەیە لەنێوان ساڵانی 1520بۆ 1555 پرۆتستانتیەتلەباکوری ئەڵمانیادا بڵاوبوویەوە.فیلپ میلانگتن ئەو کەسەی بنەماو بناغەی لۆسەریزمی نوێی دارشت، لەساڵی 1555 بەفەرمی دانی پێدا هێنرا.

ئەگەرچی لۆسەریزم نەیتوانی لەسەرجەم ناوچەکانی ئەڵمانیادا بڵاوبێتەوە، بەڵام ئەم نەتوانینەی لە وڵاتانی ئەسکەندەنافیا قەرەبوو کردەوە. "کریستنی دووەم" 1513-1523، پادشای هەڵبژێردراو بەسەر دانیمارکو نەرویج، لەو کاتەی کە لۆسەر شۆڕشەکەی دەستپێکرد، دەستی بەسەر سویدیشدا گرت. ئەم پاشایە پارێزگاری لەئاینزای کاسۆلیکی خۆی کرد، هەروەها دانی هێنا بە دەسەلاتی ئاینی پاپا. بەلأم وەنەبێ پاشا خێری لەخۆی بینیبێو توانیبێتی هەروا فەرمانڕەوایی بکات، بەڵکو کەوتە ململانێ لەگەڵ گەلەکەی، بەتایبەت سویدیەکان. ئەمانە شۆڕشیان کردو جیابوونەوە، کریستنیش بەهۆی شۆڕشێکی گشتیەوە تەختەکەی لە دەستدا. دوای ئەوەی ئەم پادشایە لادرا سویدیەکان "گوستاڤازا"یان- وەك پادشایەك بەسەر خۆیاندا هەڵبژارد. "گوستاڤازا" لەساڵی 1523 تاوەکو ساڵی 1560 فەرمانڕەوایی کرد. لەملاشەوە نەرویجو دانیمارك "فردریکی یەکەم"ی مامی کریستین "پادشای پێشوی دانیمارك ونەرویج"یان- کردە پادشا بەسەر خۆیاندا. "فردریك" لۆسەریزمی بە هەندوەرگرتو بایەخی پێدا، چونکە لۆسەریزم دەسەلاتی پاشای زیاتر دەکردو کڵێساشی دەکردە پاشکۆی

دەوڵەت. بەڵام "فردریک" باش دەیزانی کاسۆلیکیەت لەوڵاتەکەیدا بەناو ناخی خەڵکیدا ڕۆچووە، لەبەرئەوە هەروا بە ئاسانی ناتوانێ ڕیشەکێشی بکات. جا بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی لۆسەریزم لە وڵاتەکەیدا، مامۆستا لۆسەریەکانی لە دەوری خۆی کۆکردەوە. ئەم بانگەوازە بەشێوەیەك سەرکەوتنی بەدەستهێنا کە لەساڵی 1527 کاسۆلیکیو لۆسەری لە جەماوەردا لە ئاستی یەك دابوون. سا کاتێکیش فردریك لەو ساڵەدا مرد، کاسۆلیکیەکان هەوڵیاندا کۆسپ بخەنە بەردەم هەڵبژاردنی "کریستنی سێیەمی کوڕی فردریك"، چونکە ئەم شازادەیە لۆسەریەکی توندبوو، ئارەزووی دەسەڵاتێکی ڕەهای دەکرد.

نارەزایی خەڵکی لەهەمبەر دەسەڵاتی ڕەها شکستی هێناو "کریستن" توانی لەساڵی 1536 بێتە سەر تەخت، بەمەش کۆتایی بە کاسۆلیکیەت هات لە دانیمارکو نەرویج.

یەکەم کارێك کە "کریستین" پێی هەڵسا، بریتی بوو لە دەرکردنی دەستورێك کە بەهۆیەوە توانی دەستبگرێ بەسەر موڵکی کڵێساو دەسەڵاتی دینو دونیا لەپیاوانی ئاینی بستێنێتەوە. ئەمجا پاش گفتوگۆکردن لەگەڵ مارتن لۆسەر لەساڵی 1537، ئاینێکی تازەی ڕێکخستو لۆسەریزمی کردە ئاینی ڕەسمی وڵات. بەڵام کاسۆلیکیەت هەروا تەواو نەبوو، نارەزایی جوتیارانو مرۆگەران ڕۆژگارێك بەردەوام بوو. "هیلگیسن" کە یەکێ بوو لەمرۆ گەرەکان، نارەزایی خۆی دەربڕی دەرهەق بەم گۆڕانە ئاینیە. بەڵام دەوڵەت بەهۆی دەستگرتنی بەسەر سامانی کڵێسا، توانی سامانێك

کۆبکاتەوە کە بەهۆیەوە بوو بە دەوڵەمەندترین وڵاتی ئەسکەندەنافیاو توانی بەرەبەرە زاڵبێت بەسەر گروپە نەیارەکان. وە بە شێوەیەك بە هێزبوو کە لەنیوەی دووەمی سەدەی شازدەو سەرەتای سەدەی حەڤدە،ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕا لەسیاسەتی ئەورووپا. ئیدی لۆسەریزم بووبە ئاینێکی نەتەوەیی لەدانیمارك ونەرویج.

سەرکەوتنی لۆسەریزم لەسوید، بەهەمانشێوە دەگەڕێتەوە بۆ پاشاکەیان"گوستاڤازا". ئەم پاشایە بە سایەی کۆڕو کۆمەڵە نەتەوەییەکان توانی بچێتە سەرتەخت، هەرچەندە نەیارانی تا ئەو کاتەش لەژێر کاریگەری پیاوانی ئاینی کاسۆلیکی دابوون‌و سەرۆکی ئوسوقفەی "ئەپسالا" ڕابەرایەتی دەکردن. سەرۆکی ئوسوقفە دەیویست لەگەڵ دانیمارك بمێنێننەوە، پادشاش بۆ ئەوەی ڕزگاری بێ لەسەرکردەی یەکیەتی خوازان، داوای لەپاپا کرد سەرۆکی ئەسوقفە لابەرێ‌و یەکێکی تربخاتە جێگەی. کاتێکیش پاپا ئەمەی ڕەت کردەوە، پەیوەندی نێوانیانپچڕا. گوستاڤازا توانی دەست بەسەر سامانی یەکیەتی خوازان دابگری، وە بەرەبەرە دەستی کرد بە بڵاو کردنەوەی پرۆتستانتی لە وڵاتەکەیدا.

لەسەرەتادا پادشا بەکاسۆلیکی مایەوەو تەنها بە نەهێشتنی دێرەکان‌و پچڕاندنی سێیەکی باجی کڵێساو وەرگێڕانی ئینجیل بۆ سەر زمانی سویدی‌و بڵاوکردنەوەی وەرگێڕاوەکە ئۆقرەی گرت. وەلێ لەساڵی 1527 دەستی گرت بەسەر تەواوی کڵێساو دوو ئوسوقفی کاسۆلیکی لەداردا، لەهەمان کاتیش بانگهێشتی پیاوانی ئاینی لۆسەری کرد بۆ سوید. دوای ئەمە لەساڵی 1530

یەکێ لەپرۆتستانتیەکانی کردە سەرۆکی ئوسوقفەی ئەپسالا. ئیدی لەدوای ئەمە لۆسەریزم بە خێرایی بلاوبویەوە.

سەرەڕای هەندێ بەرەنگاریو نەیاری کاسۆلیکیەکان لەبەرامبەر ئەم گۆڕانە ئاینیە لەنیوەی دووەمی سەدەی شازدە، بڕیارەکانی ئۆکس برگلەسالی 1593 بوونە باوەڕ پێکراوی فەرمی حکومەتی سویدی. پادشای سوید لەسالی 1604 کاسۆلیکیەکانی لەپۆستە حکومیەکان دامالیو نەفی کردنە دەرەوەی ولات. شیاوی باسە لە هەموو ئەمانەدا پەرلەمانی سودیدی کە پێکهاتبوو لەخانەدانانو چینی ناوەڕاست، پشتیوانی پاشایان کردو هۆکاری سەرکەوتنی بوون.

**زوینگلیو کالڤن لە سویسرا:-**

لۆسەریزم نەبوو بە تاکە بیروباوەڕی پرۆستانتیزمی بەربلاو لەئەوروپادا، بەلکو لۆسەریزم لە ئەلمانیاو ولاتانی ئەسکەندەناڤیا بلاوبوویەوە و، ولاتانی تر ئەو پرۆتستانتیەیان پیادە کرد کە بۆ ولاتیان گونجاو بوو. سا کاتێکیش سەرکردە پرۆتستانتیەکان نەیانتوانی لەسەر یەك بیروباوەڕ پێکبێن، هەر لەو ساتەوە پرۆتستانتی بوو بە چەندین لقو بیروڕای جیاجیا.

هەر لەو کاتەی شۆڕشی لۆسەری لەئەلمانیا دەستی پێکرد، دوای کەمێك شۆڕشێکی تر لەسویسرا سەریهەلدا، کە "ئەلریك زوینگلی" پێشەوایەتی دەکرد. زوینگلی لەسالی 1516 وەك قەشەیەکی کاسۆلیکی ڕۆیشت بۆ شاری "ئاینزیدلن" لەهەرێمی "شوایزی" سویسرا. ئەم لەخانەوادەیەکی دەولەمەند لە دایك بووە. وە لە "ڤیێناو بال" بە ڕۆشنبیریەکی بەرز ڕۆشنبیر

بوو. ئارەزووی لەمرۆگەری‌و فێرکاری تازە بوو، ئەم ئارەزووەشی زۆر زیاتر بوو لەئارەزووی بۆ لاهوت. کاتێك زوینگلی لەلایەن پاپاوە موچەی پێ درا، هیچ گومانی نەبوو لەبیروباوەڕو دڵسۆزی خۆی بۆ کڵێسا، تەنانەت لەڕێگەی ئایندا دەساڵی بەسەر برد.

بەرەنگار بوونەوەی زوینگلی بۆ پاپا بەهۆی هۆکاری سیاسیەوە بوو، چونکە زوینگلی زۆر لەدژی بەکرێ گرتنی سەرکردە بیانیەکان بوو بۆ سەربازە بەکرێ گیراوە سویسرییەکان. بۆ ئەمەش لێدوانی داو سەرزەنشتی پاپاو پیاوانی کڵێسای کرد، بەهۆی دنەدانی ئەوان بۆ ئەم کارە گەندەڵ‌و بۆگەنە. پەرۆشی زوینگلی وای کرد هێرش بکاتە سەر تەواوی گەندەڵیەکانی کڵێسا. بەڵام دەسەڵاتی پاپای ڕەت نەکردەوە، تەنها دوای ئەوە نەبێ کە لەساڵی 1518، مۆژیارێك بۆ کەتدرائیەی زویریخ دیاری کرا. ئەمیش لەوێوە دەستیکرد بە دژایەتی کردنی پاپاو دەسەڵاتی پاپاوی ڕەت کردەوەو ڕایگەیاند کە ئینجیل بنچینەی ڕەوشتەو تاکە ڕێنوێنیکەرە بۆ ئیمان. ئەمجا هێرشی کردە سەر هەندێ تەعالیمی مەسیحی وەك: "ڕۆژوو بەپیرۆززانینی پاشماوەی قدیسان"، هەروەها ڕەوای دا بۆ پیاوانی ئاینی کە هاوسەرگیری بکەن‌و خۆیشی هاوسەر گیری ئەنجام دا. ئیدی ئەوانەی گوێبیستی وتارەکەی بون کاریگەر بوون پێی‌و پەیامەکەی ئەویان خستەگوێ‌و جێبەجێیان کردو هێرشان کردە سەر کڵێساو ئەوەی تیایدا بوو سوتاندیان‌و پاشان ڕوخاندیان.

پاپا هیچی پێنەکرا، ئەوەندە نەبێ لەساڵی 1523 داوای لە خەڵکی زویریخ کرد پشتی زوینگلی بەردەن. بەڵام خەڵکی سەربەخۆیی خۆیان لەپاپا

ڕاگەیاند. لەمەوە سەرجەم ناوچەکانی سویسرا ئاگری شۆڕشیان تێدا هەڵگیرسا، جگە لەپێنج کانتۆنەکەی قەد پاڵی چیاکانی ئەلپ، کە بەکاسۆلیکی مانەوە. پەیامی زوینگلی بە تەواوی لەپەیامەکانی لۆسەر دەچوو، وەلێ هەمو ئەو هەولانەی کە دران بۆ یەکخستنی بەرەکان لەدژی کاسۆلیکی شکستی هێنا. هەردوو پێشەنگ "لۆسەرو زوینگلی" لەساڵی 1529 لە "ماربرگ" کۆبوونەوەو هەردوو لایان لە زۆرێك لە بناغەو تعالیمی پرۆتساتی هاوڕابوون، بەلاَم لە"نهێنی تێکەڵکردن" دا– جیاوازیان تێکەوت. چونکە لۆسەر نان‌ومەی "خوانی خودایی" بەرامبەر خوێن‌و گۆشتی مەسیح هەژمار دەکرد، بەلاَم زوێنگلی ئەمەی تەنها بە هێمایەك دادەنا بۆ خوانی خودایی. هەروەها زوێنگلی پێچەوانە بوو لە لۆسەر، کاتێك ئەم جەختی دەکردەوە لەسەر چاکسازی دەوڵەت‌و ڕێکخستنی‌و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نمونەیی کە کارە سیاسی‌و دینی‌و دیموکراتیەکان ڕێك دەخات. لەڕاستیدا زوێنگلی زۆر زیاتر لە لۆسەر لەکاسۆلیکی دورکەوتەوەو، بوو بە پرۆتسانتیەکی ڕووت.

لەساڵی 1531 زوینگلی بڕیاریدا بە زەبری هێز پرۆتستانتیەت بەسەر پێنج کانتۆنەکەی قەدپاڵی چیاکانی ئەڵەپ بسەپێنێ. بەهۆی ئەمەوە جەنگی ناوخۆیی لەسویسرا هەڵگیرساو پێنج کانتۆنەکە سەرکەوتنیان بەدەستهێناو زوێنگلی کوژرا. دواتر هەردولا ڕێککەوتن‌و بڕیاریاندا هەر هەرێمێکی سویسری ئازاد بێت لەهەڵبژاردنی ئەو بیروباوەڕەی دەیەوێ. لەم کاتەوە سویسرا لەنێوان پرۆتستانت‌و کاسۆلیکەکان دابەش بوو. پرۆتستانتیەکانیش لەدوای

کــوڕانی زوێنگلــی هــیچ پێــشەوایەکیان نــەبوو تــا هــاتنی جــۆن کــالڤن‌و گیرسانەوەی لەجنێف، پاشان پێشەوایەتی کردنی کالڤن بۆ ئەوان.

## جــۆن کـــالڤن:-

لەوانــەی کــە لەکڵێــسای کاسـۆلیکی جیابوونــەوە، کـالڤن بەکەســی دووەم دادەنــدرێ لــەدوای لۆســەر. کــالڤن لەســالّی 1509 لەشــاری "لیــۆن"ی-فەڕەنسا لەهەرێمی "پیکالدی" لەبنەماڵەیەکی چینی ناوەڕاست لەدایك بووە. هەر لەمنداڵیەوە گــەرەکی بــوو خــۆی ئامادەکـات بـۆ کڵێـسا. ئیـدی لەشـاری پاریس دەستی بەخوێندن کردو ئارەزووی چووە سـەر لاهـوت ووێـژە. بـەلاّم کاتێ گەیـشتە تەمـەنی نـۆزدە سالّی، بـاوکی ئامۆژگـاری کـرد بـەوەی یاسـا بخوێنێ بۆئەوەی ببێتە پارێزەر، لەجیاتی ئەوەی لە کڵێسادا بێـت. ئەمـەش بوویە هۆی ئەوەی خۆی خەریك بکات بەلێکۆڵینەوەو خوێندنی یاسا.

لەســـالّی 1529 ز، بـــیروڕای گـــۆڕانی بەســـەرداهات‌و بـــاوەڕی وابـــوو کەدەنگێکی خودایی بانگی دەکات بۆئەوەی کڵێساجێبێڵێ‌و کڵێسایەکی نـوێ وەباربێنێ. ئەوکاتەی قوتابی بوو لەزانکۆی پـاریس پەیوەنـدی کـرد بەوانـەی کەکاریگـەر بـوون بەلۆسـەر. لەوکاتەشـدا ئەوانـەی ڕەخنـەگربوون لەکڵێـسای کاســۆلیکی ژمارەیــان زۆربــوو، بــەلاّم ئــەوان ئــەوەیان بــەگونجاو دەزانـــی کەلەڕێگەی جەخت کردنەوە لەسـەر ڕەوشـتە بـەرزەکان ورۆشـنبیریەکی بـالاّ چاکسازی لەکڵێـسادا بکـەن. وەلێ کـالڤن سـوربوو لەسـەر کـارێکی نـوێ، بەشێوەیەك کە گرنگی بەهیـچی ترنـەدەدا، هەرچـەندەبەتەواوی ئـەوانی تـری پشتگوێ نەخستبوو. کاتێکیش فرانسوای یەکەمی پاشای فەڕەنـسا لەسالّی

1532 بڕیاری لەناوبردنی جوداوازی ئاینیدا لەناو وڵاتدا، سەرەتای چەوساندنەوەی پرۆتستانت دەستی پێکرد. کالڤنیش فەرەنسای جێهێشتو ڕووی کردە سویسراولەشاری "بال" گیرسایەوە. لەوێشدا ڕێبازی زونگلی بلاوبوو. کالڤن دەستی کرد بەنوسین لەبارەی پرۆتستانتیو بەراوردکردنی لەگەڵ کاسۆلکی. وەهەستا بەبلاوکردنەوەی کتێبێك بەناوی "دەستوری ئاینی مەسیحی"و پێشکەشی فرانسوای یەکەمی کرد لەساڵی 1536، بەو مەبەستەی کاریگەری لەسەر دروستبکات. کالڤن ویستی والە فڕانسوا بکات پرۆتستنتیەت بسەپێنێ بەسەر فەرەنسادا. وەلێ لەم هەنگاوەی شکستی خوارد، بەلام بووە هۆی پەیداکردنی ناوبانگێکی مەزن بۆ کالڤن. بیروڕاکانی کالڤن بەشێکی لەلۆسەرو بەشێکی تری لەزوینگلیو چاکسازەکانی تر وەرگیراوە.

کتێبەکەی پوختو ڕێك بوو، هەر تەنها ئەوە نەبوو کە لە زوینگلیو مرۆگەرەکان وەرگیرابێ، بەلکو ئەم کتێبە خزیە ناو دەمەتەقێی ئاینیو گومان دروستکردن لەو بانگەشانەی کە کلێسا دەیکرد بەوەی ڕاستەوخۆ لە عیسیو حەواریەکانەوە هاتووە.

بە ڕەتکردنەوەی بیروڕای کلێسا، دەستی کرد بەپیادەکردنی بیروڕای پێشەنگە دێرینەکانی کلێسا، وەك باشترین سیستەمی دینی. کالڤن باوەڕی وابوو کەمەبەستی سەرەکی لەژیانی دونیا، ڕزگار بوونە لەسزای ڕۆژی دوایی. دەربازبوونی مرۆڤیش لەبیروباوەڕی ئەودا پەکی لەسەر کلێسا نەدەکەوت. باوەڕی تەواو بە خوداو بەمەسیح لەڕوانگەی ئەودا، مانای هەڵبژێردراوی ئەو

کەسە دەگەیەنێ لەلایەن خوداوە، لەبەر ئەمە پێویستی بە نێوانی کڵێسا نییە لەنێوان خوداو مرۆڤ. بەڵام ئەم هەڵبژێردراوە خودا لە ئەزەلەوە دیاری کردووە. پیاوی چاك لە تێروانینی کالڤندا، ئەو کەسەیە کە ڕەوشتەکانی لە هەڵسوکەوتە جوانەکەی و باوەڕە پتەوەکەی و دەستگرتنی بە ڕەوشتە جوانەکان ڕەنگ دەداتەوە. جا هەرکەسێ ئەم ڕەوشتانەی لێ دیاریدا، لەلایەن خوداوە لە ئەزەلەوە لەناو بەندەکاندا هەڵبژێردراوە، چاکی مرۆڤو پێچەوانەکەی، بەدەستی خودی خۆی نییە. چونکە مرۆڤ ناچارە کراوە(مجبیر[1]).

لەساڵی 1536 کالڤن ڕووەو جنێف هەنگاوی گرت لێی گیرسایەوە، کە لەم ساتەدا شۆڕشیان لە دژی میری ساڤوای سازکردبوو. ئەم میرە دەیویست کاسۆلیکیەت بەسەرخەڵکی ئەم شارەدا بسەپێنێ. کالڤن پشتگیری خەڵکی ئەم شارە پرۆتسانتیەی کرد لەدژی ئەم میرە، ئەمانیش لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەیدا، پاش ئەوەی کە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، کردیان بە سەرۆکی ئاینی خۆیان. کالڤنیش ئەم بۆستەی خۆی پاراست تا ئەو ڕۆژەی دونیای بەجێهێشت لەساڵی 1564. حکومەتی جنێف لەسەردەمی کالڤن سیوکراتی بوو، واتا کالڤن هەم سەرۆکی ئاینیو هەم فەرمانڕەوایەکی سیاسی بوو. لەم کاتەشدا دینو دەوڵەت یەکانگیر بوون. کالڤن خۆی وا حسابی دەکرد کە نێردراوێکی خواییە لەم شارەداو نمونەی پاکیزەیی وپاکزادەییو سادەژینیە لەژیانی دونیادا. کالڤن کەسێکی توندبوو لەسەردەمی خۆیداو

---

1 Cottscholk pp. 161-163

کەرنەڤاڵو بۆنەکانو مادده بێ هۆشکەرەکانی قەدەغە کردو دەرگەی مەلهاو بارڕو هەموو ئەو شوێنانەی داخست کە جێگەی هەوەسو ڕابواردن بوون. هەروەك سزای لەداردانی سەپاند بەسەر هەرکەسێ کە توشی زینا بێت و، سوتاندنی بەسەر گومرایانو تاوانکاراندا‌پیادەکرد. هەر لەم نێوانەدا هەستا بە سوتاندنی پزیشکی بەناوبانگ "مایکل سیرڤێس" بەهۆی ئەوەی بەشێوەیەکی کردەیی کارەکانی نەدەکرد. داپلۆسینو خۆسەپاندنی کالڤن لەئەوروپادا ناوبانگی دەرکردو شاری جینێفیش بووە نمونەیەك بۆ دەسەلاتی پرۆتستانتی.

پەخشان بوونی کالڤنیزم:-

جۆن کالڤن گرنگی دا بە فێرکاریو چەندین خوێندنگەو شوێنی فێرکاری دامەزراند. لەناویشیاندا زانکۆی جنێف، کە لەسەرجەم شوێنەکانی ئەوروپاوە قوتابیانی بۆ لای خۆی کەمەندەکێش دەکرد. کالڤن چەندین پەیامو نوسراوی نوسیو ئینجیلی وەرگێرایە سەرزمانی فەرەنسیو پەیوەندی کرد بە قوتابیەکانی لەشوێنە جۆراوجۆرەکانی ئەوروپاو هانی دەدان بۆ بلاوکردنەوەی پەیامەکانی. هەر ئەمەش بوو وای کرد کالڤنیزم بەشێوەیەك بلاو بێتەوە، کە هیچ مەزهەبێکی پرۆتستانتی نەیتوتنی شانی لەشان بدات.

کالڤنیزم لە لۆسەری زیاتر پەخشان بوو، بەهۆی ئەوەی کالڤن بەشێوەیەکی لۆژیکی بنچینەکانی ئاینی دامەزراند، کە خەڵکی لێی تێدەگەیشتو چینی ڕۆشنبیریش بۆی بەپەرۆش بوون.بەهۆی ئەوەی کالڤنیزم بەشێوەیەکی راشکاوانە سوی بەڕەوازانی، لەکاتێکداپێشترحەرام

کرابوو زۆر بەتوندی ڕەت دەکرایەوە، چینی سەرمایەدار مەیلیان بەلایدا کردو کالڤنیزمبوو بە مەزهەبی چینی ناوەراست. کالڤیزم بە ڕونیو ئاسانی دەناسرا، لە جیاتی سیستەمی کەهەنوتی چینێکی تری لەپیاوانی ئاینی دامەزراند کە بە منستر ناودەبران. کالڤن جەختی دەکردەوە لەسەر فێرکاریو دامەزراندنی قوتابخانەو زانکۆ، هەروەها وەرگرتنی قوتابیان لە سەرجەم شوێنەکانی ئەوروپا، کەئەمە کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر بڵاوبوونەوەی کالڤنیەت. ئەم قوتابیانە دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵاتانی خۆیان، دەستیان دەکرد بە بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی کالڤنیزم، دواتر لەهەریەکە لەهۆڵنداو سکۆتلەنداو بۆهیمیاو سویسڕاو هەندێ لە ویلایەتەکانی ئەڵمانیادا بڵاوبوویەوە. تەنانەت لە هۆڵندا کالڤنیزم یەکێ بوو لە هۆیەکانی شۆرشی هۆڵندییەکان لەدژی ئیسپانیا لەسەردەمی فیلپی دووەم.بەهەمانشێوە جەنگی سی ساڵەی نێوان پرۆتستانتیەتو کاسۆلیك لەئەڵمانیادا سەرەتاکەی لەوانەوە دەست پێکرد، شایەنی باسە ئەم جەنگە بە بەفەرەمی بەپەیمانبەستی "ویستڤالیا" کۆتایی پێهات، کە تیایدا ئیمپراتۆر بە فەرمی دانی هێنا بە کالڤنیزمو وەك کاسۆلیكو لۆسەریەت گوزارشتی لێ کرد.

کالڤنیزم لەهەندێ بەشەکانی هەنگاریادا بڵاو بوویەوەو ژمارەیەکی زۆریش لەفەرەنسیەکان باوەڕیان پێهێنا، هەروەها لەسەر دەستی "جون نوکس"، کالڤنیزم لەسکۆتلەنداش بڵاو بۆوە. "جۆن نۆکس" لە جنێفدا کالڤنیزمی خوێند. پاش ئەوەش کە لەساڵی 1560 گەڕایەوە خانەدانانی سکۆتلەندای والێکرد کاسۆلیکیەت ڕەت بکەنەوەو کالڤنیزم بکەنە ئاینی فەرمی وڵات.

کالڤنیزم لە سکۆتلەنداو لەکیشوەری ئەورووپاوە دزەی کردە ئینگلترا، پەیرو کارانی کەوتنە خەباتێکی بێوچان بۆ ئەوەی کالڤنیزم بکەنە ئاینی فەرمی وڵات. سا کاتێکیش ئەمەیان بۆ نەچووە سەر، تەنها لە پێناوی دەستەبەرکردنی ئازادی ئاینی خەباتیان دەکرد. لەسەرەتای سەدەی حەڤدەشدا بەهۆی چەوساندنەوەی ئاینی بەشێکیان کۆچیان کردە ئەمریکا.

هنری هەشتەمو کڵێسای ئینگلیزی

لە ساڵانی 1520-1530 پرۆتستانتی لە ئینگلترا سەریهەڵداو بڵاوبۆوە. شێوەی تەواوی خۆیشی وەرگرت لەماوەی پەنجا ساڵدا (1520-1570). پرۆتسانتی لەسەردەستی هنری هەشتەم (1509-1547) پەرەی گرت. هنری بەهۆی بارودۆخی تایبەتیو بارودۆخی سیاسی ناچار بوو پەیوەندی خۆی لەگەڵ کڵێسای ڕۆما بپچڕێنێو کڵێسایەکی نەتەوەییو ملکەچ بۆ ویستی پاشا دابمەزرێنێ.

وەنەبێ هنری لای بەلای بیروڕاکانی لۆسەر بوبێو لەگەڵی هاوڕا بوبێ، بەڵکو ئەم لەدژیشی وەستاو لەساڵی 1541 کتێبێکی لەدژ دەرکرد. لەکتێبەکەیدا پارێزگاری لەحەوت نهێنیەکە دەکرد. دوای ئەوەی کتێبەکەی تەواو کرد، پێشکەشی پاپای کردو بەهۆیەوە نازناوی پارێزەری ئیمانی لەلایەن پاپاوە پێ بەخشرا. هنری تا کۆتایی تەمەنی پارێزگاری لەم نازناوە کرد. تەنانەت تاوەکو ئەمڕۆش شاکانی ئینگلترا پارێزگاری لەم نازناوە دەکەن. هنری لەبانگەشەکەیدا دژایەتی بۆ پاپا نەبوو، هەروەك لەژمارەیەك

بۆنەدا دۆستو هاوپەیمانی لیۆی دەیەم بوو، تەنانەت دۆستی پاپا کاردینال "ولزی"کردبوو بە ڕاوێژکاری خۆی.

بەلاَم لەسیابەختی پاپا بارودۆخی ئینگلتراو رەوشی تایبەتی هنری لەبیستەکانی سەدەی شازدە گۆڕانی بەسەردا هات.

گۆڕانەکانیش سەبارەت بەئینگلترا بریتین لە:ـ

1-لۆسەریزم لەساڵی 1521 دزەی کردبووە بەریتانیاو کاری کردبووە سەر کۆمەڵێ لە قوتابیانی زانکۆی کامبریج، لەوانیشەوە بیروڕاکانی لۆسەر دزەی کردە زانکۆی ئۆکسفۆرد، پاش ئەمە لەنێو چینی ڕۆشنبیری لەندەنو ناوەندەکانی تری ڕۆشنبیری بلاَو بۆوە. شایەنی باسە ئەوانەی لەسەرەتاوە باوەڕیان بە بیروڕاکانی لۆسەرکرد بریتی بوون لەپیاوانی ئاینی بچوکو بازرگانە گەورەکانی لەندەن.

2- هەستو نەستی خەڵکی ئەو کاتی ئینگلترا خۆی دەبینیەوە لەئارەزووکردن بۆ چاکسازی لە کلێساو ڕاستکردنەوەی هەڵسوکەوتی پیاوانی ئاینی. هەر ئەم هەستەش لەم کاتەدا لەتەواوی ئەوروپادا بەربلاَوبوو. لەناو ئەوانەی بەپێوستی دەزانی چاکسازی لەکلێسادا بکەن، بیریارانی هاوشێوەی "تۆماسمۆرو جۆن کۆلیت" بوون، کە کاریگەربوون بە ئیرازمۆس.

3-گیانی نەتەوەیی گەشەسەندووی بەربلاَوی ئینگلترا، لەگەڵ ئەو دووبەرکییەی کە لەجیهانی کاسۆلیکی دا هەبوو بەریەك دەکەوت. هەروەك سەرهەڵدانی پاشایە بەهێزەکانو پشتگیری لێکرانیان لەلایەن چینی ناوڕاستەوە،پاشان زاڵبوونی ئەم پاشایە بەسەر خانەدانانو میرەکان، ڕێگەی

خۆشکرد بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی پاشایەتی ڕەها. ئەمانە بەشێوەیەك بەهێز بوون، کە جگە لەکلێسا هیچ شتێك کۆسپ نەبوو لەبەردەمیان. بەلام دلسۆزی پاشاکانی ئینگلترا بۆ پاپاکان کە تا ئەو کاتەش بەهێزبوون، جیا بونەوەی کلێسای ئینگلیزی تا چەند سالێك وەدرەنگ خست.

وەلێ بارودۆخ وای لە"هنری هەشتەم" کرد خۆی لەکلێسای ڕۆما جیاکاتەوە، لە دوای ئەوەی کە جیاوازی کەوتە نێوان هنریو پاپا "کلمینتی حەوتەم". ئەم جیاوازیە بەهۆی ئەوە ڕویدا کە هنری دەیویست "کاترین ئەراگۆن" خێزانی تەلاق بدات. بەلام پاپا ڕەزامەندی لەسەر ئەم تەلاقە نەنواند. شایەنی باسە"کاترین ئەراگۆن" کچی فردیناندو ئیزابێلا بوو،پێش ئەوەی لەهنری هەشتەم مارە بکرێ، مارە کرابوو لە "هنری ئارسەر"ی براگەورەی. مردنی ئارسەر وایکرد کاترین بدرێ بە هنری هەشتەم، دوای ئەوەی هنری حەوتەم ڕەزامەندی پاپای بۆ ئەم هاوسەرگیریە بەدەستهێنا. ئەم هاوسەرگیریە بە مەبەستی بەردەوامی دان بوو بە دۆستایەتی ئیسانیاو ئینگلترا. هنری هەشتەم دوای ئەوەی کە شەش مندالی لە کاترین بوو، وە جگە لە مندالێکی نەخۆش بەناوی "ماری تیودور" هیچی تری بۆ نەژیا، بەتەواوی بێ ئومێدبوو لە کاترین. کاتێ سەیر دەکەین ئەم هاوسەرگیریە ماوەی هەژدە سالێ بوو ئەنجام درابوو. جگە لەوە هنری وەك تەواوی پاشاکانی تر حەزی دەکرد کوڕێکی هەبێت جێگەی بگرێتەوە لە دوای خۆی، وەلێ لەمەشدا بێ بەرهەم بوو، چونکە کاترین لەبەدی هێنانی ئەم ئاواتە دەستە پاچەمابوو. لەبەر ئەوە دەیویست خۆی لێ ڕزگاربکات. هنری لەبارەی

ئەوەوە دەڵێت: "هاوسەرگیریمان تاوانێکە لێخۆشبوونی بۆ نییە، سەرەڕای ڕەزامەندی پاپاش لەسەری، چونکە کڵێسا ڕێگە نادات بە هاوسەرگیری کردن لەگەڵ خێزانی برا، پاش مردنی براخاوەن ژنەکە". لەهەمانکاتیشدا هنری کەوتبووە ئەویندارى "ئان پۆلین"، کە یەکێ بوو لە خزمەتکارەکانی کۆشک. هنری ئومێدی ئەوەی هەبوو کە بە هاوسەرگیری کردنی لەگەڵ ئەو ئافرەتە کوڕێکی ببێو ئەم کوڕە بتوانێ جێگەی بگرێتەوە.

لەساڵی 1527 هنری ڕاوێژکاری خۆی کاردینالّ "ولّزی" ڕاسپارد بە نێوبژیوانی کردن لە نێوان خۆی وپاپا، بەو هیوایەی بتوانێ پاپا ڕازی بکات وڕێگە بەهنری بدات کاترین تەلاّق بداتو ئان پۆلین بخوازێ. وەلێ پرسی تەلاّق سەبارەت بە پاپا هەروا ساناو ئاسان نەبوو، بەتایبەت لەم کاتو ساتە ناسکەدا، کاتێ سەیردەکەین کاترین پوری چارلسی پێنجەمی ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریای ڕۆمانی پیرۆزو پاشای ئیسپانیاو زەویە نزمەکانو سەرجەم داگیرگە ئیسپانیەکان بوو. چارلس لەم کاتەدا بەهێزترین شای ئەوروپا بوو. سوپای ئیمپراتۆر دەستی بەسەر ئیتالیاو دەروازەکانی ڕۆمادا گرتبوو، هەڕەشەیان لەپاپا دەکرد بەهۆی هاوپەیمانی بووونی لەگەڵ شای فەرەنسا. جا شەرعیەت دانبە تەلاّق لەلایەن پاپاوە، دەبووە هۆی توڕە بوونی ئیمپراتۆر. چونکە ئیمپراتۆر ئەمەی بە سوکایەتی لێك دەدایەوە لەهەمبەر خۆیو بنەماڵەکەی. هەروەك ڕێگەدانی بەتەلاّق کارێکی سەخت بوو، چونکە پاپا ئەمەی بە کارێکی پڕ مەترسی دەزانی بۆ داهاتوی. بۆیە پاپا خاوەخاوی لەکارەکە دەکردو دواخستنی کارەکەی بەباش دەزانی بۆ ئەوەی هنری

لەبڕیارەکەی سارد بێتەوە. وەلێ خۆشەویستیو شەیدا بوونی هنری بۆ "ئان بۆلین" گەیشبووە لوتکەو توانای چاوەڕوانی نەمابوو، هەر ئەمەش دواتر بویە هۆیەك بۆ جیابوونەوەی کلێسای ئینگلیزی لە ڕۆما لە ساڵی1531. پاش ئەم جیابوونەوەش ولزی"گەورە ڕاوێژکار"ی لاداو زیندانی کرد.

لەم کاتەشدا پەرلەمانی ئینگلیزی لە ژێر دەستی هنری دابوو،بۆیە بۆ هنری ڕازی کردنی پەرلەمان سەخت نەبوو،وە دەیتوانی وایان لێبکات چەند یاسایەك دەربکەن. لەساڵی1534 چەند یاسایەك بەناوی"یاسای سەرۆکایەتی" دەرکرا. بەگوێرەی ئەم یاسایە پادشا لەجیاتی پاپا سەرۆکی کلێسایە لەئینگلتراو بە ویستو حەزی خۆی دەتوانی تەلاقو هاوسەرگیری بکات. هەروەها ئەم یاسایە ئەوەی قەدەغەکرد کەپیاوانی ئاینیباج بدەنبەپاپا. جگە لەمە دامەزراندنی پیاوانی ئاینیشی وابەستەی پاشا کرد.وە ئوسقوف "کرامر" وەك سەرۆکی ئەساقیفەی کانتربەری دیاری کرا. بەم شێوەیە گرێبەستی هاوسەری کاترین هەڵوەشایەوەو "ئان پۆلین" شوێنی گرتەوە.

لەئەنجامی ئەم هەڵوێستو کارانەی کە هنری پێی هەڵسا، "پاپا کلمینت" ی حەوتەم، وەك پەرچەکردارێك فەرمانێکیپاپاوی دەرکردو تیایدا هنری بێ بەری کردو هاوسەرگیری کاترینو هنری بەبێ شەرعی نیشاندا. بەم شێوە پەیوەندی نێوان ئینگلتراوڕۆما پچڕا.

هنری ڕوبەڕوی بەرەنگاریەکی توند بوویەوە لەلایەن گەورە پیاوانی ئاینیو رەهبانو ژمارەیەك لە بیریارە گەورەکانو ئەو خەڵکانەی بە

گەرمیەوە دەستیان بە ئایین گرتبوو. بەلآم ئەم فرمانیدا بە سزادانی هەر کەسیّ کە دان بەسەرۆکایەتی پاشادا نەنیّ بۆ کلّێسا. هەروەك هەستا بە بلآوکردنەوەو بانگەشەیەکی بەرفراوان لەدژی دێرو رەهبانەکان، بەهۆی ئەوەی ئەوان ملکەچی پاپا بوون. هەروەها فرمانی دەستبەسەراگرتنی سامانو مولّکی کلّێساو دێرەکانی داو بەشێکی بۆخۆی پچڕاندو بەشەکەی تری دابەشکرد بەسەر ئەوخەلّکانەی دژایەتی پاپایان دەکردو شوێنکەوتەی خۆی بوون لەخانەدانو چینی ناوەڕاست دا. لەئەنجامی ئەوانەدا کاردانەوەیەکی جەماوەری لێکەوتەوەو جەماوەر شۆڕشی بەرپا کرد، کەناونرا شۆڕشی خەبات کاران. بەلآم هنری بە خێرایی ئەم شۆڕشەی سەرکوتکردو بەزەبروزەنگێکی زۆر شۆڕشگێڕانی داپۆلّسیو زۆرێکی لیّ لە سێدارەدان. ئەم کوشتو برەش بەزۆری لەنێو پیاوانی ئاینیو رەهبەنو گەورە بیریارەکانی وەك "تۆماس مۆر، ئوسقوف مسن جۆن فیشر" بەڕێوە چوو.

لەگەلّ ئەوەی هنری پەیوەندی لەگەلّ ڕۆما پچڕاندو خۆی کرد بە سەرۆکی کلّێسای ئینگلیزی، بەلآم پەرلەمانی ئینگلیزی، لەسالّی 1539 یاسایەکی شەش ماددەی دەرکرد، کە پارێزگاری لە تەعالیمە گرنگەکانی کاسۆلیکی دەکردو نەریت"گقوس"ی کاسۆلیکی بەهەند هەلّدەگرت، بە توندترین سزاش سزای ئەو کەسانەی دا کە یاخیو سەرپێچی کاربوون. لەملاشەوە هنری هەموو ئەوانەی لە سێدارەدا کە دژی سەرۆك بوونی پاشا بون بۆ کلّێسا. هەروەك هەموو ئەو پرۆتسانتیانەی سوتاند کە باوەڕیان بە نهێنی

تێکەڵکردن"خوانی خودایی" یاخود نهێنیەکانی تر نەبوو. ئیدی قوربانیانی کوشتو بڕی هنری بەهۆی ئەمانەوە گەیشتە چەندین هەزار کەس.

لەو سالآنەی کە ئیدواردی شەشەم "1547-1553"پاشای ئینگلترابوو، بەتوندی کەوتە ژێر کاریگەری لۆسەریزمو کالڤنیزم. ئاینزای پڕۆتستانتی بەهاندانی ئەنجومەنی ڕاسپاردن بۆسەر پاشای پچوك"ئیدواردی شەشەم"، دەستی بەبلآوبوونەوە کردوئینگلتڕاش بەشێوەیەکی بەرچاو پڕۆتستانتیەتی تێدابلآوبوویەوە. ئیدی ئینجیل وەك تاکە ڕێنوێنیکار لەقەڵەم دراو باوەڕبوون بەکرداری چاك بە پووچ وبێ بایەخ سەیرکرا. ئەمجا هەستان بەگۆڕانکاری کردن لەحەوت نهێنیەکەو "ئوسقف کرامر" ئینجیلی وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی. پیاوانی ئاینی ڕێگەیان پێدرا هاوسەرگیری بکەنو قانونی گونجاندن پیادە کرا، کە بەهۆیەوە کلێسای ئینگلیزی پرۆتستانتی پێکهێنرا. جوتیاران هەستان بە هەڵگیرساندنی چەند شۆڕشێك، کە گوزارشتی لە توڕەیی ئەوان دەکرد لەهەمبەر ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر ئایندااهاتووە.

لەدوای ئیدواردی شەشەم بارودۆخگۆڕانی بەسەر داهات. ئەمەش لەدوای ئەوەی "ماری تیۆدۆر"ی کچی هنری هەشتەم "1553-1558" لەکاترین ئەراگۆن، هاتە سەر دەسەلآت" کچی خێزانە کۆنەکەی هنری". ئەم کلێسای گێڕایەوە ناو جوغزی کاسۆلیکیو دانی هێنا بە دەسەلآتی پاپا بەسەر کاروباری ئایینی ئینگلترا. دەستی کرد بە چەوساندنەوەی پرۆتستانتییەکان. ئەمە بەهۆی ئەمەوە بوو کە ماری تیۆدۆر کچی کاترین ئەراگۆن بوو. وەك ئامەژەمان پێدا کاترین کاسۆلیکی بوو، کۆتایی ژیانیشی لەزینداندا

بردەسەرو هەر لەوێشدا گیانی سپارد. لەبەرئەوە ئاساییە کە کچەکەشی "ماریتیۆدۆر" بەکاسۆلیکی بمێتەوە. چونکە "ماری" بە کچی شەرعی "هنری" دانەدەندرا، تاوەکو دایکی بە هاوسەری شەرعی هنری دانەندرێ. ئەم هاوسەرگیریەش کاتێ بە شەرعی دادەنرا کە خودی"ماری" دەستبگرێ بە مەزهەبی کاسۆلیکی، چونکە پاپا وەك باسمان کرد جەختی دەکردەوە لەسەر شەرعیەتی هاوسەرگیری "کاترینو هنری". "ماری" پرۆتستانتیەکانی دەچەوساندەوەو سەرکردەکانی دەکوشتن. لەناو ئەو سەرکردانەی کە سوتێندران "ئوسقف کرامەر بوو.

دوای ئەوە "ماری" شوی کرد بە "فیلپی دووەمی" پاشای ئیسپانیا. ئەم پاشایە دەیویست پرۆتستانتیەکان بگێڕێتەوە جوغزی کاسۆلیکی. وەلێ ئەم سیاسەتە شکستی خوارد، چونکە لەڕووی ئابووریەوە زیانی لەبەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دا، کاتێك ئیسپانیا دەوڵەتێکی قۆرغکار بوو لەسەر بازرگانی جیهانیو داگیرگەکان، جا هاوپەیمانی لەگەڵ ئەو، مانای دەست هەڵگرتن بوو لە بەربەرەکانی کردن لەگەڵ قۆرغکاریەکانی ئیسپانیا. لەهەمان کاتیشدا ئینگلترا دەستیکرد بە هێرش کردنە سەر کەشتیەکانی ئیسپانیاو داگیرگەکانی. وە هەروەها مانەوەی ئینگلترا بە کاسۆلیکی مانای ملکەچبوونی ئینگلترا بوو بۆ دەسەلآتی کاسۆلیکی، هەروەها کۆسپو ئاستەنگ دروستکردن بوو لەبەردەم گەشەکردنی سەرمایەداری، بەهۆی حرامکردنی سوخۆریو پابەند بوون بە فرمانەکانی پاپا، کاتێك پاپا ڕێگەی

دابوو بە قۆرغکاری ئیسپانیاو پرتوگال لەسەر بازرگانی جیهانیو داگیرگەکان.

بەلام لەسەردەمی شاژنە ئیلازابێس"1603-1558" پرۆتستانیەت لەبەریتانیادا چەسپیو ڕەگو ڕیشەی داکوتا. "ئیلازبێس" کچی "ئان پۆلین" بوو، ژمارەیەکی زۆر لەگەلی ئینگلترا متمانەیان بە پرۆتستانتیەت کردو کاسۆلیکیش ڕوەو کەمی ڕۆیشت. پەرلەمان لەسەردەمی ئەمدا یاسایەکی دەرکردو جارێکی تر خۆی لەکلێسای ڕۆما جیا کردەوەو "ئیلازبێس" کرایە سەرۆکی بالای کلێسا. هەروەها پەرلەمان لەیاسایەکی "39" ماددەییدا، کلێسای ئینگلیزی کردە کلێسایەکی پرۆتستانتی ڕووت. ئەمەش بە جەخت کردنەوەی لەسەر ئینجیل وەك تاکە ڕێنوزێنیکارو ڕەت کردنەوەی کردارە چاکەکان، بەوەی کە ببنە هۆیەك بۆ ڕزگاربوونی مرۆڤ. هەروەها بەلابردنی ئەو پیاوە ئاینیانەی کە "ماری تیۆدۆ" داینا بوون. هەموو ئەمانە کلێسای ئینگلیزی وەك کلێسایەکی پرۆتستانتی دەرخست. "ئیلازبێس" لەجێگەی ئەمانەدا هەستا بە دیاری کردنی کۆمەڵەیەکی نوێ لەپیاوانی ئاینی پرۆتستانتی. "ئیلیزابێس" زۆر جەختی دەکردەوە لەسەر گونجاندن لە ئایندۆپەرستشکاری جوداوازانی کلێسای ئینگلیزی بە ئاشکرایی قەدەغە کرد.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئاماژەیەك بە ئێرلەندا بدەین. ئێرلەندا سەرەڕای هەوڵو کۆششەکانی پادشایانی ئینگلترا بۆ بلاوکردنەوەی پرۆتستانتیزم تیایدا، وەلێ هەر بەکاسۆلیکی مانەوە، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر

لەئینگلیزەکان لەهەرێمی "ئەلستر"ی باکوری ئێرلەندا نیشتەجێ بوون. بەڵام تاوەکوو حاڵی حازریش زۆرینەی زۆریان کاسۆلیك مەزهەبن.

## سەرهەڵدانی پرۆتستانتیزمی توندڕەو"پەڕگیر":-

لەماوەی سەدەی شازدەداو لەشوێنە جیاجیاکانی ئەوروپا چەندین کۆمەڵی ئاینی پەیدا بوون کە لەکاسۆلیکی دەرچون. ئەم دەرچوونە زۆر زیاتر بوو لەو دەرچونەی کە "کالڤنو لۆسەرو هنری" لێی دەرچوون. ئەمە جگە لەوەی دژی کاسۆلیکی وپاپەوەیەت بوون، دژی کلێسای پرۆتستانتیش بوون. ئەمە لەکاتێدا کلێسای پرۆتستانتی دەیویست باڵادەست بێت بەسەر کلێسای پرۆتستانتیە بچوکوکان. بەشێوەیەکی گشتی ئەمان دژی هەموو جۆرە سیستەمێکی ڕێکخستنی کەنەسی بوون. مەسیحیەت لەڕوانگەی ئەواندا شێوەیەکە لەژیان و لەتاکدا بەشێوەیەکی نادیار پەیدادەبێت، نەوەك گوزارشت بێت لەڕێکخستن ولێکۆڵینەوەو فێربوونی بیربـاوەڕێکی ئاینی. ئەمانە هاوڕابوون لەگەڵ "لۆسەرو کالڤن" لەوەی کە ئینجیل سەرچاوەی ئاینی مەسیحیو بنەما ڕەوشتیەکان بێت، بەلام لەڕاڤە کردنی ئینجیل لەگەڵ ئەواندا لێك جودا بوون.

کۆمەڵەی "ئەناباپتیست"ەکان، یەکەمینی ئەو کۆمەڵە پەڕگیرانە بوو. ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن "تۆماس مونزر 1489-1525"لە ئەڵمانیا دامەزرا. "مونزر" دوای ئەوەی چویە "گۆتەمبەرگ" داوای لە "لۆسەر" کرد بەتەواوی لەکاسۆلیکیەت دوور کەوێتەوە. بەلام "لۆسەر" ڕەتی دایەوەودەریکرد. بەهۆی ئەمەوە بە ئەڵمانیادا دەگەڕاو بانگەشەی گۆڕینی ئەم حکومەتانەی

دەکرد، بەدامەزراندنی سیستەمێکی هاوبەشی کۆمۆنیستی لەجێگەیاندا.
"تۆماس منزر" ڕاگیر کردنی مندالآنی ڕەت دەکردەوەو جەختی لەسەر ڕاگیرکردنی ئەو تازەپێگەیشتوانە دەکرد کە لەبیروباوەڕیانپاشگەز ببوونەوە. لەبەرئەوە ئەم کۆمەڵەیە بە "ئەناباپتیستەکان ، دووجار ڕاگیرکارەکان" ناسران. پاش ئەوە تاقمێکی تر چوونە پاڵیان کە شوێنکەوتەی "جون لیدن" بوون"1510-1536". "لیدن"بڕوای بەفرەژنی هەبوو خۆی چوارژنی هێنا بوو. هەروەها کۆمەڵەیەکی تریش بەناوی "مانوناتیس"دەرکەوتن. ئەمانەش شوێنکەوتەی "مینوسیمنسی"هۆڵندی بوون. "مینوسیمنیس" لەساڵی "1536" لەکاسۆلیکیەت هەڵگەڕایەوەو بووبە ئەناباپتیستو داوای ژیانێکی تازەی دەکرد لەئاسانکاری ئاینیداو جەنگو سوێند خواردنی حەرام کردو ڕگیرکردنی مندالآنو پێکەوەیی کلێساو دەوڵەتی قەدەغەکرد. یەکێکی تر لەتاقمو گرۆهانە تاقمی "مانونی" کان بوون. ئەمانیش ناویان لەخۆیاننابوو"ئەناباپتیست"و تاوەکو ئەمڕۆش لەهەریکە لەهۆڵنداو باکووری خۆرئاوای ئەڵمانیاو سویسرا بوونیان هەیە. هەروەها کۆمەڵەی "ئەندرو بودنشتاین1480-1541" کۆمەڵەی "کارلستاد" لە کۆمەڵە پرۆتستانتیە توندڕەوەکان بوون. "ئەنرو بودنشتاین" دان پێدا هێنانو وێنە ئاینیەکانو نهێنی تێکەڵ کردنو چینی پیاوانی ئاینی حەرام کرد. ئەمان نەك هەر ئەوەندە بەڵکو زیاتر تێیان پەڕاندو گومانیان کرد لەهەندێ بەشی ئینجیلو دەیانووت: "هەندێ بەشی ئینجیل ناگونجێ پشتی پێببەسترێ".

کۆمەڵـەی "ئەبریـشین" یـەکێکی تربـوو لـە کۆمەڵـە توندڕەوەکان‌و شێنکەوتەی "ڕوبرت براون" بوون. "براون" دوای ئەوەی لە زانکۆی کمبرج دەرچوو، کۆمەڵەیەکی درووستکردو پەیمان‌و بەڵێنی لێوەرگرتن کە خۆیان بپارێزن لەخەڵکی خراپ. پاش ئەمە لەساڵی "1582" کتێبێکی نووسی. "بـراون" لەکتێبەکەیدا دەڵـێ:"پێویستە کڵێسای مەسیحی لەژێر دەستی پاپاو پیاوانی ئاینی بهێنرێتە دەرێ‌و ڕێکبخرێ بە شێوەی لیژنەی سەربەخۆ کە مەسیحیە باوەڕدارەکان بگرێتە خۆ. هەروەها بنچینەو بنەمای خۆی‌و شێوازی تایبەتی خۆی هەبێ بۆ ڕێکخستنی، ئەمجا بەشێوەیەکی دیموکراتی ڕابهێنرێن‌و بەهەڵبژاردنێکی ئازاد قەشە هەڵببژێردرێت لەناو ڕێکخراوەکەیدا". لەگەڵ ئەوەی "بـراون" لـەکۆتایی تەمەنیدا لەگەڵ تـەعالیمی کڵێسای ئینگلیزی سازا وکۆک بوو، بەڵام بیروبۆوچونە سەرەتاییەکانی بووبە هۆی سەرهەڵدانی تاقم‌و گروپی پرۆتستانتی جیاجیا، کە ناسران بە "سەربەخۆخوازان"و، دواتر وشەی "پیۆریتان– توندڕەو"یان– بەسەردا برا.

یەکێکیتر لە کۆمەڵەکان، کۆمەڵی "ئەبرشی" بوون. ئەمانە ئیلهامیان لەپرۆتستانتەڕادیکاڵەکان وەردەگرت‌و بەرەبەرە مەیلیان بەلای "ئەناباپتیستە"کاندا–دەکردو ناوی"باپتیستا"یان– بەسەرابرا. هەروەها بزوتنەوەیەکی عەقلانیەت پەیدابوو بەناوی "بزوتنەوەی "خودابەیەکگرەکان،یەکتاپەرستاکان".ئەوانەلەجیاتی سۆزو "عاگیفە" ئاوەزیان بەکاردەهێنا. جەختیان دەکردەوە لەسەر ڕاڤە کردنی ئینجیل لە ڕێگەی ئاوەزەوە، هەروەها پەرجوو، خورافات‌و شتە نادیارەکانیان لێ لابردو

بە شێوەیەك شتەكانیان ڕاڤە كرد كە لەگەڵ ئاوەزی سەلیم تێك نەگیرێ*.
ئەمانە باوەڕیان بە پەرستراویەتی مەسیح‌و بنەمای سێینە نەبوو، بەهۆی ئەمانەوە لە هەردوو مەزهەبی پرۆتستانتی‌و كاسۆلیكی چونە دەر. زانای بیركاری زانی ئیسپانی "مایكل سێرڤیتس1511-1553" یەكێ بوو لەو قوربانیانەی كە یەكتاپەرستەكان بەختیان كرد. "سێرڤیتس" مامۆستای

* لەڕاستیدا ناكرێ مرۆڤ هەموو شتەكانی دەوروبەری بەئاوەز لێكداتەوە، بەتایبەتی ئەو شتانەی كە بەرهەست نین‌و پەیوەندیان بەئەو دیو سروشتەوە هەیە. چونكە ئاوەز پشت بەپێنج هەستەكان دەبەستێ، پێنج هەستەكانیش تەنها شتە بەرهەستەكان هەست پێدەكەن. هەروەها پێنج هەستەكان لەڕووی وەرگرتنی زانیاریەوە سنوردارن. بۆیە زانیاری ئاوەزیش سنورداره، تەنانەت زۆرجار چاو تەڕاویلكەت لێدەكات بەئاو" لەشوێنێكی وشك‌و گەرم گەر زۆر دوور بروانی دەبینی ناوچەیەكی سەوزو پڕئاو هەیە، كەدەشچی لەناوچەكەی خۆت گەر گەرمترو وشكترنەبێت خۆشتر نی یە"، دەبینین لێرەدا ئاوەز بەهەڵەدا دەچێت. بۆیە ناكرێ ئێمە هەموو شتەكان بەئاوەز لێكبدەینەوە. بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بەئەو دیو سروشتەوە هەیە، وەك ڕوح چی یە؟ لەكوێوە هاتووین؟ بۆكوێ دەچین؟ خودا چۆنە؟ وڵامی ئەمانە لە سنوری ئاوەزی ئێمە بەدەرە بۆیە دەبینین خودا وڵامی ئەوانەی داوینەوە.
لێكدانەوەی شتەكانی ئەو دیو سروشت‌و هەندێ لەو شتە ئاینیانەی كەئەمرۆ ئاوەزی تۆ نایبڕێ وەك ئەوە وایە بتەوی ئاوی دەریایەك لەپەرداغێك بكەیت. لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە ڕۆڵی ئاوەز كەم بكەینەوە بەڵكو پێمان وایەئاوەز لە كایەی خۆیدا ڕۆڵی سەرەكی دەبینێت لە پیشخستنی شارستانیەكان‌و پێویستیشە ڕۆڵی خۆی بگێڕێ لەو بوارانەی كەدتوانی ئەسپی خۆی لێ تاوبدا .هەر لەبەرئەوەشە پیشەوا غزالی لە بارەی ڕۆڵی ئاوەز لە كایەی خۆیدا دەڵێ:"ئاوەز چاوەو شەریعەت ڕوناكیە" تەنانەت بەركارهێنانی ئاوەز لە بابەتە شەرعیەكاندا بە كارێكی پەسەند داندراوە. هەربۆیە گەر زانایەك ئاوەزی بەكاربێنێ لەبواری شەریعەتدا گەر ئیجتیهادەكەیشی ڕاست دەرنەچێ ئەوا پاداشتێكی هەیە.بەڵام دەبێ وریابین ئاوەز گەر لە كایەی خۆیدا بەكارنەهێنرێ توشی چەندان هەڵە دەبێ. (وەرگێڕ).

زانکۆ بوو لەژمارەیەك لەزانکۆکانی ئەورووپای وەك زانکۆی پاریس لۆڤین. پاشان لەڤیننا گیرسایەوەو لەوێ لەگەڵ کلێسای کاسۆلیك تێکەڵ بوو. بەلاّم لێکۆڵینەوەیەکی نوسی کە تیایدا سێینەیو پەرستراویەتی مەسیحی ڕەت کردەوە. "سێرڤیتس" ئەم کتێبەی پێشکەشی "جۆن کالڤن" کرد، بەو مەبەستەی کاریگەری لەسەر کالڤن دروست بکات، کەچی بە پێچەوانەوە کالڤن توشی شۆك بوون هاتو مووی سەری لەگەڵ گرژ بوو. هۆشداری ئەمەی دا، بەلاّم ئەمە لەلای کاسۆلیکیەکان زانراو بوو. سێرڤیتس بەهۆی مەترسی لەسەر ژیانی لە ڤییناوە ڕووی کردە جنێڤ. بەلاّم لەوێدا ژیانی نەبردە سەرو لەلایەن کالڤنەوە سوتێنرا.

وەلێئەوانەی کاریگەربوون بە یەکتاپەرستەکان، بنەمای ئەم ئاینزایەیان بلاّوکردەوە، کە هەندێ جارپێیان دەوترا بنەماکانی "سۆزینی"، بەهۆی ئەوەی دوو کەس لە ئیتالیا بەم ناوە بنەماکانیان بلاّو دەکردەوە، کە خۆیان دەبینیەوە لە "لیلۆ سۆزینی"و برازاکەی "فاوستو سۆزینی". هەروەها "جاکوب هێرمانس 1560 -1609" یەکێ بوو لەوانەی ڕەخنەی لە پرۆتستانتی دەگرتو دژی دەمارگیریو دۆگماوی کالڤنی بوو، هەروەها دژایەتی چەوسانەوەی شوێنکەوتەکانی دەرکرد لە هۆڵندا. شاینی باسە سێرڤیتس خەڵکی هۆڵندا بوو.

## گرنگی کلێسای پرۆتستانتی دەمارگیر:-

لەسەدەی شازدە کلێسای پرۆتستانتی دەمارگیر گرنگی نەبوو، بەهۆی ئەوەی کە شوێنکەوتەکانی لەچینی ژێرەوە بوون، کە ئەمانە لەلایەن کاسۆلیکیو پرۆتستانتی دەچەوسێنرانەوە. بەلاّم بە تێپەڕینی ڕۆژگار

کاریگەریان لەسەر کلێسا سەرەکیەکانی پرۆتستانتی دروستکرد. چونکە زۆرینەی خەڵکی ئەوەیان بۆدەرکەوت کەئەمە دەرنجامێکی سروشتی بیرکردنەوەی تاکە، کاتێک پێشتر لۆسەر جەختی دەکردەوە لەسەر بیرکردنەوەی تاک بۆخۆی، هەروەها بڕیاردانی تاك لەسەر شتەکان پشت بەستن بوو بە دەقی ئینجیل. بەهەمان شێوە کالڤن ئاماژەی پێدابوو.

کلێسای توندڕەوی کالڤنیزم جیاوازی تێکەوتو کاریگەری لەسەر لۆسەریزم دروستکرد. بەهۆی ئەمەوە "دنیانەویستان‌و تەقوا دارەکان" سەریانهەڵدا. هەروەها لەکلێسای ئینگلیزی "پیۆریتان‌و میسودیستەکان" بە دیار کەوتن، کە ڕێگەیان خۆش کرد بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵەیەکی تر لەئەمریکا بەناوی "فێندەمیتالیست". ئەمانە زۆر توندڕەوو دەمارگیرتر بوون لەپیۆریتانیەکان. ئەمانە دەیان وت ئینجیل دوورە لەهەڵەو کەم‌و کوڕی. بەلاّم بزوتنەوەی یەکتاپەرستی وەك پێشتر باسمان کرد، جۆرێك لەبیرکردنەوەی ڕەخنەیی ئاوەزگەری لەناویاندا سەریهەڵدا، ئەمانە بە ڕەخنەگرتنیان لەئینجیل‌و ڕەتکردنەوەی سێینەو پەرستراویەتی مەسیح، ڕێگەیانخۆشکرد بۆ بلاّو بونەوەی بیرکردنەوەی ئازادانە لە ئاینی مەسیحیدا.

## ئەنجومەنی تەرنت‌و چاکسازی کردن لەنێو کلێسای کاسۆلیکی

## "1563-1545"

لەهەریەکە لەولاّتانی ئیتالیا، نەمسا، فەڕەنسا، ئیسپانیا ، چەندەها جولاّنەوەی ئاینی سەریانهەڵدا کەمەبەستیان چاکسازی کردن بوو لە کلێسای کاسۆلیکی، بەبێ ئەوەی لەم مەزهەبە دەربچن. ئەوان زیاتر مەبەستیان لادان‌و بنبڕکردنی ئەو گەندەڵیانە بوو کە کلێسای کاسۆلیکی گەندەڵ کردبوو.

ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی هەبوون داوای ڕۆشنبیرکردنی پیاوانی ئاینی کاسۆلیکیان دەکرد، هەروەها داوای لابردنی ئەو بنەما خراپانەیان دەکرد کە چووبووە ناو کڵێسای کاسۆلیکی. پاپاکان جوڵانەوەو بزوتنەوەی لۆسەریان وەك کێشەیەکی نێوان ڕەهبەنەکان نەدەبینی، بەڵکو زۆر لەوە بەمەترسیدارتریان سەیر دەکرد. بەڵگەشمان بۆ ئەمە، بێ توانایی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەمە لەزاڵ بوونی بەسەر لۆسەر، بەوەی نەیتوانی کاریگەری لەسەر لۆسەر دابنێت. توانجەکانی لۆسەر لەدژی ڕەهبەنیەت وگۆشەنشینی، کاریگەری لەسەر رەبەنیەت دانا لەئیتالیا.

رەبەنیەت دووبارە بوژایەوە، ئەمەش بە سەرهەڵدانی ژمارەیەك ڕێکخستنی ڕەبەنی نوێ، بە ناوی "برایانی ئاینی"، کە بەناوبانگترینیان "کیچوجین"بوو. ئەم ناوە دەدرایە پاڵ ئەو ڕۆبو کڵاوە خۆڵەمێشییەی کە دەیانپۆیشی. ئەمانە لەو پەڕی سادەیی دەژیانو هاوکاری بێدەرامەتانو هەژارانیان دەکردو ئامۆژگاریان دەکردن. بەمە چینی خوارەوەی ئیتالیا، تەواو تەواو گەردن کەچ بوون بۆ کاسۆلیکی.

لە ساڵی "1545" هەوڵی چاکسازی کردن لەکڵێسای کاسۆلیکی دەستی پێکرد. پاپا بانگهێشتی پیاوانی ئاینی مەسیحی کرد بۆ سازکردنی کۆبونەوەك لە شاری ترینتی ئیتالیا. ئەم کۆبونەوانە بەشێوەی زنجیرە کۆبونەوەیەك بەڕێوەچوو تاوەکو ساڵی "1563" بەردەوام بوو. پاپا داوای لەپیاوانی ئاینی کرد بە مەبەستی چاکسازی کردن ئامادەبن. بەڵام ئەمان لە ترسی کاریگەریەکانی ئیتالیا لەسەر ئەنجومەن، چەند مەرجێکیان پێشکەش کرد. وەلێ ئەم مەرجانە هیچکات بۆ کڵێسای کاسۆلیکی نەدەگونجا قبوڵی

بکات، بەتایبەت سازش کردن لە بیروباوەڕ لەڕووی کردەیی‌و نەزەریەوە. سازشێك بتوانێ لەگەڵ پێشکەوتنی زانست‌و فیکر بێتەوە، واتا بیروباوەڕ وایلێبکرێ لەگەڵ زانست‌و فکر تێکنەگیرێ. بەلاّم بەپێچەوانەوە کلێسای کاسۆلیکی گورزێکی توندی لەهەموو بەهاو قیەمە تازەکان وەشاندو دەستی گرتەوە بە بیروباوەڕی کۆن. ئەمەش بە جەختکردنەوەی لەسەر "حەوت نهێنیەکان" وەك ئەرکێ لەسەر هەموو تاکێکی کاسۆلیکی، هەروەها پێداگری کردنی لەسەر کردارە باشەکان‌و دانهێنان بە دەسەلاّتی پاپا بەسەر هەموو کاروبارێك کە پەیوەندی بە کلێسا وبەڕێوەبردنیەوە هەبێت. هەروەها بەرزکردنەوەی دەسەلاّتی ڕۆحی بەسەر دونیایی‌و بە تاکە سەرچاوە دانانی پاپاو کلێسا بۆ لێکدانەوەی ئینجیل، وە جەخت کردنی لەسەر رۆشنبیرکردنی پیاوانی ئاینی.

لەهەمانکاتدا هەندێ چاکسازی دارایی‌و فێرکاری ڕەگەڵ چاکسازییەکانی ترخرا. بەرتیل وکۆستەکی"واسگە"کردن وفرۆشتنی پۆستەکانی کلێسا قەدەغە کراو جەخت کرایەوە لەسەر کردارە بەرزو پەسندەکان، بەتایبەت بۆپیاوانی ئاینی. هەروەك زمانی لاتینیش بە زمانی فێرکاری ئاینی گوزارشتی لێکرا.

سەرەڕای ئەوەی باسمان کرد، کتێبێکی پوخت لەڕۆما دەرکرا کە تەعالیمەکانی کلێسای کاسۆلیکی لەخۆ گۆتبوو. هەروەها کۆپیەکی نوێی ئینجیل بە زمانی لاتینی دەرکراو کرایە کۆپیەکی پشت پێبەستراو. لیستێکیش ڕاگەیەندراو تیایدا ناوی ئەو کتێبانەی تیادا نوسرابوو کە لەلایەن

کاسۆلیکەکانەوە خوێندنەوەیان حەرام کرا بوو، بەهۆی هەرتەقە بووونی کتێبەکان"بە بڕوای کاسۆلیکەکان". شایانی باسە کتێبەکانی "لۆسەرو کۆپەرنیکۆس" لەناو ئەو لیستەدا ناویان هاتبوو. دادگاکانی پشکنینیش بەو دەسەلاتە بەرفراوانەی کە هەیان بوو ڕاسپێردران بۆ لەناوبردنی هەلگەڕاوەکان. ئەنجومەن جەختی کردەوە لەسەر ڕاستی پەرەجوو ئامادە بوونی گیانەکانو خوانی خودایيو پیرۆزی پاشماوەی قدیسەکان.

**بزوتنەوەی یەسوعی:-**

لەم ماوەیەدا بزوتنەوەیەکی نویێ دەرکەوت، کە کاریگەریەکی کارای هەبوو بەسەر بوژانەوەی کاسۆلیکی. ئەم بزوتنەوەیەش پێی دەوترا: "بزوتنەوەی یەسوعی". "ئەگناتیوس لیولا1491-1556"بە دامەزرێنەری ئەم بزوتنەوەیە دادەنرێ لەسالی "1534".پاپاش لە سالی "1540" دانی بەم بزوتنەیەداهێناو ڕەزامەندی لەسەر پەیرەوی ئەم دامەزراوەیە نیشاندا.

ئەکناتیوس سەربازێکی سوپای ئیسپانی بوو، ئیسپانیاش لەم کاتەدا شوێنەکەوتەی ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم بوو، کە لەم کاتەدا جەنگی لەگەڵ فەرەنسادا سازکردبوو. ئەگناتیوس بەشداری لەم جەنگەدا کردو بریندار بوو، بەهۆی برینەکەیەوە بەرەو نەخۆشخانە بەڕێخرا. لەکاتی برینداریدا ژیانی مەسیحو قدیسەکانی خوێندەوەو کاریگەر بوو پێیان. ئەم کاریگەریە وایکرد بڕیاربدات ژیانی خۆی بۆ مەسیحو کلێسا تەرخان بکاتو خەباتبکات بۆ بەرزکردنەوەی وشەی خودا. جا پاش بەسەربردنی چەند سالێك لەبێبەرهەمی کە بەسەری بردبوو لە خزمەتی کلێسا، بڕیار دەدات لە ڕووی ڕۆشنبیریەوە

خۆی پێبگەیەنێت. بۆیە چوو بۆ زانکۆی پاریس‌و لە کلاسیك‌و فەلسەفەو لاهوت دا دەستی بە خوێندن کردو هەر لەوێشدا ژمارەیەك ڕۆشنبیرو باوەڕدارە توندەکانی ناسی، کە دواتر بوونە لایەنگرە سەرەتاییەکانی بزوتنەوەی یەسوعی. مەبەستی ئەم کۆمەڵەیە بڵاوکردنەوەی مەسیحی بوو لەناو مسوڵمانان، بەڵام دواتر بوونە مژدەدەر لەناو پرۆتستانتیەکان‌و خەڵکی شوێنەکانی تر لە دەرەوەی ئەورووپا.

شێوازی ڕێکخستنی یەسوعی هاوشێوەی ڕێکخستنی سوپا بوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە دامەزرێنەرەکەی سەرباز بوو. بنچینەکانی ئەم بزوتنەوەیە خۆی دەبینیەوە لە سادە ژینی‌و پاکیزەیی‌و گوێڕایەڵی‌و پشتگیری بۆ پاپا. ناوەندی بزوتنەوەکەش لەڕۆما بوو. یەسوعی پێداگری دەکرد لەسەر باڵادەستی تەواو بەسەر ئەندامەکانی‌و گوێڕایەڵی کردنی ئەوان بۆ سەرکردەکانیان. کاتێکیش "ئەگناتیوس"کاتێ سەیری کرد کە کڵێسای کاسۆلیکی لەشەڕدایە لەگەڵ پرۆتستانتی، تێکۆشانی لایەنگرانی تەرخانکرد بۆ گێڕانەوەی پرۆتستانتیەکان بۆ جوغزی کاسۆلیکیەت.

یەسوعیەکان لەو کاتەوەی کە کۆمەڵەکەیان دامەزراند، چوونە نێو خەباتی ئاینی‌و چەندین خوێدنگەو زانکۆیان دامەزراند، کە بەجوانی‌و نایابی سیستەمی فێرکاری ناوبانگیان دەرکرد. هەرچی کڵێسا لەپیرۆزی‌و پیرۆزڕاگرتن لەدەستی دابوو، ئەوان بەهۆی کۆششی زانایانیان گێڕایانەوە کە لەو پەڕی بەرزی ئاستی زانست‌و زانیار دابوون. ئەوان لەگۆڕەپانی گوتارو ئامۆژگاریدا گەیشتنە چڵەپۆپەی ڕوونی گووتەو جوانی گوزارشت‌و دەربڕین‌و

زمان پاراوی، هەر ئەمانەش هۆیەك بوون بۆ ئەوەی لە مەیدانی تەبشیریدا سەرکەوتنێکی بەرچاو بەدەستبهێنن.

کاریگەری یەسوعیەکان زۆر بەهێز بوو، ئەوەتا کاتێك پۆڵەندا زۆری نەمابوو ببێتە پرۆتستانتی، ئەوان توانیان وابکەن پۆڵەندا بە کاسۆلیکی بمێنێتەوە. بەهەمانشێوە توانیان کاسۆلیکیەت لە باشوری ئەڵمانیاو بەلجیکاو لەناو کۆمەڵە گەورەکانی هەنگاریاو چیکۆلۆفاکیاش بەردەوامی پێبدەن. بەلاّم لەهەمبەر بەریتانیا سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا. ئەوان لەشوێنەکانی تری جیهان توانیان ژمارەیەکی بەرچاو لەهیندیە سورەکانو چینیەکانو هیندیو خێڵە سەرەتاییەکان بکەنە مەسیحی. وەك قەرەبوو کردنەوەیەك لە بەرامبەر لەدەستچوونی باکوری ئەوروپا.

پاپا ڕێککەوتنێکی مۆر کرد کە ناسراوبوو بە کۆنکوردات. لەم ڕێککەوتننامەیە بەربژاری ئاینی بەخشی بە ئیسپانیاو پرتوگالو ئیتالیاو فەرەنساو نەمسا، ئەم بەربژاریەش وایکرد کلێسای ئەم ناوچانە ببنە کلێسای نەتەوەیی .

## ئاکامەکانی شۆڕشی ئاینی

### 1ـ بەش بەش بوونی کلێسای مەسیحی:ـ

جگەلەوەی کە کلێسای مەسیحی پێشتر دوو بەش بوو، کە خۆی دەبینیەوە لە ئەرسەدۆکسیو کاسۆلیکی، وەلێ بەهۆی شۆڕشی ئاینی بەشێکی تریشی لێ جیابویەوەو ناسرا بە پرۆتستانتی.

ئەرسەدۆکس:ـ

ئەرسەدۆکسی وەك ئـاینزاو بیروباوەڕێـك بـاڵی كێـشا بـوو بەسـەر نیمـچە دوورگەی بەڵكان‌و ڕوسیا. ئەستەمبۆڵ پایتەخی کڵێسای ئەرسەدۆکسی بـوو. ئەرسەدۆکسی لەگەڵ کاسۆلیکی لێك جیاوازی تێکـەوت لـەو کاتـەی کـە دانـی نەهێنا بە سەرۆك بونی پاپا بۆ کڵێسای مەسیحی. کڵێسای کاسۆلیکیش دانی نـەدەنا بـە پاشـكۆیەتی کڵێـسا بـۆ دەوڵـەت، هـەروەك بـارو دۆخـی کڵێـسای ئەرسەدۆکسی وەها بوو.

دوای کـەوتنی ئەسـتەمبۆل لەسـاڵی 1453. بـەتریاریکی ئەرسەدۆکـسی زۆرێك لـە بەربژاریـەکانی لـە دەسـتدا کـە پێـشتر بەهرەمەنـد بـوو لێـی، وەك سـەرۆکی ئەرسەدۆکـسی لـە ئـەوروپای خۆرهـەلآت. بـەلآم دوای کـەوتنی ئەستەمبۆل بە تریاریـك بـوو بـە شوێنکەوتەی سـوڵتانی عوسمـانی. لەسـاڵی 1582 بە تریاریك "قستنتین" لەبەر ڕێـزی قەیـسەری ڕوسـی ڕەزامەنـد بـوو لەسـەر بەخـشینی هەنـدێ بەربـژاری بـە سـەرۆکی کڵێـسای ئەرسەدۆکـسی لەڕوسـیا. وەك دەسـەلآتی بـەڕێوەبردنی کڵێـسای ڕوسـیاو چـاودێری کردنـی پرسـە ئاینیـەکانی ئـەوێ. بـەم شـێوەیە کڵێـسای ئەرسەدۆکـسی لـەڕووی بەڕێوەبدنەوە بوو بە دوو بەش، بەشێکی لە ئەستەمبۆڵ‌و بەشەکەی تـری لـە مۆسـکۆ مایـەوە. ئەرسەدۆکـسی بـە شۆڕشـی پرۆتـستانتی کاریگـەر نـەبوو، هەروەها دانی نابوو بە حەوت نهێنیەکەو شێوازی کەنەسەیی وخوایـەتی سـێ کوچکەی پیرۆز "باوك ـ کوڕ ـ گیانی پیرۆز"،وە هـەموو ئـەو کاروبارانـەی کـە کاسۆلیکی دانی پێداهێنابوو، ئەمیش باوەڕی پێیان هەبوو.

کاسۆلیکی:-

کاسۆلیکی هەروەك پێشوو مایەوە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە لەکۆنگرەی "تەرنت"هەندێ گۆڕانی بەسەرداهات، هەروەك پێشتر باسمان کرد. کاسۆلیکی لەهەر یەکە لەولأتانی "ئیتالیا - پۆلندا - نەمسا - باشوری ئەڵمانیا - ناوچەی ڕاین‌و بەلجیکا - ئێرلەندا" مایەوەو لە ئەمریکای لاتینی‌و فلیپپینیش بلأو بویەوە.

پرۆتستانتی:-

ئاینزای پڕۆتستانتی لە"ناوەڕاست‌و باکوری ئەڵمانیاو دانیمارك‌و سویدو نەرویج‌و فنلنداو باکوری ئیرلەنداو ئەمریکای باکور (کنداو ویلایەتی یەککگرتووەکان)و ئیستوانیاو لیتوانیا" پەخشان بوو. پرۆتستتانتی لەکاسۆلیکی‌و ئەرسەدۆکسی جیاواز بوو لەبارەی حەوت نهێنیەکە. پرۆتستانتی جگە لە "ڕاگیرکردن‌و خوانی خودایی"، پێنج نهێنیەکەی تری بە پوچو بێ بەها دادەنا. ئەم دووانەشی وەك خۆی نەهێشتبۆوە، بەڵکو باوەڕی وابوو کە تێکەڵکردن تەنها هێمایەکە بۆ "خوانی خودایی"، نەوەك بەوشێوەی کە کاسۆلیکەکان باوەڕیان پێی هەبوو بەوەی لەگەڵ ئاماژە کردنی قەشە نانەکە دەگۆڕێ بۆ خوێن‌و گۆشتی مەسیح. هەروەها "ڕاگیرکردن"یشی- تەنها بۆ هەرزەکاران هێشتەوە. پرۆتستانتی پێداگری دەکرد لەسەر باوەڕ ی ڕووت، ئەمەش لەپێناو ڕزگاربوونی هەمیشەیی. هەرچەند ئەمەش لەلایەن کالڤنیەکانەوە شێوازێکی تری هەبوو، کاتێ کالڤنیزم باوەڕی وابوو کە کە

ڕزگاربوون لەئەزەلەوە بڕیاری لەسەر دراوە. کڵێسای ئینگلیزیش کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، لەسەر بنچینەکانی لۆسەر بوو.

پرۆتستانتی سیستەمی کەنەسیو چینی پیاوانی ئاینی ڕەت دەکردەوە، هەروەك لەلایەن کاسۆلیکیو ئەرسەدۆکسی پەیڕەوی لێدەکرا. لۆسەر ئوسقوفی وەك ڕێکخەری کاروباری کڵێسای هێشتەوە. وەلێ کالڤن سیستەمی کەنەسی بەتەواوی ڕەت دەکردەوەو منستری وەك مۆژیار[1] و بەڕێوبەری کڵێسا دانا. لەملاشەوە کڵێسای ئینگلیزی سیستەمی کەنەسیو چینی پیاوانی ئاینی هێشتەوە، بەلاَم پاشاو حکومەتی ئینگلیزی لەجێگەی پاپا دانداران و، ئەمان کڵێسایان بەڕێوەدەبرد. دروشمی ڕێوڕەسمی ئاینیشیان لەگەڵ ئەم کڵێسایانە لێك جودا بوو.

**2- دەمارگیری ئاینیو نەمانی لێبوردەیی:-**

یەکێکی تر لەئاکامەکانی شۆڕشی ئاینی، دەمارگیری ئاینیو پەیڕەو کردنی سیاسەتێکی توندو تیژو دڵڕەقانە بووبەرامبەر یەکتر. دەمارگیری ئاینی شتێکی نوێ نەبوو لەسەدەی شازدە، بەڵکو دەمارگیری وخەسڵەتی چاونەپۆشین دێرینەو لەگەڵ مرۆڤدا سەری هەڵداوە، بۆ ئەمەش نمونەی مێژوییمان زۆرە. دەمارگیری لەنێو هۆزو خێڵو نەتەوەو گروپە ئاینیەکان بوونی هەبوو. ئەگەر بێتو باسەکەمان تایبەتتر بکەین بە دەمارگیری ئاینی، هەروەك تایبەتە بەم لایەنە، ئەوا دەبینین هەمیشە کەمە ئاینیەکان لەلایەن

---

[1] مۆژیار : ئامۆژگاری کەر

زۆرینەکانەوە توشی چەوساندنەوە بوون، هەروەك لەکاتی بلاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی دا لەڕۆما کە مەسیحیەکان لەلایەن ڕۆمەکانەوە دەچەوسێنرانەوە. بەلام لەکۆتایی ڕۆژگاری ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی، ئاینی مەسیحی بوو بە ئاینی زۆرینە، ئیدی ڕەوشەکە پێچەوانە بویەوەو ئەمجارە مەسیحی بت پەرستی کەمینەی دەچەوساندەوە.

کاسۆلیکیش لەم دەمارگیریە بەشدارەو ئەمیش لەخۆرئاوادا پیادەی سیاسەتێکی توندڕەوانەی کرد بەتایبەت لەهەمبەر هرتەقەو هەلگەڕاوەکانی کلێسا، کە زۆر بە توندی دژاتی دەکرن، لەسەدەکانی ناوەڕاستدا. ئەم دژایەتیبەی ئەمان بۆ هەرتقەو هەلگەڕاوەکان زۆر زیاتر بوو لە دژایەتی کاسۆلیك بۆ مسولمانانو جولەکە. "هرتقە یان هرتقی بە ڕۆیشتن ڕووەو گومڕاییو مەترسی لەسەر کۆمەلگە لەقەلەم دەدرا. ئەوانەشی تومەتبار بوون بە هرتقە، ناپاكو ئاژاوە گێڕەکان بوون کە شۆڕشی کۆمەلایەتیان مەبەست بوو. سا کاتێکیش هرتقە نەیاری سیاسیو ئابووری خۆی دەرخست، لەباربردنی بە هۆکاری سیاسیو ئابووری دەکرا. کلێسای کاسۆلیك بۆ لەڕەگوڕیشە دەرهێنانی هرتقە هەستا بە دامەزراندنی دادگای پشکنین لەسەدەی سێزدە. ئەندامانی ئەم دادگایانە بریتی بوون لەڕەبەنەکان، کە بە دڕندانەترین شێوە، ئەشکەنجەی گومان لێکراوانو تۆمەتبارانیان دەدا، بەمەبەستی ئەوەی دان بنێن بەوتۆمەتەی کە پێی تۆمەتبارن "زۆر جار ئەو تۆمەتانە تەنها لەسەر گومانێك هەلچنرابوون....(وەرگێڕ)". کلێسا بڕیاری مردنی بەسەر کەسدا نەدەسەپاند، تەنانەت هەرتەقەش، بەلام دادگاکانی

پـشكنينلەتواناياندا هـەبوو بڕيـاری مـردن بەسـەر خەڵكدا بـدەنو ڕادەسـتی دەسـەڵاتی بكـات بـۆ جێبـەجێ كردنـی ئـەم بڕيـارە. زۆرێـك لـە تاوانبـارانو ئەوانەی كە بە هرتقە تاوانبار كرابوون، بەدڕندانەترين شێوە ڕووبەڕوی مـەرگ دەكرانەوەو دەسوتێنران، چونكە هەموو ئەوانە دژايەتی كۆمەڵێ بيروبـاوەڕی كڵێسايان دەكردو ڕەخنەيان لە گەندەڵيەكانی كڵێسا دەگرت.

وەلێ لەئـەنجامی بڵاوبوونـەوەی هـزری نـوێو كلاسـيكيەتو بزوتنـەوەی مرۆگەریو پەيوندی كردنی ئەوروپيەكان بە خەڵكانی شـوێنەكانی تـر بـەهۆی دۆزينەوە جوگرافيەكان. دەمارگيری لەناو ئەوروپيەكان دای لەكزیو كڵێـسای كاسۆليكی لە نيوەی دووەمـی سـەدەی پـازدەو سـەرەتای سـەدەی شـازدە، لێبـوردەی زۆری پـەيڕو دەكـرد. بـەلأم ئـەم بـارو دۆخـە هـەروا نەڕۆيـشتو لەئـەنجامی شۆڕشـی ئـاينی، دەمـارگيری ئـاينی بەشـێوەيەكی زۆر خەسـت سـەريهەڵدا كـە لـە پێـشتر وێنـەی نـەبووە. پـەيڕەوكردنی ئـەم سياسـەتی دەمارگيريە لەم كاتەدا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆيەك، لەوانە:ـ

پادشـاكانی كاسـۆليكو پرۆتـستانتيەكان دەيانويـست يەكيـەتی ولأتيـان بەدی بێننو هێمنـیو ئاسـايش لەولأتيانـدا بـچەسپێنن بـۆ مەبەسـتی بـەڕمێن خستنی بازرگانیو زيـادبوونی سـەروەتو سـامانيان. بـەلأم پارچەپارچـەيیو بەشـبەش بـوونی ئـاينیو تـايفی، نوێنگـەی دروسـتبونی ئـاژاوەو پەشـێویو تێكـدانی ڕيزەكـانی گـەل بـوو، وە هۆكارێـك بـوو بـۆ دروسـتبونی تەگـەرە لەبـەردەم يەكيـەتی نيـشتمانیو گەشـانەوەی بازرگـانی. ئەمـەش وايكـرد

پاشاکان لە هەوڵی لەناوبردنی هەموو ئەو شتانەدابن کە ڕۆڵەکانی گەل بەرەو ناکۆکیو پارچەپارچەیی دەبات.

لە ولاتە کاسۆلیکیەکان بەو پەڕی بێ باکیەوە دەکەتنە وێزەی پرۆتستانتیەکانو لەناویان دەبردن، هەروەك فەرەنسا نواندی. ولاتە پرۆتستانتیەکانیش بەهەمانشێوەی کاسۆلیکیەکان هەمووئەو کەسانەیان دەچەساندەوەو لەناویاندەبردن کە هاومەزهەبیان نەبوون، هەروەك ولاتە ئەسکەندەنافیەکان. جەنگی سی ساڵە"1618-1648" بەشێکە لەو دەمارگیریە سەرشێتانەیە، کە ئەو کاتە پەیڕەوی لێ دەکرا. بەلام بە تێپەڕینی ڕۆژگار چەند هەنگاوێکی ئازایانە نراو داوادەکرا سیاسەتی لێبوردەیی ئاینی بگیرێتە بەر. "سیگسموند"ی کاسۆلیکی کە پادشای پۆڵندا بوو، لە سالانی "1548-1572" هەستا بە پەیڕەو کردنی سیاسەتێکی مامناوەند لەگەڵ پرۆتستانتەکان، بەهۆی ئەوەی خێزانەکەی میرێکی ئەڵمانی پرۆتستانتی بوو. لەدوای مردنی ئەم پاشایە، پەرلەمانی پۆڵندی ئازادی ئاینی بەخشی بە خەڵکانی غەیرە کاسۆلیك. لەملاشەوە دەوڵەتی عوسمانی ئازادی تەواوی ئاینی بەخشی بە دانیشتوانی بەلقان. لەفەرەنساش هنری چوارەم، بەپێی پەیمانی نانت "1598" ئازادی ئاینی بەخشی بە پرۆتستانتی. چەند هۆکارێك هەبوو بۆ ئەوەی کە لێبوردەیی ئاینی جێگەی دەمارگیری ئاین بگرێتەوە. چونکە لەدوای ئەم هەموو کوشت وبڕە خەڵکی گەیشتنە ئەو ڕاستیەی کە لەدووبەرەکیو پارچەپارچەیی سود نابینن‌و بە پێچەوانەوە لێبوردەیی ئاینی مایەی یەکیەتی نیشتمانیو سەربڵندی

پاشایەتیە. کەسە دڵسۆزو خەمخۆرەکان لەهەردوو بەرەی کاسۆلیكو پرۆتستانتی، وایان دەبینی کە پێویستە لێبوردەیی بەرامبەر یەکتری بنوێننو سەربەستی جێبەجێ کردنی دروشمە ئاینیەکان بەیەکتری ڕەوا ببینن. هەروەها جەنگو شەڕە ئاینیەکان پەرچەکردارێکی دروستکرد لەدژی توندو تیژی، ئەو توندو تیژیەی کە لەهەناویاندا بێزاریو بوغزو کینەی هەڵگرتوەو خستویەتە هەناوی زۆرینەی خەڵکی. لەملاشەوە بزوتنەوەی ئاوەزگەری سەریهەڵدا کەداوی لەخەڵکی دەکرد گرنگی بدەن بە کاروباری زیندوی وەك زانستیە سروشتیەکان، کە مایەی خێری تاكو کۆمەڵە.

## کاریگەری شۆڕشی ئاینی لەسەرئاکارو ڕەوشتو بنبڕکردنی جادوگەریو وە درەنگ خستنی فێرکاری:-

یەکێ لەو بوارانەی کە کاریگەر بوو بە شۆڕشی ئاینی، بواری ڕەوشتو ئاکار بوو. هەریەکە لە کاسۆلیكو پرۆتستانتەکان هەوڵیاندەدا لەڕێگەیهەڵسوکەوتەکانیانەوە، بەڵگەی ئەوە بهێننەوە کەمەزهەبەکەیان بەرەو ڕەوشتە بەرزەکان هەڵیان دەنێ. وە هەریەکەو ئەوی تری تۆمەتبار دەکرد بە نەمانی ڕەوشتو داتەپینی ئەخلاقی. پرۆتستانتەکان، کاسۆلیکیەکانیان تۆمەتبار دەکرد بە درۆکردنو چەواشەکاری،لەملاشەوە کاسۆلیکەکان پرۆتستانتیان بە گەندەڵی داریی وڵات تۆمەتبار دەکرد.

لەم کەشو هەوایەدا کەپڕی بوو لە تۆمەتو تەشەر لەیەکتردان، پیۆریتانیەکان سەریانهەڵدا، کە پێداگریان دەکرد لەسەرخۆ بەدورگرتن لەچێژەکانو پیادەکردنی ڕەوشتە بەرزو پەسندەکانو کاری بە بەرهەمو

کەمکردنـەوەی پەشـێویە ئاینیـەکانو زیـاد کردنـی ڕۆژانـی کـار. بیۆریتـانی لەنێوانی کاڵڤنیو پرۆتـستانتیە دەمارگیرەکانـدا بەپلـەی یەکـەم بلاّوبویـەوە. بـەلاّم کاسـۆلیكو لۆسـەریەکان بـە هەمانـشێوە پیـادەی یاسـایەکی تونـدیان دەکرد لەدژی داتەپینی ڕەوشتو پابەند نەبوون بە ئاین.

جگە لەمانەی باسمانکرد، شۆڕشی پرۆتستانتی کاری کـردە سـەر هونـەر، بەتایبەت هونـەری بیناسـازی. کاسـۆلیکەکان کلێـسای گـەورەو کتدرائیـەیان بنیـات دەنـا، وەلـە دروسـتکردنیدا بـەناوبانگترین هونەرمەنـدو بیناسـازیان دەخـستە کـار، ئەمـەش لـەپێناوی سـازکردنی ئاهـەنگو کەرنـەڤالّی ئـاینی، بەتایبەت بـۆ ئەنجامـدانی کۆنوێـژ. کاسـۆلیکەکان تـەنها گرنگیـان بـە کلێـسا سازکردن نـەدەداو بـەس، بـەڵکو گرنگـی زۆریـشیان بـە پەیکـەرو وێنـەدەداو کلێـساکانیان بـە وێنـەی جـوانو پەیکـەری نـاوازە دەڕازانـدەوە. وەلیّ پرۆتستانتەکان زۆرێك لەبیروباوەڕی کاسۆلیکیەکانی ڕەت دەکردەوە، لەوانـە کۆنوێـژ، کـە بەهۆیـەوە ڕۆژگـاری سـازکردنی کاتدرائیدیـەکان ئـاوابوو. دروستکردنی پەیکەرو نەخشاندنی وێنـەو نیگـار کۆتـایی هـاتو هونـەر لـەناو جیهانی پرۆتستانتیەکاندا توشی لەناوچوون هات. پاش ئەمە ماوەیەکی زۆری پێچوو، تا دیسان ولاّتە پرۆتستانتیەکان گرنگیان بە هونەر دایەوەو گەڕانـەوە سەری.

هەروەها شۆڕشی ئاینی کاریکردە سەر جادوگەریش. یەکیّ لە ئاکامەکانی شـۆڕش لـەناو بردنـی جادوگـەری بـوو. بنبڕکردنـی جادوگـەری لەسـەدەی شازدەدا شتێکی نویّ نەبوو، بەڵکو پاپاکـانیش دژایـەتی جـادو نوشـتەکاریان

دەکرد. کلێسای کاسۆلیکی لەهەموو جێگایەك بەدوای جادوگەراندا دەگەڕانو سزایان دەدان. بەلاّم بە تێپەڕینی ڕۆژگار کاسۆلیکەکان سزای جادوگەرانیان سووککرد، پاشان بە تەواوی سزایان لەسەر هەلّگرتن. لەکاتیکدا ولاّتە پرۆتستانتیەکان تاماوەیەکی درێژ لەسزادانی جادوگەران بەردەوام بوون.

شۆڕشی ئاینی فێرکاریشی بەدرەنگ خست، دوای ئەوپێشکەوتنە گەورەی کە زانست بەخۆیەوەدی لەسەدەکانی چواردەوپازدە. سەرچاوەکانی سامانی سەروەتی کلێسا لەسەدەی شازدەدا دەستی بەسەرداگیرا، لەکاتێکدا ئەم سامانەی کلێسا هۆی بەڕێوەبردنی زۆرێك لەخوێندنگەو زانکۆکان بوو. لەبەرئەمە شوێنە پرۆتستانتیەکان دەرگەکانیان داخستو خوێندنیش تەنها لەناو چینی ئەرستۆکراتی خۆی گرمۆلّەکرد. جەنگە ئاینیەکانیش کە لەنێوان کاسۆلیكو پرۆتستانتەکاندا هەلّدەگیرسا ئەوەندەی تر خوێندنو فێرکردنی دوادەخست. لەملاشەوە زانکۆکان بوونە جێگەی دەمەتەقێی ئاینی، هەردەم لەژێر هەڕەشەی هێرشی سەربازیدا بوون. ئەم ڕەوشە ناهەموارە بووە هۆی دابەزاندنی ئاستی زانکۆو قوتابیانی زانکۆ. پرۆتستانتیەکان ڕێگەیان بە خۆیان نەدەدا ڕۆلّەکانیان بنێرنە زانکۆ کاسۆلیکەکان. لەملاشەوە کاسۆلیکەکان چاودێری زانکۆکانیان دەکردو خوێندنی پرۆتستانتیزمیان قەدەغە دەکرد. قەلّسیو توڕەیی پیۆریتانەکانی ئینگلتڕاش گەیشتە ڕادەیەك، کە "ئۆلیڤەر کرۆمۆویل"ناچار بوو دەرگەی هەردوو زانکۆی ئۆکسفۆردو کمبرج دابخات.

وەلێ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خوێندن بایەخی خۆی لەدەست نەدا. سویسرا لەم کاتەدا بەهۆی هەوڵو كۆششی جۆن كالڤن وهاوەڵانی، كە لەڕێگەی كردنەوەی زانكۆو خوێندنگەكان گرنگی زۆریان بەبڵاوكردنەوەی ڕۆشنبیری دەداو توانیان ببنە گرنگترین ناوەندی خوێندن ولێكۆڵینەوە. یەسوعیەكانیش لەملاوە چەندین خوێندنگە وزانكۆیان بنیاتناو هەوڵی بڵاوكردنەوەی ڕۆشنبیریان دەدا. ئیدی لەدوای نیوەی سەدەی حەڤدە، بوژانەوەیەكی سەرتاپاگیر دەبینین لەكایەی زانست وفێركاری لە نێو هەردوو ئاینزای پڕۆتستانتیو كاسۆلیكی.

## كاریگەری شۆڕشی ئاینی بەسەر دەوڵەت وكۆمەڵگە :ـ

بێگومان پێشكەوتنی لایەنی سیاسیو كۆمەڵایەتی ڕۆڵێكی گرنگی گێڕا لەهەڵگیرسانی شۆڕشی ئاینی. بەڵام ئەمجارە شۆڕشی ئاینی كاری كردەسەر پێشكەوتنی كایەی سیاسیو لایەنی كۆمەڵایەتی. ئەم كارتێكاردنە دوولایەنیە چەند هۆیەكی لەپشتە:

1-هۆشی نەتەوەیی كەبوو بەهۆی سەربڵند كردنی حكومەتە نیشتیمانیە نویەكان، بەهۆی شۆڕشەوەئەم هۆشی نەتەوییە زیاتر خەملی. لەوڵاتەكاندا كلێسا لەسەر بنەمای نەتەوەی دامەزرێندرا. لۆسەریزم ببوو بەئاینزایەكی نەتەوەیی، كەزۆرترینی ئەڵمانی وئەسكەندەناڤیەكان پەیڕەویان لێ دەكرد، هۆڵندیو سكۆتلەندیەكانیش، شوێنی كالڤنیزم كەوتن. ئەم بڵاوبوونەوەی كلێسای نەتەوەییە، هەر لەناو پڕۆستانتیەكان كورت هەڵنەهات، بەڵكو كاسولیكیەكانیش پێی كاریگەر بوون. هەریەكە لەفەڕەنساو ئیتاڵیاو ئیسپانیا

توانیان بەربژاری لە ڕۆما وەرگرن، بۆ بنیاتنانی کلێسای نەتەوەیی. بەم شێوەیە شۆڕشی ئاینیو پاکسازی ئاینی قالبێکی نەتەوەیی وەرگرتو بوو بەهۆی زیاتر بەگەڕخستنو کلێپەسەندنی بزوتنەوە نەتەوەییەکان.

2-کاتێ شۆڕشی ئاینی هەلگیرسا، سەرمایەداری لەپەرەسەندندا بوو، بۆیە زۆرێك لەمیرو پاشاکان پێشوازییان لەبیروڕاکانی لۆسەرو کالڤن کرد. هەروەها چینی ناوەڕاست گرنگیان دا بەو بیروڕایانەی کە کالڤن خستبوویە بەرچاوان سەبارەت بە کارکردنو هاندانی کاری بە بەرهەمو، لێدوانەکانی سەبارەت بە سوخواردن. کالڤن سوی بە حەلاڵ دەزانیو ڕایگەیاند کە ئەوەی کاسۆلیکەکان کردویانە سەبارەت بە حەرام کردنی سوو نا دادگەری تێدایە. لەبەرئەوە دەبینین کاتێك سەرمایەداریەت لەهەریەکە لەئینگلتراو فەرەنساو هۆلندا خەملی، کالڤنیزم لەنێو چینی ناوەڕاست بلاوبویەوەو هاوکاری چینی ئەرستۆکراتیو پادشایانیان کرد لەدەستگرتن بەسەر سەروەتو سامانی کلێسا. بیروڕای خەلکی لەهەمبەر سامان، گۆڕانی بەسەرداهاتو دەولەمەندیو سامانیان بە بەخششی خودا دەزانی بۆ بەندە چاکەکانی.گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە سەروەتو سامان گوناهو تاوان نییە هەروەك خەلکی سەدەکانی ناوەڕاست کە باوەڕیان وابوو. بێ کاریو کلۆلی "بێ دەستو پلی" بە دوو گوناهیان دادەنا کە لێخۆشبونی بۆ نییە.

3- لە کۆتایدا ئەوە ماوە بلێین: کە شۆڕشی ئاینی جگە لەمانەی سەرەوە، بەهۆی خۆمالی کردنی سامانی کلێسا. بوو بە هۆیەك بۆ سەربلندکردنی پاشایەتی ڕەها. پاشاکان تەنها بەوەندە نەوەستان، بەلکو

پیادەی دەسەلاتی پاپایان کرد لەهەمبەر کلێساکانیان. دوای ئەوەی کە پەیوەندی ئەم کلێسایانەیان بە ڕۆماوە پچڕاند. تەنانەت لە ولاتە کاسۆلیکیەکانیش پاشاکان لەلاوازی پاپا سودیان بینیو توانیان چەندین بەربژاری وەربگرنو کلێسا بەپاشاوە پەیوەست بکەن. هەر ئەمەش یارمەتی سەرهەڵدانی مافی خودایی پاشاکانی دا، بەوەی پاشاکان لەلایەن خوداوە دەسەلاتیان پێدراوە، هەروەك پاپاکان پێشتر بانگەشەیان بۆ دەکرد.

### 5/پەیوەندی شۆڕشی ئاینی بە دیموکراتیەتی نوێ:-

سەرهەڵدانی دیموکراتیەتی نوێ زۆرێك دەیگێڕنەوە بۆ شۆڕشی پرۆتستانتی. وەنەبێ ئەم فیکرەیەش دووربێ لەڕاستی.پرۆتستانتیەکان جەختیان دەکردەوە لەسەر تاك گەرایی. هەروەها هەڵبژاردنی ئەندامانی کلێسا لەناو هەندێ لەگروپە پرۆتستانتیە دەمارگیرەکان، بەشێوەی دیموکراتیەت بەڕێوەدەبرا. هەروەك کەمینەی پرۆتستانتی دژایەتی زۆرداری دەکردو ڕوبەڕوی دەبونەوەو شۆڕشیان لەدژی ئەرستۆکراتی سازدەکرد. بەلام لەگەڵ ئەوانەشدا کۆمەڵە پرۆتستانتیە سەرەکیەکانی وەك "لۆسەریو کالڤنیو ئینگلیکانی"، خۆیان ئۆرستۆکراتی بوون، نەوەك دیموکراتی، کاتێ دەبینین لۆسەریزم لەناو میرەکانی ئەڵمانیاو ئەسکەندەنافیا پەرەی سەند. هەروەها کالڤنیزم لە جنێفدا دەسەلاتی ئاینیو دونیای تێکەلاوکردو هنری هەشتەمیش کە کلێسای ئینگلیزی دامەزراندو ئینگلیکانی قبوڵ کرد، لە چینی ئەرستۆکراتی بوو.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە دیموکراتیەت لەئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا لەناو هەندێ لە دەسەلاتی شارەکاندا بوونی هەبوو، هەروەك هەندێ لەشارەکانی هۆڵنداو شاری فلۆرەنسای ئیتالیا. دیموکراتیەت لەناو هەندێ لەدەوڵەتە نەتەوەییە نوێیەکان گەشەی سەند، وەك پەرلەمانی ئینگلترا لەپێش سەرهەڵدانی پرۆتستانتی. هەروەها هەندێ لە دێرەکان کارەکانی خۆیان بە دیموکراسی دەبرد بەڕێوە. وە هەندێ لەنوسەرە کاسۆلیکەکان بانگەشەیان بۆ دەکردو داوای ڕووبەڕووبوونەوەی زۆرداریو مافی خودایی پاشاکانیان دەکرد، وەك "جیزویت ماریانا1536-1624، فرانسیسکۆ سوارېزا 1548-1617".

لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە کڵێسا پرۆتستانتیە دەمارگیرەکان، بەتایبەت "ئەبرشیەکان"لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان پیادەیدیموکراتیەتیان دەکرد.وەلێ ڕەگوڕیشەی دیموکراتیەت دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری یۆنانی کۆن. ئەوکاتەی دەسەلاتی ئەسینا لە سەدەی"5پ.ز" بە میکانیزمی دیموکراتی هەڵدەسوڕا. هەر ئەم فکرەیەش لەسەردەمی ڕێنیسانس دووبارە زیندوکرایەوە. هەروەك پەرلەمانی ئینگلیز لەسەرەتاکانی سەردەمی نوێگەشەی کردو بنەمای نوێنەرایەتی پەیڕەو کردو خەڵکیش لە بەڕێوەبردنی کاروباریان لەڕێگەی ئەم نوێنەرانەوە پێویست بوو دەنگێکی ئازادیان هەبێت. بیریارە پرۆتستانتیەکان لە ئینگلتراو ئەمریکا ڕێگەیان خۆشکرد بۆ دیموکراتیەتی نوێ. بەلام نمونەی دیموکراتی فەرەنسای کاسۆلیك ماوەیەك دواکەوت، وە لە ڕوی فکریو کردەییەوە کاریگەر بوو بە

ئینگلتراو ئەمریکا. ئەمریکاش بە پیادەکردنی دیموکراتیەتێکی کردەیی، کاریگەری لەسەر فەرەنسا دروستکرد. ئەوەی ماوەتەوە بڵێین ئەوەیە کە جۆن لۆك بە پێشەنگی فکری دیموکراتی سیاسی دادەنرێت.

**بەش ( پشك )ی جوتیاران:۔**

بارودۆخی جوتیاران بە شۆڕشی پرۆتستانتی، بەرەو باشی نەڕۆیشت، بەڵکو لە زۆر ڕوەوە نالەبارترو پرچەرمەسەری تر بوو. ئەو بەرەو پێش چوونەی کە بارودۆخی ئابووری ئەوانی گرتبویەوە لەپێش شۆڕش، بەهۆی کەم کردنەوەی باجو ئەرکەکانی کڵێسا بوو. وەلێ ئەمەش گۆڕانی بەسەرداهاتو ڕووەو تێك چونێکی سەرلەبەری هەنگاوی نا، ئەمەش بەهۆی زیاد بوونی باجەکانی حکومەت و، ئەو ئەرکانەی کە خاوەن زەوییەکان بەسەریاندا دەیسەپاندن. هەروەها بەبێ بەشکردنیان لەزۆرێك لەو بەربژاریانەی کە پێش تر لێی بەهرەمەند ببوون،"بەشێك لەپارچە زەویەك تایبەت کرا بوو بە جوتیار، کەتەنها خۆی دای دەچاند". بەلاَم حکومەتو خاوەن زەویەکان دووبارە دەستیان بەسەردا گرتەوە. هەروەك دەستیانگرت بەسەر موڵكو سامانی دێرەکان، بەهۆی ئەمەشەوە جوتیاران بێ بەش بوون لەزۆرێك لەو بەخششانەی کەپێشتر لەلایەن دێرەکانەوە پێیان دەبەخشرا. ئەو یاسا نوێیانەی کە داڕێژران مافی جوتیارانی کەمکردەوەو ئەرکەکانی لەسەر زیادکردن، بەتایبەت دوای ئەوەی کەزۆرێك لەپشووەکان لابران، کە لەپێش شۆڕشدا هەبوونو جوتیاران لێی بەهرەمەند بوون.وەلێ زۆر لەو پشوانە لابرانو ڕۆژەکان کران بەڕۆژە ماندووکارەکان. کاڵڤنیەکانیش هەستان

بـە قەدەغـەکردنی سـەماو گاڵتـەو گـەپ، لـە کاتێـدا ئەمانـە وزەو توانـای دەگێڕایەوە بۆ جەستە دوای ماندوبوونێکی زۆر.

لە بەرامبەر ئـەم بارودۆخـەدا جوتیـاران چـەندین شۆڕشـیان هەڵگیرسـاند، وەلێ بەوپەڕی دلڕەقانە سەرکوتکران. جوتیـارانیش لـە وڵاتەپرۆتـستانتەکان، بارودۆخیان زۆر خراپتربوو لە پێشووتر.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو کاریگەریانەی کە باسمان کردن تەنها بەهۆی شۆڕشی ئاینی نەبوو بە تەنها، بەڵکو چەندەها هۆکاری تری وەکو گۆڕانکاریە ئابووریو سیاسـیو فکریـەکان کـە لەسـەدەی شـازدەدا گۆرانکاریـان بەسـەر داهات، لەو هۆکارنە بوون، کە بوونـە هـۆی دروسـتبوونی ئـەم دەرەنجامانـە، لەناویشیاندا شۆڕشی ئاینی.

### ئاراستەگرتن ڕووەو عەلمانیەت "لائیکی":-

دوای شۆڕشی ئاینی دەوڵەت خۆی سەرپەرشتی ئـەو کارانـەی دەکـرد کـە پێشتر کڵێسای کاسۆلیکی پێی هەڵدەسـتا. ئـەم کارانـەی دەوڵـەت تـەنها بـە دەستگرتن بەسـەر زەویـەکانی کڵێـساو باجـەکانی کـورت هەلنـەهات، بـەڵکو تـەواوی پرۆسـەی فێرکـردنو چـالاکیە خێرخوازیـەکانی گرتـەوە. کڵێـسا پێشترخۆی سەرپەرشتی کاری فێرکردنو کاری ڕۆشـنبیری دەکـردو تێـچونی لـە ئەسـتۆی خـۆی گرتبـوو دێرەکـان هەڵدەسـتان بـە چـالاکی خێرخـوازیو چاکەکاری. بەڵام دوای دەستگرتن بەسەر موڵکی کڵێساو لەناوبردنی دێرەکان لەلایـەن دەوڵەتـەوە، سـەرجەم ئـەو کارانـە کەوتنـە سەرشـانی دەوڵـەت. لەڕۆژگاری شـاژن "ئیلیـزابێس" حکومـەتی ئینگلیـزی هەسـتا بـە دەرکردنـی

زنجیرە یاسایەك بەمەبەستی بەدیهێنانی ئەوانەی باسمان کرد، لەوانە: باجی نوێی سەپاند بۆ بەڕێوەبردنی خانەکانی فێرکردنو بەخێوکردنی پەککەوتەکان، کەجگە لەمانە هەژارەکانیشی دەگرتەوە. هەروەك هەستا بەکردنەوەی خانەکانی کاروبەکریَ گرتنی خاوەن تواناکان بۆ کارکردن بەمەبەستی کارپێکردن. هەروەها حکومەتە ئەسکەندەنافیەکانو میرە لۆسەریەکان لە "سەکسۆنیاو لۆتەنبەرگ" هەستان بە هەمان ئەو کارانەی کە شاژن ئیلیزابێس پێی هەستا بوو. دەسەڵاتەپرۆتستانتیەکان هەستان بە کردنەوەی خوێندنگەو زانکۆکانو سەرپەرشتی کردنیان. لایەنی ئاینیش بە بەردەوامی دەخوێنران لە قوتابخانەکاندا.

بەڵام لەوڵاتە کاسۆلیکیەکاندا هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەش هەر کڵێسا سەرپەرشتی کارە خێرخوازیو فێرکاریەکانی دەکرد. وەلێ دوای ئەم مێژووە دەوڵەت لەم کارانەدا شوێنی کڵێسای گرتەوە. هەموو ئەو دەرەنجامانەی کە باسمان کردن، وەنەبێ تەنها شۆڕشی ئاینی هۆکار بووبێ، بەڵکو چەندەها هۆکاری تریش هەبوو بۆ هەریەکە لەم گۆڕانکاریانە. شۆڕشی ئاینیش یەکێ بوو لەوانە.

## هەڵبژاردنی چارلسی ئیمپراتۆر:-

لەکانونی دووەمی 1519 ئیمپراتـۆر ماکسیملیان لـەدونیا دەرچـوو. ئـەو بـاوەڕی وابـوو کـە دەنگـدەرانی ئـەڵمانی"نـەوەی خـۆی"چارلـسی یەکـەمی پادشـای ئیسپانیا هەڵدەبـژێرین بـە ئیمپراتـۆر، بەتایبـەت دوای ئـەوەی کـە ماکـسیملیان بەوپـەڕی دەسـتکراوەیی بەخشـشی پێـدان. لـەپاش مردنـی ئیمپراتـۆر وەك ئـەوەی هـیچ ڕووی نـەدابێت کاروبارەکـان چـونەوە جێگـەی خۆیـان. سـەرەڕای کاندیـدی چـارلس بـۆ ئیمپراتـۆر، هەریەکـە لـە "هنـری هەشتەم و فرانسوای یەکەم"، کاندیدبوون بۆ ئیمپراتۆر.

فرانسوای یەکەم لەکاتی هەڵبژاردندا، بەمەبەستی پاراستنیئیمپراتۆریەت بەڵێنی جەنگیدا لەدژی تورکە عوسمانیـەکان. هـەروەها بـەڵێنی دامەزرانـدنی تۆڕێکی بەرفراوانی هاتوچۆیدا، وە بەڵێنیدا سەروەری یاسا بپـارێزێو ئـەمنو ئاسـایش بـۆ ئـەڵمانیا بگێڕێتـەوە. پـاش ئـەوەی ئـاژاوەو پەشـێوی ڕووی تێکردبـوو. بـەڵام لەڕاسـتیدا ئەگـەر فرانـسوا هەڵبـژێردرابا تـەنها گرنگـی بـە فەرەنـسا دەدا. دەنگـدەرانی ئـەڵمانیش ئەوەنـدەی پاراسـتنی سـەربەخۆی خۆیانو دەستوەرنەدان لەکاروبارەکانیان بەلاوە گرنگ بوو، ئەوەنـدە ڕێگـەو سـەروەری یاسـایان بـەلاوە گـرنگ نـەبوو. لەملاشـەوە هنـری هەشـتەم بەشێوەیەکی گەرمو گوڕ هەوڵی نـەدەدا بـۆ پۆسـتی ئیمپرتـۆری، لەبەرئـەوە هەریەك لە دوو کاندیکەی تر هەوڵی بەدەسـتهێنانی پـشتیوانی ئـەویان دەدا. کاتێك پاپاش پشتگیری خۆی بۆ فرانسواڕاگەیاند، دەنگـدەران قـەڵس بـوون،

چونکە حەزیان نەدەکرد پاپا دەست لەم پرۆسەیە وەربدات. ئەمەش زیانی بە بەرژەوەندی فرانسوا گەیاند.

لەگەڵئەوەی دەنگدەران سەرجەمیان ئەڵمانی بوون، بەلاّم هەر بەرژەوەندی تایبەتیان دەخستەپێش بەرژەوەندی گشتی، سەرەڕای کاریگەری بەخشش بەسەرایاندا. هەرچەندە فرانسوا ئامادەیی هەبوو بۆ پێدانی بەرتیلو بەخشش بەوپەڕی دەستکراوەیی، بەلاّم سیابەختی ئەم لەوەدابوو کە بە قەدەر چارلس داهاتو خەرجی لەبەردەستدا نەبوو. لەسەرەتادا دەنگدەری "برندن برگو براکەیشی" پشتگیریان لەفرانسوا کرد،میری پلاتیناتو سەکسۆنیاش بەهۆی ئەوەی لەسەردەمی ماکسیملیاندا زیانبار ببون،پشتگیریان جێگەی گومان بوو.

لەم کەینو بەینەشدا بنەماڵە سەرمایەدارەکان ڕۆڵیان هەبوو، لەم نێوانەشدا بەمەبەستی بانگەشەکردن بۆ چارلس نزیکەی یەك ملیۆن جونەیهیان خەرجکرد. بەتایبەتیش بنەماڵەی فوگور.

کاتێك پاپا"لیۆی دەیەم"پێشنیاری فرانسوای کرد بۆ میری سەکسۆنیا، بەمەبەستی هەڵبژاردنی فرانسوا یان خۆکاندیدکردنی، فردریکی میری سەکسۆنیا ئەمەی ڕەت کردەوەو چارلسی کاندید کرد، ئەمەش لەلایەن دەنگدەرانەوە پشتگیری لێکرا. ئیدی چارلس لە "28/حوزەیرانی1519، بەناوی چارلسی پێنجەم" لە شاری "فرانکفۆرت" وەك ئیمپراتورێك بۆ ئیمپراتۆریای رۆمانی پیرۆز هەڵبژێردرا. پاش ئەمە لەشاری "ئەکسی لاشبیل" پایتەختی "شارلەمان" لە "23/تشرینی یەکەم 1520" تاجی کردە سەر.

لەپاش هەڵبژاردنی، "گاتینـاری" ڕاوێـژکاری لەنوسـینیکدا بۆچارلـسی نوسی:"گەورەم، خوای گەورە لەگەڵ تۆ دلۆڤانـە، تـۆی بـەرز کـردەوە لـەناو جیهانی مەسیحیو بەسـەر مـیرو پاشـایان گـەورە کـردی بـۆ دەسـەڵاتێك کـە لەسەردەمی باپیرە گەورەت شارلمانەوە کەسێ خەوی پێوە نەبینیوە. خـودا تـۆی لەسـەر پایـەو پلەیـەك جـێگیر کـردوە، بەهۆیـەوە دەوڵـەتێکی جیهـانی بەدیدێتوجیهانی مەسیحیەت لەژێر سێبەری بەیداغەکەیدا یەکدەگرێ".

چارلس ئیمراتوریایەکی بـەرفراوانو سـامانێکی زۆری لەئـەوروپاو ئـەفریقاو ئەمریکا بە میراتگرت. بەڵام گەورەیی ئیمپراتۆریەکەی زیاتر لەگەڵ سەدەکان ناوەڕاستدا دەگونجا، نەوەك سەدە نوێیەکان. چـارلس لـەم نێوانـەدا ئـامرازو میکانیزمێکی لەدەستدا نەبوو کە بە هۆیەوە ئیمپراتۆریەکەی یـەکانگیربکاتو بەیەکتریـەوە ببەسـتێتەوە. یەکیـەتی ئـەڵمانیش لەهەمبـەر سـەربەخۆخوازی میرە ئەڵمانیەکانو هەولەکانیان بۆ ڕزگار بوون لەدەسـەڵاتی ئیمپراتـۆر ببـوە شـتێکی خـەیاڵی. لەملاشـەوە شۆڕشـی لۆسـەریو جەنگـە خوێناویـەکانو بڵاوبوونەوەی ئاژاوەو پەشێوی، بارودۆخەکـەی دژوارتـر کـردو کارەکـانی زۆر زیاتر ئاڵۆز کـردو یەکیـەتی وەدرەنـگ خـست، بەشـێوەیەك تـاوەکو سـەدەی نۆزدە ئەمە بەدی نەهات.

ئیمپراتۆر دەسـەڵاتێکی ناوەنـدی بـەهێزو بـە گڕوتینـی نـەبوو کـە بتـوانێ بەسـەر ئـەم ئیمپراتـۆرە فراوانـە ڕابگـات. هـەروەك سـوپایەکی هەمیشەییو بوجـەو خەزێنەیـەکی تایبـەتی لەبەردەسـتدا نـەبوو. هـەموو ئەوانـە وایـانکرد ئیمپراتۆر هەمیشە لەنێوان پایتەختەکاندا لەهاتوچۆ دابێت.

**ڕەوشت و ئاکارەکانی :-**

ئیمپراتـــــۆر چارلــــــسی پێنجـــــەم لــــــەزیرەکی بــــــاپیری ماکسیملیان ولەسەرنجڕاکێشی باوکی "فیلپ" سودمەند نەبوو. لەگەڵ ئـەوەی چارلس لەئەسپسواریو لەشەڕە شمشێردا بـەتوانابوو جەربـەزەبوو، بـەلاَم بـۆ بەڕێوەبردنی ئەم ئیمپراتۆرە فراوانـە بـەتواناو بیرتیـژ نـەبوو. جگەلەمـە ئـەم زمـانی ناسـازبوو، هـیچ زمـانێکی بـەپاراوی و ڕەوانبێـژی نـەدەزانی. تەنانـەت زمانی فەرەنسیشی نەدەزانی لەکاتێکدا لەفەرەنساپەروەردە ببـوو. هـەروەها زمـانی ئـەڵمانی و لاتینیـشی بەباشـی نـەدەزانی، زمـانی ئیـسپانیش بەهـەمان شێوە. بەلاَم لەپێش ئـەوەی بگاتـە تەمـەنی پێگەیـشتن زمـانی هۆڵنـدی فێـر ببوو. هەروەها لەبیرکاری و مێژوودا شارەزایی هەبوو، بەهۆی ئەوەی بیرکـاری لەجەنگدا یاریـدەی دەدا، هـەروەك مێـژووش هیوایـەتێکی بنەمالـەی پاشـایی بوو.

لەگەڵ ئەوەی سالاَنی فەرمانڕەوایەکەی پڕبوو لەکێشە، بەلاَم ئەم گرفتانە ئەزمونی پێداو پێی گەیاندو شارەزای کردو کردیـە کەسـێکی ئیـداری و تونـدو تۆڵ و زانا بەکاری خۆی.

چارلس کەسێکی دیندارو دڵسۆز بوو بـۆ کلێـسای کاسـۆلیکی "دینـی بـاب و بـاپیرانی". لـەکاتی وەلاَمدانـەوەی لۆسـەردا ئـەم دڵـسۆزیەی خـۆی و بـاوك و باپیرانی خستە ڕوو. چارلس بەئەرکی سەرشـانی خـۆی دەزانـی لـە بەرامبـەر هەرتەقـەپارێزگاری لەکاسـۆلیکیەت بکـات.هەرتەقـەش لـە بیروبـڕوای ئەمـدا بریتی بوون لە پرۆتـستانتیەکان. بەهەمانـشێوە بەپێویـستی دەزانـی جـەنگ

لەگەڵ فرانسوای یەکەم سازبکاتو دژایەتی بکات. چارلس فرانسوای بە"دوژمنی ئاشتیو سەقامگیری ئەورووپا" دادەنا، هەروەها دەیویست لەدژی عوسمانیەکان بجولێتەوەو بەربەست دابنێ لەبەردەم پێشڕەوی کردنیان ڕووەو ئەورووپا، ئەمەش بۆ پاراستنی شارستانیەتی خۆرئاوا، بەپێی گووتەی خۆی. بەڵام کێشە زۆرو زەبەندەکانی ئەویان بەدرێژایی ژیان سەرقاڵکرد، بەبێ ئەوەی هیچ ئامانجێکی دەستگیربێت.

**گیروگرفتە کارگێریەکان:ـ**

چارلس گرنگیدەدا بەو ئیمپراتۆریەی کە بنەماڵەکەی ڕابەرایەتی دەکرد، هەروەها ئەو موڵکە میراتیەی کە بۆی مابۆوە. ئەم گرنگی دانەی زۆر زیاتر بوو لەگرنگی دانی بە ئەڵمانیا. ئەمە لەکاتێکدا بەشێك بوو لەئیمپراتۆرە بەرفراوانەکەی. ئەو ئیمپڕاتۆرە بەرفراوانەش پێکهاتبوو لە:"ئیتالیا، ئەڵمانیا، نەمسا".ئەم ناوچانە لەڕێگەی ژنو ژنخوازیو هاوسەرگیریەوە هەندێکیان بەهەندێکیان بەسترانەوەو بوون بە موڵکی بنەماڵەیەك، کە بریتی بوو لە بنەماڵە هبسرگی نەمساوی. ئەم بنەماڵیە تاکە هاوبەندیەك بوو توانیبووی بەشەکانی ئیمپراتۆریەت بەیەکەوە ببەستێتەوەوپابەندی کات بە خودی ئیمپراتۆر. سەرۆکی ئەم بنەماڵەیەش لەباوکەوە پشتاوپشت دەرایە کوڕ.

ئەم ئیمپراتۆریەتە دەسەلآتێکی ناوەندی نەبوو کە بتوانێ دەسەلآتی خۆی بسەپێنێ بەسەر سەرجەم بەشەکانی. وە کارگێڕیەکی گشتیو یەکگرتوی نەبوو کە سەرپەرشتی بکاتو سەرجەم بەشەکانی بەڕێوەبەرێت. بەڵکو هەر پارچەو عاداتو یاساو دامەزراوەو سیستەمی فەرمانڕەویی خۆی هەبوو، بەبێ

ئەوەی لێکچونێك لەنێوانیاندا هەبێت. یاخود هاوبەندیەك هەبێت ئەو بەش‌و پارچە لێك ترازاوانە بەیەکترەوە وابەستە بکات. تەنها "ئیمپراتۆر چارلسی" پێنجەم بوو کە وابستەی یەکتری کردبوون. ئەم شەقڵە بەشێوەیەك بووتەنانەت شوێنێکی وەك زەویەنزمەکان کە پێکهاتبوو لەحەڤدە هەرێم، هەر هەرێمە یەکیەتیەکی سیاسی تەواوی هەبوو، لەپاڵ ئەوەی کە کاگێڕیەکی ناوەندی‌و سیستەمێکی نوێنەرایەتی هەبوو بۆ سەرجەم هەرێمەکان. شیاوی باسە میرنشینی"بۆرگەندیا" شوێنکەوتەی ئەوان بوو، وەلێ ڕێکخستنێکی سیاسی جیاوازی هەبوو.

ئیسپانیاش بەهەمان شێوە یەکانگیر نەبوو. هەرێمی قشتاڵە زۆرینەی بەشەکانی ئیسپانیاو ئەو موڵکانەشی دەگرتەوە کە لەئەمریکا دۆزرابوونەوە، لەپاڵ هەندێ بەشی ئەفرقیا. "ئەراگۆن"یش-پێکهاتبوو لەچوار هەرێمی سەربەخۆ، کە بریتی بوون لە:"ئەرگۆن - کاتۆلنیا - بلنیسیا - ناڤار". سەرەڕای ئەوەی "ناپوڵی‌و صقلیەو سەردینیا"ش- بەشێك بوون لە مەملەکەتی ئەراگۆن. شیاوی باسە هەریەکە لەم دەوڵەت‌و هەرێمانە کارگێڕیەکی سەربەخۆو پەرلەمانێکی تایبەتی‌و سیستەمێکی باجی تایبەتی خۆی هەبوو. هەروەها موڵکەکانی بنەماڵەی "هبسبرگ"یش- کەپێکهاتبوو لە:"نەمسا - ستریا - کارنیولا - کارنسیا - تیروڵ"، بەهەمانشێوەی ناوچەو بەشەکانی تری ئیمپرتۆریەتەکەی بوون لەڕووی کارگێڕیەوە.

### گیروگرفتەکانی چارلس لە ئەڵمانیا:ـ

کاتێك چارلسی پێنجەم لەساڵی 1520 هاتە سەر تەخت، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆزکورت هەڵاتبوو لەگەڵی ئەڵمانیا، سەرەڕای چیك لەبۆهیمیا. ئەڵمانیاش چاوەڕوانبوو هاوشیوەی فەرەنساو ئینگلترا یەکێتی تەواو بەخۆیەوە ببینی بەهۆی ئەو هەستەی هەیانبوو بەوەی کە لەیەك ڕەگەزن‌و بەیەك زمان قسەدەکەن‌و عادات‌و نەریتی هاوبەشیان هەیە.ئەڵمانەکان لەڕووی هەستی نیشتمانیەوە بێ هێز نەبوون، کاتێك سوارەکان‌و شارە ئازادەکان‌و تەنانەت خانەدانەکانیش بانگەشەیان دەکرد بۆ شێوەیەك لەنیشتمانی بوون‌و پێویستی چاکسازی کردن لەدامەزراوە کۆنەکان. بەڵام لەمیکانیزمەکانی چاکسازی کردن جیاوازیان تێکەوتبوو. هەرچەندە چارلس هێزو توانای خۆی خستبۆ گەڕ بۆ ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا، بەمەبستی یەکخستنی ئەڵمانیا سەرەڕای هۆڵنداو نەمسا، کە بە هۆیەوە دەبووە بەهێزترین دەوڵەت لەکیشوەری ئەوروپادا، بەڵام ئەو گیرو گرفتانەی کەپاشاکانی ئینگلتراو فەرەنسا دەیانخستە بەردەمبەدیهێنانی ئەو ئامانجە هیچی وای کەمتر نەبوو لە گرفتانەی کە دەهاتنە ڕێی لەهەمبەر بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا.لەلایەکی تریشەوە چارلس هیچکات ئامادەنەبوو لەپێناو ئەو ئامانجەدا قوربانی بە موڵکەکانی بدات لەئیسپانیاو ئەمریکا، وە دەستبەرداری ئەو موڵکانە بێت کە بە سەروەت‌و سامانیان خەزێنەی ئیمپراتۆریان پڕ دەکرد. واتا ئامادە نەبوو لەپێناو ئەڵمانیادا هیچ قوربانیەك بدات، کە داهاتەکەی کەمتر بوو لەداهاتی زەویە نزمەکان.

میرەکانی ئەڵمانیا سەرکۆنەی ئیمپراتۆیان دەکردو تاوانباریان دەکرد بە نیشتمانی نەبوون و فەرامۆشکردنی کاروباری ئەڵمانیا. لەڕاستیدا ئیمپراتۆر بە فەرەنسی قسەی دەکردو هیچ لە ڕوایژکارەکانی خەڵکی ئەڵمانیا نەبوون. ئەمەلەکاتێدا پێش ئەوەی کە لەساڵی 1519 بە ئیمپراتۆر هەڵبژێردرێ، دەنگدەران لەمیرەکان داوایان کرد کە زمانی ئەڵمانی وەك زمانێکی فەرمی جێگەی زمانی لاتینی بگرێتەوە، هەروەها پۆستەکانی ئیمپراتۆریەت تەنها بۆ ئەڵمانەکان بێت، وە داوایان لێکرد سوپای بیانی نەخاتەکار لەو جەنگانەی کە ئیمپراتۆر هەڵیان دەگیرسێنێ، تەنها کاتێك نەبێت کە "دایت"ڕەزامەندی لەسەری بنوێنێت. هەروەك نابێ دەستبەرداری زەویە نزمەکان بێت بۆ دەسەلاَتە بیانیەکان، یاخود نابێت میرەکان ناچار بکات ملکەچی بنوێن بۆ خەڵکی بیانی. هەروەها دان بهێنێ بەسەربەخۆیی ویلایەتەکان‌و لەناویاندا ئەنجومەنی ڕاسپاردن دیاری بکات. کە هەر ئەم ئەنجومەنەش بەشداری بکات لەفەرمانڕەوایەتی کردن.

"دایت"ی ئەڵمانیا لەساڵی 1521 کاتێك لەشاری ورمز کۆبونەوەی گرێدا، بڕیاری دامەزراندنی ئەنجومەنی ڕاسپاردنی دەرکرد. پیویستبوو ئەم ئەنجومەنە پێکبێت لە بیست‌و سێ ئەندام کە نوێنەرایەتی خواستی میرەکانی ویلایەتە ئەڵمانیەکان بکات. هەرچەندە ئەنجومەنی ڕاسپاردن لەسەرەتای فەرمانڕەوایی چارلسدا بە پێکهێنانی یەکێتی گومرگی لەنێوان ویلایەتەکان‌و سەپاندنی باج بەسەر کەلوپەلی هاوردەدا توانی دەستەبەری سەربەخۆیی ئابووری بکات. هەروەها بەمەبەستی کەمکردنەوەی پشتبەستنی ئیمپراتۆر

بە دیاری میرەکان، دەستەبەری داهاتی دیاری کراوی کرد بۆ خەزێنەی ئیمپراتۆر،ئەمەش وایکرد ئەڵمانیا ڕووەو یەکێتی سیاسی هەنگاو بەرەو پێشەوە بەرێت. بەلاّم لەناو دەوڵەمەندانی شارو بازرگانانی کۆمەڵەی هنسی نارەزایی زیادی کردو سکالاّیان کرد لەگرانی باجە نوێیەکان بەسەر شانیانەوەو دەیانگوت: ئەم باجانە بازرگانیەکەیان هەرەس پێدەهێنێ. ئەمەش ئەنجومەنی ناچار کرد واز لەم بیرۆکەیە بهێنێو دووبارە پشتببەستێ بەو بەخشیشانە کە ویلایەتەکان پێشکەشیان دەکرد. ئەنجومەنی ڕاسپاردان جارێکی ترو پاش سێ ساڵ، لەنورمبرگ کۆبونەوەی سازدا، بەلاّم بەهیچ کارێك هەڵنەستا جگە لەدانانی کۆمەڵێك بڕیارو یاساو لەساڵی 1532 خستیە بواری جێبەجێ کردن. بەم شێوە هەستدەکەین کە ئیمپراتۆر نەیویستووەو ئارەزوی بەشداری کردنی نەکردووە لەئەنجومەنێك کە دەسەلاّتی کۆت بکات. بەمەش جڵەو بۆ میرەکان شلبوو بۆ ئەوەی سودمەندبن لەسەربەخۆی خۆیان.

**چارلس و سوارەکان :ـ**

لەسەدەکانی ناویندا سوارەکان پەیوەست بوون بە دەرەبەگ. سوارەکانی ئەڵمانیش پاشماوەی سیستەمی سوارەکانی ئیمپراتۆری بوون. بەلاّم بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخەکانو زیادبوونی دەسەلاّتی میرەکان،سنور بۆ ئازادی هەڵسوکەوتیان داندرا، لەملاشەوە قەدەغەکرانی جەنگە ناوخۆییەکانی نێوان خانەدانانو پیادەکرانی یاسای ڕۆمانی لەبری بنەماو یاسای دەرەبەگی، گورزی کاریگەری لەسوارەکان سرەواندوداهاتو دارایی کەم کردنەوە. بەهاتنی

سەدەی شازدە سوارەکان بوونە نیشتمانیو نەتەوەپەروەرو ڕقیان لەمیرو خاوەن قەڵاکان بوو، ئەوانەی هیچ کارێکیان نەبوو جگە لەجەنگو بڵاوکردنەوەی پەشێویو ئاژاوە نەبێت. بەهەمانشێوە بەچاوێکی سوكو کەم بایەخ سەیری بازرگانیان دەکرد. هەرچەندە بەشێك لەمان ڕۆشنبیر بوون بە ڕۆشنبیریەکی بەرز، بەلاّم مەیلو ئارەزویان بەلای سەقامگیری دانەبووو شانازیان دەکرد بە ئەڵمانی بوونی خۆیان. ئەم سوارانەی لەژێر سەرکردایەتی "فرانزون سیکینگف"و "ئولریك فونهتن"دابوون، لەدژی هەڵبژاردنی چارلسی پێنجەم بە ئیمپراتۆر ڕاوەستانو بەتوندی لەدژی بە گەورەگرتنی چارلس بوون بەسەر کاندیدکراوەکانی تر لەغەیری ئەڵمانیو فرانسوای یەکەمو هنری هەشتەم. سوارەکان چاوەڕوانی ئەوەیان لە ئیمپراتۆر دەکرد کە یەکیەتی ئەڵمانیا بەدی بێنێت. وە لە ناکۆکی خۆی لەگەڵ میرو دەوڵەمەندەکانی شار، پشت بەتوانای ئەوان ببەستێ وبە هێزی ئەوان ملی میرەکان کەچ بکات. لەمەشدا بەمەبەستیان ڕێگە خۆشکردن بوو بۆ دامەزراندنی دەسەلاّتێکی ئەڵمانی ناوەندی یەککگرتووی بەهێز.

بەلاّم کاتێ پرۆتستانتیو شۆڕشی مارتن لۆسەر وەك دوو ڕوداوی تازە هاتنە سەر شانۆی ڕوداوەکان، سوارکان بەپاڵنەری نەتەوەیی باوەڕیان بە لۆسەریزم کرد. بەوپێیەی کە جیابوونەوەی لۆسەر لەپاپا، دەبێتە هۆی جیابوونەوەی ئەڵمانیا لەئیتالیاو دامەزراندنی کڵێسای تایبەتی ئەڵمانی. ئەمەش هۆیەکە بۆ یەکیەتی ئەڵمانیا. جا کاتێك دایتی ئەڵمانی لەورمزدا لەژێر کاریگەری ئیمپراتۆر لەساڵی 1521 فەرمانی بێبەری بوونی بۆ مارتن لۆسەر

درکرد، سوارەکان لەدژی ئیمپراتۆر وەستان و شۆڕشیان لەدژی بەرپاکرد. "سیکینگف" دادگای بالآی ڕەتکردەوە، کە دایت لە "ورمز"دا- دایمەزراندبوو، هەروەها هێرشیکردە سەر ئوسقوفەی "تریر"ی کاسۆلیکی و موڵك و سامانی کڵێسا. "سیکنینگف" و هاوڕێکەی لۆسەریزمیان خستە سەرشانی خۆیان. بەلآم میرەکان لەناخیاندا ڕوحی دوژمنکارانەی کۆنیان هەڵگیرساند بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئاین و لەساڵی 1523 شۆڕشی سوارەکانیان سەرکوتکرد. "سیکینگف" کوژراو "هۆتن"یش- بەرەو سویسرا ڕای کردو پەنای برد بۆ دورگەیەك لەدەریاچەی زویریخ، پاشان هەرلەوێدا مردو جگە لەقەڵەمەکەی هیچی تری لەپاش خۆی جێنەهێشت بەپێی گووتەی زوینگلی. بەم شێوەیە دوایەمین هەوڵی یەکیخستنی ئەڵمانیا لەسەدەی شازدە کۆتایی پێهات.

چارلس بە کاسۆلیکی مایەوە بەهۆی ئەوەی باوەڕی وابوو دەسەڵاتە سیاسیەکەی سەرکەوتوو دەبێت ئەگەر پارێزگاری لەمەزهەبی کاسۆلیکی بکات. وەپێویستی چارلس بۆ هاوکاریەکانی پاپا لەڕووی سیاسی و، وەبە مەبەستی جێبەجی کردنی پرۆژەکانی هۆکارێکی تربوو بۆ ئەوەی چارلس پارێزگاری لە کاسۆلیکیەت بکات. ئەمەش هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی میرەکان لۆسەریەت قبولْ بکەن و لەکاسۆلیکی دەربچن و دەسەلآتی ئیمپراتۆر لەسەرخۆیان کەم بکەنەوە. خۆ ئەگەر ئیمپراتۆرو میرە ئەڵمانیەکان بەیەکەوە پرۆتستانتیان وەرگرتبا یان ڕەفزیان کردبا، ئەوا یەکیەتی تەواو دەبوو جەنگی ناوخۆش هەڵنەدەگیرساو دەسەلآتێکی ناوەندیش هەڵدەستا

بە دامەزراندنی کڵێسایەکی یەکگرتوو. بەڵام میرەکان جیاوازی ئاینیان کردە ئامرازێك بۆ دژایەتی کردنی ئیمپراتۆریی کاسۆلیکیو دەستەبەرکردنی دەسەڵاتی خۆجێیو نەهێشتنی ئومێدی یەکیەتی ئەڵمانیا. بەم شێوەیە ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز شڵەژاو شپرزە بوو لەڕۆژگارێکدا کە گەورەترین ئیمپراتۆری هەبوو.

**شۆڕشی جوتیاران:ـ** 1525ز

هەروەك چۆن میرەکان لەپەنامو غیابی چارلسی پێنجەم بەسەر شۆڕشی سوارەکاندا زاڵ بوون، بەهەمانشێوە لەساڵی "1525" توانیان بەسەر شۆڕشی جوتیاراندا سەرکەون. لەسەدەی پازدە بەهۆی کەمی دانیشتوانو کەم بوونەوەی دەستی کار، جوتیاران بارودۆخیان باشتر بووو توانیان هەندێ ئازادی بەدەستبهێنن. ئیدی هۆشیاریان زیاد کردو ڕەخنە گرتنیان لەباجە دەرەبەگیەکانو ڕاوکردن لەکێڵگەکانیاندا زیادی کرد. وەلێ لەسەدەی شازدە بەهۆی کەمبوونەوەی داهاتی خانەدانانبارودۆخ گۆڕانی بەسەرداهات. ئەم کەمبونەوەی داهاتە بەهۆی قەیرانە ئابووریەکانو بەرزبوونەوەی نرخەکان لەسەرەتای سەدەی شازدە هاتە ئاراو بەهۆیەوە خانەدانان ویستیان دووبارە باجە درەبەگیەکان بسەپێننەوە، ئەمە لەکاتێکدا جوتیاران دەیانویست ئازادی زیاتر بەدەستبێنن. خۆ لەڕاستیدا داواکاری جوتیارانیش ڕاستوڕەوابوو کاتێك سکاڵایان دەکرد لەدەستبەسەراگرتنی دارستانەکانیانو ناچارکرانیان بە خزمەتکردنی خانەدانان.

پەیامەکانی لۆسەریش لەملاوە بۆ خۆی هاندان و گەرمکردنبوو بۆ سازکردنی شۆڕش. ئەمەش بەجەخت کردنەوەی لەسەر برایەتی مرۆڤەکان گرنگی دەستگرتن بەسەر داهاتی کلێسا. هەروەها "توماس مونزو ساکاو" وەك چۆن لەهاندانی جوتیارانی "نوڤرنجیا" ڕۆڵیان گێڕا، بەهەمانشێوە لەوروژاندنی جوتیاران بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی شیوعیەتی لە"ملهاوزنی سەکسۆنیا" ڕۆڵی کارایان بینی. ئەوتا دەبینین یەکێ لەبانگەشەو دروشمەکانیان کە لەناو جوتیاران بڵاویان دەکردەوە، دەڵێ:"شۆڕش بکەن، بکوژن و بجەنگن لەپێناوی خودا، بەردەوام بن..... هۆ خەڵکی شارو لادێو کرێکارانی کارگەکان بەردەوام بن.....دەمێکە ئاگر داگیرساوە، با خوێنی سەر شمشێرەکانتان وشك نەبێتەوە..... خودا لەگەڵتان دایە"[1].

شۆڕش لە ساڵی 1525 لەدارستانی ڕش دەستیپێکردو لەباشوری خۆرئاوای ئەڵمانیا بە ئاراستەی نەمساو سەکسۆنیا تەشەنەی سەند. بەهۆی ئەوەی لەسەرەتادا شۆڕش لە دژی کلێساو پیاوانی ئاینی کاسۆلیکی بوو مارتن لۆسەر پێشوازی لێکرد. بەڵام کاتێك شۆڕش چووە حاڵەتی دژایەتی کردنی خانەدانان لەناوەڕاست و باشوری ئەڵمانیا، لۆسەر هەڵوێستەی کردو ئەمەی بە مەترسی زانی لەسەر لۆسەریزم. لەبەرئەوە لەدژی شۆڕش ڕاوەستاو هانی خانەدانانیدا بۆ سەرکوتکردنی. میری سەکسۆنیا "هست دارمشتات" لەمایسی ساڵی "1529" توانی لە "فرانکهاوزن" بەسەر جوتیاراندا زاڵبێت. جێگەی باسە ئەم جوتیارانە لەلایەن "تۆماس

---

1 هەمان سەرچاوەی پێشو.

مونزر"ەوە—سەرکردایەتی دەکران. پاشئەمە زۆری نەبرد شۆڕش شکستی هێنا. بەڕاستی شکستی شۆڕش سەرکەوتنی خانەدانان بوو بەسەر ئیمپراتۆر، کاتێك کە ئیمپراتۆر پارێزەری جوتیاران بوو. دەسەلاتی خانەدانان لەسەر حیسابی ئیمپراتۆر دای لە زیادی‌و بارودۆخی جوتیاران زۆر لەپێشو خراپترو نالەبار تر بوو[2].

## جەنگەکانی چارلسی پێنجەم:-

گیروگرفتەکانی چارلسی پێنجەم بەهۆی جەنگە درەکیەکانەوەئالۆز بون. چارلس لەپێشینەکانی خۆیەوە لەجیاتی ئاشتی، ململانێیەکی بەردەوامی لەگەڵپاشایانی فەرەنسا بۆ بەجێمابوو. سەرەڕای هەڵپەو تموحی فرانسوای یەکەم بۆ تەختی ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز. هەر ئەمەش هۆکارێ بوو کە چارلسی ناچار کرد بە درێژایی ژیانی دژایەتی بکات.

## جەنگی نێوان ئیمپراتۆر چارلسی پێنجەم‌و فرانسوای یەکەمی پاشای فەرەنسا

فرانسوای یەکەم پیاوێکی سەرەڕۆو کەمتەرخەم بوو، هەستی بە بەرپرسیاری نەدەکرد. بە هێزی سەربازی خۆی‌و بەکەسایەتی خۆی سەرسام بوو. فرانسوا لەساڵی 1515 هاتە سەر تەخت. کاتێك هاتە سەر تەخت بینی وڵاتەکەی بە موڵکی بنەماڵەی هبسبرگ گەمارۆ دراوە، لەبەرئەوە هەوڵی دا خۆی لەم گەمارۆیە ڕزگار بکات، ئەمەش بە کۆکردنەوەی وڵاتە بچوکەکان لەدەوری یەکترو هاندانیان لەدژی بەهێزترین دەسەلاتی ئەووروپا.

---

2 Ibid; 135-146

فرانسوا وەك پێشینەكانی شكستی هێنا لەدەستخستنی تاجی ئیمپراتۆری. لەبەرئەوە لەهەندێ هۆكار دەگەرا تا شەرعیەت بدات بەو جەنگەی كە لەگەڵ چارلس هەڵیدەگیرسێنێ. ئەو هۆكارانەی كە ئەم پاساوی جەنگەكەی پێ كرد، بریتی بوون لە:

1. لۆیسی دوازدەهەمی پاشای فەرەنسا لەساڵی 1512 میلانۆی لەدەست هاتەدەر، فرانسواش لەساڵی 1515 گێڕایەوە ژێردەستی خۆی. سا كاتێكیش چارلسی پێنجەم هاتە سەر تەخت لەساڵی 1519، بڕیاری دا ئەم دۆقیە بخاتەوە سەر ئیمپراتۆریەكەی، بەو پێیەی میرنشینێكی شوێنكەوتەی ئیمپراتۆرە

2. فرانسوا داوای تەختی ناپۆلی دەكرد، كە كاتی خۆی لۆیسی دوازدە لەساڵی 1504 بۆ فردیناندی پاشای ئیسپانیی چۆڵی كردبوو. فردیناندیش باپیری چارلس بوو لەدایكیەوە.

3. فرانسوای یەكەم نیشتمانی ناڤارای بەهی خۆی دەزانی، لەكاتێكدا بەشێكی زۆری بە ئیسپانیاوە لكێنرابوو. دوای ئەوەی بە زەبری هێز فردیناندو ئیزابێلا دایانپچراند. جا فرنسوا گێڕانەوەی ئەم ناوچەیەی بە پێویست دەزانی.

4. فرانسوا دەیویست دەستبگرێ بەسەر زەویە نزمەكان. بەڵام چارلس كۆسپێكی بەهێز بوو لەبەردەمیدا.

سیاسەتی چارلسی پێنجەم لەدەوری مافە نەریتیەكان "نەریتی ئەوسا" هەڵدەسوڕا. وەك ڕێزگرتنو پاراستنی مافە دەرەبەگایەتیەكان.

ڕاوێژکارەکەی ئامۆژگاری کرد بەوەی کە دۆقیەی برگندیا کەچارلس خۆی تیایدا پەروەوەردە ببوو، لە بنەڕەتدا بەشێك نییە لەفەرەنسا. بەهەمان شێوە دۆقیەی میلانۆ لەباکوری ئیتالیا، کە لەجەنگی "ماریگنانوی" سالّی 1515 کەوتبووە ژێردەستی فرانسوا، ناوچەیەکی دەرەبەگی ئیمپراتۆری ڕۆمانیە. مانەوەشی لەدەستی فەرەنسا، ڕێگەکانی نەمسا بەدەریای سپی ناوەڕاست دەپچڕێنێ. چارلس گێڕانەوەی ئاشتی بۆ ئەوروپا بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی، تەنانەت باوەڕی وابوو ئەگەر پێویستکات هێز بەکاربێنێ، ئەوا بەئەرکی سەرشانیەتی بەکاریبێنێ.

بە تێکهەڵچوونە سەربازیەکانی فەرنساو ئیمپڕاتۆر لەسەر سنوری نێوان ئەڵمانیاو فەرەنسا، سەرەتای چالاکیە جەنگیەکان لەسالّی 1521ز دەستی پێکرد. بەم تێکهەڵچوونە ئیمپراتۆر گوشاد بوو، چونکە بووە هۆی خۆشکردنی ئاگری جەنگو پالّی نا بە سوپای فەرەنسا ڕووەو باکوری ئیتالیا. سوپای ئیمپراتۆریش توانی دۆقیەی میلانۆ بگێڕێتەوە ژێر دەستی خۆیو فەرەنسیەکانی تێیدا دەرپەڕێنیو بنەماڵەی سفورزا لەم ناوچەیە بخاتە سەرکار، بەو پێیەی ئەم ناوچەیە میرنشینێکەو پەیوەستە بە ڕۆمانی پیرۆز. لەملاشەوە پاپا لەبەرامبەر هاوکاریکردنی کردنی ئیمپراتۆر"پارما"ی دەستکەوت. لەم کاتەداو لەسەرەتاکانی سالّی 1524، سوپای ئیمپراتۆری شاخەکانی "ئەلّپ"ی بڕیو بە درێژایی هاوینی ئەم سالّە گەمارۆی فرانسوای یەکەمی دا لە"میرسیلیا". بەلاّم فرانسوا بەسەریاندا سەرکەوتو بە خراپی تێکشکاندن بەبێ ئەوەی دوایانکەوێت. پاشان بەشێکی سوپاکەی بەرەو

ناپوڵی ناردو خۆیشی سەرکردایەتی بەشەکەی تری کرد بەرەو پێدەشتی "پاڤیا" لەنزیك "میلانۆ" بە مەبەستی گەمارۆدانی سوپای ئیمپراتۆر.

سوپای تێکشکاوی ئیمپراتۆر توانی بۆ کۆکردنەوەی هێزەکانی پاشەکشە بکات بۆ میلانۆ، تاوەکو هێرش بکاتە سەر فرانسوا. سوپای فەرەنسی لەمانگی شوباتی 1525 لە"پاڤیا" تێکشکاو توشی زیانێکی قورس هاتو فرانسوا دەستگیرکراو بەرەو مەدرید بەڕێخرا، کە لەوێدا ئیمپراتۆر چاوەڕوانی دەکرد. فرانسوا نزیکەی ساڵێك بە دیلی مایەوە سەرەڕای ئەو زیانە قورسەی کە توشی سوپاکەی بوو. چارلس بەسەرکەوتنی هاوسەنگی نێودەوڵەتی ئەورووپای لاسەنگ کردو کەوتە دووڕیانێك لە بارەیەوە، یان ئەوتا پەلاماری فەرەنسا دەداتو هێرشی دەکاتە سەرو ویستی خۆی بەسەریاندا دەسەپێنێ، یا لەدیلی ئەو سود وەردەگرێو ڕێککەوتنێکی لەگەڵدا ساز دەکات کە لەقازانجی ئیمپراتۆریەتەکەی دابێت. لەڕاستیدا سەخت بوو بەهۆی هێرشەوە سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە بەسەر فەرەنسیەکاندا بەدەست بێنێ، چونکە فەرەنسیەکان خۆیان بۆ پارێزگاری کردن لە وڵاتەکەیان ئامادەبوون، هەروەك چارلسیش بەو ڕادەیە بەهێز نەبوو کە زاتی ئەم کارە بکات. لەلایەکی تریشەوە ئەگەر چارلس بەگوێی ڕاوێژکارەکەی "گاتیانارا"ی کردبا کە ئامۆژگاری کرد بەوەی فرانسوا لەئیتالیادا بۆ ماوەیەکی درێژ بهێڵێتەوەو وەك دەستەبەریەك بۆ هەر هەوڵێکی دوژمنکارانەی فەرەنسیەکان بیخاتە کار. جائەگەر بەم ڕایەی کردبا، ئەوا لەسەری پێویستبوو هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلەکەی بکات بە"جوامێریو گەورەییەك کە هێزی تێدا دەرکەوێ، وە

بەزەییەك كە سەرچاوەكەی لە خواوە بێت". هەر هەمان ڕاوێژكار ئامۆژگاری كرد بەوەی "داوای هەموو دۆقیەی بۆرگەندیا بكات، چونكە مافی شەرعی خۆیەتی، ئەمجا پەیمانێكی ڕەقی لەگەڵ ببەستێ، بەو مەرجەی پەیمانەكە دادوەرانەبێتو دەستەبەری ئاشتی بكات، هەروەها لۆسەریزم ڕیشەكێش بكاتو عوسمانیەكانیش بەرەو ولاتی خۆیان ڕاوبنێ". بەلام چارلس بەگوتەی ڕاوێژكارەكەی نەكردو وتوێژی هەڵبژارد لەگەڵیدا. واتا لەبری ئەمە هەستا بە سازكردنی وتووێژ لەگەڵ فرانسوا. جا لەكانونی دووەمی ساڵی 1526 پەیمانبەستی مەدرید لەنێوانیاندا بەسترا. بەگوێرەی ئەم پەیمانە پێویستبوو لەسەر فرانسوا واز لەزەویە نزمەكانو ئیتالیاو بۆرگەندیا بهێنێ بۆ ئیمپراتۆر. هەروەها چەند جارێك بە كتێبی پیرۆز سوێند بخوات كە پابەندبێت بە بەڵێنەكەیو خوشكی گەورەی ئیمپراتۆر "ینورا" بخوازێ. "خێزانی فرانسوای یەكەم پێشتر لە ساڵی1524 لەتەمەنی بیست وچوار ساڵیدا كۆچی دوایی كرد".

بەلام فرانسوا هەرزوو پەیمانەكەی شكاندو قاچەكانی خۆی لەسەر زەویەنزمەكان گیركردەوە. بەوپاساوەی كەسوێند خواردنەكەی لەژێر فشاردا بووە. ئەمجا ڕێككەوتنەكەی ڕەتكردەوەو دەستیكرد بەهاندانی میرنشینە ئیتاڵیەكان لەدژی چارلس، وەك "پاپا كلیمێنتی حەوتەم، فرانسیسكۆ سفورزا، فلۆرەنسا، ڤینیسیا، هنری هەشتەمی پاشای ئینگلترا". ئەمەش بە پێكهێنانی كۆمەڵەی"كونیاگ" لە22/ مایسی/1526. ئیدی بە تەواوی دەركەوت كەجەنگی نێوان فەرنساو ئیمپراتۆر نوێ دەبێتەوە. چارلس

لەبارەی فرانسواوە وتویەتی:"ئەگەر فرانسوا پارێزگاری کردبایە لە بەڵێنەکەی، جەنگ نوێ نەدەبویەوە............ ئەو ناپاکیو غەشی لێکردم، بەڕاستی ئەم وەك کەسێکی خانەدانانو پاڵەوانانە مامەڵەی نەکرد، بەڵکو وەك کەسێکی نامەردو ناپیاومامەڵەی کرد".

## تالأنکردنی ڕۆما:-

سوپای ئیپراتۆر شاخەکانی ئەلپی بڕی ڕووەو ئیتالیا. لەمکاتەشدا موچەی سەربازان وەدرەنگ کەوتبوو ئەو ئازوقەی کە لایان بوو بەشی نەدەکردن. ئیدی سوپا بە فلۆرەنسادا تێپەڕی ڕووەو ڕۆما، بەو بڕوایەی ڕۆما سامانی هەموو جیهانە. سەرکردەی فەرەنسی نەیتوانی بەسەریاندا زاڵ بێتو سوپای ئیمپراتۆر هێرشی کردە سەر شارەکە. ئیدی ڕاو ڕووتو ئەتککردنی ئافرەت بەتایبەت ڕەهیبە جوانەکان بۆ ماوەی نۆ مانگ بەردەوام بوو. "سوپای ئیمپراتۆر لەمانگی مایسی 1527 هێرشی کردە سەر شارەکە". لەملاشەوە پاپا لەقەلای "سنت ئەنجلۆ" خۆی حەشاردا. دواتر ناچاربوو پەیمان لەگەڵ چارلس ببەستیو بەگوێرەی ئەم پەیمانە سفورزا گەڕایەوە میلانۆو میدتچی بۆ فلۆرەنساو پاپاش هەندێ لەزەویەکانی گێڕایەوە.

تالأنکردنی ڕۆما جیهانی کاسۆلیکی هەژاندو ورووژاندی. تەنانەت هنری هەشتەم کە ئەو کاتەش دڵسۆزی پاپا بوو، هاوکاری فرانسوای کرد لەدژی چارلس. بەلأم هەڵە سەربازییەکانی فرانسوا گەلێ زۆربوو، بۆیە نەیتوانی قاچەکانی خۆی گیربکات لەسەر ئیتالیا، لەبەرئەوە ئاشتەوایی "کمبری" لە ساڵی 1529 لەگەڵ چارلس بەست. بە گوێرەی ئەم ئاشتەواییە بەندەکانی

پەیمانبەستی مەدرید نویێ کرایەوە، ئەمەش بە وازهێنانی لەزەویە نزمەکان‌و ئیتالیا. چارلس سەبارەت بە دۆقیەی بۆرگەندیا زۆر پێداگری نەکرد. لەساڵی 1530 ئیمپراتۆر سەردانی ئیتالیای کردو لەوێدا تاجی لۆمبادریاو تاجی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دێرینی لەلایەن پاپاوە خرایەسەر. شیاوی باسە ئەمە دواین جاری پاپا بوو لە هەمبەر تاج خستنەسەر سەری ئیمپراتۆرانی ئیمپراتۆریای ڕۆمانی پیرۆز. لەم کاتەشدا تەمەنی چارلس سی ساڵ بوو.

جەنگ‌و هەرای نێوان چارلس‌و فرانسوا کۆتایی پێنەهات‌و لە ساڵانی 1536–1538 گۆبەندەکە نویێ بویەوە. فرانسوا بە هاوپەیمانی لەگەڵ میرە پرۆتستانتیەکان لەئەڵمانیاو سکۆتلەنداو سویدو دانیمارك، هاوشان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کەوتە جەنگ لەدژی چارلس. هەروەها لەساڵانی 1542–1544 دیسان جەنگ دووبارە بوویەوە. لەپاش مردنی فرانسواش تاوەکو ساڵی 1547 جەنگ بەردەوام بوو. ئەم جەنگانە بە ئاشتەوایی "کاتو کامبریس" لەساڵی 1559 کۆتایی هات. ئەم پەیمانە لەنێوان هنری دووەمی پاشای فەرنساو "1547–1559" فیلیپی دووەمی پاشای ئیسپانیا کوڕی چارلس بەسترا. بەگوێرەی ئەم پەیمانە ئیتالیا کەوتە ژێردەستی بنەماڵەی پاشایی ئیسپانیا، فەرەنساش سێ شاری قایمی لەناو ئمپراتۆریای ڕۆمانی کەوتە دەست، کە خۆی دەبینیەوە لە "میتز ـ تول ـ ڤیردون". بەمەش فەرنسا لەسەر حسابی ئەڵمانیا فراوان بوو.

ئەنجامی کێشەو هەرای بنەماڵەی هبسبرگ‌و فەرەنسا بریتی بوو لەپارێزگاریکردن لەهاوسەنگی نێودەوڵەتی‌ونەهێشتنی خۆتێهەڵقورتاندی

فەڕەنسا لەکاروباری ئەڵمانیا. بەڵام لەهەمانکاتدا ئەم دووبەرکیانە دەرفەتی دایە دەوڵەتی عوسمانی تاوەکو لەخۆرهەڵاتی ئەوروپا دەرکەوێ. هەروەها هۆکارێکیش بوو بۆ پەخشانبوونی پرۆتستانتی لەئەڵمانیا. لەلایەکی تریشەوە بوو بە هۆیەك بۆ هاوپەیمانبوونی فەرنساو دەوڵەتی عوسمانیو وەرگرتنی بەربژاری لەلایەن فەرنساوە لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا[1].

### چارلسی پێنجەمو دەوڵەتی عوسمانی:-

لەو ساڵەی چارلسی پێنجەم هاتە سەر تەختی ئیمپراتۆری، دەوڵەتی عوسمانیش یەکێ لەمەزنترین سولتانەکانی بەخۆیەوە بینی، کە هەر لەو ساڵەدا هاتە سەرتەخت. ئەمیش سولتان سلێمانی قانونی بوو"1520-1566". سلێمانی قانونی بەهۆی دەستگرتنی بەسەر وڵاتی قەفقاسو باشوری ڕوسیا، سنوری ئیمپراتۆریەکەی فراوان بوو کە بەهۆیەوە ناوچەی دەریای ڕەش بوو بەهی دەوڵەتی عوسمانی. هەروەها دەستی گرت بەسەر دۆڵی ڕافدینو توانی بگاتە کەنداوی عەرەبی لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە سەرکردەی دەریایی عوسمانی "خیردین بربرۆسا" توانی زاڵ بێت بەسەر دەریای سپی ناوەڕاستو بندوقی جەنەویەکان دەربکات. بەمەش دەریای سپی ناوەڕاست بەشێوەیەك لەشێوەکان بوو بە دەریایەکی عوسمانی. ئەمجا سلێمانی قانونی ئاراستەی ڕووەو خۆرئاوا وەرچەرخاندو جەنگی لەدژی

---

1 Ibid; 146-155

مەجەر ڕاگەیاند، بەو پاساوەی پاشای مەجەر پیرۆزبایی لێ نەکردوە لەو کاتەی چۆتە سەر تەختی عوسمانی. واتا "پاشا پیرۆزبایی لەسولتان نەکردوە بەو بۆنەیەی بووە بە سوڵتان". پاشان لەجەنگێکی یەکلاکەرەوەدا بەناوی جەنگی "موهاکس" لەساڵی1526 توانی سەرکەوێ بەسەریانداو"بودابیست"ی پایتەختیان بگرێ. هەروەها سوڵتان سلێمان توانی پێشڕەوی بکات ڕووەو نەمساو لەساڵی 1529 گەمارۆی ڤیننای دا. چارلسی پێنجەم کە لەهەموو لایەکەوە بەڵای بۆ دەهات، ناچار بوو بگەڕێتەوە ڤیننا بۆ پارێزگاری لێکردنی. هەرچۆنێك بێت گەمارۆی ڤیننا سێ هەفتە زیاتری نەخایاند. بەڵام سوڵتان توانی دەست بەسەر سێیەکی زەوی مەجەڕدا بگرێ، وە پاش کێشەو ململانێیەکی درێژی نێوان سلێمانو چارلسی پێنجەم ڕێککەوتنێکیان لەساڵی 1547 مۆرکرد. بەگوێرە ئەم پەیمانە سوڵتان دەستی بەسەر بەشێکی زۆری خاکی مەجەڕدا گرت. لەناویشیاندا "بودا بیست". هەروەها پاشای مەجەڕ ڕازی بوو ساڵانە "30000"لیرە بدات بە سوڵتانی عوسمانی.

هاوپەیمانی نێوان فرانسوای یەکەمی پاشای فەرەنساو سلێمانی قانونی لەدژی چارلسی پێنجەم، وایکرد سوڵتان سلێمان چەندین بەربژاری مەترسیدار ببەخشێ بەفەڕەنسا. وە هەر ئەمەش دەرگەی والآکرد بۆ

وەرگرتنی بەربژاری لەعوسمانیەکان لەلایەن بیانیەکانەوە. ئەم بەربژاریانەش خۆی دەبینیەوە لە :-

1. فەرەنسا ئازادی تەواوی پێدرا لە بواری بازرگانیو کەشتیوانی دا لەبەندەرەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بەمەرجێ ڕەسمی "5٪" لە نرخی بازرگانیەکەی ببەخشێ بە عوسمانیەکان.

2. عوسمانیەکان ڕێگە نەدەن بەهیچ کەشتیەکی بیانی بە هاتوچۆکردنی لەبەندەرەکانی دەوڵەتی عوسمانی، تەنها بەو مەرجە نەبێت کە ئالای فەرەنسا بەرز بکاتەوە.

3. لەکێشە مەدەنیو تاوانەکاندا خەڵکە فەرنسیەکان لەقونصلەکانیان دادگایی بکرێن.

4. جالیەی فەرنسی دامەزراو لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەربژاری تایبەتی هەیە لە بواری گواستنەوەی کالاو کەلوپەلەکانیدا لەناوخۆی دەوڵەتی عوسمانیدا.

5. فەرەنسیەکان ئازادیی ئاینی تەواویان پێبدرێو فەرەنساش ببێتە پارێزەری مەسیحیەکانی نیشتەجێ لەزەویەپیرۆزەکان[1]

بەم شێوەیە چارلس بە درێژایی ژیانی لەژێر هەڕەشەی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو. جەنگ لەساڵی 1551 دووبارە بۆوەو دوای مردنی چارلسیش هەر کۆتایی نەهات، تا لەساڵی 1562 ڕێککەوتن سازبوو. پاش

1 Hayes، op. cit; pp. 225-241

ئەمە فردیناند لەساڵی 1564کۆچی دوایی کردو سلێمانی قانونیش لەساڵی 1566کۆتایی بەژیانی هات.

## ئیسپانیا لە رۆژگاری چارلسی پێنجەم:ـ

"چارلس" بەناوی چارلسی یەکەم لەدوای مردنی فردیناندی باپیری لەساڵی 1516 چووە سەر تەختی ئیسپانیا. "فردیناند باوکی دایکی چارلس بوو (لەدایکیەوە باپیری بوو) کە لەساڵی 1516 لە دونیا دەرچوو"، ئاوابونی کەسایەتیەکی بەهێزی وەك فردیناند لە ولاتێك کە هیشتا بە تەواوی یەکانگیر نەبوو، دەرفەتی رەخساند بۆ سەرهەڵدانی گێرمەوکێشە کۆنەکانو هەولدانی خانەدانان بۆ گێڕانەوەی دەسەلاتیانو خۆ زاڵکردنیان بەسەر شارەکاندا، لەکاتێکدا شارەکان بەرەنگاری ئەمەیان دەکرد. خانەدانانو شارەکان هاتنی هۆڵندیەکانیان لەگەڵ چارلسدا بۆ ئیسپانیاپێ ناخۆش بوو. چارلسیش بەسەر زەویە نزماکاندا دەسەلاتدار بوو لەو کاتەوەی باوکی "فیلپ" لەساڵی 1506 کۆچی دوایی کردبوو. لەئەیلولی 1517 چارلس زەویە نزماکانی جێهێشتو بەرەو ئیسپانیا کەوتە ڕێو لەکۆتایی تشرینی یەکەم گەیشتە قشتالە. وە لەشوباتی 1518 کۆبونەوەی بە کورتیزی قشتالە بەستو پەیمانی دا کە ڕێز لەدابو نەریتی ولات بگرێو جگە لەئیسپانیەکان هیچ کەسێکی بیانی لەپۆستە حکومیەکان دانەمەزرێنێ. لەملاشەوە کورتیز ڕەزامەندی نواند لەسەر بەخشینی خەرجی بۆ ماوەی سێ ساڵ.

چارلس هەوڵیدەدا ئیدارییەکی ڕێکوپێکو حکومەتێکی سەقامگیر دابمەزرێنێ.هەر کاتێك سەردانی هەر شارێکی دەکرد داوای خەرجیو داهاتی دەکرد، ئەمەش شوێنەوارێکی پەستیو نیگەرانی لەناو خانەدانو دەوڵەمەندان دروستکرد، کاتێك ئەوان لەدوای مردنی فردیناند خۆیان لەم بارە ناهەموارەی کە فردیناند بەسەری هێنابون ڕزگارکردبوو. ئیدی وروژان‌ودەستیانکرد بە نانەوەی ئاژاوەو کاری فرانخوازیان لەسەرحسابی یەکتری ئەنجامدا. سەرەتاکانی ئاژاوەو پەشێویو ئالۆسکاوی دەرکەوتو زەنگی شۆڕشی لێدەدا، بەتایبەت کاتێ سکالاکان زۆر بوون. وە پاش ئەوەی کە هەواڵی مردنی ئیمپراتۆر ماکسیملیان گەیشت، شۆڕش بە تەواوی دەستی پێکرد. دەنگدەرانی ئەڵمانیا داوای گەڕانەوەی چارلسیان دەکرد بۆ ئەڵمانیا بە مەبەستی هەڵبژێردرانی وەك ئیمپراتۆر. لەم لاشەوە ئیسپانیەکان دژی پاشکۆیەتی بوون بۆ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز، هەروەك لەدژی ئەوەبوون کە لەلایەن ئەلمانیو هۆڵندیەکان فەرمانڕەوایی بکرێن. لەبەرئەوە شۆڕشگێڕان هەوڵیاندا ڕێگە بگرن لەڕۆیشتنی چارلس. بەلام چارلس توانی لەم ولاتە بچێتە دەرەوەو یەکێ لە هۆڵندیەکان وەك جێگری خۆی دیار بکات لەقشتالە بۆ ئەوەی ڕووبەڕوی ئەو شۆڕشە زیان بەخشە ببێتەوە.

شۆڕش لەیەك کاتدا کاری خانەدانانو دانیشتوانی شار بوو. کلێساش لەزۆربەی شوێنەکان پشتیوانی لەبەرگریکاری ئسپانیەکان دەکرد لەمەڕ دژایەتی کردنی بێگانە. شۆڕشگێڕان بەشێکی زۆری ولاتیان داگرتو حکومەتێکیان لە ساڵی 1520 بۆ خۆیان دامەزراندو حکومەتی جێگری

پاشایان ڕوخاندو شەرعیەتی حکومەتی خۆیان ڕاگەیاند. شۆڕشگێڕان گەیشتنە پایتەخت"قشتالە"وڕایانگەیاندکە تەندروستی"خانمجوانا"باش بۆتەوە. ئەوەبوو داوایان لە"جوانا" کردڕەزامەندی بنوێنێ لەسەر شەرعیەتی حکومەتەکەیان. وەلێ "جوانا" پێش ئەوەی وتەیەك لە دەمی بێتەدەر لەسەر ڕەزامەند بوونی، دووبارە هۆشی لەدەستدا. داواکاری شۆڕشگێڕان بریتی بوو لەسکالا کۆنەکانو چاکسازی کردن لە دەستورو دامەزراندنی خەڵکی ئیسپانیا لەسەر پۆستەکانی دەوڵەت، لەجیاتی خەڵکی غەیرە ئیسپانی. هەروەهاداوایان دەکرد ڕێگە بگیرێ لەدزەکردنو ڕۆیشتنی زێڕو زیوی هاتووی ئەمریکا بۆ دەرەوەی ئیسپانیاو چارەسەری بەرز بوونەوەی نرخەکان بکرێ. بەلام داواکاری خەڵکانی شارەکان خۆی دەبینیەوە لەچاکسازی کردن لە "کورتیز". ئەوان داوایان دەکرد "کورتیز" لەهەموو دووساڵێك جارێك کۆبێتەوە بەبێ بانگهێشتکردنی پاشا. هەروەها داوای هەڵوەشاندنەوەی بەربژاری خانەدانیان دەکردو دەیانویست باج لەسەر ئەوانیش دبنرێ.

چارلسیش لەدژی خەڵکانی شار پشتیوانی خۆی بۆ خانەدانەکان دەربڕی. بەوەش گوێڕایەڵی خەنەدانەکانی بۆ خۆی مسۆگەرکردو سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا. ئیدی هەر ئەم خانەدانانە شۆڕشیان داپلۆسی. پاش ئەوەش کەچارلس کرایە ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریای ڕۆمانی پیرۆزو گەڕایەوە ئیسپانیا، شۆڕشی "کوسیی ناروس" کۆتای پێهاتبوو. بەسەرکوتکردنی شۆڕش سیستەمی پەرلەمانی لەئیسپانیا کۆتایی پێهاتو دەسەلاتی ڕەها دەستی پێکرد، بەبێ ئەوەی کورتیز هەڵوەشێتەوە. دوای ئەوەی چارلس

لێخۆشبوونی گشتی ڕاگەیاند بۆ هەموویان، خانەدانانو خەڵکی شارەکان پشتیوانی چارلس یان کرد. شیاوی باسە شۆڕشی لۆسەرو دەستگرتنی چارلس بەکڵێسای کاسۆلیکیو پارێزگاری لێکردنیو دەستکەوتنی پۆستی ئیمپڕاتۆری، ئیسپانیەکانی لەچارلس نزیك خستەوەو، وای لێکردن فەخرو شانازی پیێ بکەن. سەروەتو سامانی ئەمریکا و ئیسپانیا بەسەر چارلسدا دەڕژا، ئەمەش چارلسی والێکردخۆشەویستی هەبێت بۆ ئیسپانیاو سیاسەتێکی ئیسپانی ڕووت پەیڕەو بکات. ئەمجا تاکاتی مردنی ڕەچاوی هەر مامەڵەیەکی دەکرد گەربەزیان تەواو بوایە لە هەمبەر ئیسپانیەکان.

### کۆتایی چارلسی پێنجەم:-

پاش ئەوەی جەنگو ناکۆکیەکان جەستەی چارلسی شەکەتو ماندوو کرد، چارلسی پێنجەم لە ساڵی 1556 لەتەختی ئیمپراتۆری دابەزیو وڵاتە بەرفراوانەکەی دابەش کرد لەنێوان کوڕەکەی فیلپو براکەی فردیناند. ئیسپانیاو زەویە نزمەکانو ئەمریکاو ئیتالیا بوونە بەشی فیلپ. لەکاتێکدا فردیناند موڵکە ویراسیەکانی خۆی لەئەڵمانیا بە میراتگرت، کە لەساڵی 1531ەوە- فەرمانڕەوایی ئەڵمانیای دەگێڕا لەبری براکەی چارلس، کە زۆربەی کاتەکان لە ئەڵمانیادا ئامادە نەبوو. چارلس جگە لەنازناوی ئیمپراتۆر هیچی تری بۆ نەمایەوە، ئەو نازناوەی تا مردنی پارێزگاری لێکرد. چارلس دوو ساڵی کۆتایی تەمەنی لەدێرێکی ئیسپانیا بردەسەرو لەوێدا خۆی خەریکی پەرستشی پەروەردگاری کرد. تا لەساڵی 1558 گیانی سپارد.

## ئینگلترای ڕۆژگاری هنری هەشتەم

## 1527-1509

هنری هەشتەم لە باوکیەوە ولاتێکی یەکگرتوو سیاسەت و ئابووریەکی لەنگەرگرتوو هاوسەنگی بۆ بەجێما، لەپاڵ ئاشتی و ئاسایشێکی گشتی و سەروەت و سامانێکی زۆر. لەمکاتەدا کاردینالْ تۆماس ولْزی "1475-1535" هاوکاری و یاریدەدەری بوو لەحوکمکردنیدا. ئەم پێش ئەوەی ببێت بە کاردینالْ و ڕاوێژکار، سەرقالْ بوو بەپۆستە ئاینی و دونیایەکەی لە کلێساو دەوڵەت دا. ولْزی خۆی خۆشەویستکرد لەلای پیاوانی ئاینی و سیاسەتوانان. بەرەبەرە بەرزبوویەوە تا بوو بە وەزیر. ولْزی پۆستەکەی خۆی قۆستەوەو بەکاری هێنا بۆ بەدەستهێنانی دەسەلآت و ناوبانگ. دەسەلآتیشی بەرفراوانبوو پاش ئەوەی بوو بە ڕاوێژکاری هنری هەشتەم. ئیدی بوو بە ئاڕاستەکاری سیاسەتی دەوڵەت لەناوەوەو دەرەوە.

ئەم بەشێوەیەك بەرزفڕبوو کەئارەزوی دەستکەوتنی پۆستی پاپەوی دەکرد. "ولْزی" توانی دەسەلآتی پاشا بەهێز بکات و خانەدانان لاواز بکات و دادگای هۆڵی ئەستێرە بەکاربێنێ بۆ دادگایی کردنیان. وە بە بەرتیل و بەخشیش پشتگیری پەرلەمانی بەدەست هێنا. "ولْزی" تێبینی ناکۆکی نێوان چارلس و فرانسوای کرد، لەبەرئەوە ویستی سود لەم ناکۆکیە وەربگرێ، بۆ ئەوەی پێگەی خۆی و ولاتەکەی بگەیەنێتە ئاستێکی بەرچاو.

لەم کاتەدا لەئینگلترادا هەبوو دەیگوت: ئینگلترا سیاسەتێکی دابڕاوی هەیە، ئەمەش بەهۆی بچوکی ئینگلترا لەم کاتەداو نەبوونی پایەکی گەورە

لەناو وڵاتە گەورەکان. بەڵام وڵزی بیروڕای بە پێچەوانەی ئەمە بوو، هنریش هاوکاری کرد. ئیدی جارێك دەچووە پاڵ چارلسی پێنجەمو جارێك لای فرانسوای یەکەم. بەمەش هێزێکی لەناوخۆو ناوەندێکی بەرزی لە دەرەوە دا بۆ وڵاتەکەی دەستەبەر کردو خودی خۆیشی بووە پیادە کاری. لەبەرئەوە بە دامەزرێنەری سیاسەتی هاوسەنگی نێودەوڵەتی دادەنرێ.

"وڵزی" بەهۆی لەبەرچاو گرتنی خزمایەتی نێوان هنری وچارلس لەلایەك،لەلایەکی تریشەوە بەهۆیهەبوونی بەرژەوەندییێکی زۆری بەریتانیا لە زەویەنزمەکاندا کەچارلس بەسەریدا فەرمانڕەوابوو، لایەنگری چارلسی دەکرد. هەروەها ئەم لایەنگیریە کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر بەدەستهێنانی چاوتێبڕینەکانی وڵزی لەڕۆمادا. هەرچەندە "هنریو وڵزی" ماوەیەك لایەنگری فرانسوایان کرد، بەڵام چارلس دوای ئەوەی بەرتیلی پێ بەخشین هەرچۆنێکبێت توانی بەلای خۆیدا کێشیانبکات. ئیدی وڵزی بە مەبەستی هاوکاری چارلس هێرشی کردە سەر فڕانسوا، بەڵام ئەم هێرشە کاریگەیەکی ئەوتۆی نەبوو. لەتاڵانکردنی رۆماشدا لەساڵی1527، هنری بەلای فرانسوادا شکایەوە، بەهۆی ئەمەش چارلس تووشی سەرلێشێوان هات.

بەڵام وەنەبێ تاڵانکردنی ڕۆما تاکەهۆکاربووبێ بۆتێکچونی پەیوەندیەکانی نێوان "هنری وچارلس"، بەڵکو چەند هۆکاری تریش هەبوون کە کاریگەریان بەسەر ڕەوشەکەدا هەبوو. چونکە دەمێك بوو هنری دەیویست خۆی لەخێزانەکەی"کاترین ئارگون" رزگاربکات. "بەهۆی ئەوەی ئەم

هاوسەرەی هیچ کوڕێکی نەبوو کەجێگەی بۆ بگرێتەوە"، وەك پێشتر ڕونمانکردەوە. بەلاّم کاترین پوری چارلس بوو، ئەمەش کارەکەی سەختکردبوو. لەملاشەوە پاپا ئامادەنەبوو مافی تەلاق ببەخشێ بە هنری. ولزی دەیویست سود لەم هەلومەرجە وەرگرێ.ولّزی حەزی دەکرد کاری تەلاق سەربگرێ، چونکە ئەمە پاشای ڕزگار دەکرد لەدۆستایەتیو پەیوەستبوونی بە ئیسپانیا. هەر ئەمەش دەرفەتی دەڕەخساند بۆ هاوسەرگیری کردنی هنری لەگەلّ خانمی فەڕەنسا، کەبەهۆیەوە فەڕنسا دەبوو بە دۆستی ئینگلترا. بەمەش دەیتوانی پاریزگاری بکات لە هاوسەنگی نێودولّەتی.

وەلێ هنری لەدۆلێکی تردا بوو، ئەم بیروڕای تایبەت بەخۆی هەبوو لەبارەی ئافرەتدا. لەبەرئەمە هیچ گرنگی نەدا بە بیروڕاکانی ولزیو بە کارە دیبلۆماسیەکانی خانمی فەڕەنسی. هەروەك هیچ بەزەیی نەهاتەوە بە ئەشكو ئەسرینەکانی کاترینی خێزانی. لەنێو هەموو ئەمانەدا هەستا بە ئەنجامدانی هاوسەرگیری لەگەلّ کچە لاوێکی ئینگلیزی بەناوی "ئان بۆلّین" کە دەمێك بوو شەیدای ببوو. بەمەش هیوای فڕانسوا تێکشکاو ولزی لە وەزارەت کەوتو لەزینداندا بە غەمەوە گیانی سپارد. پەیوەندیەکانی نێوان ئینگلتڕاو"چارلسیپێنجەم"یش تێکچوو. هەروەها ئینگلترا لەکلێسای کاسۆلیکی جیابوویەوەو پڕۆتستانتیەتی ڕاگەیاند.

بەلاّم لەدوای کوشتنی ئان بۆلّینو مردنی کاترین ئەراگۆن لەلایەك، وە هاوسەرگیری هنری لەگەلّ خانمێکی ئینگلیزی، پەیوەندیەکانی چارلسو

هنـــری ڕووەو باشبوونەوەچـــوو، بەمـــەش هـــۆی ســـەرەکی تێکـــدانی پەیوەندیەکانی نێوان ئەم دوو پاشایە کۆتـایی پێهات. پـاش ئەمـەش هنـری چەندین هاوسـەرگیری تـری بەئـەنجام گەیانـد، تـا ئـەو کاتـەی مـەرگ بووبـە میوانیو تەختو تاجی جێهێشت.

## ئیسپانیای ڕۆژگاری فیلپی دووەم

## 1598-1558

### ئاکارەکانی فیلپو گیروگرفتەکان:-

فیلپی دووەم، کوڕی چارلسی پێنجەم لەسـاڵی 1527 لـەدایك بـووە. ئـەو سەرجەم موڵکی باوکی بە میرات گرت، بـەهۆی ئـەوەی فردینانـدی مـامی بـە ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریای ڕۆمانی پیرۆز هەڵبژاردو موڵکی بنەماڵەی هبسبرگی نەمساوی بۆخۆی بەمیرات گرت.

بیروڕاکان سەبارەت بە فیلپ جیـاوازن، بەریتانیـەکان فیلـپ بـە کەسـێکی خۆسەپێنو زۆردار لەقەڵەم دەدەنو گوزارشتی لێدەکەن بـەوەی کـە چاکەی بۆ غەیری خـۆی نەدەویـست. لەهەمانکاتـدا ئیـسپانیەکان بـە ڕەمـزو هێمـای وڵاتــی دادەنـێنو بـە پاڵـەوانێك لـە پاڵـەوانانی ئـاینی مەسـیحیو پـارێزەری شارســـتانیەتی خۆرئـــاوا ئـــەژماری دەکـــەن. هۆکـــاری ئـــەم لێکنەچـوونەی بیروڕاکـانیش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو پـیلان وپیلانگێڕیـەی کـە فیلـپ لـەدژی بـەریتانیا پێـی هەڵدەسـتا، کـە لەئەنجامـدا گـەلی ئینگلیـزی ڕقو قینیـان لەبەرامبەریدا دروستبوو. وەلێ ئسپانیەکانیش بە مەزنی دەگرن، چونکە لەناو

ئەوان لەدایك بووە، هەر لەناو ئەوان دەژیاو نیشتەجێ بوو، بەزمانی ئەوان دەئاخافتو پارێزگاری لەکاسۆلیکی دەکردو خۆشگوزەرانی بلاوکردەوە. ئیسپانیا لەسەردەمی ئەودا لەڕۆژگاری زێڕیندا دەگوزەرا، بەلام بەهۆی سیاسەتی زۆردارانەی فیلپ هەرەسو داڕوخانلەکۆتاییەکانی ژیانی دەستی پێکرد. فیلپ لەڕوخساردا زیاتر وەك کەسێکی ئەلمانی دەهاتە بەرچاو نەوەك ئیسپانی. کاتێك ڕوویەکی سەرنجڕاکێشو قژێکی زێڕینو دووچاوی شینی هەبوو. فیلپ هاوسەرگیری لەگەلّ "ماریا"ی پرتوگالی ئەنجام دا، وەلێ ماریا لەکاتی مندالّبوونیدا گیانی سپارد. ماریا مرد، بەلام کوڕێکی شێتو خوێنڕێژی بەجێهێشت بەناوی "کارل" لەبەرئەوە باوکی زیندانی کرد، گوتراویشە فرمانی داوە بە کوشتنی. وە دەشگوترێ: "کارل" بە مردنی سروشتی خۆی مردووە. ژنی دووەمی فیلپ "ماری" خانمی ئینگلترا بوو، کە بەبێ ئەوەی خۆشەویستی ئالوگۆڕبکەن فیلپ بووبە ئەویندارى. خێزانی سێیەمیشی "ئیلازبێسی فالوای کچی هنری دووەمی" شای فەرەنسا بوو. ئەم ژنەیان سەبارەت بە فیلپ خێزانێکی ڕۆمانسی بوو، بە مردنیشی خەمێکی گەورەی توشی فیلپ کرد لەسالّی 1568. فیلپ لەپاش مردنی ئەم هاوسەرەی، "ئان"ی نەمساوی خواست بۆ مەبەستی سیاسی، بۆ ئەوەی کوڕێکی ببێ بتوانێ تەختی ڕادەست بکات، بەلام کوڕەکەی "فیلپی سێ یەم" نەیتوانی جێگەی باوکی بگرێتەوە.

فیلپی دووەم پیاوێکی زۆردار بوو لەفەرمانڕەواییدا، خۆی سەرپەرشتی سەرجەم کاروبارو کێشەکانی دەولّەتی دەکرد. بەهۆی زۆر سەرقالّ بوونی بە

کارەکانی، نەیتوانی بە وریایو زرنگیەوە کارە گرنگەکان چارەسەر بکات لەبواری کارگێڕیو سیاسی دا. فیلپ کاسۆلیك مەزهەبی بوو، زۆر بە پەرۆش بوو بیروباوەڕەکەی. پەرۆشی فیلپ بۆ بیروباوەڕەکەی گەیشتە ڕادەی دەمارگیری. ئەوەبوو هەستا بە دامەزراندنی داداگایپشکنین بەمەبەستی دادگاییکردنو لێپێچینەوەی پرۆتستانتیو غەیرە مەسیحیەکان. لەڕەوشتەکانی تری ئەوە بوو کە کەسێکی فێڵاوی بوو سیاسەتی میکیاڤیللی پەیڕەو دەکرد. ئەگەر جەنگی بە پێویست نەزانیبا پەنای بۆ جەنگ نەدەبردو دەیویست چارەسەری کێشەکانی بەڕێگەچارەی دیبلۆماسی بکات، بەلاًم کاتێکیش جەنگی بەکاریکی پێویست هاتبایە بەرچاو، ئەوا لەچوونە ناو جەنگ دوو دڵی نەدەکرد. گەورەترین ئامانجی ئەم یەکپارچەکردنی جیهانی مەسیحیو کردنی ئیسپانیا بوو بەمەزنترین دەوڵەت لەجیهاندا. بەلاًم لەم ئامانجەدا شکستی خوارد. چونکە فیلپ دەیویست خۆی موڵکە بەرفراوانەکانی بەڕێوەبەریً. ئەم لەیەك کاتدا دەستی دەخستە سەرجەم کارەکان. لەکاتێدا سەرپەرشتی کارە بڕێوەبەریو کاگێڕیە ئاڵۆزەکانی دەکرد، لەهەمانکاتیشدا پێویست بوو لەسەری داگیرگەکانی بە گیانێکی سیاسیو بازرگانیەوە بەڕێوەبەریً لە ئەمریکاو ئاسیاو ئەفرقیادا، هەروەك لەسەریشی پێویست بوو شۆڕشو ئاژاوەکان سەرکوتبکات، کە لەزەویە نزمەکان هەلگیرسابوو. هەروەها دەبوایە ڕووبەڕووی پرتستانتیەت ببێتەوە لەهەریەکە لەئینگلتراو فەرەنسا، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا دەیویست مەسیحیەتیش سەربخاو پشتگیری بکات لەدژی مسوڵمانان کە لەم کاتەدا

زاڵبوون بەسەر باشوری خۆرهەڵاتی ئەوروپاو خۆرهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست. دەرەنجامی هەموو ئەمانەش کارەساتێك بوو بۆ دەوڵەتی ئیسپانیاو داهاتی ئەم وڵاتە. ئیدی دەرەنجامەکان دەرکەوتن پێش ئەوەی سەدەی شازدە کۆتایی پێبێت. ئەوەبوو هۆیەکانی داڕوخان دەستی پێکرد، بەشێوەیەك فیلپی دووەم پێش ئەوەی بمرێ لەساڵی1598 تێبینی ئەم هەرس هێنانەی کرد.

**سیاسەتی فیلپی دووەم:-**

فیلپی دووەم باوەڕی بە یەکپارچەیی وڵات هەبوو. ئیسپانیای کردە خاوەنی یاساو ڕێسایەکی یەکانگیرو عاداتو نەریتێکی تێکەڵ. ئەمەش بەمانای بەهێزکردنی پاشایەتی ڕەها دێت. فیلپ بە پێویستی دەزانی یەکیەتی نیشتمانی لەگەڵ پادشایتی ڕەها دابێت. کورتیزی ئیسپانیاش نەیاری فیلپ نەبوو، کورتیز تاوناتاوێك کۆبونەوەی خۆی سازدەکردو ڕەزامەندی خۆی لەسەر باجە نوێیەکان نیشان دەدا، لەکاتێکدا باجە کۆنەکان هەر بەردەوام بوونو ببوونە داهاتێکی ساڵانە بۆ خەزێنەی دەوڵەت، بەبێ ئەوەی هەوڵی لابردنی بدرێ. ئەمە ڕەچەیەکی دروستکرد کە دواتر پاشاکانی ئیسپانیا بەسەریا ڕۆیشتن. فیلپ خانەدانەکانی لەکۆشکی شاهانە نزیکدەخستەوە، بەبێ ئەوەی کاری گرنگیان پێ بسپێرێ. لەملاشەوە پشتی دەبەست بە چینی ناوەڕاستو لەپۆستەکاندا دای دەمەزراندن.

فیلپ لەڕێگەی سکرتێرەکان کارەکانی ڕادەپەڕاند، وە لەسەر هەموو بچوكو گەورەیەك بیروڕای وەردەگیرا. بەهۆی ئەمە ڕێوشوێنگرتنە بەرەکانی

حکومەت بێ بەرهەم بوون‌و زۆرێکیان فەرامۆشکران، هەموو ئەوانەش گیانی داهێنانی لەناو فەرمانبەران لەناوبردو ئیدارەی ناوەندی لاواز کرد.

وەنەبێ باری ئابووری‌و دراییی ئیسپانیا لەڕەوشی سیاسی‌و کارگێڕیەکەی باشتر بوبێ، بەڵکو ئەمیش خراپتر بوو. پرۆژە دەرەکیەکان بارگرانیەکی قورسیان لەسەر قشتاڵە دروستکردبوو. ئەراگۆنیش بەهۆی کەم دەرامەتیەوە نەیدەتوانی خەرجی پێشکەش بکات. لەملاوە داهاتی زەویەنزمەکان بەهۆی شۆڕشەوەپچڕانی تێکەوتبوو. داهاتی ئیتالیاش کەم جار وابووە بەشی ڕاپەراندنی کارەکانی بکات. ئەو سەروەت‌و سامانە بەردەوامەشی کە لەکانەکانی ئەمریکادا هەیبوو، سەرمایەدارە بێگانەکان زیاتر سودیان لێ دەبینی وەك لەحکومەتی ئیسپانیا. ئەمانە لەباج بەخشرا بوون، تەنهاکاتێك نەبێتکە حکومەت گەرەکی بوایە هەندێ پارەی لێدەسەندن. وەبەهۆی ئەوەی باجی دەیەکیان خستەسەر گشت فرۆشراوەکانی پرۆژە پیشەسازیەکان شکستیان هێنا. سەرەرای ئەمەش چەوساندنەوەی مۆریسکۆس‌وجولەکەکان بووە هۆی کەمبوونەوەی داهات‌و سامانی ئەم وڵاتە. چونکە ئەم چینە خاوەنی سامان‌و پیشەسازی بوون. لەبەرئەوە ئیسپانیا لەکۆتایی سەدەی شازدە کەوتە سەر لێواری ناپوتی‌و مایەپوچی.

لەڕووی ئاینیشەوە فیلپ باوەڕی وابوو کە جیاوازی مەزهەبی‌و فرەئاینزایی لە دەوڵەتدا دەبێتە هۆی دووبەرەکی‌و ێرانکاری. کاتێکیش فیلپ ئارەزووی لە یەکرپزی‌و یەکدەنگی وڵات دەکرد، کڵێسای کاسۆلیکی وەك عقیدەو بیروباوەڕی فەرمی دەوڵەت ناساندو جەختی لەسەر کردەوە. هەموو

ئەمانەشی لەبەر مەرامی سیاسیو ئاینی کرد. لەڕووی سیاسیەوە دەتوانین بڵێین: ئیسپانیو پرتوگالیەکان کاسۆلیکی بوون، ئەوان لەهەر کوێیەك بوونیان هەبوایە دەستیاندەکرد بە بڵاوکردنەوەی کاسۆلیکیەت، جا ئەم هۆیە هۆکارو یاریدەدەر بوو بۆئەوەی لەداهاتوودا پرتوگال بچێتەپاڵ ئیسپانیا. فیلپ بۆجێبەجێ کردنی سیاسەتەئاینیەکەی وەك باوەڕدارێکی دڵسۆز بۆکاسۆلیکی، هانی پاپایدا لەسەر بەردەوام بوون لەچاکسازی کردنی کڵێسای کاسۆلیکی، بەتایبەت لەئەنجومەنی "تەرنت" لەئیتاڵیا. هەروەك هەستا بەدامەزراندنی دادگاکانی پشکنین بۆپیادەکردنی سیایەسەتە زۆرداریەکەی، بەتایبەت لەبواری ئاینیدا. لەهەمان کاتیشدا هەوڵیدا پرۆستستانتیەت لەفەرەنسادا لەناوباریو ئینگلتراش بگێرێتەوە جوغزی کڵێسای کاسۆلیکی[1].

فیلپ بۆ جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتەی کە بەرەو یەکپارچەکردنی نیمچە دورگەی ئیبیریا دەیبرد. لەساڵی 1580 داوای تەختی پرتوگالی کرد، بەو پاساوەی دایکی کچی پاشای پرتوگال بووە. بۆ ئەمەش بنەماڵەی "براکنز" لەبەرامبەر وەرگرتنی بڕێکی زۆرو زەبەند لەماڵ، ڕەزامەندیان نیشاندا لەهەمبەر ئەم داوایەی فیلپ. لە کاتێکدا تەختی پرتوگالی بۆ ئەم بنەماڵەیە ڕەوایی تر بوو وەك لە فیلپ. ئیدی سوپای ئیسپانی ڕووەو پرتوگال کشاو خستیە پاڵ ئیسپانیا. فیلپیش دانی هێنا بە دامەزراوە ومونەسەسە سیاسیەکەی پرتوگالو حەقو مافی دەستوری بۆ

---

1 ibid; pp. 234-237

پرتوگالیەکان. هەروەها خانەدانە بچوکەکان و خاوەن کێڵگەکانی لەخۆی نزیکخستەوە. بەڵام ئەم یەکیەتیە گەلی پرتوگالی پێی ڕازی نەبوو هەرچەند بۆ ماوەی شەست ساڵ لەژێر دەستی ئیسپانیادا مانەوە. تا ئەوە بوو لەساڵی 1640 بە سەرداریەتی بنەماڵەی "بڕاکنز" جارێکی تر پرتوگال لەئیسپانیا جیا بوویەوە[2].

## چەوساندنەوەی مۆریسکۆس و ڕاوەدونانیان لەئیسپانیا :-

فیلپی دووەم سیاسەتی سەرکزکردنی موسڵمانە تورکەکان و ملکەچکردنی مۆریسکۆسەکانی گرتبۆبەر. ئەمانە پاشماوەی موسڵمانەکان بوون لەئیسپانیا کە مەسیحیەتیان قبوڵ کردبوو. بەلاّم زۆرینەیان بەنهێنی دەستیان بەئیسلامەوە گرتبوو. پەیڕەوکردنی دروشمەکانی خۆیان و بەژداری نەکردنیان لەڕێوڕەسمی ئاینی ئیسپانیەکان، بەڵگەیەك بوو بۆئەمە. گوتراوە: فیلّپی دووەم لەساڵی 1564 ئامۆژگاری دادگاکانی پشکنینی کردووە بەوەی لەگەڵ مۆریسکۆسەکاندا زۆر توندنەبن، بەڵکو کڵێسای کاسۆلیکی هەولبدات دروشمەکانی کڵێساو سروتە ئاینیەکانیان فێربکات. وەلیّ هیچ شتێ لەمانە نەهاتنە بواری جێبەجێ کردن. فیلّپی دووەمیش وەك فەرمانڕەوایەکی زۆردار چاوپۆشی نەدەنواند لەسەرپێچی کردن لەسیاسەتەکەیداو هەبوونی پەیوەندی موسڵمانەکانی ئسپانیا بەعوسمانیەکان.

---

2 هەمان سەرچاوەی پێشوو.

لەسالّی"1566"فەرمانێکیان دەرکردو تێیدا داوای گێڕانەوەی یاسای سالّی 1526 دەکرد. ئەو یاسایە زمانی عەرەبی ڕەتدەکردەوەو گەرماوی ڕۆژهەلاّتی قەدەغەدەکرد. هەروەها بەکارهێنانی مامانە مەسیحیەکانی لەلایەن خێزانە موسلّمانەکانەوە لەکاتی مندالّبووندا فەرزکردبوو. هەر بەپێی ئەم یاسایە دەبوایە لەماوەی سێ سالّدا زمانی ئیسپانی فێربن، بەبێ ئەوەی مامۆستایان بۆ دابنرێ. هەندێ لەحاکمو سەرکردەکان نەیاری پیادەکردنی ئەم سیاسەتە نائەقلاّنیە بوون، وەك فەرمانڕەوای غەرناتە"دی منوزا"و"دیوکئۆفئالفا"، بەلاّم هیچ کەسیان نەیانتوانی فیلپ لە پیادەکردنی ئەم سیاسەتە پەشیمان بکەنەوە. ئیدی وێرانکردنی گەرماوەکان لەسالّی1567 دەستی پێکرد. مۆریسکۆسەکان لەبەرامبەر ئەم دەستدرێژیەداو وەك کاردانەوەیەك لەسالّی 1568 شۆڕشێکیان بەرپاکرد، بەلاّم کوشتارگەی گەورەیان بۆسازکراوسەرکوتکران. ئیدی مۆریسکۆس سەری ئیسپانی دەبڕیو ئیسپانی سەری مۆریسکۆسی دەبڕی.ئەم کوشتوبڕە بەشێوەیەك بەڕێوەدەچوو، کەیەکێ لەسەربازانی ئیسپانیا لەبارەیەوە دەلّێ:"ئێمە هەموومان درزو جەردەبووین، منیش لەناویاند یەکەم بووم". کاتێکیش یەکێ لەسەرکردە ئیسپانیەکان ویستی بە ڕێگەچارەی ئاشتیانە کۆتایی بەم کوشتارە بهێنێ، فیلّپی دووەم لەسەر کار لایداو براکەی خۆی خستە جێگە بەناوی "دون جوانا". جوانا توانی شۆڕش سەرکوت بکات. لەئاکامی ئەم گۆبەندەدا خانەوەدەکان لەناوچە جۆربەجۆرەکاندابەرێشانو پەراگەندە بوون. وە بەبێ ئەوەی لێیان خۆشبن دەستیان بەسەر

مولکومالّیانداگرتو هەموو شتێکیان لیٚ زەوت دەکرا، مەگەر شتیٚ کەلکی گۆێزانەوەی هەبوایە. ئەمانە لەهەرجێگەیەك بووبان کۆتو بەندیان بەسەردا دەسەپێنرا. بەلاّم وەنەبیٚ مۆریسکۆسەکان بەتەواوی گلۆلەیان کەوتبێتەلێژیو بیٚ دەرەتان مابنەوە، بەلّکو ئەوان بەهۆی ئەوەی پیشەگەرو کارزان بوون، لەهەر شوێنێك گیرسابنەوە بەزوویی دەیانتوانی بارودۆخیان باش بکەنو خۆشگوزەرانیو خۆشنودی لەم ناوچەیەدا بلاّوبکەنەوە کەتیایدا ئۆقرەیان لیٚ دەگرت. ڕەنگە ئەوە هۆکاری سەرەکی بووبیٚ بۆئەوەی سۆزی هەندیٚ لەفەرمانڕەواو سەرکردەکان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، بەوەی کەچیتر فیلپی دووەم مۆرسیکۆس نەچەوسێنێتەوە. بەلاّم کارەکە بەوەندە کۆتایی نەهات، بەلّکو ئەمجارەشیان فیلپی سیٚ یەمی کوڕی فیلپی دووەم لەساڵی 1609 فەرمانیدا مۆرسیکۆس لەئیسپانیا بەتەواوی ڕاوبنرێن.[1]

## جەنگی "لیپانتۆ" لەنێوان گەلەکەشتی ئیسپانیو عوسمانی 1571:-

دوای ئەوەی فیلپی دووەم سەرکەوت بەسەر شۆڕشی مورسیکۆس. براکەی خۆی "دون جوانە"ی- وەك سەرۆکی کەشتیگەلی "هاوپەیمانان پیرۆز" دیاری کرد. هاوپەیمانی پیرۆز پێکها تبوو لە "ئیسپانیا، ڤێنساو هەندی شاری تری ئیتالیا". ئیسپانیەکان لەساڵی 1564 لەبەرامبەرکەشتیگەلی عوسمانی تێکشکان. فیلپیش دەیویست

---

1 هەمان سەرچاوەی پێشو.

عوسمانیەکان دوورخاتەوە لەدەریاکانی دەوری ئیسپانیا، بەبێ ئەوەی پەل بهاوێتە خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست، یاخود توشی جەنگێکی بەردەوامبێ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی. کاتێك عوسمانیەکان لەساڵی 1570دەستیانگرت بەسەر"قبرس"دا، پاپا هاوپەیمانیەکی پێکهێنا لەنێوان ڤێنساو ئیسپانیاو پاشان لەجەنگێکی توندوتیژدا لەنزیك لیپانتۆ لەتشرینی یەکەمی 1571 کەشتیگەلی هاوپەیمانان کەشتیگەلی عوسمانیەکانی تێکشکاند. ئەم سەرکەوتنە سەبارەت بەعوسمانیەکان خاڵی وەرچەرخانبوو، ئیدی لەمەوە عوسمانیەکان نەیانتوانی بەشێوەیەکی کارا فراوانخوازی ڕووەو ئەوروپا پیادەبکەن. هەروەك فیلیپیش لەئاوەکانی خۆرهەلات لە جەنگکردنی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بەردەوام نەبوو، بەهۆی ئەوەی ڤینیسیا لەم ناوچەیەدا بازرگانی دەکردو دوژمنی لەمێژینەی بنەماڵەی هبسبرگ بوو[2].

### شۆڕشی زەویە نزمەکان:-

#### هۆکارەکانی شۆڕش:-

لەبەشی یەکەمدا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە زەویەنزمەکان لەسەدەی پازدە کەوتبووە ژێر دەسەلاتی میرەکانی بۆرگەندیا. بەلام بەمردنی چارلسی چاپوك لەساڵی 1477، تەخت گوازرایەوە بۆ کچەکەی ماری. "ماری"ش– خێزانی ئیمپراتۆر ماکسیملیانی ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریای ڕۆمانی پیرۆز بوو. ساکاتێکیش "ماری" لەساڵی 1481 مرد، فیلیپی کوڕی تەختەکەی بە میرات

---

2 هەمان سەرچاوەی پێشو.

گرت. کاتێکیش فیلپ لەساڵی 1506 لەدونیا دەرچوو، چارلسی کوڕی بووە میر بەسەر زەویەنزمەکان. سەرەڕای ئەوەش چارلس لەساڵی 1516 بووە پاشای ئیسپانیا، ئەمەش لەدوای مردنی "فردیناند"ی باپیری لەدایکیەوە، واتا "فرردیناند باوکی دایکی چارلس بوو". هەروەها بوو بە ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریای ڕۆمانی پیرۆز لەساڵی 1519، دوای ئەوەی باپیری ماکسیملیان بەرەو پیری مەرگ چوو.

لەگەڵ ئەوەی چارلس بەشێك لەکۆتایی ژیانی لەدەرەوەی زەویە نزمەکان بەسەربرد، بەڵام خۆشەویستی بۆ زەویەنزمەکان هەر هەبوو. ئەو شوێنەی کە لێی لەدایك بووەو پەروەردە کراوەو لێی گەورە بووە. خەڵکەکەشی هەر بۆی دڵسۆز بوون سەرەڕای هەبونی هەندێ ناڕەزایی. چارلس هەوڵی دا لەژێرباڵی حکومەتێکی مەرکەزیدا هەرێمەکان بکات بەیەك ، بەلاّم ڕووبەڕووی بەرەنگاریەکی توند بوویەوە، بەهۆی ئەوەی کە خەڵکی هەرێمەکان ڕاهاتبوون لەسەر دەسەلاّتی خۆجێی، هەربۆیە هەروا سانا نەبوو ملکەچبکرێن بۆ ئیدارەیەکی ناوەندی. سەرەڕای ئەوانەش چارلس باجی قورسی خستە سەرشانی خەڵکی شارو خانەدانان، بەمەبەستی پڕکردنەوەی خەرجی ئەوجەنگە زۆرانەی کە لەدژی فەرەنساو پرۆتستانتیەکان ئەجامی دەدان. خەڵکی زەویەنزمەکانیش بەگشتی ئاشتیو سەقامگیریان گەرەك بوو، بۆئەوەی بازرگانیەتی خۆیان ئەنجام بدەن، سەرەرای ئەوەشکە جەنگ بە زیانی بەرژەوەندیە ئابووریەکانی ئەوان تەواودەبوو. هەرچەندە سەرەتاکانی شۆرش لەکۆتایی ژیانی چارلس دەرکەوتبوو، بەلاّم هەرچۆنێکبێت توانی

پارێزگاری بکات لەگوێڕایەڵی دانیشتوانی زەویە زمەکان. ئەمەش بەهۆی ئەو کارگێڕیە وردو لێزانانەی کە "مارگریت ئوف ستریا"و پاش ئەویش "ماری ئوف هنگاریا"ی خوشکی چارلس پیادەیان دەکرد. ئەم دوانە بەدوای یەکدا لەجیگەی براکەیان فەرمانڕەوایان دەکرد بەسەر زەویەنزمەکان.

پرۆتستانتیەت لەرێگەی خەڵکانی دەرەوەی زەویە نزمەکان لەناو زەویە نزمەکان پەخشان بوو. ئەم خەڵکانە بەمەبەستی ژیانو بەدیهێنانی ژیانێکی باشتر هاتبوونە شارە هۆڵندیەکان و تیایدا نیشتەجێ بوون. ئەو خەڵکانە ئاینو ئاینزای نوێیان بلاوکردەوە وەك "ئەناباپتیست، لۆسەریەت". چارلس هەوڵیدا هەڵگەڕاوانو هرتقە ڕیشەکێش بکات، بۆ ئەو مەبەستە لەساڵی1550 دادگای پشکنینیی دامەزراند. بەلام ئەوە لەسەرشانی دانیشتوان گرانبوو، چونکە ئەوان لەسەر ئازادییو سەربەخۆیی سیاسیو ئابووری ڕاهاتبوونو هەرلەبەرئەوەش کالڤنیەتیان وەرگرت. لەپاڵ ئەوانەداو ئەو لێپێچانەوەو ئیجرائاتانەی چارلس گرتنیەبەر، بووبەهۆی پەیدابوونی ناڕەزایەکی گشتی. ساکاتێکیش "فیلپ"ی کوڕی هاتە سەر دەسەلات، بارودۆخەکە خراپتر بوو. چونکە کوڕەکەی ویستی سیاسەتی باوکی توندتربکات. بەوەش بەرەنگاریەکی گشتی لەسەرجەم چینەکانەوە دەستی پێکرد[1].

خانەدانان یەکەم چینێکی کۆمەڵگە بوون کەناڕەزایی خۆیان دەربڕی، دوای ئەوەی هەستیان بەوە کرد کەفیلپ دەیەوێ لەپۆستە حکومیەکان دوریانخاتەوەو لەئەنجومەنە ناوچەییەکاندا مافیان نەهێڵێت. هەروەها فیلپ

1 Ibid: pp 231-232.

ئەنجومەنی دەوڵەتی لەگشت دەسەلاّتێك داماڵی، کە پێشتر لەم دەسەلاّتانەی بەهرەمەند بوو. فیلپ خانەدانانی تۆمەتبارکرد بەوەی خۆیان بە بەرپرسیار نازانن لەبەرامبەر گەلو بەکۆمەڵەیەکی خۆویستو بەدکرداری ناوزەد کردن. بەلاّم ئەم پرسە لەوە زیاتر بوو، لەڕاستیدا فیلپ دەیویست نەك هەر زاڵبێت بەسەر خانەدانانو بەربژاریەکانیان نەهێڵێت، بەڵکو مەبەستی بوو زاڵبێت بەسەر ئازادی دەستوری شارنشینانو دەسەلاّتی ڕەهای خۆی بەسەر ولاّتدا بسەپێنێ.هەروەك بڕیاریدا هرتقە لەناوبەرێو پرۆتستانتیەت لەڕەگو ڕیشەوە دەربهێنێو کڵێسای کاسۆلیکی لەزەویەنزمەکان دابمەزرێنێتەوە. بەلاّم ئەمە ناڕەزایی لێکەوتەوە. خانەدانان نیگەران بوونو ناڕەزایان دەربڕی لە لەدەستچونی سەروەتی کڵێساو دەسەلاّتی ئەم کڵێسایە بەسەریاندا. بازرگانانیش ڕەخنەیان هەبوو نارازی بوون لەدەستێوەردانی پیاوانی ئاینی لەکاروباری ئابووریان.

خەڵکی شاری "ئەنتۆریب" داوایان لە"فیلپ" کرد کە ڕێکخستنەوەی کڵێساو سەپاندنی کاسۆلیکی بەسەریاندا بوەستێنێ. وەلێ "فیلپ" بە سەپاندنی ویستو مەبەستی بەسەر گەل، ڕوبەڕووی ئەم ناڕەزاییە توندە بوویەوە.

فیلپی دووەم قەرزێکی زۆرو بەسەریەکداکەڵەکە بووی هی سەردەمی باوکی بۆ بەجێمابوو، ئەوەش بەهۆی سیاسەتی دەرەوەی چارلسو جەنگە بەردەوامو بە مەسەرەفەکانی. دانیشتوانی زەویە نزمەکانیش پشکی شێریان بەردەکەوت لەو خەرجیانەی کە پاشاکانی ئیسپانیا خەرجیان دەکرد،

بەبێئەوەی هیچ بەرژەوەندیەکیان لەوەدا هەبێ. ئەوان هەبوونی سەربازە ئیسپانیەکانیان لەولاتی خۆیاندا بەلاوە ناخۆش بوو. ئەمەش لەدوای بەستنی ڕێککەوتننامەی"کاتو کامبریس"ی- سالی 1559، کە بەهۆیەوە کۆتایهات بە جەنگی ئیسپانیاو فەرنسا.

پێویست بوو لەسەر هۆلەندیو بەلجیکیەکان خەرجی ئەم سوپایە بدەن بەشێوەیەکی نەقدیو دیار. لەڕاستیدا هەبوونی ئەم سوپایە نیشاندانی دەسەلاتی فیلیپی دووەم بوو لەزەویەنزمەکان.

فیلپ نەیدەزانی لەوێدا چی ڕوودەدات. ئەم جگە لەتەنها جارێك نەبێت سەردانی زەویەنزمەکانی نەکرد، ئەم سەردانەشی لەسەرەتای دەسەلاتداریو لەسالی 1559دا بوو. بەلام دەبێ ئەوە بزانین کە مەدریدو ئەمستردام یاخود برۆکسل لەیەکترەوە دور بوون. ئەم ڕاپۆرتانەشی بۆی ڕەواندەکران هەمویان جێگەی بایەخ نەبوون. ئەو کێشەو گیروگرفتانەی کە هەبوون سانا بوونو دەتوانرا چارەسەر بکرێن، ئەگەر فیلپ خۆی لەناویان بووبا. بەلام دواتر ئالۆز بوون و شۆڕشێکی بەرفراوانی نەتەوەیی لێکەوتەوە[1].

لەسەرەتاداناڕەزایی لەدژی هەبونیهێزەسەربازیەکانی ئیسپانیاو دادگاکانی پشکنینبوو لە شارەکاندا. خانم"مرگریت ئۆف پارما" کە بەسەر هۆلندا فەرمانڕەوا بوو، هەولێدا پشکی گەورە لە بەربژاری ببەخشێ بەهۆلندیەکان، ئەمەش بە کشاندنەوەی هێزە ئیسپانیەکان لەشارەکانو دەرکردنی هەندێ لەو فەرمانبەرانەی کە ناحەز بوون بەلای دانیشتوانەوە.

---

1 Ibid; pp. 232-234.

بەلآم فیلیپ سووربوو لەسەر پیادەکردنی سیاسەتە ئاینیەکەیی‌و هۆشداریدایە"مرگرێت" بۆ پیادە کردنی ئەم سیاسەتە، سەرەڕای ئەوەی خانەدانان ئاگاداریانکردەوەو لەم بارەیەوە پێیان ڕاگەیاند کە پیادەکردنی ئەم سیاسەتە لەم کاتەپڕ لەپەشێوی وشلەژاویەدا کە ولآتی گرتۆتوە کارێکی گەوجانەیەو لۆژیکی نییە. کاتێ فیلیپ سووربوو لەسەر پیادەکردنی پێشنیارەکانی ئەنجومەنی تەرنتی کەنەسی لەزەویەنزمەکان، خانەدانان لەساڵی1566 کۆبونەوەو سکالآنامەیەکیانپێشکەشی"مارگریت"کرد. تیایدا گوێڕایەڵێ خۆیان دەربڕی‌و هۆشداریشیاندایە بە هەلگیرسانی شۆڕش‌و تەشەنەسەندنی لەولآتدا، ئەگەر بێت‌و دادگاکانی پشکنین هەڵنەوەشێتەوەو ستەم لەسەریان هەڵنەگیرێ. لەسەرەتادا "مارگریت" گوێی بۆ گرتن‌و سکالآکانی پەسەند کردن. بەلآم یەکێ لەڕاوێژکارە ئیسپانیەکانی پێی ڕاگەیاند: "کەپێویست ناکات لەم سواڵکارانە بترسن" مەبەستی پێی میرەکانی زەویە نزمەکان بوو. ئیدی لەمەوە شۆڕشگێڕان ناویان لەخۆیان نا"سواڵکاران" دواتر دروشمی"تورەکەوکەشکۆڵ"[1]یان- بەرزکردەوە. سواڵکاران بۆ پێشکەشکردنی سکالآکانیان شاندێکیان چوویە لای پاشا. لەسەرەتادا پاشابەڵێنی جێبەجێکردنی داواکاریەکان‌و هەڵوەشاندنەوەی دادگای پشکنینی دا، بەلآم هەر زوو لەبەڵێنەکەی پەشیمان بویەوە. ئیدی لەم کاتەدا جەماوەری تورە لەپرۆتستانتە توندڕەوەکانی زەویەنزمەکان هێرشیانکردە سەر کلێسای کاسۆلیکی‌و تێکیانداو وێنەوپەیکەرەکانیان

---

[1] مەبەست لە کەشکۆڵ:- تورەکەی سواڵکەرە.

شکاندو دێرەکانیان وێرانکرد، ئەمجا کتدرائیەی ئەنتۆربیان لەهاوینی 1566 ڕوخاند.

فیلیپی دووەم لەبەرامبەر ئەمەداو بەمەبەستی سەرکوتکردنیخەڵکی زەویەنزمەکان،"دۆف ئەلڤا"ی وەك بەناوبانگترین سەرکردەی سەربازی بە سوپایەکەوە نارد بۆ ناوچەکە. "ئالڤا" لەئابی 1567 گەیشتە زەویەنزمەکان. لەوێشدا بەوپەڕی تواناو لێهاتوییەوە دەستیکرد بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانی پاشا. ئەمجا هەستا بە دامەزراندنی ئەنجومەنی شۆڕش بۆ چاوخشاندنەوە بەو گیروگرفتانەی تایبەت بوون بەناپاکی. بەلاّم ئەنجومەن گۆڕا بۆ دادگایەکی عورفی، کە خەڵکی ناویان نابوو دادگای خوێن. ئالڤا وەك حاکمی گشتی بۆ ماوەی شەش ساڵ لەزەویە نزمەکان مایەوەو لەم ماوەیەدا هەشت هەزار کەسی لەسێداردا، کە لەناویاندا گەورە خانەدانان هەبوون. هەروەها سێ هەزار کەسی لەسەروەتو سامانی تایبەتی خۆیان بێ بەش کرد، ئەوانەیشی کە ولاّتیان جێهێشت لەسەد هەزار کەس کەمتر نەبوون. لەپاڵ ئەوانەشدا "ئالڤا" هەستا بە وەرگرتنی دەیەك لەنرخی هەموو شتێکی فرۆشراو. جا ئەم باجانەو نەمانی سەقامگیریو لەبارچونی هێمنیو ئاسایش، بوو بەهۆی تێکچونی باری ئابووری ولاّت. لە دەرەنجامی ئەمەدا دانیشتوانی شارە بۆرجوازیەکانی باشور لەگەڵ خانەدانانو بازرگانانی باکور کە پرۆتستانتی بوون ڕیزەکانیان پتەو کردو شۆڕشیان لەدژی ئیسپانیا ڕاگەیاند[1].

---

1 Ibid; pp. 134-137

**هەڵبژاردنی ولیەم ئۆرنج بەڕێبەری شۆڕش:-**

خانەدانانی زەویەنزمەکان،"ولیەم ئۆرنج"ی میری "هۆڵنداو زیلندا"یان "1533_1584"بەسیاسەتوان و سەرکردەیەکی گەورە دەهاتە بەرچاو. "ولیەم ئۆرنج" پرۆتستانتی مەزهەب بوو. کاتێکیش "ئالڤا" گەیشتە زەوییەنزمەکان، ئەم وڵاتی جێهێشت و ڕویکردە ناوچەکانی خۆی لە"ناساو" لە ئەڵمانیا. ئەم خانەوادەیە بەهۆی ئەوەی خاوەنی هەرێمی "ئۆرنج" بوون لەباشوری فەرەنسا، نازناوی "ئۆرنج"یان-بەسەردابڕا. "ئالڤا" دەستیگرت بەسەر گشت موڵك وماڵی"ولیەم ئۆرنج"لەهۆڵندا. کاتێکیش شۆڕشگێڕان چەند کەمە سەرکەتنێکیان بەدەستهێنا، بانگهێشتی"ولیەم ئۆرنج"یان- کرد بۆ گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی و ڕابەڕایەتی کردنی شۆڕش.

لەسەرەتادا سەرکەوتن بەلای هاوپەیمانی ئالڤاو ئیسپانیادا بوو، بەڵام ئۆرنج لەساڵی 1569، توانی هێزێکی دەریایی لەخۆبەخشان و چەتەکان دروستبکات. ئەوانە بەسوالکارانی دەریایی ناسران و ئامانجیان هێرشکردنەسەر کەشتیەئیسپانیەکان بوو. کاتێکیش ئەم هێزە لەیاخی بوان و تاوانباران تەیار کرا، لەدڕندانەترین کار لەدژی ئیسپانی و کاسولیکەکان خۆیان نەدەبوارد. ئەم هێزە بووە کرۆکی هێزی دەریایی هۆڵندی و بوونە دێوەزمەیەکی وا کەخەوی لەئالڤاو حکومەتی ئیسپانی تێکداو شۆکی کردن. ئەوانە شۆڕشگێڕانیان هاندەدا کەبەردەوام بن لەشۆڕشکردن. هاوکات "ولیەم ئۆرنج" بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئالڤا، هەستا بە دامەزراندنی سوپایەکی بەهێز. جا دوای ئەوەی ئالڤا نەیتوانی بارودۆخەکە ڕێکبخاتەوە،

لەساڵی 1573 "فیلپ" هەستا بەلابردنی "ئاڵڤا"و، "ڕێکوینرتز"ی لە جێگە دانا. هەرچەندە "ڕێکوڕتیز" کەسێکی دیبلۆماسی بوو، وەلێ لەئاڵڤا بەتواناتر نەبوو، ئەوەبوو شکستی هێناو لەساڵی 1576 بەنەخۆشی ڕەشەگرانەتا مرد. لەدوای مردنی، سەربازان بەبێ مووچە ماوەیەك مانەوە، هەربۆیە هێرشیانکردە سەر هەندێ شارو هەستان بە نانەوەی پەشێوی‌و ئاژاوەو ئەنجامدانی تاوان‌و دزی‌و ڕاوڕووت. لەو کاتەشداو لەساڵی1576 نوێنەرانی هەرێمەکان کۆبوونەوەو ڕێککەوتنێکیان کرد بۆئاشتەوایی‌و یەکدەنگ بوون لەسەر بەرەنگاربوونەوەی ئیسپانیەکانیان، تائەوەی دادگاکانی پشکنین لادەباو سەربەستی ڕابردوویان بۆ دەگێڕێتەوە. لە هەمان کاتدا فیلپی دووەم براکەی خۆی "دۆن جوانی" دیاری کرد وەك حاکم بەسەر زەوییەنزمەکان. "دۆن جوانی" وای بینی کە ڕێککەوتن‌و لەیەکترگەیشتن لەگەڵ پڕۆستانتیەکان کاتی بەسەرچووە. بەڵام ئەویش وەك حاکمی پێش خۆی نەیتوانی چارەسەرێك بۆ بارودۆخەکە بدۆزێتەوە ولەساڵی 1578 لەدنیا دەرچوو [1].

پاش ئەوە فیلپ "ئەسکەندەر فورینزای" میری پارما لە ئیتاڵیادا، وەك فەرمانڕەوای زەوییەنزمەکان دیاری کرد. ئەمەش بەهۆی ئەوەی لەلای فیلپ بەکەسێکی سیاسی‌و بەتوانا دادەنرا. "ئەسکەندەر" توانی بۆماوەی چواردەساڵ دەسەلات بەسەر زەویەنزمەکاندابنوێنێ "1578_1592". ئەو سیاسەتوانە لێهاتوە توانی پیادەی سیاسەتی میکافیللی بکات. ئەوە بوو

1 Ibid; pp.237-238

هەستا بەچاندنی تۆوی دووبەرەکیو ناکۆکی لەنێوان هەرێمەکانی باکور کەدانیشتوانەکەی بەئەڵمانی دەدوانو زۆرینەیان بازرگانو پرۆستانتی بوون، لەگەڵ هەرێمەکانی باشور کەدانیشتوانەکەی بە فەرەنسی قسەیان دەکردو زۆربەیان پیشەسازو کاسولیکی بوون. "فورینزا" بەدانیشتوانی باشوری دەووت: "هیچ شتێك نییە کەپەیوەندی ئێوەو ئیسپانیا لێکبکات، بەهۆی نزیکی ئایینو زمانتان. بەڵام وشیاربنو بەئاگا بن لەپرۆتستانتەکانی باکور کە لەزمان وئاینتان جودان. لەهەمان کاتیشداو لەساڵی "1579" ڕێککەوتننامەی "ئاراز"ی بەست لەگەڵ نوێنەرانی دە ویلایەتی باشور، بۆ پارێزگاری کردن لە کاسۆلیکیو بەرژەوەندیەکانی فیلپی دووەم. لەهەمان ساڵیشدانوێنەرانی هەرێمەکانی باکور کۆبوونەوەو پەیمانی "ئۆتریخت"یان-بەست، بە مەستی هەوڵدانو کۆششکردن بە ماڵو گیان لە پێناوی پارێزگاری کردن لەئازادیو سەربەستی زەوت کراوو مافی پێشێلکراوو هەپرون کراویان، بۆ دژایەتی کردنی ئیسپانیای سەرکێش. هەموو ئەمانەش بۆ بەدەستهێنانی ئازادی پەرستشکاریو ڕێزدانان بوو بۆ وڵات. بەم شێوەیە فورینزاپەیمانی "ئاشتەوای"ی -لەناو بردو زەویە نزمەکانی کردە دوو بەشو دوو ڕکەبەری یەکتر. بەشی باشور لەسەرەتادا لەژێردەستی بنەماڵەی "هبسبرگ"ی ئیسپانی مایەوە. بەڵام لەدوای پەیمانی "ئورتریخت"ی 1713 کەوتە ژێر دەستی نەمسا. لەکاتێکدا بەشی باکوری سەربەخۆو ئازاد بوو، ناونرا هۆڵندا. هۆڵندا توانی پێگەیەکی نایاب لەناو گەلانی شارستانی ئەورووپا بۆ خۆی بنیات بنێو تا ڕۆژگارێکی درێژ سەروەتو سامانی زۆرترو خۆشگوزەرانو

بالآتر بوو لە بەلجیکا. هاوکات دژایەتی‌و جەنگ‌و ناکۆکی بەشی باشوری زەویە نزمەکان "بەلجیکا"ی توشی داڕوخان کردبوو. وە بەهۆی بەربەستی هۆڵندیەکان لەسەر ئاوەڕۆی "شیلت"و زاڵ بونیان بەسەر ئاوەکانی دەوروبەر، ئابووری بەلجیکا هەرەسی هێناو گوزەرێکی کەمەرشکێن لە بەندەری ئەنتۆریب دراو بازرگانی‌و پیشەسازی گواسترایەوە شاری ئەمستردامی هۆڵندا. هەموو ئەمانەش بەهۆی دروستکردنی بەربەستی هۆڵندیەکان لەسەر ئاوی شیلت ڕوویدا.

جەنگ‌و شەڕو ناکۆکی بۆ ماوەیەکی دورو درێژ لەنێوان ئیسپانیاو هۆڵندا بەردەوام بوو. "فورینزا" لەو باوەڕە دابوو کە دەتوانێ باکوریەکان بەزەبری هێز سەرکوتبکات، هەروەك چۆن بەهۆی زرنگی‌و سیاسەتەوە باشوریەکانی ملکەچکرد. بەلآم هۆڵندییەکان براوەبوون‌و سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەیان بەدەستهێناو سەربەخۆی خۆیان دەستکەوت بەهۆی کۆمەڵێ هۆکار. لەوانە:

1. سروشتی سەر زەمینی هۆڵندا گونجاو نەبوو بۆ جموجۆڵی سەربازی، ئەمەش بەهۆی نۆکەندی زۆر کە پێکهاتبو لەتۆڕێك. ئەم تۆڕە لەکاتی کردنەوەی بەربەستی سەر ڕوباری شلێت،دەتوانرا بکرێتە هێڵی بەرگری‌و بەهۆیەوە ئەرزەکان بە ئاو دادەپۆشران.

2. شارەزایی هۆڵندیەکان لە دەریاوانی دا، هەروەها ڕێکخستنی جموجۆڵی چەتە دەریاییەکان‌و هێرشە بەردەوامەکانیان بۆ سەر کەشتیە ئیسپانیەکان‌و بازرگانی‌و داگیرکەکانیان لەدەریادا. ئیدی ماوەیەکی زۆری

نەبرد کە هێرشکردنە سەر کەشتیە ئیسپانیەکان بوویە پیشەیەك ولآتو کۆمەڵەکان ئەنجامیان دەدا.

3. هۆڵندیەکان لەجەنگەکانیاندا پشتیاندەبەست بە سەربازانی بەکرێ گیراو. لەملاشەوە هەوڵەکانی خۆیان چڕدەکردەوە لەبواری بازرگانیو گەشەپێدانی ولآت لەڕووی ئابووریەوە، کە بەهۆیەوە خۆشگوزەرانیو خۆشنودی پەخشان بوو. ئەوەبوو هۆڵندا بوو بە ولآتێکی بازرگانیو داگیرکاری گەورە لەئەورووپادا. هەروەك ئەمستردام بووبە یەکێ لەشارە هەرە گەورەکانی بازرگانی لە جیهاندا.

4. سیاسەتی جەنگی "ولیم ئورنج" خۆی دەبینیەوە لە ڕووبەڕونەبوونەوە لەسەر زەویەکی بەرچاو. واتا" بەشێوەیەك جەنگی نەدەکرد کە دوژمن ئەوی لێ دیار بوایە". هەروەك سوپای ئیسپانی کەوتبووە بەر هێرشی بەردەوامی دوژمنانیان، تا بەرەو بێ توانیی چوون.

5. هۆڵندا توانی هاوکاریەکی زۆری جیهانی پرۆتستانتی بەتایبەت ئەڵمانیاو ئینگلتڕاو پرۆتستانتیەکانی فەرەنسا بەدەست بێنێ.

6. فیلپ خۆیشی هۆکار بوو، کاتێك دەیویست لەیەککاتدا زۆرترین پرۆژەکانی جێبەجێ بکات. هەربۆیە لەهیچیاندا سەرکەوتنی تەواوی بەدەستنەهێنا. ئەوکاتێك لەململانێیەکی توندو تیژدابوو لەگەڵ هۆڵندا، جەنگی لەدژی شاژن ئیلیزابێس ڕاگەیاند. هەروەك دەستی لەکاروباری ناوخۆی فەڕەنساش وەردەدا. هەرئەمەش وایکرد هۆڵندیەکان کارەکانیان ڕێکخەن وسەرکەوتن بەدەستبێنن.

لەساڵی 1581 فیلپی دووەم ولیەم ئۆرنجی بەناپاك لەقەڵەم داو لەدەرەوەی یاسای هەژمارکرد، هەروەك خەڵاتێکی تەرخانکرد بۆهەرکەسێ ئەو بەزیندویی یان بەمردویی بهێنێ. ولیەم ئۆرنج بە پۆزش هێنانەوەوپوچەڵکردنەوەی ئەوەی کە پێی تاوانبار کرابوو بەرپەرچی فیلپی دایەوە. پاشان نوێنەرانی هەرێمەکانی باکور لە "لاهای" کۆبوونەوەو بڕیاری جیابوونەوەیاندا لەپاشایەتی ئیسپانیاو ڕایانگەیاند کە پادشا هیچ دسەلاَتێکی نییە بەسەریاندا. شیاوی باسە وسیقەی "لاهای" ساڵی 1581 دادەنرێ بەبناغەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆی هۆڵندا. هەرچەندە "ولیەم ئۆرنج" لەساڵی 1584 لەلایەن بەکرێ گیراوانی ئیسپانیەوە تیرۆرکرا، بەڵام هۆڵندییەکان لەژێر سەرکردایەتی "مۆریس"ی کوڕی ولیەم ئۆرنج، هەر بەردەوام بوون لەخەبات و تێکۆشان لەدژی فیلپی دووەم . لەم کاتەشدا پەیوەندی نێوان ئینگلتراو ئیسپانیا زۆر ئاڵۆز ببوو، بەتایبەت پاش ئەوەی "ئەسکندەر فورینزا" لەساڵی 1585 توانی ئەنتۆریب داگیربکات و لە دەستی هۆڵندییەکان بیهێنێتە دەر. هاوکارییەکانی ئینگلتراش بۆ هۆڵندا دەستی پێکردو شۆڕش بەشێوەیەکی پچڕپچڕ هەرلابەردەوام بوو تاوەکوساڵی 1609، کاتێك فیلپی سێیەم ناچاربوو ئاگربەستێك لەگەڵ هۆڵندییەکان بۆماوەی دوازدە ساڵ ڕابگەیێنێ.

بەگوێرەی ئەم ئاگربەستە هۆڵندییەکان زۆر لەوەی پێشبینیان دەکرد زیاتریان دەستکەوت. بەڵام دانهێنان بە هۆڵندا وەك وڵاتێکی سەربەخۆ بەدرەنگ کەوت تاساڵی 1648ز.

حەوت هەرێمەکەی باکور بەیەکەوە ڕێککەوتن لەسەر پێکهێنانی دەوڵەتێکی یەکگرتووو ملکەچ بۆ پەرلەمان، کە نوێنەرایەتی هەرێمەکان بکات، وە فەرمانڕەواییەکی گشتی پشتاوپشتی هەبێت لە بنەماڵەی ئۆرنج. بەڵام هەر هەرێمێك کارگێڕیو ئیدارەی تایبەت بەخۆی هەبێتو پارێزگاری لێ بکرێت. ناکۆکی دەستوری لەنێوان فەرمانڕەوایی گشتیو پەرلەمان دروست بوو، وە بەردەوامیدابە درێژایی سەدەی حەڤدە. چینی سەرمایەدارو دەوڵەمەندی شارەکان پشتگیری پەرلەمانیان دەکردو ئارەزویان لەئیدارەیەکی ئۆلیگاریکی بوو. کە لەم شێوەیەدا حکومەتی مەرکەزی دەستخستنە نێو کاروباری هەرێمەکانی کەمترە. ئەمە لەکاتێکدا چینی هەژارایش پشتگیری فەرمانڕەوایان دەکردو هاوکاریان دەکرد لەدامەزراندنی حکومەتێکی پاشایی دەستوری بەڕابەرایەتیو سەرکردایەتی بنەماڵەی ئۆرنج، لەگەڵ هەبوونی پەرلەمانێکی گشتی هاوشێوەی ئینگلترا. لەماوەی سەدەی حەڤدە هۆڵندا بوو بە دەوڵەتێکی پەرلەمانی کۆماری، لەگەڵ هەبونی ئازادی گەورە بۆتاك وکۆمەڵ و گەشانەوەیەکی ئابوری بە شێوەیەك پێشتر وێنەی نەبوو.

نیوەی سەدەی حەڤدە لەژێر سایەی سیستەمی کۆماری سەردەمی زێڕینی هۆڵندا بوو. سەرۆکی ئەو کاتە "دی ویت" بوو1663-1672 کە لەلایان دانیشتوانی شارەکانەوە پشتگیری دەکرا، ئەوانەی کەپشتیوانی کۆماریان دەکرد. بەڵام کارە دوژمنکارەکانی لویسی چواردە بۆسەر هۆڵندا، بووبە هۆی پەستبوونو ناڕەزاییو بێزاری خەڵکی. بەوهۆیەوە "دی ویت" یان کوشت وپشتگیریان لە فرمانڕەوای نوێ "ولیم ئۆرنج"کرد. "ولیم

ئۆرنج"ی نویێ، نەوەی ولیەم ئۆرنجی فەرمانڕەوایی پێشوی هۆڵندابوو، وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد. ولیمی نویێ هەر لەکۆنەوە خەڵکی لادێکان پشتگیریان لێدەکردو لەلایەن گەلی هۆڵندیشەوە دەسەڵاتێکی فراوانی پێ بەخشرا، بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی کارە دوژمنکاریەکانی لۆیسی چواردە. شیاوی باسە کۆماری پێشوو نەیتوانی بەرەنگاری لۆیسی چواردە ببێتەوەو زۆر لەداگیرگەکانی لەدەستدا.

لەدوای مردنی ولیەم ئۆرنج لەساڵی 1702، سیستەمی پەرلەمانی هەر بەردەوام بوو. پاشایەتی لەسەدەی هەژدە پێگەی بەهێزتربوو لەناو بنەماڵەی ئۆرنج. تەنانەت تاوەکو ئێستاش ئەم بنەماڵەیە بە دەسەڵاتداریەکی دیموکراتی پەرلەمانی لەسەر شێوازی سیستەمی ئینگلترا فەرمانڕەوایی بەسەر هۆڵندادا دەکات. لەملاشەوە بەلجیکا لەژێردەستی ئیسپانیادا مایەوە. پاشان کەوتە ژێردەستی نەمسا، وەلە دوای هەڵگیرسانی شۆڕش لەدژی هۆڵندا لەساڵی 1831، سەربەخۆیی لەساڵی"1839" بەدەستهێنا.

## ئینگلترای ڕۆژگاری شاژنە ئیلیزابێس "1558-1603"

"ماری تیۆدۆر" کچی "هنری هەشتەم‌و خێزانی فیلپی دووەم"ی پاشای ئیسپانیا لەساڵی "1558" تالاوی مەرگی چەشت، بەمەش تەختی ئینگلیزی گواسترایەوە بۆ زڕخوشکی خۆی "ئیلیزابێس"ی کچی"ئان بۆلین". فیلپی دووەم ڕۆڵی هەبوو لەپاراستنی ئیلیزابێس‌و گواستنەوەی تەخت بۆ ئەو. بەو ئومێدەی هاوسەرگیری لەگەڵدا ساز بکات، لەپاش مردنی خێزانەکەی"ماری".

ئیلیزابێس خۆسەپێن و سەرکەشبوو، بەڵام بەناوبانگ بوو بەزیرەکیەکی کەم وێنەو بەتوانایی لەبڕیارداندا. کارزانی‌و سیاسەتوانی لە "ئیلیزابێس"دا

دەرکەوت بەشێوەیەك لەناو کەمێ لەسەرکردەکانی ئەوروپای ئەوکاتدا نەبێ، وێنەی نەبووە. کەسایەتی سەرنجڕاکێشی ئەو کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەبەدەستهێنانی ڕێزوخۆشەویستی وەزیرو ڕاوێژکارەکانی.

ئیلیزابێس سیاسەتی میکاڤیللی پیادەکرد کە بنیات نرابوو لەسەر فێڵ‌و تەڵەکەبازی. فیلیپی دووەم هەوڵیدا لەڕێگەی هاوسەرگیریەوە لێی نزیك ببێتەوە، بەڵام ئەم ڕەتی کردەوە. ئیلیزابێس پرۆستانتی بوونی‌و نەتەوەیی بونی خۆی ڕاگەیاندو لەگەڵ تەوژمی بەرزی ئەوکاتی ئینگلترا دەڕۆیشت. کاتێك ئیلیزابێس لەدژی ئیسپانیا هاوکاری شۆڕشی پرۆستانتیەکانی کرد لەزەویەنزمەکان، پەیوەندییەکانی لەگەڵ فیلیپی دووەم گرژی تێکەوت، هەروەها دنەی چەتە دەریاییەکانی دا لەدەریاکانداو هێرشکردنە سەربازرگانیەتی ئیسپانیای گەرمترکردو هانی دەدا. لەپاش ئەوە فیلیپی دووەم دەستی کرد بەڕێکخستنی پیلان‌و دەسیسە بۆ لادان‌و کوشتنی ئیلیزابێس. هەروەها هەستا بەبەخشینی پارەو بەخشش بەخەڵکی لەهەریەکە لەئینگلتراو فەرەنساو ئێرلەنداو بە پارەوماڵ هەڵیخەڵەتاندن بۆ بەئەنجامگەیاندنی پیلان‌و دەسیسە لەدژی ئیلیزابێس. هەروەها فیلپ، ماری ستیوارتی شاژنی سکوتلەندای بە داردەستێك زانی بۆ جێبەجێ کردنی پیلانەکەی[1].

**ماری ستیورات:ـ**

ماری ستیورات کچی جیمسی پێنجەمی پاشای سکۆتلەندا لەساڵی 1542 لەدایك بووە، ماری نەوەی "مرگریتی خوشکی هنری هەشتەم" بوو"پاشای

1 Cant،W.E. History of Enland،(Harper،1957) pp.335_351.

ئینگلترا". هەربۆیە لەدوای مردنی ئیلیزابێس دەبوایە ماری کاندید بکرێت بۆ تەختی ئینگلیزی. شایانی باسە ئیلیزابێس شوی نەکردو هاوسەرگیری ئەنجام نەدا. لەهەمان کاتدا ماری نزیکایەتی هەبوو لەگەڵ بنەماڵەی "گیمز"ی فەڕەنسی. هنری هەشتەمیش هەوڵی دەدا ماری لە "ئیدواردی شەشەم"ی کوڕی مارە بکات، بە ئومێدی یەکانگیرکردنی دوورگەی بەریتانیا. بەڵام پەیوەندییەکانی نێوان بەڕیتانیاو سکۆتلەندا بەهۆی سیاسەتی چەوتی هنری هەشتەم لەبەرامبەر سکۆتلەندە گرژی تێ کەوت. ئەمەش بەهۆی هەوڵەکانی هنری هەشتەم بۆئەوەی سکۆتلەندا بخاتەپاڵ خۆیو پرۆستانتیەت بەسەریاندا بسەپێنێ. سکۆتلەندیەکانیش "ماری"ان- ناردە پاریس بە مەبەستی پەروەدەبوونی لەدەرباری شاهانەی فەڕەنسا.

لەم کاتەدا ئینگلترا ڕووبەڕوی مەترسی پەلاماری سکۆتلەندیو فەڕەنسیەکان بوویەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی جەنگی نێوان فەڕەنساو ئیسپانیا بە پەیمانبەستی "کاتۆکامبریس"ی ساڵی1559کۆتایی پێهات. ماری هاوسەرگیری کرد لەگەڵ فرانسوای دووەم کە تازە ببوە پاشای فەرەنسا. سکۆتلەنداش لەلایەن دایکی ماری بە وەصی فەرمانڕەوایی دەکرا، وە لەلایەن سوپای فەرەنسیەوە پشتگیری دەکرا. فرانسوای دووەم تا ئەو کاتەش تەمەنی بچوك بوو لەپازدە ساڵ تێ پەڕی نەدەکرد، بۆیە ڕاوێژکارەکانی حکومیان بەسەردادەکرد، کە دوانیان لەبنەماڵەی گیزبوونوخاڵی ماری ستیوراتبوون. ئەمانە دەیانویست ماری شاژنی فەرەنسا بکەن بەشاژنی بەریتانیا، بەوپێیەی ماری میراتگریشەرعیە. ئەمانە بۆ

مەبەستی خۆیان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە کاترین ئارگۆن خێزانی شەرعی هنری هەشتەمە، چونکە پاپا "کلێمنتی حەوتەم"ڕەوایی نەداوە بە تەلاق دانی کاترین، لەبەرئەوە گرێبەستی هاوسەری "ئان بۆلین" ڕەوانیە بە گوێرەی یاسای کڵێسا. کاتێکیش ئیلیزابێس کچی ئان بۆڵینە کچی ناشەرعی هنری هەشتەمە. لەڕاستیدا ئەم تەفسیرولێکدانەوەیە پەسەندو ڕاست بوو لەلایەن کاسۆلیکەکان، چونکە لەدیدی ئەواندا پرۆتستانتیەت هرتقە بوو. هەرچەندە فیلپی دووەم دەیویست ئینگلترا بە کاسۆلیکی بمێنێتەوە، بەڵام ئارەزووشی نەدەکرد فەرەنسا بەسەریدا باڵادەستبێ.

لەم کاتەدا ڕوداوەکان یاریدەی شاژن ئیلیزابێس-یان کردو "با" بەقازانجی ئیلیزابێس هەڵیکردو ڕزگاری بوو لەمەترسی پەلاماردران. ئەمەش کاتێ شۆڕشی پڕۆستانتی لەساڵی 1559 لەسکۆتلەندا هەڵگیرساو "جون نوکس"ی قوتابی جۆن کالڤن لەسویسڕاوە گەڕایەوە سکۆتلەنداو لەوێدا ژمارەیەکی زۆری سکۆتلەندیەکانی قەناعەت پێ هێنا. هەروەك لەم کاتەشدا بزوتنەوەی نەتەوایەتی بەهێزبوو کە دژایەتی باڵادەستبوونی فەرەنسایان دەکرد بەسەر سکۆتلەندا. کاسۆلیكوپرۆتستانتیەکان یەکیانگرتو شۆڕشگێڕەکان داوای هاوکاریان کرد. هەرچەندە هاوکاری ئیلازبێس واتای بەهێزکردنی پڕۆتستانتیەکانی دەگەیاند لە ئەوروپاداو سۆزی ئەوانی بۆ لای خۆی کێش دەکرد. وەلێ بێ وەی نەدەبوو لەمەترسی کاسۆلیکەکان، بەتایبەت فەرەنسیو ئیسپانیەکان لەبەرامبەریدا.

لەساڵی 1560 ئیلازبێس بڕیاریدا هاوکاری سکۆتلەندیەکان بکات. لەمیانەی هاوکاری کردنەکەدا سوپای ئینگلیزی سەرکەوت بەسەر سوپای فەرەنسیدا، وە بەگوێرەی پەیمانبەستی"ئەدینبر"کە لەنێوان وەصیو

ئینگلیز بەسترا، وەصی ڕەزامەندی نواند لەسەر پاشەکشەی سوپای فەرەنسی، بەو مەرجەی سوپای ئینگلتراش سکۆتلەندا جێبێڵێت. وەلەهەمانکاتداپەرلەمانی سکۆتلەندی کاسۆلیکیەتی لەکارخستو پرۆتستانیەتی کردە کڵێسای فەرمی. مەترسی فەڕنسیەکانیش بەمردنی فرانسوای دووەم لەساڵی 1560 کۆتایی پێهات، ئیدی هیچ هیواو ئاواتێك بۆ بێوەژن "ماری ستیورات" لەفەڕەنسا نەمایەوە، لەبەرئەوە ڕووەو سکۆتلەندا گەڕایەوە لەساڵی1561 کە ئەوکاتە تەمەنی هەژدە ساڵ بوو.

ماری ستیوراتی کاسۆلیکی مەزهەب هەستی کرد گەلی سکۆتلەندی پرۆتستانتی مەزهەب مەیلیان بەلای ئینگلترا دایە. ئیدی هەرچی زیرەکیو زرنگی هەبوو خستیەکار بۆ زاڵ بوونی بەسەر کێشەکان. ماری لەلوتکەی زیرەکیوجوانی دابوو، ئەو دوو بەهرەیەی خستە کار بۆ کێش کردنی هەرچی پەیوەندی پێوە ئەکرد، وە هەوڵی بەدەستهێنانی سۆزی گەلەکەیداو ڕێچکەوپەرتەوازەیی ئایینی فەرامۆشکردو جەختی دەکردەوە لەسەر لایەنی نەتەوەیی، بەمەستی بەدەستهێنانی هەندێ سەرکەوتن. لەساڵی 1565 ماری شوی کرد بە "لورد درانیلی"کاسولیکی مەزهەب. درانیلی نزیکایەتی هەبوو لەگەڵ بنەماڵەی پاشایەتی ئینگلیزی، ئەمەش ماری بەهێزکرد بۆ داواکردنی تەختی ئینگلیزی [1].

لەهەمان کاتدا کڵێسای کاسولیکی لەئیتاڵیا کۆتایی هێنا بەکۆبوونەوەو بەخۆداچوونەوەکانی کە لەچوارچێوەی ئەنجومەنی تەرنت بەڕێوە دەچوو. ئەنجومەنی تەرنت لەکۆتایی دانیشتنەکانی لەساڵی1563 بڕیاریدا

---

1 هەمان سەرچاوەی پێشوو

پڕۆتستانیەت بنبڕ بکاتو فیلپی دووەمیشی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە وەك سەرپەرشتیار دیاری کرد. فیلپی دووەم وای پێ باشبوو لەپێش هەستانی بە هەرکارێك، هەستێ بەشۆڕشێکی دیبلۆماسیو هەموو پرسەکان دوابخات بە مەبەستی لەناوبردنی پڕۆتستانیەت. فیلپ وەك هەنگاوی یەکەم، لەساڵی 1565لە"پوین"ی باشوری فەرەنسا کۆبوونەوەیەکی گرێدا لەنێوان "کاترین میدتچی وەصیو نوێنەری فیلپی دووەم". ئەوەشی کەلەوێدا گوزەرا بەنهێنی مایەوە، بەڵام کۆبوونەوە کۆتاییهێنا بەجیاوازی نێوان ئیسپانیاو فەڕنساو هەموو هەوڵی خۆیان خستەگەڕ بۆ لەناوبردنی پڕۆتستانیەت لەئینگلتراو فەرەنساو هۆڵندا. ئەوەش لەهەمبەر ئینگلترا مانای پشتگیری ئیسپانیاو فەرەنسای دەگەیاند بۆ "ماری ستیورات".

دیسان وەك جاری ڕابردوو بەخت یاوەری ئیلیزابێسی کرد، ئەوەش لەڕوودانی شۆڕشی زەوییە نزمەکان دەردەکەوێ، کەلە هەمان کاتدا ڕویداو فیلپی دووەمی ناچار کرد هێزێکی گەورە بنێرێ بۆ ئەم ناوچەیە بەمەبەستی سەرکوت کردنی شۆڕش. بەهۆی ئەوەش ماوەیەکی زۆر توشی سەرقاڵی بوو. هەروەها لەفەرەنساش شۆڕشی ئایینی سەریهەڵداو شۆڕشەکە گەورە بوو دواتر جەنگی نێوخۆیی لێکەوتەوە، بەشێوەیەك تا ساڵی 1589 کۆتایی نەهات.

لەسکۆتلەنداش ماری ستیورات بیروباوەڕی کاسولیکی خۆی ئاشکرا کرد. بەمەش پڕۆتستانیەتیەکان لێی دوور کەوتنەوە. لەملاشەوە "دارانلی" کەسێکی لوتبەرزو گێلبوو، هیچ هاوکارییەکی ماری نەدەکرد لەوتووێژکردنی لەگەڵ وولاتە کاسۆلیکیەکان. "درانیلی" بە مامەڵەیەکی ڕەق مامەڵەی لەگەڵ

ماری دەکرد، بەوەش ماری ناچار بوو پشت ببەستێ بە سکرتێرەکەی "داڤید ڕیزو". ئەمە بووە هۆی جولاندنی دەماری"غیرە"ی درانیلی هەتا ڕادەی سەرشێتی. تادواتر بە هاندانی لۆردە مەزهەب پرۆتستانتەکان درانیلی لەبەرچاوی ماری ستیورات "ڕیزو"ی کوشت.

پاش ئەمە ڕێککەوتن لەنێوان شاژن و هاوسەرەکەی دروست بوو، کە ماوەیەك بەردەوامی دا. لەم ماوەیەدا واتا ساڵی "1566" ماری کوڕێکی بوو ناوی لێینا "جیمس". بەلاّم پاش لەدایکبوونی ئەم کوڕەش "درانلی"لەهەڵسوکەوتە گەوجانەکەی دەرهەق بە"ماری" هەر بەردەوام بوو. تا ئەوەبوو ماری هەستی بە هاوکاری یەکێ لەڕاوێژکارە دلسۆزەکانی کرد بەناوی"بوسویل". مامەڵەی خراپی "درانیلی"بووە هۆی ئەوەی ماری بکەوێتە ئەڤینی "بوسویل". بوسویل دوودلی نەکرد لەکوشتنی درانلیو ڕفاندنی ماری ستیوراتو تەلاقدانی هاوسەرەکەی ، پاشان گەڕانەوەی بۆ "ئەندبرە"و مارە کردنی ماری لەخۆی لەسەر شێوازی پرۆتستانتی .

بەلاّم،لەئەنجامی ئەم ڕووداوانە "ماری" سەرجەم هاوکارییەکانی لەدەستداو گەلی سکۆتلەندی بوونە نەیاریو کەوتنە دژایەتی کردنی. هێزەکانی پرۆتستانتی توانیان "ماری" دەستگیر بکەنو بەسەر هێزەکانی "بوسویل"دا زاڵ بن. شیاوی باسە "ماری" دەستبەرداری تەختەکەی بوو بۆ کوڕەکەی. "ماری" بۆ ماوەیەك دەستبەسەر کرا، بەلاّم ئەو پیلانانەی کە ئەنجامدران هاوکاری هەلاّتنی مارییان کرد بۆ ئینگلترا لەساڵی1568.

وەنەبێ "ئیلیزابێس" حەزی کردبێت ماری ڕادەستی دوژمنەکانی بکات، یاخود هاوکاری بکات لە دژی دوژمنەکانی. بەلکو ئیلیزابیس لەجێگەی ئەم دوو هەلۆێستەدا، ڕێگەی سێیەمی هەڵبژارد کە بریتی بوو لەزیندانی کردنی

لەلای خۆی. لەبەرئەوە لەقەلآیەکدا زیندانی کرد. دواتـر ئەوزیندانـە بـۆی بـوو بە جێگەیەك تا کۆتایی ژیانی.

ئـەو مەترسـیانەی لەسـەر "مـاری" بـوو لەزینـدان، کـەمتر نـەبوو لـەو مەترسـیانەی کـە لەسـەری بـوون لـەکاتی پاشـایەتی. کاسـۆلیکەکانیش لەساڵی1569 بەسەرکردایەتی"نۆرفولك" شۆڕشێکیان هەڵگیرساند لەباکوری ئینگلترا، بە هیوای ئەوەی "نورفولك" هاوسەرگیری سـازبکات لەگـەڵ مـاریو دواتـر بیکـەن بەسـەرۆکی ئیـنگلتراو بیروبـاوەڕی کاسـۆلیکی بەسـەر وولآتـدا بـسەپێنن. واتـا (دوای ئـەوەی شـۆڕش سـەرکەوت، ئـەوان ئـەم هیوایـەیان هەبوو). خانەدانانیش بەهۆی نیگەرانیو دڵگرانیان لەکەمبوونەوەی چانـسیان لەپۆستەحوکومیەکانو لەرزۆك بوونی دەسـەلآتیانو زاڵبـوونی "لۆردسیـسل" بەسەر حوکومەتداو زیادبوونی دەسەلآتی، هاوکاریو پـشتگیری "دیـوك ئۆن نور فولك"یان– کرد. لەپاڵ ئەمەشدا هەستی ئایینی پاڵنەرێکی تریان بوو بۆ ئەوەی پشتگیری لە "نور فولك" بکەن، هەروەها فیلیپی دووەمـیش لەڕێگـەی باڵوێزی خۆی لـە لەنـدەن هـانی "نـور فولـك"ی– دەدا لەسـەر شۆڕشـکردن. بەلآم سەرەڕای هەموو ئەوانەش شۆڕش پێش دەستپێکردنی هەرەسی هێنـا. بـەهۆی ئـەوەی ئینگلیـزە کاسـۆلیکەکان شۆرشـیان لـەدژی حکومـەت ڕەت کـردەوە، لەملاشـەوە هاوکارییـەکانی ئیـسپانیا نەهاتنـە بەرهـەم. بـەهۆی ئەوانـەوە سـەرکردایەتی شـۆڕش بـەزیو "ئیلازبـێس"یـش– تۆڵـەی لـە شوێنکەوتەکانی شۆڕش کردەوە. هەروەها حکومەتی سکۆتلەنداش سەرکردە شۆڕشگێڕەکانی دەستگیرکردو ڕادەستی ئیلازبێـسی کـردن بۆئـەوەی توشـی هەمان چارەنوسی شوێنەکەواتەکانیان بکات.

لەساڵی 1570 پاپا فرمانی بێبەری بوونی لەهەمبەر "ئیلازبێس" دەرکردو فرمانەکەشی لە ئینگلترا بلاّوکرایەوە. بەلاّم ئەم فرمانە ئەگەر هاتبایەوپێش شۆڕش دەرکرابوایە، ئەوا کاریگەری دەبوو لەسەر کاسۆلیکە ئینگلیزەکان. بەلاّم دەرکردنی فرمانەکە لەدوای کۆتایی هاتنی شۆڕش بوو. ئەمەش ڕەنگدانەوەو کاریگەری پێچەوانەی دروستکردو بووبە هۆی ڕق و کینە لەدژی کاسۆلیك.

لەساڵی 1571 "ڕیدۆلفی" ئیتالی پارەگۆڕ، بەڕەزامەندی پاپاو فیلپی دووەم، هەستا بە سازدانی پیلانێك بۆ گۆڕینی سیستەمی دەسەلاّتی ئینگلترا. ئەمەش بە مارەکردنی ماری ستیورات لەنورفلك. "نورفولك" پێشتر دەستی لەشۆڕشەهەڵگرت، بەمەش خۆی ڕزگارکرد لەسزای سێدارە. هەروەهاپیلانەکە بۆ ئەوەش بوو بەهاوکاری هێزی ئیسپانی "نورفولك" بچێتە سەرتەختی ئینگلیزی. وەلێ ئەمانە بوونە پۆشی دەم ڕەشەباو "لوردسیسڵ" هەر لەسەرەتاوە هەستی بەو پیلانەکردو ئاشکرای کرد. بەلاّم لێی گەڕا بۆ ئەوەی سەرجەم نەخشەکانی بۆڕوون بێتەوەو سەرجەم سەرەداوەکانی بێتەدەست. لەو کاتەدا باڵوێزی ئیسپانی لەولاّت دەرکردوپیلانگێڕانی گرت، لەسەروی هەموشیانەوە "نورفولك". دواتر سەرجەمیانی لەسێدارەدا. ئیدی لەدوای ئەمانە پەرلەمان گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ژیانی ئیلازبێس لە مەترسی دایە، مادام ماری ستیورات لە ژیان دایە. لەبەرئەوە داوایان لە ئیلازبێس کرد ماری لەداربدات، بەلاّم ئیلازبێس

ئەمەی ڕەت کردەوە. پاش ئەمە ئیدی پیلانگێڕی کۆتایی پێهات تاکۆتایی سالّی1584.

ئیلازبێس بەنهێنیو جارجارەش لەڕێگەی پرۆتستانتە فەرەنسیەکانەوە هاوکاری شۆڕشی پرۆتستانتی دەکرد لەزەویەنزمەکان. بەلاّم زەویە نزمەکان لەسالّی 1579 دابەش بوو بۆ دوویەش، کە بریتی بوون لەباشوریەکانی لایەنگری ئیسپانیاو باکوریەپرۆتستانتیەکان، کە بڕیاریاندا خەبات بکەن لەپێناوی سەربەخۆیی. لەم ماوەیەی کە ئیلازبێس هەولّیدا هاوکاری باکوریەکان بکات. داوای لەمیر"ئەنجوی" برای پاشای فەرەنسی کرد، هاوکاری هۆلّندیەکان بکات لەبەرامبەر دیاری کردنی وەك فەرمانڕەوا بەسەر هۆلّندا. بەلاّم بۆ بەدبەختی ئەم میرە مرد. هەروەك"ولیم ئۆرنج"ی پێشەوای پرۆتستانتیەکان لەسالّی 1584 پەنهانکوژکرا. ئیدی هیچ بوارێك بۆ ئیلازبێس نەمایەوە کە هاوکاری پرۆتستانتیەکان بکات، تەنها بە ئاشکرایی نەبێت. لەمەوە هەر شالاّوکی ئیسپانیا بۆسەر هۆلّندا، هەلّمەتی ئینگلتراشی بەدوادا دەهات.

ئیلازبێس بۆ هاوکاری حەوت هەرێمەپرۆتستانتیەکە، وە لەدژی ئیسپانیا لەسالّی1585 سوپای وەڕێخست ڕووەو هۆلّندا. فیلپی دووەمیش پیلانێکی ڕێکخست لەدژی ئیلازبێس، کە کاسۆلیکەکان پێی هەلّدەستان بە مەبەستی هەلّگێڕانەوەی دەسەلاّتی ئینگلتراو کوشتنی ئیلازبێسو هێنانە سەرتەختی "ماری ستیورات". بەلاّم یەکێ لە وەزیرەکانی ئیلازبێس بەناوی"ولشانگهام"، بەپیلانەکەی زانیو ئاشکرای کردو پیلانگێڕانی دەستگیر کردو هەموویانی لەسالّی 1586 لە سێدارەدا. لەهەمانکاتدا پەرلەمان هاتە ئەو بڕوایەی کە سەقامگیری تەواو لەولاّتدا پەرەناگرێ، مادام

"ماری ستیورات" لەژیاندا بێت. لەمەشەوە پەرلەمان بڕیاری لەسێدرەدانی "ماری ستیورات"ی- دا. "ئیلازبێس"یش ڕەزامەندی لەسەر نواندو لەساڵی 1587 لەسێدارە درا. شیاوی باسە ئەم پیلانە دوایین چەك بوو لەدەستی فیلپی دووەم بۆ سەرکزکردنی ئینگلترا. ساکاتێکیش شکستی خوارد، جەنگی لەدژی ئینگلترا ڕاگەیاند.

**جەنگی ئارامادا 1588:-**

فیلپی دووەم باش دەیزانی، کە ناتوانێ حوکم بکات بەسەر هۆڵنداو ئەمریکا، وە ناتوانێ پارێزگاری بکات لەڕێگە بازرگانیەکان، تەنها بەوە نەبێ کە ئینگلترا سەرشۆڕ بکات. ماوەیەکیش دەبوو ئینگلیزەکان هێرشیان دەکردە سەر کەشتیەکانو داگیرگەکان. "سێرڤانتیس دریك" یەکەم کەس بوو کەشتیە ئیسپانیەکانی ڕووت کردەوە لەکەلوپەلەکانی لەزێڕو زیو، وە بەرەو بەندەرەکانی ئینگلیز ڕاپێچی دان. "ڕیچار هوکنز"و "والترڕایلی" لە لەناوبردنی قۆرغکاری بازرگانی ئیسپانیو پرتوگالی لەداگیرگەکان کەمتر نەبوون لەدریك.

فیلپی دووەم بۆ تۆڵەسەندنەوە لەئینگلیز کەشتگەلێکی گەورەی ئامادەکرد. ئەم کەشتیگەلە بەشێوەیەك بوو، جیهانی مەسیحی لەپێشتردا وێنەی ئەمەی بەخۆیەوە نەدی بوو. ئەم کەشتیگەلە پێکهاتبوولە 130 کەشتی گەورەو هەشت هەزار دەریاوانو نۆزدە هەزار سەرباز، سەرەڕای ئەوەی کە "ئەسکەندەر فرتیزای" فەرمانڕەوای زەویە نزمەکانیش بە 33 هەزار سەرباز گەیشتەوە پێیان. فیلپ وای دەزانی ئینگلترا بەهۆی

دووبەرەکی نێوان پرۆتستانتیو کاسۆلیکی لەناوخۆدا توشی دابەشەکی هاتوون. بەلاّم بۆچوونەکەی فیلپ ڕاست دەرنەچوو، بەلّکو ئینگلیزەکان هەستی نەتەوەییان زیاتر بوو. وە هەر ئەم هەستەش زالّ بوو بەسەر بیروباوەڕو ئاینیانو دەستیان خستە ناودەستی یەك بۆ پارێزگاری لەولاّت. لەلایەکی تریش کەشتگەلی ئینگلیزی لەگەلّ ئەوەی ژمارەی کەمو قەبارەی بچوك بوو، بەلاّم بەخێرایی دەجولاّنو سەرپەرشتی کرانیان ئاسانبوو، هەر ئەمەش سەری لە کەشتیگەلیو کەشتیە گەورەکانی شێواندو سەرپەرشتی کردنیانی قورس کرد. سەرەڕای ئەمەش ئینگلیزەکان کەشتیوانی شارەزایان هەبوو، هەروەها دەریاوانی بە ئەزمونیان هەبوو، کە ئەزمونیان لە جەنگی دەریاداپەیداکردبوو، بەتایبەت سەرکەوتنیان بەسەر کەشتیە ئیسپانیەکانو زالّ بوونیان بەسەر کەشتیوانە ئیسپانیەکان لەم بوارەدا. کەشتیە ئیسپانیەکان لە گێژەلۆکەیەکی توندی دەریایدا تێکشاکان، ئەمەش لە دەریاکانی دەورەی ئینگلترادا، بەتایبەت لەکەنداوە بەردینەکانی سکۆتلەندا. بە شکستی ئارمادا هۆلّندا ڕزگاری بوو، ڕۆژگاری قۆرغکاری ئیسپانی بۆ بازرگانیو داگیرگەکان بەسەرچوو، هەروەك یەکەم هەنگاوی دەسەلاّتو شکۆی بەریتانیا بوو بەسەر دەریاکاندا[1].

لەپاش جەنگی ئارمادا ئینگلترا سەقامگیر بوو، سکۆتلەنداش بوو بەدەولّەتێکی دۆست. دانیشتوانی "ویلز"یش- بنەمالّەی تیۆدۆریان بە بنەمالّەیەکی "ویلز"ی دانا، بەهۆی ئەوەی هنری حەوتەمی پاشای ئینگلترا

1 Travelyan ، B.M. Hstory of England ( Ronmup . 1958) pp . 323-360.

بە ڕەسەنویلّزیە. ئەم شۆڕشانەشی کە لەم کاتەدا هەلّگیرسان لە ئێرلەندا ئلازبێس بەئاسانی سەرکوتی کردن.

## فەرەنسای ڕۆژگاری جەنگو کوشتارە ئاینیەکان

## 1598-1558

فرانسوای یەکەم لەسالّی 1547 لەدونیا دەرچوو. دوای ئەم هنری کوڕی فڕانسوا بەناوی هنری دووەم لەجێگەی دانیشت. هنری دەسەلاّتی پاشای زیاد کردو لەسەر حسابی ئەلّمانیا فرانخوازی کرد ڕووەو خۆرهەلاّت. دواتر هاوسەرگیری ئەنجامدا لەگەلّ "کاترین میدتچ"ی فلۆرەنسی، کە بەناوبانگ بوو بە زیرکیەکی بێ وێنەو بیرتیژی لەفێلّو تەلّەکە بازیدا، لەگەلّ ڕوویەکی ناشرینو کەلەشێکی گەورە.

جەنگی نێوان فەرەنساو ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆزو ئیسپانیا لەسەردەمی ئەمدا هەر بەردەوام بوو، تا بە پەیمانبەستی "کاتوکامبریس" کۆتایی پێهات لەسالّی 1559. بەگوێرەی ئەم پەیمانبەستنە فەرەنسا شاری "میتزو تولو ڤیردون"ی ئەلّمانیای وەچنگ کەوت. ئیسپانیاش بەتەواوی قەلّەمڕەوی چەسپی بەسەر زەویە نزمەکانو ئیتالیا. بەلاّم لەمانگی تەموزی هەمان سالّدا هنری دووەم بەهۆی زۆر پێداگرتنی لەئەنجامدانی تفەنگبازی لەگەلّ سەردەستەی پاسەوانان،گیانی لەدەستدا. لەبەرئەوە کاترین میدچی ناچاربوو لەگەلّ منداڵەکانیدا هاوبەشی بکات لەفەرمانڕەوایدا. لەگەلّ هەریەکە لە:"فرانسوای دووەم 1559- 1560، چارلسی نۆیەم 1561-

1574هنری سێیەم 1572-1589". کاترین بڕوای وابوو کەپێگەو دەسەلاتی خۆی ومندالەکانی لەسێ لاوە هەڕەشەی لەسەرە. کەبریتین لە:

1. بلاوبوونەوەی پڕۆتستانتی لەفەڕەنسا، کەپێیان دەگوترا "هیگۆنت"

2. فراوان بوونو بەهێزبونی دەسەلاتی گەورە خانەدانەکان، بەتایبەت بنەمالەی گیزو بۆرۆن.

3. دەستتێوەردانی فیلپی دووەمی پاشای ئیسپانیا لە کاروباری فەرەنسا.

جائیستا یەکە یەکە شرۆڤیان دەکەین.

1_ هیگۆنۆت"پرۆتستانت":-

لەناوەڕاستی سەدەی شازدە پرۆتستانتی کالڤنی بەخێرییەکی بێوێنە لەفەرنسادا گەشەی سەندو پەخشان بوو، بەشێوەیەك لە30٪ فەرەنسایی گرتەوە. بەداهاتنی شەستەکانی هەمان سەدە، خانەدانانیش دەستیان کرد بەخۆخزاندنە ناو کلێسای پرۆتستانتی. "جۆن کالڤن"یش سور بوو لەسەر هێنانو کەمندەکێش کردنی خانەدانان بۆ نێو ئاینزاکەی. ئیدی زۆری نەبرد کە خانەدانان زالبوون بەسەر کۆبونەوەکانی کلێسای پرۆتستانتی.

دوای ئەوەی "کولینی" سەرکردەی هێزی دەریای فەرەنسیو "کوندی" سوپاسالاری فەرەنسی لەبنەمالەی بۆربۆن "لقێکی بنەمالەی پاشایی" چوونە ناو کلێسای پرۆتستانتی، دەسەلاتی سیاسیو سەربازی ئەوان گەیشتە ترۆپك. لەگەلْ هەبوونی دەسەلاتی سیاسیو سەبازیشیان، کەچی ئارەزوویان نەدەکرد کێشە دروستکەن بۆ بنەمالەی پاشایی یا سنورێك بۆ

دەسەلاتی پاشا دابنێن، واتا ئەوان "ئارەزوی ئەم کارەیان نەدەکرد". بەلکو ئازادی ئاینیان دەویست بەگوێرەی پرۆتستانتیەت. وەلێ "کۆندی" کە لە بنەماڵەی بۆربۆن بوو، ئارەزووی دەکرد بۆماوەیەك بچێتەپاڵ ئەنجومەنی ڕاسپاردن، تاوەکوپادشا؟دەگاتە تەمەنی پێ گەیشتن. ئەم دووانە واتا "کۆلینی و کۆندی" بالادەستبوون بەسەرجولانەوەی شۆڕشێکی خاوەن ڕێکخستنێکی سەربازیو سیاسیو ئایینی. فرنسوای یەکەمیش هەربچوك بوو کاتێ باوکی مرد، بەمەش بوو بە ئالەتێك بەدەستی خاڵەکانی لە بنەماڵەی گیز. ساکاتێکیش لەکانونی یەکەمی 1560 گیانی سپارد، براکەی "چارلسی نۆیەم" شوێنی گرتەوە کە گەیشتبووە تەمەنی دە ساڵان. ئیدی کاترین ئەم هەلەی قۆزتەوە بۆئەوەی لەجێگەی ئەوان فەرمانڕەوای بکات.

ئامانجی کاترین خۆی دەبینیەوە لەپارێزگاری کردن لەیەکیەتی فەڕەنساو هێشتنەوەی پادشایی لەناو منداڵەکانی. وە لەساڵی 1560 ئازادی پەرستشکاری بەپرۆتستانتیەکان بەخشی، لەبەرامبەر وازهێنانیان لەڕێکخستنی سەربازی. وەلێ کاترین وای بینی کەئەم لێبوردەییو ئازادی ئاینیە، ئەزیەتی کەمتر نییە لەپارێزگاری کردن لەیەکڕیزیو ڕێگری کردن لەدووبەرەکی. لەگەڵئەوەش کە هیگۆنۆت کەمینە بوون لەفەڕەنسا، بەلام باشترینی چینی ناوەڕاست بوون لەدەوڵەمەندیو ڕۆشنبیری داو لەسەردەمی فرانسوای یەکەمەوە زۆرینەیان خاوەن دەسەلاتو پۆستە بەرزەکانی دەوڵەت بوون. ئەوان جەختیان دەکردەوە لەسەر لێ بوردەیی ئاینی بۆ خۆیان، هەروەك داکۆکیان دەکرد لەسەر کۆبونەوەی پەرلەمان بەشێوەیەکی

ڕێكوپێكو باڵادەستی نوێنەرانی گەل بەسەر خەزێنەی دەوڵەت. بەڵام ئەمە تێكدەگیرا لەگەڵ دەسەلاتی پاشایی ڕەهاو یەكیەتی نیشتیمانی. لەبەئەوە هێرشو هەڵمەتی زۆركرایە سەریانو لەهەموو ناوچەكان دەچەوسێنرانەوە. هەروەك كوشتارگەو جەنگی ئاینی بەردەوام بوو بەدرێژایی ساڵانی 1562-1593 كە ئامانج تیایدا لەباربردنی پڕۆتستانتی بوو.

2-خانەدانان:ـ

دوو بنەماڵەی سەرەكی خانەدانان لەفەڕەنسادا هەبوون، كەلەگەڵ دەسەلاّنی بنەماڵەی پاشایی ناكۆكبوون. ئەوانیش بریتی بوون لەبنەماڵەی "گیز، بۆربۆن". بنەماڵەی بۆربۆن دەچونەوە سەر لۆیسی نۆیەم كەلەسەدەی سێزدە بووە پادشای فەڕەنسا. لەبەرئەوە لقێك بوون لەبنەماڵەی پاشایی. سەرۆكی ئەم بنەماڵیەش ناوی "ئانتۆنی" بوو لەسەردەمی "هنری دووەم،كاترین میدتچی"، كە بەسەر هەرێمێك بەناوی "ناڤار" لەنێوان ئیسپانیاو فەرەنسادا دەسەلاتداربوو. پێشتریش ئەوەمان ڕوونكردەوە كە "كۆندی" برابچوكی "ئانتۆنی"چووە سەر ئاینزای پڕۆتستانتی. بە مردنی یەكلەدوایەكی منداڵەكانی "هنری"ش كە پاشابوون بەسەر فەرەنسادا، بەبێ هەبوونی میراتگرێك لەناو بنەماڵەكەیان بۆ تەختی فەرەنسا، بنەماڵەی بۆربۆن بوو بە تاكە میراتگری تەختی فەرەنسی. وە بەگوێرەی یاسای فەرەنسی ئەوكاتیش كچ نەیدەتوانی بچێتە سەرتەختی فەرەنسا.

"ئـانتۆنی" هاوسـەرگیری کـرد لەگـەڵ شـاژنە ناڤـار، بەمـەش بووبەپاشـا بەسـەریدا. شـایەنی باسـە بەشـی باشـوری ئـەم هەرێمـە لەسـاڵی1512خرابووەسـەر ئیـسپانیا. براکەیـشی بـەناوی"لـۆیس"میربـوو بەسەر هەرێمی "کۆندی"، ئەو بەئازایی‌و دڵسۆزی ناسـرابوو، هەردوکیـشیان پرۆتستانتی بوون.

بەلام بنەماڵەی گیز دەچوونەوە سەر"دۆق لۆرین". شایانی باسـە هـەرێمی لۆرین بەشێك بوو لە ئیمپراتوریای ڕۆمانی پیرۆز. بەلام میرەکەی مەیلی بەلای فەرەنـسادابوو، پەیوەنـدیی کـرد بـە دەربـاری فرانـسوای یەکـەم‌و تـوانی شاری"متیز" لەئیمپراتورو شـاری "وەکـال"ی لـەئینگلترا بەدەسـتبخات‌و بـە فەرەنساوە گرێی بدات. بەمەش جـەماوەرێکی گـەورەی لـەناو فەرەنـسیەکان بۆخۆی گل دایەوە. "دۆق لۆرین" وەك کاسـۆلیکیەك مایـەوە، براکەیـشی کـە کاردینالْ بوو، بەناوبانگ بوو بە سەروەت‌و سامان ولوت بەرزی‌و کەشخەیی.

دەسەلاتی ئەم بنەماڵەیە لەسەردەمی "هنری دووەم" زیادی کرد.ئەمـەش بـەهۆی بەشـداری کردنیـان لـە جەنگـەکان دژی چارلـسی پێنجـەم‌و فیلپـی دووەم، وە هانـدانی پاشـا بـۆ بنبڕکردنـی پرۆتـستانتیەت،لەلایەکی تریـشەوە بەهۆی ئەوەی یەکێ لەنزیکانی خۆیان بـەناوی "مـاری سـتیوات"یـان– دا بـە فرانسوای یەکەمی جێگرەوەی پاشا. بـەلام باردۆخیـان هـەروا نەچـووەپێش، بـەڵکو بـە مردنـی فرانـسوای یەکـەم لەسـاڵی 1560باروردۆخیـان گـۆڕانی بەسەرداهات.

بەمردنی فرانسوای یەکەم بنەماڵەی "گیز" ڕووبەڕوی نەیاریەکی توندو سەختبوونەوەلەلایەن بنەماڵەی بۆربۆنی ڕکەبەریان‌و کاترین "میدتچی" شاژنی فەرەنسا. تا ئەوەبوو کاترین "دۆق گیزی" لەئەنجومەنی ڕاسپاردن دەرکرد.

"کاترین" لەهەڵپەی بنەماڵەی گیزو زیادبوونی دەسەڵاتی پرۆتستانتیەکاندەترسا. لەبەرئەوە زنجیرەیەك کوشتارگە "قصابخانە"و جەنگی ناوخۆیی نایەوە لەنێوان گەرم‌وگوڕەکانی بنەماڵەی گیزی کاسۆلیك‌و بۆربۆنی پرۆتستانت‌و هەرجارەو لایەنگری لایەنێکی دەگرت، تاوەکو ژمارەی قەسابخانەکان گەیشتنە هەشت کوشتارگەو لەناویاندا قەسابخانەی "سانتی بارتلیمۆ" لەهەموویان خوێناوی‌و توندوتیژتر بوو کە لە 24\ئابی\1572ڕویدا. کۆتایی هەموو کوشتارگەکان پێدانی بەربژاری بوو بە پرۆتستانتیەکان.

کاترین میدتچی لەباڵادەستی‌و دەسەڵاتی ئەدمیراڵ کۆلینی دەترسا. "کۆلێنی" بەهۆی توانا لەڕادەبەدەرەکەی‌و کەسایەتیە ڕێزدارکەی باڵادەستی بەسەر پاشادا نواندبوو. لەبەرئەوە کاترین داوای هاوکاری لەبنەماڵەی گیز کردو کوڕەکەی چارلسی والێکرد دەستورێك دەربکات بۆ تەفروتوناکردنی پرۆتستانتیەکان. نیشانەی دەسپێکردنی کوشتارەکەش لێدانی زەنگ بوو لەکلێسای پاریس لەکاتژمێر دووی پاش نیوە شەوی 24\8\1572. ئیدی ئەم شەوە کوشتارێك ڕویدا کە بەدرێژایی ئەو ڕۆژە بەردەوام بوو، وە لەهەرێمە جیاجیاکانیش حەوت ڕۆژی خایاندو بەهۆیەوە دەهەزار کەس بوونە قوربانی. ئەم کارە وەحشی گەرانەیە دەستی نەپاراست لەمنداڵ‌و ژن‌و پیرو پەککەوتە. شیاوی باسە ڕابەری پرۆتستانتیەتیەکان ئەدمیڕاڵ کولینی لەم

کوشتوکوشتارەدا کوژرا. بەلاَم هەموو ئەو دڕندەیی و وەحشی گەریەتیەش نەیتوانی پرۆتستانتیەکان لەناوبەرێو ورەیان دابەزێنێ.

لە دەرەنجامی ئەوەدا فەرنسابوو بە دوو بەش، بەشێکیان جەختیان دەکردەوە لەبەردەوامبوونی کوشتارەکان و لەناوبردنی پرۆتستانتیەکان[1]. کە ئەمانە لەبنەماڵەی گیز بوون. بەشەکەی تریشیان کە لەکاسۆلیکە میانڕەوەکان بوون، دژی کوشتارەکان وەستان و دژی بەکارهێنانی چەك و توندو تیژی بوون بۆ مەبەستی ئاینی. بۆ ئەو مەبەستەشپارتێکی سیاسیان دروستکرد بەناوی "پالۆتیك" واتا سیاسیەکان. هەروەها سەرزەنشتی بنەماڵەی گیزیان کرد لەسەر بەکارهێنانی سیاسەتی قبوڵنەکردنی یەکتری و پەنابردن بۆ جەنگی ئاینی بۆ مەبەستی سیاسی.

کاتێك کاروبارەکانی فەرەنسا ڕووەو خراپی ڕۆیشت، ڕۆڵە لاوازەکانی کاترین نەیانتوانی بەسەر کارەکانی دەوڵەت ڕابگەن. ئیدی جەنگێکی ناوخۆیی هەڵگیرسا لەنێوان هەرسێ بنەماڵەی "گیزو، بۆرۆن و، بنەماڵەی پاشایی". ئەم جەنگە ناسرا بە جەنگی سێ هنری، چونکە هەریەکەلە"هنری دۆق گیز، هنری ناڤار سەرۆکی بنەماڵەی بۆرۆن، هنری سێیەم پاشای فەرەنسا" بەژداریان تیاداکرد. ئەم جەنگە تا ساڵی 1589 بەردەوام بوو، کە تیایدا هنری "دۆق گیز" کوژراو "هنری سێیەم"یش-مرد، بەبێ ئەوەی هیچ میراتگرێ بەجێبهێڵێ بۆ تەختەکەی. بەمەش تەختی فەرنسی گوازرایەوە بۆ "هنری ناڤار"ی- سەرۆکی بنەماڵەی بۆربۆن. پاش ئەمە هنری ناڤار

---

[1] Green، op. cit; pp. 247-266

بەناوی هنری چوارەم لەساڵی 1589 هاتە سەر تەختی فەڕەنسی. لەم جەنگەدا فیلپی دووەمی پاشای ئیسپانیا هاوکاری دۆق گیزی کاسۆلیکی دەکردو، ئیلازبێس هاوکاری هنری ناڤارو پرۆتستانتیەکانی دەکرد.

بەهاتنی هنری چوارەم بۆ سەرتەختی فەرمانڕەوایی، ڕۆژگارێکی نوێ دەستی پێکرد. کە ڕۆژگاری مەزن بونی فەرەنسایە لەسەدەی حەڤدەو ئاوابوونی ئەستێرەی ئیسپانیاو پرتوگاله لەئاسمانی ئەوروپا.

# ئەوروپا لەسەدەی حەڤدە

## ئەوروپا لە دوای ساڵی 1600 :-

پاش ئەوەی ئەوروپا نزیکەی سەدەیەك شاهیدی بینینی جەنگی ئاینیو ڕکەبەری سیاسی بوو لەناو یەکتری، وەلێ لە سەرەتای سەدەی حەڤدەو لەگەڵ هاتنی ئەم سەدەیە، ئاشتییەکی ڕێژەیی ئەروپای داگرت. خەڵکیش هیچ چارەسەرێکیان شك نەدەبرد بۆ ئەو کێشانەی کە پێشتر ببوونە هۆی سەرهەڵدانی ئەم جەنگ و ناکۆکیانە. لەبەرئەوە لە چاوەڕوانی داگیرسانی ئاگری جەنگێکی وێرانکار دابوون، کە ئەوروپا هەرگیز جەنگی وەهای بەخۆوە نەدیبێ. ئەوەبوو چاوەڕوانیەکەیان شکاو ئەوەی چاوەڕوانیان دەکرد هاتەدی. کاتێك جەنگی سی ساڵە هەڵگیرسا.

لەفەرنسادا هنری چوارەم هاتە سەرتەختوجەنگی ناوەخۆش لە نێوان کاسۆلیك و پرۆستانت هەر بەردەوام بوو. کۆتایشی پێنەهات، هەتا لە کۆتاییدا بەربژاری تایبەت بەخشرا بە پرۆتستانتیەکان. ئەمەش بەگوێرەی فەرمانی "نانت"ی ساڵی1598. ئیدی لەم کاتەوە ئاشتی ئەم وڵاتەی داگرت. داگیرکاری لەنێوان ئیسپانیاو ئینگلترا کۆتایی پێهات. ئەمەش دوای ساڵێك لە هاتنە سەرتەختی "جیسمی یەکەم" بۆ سەر تەختی ئینگلیز لە ساڵی 1603. ئەم شایە سیاسەتی هێمنی گرتەبەر لەگەڵ ئیسپانیا، کە بە هۆیەوە چینی ناوەڕاست دلگرانوپەست بوون، ئەو چینەی کە لەسەر تالانکردنی داگیرگەکانی ئیسپانیا ڕاهاتبوون. هۆڵنداش لەجەنگەکانی لەگەڵ ئیسپانیادا لە پشتێنەیەکی تەسکدا جەنگەکانی بەڕێوەدەبرد، ئەوەندەش بەئاگربەستێکی دوازدە ساڵانە لەنێوانیاندا کۆتایی پێ هات لەساڵی 1609. وەلێ پێش ئەوەی ئەم ئاگربەستە کاتەکەی کۆتایی پێ بێت، جەنگی سی ساڵە هەڵگیرساو زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا بەژداریان تیاداکرد[1].

---

1 COTTSHALK. 1 . EUROPPE AND MODERN WORGD(CHICAGO .1951) V.I.P.P.260_277;298_304;353_360

## کۆمەڵگەی ئەوروپا لەسەدەی حەڤدە

سەرەڕای ئەو پێشهاتە سیاسیو ئابوریو ئاینیو شۆڕشگێڕیانەی ڕوویاندا، کە گەشەسەندنێکی مەزنبوون ئەورووپای گرتەوە. بەڵام کۆمەڵگای ئەورووپی بەلای کەمی لەڕوکەشدا تاڕادەیەك هەر بە کۆمەڵگەی سەدەی شازدە دەچوو. پادشاکان سەرۆکی وڵات بوون بێجگە لە هەندێ لە وڵاتە کۆمارییەکان. هەروەها پێگەی پیاوانی ئاینی لە کۆمەڵگادا پێگەیەکی گەورە بوو، هەروەك خانەدانەکانیش لە پۆستە بەرزەکانی دەوڵەتدا کاریان دەکردو لە سەرەوەی چینەکان بوونو بەچاوی سوك سەیری چینی بۆرجوازیان دەکرد. ئەو چیینەی تا ئەو کاتەش هەوڵیان دەدا یەکسان بکرێن لەمافەکاندا. بەڵام زۆرینەی دانیشتوان بریتی بوون لە جوتیارانو هەژار انی فەرامۆشکراوی شارەکان.

## دەسەڵاتی ڕەهاو مافی خودایی پاشاکان:-

پادشاکان لە فەرمانڕەوایەتیدا پشتیان دەبەست بەتیۆری مافی خودایی. چونکە پادشاکان سەرۆکی دەوڵەت وکلێسا بوون و دەیانتوانی فکرو بیروباوەڕی خەڵك لە وڵاتەکانیاندا ئاڕاستە بکەن. پادشا دامەزراوەو دامو دەزگای دەوڵەتی بەگوێرەی ویستو مەبەستی خۆی دەگونجاند. هەروەها خەڵکی ژێر دەسەڵاتی خۆی ناچار دەکرد ئەو ئاینو ئاینزایە هەڵبژێرن کەخۆی هەڵیبژاردبوو. مەبەستمان لەپادشاکان ئەوانە بوون کە ووڵاتەکانیان یەکخستو هەموو ئەو شتانەشیان لەناوبرد کە ببووە هۆی دوبەرەکیو تێکدانی ڕیزەکانی گەل. هاشێوەی بارودۆخی فەڕەنساو ئینگلترا، کاتێك توشی ناکۆکیو دووبەرەکی ناوخۆیی ببون. پروسیا ئەو وڵاتە بوو کە بەهەوڵو تێکۆشانی کۆمەڵێ لەپادشاکانی دامەزرا. ڕوسیاش هەر لە سەدەی حەڤدە پادشایەتی ڕەهای تێدا چەسپی. دروشمی باوو بەربڵاوی ناو پادشاکانی ئەورووپا بووبەدروشمی:"یەك پاشا فەرمانڕەوایی دەوڵەتێکی یەکگرتوویی خاوەن یەك یاساو

یەك ئایین‌و یەك بیروباوەڕ دەكات". بەڵام لەگەڵ هەمووئەمانەشدا دەوڵەت دانی دەنا بە دامودەزگاو دابو نەریتی ناوچەیی. خانەدانان‌و پیاوانی ئایینی‌و تەنانەت سەندیكاكانیش بەرەنگاری پێ درێژیەكان‌و تێپەڕاندنەكانی پادشاكانیان دەكرد، كاتێك لەسەر حیسابی بەرژاریەكانیان زیادی دەكرد. وەلێ لەگەڵ هەبوونی بەرەنگاری‌و دووبەرەكی‌و جیاوازی ئاینی لە هەندێ لەدەوڵەتەكاندا، بەلام پادشاكان بەشێوەیەكی گشتی توانیبویان زاڵبن بەسەر بارودۆخی وولاتەكانیان‌و شێوەیەك لە یەكیەتی ئاینی‌و سیاسی لە وولاتدا بەدی بهێنن.

پادشا ببوو بە سەرۆكی كلێساو هەستا بەجێگیركردن وسەقام گیركردنی هێمنی‌و ئاسایش لەولاتەكانیاندا، وە بەهۆی یاریدەرانیان ڕێكیانخستو داهاتی دەوڵەتیان بەكاردەهێنا لەسودی ولاتو پرۆسەی داگیركاری‌و فراوانخوازی[1]

## ڕۆڵی سوپا لەسەر چارەنوسی دەوڵەت:-

لە ئەوروپای سەدەی حەڤدە سیاسەت و پەیوەندیە دەرەكیەكان لە گرنگترین كارەكانی پاشا بوون. پێگەو گرپتینی دەوڵەت، پەیوەست بوو بە بەهێزی سوپاكەی لە گۆڕەپانی جەنگدا. جا لەبەرئەمانەو لە پێناوی پارێزگاری كردن لە نیزامی ناوخۆو چەسپاندنی دەسەلاتی پاشایی، دەوڵەت گرنگی زۆری دەدا بە هێزی سەربازی. بەسەربازیكردن لەم كاتەدا بوونی نەبوو، پاشاكان پشتیان دەبەست بەو كەسانەی كە ژیانی خۆیان لەسەربازیدا بەسەردەبردو سەربازی بۆیان ببوو بە پیشەیەك. هەروەها ئەفسەرانی سەربازیش بریتی بوون لەو خانەدانانەی كە خزمەتی سەربازی بۆیان شانازی بوو. جگە لەمە سەربازانی كاسەلێس‌و بەكرێگیراوەكان[2] پێكهێنەرێكی تر بوون

---

1 Ibid.

2 بەكرێ گیراوەكان: پێشتر ئەمەمان روون كردەوە

لە سوپادا. زۆینەی ئەم بەکرێگیراوانە پێکهاتبوون لە سویسریو ئەڵمانیە مەشق دراوەکان کە بە باشترینی سەربازانی ئەوروپا دەژمێردران لەم کاتەدا.

جەنگەکان جۆراوجۆر و بەردەوام بوون و ئاگربەستو ئاشتیەکان ماوەکورت بوون. بەمەش جەنگ ببوو بە بارێکی قورس لەسەر شانی چینی ناوەڕاستو هەژارو خەزێنەی دەوڵەت. پادشاکان بەسەر بارودۆخی وڵاتەکانیاندا زاڵ بوون. داهاتی وڵاتو هێزی سەربازیان بۆ مەبەستی فراوانکردنی وڵاتو قەڵەمڕەوی خۆیان دەخستە گەڕ، ئەمەش لەسەر حسابی وڵاتانو میرنشینانی تر تەواو دەبوو. جەنگەکانیش جەنگانێکی بەرفراوان نەبوون وەك جەنگی ئەمڕۆ، لەبەرئەوە زیانەکانیان سنوردار بوو.

## دەسەلاتی پیاوانی کۆشك"دەربار"، "بلاگ":ـ

هەرچەندە دەسەلاتی پیاوانی دەربار لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر جیاوازبوو، بەلام دەسەلاتێکی فراوانو گەورەیان هەبوو لە ئەوروپا. زۆرێك لە پۆستو پیشە گرنگەکان تایبەت بوو بە ئەوانو بەخشرابوون لەباجەکانو تەنانەت باجو پیتاکی دەرەبەگایشیان وەردەگرت لەو جوتیارانەی کە لە زەویەکانیاندا کشتوکاڵیان دەکرد. ئەوان وەك پیاوی سەربازی یاخود پیاوی دیبلۆماسی یان وەك کارمەندی تەکنیکی گرنگی زۆریان هەبوو لە دەوڵەتدا. گەنجەکانی ئەم چینە هەر لە بچوکیەوە ڕادەهێنرانو مەشق دەدران بۆ ئەو ئیشو کارانەی لە داهاتودا پێیان دەسپێردرا یا بۆیان دەمایەوە. زۆرێکیان بوونە پارێزەری زانستو هونەرو ئەدەب. بەلام بارودۆخی ئەوان هەروا نەمایەوە، بەلکو دەسەلاتی سیاسیان بەرەو شکستو لەناوچون ڕۆیشت، ئەمەش بەهۆی بالادەست بوونی پاشاکانو مەزن بونی چینی ناوەڕاست. ئەو چینەی داوای بەشداری کردنی دەکرد لە دەسەلاتی سیاسی.

بەلام خانەدانانی هەرێمەکان هەژاربوون. بارودۆخی ماڵیان بەشێوەیەك نەبوو کە بەهۆیەوە بتوانن دزە بکەنە کۆشكو دەربار. گەورەکانیشان خۆیان کاروباری ناوچەکانیان دەبرد بەڕێوەو قبوڵیان نەبوو ببنە شوێنکەوتەی پادشاو دەرباری پادشا.

ئەمە بارودۆخی خانەدانانی پروسیاو فەرەنساو تەنانەت ئینگلتراش بوو. ئەوانە پارێزگارییان لە پێگەی خۆیان دەکردو جێگەی ڕێزبوونو ڕێزیان لێ دەگیرا لە لایەن دانیشتوانی هەرێمەکان، بەڵام ناوبانگیان کەمتر بوو لە ناوبانگی پیاوانی کۆشك.

## گەشەسەندنی چینی بۆرجوازی:-

لە کاتێکدا زەوی و زار هۆکار بوو بۆ سەروەتو سامانو چینی ئەرستۆکراتی پیادەی دەسەلاتێکی سیاسی بەهێزی دەکرد. لەهەمانکاتدا چینی ناوەڕاست خۆی دەبینیەوە لە بازرگانو خاوەن سامانو خاوەن کارگەو فابریقەکان. ئەمانە خەباتیان دەکرد لەپێناوی دوورخستنەوەی چینی ئەرستۆکرتی و دەستخستنی مافە سیاسیەکانیانو بەشداری کردنیان لە دەسەلات. دەبینین لە ئینگلتراداو هەر بۆ ئەم مەبەستە لە نیوەی سەدەی حەڤدە چینی ناوەڕاست شۆڕشێکیان هەلگیرساندو کۆماری "ئۆلیڤەر کرۆمۆویل"یان- دامەزراند. وەلێ فەرەنسا تا ئەم کاتەش لە ژێر دەسەلاتی پاشایی ڕەهایی دابوو. هۆکاری پشتبەستنی پاشاکان بە چینی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە دەرەبەگایەتی ببوو بە سەرسەختترین دوژمنی پاشاکان، ئەمەش لەکۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستو سەرەتاکانی سەدە نوێیەکان. چینی ناوەڕاست کە بریتی بوون لە بازرگان و سەرمایەدارو خاوەن کارگەو کارخانەکان، دەیانویست ڕزگاریان بێت لە دەرەبەگایەتیو بەربەریەت. لەبەرئەوە بەسەروەتو سامانیان پاشاکانیان دەکردو بوونە هاوپەیمانیان ئەمەش لەپێناوی زاڵ بوونی پاشاو لەناوبردنی دەسەلاتی خانەدانو میرو دەرەبەگەکان. ئەم هاوپەیمانیو دۆستیە لە سەدەی حەڤدە هەربەردەوام بوو، تەنها لە ئینگلیترادا نەبێت، لەوێ چینی ناوەڕاست هەستی کرد ناتوانێ بەرژەوەندییەکانی بپارێزێو گەشەی پێبدا، ئەگەر بێتو بەشداری نەکات لە دەسەلاتو مافە سیاسیەکانی بەدەستنەهێنێو سنورێك دانەنێ بۆ پاشایەتی ڕەها. پاشایەتیەك کە دەستی کردبوو بە دەستدرێژیکردنە سەر مافەکانی چینی ناوەڕاست، ئیدی ئەوەش بووە هۆی دروستبوونی شۆڕشی پەرلەمانو جەنگی ناوخۆیی لە نیوەی سەدەی حەڤدە. بەلام ئەوە لەئینگلترا ڕویداو لەوێدا بارودۆخ بەم شێوەیە

بوو. ئەگینا لە شوێنەکانی تری کیشوەری ئەوروپا شۆڕشکردن لە دژی پاشایەتی ڕەها بەدرەنگ کەوت تا کۆتیی سەدەی هەژدە، کە تیایدا شۆڕشی فەرەنسی هەلگیرساو کۆتایی بەسەردەمی کۆن هێنا.

هەرچۆنێك بێت لە سەرەتاکانی سەدە نوێیەکان، پاشاکان دنەی بازرگانی و پیشەسازییان دەداو گرێبەست و بەلێندەرایەتی بازرگانیان دەبەست لەگەلَ ولاتانی دەرەوە. هەروەها بەربژاریان دەبەخشیو کۆمپانیای بازرگانیان دادەمەزراندو هەلدەستان بەسازکردنی پرۆژەی ئابوری بەرمێن بۆ تاکەکانی چینی ناوەڕاست، ئەوانەی کە تواناو هێزی خۆیان سەلماند لە کایەی بازرگانیو پرۆژەی ئابوریدا. لەمەشەوە سەرمایەدارو خاوەن پیشەو وەچەی چینی ناوەڕاست بە شێوەیەکی گشتی ویستو دەسەلاتی پاشایان چەسپاند.

بەلام ڕۆچونی پاشاکان لە دەسەلاتداریەتی ڕەهاو سەپاندنی باجی قورس بەسەر شانی چینی ناوەڕاستو یەکسان نەکردنی ئەم چینە لەگەلَ چینی ئەرستۆکراتی خاوەن زەویوزارەکان لەڕووی مافو بەربژارییەکان، بوو بەهۆی هەولدانی ئەم چینە بۆ دانانی سنورێك بۆ ئەم بارودۆخە، بە تایبەت لەپاش زیادبونی ژمارەی ئەم چینەو زۆربوونی سەروەتو سامانیان لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە قەتیس بوونی ڕۆشنبیریو مەعریفەت لەناو ڕۆلەکانیان. جا هەموو ئەوانە زەمینەی شۆڕشکردنی بۆڕەخساندن. لەبەرئەوە لە ئینگلترا هەستان بەسازدانی شۆڕش لە سەدەی حەڤدە. وە لە فەرەنساش لە کۆتایی سەدەی هەژدەو لە ناوچەکانی ئەوروپاش لە سەدەی نۆزدە شۆڕشەکانیان دەست پێکرد[1].

## قورسی باجەکان لەسەر خەلك بەگشتی:-

قورسی باجەکان کەتبووە سەرشانی جوتیاران، جوتیارانێك کە بەبێ ئەوەی ژیانیان باش بکرێ خەرجی دەولەتو دەربارو جەنگەکانیان دەکێشا. جوتیاران سێ لەسەر چواری دانیشتوانی ئەوروپایان پێکدەهێنا.

1 Ibid.

لە کاتێکدا زەوی‌و کێڵگەکان تا ئەو کاتەش بەسەرچاوەی سەروەت‌و سامان دادەنرا، قورسایی باجەکان کەوتبووە ئەستۆی جوتیاران، بەهۆی ئەوەی خانەدانان‌و خاوەن زەویەکان لەباج بەخشرابوون. شارە ئەوروپیەکان لە سەدەی حەڤدە قەرەباڵغ نەبوون بەچڕی دانیشتوان، کەم جار وابووە دانیشتوانی شارەکان لە 100000 کەس تێپەڕبووبێ مەگەر پایتەختە گەورەکانی وەك پاریس، لەندەن، لەوە زیاتر بووبن. لە کاتێدا ئەوانیش ژمارەی دانیشتوانیان نەدەگەیشتە نیو ملیۆن کەس. کرێکارانی شاروپیشەوەران نەیاندەتوانی باج بدەن، ئەمانە هەستان بە پێکهێنانی یەکیەتی کرێکاری، کە بەشێوەیەکی سەرەتایی پێکهاتبوو. بەلاّم هەرگیز لەلایەن حکومەتەکانەوە دانی پیا نەدەهێنرا.

خۆ هەرچەندە بازرگان‌و سەرمایەدارو خاوەن کارەکان بەشی گەورەی باجەکانیان دەدا. بەلاّم بەهۆی ئەوەی ئەوان ژمارەیان کەم بوو باجی قورس دەکەوتە ئەستۆی جوتیاران.

## نەبوونی هێزی گەل بۆ گۆڕانکاری:-

زۆر بەکەمی خاوەن دەسەلاّت‌و سیاسەتوانان گرنگیان دەدا بە ڕای گشتی‌و هێزی جەماوەر. خۆ وەنەبێ جەماوەریش لە وێنەی هێزێکی شۆڕشدا بووبن، بەڵکو ئەمانیش بەوبەشە ڕازی بوون کە لەژیانیاندا بەشیان بوو. ئەمەش بەهۆی ئەوەی باوەڕیان وابوو ویستی خودا وایەو هەر چینەو ڕۆڵی خۆی لەژیاندا بۆ براوەتەوە، بەشی خانەدانان ئیدارەو سیاسەتەو بەشی جوتیارانیش کێلاّنی زەوی‌و زارە. لەتوانای پاشاکاندا بوو کە بەسەر جەماوەردا دەست ڕۆیشتوبن‌و ئیدارەیان بکەن بەشێوەیەکی کاراو گوێڕپەڵیان دەستەبەر بکەن بۆ خۆیان. وە هەرچەندە کێشەکانیان ڕوون‌و دیاربوو، بەلاّم ئەم کێشانە نەدەبوونە مەترسی بەسەر سیستەمی دەسەلاّت. کەم وابووە جوتیاران شۆڕشبکەن، ئەو شۆڕشانەیشی کە ئەنجامیان دەدا، کێشەیەکی بچوك‌و ئاسان بوو

بەخێرایی سەرکوت دەکرا. سەرکردەکانی بزوتنەوە فیکریەکانیش لە چینی ناوەڕاست دابوون‌و کەمێکیان لە چینی ئەرستۆکراتی بوون.

کاتێکیش هۆشیاری سیاسی‌و فکری بەشێوەیەك لەشێوەکان لەناو جوتیاران لەئارادا نەبوو، ئەوان گرنگیان نەدەدا بە تەیاری سیاسی‌و فکری‌و ئاینی باوی ئەوروپا. هەروەك بە هیچ جولانەوەیەکی کاریگەر هەڵنەدەستان کە ببێتە هۆی باشکردنی بارودۆخی ژیانیان، یاخود ببێتە هۆی ئەوەی بیانکاتە خاوەن زەوی. ژیانی جوتیاران سادەو ساکار بوو، شێوازی سەرەتایان بەکاردەهێنا لە کشتوکاڵدا، جگە لە هەندێ ناوچەکانی ئەوروپا کە لەم قاعیدەیە لایاندا. بۆ نمونە لە ئینگلترا گەشەپێدانی سەرمایەداری و بازرگانی خوری بەرمێن و پڕقازانج، کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر لەناوبردن‌و نەهێشتنی دەرەبەگی‌و پەیدابوونی پڕۆسەی پەرژین بۆ سازکردنی لەوەڕگە بۆ بەخێوکردنی مەڕومالآت. ئیدی جوتیاران یا بوون بە کرێکاری کشتوکاڵ، کە بەکرێ کاریان دەکرد، یا بوونە شوان‌و چاودێری مەڕو مالآت. بەشێکیشیان کۆچیان کرد بۆ شارەکان بۆ ئەوەی لەژێر سیستەمی کەرتی تایبەت یاخود لە کارگەیەکی بچوك سەرقاڵ بن‌و دەست بەکاربکەن.

بە تێپەڕینی ڕۆژگار دەوڵەمەندو خاوەن سەرمایەکان توانیان زەوی هاوسێکانیان لە خاوەن زەویەکان بکڕن‌و پاشان بەیەکیانەوە گرێ بدەن‌و بیانخەنە پاڵ یەك، بەمەبەستی ئەوەی بیانکەن بەکێڵگەیەکی گەورە. جا هەر ئەم پڕۆسەیە کە دەوڵەمەندو خاوەن سەرمایەکان دەستیان پێکردبوو وایکرد ئینگلترا بە کێڵگەی فراوانەکانی ناوبانگ دەربکات.

بەلاَم لە ئەوروپای خۆرهەلاَت ڕەوشەکە بەم شێوەیە نەبوو، بەڵکو بارودۆخی جوتیاران تێکچوو، ئەمەش بەهۆی فراوانکردنی کێڵگە گەورەکان و پابەندکردنی جوتیاران بە زەویەکانیان. ئەم بارودۆخەش تاوەکو سەدەی نۆزدەو بیست هەربەردەوام بوو.

**فراوان بونی (کەلەبەر) نێوانی دەوڵەمەندو هەژار:-**

نێوانی چینی ئەرستۆکراتی و چینەنزمەکان لە کۆمەڵگەدا فراوانی تێکەوت. خاوەن سامانەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە دێهاتو لادێکان لەگەڵ جوتیاراندا ژیانیان بەسەر دەبردو بەشداریان لەگەڵ دەکردن لە شێوازی ژیان. بەڵام دواتر ئەمە گۆڕانی بەسەرداهات. ئەمجارە ئەوان لە شارەکان نیشتەجێ بوونو لە ژیانی شارنشینی بەهرەمەند بوونو دەستبلاویو زیادەڕۆیان دەکرد لە خواردنو پۆشاکو چێژو خۆشیەکان، بەشێوەیەك کە پێشینەو باوك وپیرانیان لەلادێکاندا پێشتر خەونیشیان پێیەوە نەدیبوو. وەلێ بۆ هەژاران هیچکات بوار نەدەڕەخسا بۆ گەیشتنیان بەم چینە، لەبەرئەوە لە سەریان پێویست بوو دەستگرن بەو پێگە کۆمەلایەتیەی کە هەیانبوو. دەوڵەمەندو خاوەن سامانەکانی چینی ناوەڕاستیش بەهۆی سەروەتو سامانیان توانیان بەربەستو لەمپەرەکان بشکێننو ژنو ژنخوازی لەگەڵ چینی ئەرستۆکراتی ئەنجام بدەنو خۆیان بخزێننە ناو ڕیزەکانیان. هەروەها ڕۆڵەکانی چینی ناوەڕاست، ئەو ڕۆڵەو زارۆکانەی کە پشکی گەورەیان هەبوو لە مەعریفە، توانیان پۆستە بەرزەکانی دەوڵەت بخەنە دەستی خۆیانو درزەبکەنە نێو ڕیزی چینە بەرزەکان.

لەگەڵ هەبوونی ئەم نێوانە فراوانە لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگە، بەلام لە دیدی خەڵکیدا ئەمە بەئاسای سەیر دەکرا. سەروەتو سامان مەگەر بەدەگمەن ئەگینا نەدەبووە هۆی گۆڕانکاری، بەڵکو بەهۆیەوە هەندێ ماف بە دەستدەخراو نزیکتر دەبوونەوە لەچینی سەروتر. گۆڕانی کۆمەلایەتی سستو خاو بوو، منداڵ لەسەر پیشەی باوکی دەڕۆیشتو خۆی لەسەر ڕادەهێناو مەشقی تیادا دەکرد بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی ڕواڵەتی لەشێوازەکانی ژیانو گوزەران ئەنجام بدات. جیلی تازە پاشکۆی جیلی پێشوتری بوو، جیلی نوێ لە هەموو لایەنەکانی خوو نەریتو شێوەی گوزەران بەتەواوی لە جیلی پێش خۆی دەچوو. تەیارە شۆڕشگێڕیەکان زیاتر سیاسیو هزری بوون، وەك لەوەی کۆمەلایەتیو ئابووری بن. ئەم تەیارو تەوژمانە نەدەبوونە

ڕێگر لە بەربژاری خانەدانانو پاشاکان، هەروەك نەدەبوونە هۆی وەرگرتنی مافی چینی گشتی لە پۆستە حکومیەکانداو دابەشکردنی سەروەتو سامان لەناو خەڵکیدا بەشێوەیەکی یەکسان. بزوتنەوەی بانگەشەی یەکسانی "الیڤر" لە ئینگلترا کە لە نیوەی سەدەی حەڤدە سازکرا، زیاتر وەك بزوتنەوەیەکی پەرگیرو توندڕەو گوزارشتی لێکراو کەمێك لە خەڵکی نەبێ، پشتگیریان لێنەکرد. لەسەر ئەورووپا پێویست بوو سەدەیەکی تر چاوەڕوان بێت بۆ دروستبوونی گۆڕانە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریەکان.

## ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆزو جەنگی سی ساڵە

بنەماڵەی هبسبرگی نەمساوی بەردەوام بوو لە فەرمانڕەوایی کردنی بەسەر موڵكو خاکە میراتیەکانی خۆی لە نەمسا، بۆهیمیاو هەنگاریا، سەرەڕای هەڵبژاردنیان بە ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریای ڕۆمانی پیرۆز. لەساڵی 1558 فردیناندی یەکەم برای چارلسی پێنجەم جێگەی چارلسی گرتەوە. ساکاتێکیش فردیناند لە ساڵی 1564 دونیای جێهێشت، ماکسیملیانی دووەمی کوڕی هەڵبژێردرا بە ئیمپراتۆر. بەلام ئەم ئیمپراتۆریایە لە کۆتاییەکانی ڕۆژگاری چارلسی پێنجەم هێزو شکۆمەندی لە دەستدا. ئەمەش بەهۆی بایەخدانی چارلس بە ئیسپانیا، ئەو ئیسپانیایەی خاوەن سوپایەکی بەهێز بوو، کە بەهێزی خۆی لە جەنگەکانی چارلسدا سەلماند، وە داهاتی ساڵانەی موڵکەکانی ئیسپانیا یاریدەی بەردەوام بوونی ئەم جەنگانەی دەدا. فیلیپی دووەمی پاشای ئیسپانیا لەباوکیەوە "چارلس"هێزو سەرەوتو سامانی بە میرات گرت. بێجگە لە فردیناندی مامی کە ئەمیش ئیمپراتۆریەتی بۆ بەجێما. لەملاشەوە دایتی ئەڵمانی بەرەبەر سەرجەم دەسەڵاتەکانی لەدەستدا، ئەمەش لەدوای سەردەمی چارلسو براکەی فردیناند. ئیتر دایت وای لێهات تەنها بۆ دەنگدان لەسەر باج کۆدەبویەوە[1].

---

1 Pennington، D.H. 17th Euorope( rondon 1974).

ئیمپراتۆر ڕۆدۆلف"1576–1612" کوڕی فردیناند، شاری "پراگ"ی لە بۆهیمیا کردە پایتەخت، بە مەبەستی خۆبەدورگرتنی لە پیلانگێڕیەکانی براکەی "ماسیۆز" 1612–1619. شیاوی باسە "ماسیوز" دەستیگرت بوو بەسەر موڵکەکانی بنەماڵەی هبسبرگ لە ڤیننا. لە سەردەمی جوتە براکە"ڕۆدۆلف–ماسیۆز" بارودۆخی ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز توشی پەشێویو ئاژاوە بوو لە ڕووی سیاسیو ئابووریو ئاینی کە دواتر سەری کێشا بۆ جەنگی ناخۆیو دواتریش لایەنە بیانیەکان چوونە نێوی. لە ڕاستیدا ئاشتەوایی "ئۆکسبرگ" لە ساڵی 1555 ئومێدی ئەوەی لێدەکرا کە کێشە ئاینیەکان بە کاتی لەناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز چارەسەربکات. وەلێ ئەم ئاشتەواییە لەم بوارەدا شکستی هێنا، ئەمەش بەهۆی:-

1. بەردەوام بوونی میرە پرۆتستانتیەکان لە دەستبەسەرداگراتنی زەویەکانی کڵێسا لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە پیاوانی ئاینی کاسۆلیك داهاتو سامانی کڵێسایان بۆ خۆیان هەڵدەگرت. ئەمەش پێچەوانەی ئاشتەوایی ئۆکسبرگ بوو.

2. ڕێککەوتننامەی ئۆکسبرگ دانی هێنا بە لۆسەریزمو کاسۆلیکیەت، ئەمە لەکاتێکدا کالڤنیزمیش لەباشورو ناوەڕاستی ئەڵمانیاو بۆهیمیا سەری هەڵدا بوو. جا ئەمانیش داوایان دەکرد کالڤنیزم لە مافدا یەکسان بێت بە لۆسەریزمو کاسۆلیکیەتو بەیەك چاو سەیر بکرێنو بە فەرەمی دان بهێنرێ بە کڵێسای کالڤنی.

جا بۆ چاوگێڕانەوە بە ڕێکەوتننامەی ئۆکسبرگو بە دەستهێنانی بەربژاری زیاتر لە ئیمپراتۆری کاسۆلیکی ڕۆدۆلف، میرە پرۆتستانتەکانی ئەڵمانیا بەسەرکردایەتی "فردریك"ی هەڵبژێردراوی ویلایەتی "پلانتیات لەسەر ڕاین"، لە ساڵی 1608 یەکیەتیەکیان پێکهێنا. لە بەرامبەر ئەمانیشدا میرە کاسۆلیکەکانی ئەڵمانیا بۆ بەرەنگاربوونەوەی پرۆتستانتیەتو ڕێگەگرتنو پێشگری کردنیان لە دەست بەسەرداگرتنی موڵکی کڵێسای کاسۆلیکی، هەروەها بۆ گێڕانەوەی ئەو زەویوزارانەی کە کڵێسای کاسۆلیکی لە دەستی چوبوو، بەسەرکردایەتی "ماکسیمیلیان"ی میری

"پاڤاریا" یەکتریانگرتو جۆرە یەکیەتیەکان بەدیهێنا، ئەمەش بۆ دروستکردنی کۆمەڵەی کاسۆلیکی لەساڵی 1609. بەم شێوەیە ئەڵمانیا دابەش بوو بۆ دوو سەربازگەی دژ بەیەکو دوو بەرەی جەنگ خواز، کە هۆشداری دەدایە ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز بە جەنگێکی ناوخۆیی وێرانکارو کاولکار.

بێ گومان کۆمەڵەی کاسۆلیکی پشتیوانی ئیمپراتۆری کاسۆلیکی دەکرد لە دژی یەکیەتی پرۆتسانتی، بەلاَم بەهیچ شێوەکیش میرە کاسۆلیکیەکان ئارەزویان نەدەکردو نەیاندەویست ئیمپراتۆر بەهێز بێت لەسەرحسابی خۆیان، بەڵکو دەیانویست سەربەخۆیی خۆیانو بەرژەوەندیەکانیان بپارێزن لەپێ درێژیەکانی ئیمپراتۆر. ئارەزوی میرە پرۆتستانتەکانیش لەمە کەمتر نەبوو. وە نەبێ ئیمپراتۆریش لەمە بێ ئاگا بێت، بەڵکو ئیمپراتۆریش ئەمەی باش دەزانی. دەیزانی لە دەرەنجامی جەنگدا دەسەلاَتی ئیمپراتۆر وردە وردە لەناو دەچێو کەم دەبێتەوە، وەلێ نەیدەتوانی پێشگری بکاتو ڕێگە لەڕوودانی بگرێ. بەم شێوەیە هۆکارە سیاسیو ئابووریو ئاینیەکان کۆمەکی یەکتریان کردو بەیەکەوە بوونە سوتەمەنی بۆ هەڵگیرسانو خۆشکردنی ئاگری جەنگی سی ساڵە.

### شۆڕشی بۆهیمیا:ـ

ئیمپراتۆر ماسیوز"1612-1619" هیچ کوڕێکی نەبوو جێگەی بگرێتەوە، بۆیە کوڕی مامی خۆی"فردیناند"ی کاندید کرد بۆ ئەوەی جێگەی بگرێتەوە. کاتێ فردیناند ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ کاسۆلیکیو دەسەلاَتی ڕەها، لە هەریەکە لەنەمساو هەنگاریاو بۆهیمیا بە تایبەتی نەیارانی زۆر بوونو دژایەتی هەڵبژاردنی ئەویان کرد. میرە کالڤنیەکانی چیك لە بۆهیمیا دەترسان لەوەی ئیمپراتۆری کاسۆلیك قەدەغەی پیادەکردنی دروشمی ئاینزاکەیان بکاتو بەربژاریەکانیان ڕەت کاتەوەو دەست بەسەر موڵکو سامانیان دابگرێ. هەربۆیە کۆمەڵێك لەوانە هێرشیان کردە سەر دائیرەیەکی

فەرمانبەرانی ئیمپراتۆر لە 23\مایسی\1618ئەوەی تیایدا بوو دەستگیریان کردو لەپەنجەرەی یەکێ لە ژورەکان فڕێیاندانە ناو ئەو کەناڵەی کە دەوری ئەو قەلآیەی دابوو کە دائیرەکەی تیادا بوو. شیاوی باسە ئەمانە لە بەرزی شەست پێ وە فڕێدرانە خوارەوە. شۆڕشگێڕان لادانی ئیمپراتۆریان ڕاگەیاندو فردریك یان لەسەر بۆهیمیا کردە پاشا. فردریك هەڵبژێردراوی پلاتینات بوو. فردریکیش تاجی پاشایی لە"پراگ" وەرگرتو ئامادەیشی نیشاندا بۆ پارێزگاری کردن لە نازناوی پاشایی.

لەهەمانکاتدا ئیمپراتۆر "ماسیوز" کۆچی دوایی کرد. دوای ئەویش فردیناند هەڵبژێردرا بە ئیمپراتۆر بەناوی "فردیناندی دووەم" 1619-1637. ئیمپراتۆری نوێ ڕێوشوێنی خێرای گرتەبەر بۆ دەرپەڕاندنی "فردریك" لە بۆهیمیا، هەر بۆ ئەم مەبەستەش لەگەڵ پاشای ئیسپانی "فیلپی سێیەم" ڕێککەوت لەسەر ئەوەی کە "فیلپ" سوپا بنێرێ بۆ دەستگرتنی بەسەر پلانتینات. هەروەها سوپای نەمساو کۆمەڵەی کاسۆلیکی بە سەرکردایەتی سەرکردەی ئیمپراتۆری "تیلی"بەرەو بۆهیمیا بەڕێ بکەوێت. "فردریك" پێشبینی دەکرد لەلایەن زاواکەی "جیمسی یەکەم"ی پاشای ئینگلتراوە هاوکاری بکرێت، هەروەك پێشبینی هاوکاریشی دەکرد لەلایەن میرە لۆسەریەکانی باکوری ئەڵمانیا. بەلآم لە هەردوو بارەکەدا پێشبینەکەی ڕاست دەرنەچوو. چونکە جیمسی یەکەم سەرقاڵ بوو بە ململانێی لەگەڵ پەرلەمانی ئینگلیزیو حەزی لە دژایەتی کردنی ئیسپانیا نەدەکرد، هەر بۆیە بەچەند ئامۆژگاریەکی پوچەڵ وازی لێهێنان. ئەمە لە کاتێکدا گەلی ئینگلیزی سور بوو لەسەر هاوکاری کردنی فردریك و پشتگیری کردن لەپرسی پرۆتستانتیزم. میرە لۆسەریەکانیش بە گوتەو ئامۆژگاریەکانی "جۆن جۆرج" ی میری سەکسۆنیایان کرد، بەوەی کەبێ لایەن بن لەم نێوانە، بەو هیوایەی بەربژاری زیاتر وەچنگ بخەن لەئیمپراتۆر.

"تیلـی" سـەرکردەی ئیمپراتـۆری لەجـەنگی "گـردی سـپی" لـە بۆهیمیـا لەساڵی1520سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەسەر هێزەکانی پرۆتستانتی. "فردریك"ی ناسـراو بـە"پاشـای زسـتان"، تێکشکاو وڵاتەکـەی خرایـەوە جـوغزی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی پـیرۆز لـەژێر سـایەی ئیمپراتـۆر فردینانـدی دووەم. بەشـێکی زۆریـش لـە خانـەدانانی چـیك ژیـانو زەویـەکانیان لەدەسـتدا، لێـرەوە پیـادەکردنی دروشمـە پرۆتستانتیەکان لە بۆهیمیا قەدەغە کرا. سوپای ئیسپانیش تـوانی دەست بەسـەر ویلایـەتی پلاتینیـات دا بگـرێو بیخاتـە سـەر هـەرێمی پاڤاریـا کـە لـە ژێردەسـتی "ماکسیمیلیان" دابوو. "فردریك"یش سەرجەم موڵکەکانی ئەوێی لەدەست چوو. بـەم شێوەیە گەڕی یەکەمی جەنگ لە بەرژەوەندی ئیمپراتۆری کاسۆلیکی کۆتـایی پێهـاتو دانیشتوانی پلاتینیات لەسەر ڕوباری ڕاین ناچار کران کاسۆلیکی پەسەند بکـەن، پـاش ئەوەی ببوون بە کالڤنی. هـەروەك ئیسپانیاش وای لێهـات ڕۆڵـی سـەرەکی بگێـڕێ لـە ئەوروپا لە نێوان ساڵانی 1621-1625[1].

نوێ بوونەوەی جەنگ لەنێوان ئیسپانیاو هۆڵندا:-

فیلپی سێیەم کۆچـی دوایـی کـردو کوڕەکـەی فیلپـی چـوارەم چـووە سـەر تـەختی ئیـسپانیو جێگـەی بـاوکی گرتـەوە. پـێش ئـەوەی مەسـتیو دڵخۆشـی سـەرکەوتنی ئیسپانیا بەسەر پلاتینیات کۆتایی بێـت، فیلپـی چـوارەم بڕایریـدا جـارێکی تـر هۆڵنـدا داگیربکاتـەوە. بـۆ ئەمـەش دەیویـست سـود ببینـی لـە هـەبوونی سـوپای ئیـسپانیا لـەپلاتنیات، هـەروەها ئـاگر بەسـتیش کـە ڕاگەیـەنرا بـوو ماوەکـەی دوازدە سـاڵ بـوو لەساڵی 1621 کۆتایی پێدەهات. واتا سودی لەکۆتایی هاتنی ئـاگر بەسـتو هـەبوونی سوپای ئیسپانی لەپلانتیات دەبینی.

1 Ibid; pp. 282-288.

هۆڵندا هاوکاری لە هەریەکە لەئینگلتراو فەرەنساوە وەچنگ کەوت، هەروەها شالاوێکیان لە دژی بەرازیل دەست پێکرد، بەلام شالاوەکە شکستی هێنا. لەملاشەوە ئینگلیزەکان لەسالی1625 شالاوێکیا بەرەو بەندەری قادسی ئیسپانی وەڕێخست، وەلێ ئەم شالاوەش بەرپەرچ درایەوە وشکستی هێنا. لە هەمان سالدا ئیسپانیا توانی دەستبەسەر شاری "بریدا"ی-هۆڵندا دا بگرێ. ئەمەش دوای گەمارۆ دانێکی دووردرێژ لەهەمبەر ئەم شارە. ئەم سەرکەوتنە ئیسپانیەکانی دلخۆش کرد، ئەوەبوو هونەرمەندی ئیسپانی "فیلاسکویز" بەلەوحەیەکی هونەریجوان نەمری بەم سەرکەوتنە بەخشی.

سەرکەوتنی ئیمپرتۆری کاسۆلیکیو ئیسپانیا، کاری کردە سەر میرە پرۆتستانتەکانی ئەلمانیاو ڕایچلەکاندنو ترسی خستە دلیانەوە. لەگەل ئەوەی میر لۆسەریەکان نیگەران بوون لە هەلەشەیی فردریکی لاو لە بۆهیمیا، کە هەلدەستا بەکاری دزیو ڕاوو ڕووتو سوتاندنی دێهاتەکان شان بەشانی پاشماوەی سەربازەکانی، بەلام هەرچۆنێك بێت بەلای دا وەرچەرخان، بەهۆی ترسانیان لە فراوانخوازیەکانی پاقاریای کاسۆلیکیو بە هێزبوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیو ئیسپانیا، لە دوای ئەو سەرکەوتنانەی کە بەدەستیان هێنا لە هەریەکە لە هۆڵنداو پلانتیناتو بۆهیمیا. هەرچەندە میرە لۆسەریەکان کاتی خۆی چاوەڕوانی وەرگرتنی بەربژاری بوون لە ئیمپرتۆر، بەلام بەپێچەوانەوە بەهۆی بەردەوام بوونی فردریك لە کارە چەوتەکانی، ئیمپراتۆر بەخشینی هەرجۆرە بەربژاریەکی بەمیرە لۆسەریەکان ڕەت کردەوە.

## خزینی دانیمارك بۆ ناو جەنگی سی سالە :1625-1629.

لەکاتێکدا میرە پرۆتستانتیەکان واق وڕماو مابوون لە هەمبەر دەربڕینی هەلوێستیان لە نێوان گوێڕیەلی کردن بۆ ئیمپراتۆریان سازکردنی شۆڕش لە دژیدا. "کریستنی چوارەم" خۆی خزاندە نێوجەنگ، ئیدی ئەلمانیاش وەك گەڕی دووەم چوویە نێوجەنگ کە ناسرا بەگەڕی دانیمارکی. کریستنی چوارەم لە سالی"1588-

1648" پیاوێکی بە جۆش وخرۆش‌و بەرزەفڕبوو. کاتێك میر بوو بەسەر هۆڵشتاین وەك ئەندامێك بەشداری دەکرد لە "دایت"ی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆزو تێیدا دژایەتی بنەماڵەی "هبسبرگ"ی دەکرد. کاتێکیش بووبە پاشا بەسەر دانیمارك‌و نەرویج، ویستی قەڵمڕەوی خۆی فراوان بکات‌و باڵادەست بێت بەسەر کەنارەکانی دەریای باکور. وە وەك کەسێکی باوەڕدار بەلۆسەریزم ویستی هاوکاری لۆسەریەکانی ئەڵمانیا بکات‌و ئەو زەویانە بگێڕێتەوە کە پرۆتستانتیەکان لەدەستیان چووبوو.

لەساڵی 1625 بەمەبەستی هاوکاری کردنی سوپای پرۆتستانتی لۆسەری کالڤنی، سوپای دانیمارکی هێرشی کردە سەر ئەڵمانیا. لەملاشەوە ئینگلترا هاوکاری ماددی خۆی پێشکەشی پرۆتستانتیەکان کرد لە جەنگەکانیاندا لە دژی ئیمپڕاتۆری کاسۆلیکی.

خۆ ئەگەر هاتباو "ولشتاین"ی سەرکەش‌و ئازا سەری هەڵنەدابا کە دەیویست پارێزگاری بکات لەئیمپڕاتۆرو کاسۆلیکیزم، ئەوا سەرکردەی ئیمپڕاتۆری "تیلی" نەیدەتوانی ڕووبەڕووی سوپای پرۆتستانتی ڕابوەستێ. "ولشتاین" دوای ئەوەی دەستیگرت بەسەر موڵکی خانەدانەکان لە بۆهیمیا، سامانێکی زۆری وەچنگ کەوت. ئینجا داوای لە ئیمپراتور کرد کە ڕێگەبدات بە دامەزراندنی سوپایەکی سەربەخۆ کە بەهۆیەوە بتوانێ هێمنی‌و ئاسایش بگێڕێتەوە بۆ ئیمپراتوریەت‌و دانیمارکیەکانیش دەربەڕێنێ. "ولشتاین" بەهۆی سوپای گەورەو زۆرو زەوەند کە ژمارەیان پەنجا هەزار سەرباز دەبوو، توانی ترس‌و دڵەڕاوکێ بخاتە گشت ناوچەکانی ئەڵمانیا. شیاوی باسە ئەم سوپایە پێکهاتبوو لەو بەکرێگیراوانەی کەلەسەر ڕاوو ڕووت دەژیان‌و بەبێ ڕەچاوکردنی گەل‌و هۆزو جیاوازی ئایینزا"پرۆتستانت،کاسۆلیك" کۆمەڵ ببوون لەسەر گوێڕیەڵی تەواو بۆ سەرکردە.

لەو تێکهەڵچونەی کەلە"لۆتەر"ی باکوری ئەڵمانیا ڕوویدا لە ساڵی 1626، سوپای دانیمارکی لە بەرامبەر سوپای هاوبەشی هەردوو سەرکردە "تیلی‌و، ولشتاین"

تێکشکاو ویلایەتە ئەڵمانیە لۆسەرییەکانیش کەوتنەژێر ڕکێفی دلۆڤان"ڕەحمەت"ی کۆمەڵەی کاسۆلیکی. میری براندنبرگ پشتیوانی ئیمپراتۆری کرد لە دژی هاتنە ناوەوەی سوپای دانیمارك بۆناو ئەڵمانیا. لە ڕاستیدا لە دەستچوونی هێزی دەریایی هۆکارێك بوو بۆ نەهێشتنی داگیرکاری دانیمارکی لە بەرامبەر سوپای ئیمپراتوریدا. ترسان لە هاتنە ناوەوەی سوپای سوید بۆ ناو جەنگو بێ هیوابوونی خودی پاشای دانیمارك لە سەرکەوتن، بوو بەهۆی ئەوەی ئاشتەوایی"لوپیك" ببەسترێ لەنێوان ئیمپراتورو دانیمارك لەساڵی1629. کە بەگوێرەی ئەم ئاشتەواییە پاشای دانیمارکی توانی هەرێمی "شلزویك وهۆڵشتاینو جیتلەند" لەدەستی خۆی بهێڵێتەوە، بەلاّم لەئەڵمانیا دەرپەڕێنرا[1].

**فەرمان( مەرسوم )ی گێڕانەوە 1629 :-**

کۆمەڵەی کاسۆلیکی فشاری خستەسەر ئیمپراتۆرو ناچاری کرد فەرمانێك دەربکات بەمەبەستی گێڕانەوەی ئەو زەوییانەی کەپرۆتستانتیەکان دەستیان بەسەرداگرتبوو. ئەم دەست بەسەرداگرتنەش پێچەوانەی بەندەکانی پەیمانی ئۆکسبرگی ساڵی 1555بوو. ئەم کۆمەڵەیەی کە ئیمپراتور ڕێکیخست هەموویان کاسۆلیکی بوونو هەستان بەجێبەجێ کردنی ئەو فەرمانە. وە لە ماوەی سێ ساڵدا توانیان پێنج ئوسقوف وسێ شار لە شارەکانی کۆمەڵەی هنسی پێشوو لەگەڵ سەد دێرو ژمارەیەکی زۆر ئەبریشیات بگێڕنەوە.

پیشتر تورەیی ئیمپراتورو هەرجۆرە هێرشێکی لۆسەرییەکانی نەدەگرتەوە، بەلاّم فەرمانی گێڕانەوە لۆسەریەکانی ترساندو لە تۆڵەی کۆمەڵەی کاسۆلیکی زراوی بردن، هەربۆیە پەنایان بردە بەر سوید کە بەهێزترین دەوڵەتی پرۆتستانتی ئەوروپابوو. بەلاّم

---

1 Ibid; pp. 289-291

ئیمپراتور نەیدەتوانی خۆی ئامادەکات بۆ بەرەنگاریو ڕووبەڕوبونەوەی شالاّویکی بیانی تازە بەهۆی لاوازبوونی سوپاکەی . شیاوی باسە دوای لادانی "ولّشتایین" لە سەرداریەتی سوپا لەسالّی1630، سوپاکەی لاوازبوو. ئیمپڕاتۆر لەسەر داوای کۆمەڵەی کاسۆلیکی "ولّشتاین"ی-لادا لەسەرداریەتی سوپا، کاتێك ناڕەزاییان دەربڕی لە کاری تێکدەرانەی سەربازەکانی ئەم سوپایە.

## سوید دەچێتە ناو جەنگی سی ساڵە 1630-1635:-

گەڕی سێیەمی جەنگی سی ساڵە بەچوونە ناوەوەی سوید بۆناو ئەم جەنگە دەستی پێکرد، لە سالّی 1630. "گوستاف ئەدولّف" 1611-1632 نەوەی گوستاف ڤازا، لەسەر لەسوید دەسەلاّتدار بوو لۆسەریزمی کردە کلّێسای ڕەسمی ولاّتەکەی. گوستاف ئەدۆلّف پیاوێکی سەرنجڕاکێش بووخاوەنناوبانگو ڕۆشنبیرییەکی بەرز بوو، ئەو جگە لەوەی حەوت زمانی دەزانی ئارەزوی لەشیعرو مۆسیقاش دەکرد. لەپالّ ئەوانەشدا کەسێکی بەرزخوازو چالاكو دلێر بوو. "ئەدۆلّف" لەخەونی پێکهێنانی دەولّەتێکی سویدی گەورەدا بوو، بەشێوەیەك بتوانێت زالّ بێت بەسەر باکوری ئەوروپا. جا وەنەبێ هەر لە خەونی ئەوەدا بوبیّو تەواو، بەلّکو کاریشی دەکرد بۆ وەدیهێنانی ئەم خەونە. ئەدۆلّف توانی دەریای بەلّتیق بکاتە دەریایەکی سویدی، ئەمەش بەهۆی دەستگرتنی بەسەر فنلنداو ئیستوانیا. هەروەها لەوململانێیەشی کەلەنێوان سویدو پۆلّندا دروست بوو لە سالّی1621-1629،سوید "لیۆڤینیا"و ڕێژگەی ڕووباری "ڤیستۆلای" کەوتە ژێرچنگ. هەروەك بەپەیمانبەستنی لەگەلّ ڕوسیا، ڕوسیا وازی لە هەنگیریا هێنا بۆ سوید. شیاوی باسە بەهۆی زالّ بوونی بەسەر لیۆڤینیاو ڕێژگەی ڕووباری ڤیستۆلا، سوید کەنارەکانی خۆرهەلاّتو باکوری دەریای بەلّتیقی چنگ کەوت. لەدوای ئەمانەوە چاوتێبڕینەکانی ڕووەو کەنارەکانی باکور لەئەلّمانیا وەرچەرخا، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە ئیمپراتۆر فەرمانی گێڕانەوەو دەستگرتنەوەی بەسەر

موڵکەکانی کڵێسای پرۆتستانتی لە ئەڵمانیا دەرکرد. واتا: "ئیمپراتۆر فرمانی دەستگرتنیدا بەسەر موڵکەکانی کڵێسای پرۆتستانتی لە ئەڵمانیا". لەهەمانکاتیشدا کاردینال ڕیشیلۆی وەزیری لۆیسی سێزدەی پاشای فەرەنسا، دەیویست جەنگی سی ساڵە بەردەوام بێت، بۆ ئەوەی بنەماڵەی هبسبرگ لاواز بێتو بنەماڵەی بۆربۆنی فەرەنسی جێگەی بگرێتەوە. هەروەها لەسەر حیسابی ئەڵمانیا هەندێ سودو قازانجی دەستکەوێ. جا بۆجێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە ڕشیلیۆ هاوپەیمانیەتێکی لەگەڵ "گوستاف ئەدۆڵف" بەست، لەسەر ئەوەی هاوکاری پاشای سوید بکات بە ماڵوچەك، لە بەرامبەردا "ئەدۆلف" ئازادی ئایینی بدا بە کاسۆلیکی ئەو ناوچانەی داگیری دەکات.

لە ساڵی1630"گوستاف ئەدۆڵف" لە پۆمیرانیا"باکوری ئەڵمانیا" دابەزی و دەستیکرد بە بەستنی هاوپەیمانیەتی لەگەڵ میرە پرۆتستانتەکان بەتایبەت لەگەڵ میری براندبرگو سەکسۆنیا. بەلاّم کاتێك کە "ئەدۆڵف" خەریکی ووتووێژکردن بوو لەگەڵ میری براندنبرگ لە پۆتستدام،"تیلی"سەرکردەی ئیمپراتوری لەساڵی1631 دەستیگرت بەسەر شاری "مگدبرگ"ی قایمو سەنگەربەند. ئەمەش لە دوای گەمارۆدانێکی درێژ. دوابەدوای ئەم دەستبەسەرداگرتنەش دەستی کرد بەسازکردنی کوشتو کوشتارێك کە نزیکەی بیست هەزار کەس لە دانیشتوانی ئەم شارە کوژرا بەبێ جیاوازی کردن. هەروەها دەستیانکرد بەڕاو ڕووت وێرانکاری بۆ لە ناوبردنی دانیشتوانی ئەم شارە. بەهۆی ئەوەی ئەم شارە لۆسەری بوونو بەهۆی ئەمەوە میرە ئەڵمانیەکان تورەو دەهری بوون. لە هەمانکاتیشدا گوستاف ئەدۆڵف لەگەڵ میری براندنبرگو سەکسۆنیاو میرە پرۆتستانتیەکانی تر سوپای "تیلی"یان- لە ناوچەی "برایتنفلد" لە نزیك شاری "لاییزیك" لە ئەیلولی 1631 تێکشکاندو کەنەفتیان کردن. پاش ئەوە ڕووەو باشوری خۆرئاوای ئەڵمانیا بەئاراستەی ڕووباری ڕاین ڕۆیشتن، بەمەبەستی هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ کالڤینیەکانی ئەوێ.

ئوسقوفیەی "مینز،کولون،تریر" دەکەوتنە ژێر دەسەلاتی پاشای سوید، ئەگەر هاتبایە کردینالّ ڕیشیلۆ نارەزایی خۆی دەرنەبڕیباو داوای لە پاشای سوید نەکردبا ئەم سێ ناوچەیە جێبێلێ. بەهۆی ئەمەوە گوستاف ڕووی کردە خۆرهەلاتو شالاوی بردە سەر پاڤاریاو داگیری کردو سوپای تیلی جارێکی تر لە جەنگی"لیك" لە نیسانی 1632 تێکشکاندو توانی تیلی هەر لەم جەنگەدا بکوژێ. پاش ئەوە پاشای سوید ڕوویکردە نەمسا. لەم کاتەدا ئیمپراتور سەرکردەی لابراو "ولّشتاین"ی گێڕایەوە سەر پۆستەکەی بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی گوستاف ئەدۆلف، هەروەها لەگەلّ فیلیپی چوارەم ڕێککەوتننامەیەکی بەست، بۆ ئەوەی لەگەلّ خۆی بەژداری جەنگبکات[1].

لە پاییزی سالّی 1632 سوپای سوید گەیشتە سوپای "ولّشتاین"و لە جەنگێکی یەکلاکەرەوەدا، کە لە "لوتنزن" ڕویدا سوپای "ولّشتاین" تێکشکا، بەلاّم گوستاف هەر لەو جەنگەدا کوژراو سەرکەوتنی نەبینی. لەگەلّ ئەوەی سوپای سویدی لە سەرکەوتنەکانی بەردەوام بوو، بەلاّم کەسێ نەبوو شوێنی سەرکردەی کوژراوییان بۆ بگرێتەوە. ئیمپراتور هەوالّی پێ گەیشت کە "ولّشتاین" هەولّدەدات لەگەلّ پرۆتستانتیەکان پەیمانی ئاشتەوایی ببەستێ، وەلێ لەلایەن یەکێ لەو کەسانەی کە پەیوەندی بە ئیمپراتورەوە هەبوو لە سەربازگەی خۆی لە سالّی 1634 پەنهانکوژ کرا. جا بە نەمانی هەردوو سەرکردە "گوستاڤو ولّشتاین" لەسەر شانۆی ئەم جەنگە خوێناویە، هەردوو لایەن "کاسۆلیك، پرۆتستانت" گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە بەردەوام بوون لە جەنگێکدا کە هەردوو لای شەپرێو کردوەو ئابووری ئیمپراتۆریەتی هەرەس پێهێناوە، هیچ سودو کەلّکی نییە. هەروەها ئارەزووی ئەوان بۆ دەرکردنی بیانی لە ئەلّمانیا، ئاشتەوایی پراگی سالّی 1635ی لێکەوتەوە، کە لە نێوان ئیمپراتۆرو ئەو میرانە بەسترا کە ئارەزویان لەوەستانی جەنگ دەکرد.

---

1 Ibid; pp 292-297.

بەگوێرەی ئاشتەوایی پراگ بڕیاردرا میرە ئەڵمانەکان چەك دابنێنو سوپای ئەڵمانیا بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆر، جگە لە میری سەکسۆنیا کە هەندێ جیاوازی بۆخۆی دەستەبەر کرد. هەروەها بڕیاردرا کوتلەگەری کاسۆلیکیو پرۆتستانتی نەهێڵدرێو ئەو زەویو موڵکانەشی کە هەردوولا لە کاتی جەنگدا دەستیان بەسەردا گرتووە، بگێڕدرێنەوە بۆ خاوەنە ڕەسەنەکان. سەبارەت بە زەویەکانی کڵێساش بڕیاردرا ئەم زەویانە بگێڕدرێنەوە دەستی خاوەنە ڕەسەنەکانی بۆ ماوەی چل ساڵ، تا ئەم دوو لایەنە دەگەنە کۆتا چارەسەر. بەم شێوەیە ڕۆڵی سوید لە جەنگی سی ساڵە کۆتایی پێهات.

## خۆ خزاندنی فەرەنسا بۆ ناو جەنگی سی ساڵە 1635-1648:-

کاردینال ریشیلۆ باوەڕی وابوو مەزن بوونی فەرەنسا بەندە بە زاڵ بوونی بەسەر بنەماڵەی هبسبرگی نەمساویو ئیسپانی. هەر بۆیە سوربوو لەسەر تەمبێ کردنی ئیمپراتۆرو وێرانکردنی تەواوی ئەڵمانیا. جا سەرەڕای ئەو هاوکاریانەی کە پێشکەشی میرە پرۆتستانتیەکانی ئەڵمانیاو پاشای سویدی دەکرد، جەنگیشی لە دژی بنەماڵەی هبسبرگو ئیسپانیا ڕاگەیاند. مەبەستی ریشیلۆ سەرکزکردنی ئیمپراتورو دەستگرتنی بوو بەسەر هەرێمی ئالازاس. مەبەستی سەرەکیشی خۆڕزگارکردن بوو لە فیلیپی چوارەمی پاشای ئیسپانیا. ریشیلیۆ بۆ بەردەوامی دان بەجەنگی دژ بە ئیمپراتور، پشتی دەبەست بە سویدو میرە پرۆتستانتیەکانی ئەڵمانیا، ئەمە لە کاتێکدا خۆیشی ئامادە دەکرد بۆ ڕووبەڕونەوەی ئیسپانیا. ئیسپانیایەك کەچوار دەوری موڵکی فەرەنسای دابوو.

فیلیپی چوارەم تاوەکو ساڵی 1635 هاوکاری کوڕە مامەکانی دەکردو درێژەی بەجەنگەکانی دەدا لە هۆڵنداو ئەڵمانیا. بەڵام لە پاش ئەم مێژووە ڕووبەڕوی هێرشێکی توندو سەختی فەرەنسیەکان بوویەوە لە هەر یەکە لە هۆڵنداو بەلجیکاو زەوییەکانی

فەرەنساو باکوری ئیتالیاو تەنانەت لەناو خودی ئیسپانیاش. بەمەش فیلپ ناچار بوو واز لە هێرش بهێنێتو بچێتە قۆناغی بەرگریکردن لە زەوییەکانی. لە سەرەتادا سەرکەوتن بەلای هاوپەیمانی ئیسپانی دابوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەی سوپاکانیان مەشق دراو بوونو باشترینی سەرکردەکانیش سەرپەرشتی ئەم سوپایانەی دەکرد، وەك "پیکلۆمینی" ئیتالی، کە لەگەڵ ولشتاین جەنگی دەکردو لە پەنهانکوژ کردنیشی بەشداری کرد. ئەمە لە کاتێکدا سوپای فەرەنسی ژمارەیان لە دووسەد هەزار سەرباز زیاتر بوو، بەڵام لە ڕووی مەشقو سەرکردەی کاراوە کەمو کورتیان هەبوو. سوپای ئیسپانی لە ساڵی 1636 ز چوویە باکوری فەرەنساو خەریك بوو دەست بەسەر پاریس دا بگرێ. وە لەساڵی 1637سوپای ئیسپانی کۆتایی شاخی "برانس"ی بڕیو دەستی گرت بەسەر باشوری فەرەنسادا. بەڵام بەرەبەرە لەگەڵ شارەزابوونی فەرەنسیەکان لەجەنگو پەیدابوونی سەرکردەی سەربازی بەهێزو لێهاتوو لەناویاندا، سوپای ئیسپانی ڕووەو تێکشکان چوو، تا ئەوەبوو لەهۆڵنداو ڕاینو باکوری ئیتالیا سوپای ئیسپانیا بە تەواوی تێکشکا.

ئیدی خاڵی وەرچەرخان لەۆململانێی نێوان ئیسپانیو فەرەنسی دەستی پێکرد. خانەدانانی پرتوگال کە لە لیشبۆنەوە کۆببوونەوە لابردنی فیلپی چوارەمو دانانی "جۆنی چوارەم"یان–وەك پاشایەك بەسەر پرتوگال ڕاگەیاند. شیاوی باسە "جۆنی چوارەم" لە بنەماڵەی "براگنز"ی پرتوگال بوو. لەملاشەوە هۆڵندییەکان دەستیان کرد بەهاوکاری کردنی سوپای فەرەنسی لە جەنگەکانیان لە دژی ئیسپانیا. هەروەها لە"ئەڕاگون وناپولی" شۆرش لە دژی فیلپی چوارەم سەریهەڵدا، بەڵام فیلپ بەخێرایی داپلۆسی.

لەگەڵ ئەوەی فیلپ دەیتوانی پارێزگاری بکات لەمیلانو بەلجیکا، بەڵام ئەمە لەسەر حیسابی سەروەتو سامانی تەواو ئەبوو، ئەو سامانەی کە خەریك بوو کۆتایی پێ دەهات. ئەم بارە هەر بەردەوام بوو تا لە جەنگی "ڕوکری" لە ساڵی1643،

فەرەنسیەکان بە سەرکەوتنێکی پلیشێنەر سەرکەوتنیان بەسەر سوپای ئیسپانیا بەدەستهێناو بەهۆیەوە سەرەتای هەرەسهێنان و نشوستی ئیسپانیا دەستی پێکرد.

بەلاّم لە ئەلّمانیا ئیمپراتور توانی ڕووبەڕووی پرۆتستانتیەکان ببێتەوە. بەلاّم لەپاش تێکشکانی ئیسپانیەکان، فەرەنسیەکان توانیان سوپا بۆهاوکاری پرۆتستانتیەکان بنێرن. "فردیناندی سێیەم" کە لەپاش مردنی باوکی "فردیناندی دووەم" لە سالّی1637 بوو بە ئیمپراتور، هەولّیدا ئاشتەوایی لەگەلّ فەرەنسادا ببەستیّ. بەلاّم هەتا مردنی "ڕیشیلۆ" لە سالّی 1646هەولّەکانی شکستی خوارد. شیاوی باسە "فردیناند" لە سالّی"1641"ەوە- لەهەولّی ئاشتەوایی دابوو. سوپاکانی فەرەنسی سەرکەتنی تریان بەدەست هێنا و"پاڤاریا" یان-لە سالّی 1646 داگیرکرد. تا لە کۆتایی دا ژمارەیەك پەیمانبەست بەسترا لە شارەکانی "مونستەرو ئۆزنابرك" لە هەرێمی "ویستڤالیا" لە سالّی 1648، کەبەپێی ئەم پەیمانە جەنگی سی سالّە لە ئیمپراتوریەتی ڕۆمانی پیرۆز کۆتایی پێهات[1].

## پەیمانبەستی ویستڤالیا 1648:-

بەگوێرەی پەیمانبەستی ویستڤالیا بنەمالّەی هبسبرگی نەمساوی فەرمانڕەوایی ناوچە ویراسیەکانی دەکرد، لە هەریەکە لە "نەمسا، بۆهیمیا، هەنگاریا"، وەلیّ دەسەلاّتی سیاسیان لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز دای لە کزی، هەروەك گۆڕانکاری گەورەو گرنگ لە خودی ئەلّمانیا دروستبوو. کە بریتیتن لە :

1. هەموو میرێك فەرمانڕەوایی ڕەهایە لە ویلاتەکەیدا، دەتوانی جەنگ ڕاگەیەنیّو پەیمان ببەستیّ، بەبیّ ئەوەی ڕێگری بکریّ لەلایەن ئیمپراتۆر.
2. فەرەنسا هەرێمی ئەلازاسی چەنگ کەوت جگە لەشاری "سترازبورگی ئازاد" کە هەلاّوێر بوو لەمەدا. هەروەك دان هێنرا بە خاوەنداریەتی فەرەنسا لە هەمبەر هەرسیّ ئوسقوفەی ئەلّمانی "مینز، تول، ڤیردون".

---

1 Ibid; pp. 297- 302

3. سوید پۆمیرانیای کەوتە دەست، کە کەوتبووە سەر ڕێژگەی ڕوباری ئودر، هەروەها باڵادەستبوو بەسەر ڕێژگەی ڕوباری "ئیلپو لیر". هەروەك توانی ئوسقوفەی بریمنی دەستکەوێت لەگەڵ زەویەکانی دەوروبەری.

4. فەرەنساو سوید مافی دەستوەردانیان هەبوو لەکارو باری ئەڵمانیا، بەهۆی ئەوەی خاکیان هەبوو لە ئەڵمانیا. تەنانەت مافی ئەوەیان پێدرا دەنگ بدەن لە دایتی ئەڵمانی.

5. میرنشینی برادنبرگ پومرانیای خۆرهەلاتو ژمارەیەك ئەوسقوفیەی وەچنگ کەوت، لە ناویاندا ئوسقوفیەی مگدبرگ، بەمە تۆوی دەوڵەتی پروسیا چەکەرەی کرد.

6. ویلایەتی پلانتینات لەسەر ڕاین، دابەشکرا لە نێوان ماکسیملیانی پاڤاری سەرۆکی کۆمەڵەی کاسۆلیکی لە جەنگ، وە کوڕی فردریکی میری پلانتیناتو سەرکردەی پرۆتستانتی لەگەڕی بۆهیمی یەکەم لە جەنگی سی ساڵە. بەمەش پاڤاریاو پلانتینات مافی بەشداری کردنیان هەبوو لە هەڵبژاردنی ئیمپراتۆرو دەنگ دان لە دایت.

7. هەریەکە لە هۆڵنداو سویسرا بوون بە دەوڵەتی سەربەخوو لەلایەن وڵاتانەوە لەپەیمان بەستی ویستڤالیا بە فەرەمی دانیان پیاداهێنرا.

هەموو ئەم خاڵانە لەڕوی سیاسیەوە بوون، وە لە ڕوی تریشەوە دەتوانین بڵێین:

1. دان هێنرا بە کڵێسای کالڤنیو هەمان ئەو مافانەی پێ بەخشرا کە بە لۆسەریزم بەخشرا بوو.

2. خاوەنداریەتی زەوی کڵێسای کاسۆلیکیو پرۆتستانتی بە گوێرەی بنەمای ساڵی 1624 دانەرا.

3. هەریەکە لەپرۆتستانتیو کاسۆلیك لەدادگای ئیمپراتۆری دا وەك یەك دادوەریان دەکرا.

## ئاکامەکانی جەنگی سی ساڵە:-

جەنگی سی ساڵە کۆتا جەنگی ئاینی بوو لە ئەوروپا. هەرچەندە ئەم جەنگە کە هەڵگیرسا وەك ململانێیەکی ئاینی لە نێوان کاسۆلیكو پرۆتستانتی دەستی پێکرد، بەڵام لەپاڵ ئەوەشدا هۆی سیاسیو ئابووری ڕۆڵیان تیا گێڕاوە. دەتوانین ئەمە لە جەنگەکەدا تێبینی بکەین، کاتێك میری "براند نبرگ" پرۆتستانتی مەزهەب هاوکاری ئیمپراتۆری کاسۆلیکی دەکرد. لەملاشەوە فەرەنسای کاسۆلیك هاوکاری میرە پرۆتستانتیەکانی ئەڵمانیای دەکرد. ئەم جەنگە ڕێگەی خۆشکرد بۆ ئازادی ئاینیو لێبوردەیی بیروباوەڕ لە بەرامبەر یەکتریدا.

## سەرهەڵدانی نوێنەرایەتی دیبلۆماسی لە پەیوەندی نێودەوڵەتی:-

لەدوای جەنگی سی ساڵە نوێنەرایەتی دیبلۆماسیو ئاڵوگۆڕکردنی باڵوێز لە نێوان وڵاتانی ئەوروپادا بوو بە کارێکی بەربڵاو. لەڕاستیدا پێشترو لەسەدەی پازدە دیبلۆماسیەت لە نێوان شارەکانی ئیتالیادا سەری هەڵدا، پاش ئەمەو لە سەدەی دواتر لە هەریەکە لە ئیسپانیاو فەرەنساو ئینگلترادا بڵاو بویەوە. بەڵام ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز لە جوغزی ئەم بوارەدا نەبوو، بەهۆی ئەوەی دەسەڵاتو نفوزێکی زۆری هەبوو لەناو ئەو وڵاتانە. بەڵام جەنگی سی ساڵە ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆزی هێنایە ئاستی وڵاتانی تری ئەوروپا.

دەوڵەتانی ئەوروپا لەگەڵ یەکتری دا لەسەر بنەمای هاوئاستی لە سەربەخۆیو خاوەن هێزو شکۆمەندیەت مامەڵەیان لەگەڵ یەکتری دەکرد. دیبلۆماسیەتو ئاڵوگۆڕی نێردە لە نێوان وڵاتان کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر چەسپاندنی پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان، بەتایبەت لە کاتی ئاشتیدا. ڕێککەوتنە بازرگانیەکانو هاوپەیمانیەتی، بوون بە بنەمایەك بۆ ئەم پەیوەندیانە، دوای ئەوەی ژنو ژنخوازی بنەمای پەیوەستکردن بوو لە نێوان وڵاتان. کایەی دیبلۆماسی بوو بەپیشەیەك یاخود

شارەزاییەك، كە لەناو چینی ئەرستۆكراتی كورتهەلات. ئەم چینە ڕاهاتبوون لەسەر خوونەریتی كۆمەڵگە خۆشنودەكانو دەیانزانی ڕۆڵی دیبلۆماسی ببینن، بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی وڵاتی خۆیان بكەنو ناوندو پێگەیەكی شیاو بۆ وڵاتەكەیان لەنێو وڵاتان دەستەبەربكەن. ویستڤال یەكەمین كۆنگرەیەكی نێودەوڵەتی بوو كە وڵاتان نوێنەری خۆیان بۆی نارد بە مەبەستی گێڕانەوەی هێمنیو ئاشتی بۆ ئەورووپا، پاش ئەوەی جەنگو تێكهەڵچونەكان بۆ ماوەی سی ساڵ ئەورووپای هەپرون كردبوو[1].

## سەرهەڵدانی یاسای نێو دەوڵەتی:-

یەكێكی تر لە دەرەنجامەكانی جەنگی سی ساڵە سەرهەڵدانی یاسا نێو دەوڵەتی بوو. لەم جەنگەدا ژمارەیەكی زۆری خەڵكی زەرەرمەند بوون بە كاری دزیو ڕاووڕوتو سوتاندنی دێهاتو لادێكانو ڕژانی خوێنی بێتاوانان . ئیدی خەڵكی وایاندەبینی كە دانانی هەندێ بنەماو بنچینە كارێكی پەسەندو چاكە. ئەمەش بۆ پاراستنی وڵاتانی بێ لایەنو چارەسەركردنی نەخۆشو بریندارو قەدەغەكردنی ڕشتنی خوێنی بێتاوانان و كاری وێرانكاری. بەناوبانگترین نوسراویش كە لەم بارەیەوە نوسرابێت كتێبی "هۆگۆ گرۆشێس"ە.

گرۆشیس خەڵكی هۆڵندابوو، یەكێ بوو لە بەناوبانگترینی پیاوانی زانستو مەعریفە. بەهۆی چالاكی سیاسیەوە لە دژی فەرمانڕەوایانی هۆڵندا بە درێژایی ژیانی زیندانی بوو. گروشیس بانگەشەی دەكرد بۆ لێبوردەیی ئاینی. ئەو لە زیندان بوو تا ئەوەی لە ساڵی 1619 لە زیندان ڕایكردو لە پاریس نیشتەجێ بوو، وە لەوێدا هەستا بە نوسینی كتێبە بەناوبانگەكەی بەناوی"گوتارێك لەمەڕ یاسای جەنگو ئاشتی" كە لە ساڵی 1625 بڵاوی كردەوە. ئەم كتێبە بووبە یەكەم كتێب كە بەشێوەیەكی ڕێكوپێك چارەسەری بابەتیانەی بۆ یاسای نێودەوڵەتی كردبوو.

---

1 Gotts chalk، op. cit، 304-308.

گرۆشیس وایبینی کە یاسای سروشتی ڕێبازێکی ئاکاریەو پەسندە لەلای خەڵکی، ئەمەش بەهۆی ئەوەی لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا کۆکە. لەگەڵ ئەوەی ئەم یاسایە لە فەلسەفەی یۆنانی کۆن وەرگیراوە، بەلام لەگەڵ بنچینەی ئاین دێتەوە کە دەڵێ: "ئەوەی بۆخۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکیشت پێ خۆشبێ". گرۆشیس تیۆرەکەی لەسەر ئەم بنەمایە دانا بۆ دەستەبەرکردنی دادگەری لە جیهاندا. ئەم جەختی دەکردەوە لەسەر ئەوەی کە "جەنگ دەربازبوونی بۆ نییە لەنێوان دوڵەتان، ئەمەش بەهۆی ئەوەی پشت دەبەستێ بە هەواو ئارەزوو جۆش‌و خرۆش، هەر بۆیە ڕێگری لێکردنی زەحمەتە. کەواتە مادام جەنگ هەر بەرپادەبێت، پێویستە جەنگ بەرتەنگ بیکرێتەوەو ڕێگری لێبکەن لەوەی فراوان بێت‌و سەربکێشێت بۆ ناو ئەو دەوڵەتانەی کە بەشداری تێدا ناکەن. هەروەها خۆ بەدووربگیرێ لەکاری دزی‌و ڕاوو ڕوت‌و ڕشتنی خوێنی بێ تاوانان‌و سوتاندنی تەڕو وشك".

بەڕاستی کتێبەکەی گروشیس کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر سوککردنی ئەزیەت‌و ئازارو ناخۆشیەکانی جەنگ. ئیدی لە دوای ئەمە ڕێککەوتنە نێودەوڵەتیەکان زۆرێك لە بیروڕاکانی ئەم یاسا داڕێژراوەیان لەخۆ دەگرت. یاسای نێودەوڵەتی لەسەدەی حەڤدە لە ئەوروپا گەشەیکردو دەوڵەتەکان لە کێشەلاوەکیەکاندا دەستیان پێوەدەگرت، تەنانەت لە پەیمانە نێودەوڵەتیەکانیش، دەوڵەتانی پەیمانبەست پەیوەست دەبوون بە یاسای نێودەوڵەتی‌و بنەماکانی، هەروەك داب‌و نەریتی پیادەکراو لە نێوان دەوڵەتان بۆ یاسای نێودەوڵەتی زیادکراو خرایە سەری، کاتێك پێشتر ئەمە دەقی پەیمانە ڕەسمیەکان نەبوو، سەرەڕای ئەوەی کە سودێکی زۆری هەبوو بۆ چاککردنی پەیوەندی نێوان دەوڵەتان و چارەسەر کردنی کێشە نێودەوڵەتیەکان. بەلام لە کاتی تێکگیرانی بەرژەوەندیە گەورەکان‌و سودو قازانجە زۆرەکان، دەوڵەتان خۆیان پابەند نەدەکرد بە یاسای نێودەوڵەتی‌و تەنها بەرژەوەندی

خۆیان دەبینی، ئیدی پەیماننامەو هاوپەیمانەتیەکان دادەڕمان هەڵدەوەشانەوەو بەبێ ئەوەی کەس گوێی پێ بدات.[1]

## سەرهەڵدانی بنەمای هاوسەنگی نێودەوڵەتی:-

ئەو هەوڵەی کە هەبوو بۆدانانی سنورێك لە بەردەم فراوانخوازیو هەڵپەکارییەکان، ناونرا هاوسەنگی نێودەوڵەتی. ئەمەش بە مانای نەهێشتنی هەلو دەرفەت دێت لە بەردەم دەڵەتێك یان کۆمەڵە دەوڵەتێك کە بتوانن بەشێوەیەك خۆیان بەهێز بکەن مەترسی دروست بکەن لەسەر بەرژەوەندی دەوڵەتێکی تر. نەهێشتنی ئەم هەلو دەرفەتەش بە پێکهێنانی بەریەکی دژ پەیدا دەبێ، بەوەی کە بتوانێ هاوسەنگی نێوان دەوڵەتانی ئەوروپا بێگرێتەوە. پێشتر شارە ئیتاڵیەکان لە سەدەی پازدە ئەم بنەمایەیان لە سنورێکی بەرتەسکدا جێبەجێ دەکرد. هەروەها ڕاوێژکاری هنری هەشتەم کاردینال "ولزی" لە سەدەی شازدە لەسەر ئەم بنەمایە دەڕۆیشت. بەلام "هۆگۆگرۆشیس" سیاسەتی هاوسەنگی نێودەوڵەتی کردە بنەماو ڕێبازێك، کە دەوڵەتان لە سیاسەتی جیهاندا لەسەری دەڕۆیشتن. ئەمەش بەدانانو دامەزراندنی هاوسەنگی لەنێوان دەڵەتانی ئەوروپا بۆمەبەستی پارێزگاری کردن لەئاشتی. کۆبوونەوەی دەوڵەتانیش بەیەکەوە لەجەنگی سی ساڵەدا لە دژی بنەماڵەی هبسبرگ ڕاستیەکی ڕوونە سەبارەت بەم سیاسەتە. هەروەها کۆنگرەی ویستڤالیا هەم دیس گوزارشتە لە هەوڵی دەوڵەتان بۆ کەم کردنەوەی باڵادەستی بنەماڵەی هبسبرگ بەسەر ئەوروپادا، ئەمەش بەلێداماڵینی هەندێ بەشی خاکەکەی، بە شێوەیەك کە هێنایانە ئاستی وولاتانی تر. بەمە توانرا پارێزگاری بکرێ لە هاوسەنگی نێودەوڵەتی و ئاشتی ئەوروپا.

---

1 Ibid. 304-308.

بنەمای هاوسەنگی نێودەوڵەتی بووبە بناغەو ڕێڕەوێك کە دەوڵەتان لە دوای جەنگی سی ساڵەوە لەسەری دەڕۆیشتن. هۆکارێکیش بوو بۆ پاراستنی ئاشتیو ڕووبەڕووبونەوەی دوژمنکاری لەلایەن کۆمەڵێك لە دەوڵەتان. زۆربەی جاریش بەرەی ناکۆكو ناتەبا کە لەسەر دەستکەوت دەکەوتنە کێشە، بەهۆی ئەم بنەمایە ناچاربوون واز لە هەندێ لە هەڵپەو چاو چنۆکیەکان بێنن تا ئەوەی تەرازوو هاوسەنگ دەبوو لە نێوانیان.

وەلێ دواتر بنەمای هاوسەنگی نێودەوڵەتی بوو بەهۆو ئامرازێك بۆ دەوڵەتەگەورەکان، بەوەی کە پاساو بدەنە خۆیان و بیانوو بهێننەوە لەهەمبەر دابەشکردنی دەوڵەتە لاوازەکان. ئەمەش کاتێ دەوڵەتێکی بەهێز دەیویست بەشێك لە وڵاتێك بۆخۆی بپچڕێ، وە دەوڵەتانی بەهێزی دووەم هەندێکی تر یاخود بەشێکی تریان دەبرد، هەتاوەکو هەردوولا هاوسەنگ دەبون. هاوسەنگی نێودەوڵەتی مایەوەو بەردەوام بوو لەسەدەی دواتریش، وە لەسەدەی بیستەمیش لە بوارێکی فراوانتر بەکارهێنرا.

کاتێ کە هاوسەنگی نێودەوڵەتی نەیتوانی کاریگەری هەبێت لەسەر چەسپاندنی ئاشتیو دوژمنکاری هەر بەردەوام بوو لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم، دەستەبەری پێکەوەیی(کۆمەڵکاری) لەپێناوی ئاشتی بووبەبنچینەی دیبلۆماسی نوێ.

هەر لە دەرەنجامەکانی جەنگی سی ساڵە کزبوونو پوکانەوەو نوشستی هێنانی ئیمپراتوری ڕۆمانی پیرۆز بوو، هەروەها بەدرەنگ کەوتنو دواکەوتنی یەکیەتی ئەڵمانیا بوو. ئەمەش بەهۆی خۆپەرستی میرەکانی ئەڵمانیاو دەستوەردانی بێگانە لە کاروبارەکانی ئەڵمانیا، وەك فەرەنسا، سوید، دانیمارك، ئەمە لەڕووی سیاسیەوە. لە ڕوی ئابوریشەوە بەهۆی کاری جەنگ و وێرانکاری، ئەڵمانیا گۆڕا بۆ زەوییەکی وشكو دێمەڕۆك. ئەم جەنگە سێیەکی دانیشتوانی"یازدە ملیۆن کەس"ی لەناوبرد، هەروەها پێنج لەسەر شەشی ئاوەدانیەکانی کاولو وێرانکرد، هەروەك سێ یەکی زەوییەکانی

باکوری ئەڵمانیا بووبە زەوییەکی بەکەڵك نەهاتوو بۆ کشتوکاڵ. ئەم تێکچونو وێرانکارییە تەنها کشتوکاڵی نەگرتەوە، بەڵکو چالاکی بازرگانیشی توش کردو بووەهۆی گواستنەوەی بازرگانی لە ئەڵمانیاوە بۆ هۆڵنداو فەرەنسا. خوێندنو فێرکاری بەرەو نەمان ڕۆیشتو خورافیەت سەرجەم شوێنەکانی وڵاتی گرتەوە. ئەڵمانیا بەشێوەیەك توشی چەرمەسەریو هەژاریو وێرانکاری بوو، کە ئەوەندە بەسە نمونەی خانەوادیەکی هەرێمی پلانتینات بهێنینەوە کە تەنها لە ماوەی دووساڵ هەشت جار تالانکرا، لە سەکسۆنیاش ڕەوە گورگ وەکو مێش لە دەوری کەلاكو مردوەکان دەهاتنو دەچوون.

ئیسپانیاش سەرەڕای ئەوەی کە وڵاتەکەی گۆڕەپانی جەنگ نەبوو، بەهۆی ئەوەی جەنگەکانی لە هۆڵنداو ئیتالیاو باشوری ئەڵمانیا ئەنجام دەدا، بەڵام سوپاکەی توشی زیانی گەورە بوو بەوەی ژمارەیەکی زۆری گەنجەکانی لە دەستدا. ئەمەش لە دەرەنجامی جەنگە بەردەوامەکانی لە سەدەی شازدەدا. کە لە ئاکام دا ئیسپانیا لە ڕووی ماڵیو سەربازی پوکایەوەو لاواز بوو.

لەگەڵ ئەوەش کە فیلیپی چوارەم تێکۆشاو هەوڵێکی زۆری دا بۆ ڕزگارکردنی بنەماڵەی هبسبرگی نەمساوی، وەلێ ئیمپراتۆر تێنەکۆشاو هەوڵی نەدا بۆ ڕێگری کردنو بەربەست کردنی فەرەنسا، کاتێ فەرەنسا ویستی زەویەکانی ئیسپانیای داگیربکات. تەنانەت کاتێك فیلپ داوای لە ئیمپراتۆر "فردیناندی سێیەم" کرد کە شانبەشانی ئیسپانیا بەردەوام جەنگ بکات لە دژی فەرەنسا لە دوای ساڵی 1648، وەلێ فردیناند ئەم داوایەی ڕەت کردەوە. بەمەش ئیسپانیا ناچار بوو بە تەنیا بەردەوامبێت لەجەنگ کردن بۆماوەی دە ساڵی تەواو. واتا تاوەکو ساڵی1659 کە جەنگیان کۆتایی پێهێنا بەگوێرەی پەیمانی "برنس".

بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە ئسپانیا دەستبەرداری هەرێمی "رونسیلی" بوو لە خۆرهەلاتی چیاکانی "برانس"، هەورەها دەەستبەرداری بەشی باشوری بەلجیکا بوو،

کە شاری "ئۆراتۆ"و ژمارەیەك شاری تری قایمو پتەوی تێدابوو بە نسبەت فەرەنسا. هەروەك فیلیپی چوارەم ڕەزامەندی نواند لەسەر بەخشینی کچەکەی "ماریا تریزا" بە پاشای فەرەنسی لۆیسی چوارده. لەبەرئەوە فەرنسا داوای زێدەتری لەئیسپانیا نەکرد، بەو هیوایەی کە کچی فیلیپی چوارەم لەگەڵ خۆیدا سامانێکی زۆر بهێنێ. بەلام لەڕاستیدا ئیسپانیا بە کردەیی هەژار بوو نەیدەتوانی تێچوونی خانمی نوێ بۆ فەرەنسا بدات. فیلیپی چوارەم هەوڵیدا پرتوگال بگێرێتەوە، بەلام شکستی خواردو لە ساڵی 1665 بەرەو پیری مەرگ چوو تەختی ئیسپانیای جێهێشت بۆ کوڕەکەی چارلسی دووەم. بەمردنی فیلپ پێشڕەوی کردنی ئەوروپا لە ئیسپانیاوە کەوتە دەستی فەرەنسا

## نوشستیو داڕوخانی ئیسپانیا لەسەدەی حەڤدە:-

ئیسپانیا تاوەکو نیوەی سەدەی حەڤدە سودو کەڵکی وەردەگرت لە شکۆمەندیو گەورەبوونی لە ئەوروپادا. بەلام بەرەبەرە بەرەو دارمان ڕۆیشت. ئەم دارمانە لە کۆتاییەکانی دەسەلاتی "فیلیپی دووەم" دەستی پێکرد. دەتوانین جەنگی "ئەرمادا" بەخاڵی وەرچەرخانو گۆڕان دابنێین لە مێژووی ئیسپانیا دا، بەهۆی ئەوەی کە دەستەپاچەییو بێ هێزی فیلیپی دووەمی سەلماند لە ڕێکخستنی کاروباری ئەوروپیو نواندنی دەسەلات بەسەریدا. لەگەڵ ئەوەشدا شکست کاریگەری نەبوو لەسەرحوکمو دەسەلاتی بنەماڵەی هبسبرگی ئیسپانیا.

ئیسپانیا لەماوەی نیوە یەکەمی سەدەی حەڤدە وەك بەهێزترین دەوڵەت لە ئەوروپاو خاوەنی زۆرترین سەروەتو سامان دەڕۆیی بەڕێوەو هەر بەردەوم بوو تێیدا. هەروەك پەیوەندیە بەهێزەکانی نێوان لقی بنەماڵەی هبسبرگی ئیسپانیو نەمساوی هەر بەردەوام مایەوە. فیلیپی سێیەم لە دوای باوکی "فیلیپی دووەم" هاتە سەرتەخت لەساڵی 1598، لەسەری بەردەوام بوو تا ساڵی 1626. بەهەمان شێوە کوڕەکەیشی

"فیلپی چوارەم" جێگەی فیلپی سێیەمی گرتەوەو تا ساڵی 1665 لەسەر دەسەلات مایەوە. "فیلپی چوارەم" بۆ هاوکاریکردنی نزیکەکانی لە نەمساویەکان، وە بۆ گێڕانەوەی پرتوگال‌و هۆڵنداو سەرکزکردنی فەرەنسا خۆی خزاندە ناو جەنگی سی ساڵە. شیاوی باسە ڕەوشی نێودەوڵەتی هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی ئیسپانیا بتوانێ پارێزگاری لەشکۆمەندی خۆی بکات. کاتێ دەبینین جەنگی ناوخۆیی لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدە فەرەنسای وێران کردبوو. هەروەها کوژرانی "هنری چوارەم"و ئەو پەشێوی‌و ئاژاوەو ئالۆزکاویەی کە لەڕۆژگاری "ریشیلۆو مازارین" ڕویدا. هەروەك لە بەشی داهاتو ڕوونی دەکەینەوە کە چۆن فەرەنسای هەڵپروکاندو تاقەت‌و توانای فەرەنسای لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدە نەهێشت. ئەڵمانیاش لە هەمانکاتدا بەهۆی جەنگی سی ساڵەوە وێران ببوو. ئینگلتراش خەریك بوو بەوپەشێوی‌و ململانێیەی کە لە نێوان پاشاو پەرلەمان بەڕێوەدەچوو، کە دواتر بە هۆیەوە جەنگی ناوخۆیی سەریهەڵدا. لەبەر هەموو ئەم هۆکارانە ئیسپانیا لە ماوەیەکی ئاشتی‌و خۆشگوزەرانیەکی ڕێژەیی دا دەژیا، جەنگیش لە نێوان خۆی‌و هۆڵندا بەپێی ئاگربەستی ساڵی1609 کۆتایی پێهێنرا. ئیدی ئیسپانیا بەهرەمەند بوو بەسەروەت‌و سامان‌و داگیرگەکانی‌و لە بازرگانی خۆرهەلات کەڵكوسودی وەردەگرت. هەروەها کایەی هونەرو وێژە لەم ماوەیەدا پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی‌و هونەرمەندو وێژەزانانی چەشنی "ڤالاسکویز، جینروین، ماریانە...هتد" دەرکەوتن. بەلآم سەرەڕای ئەو هەموو سەروەت‌و سامانەی کەلێی هەڵدەقولا، ئەو گەشانەوەیەی کەهونەرو وێژە بەخۆیەوە بینی، کەچی ئیسپانیا دەستی بەداڕوخان کردو دەسەلات‌و پایەی لە ئەوروپا لە دەستدا. بەهۆی ئەوەی:

1– لە ڕاستیدا ئەو سەروەت‌و سامانەی کە هەڵدەقولاو لەم دیوی دەریاکانەوە بۆئیسپانیا ڕێچکەی بەستبوو، گەلی ئیسپانی لێی سودمەند نەبوو، بەڵکو ئەوەی کەڵکی لێ وەردەگرت کۆمەلێکی کەم بوون لە بازرگان‌و خانەدانان. هەروەها زۆرترینی ئەوانەی

سودمەند بوون لێی، بازرگانو سەرمایەدارانی بیانی بوون، بەتایبەت هۆڵەندیو ئەڵمانیەکانو بەپلەی دووەم ئیتاڵیەکان. هەروەك پێشتر ئەوەمان باسکرد.

2- پیشەسازو دەستڕەنگینەکان لەچینی ناوەڕاست بوون و زۆربەیان لەمۆرسیسکۆسەکان بوون (مەغریبیەکان لەپاشماوەی عەرەب، کە مەسیحیتیان وەرگرتبوو). حکومەت بۆ بەدیهێنانی یەکیەتی گەلو وڵات دەستی کرد بەچەوساندنەوەی ئەم خەڵکانە. ئەوەبوو لە ساڵی 1609 ناچارکران وڵات جێبێڵن، بەمەش ئیسپانیا چینێکی خاوەن پیشەی لە دەستدا، چینێك کە لە توانادا هەبوو سودیان لێ وەربگیرێ بۆ پەرەپێدان و گشەپێدانی سەرمایەداریەت لە ئیسپانیا.

3-ئەو باجە زۆرو قورسانەی کە خرابوونە ئەستۆی گەل، دواتر بووە هۆی لاوازکردنی باری ئابووری گەلی ئیسپانی.

4-دەستوەردانی ئیسپانیا لە کاروباری ئەوروپاو خۆخزاندنە نێو جەنگی سی ساڵە کە لە ڕاستیدا بۆ ئیسپانیا پەنجا ساڵ بوو، ئاکامێکی شکست ئامێزی هەبوو، بەوەی ئیسپانیا لە کایەکەدا تێکشکاو سەرجەم

سامانی لە دەست داو داگیرگەکانی لە دەست دەرچوو.

5-پادشایی ڕەهاو کارگێڕی ناوەندی هۆکارێکی تربوو بۆ هەرەسهێنانی ئیسپانیا. خودی پاشا نەیدەتوانی هەموو کارو بارەکانی ئیمپراتۆریەتە بەرفراوانەکەی ڕاپەڕێنێ. ساکاتێکیش فیلپ مرد، چەندپاشایەکی لاواز هاتن کە خەڵکانێکیان دامەزراندو کردیانن بەدەسەڵاتدار کە بە تواناو لێهاتوو نەبوون، ئەمەش بووبە هۆی تێکچوونو ئیفلیج بوونی دامو دەزگاکانی دەوڵەتو نشوستی هێنانی لە دوای هاتنی نیوەی سەدەی حەقدە. لاوازی پاشاکانی ئیسپانیا وایکرد هاوسەرگیری پێکبهێنن لە نێوان کوڕو کچە ئامۆزاکانی بنەماڵی هبسبرگی نەمساویو ئیسپانی. چارلسی پێنجەمو فردیناندی یەکەم برای دایكو باوکی یەکتری بوون. هەروەها فیلپی دووەم کوڕی چارلسی پێنجەم هاوسەرگیری کرد لەگەڵ کچی ئیمپراتۆر ماکسیمیلیانی دووەمی کوڕی فردیناندی

یەکەم "کە دەکاتە مامی، واتا ماکسیمیلیان مامی فیلپ بوو". هەروەها ماکسیمیلیان خوشکی فیلپی دووەمی خواست، لەبەرئەوە فیلپی سێیەم ی کوڕی فیلپی دووەم نەوەی ماکسیمیلیان بوو. بەم شێوەیە ژن وژنخوازی لەنێوان هەردوو بنەماڵە بەردەوام بوو تا ئەوەی چارلسی دووەمی کوڕی فیلپی چوارەم دوایەمین پاشای بنەماڵەی هبسبرگی ئیسپانی بوو. ئەم شایە بەدرێژای سیوحەوت ساڵی فەرمانڕەوایی نەخۆش‌و دەردەداربوو، پادشاکانی ئەورووپاش زۆر بەپەرۆشەوە لە چاوەڕوانی مردنی دابوون، تا لەساڵی 1697چاوەڕوانیەکەیان شکاو چارلس تەخت‌و تاراجی جێهێشت.

## ڕۆژگاری مەزن بوونی فەرەنسا

جەنگە دەرەکییەکان‌و شۆڕشەنێوخۆییەکان ڕۆڵێکی کاریگەری بینی لە وێرانکردنی فەرەنسای سەدەی شازدە. شارەکان چۆڵ بوون وئاگری جەنگ ژمارەیەکی زۆری لێ خاپور کردن، ڕێگەو بانەکان پشتگوێ خران، ڕێگرو چەتەکان خراپەکاریان دەنایەوە. بەهۆی وەستانی چالاکی بازرگانیش کشتوکاڵ پەکی کەوت‌و بێکاری بڵاوبوویەوە. لە هەموو ئەمانەدا بەشی دەوڵەت مایەپوچ بوونی خەزێنەو ئیفلیج بوونی دام‌و دەزگاکانی بوو، کە هەرئەمەش وای لە خانەدانان کرد گوێڕایەڵی بۆ حوکومەت نەنوێنن‌و دەسەڵات بەدەستەوە بگرن. ئەم هەموو ناخۆشی‌و تاڵی‌و وێرانکاریەی کە فەرەنسای گرتەوە، زۆری نەمابوو ئەو هەوڵ و کۆششانە بەهەدەر بدات کە لە سەدەی پازدەوە لەپێناوی چەسپاندنی پایەکانی دەوڵەت درابوون. بەڵام سەرهەڵدانی چەند کەسایەتیەکی بەهێز، بووە هۆی گێڕانەوەی ئەم هەوڵ‌و کۆششانە. ئەمەش کاتێك ئەم کەسانە توانیان هێمنی‌و ئارامی بگێڕنەوەو کارەکان بخەنەوە جێگەی خۆیان‌و هەستان بە زنجیرەیەك چاکسازی کە بەهۆیەوە دەسەڵاتی ناوەندی‌و پادشایەتیان بەهێزکردو فەرەنسایان کردە بەهێزترین دەوڵەتی ئەورووپای سەدەی حەڤدە. یەکەمینی ئەوکەسانەش هنری ناڤار بوو، یاخود هنری چوارەم.

## بنەماڵەی بۆربۆن‌و پادشایەتی ڕەها:-

وەنەبێ فەرمانڕەوایی ڕەها لەسەر دەستی بنەماڵەی بۆربۆن لە فەرەنسا چەسپی بێت، بەڵکو لەپێش ئەوانیشەوە هەبوو، کاتێك دەبینین نوسەری فەرەنسی "جان بودان" پشتگیری ئەم جۆرە دەسەڵاتەی دەکردو باوەڕی وابوو کە پادشا لەسەرووی یاساوەیە، هەروەك هەموو شتێك ملکەچی فەرمان‌و ویستەکانیەتی‌و گشت تاکەکان پێویستە گوێڕایەڵی بن. پەرلەمانیش مافی ئەوەی نیە هاوبەشی پادشا بکات لە دەسەڵاتی باڵاداو پەرلەمان هیچ نییە تەنها ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری نەبێت. شیاوی

باسە "جان بودان" ماف ناس بووەو لە ساڵی 1576 پشتیوانی لەم شێوە دەسەڵاتە کردوەو خۆیشی کاریگەر بووە بەکلتوری کلاسیکی.[1]

## هنری چوارەم، یەکەم پاشای

## بنەماڵەی بۆربۆن( 1610-1589 )

### ڕەوشتو ئاکاری:-

"هنری چوارەم" بە سەرۆکی بنەماڵەی بۆربۆن دادەنرێ. لە ساڵی 1589 تەختی فەرەنسی کەوتە بن دەست. جەنگە خوێناویەکان بەمردنی هنری سێ یەمی پاشای فەرەنساو کۆتایی بنەماڵەی ڤالوای پاشای فەرەنسی کۆتاییان هات. هنری پیاوێکی بەهێزو وریاو چالاك بوو. بیرتیژو زیرەك بوو، زەردەخەنە ڕووی بەرنەدەداو هەمیشە لەسەر لێوی بوو، کە گوزارشت بوو لەسەر ڕۆح سوکیو زیرەکیو وورە بەرزی. هنری زۆر حەزی لە چاککردنی کاروباری وڵاتەکەی بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ناسراو بوو بەڕژدیو خۆویستی، وە بەهۆی ئەوەی کەسێکی سەربازی بوو، حەزی لە هەبوونی نەیاری نەدەکردو دەیویست فەرمانەکانی بەبێ ئەملاولا جێبەجێ بکرێت.

**هنری چوارەمو فرمانی نانت:-**

دوای چوار ساڵیش لە هاتنە سەرتەختی هنری چوارەم جەنگی ناوخۆیی لە فەرەنسا هەربەردەوام بوو. هنری بۆ ئەوەی پێگەی خۆی بچەسپێنێ، لە ساڵی 1593 ئایینزای پرۆتستانتی واز لێهێناو چووە سەر ئایینزای کاسۆلیکی، کە ئاینزای زۆرینەی خەڵکی فەرەنسا بوو. لەهەمان کاتیشدا شۆڕش کۆتایی پێهات. لە ساڵی 1598 هنری فرمانی"نانت"ی لە شاری نانت دەرکرد، کە ئازادی پەرستشکاریو ئاینی دەدا بەپرۆتستانتیە فەرەنسیەکان"هیگۆنۆت".

---

1 Gottschalk‹op.cit;pp.261-178 Hayes‹cit;pp.276-319

بەپێ ی ئەم فرمانە:ـ

1- پڕۆتستانتیەکان مافی پیادەکردنی دروشمە ئاینیەکانو نەریتە ئاینیەکانی خۆیان هەیە لە شوێنی تایبەتی خۆیان بەبێ ئەوەی حکومەت یا هەرلایەك دەست لە کاریان وەربدات.

2- پڕۆتستانتیەکان مافی پیادەکردنی دروشمە ئاینیەکانی خۆیان هەیە لە شوێنە گشتیەکان لە دووسەد شارو سێ هەزار قەڵای ناو فەرەنسا.

3- حکومەتی فەرەنسی هاوکاری ماددی دەبەخشێ بەقوتابخانە پڕۆتستانتیەکان.

4- ڕێگە درا بە بڵاوکردنەوەی پەرتوکە پڕۆتستانتیەکانو نەهێشتنی کۆسپ لە بەردەمیانو پشتگیری کردنیان لەلایەن حکومەتو کاسۆلیکەکان.

5- پڕۆتستانتیەکان مافی ئاینیو سیاسی تەواویان هەیە.

6- پڕۆتستانتیەکان مافی ئەوەیان هەیە سەبارەت بەهەندێ کاری دادوەری کۆبونەوە بکەن.

7- بۆ دەستەبەری و زامنی جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارانە، حکومەت بۆ ماوەی هەشتساڵ مافی دەسەڵاتداریەتی بەخشی بەپڕۆتستانتەکان کە دەسەڵاتیان هەبێت لە دووسەد شار.

ئەم فرمانە سەرەتای ئازادی ئاینی بوو لە فەرەنسا، بەڵام بەهۆی ئەوەی ئەم بەربژاریانەی کەپێیان بەخشرابوو بەهۆی بیروباوەڕەوە نەبوو، بەڵکو بەهۆی پێویستی سیاسیەوە بوو، بەوەی کە هنری باوەڕی وابوو پێویستە لەسەر فەرەنسیەکان بەهۆی ئاینو جیاوازی بیروباوەڕەوە جەنگی یەکتری نەکەن، هەروەك خۆیشی چووە سەر ئاینزای کاسۆلیکی. بەهەمان شێوە کاسۆلیکەکانیش بەمەڕازی نەبوون چونکە ئازادی ئاینی بەخشیبوو بەپڕۆتستانتەکان. ئەم ناڕازی بوونە دواتر سەری کێشا بۆ پەنهانکوژ کردنی هنری بەدەستی کاسۆلیکێکی توندڕەو خۆی کردە قوربانی ئەم فرمانە. جەنگی

هنری چوارەم لەگەڵ فلیپی دووەمی پاشای ئیسپانیا هەر بەردەوام بوو تاوەکو ساڵی1589، لەم ساڵەدا بەپەیمانی "ڤێرڤین" کۆتایی هات. ئەم پەیمانە جەختی دەکردەوە لەسەر بڕیارەکانی پەیمانی ساڵی 1559، کە بەگوێرەی پەیمانی ساڵی ناوبراو فەرەنسا دانی نابوو بە باڵادەستی ئیسپانیا بەسەر ناپۆلیو صقلیەو دۆقیەو میلانۆ لە ئیتاڵیا، هەروەك ئیسپانیاش دانی نابوو بە باڵادەستی فەرەنسا بەسەر سێ شارە ئەڵمانیە کە"میتیز-تول-ڤیردون".

## چاکسازییەکانی سۆلی:-

پاش ئەوەی هنری چوارەم زاڵ بوو بەسەر پەشێویەکانی ناوخۆو هێمنیو سەقامگیری گێڕایەوە وڵات، بەیاریدەی وەزیری دارایی"دیوك ئوف سۆلی" هەستا بەچاکسازیەکی فراوان.

"سۆلی"پرۆتستانتیەکی دڵسۆز بوو، مەیلو ئارەزووی لە کەمکردنەوەی خەرجیەکان بوو. "سۆلی" هەستا بە ئەنجامدانی گەشتێك بەناو فەرەنساو لەم گەڕانەیدا لە نزیکەوە ڕەوشی خراپی دارایی بەرچاوکەوت. ئیدی دوای ئەمە بڕیاری چاکسازیدا. یەکەم ڕێوشوێنێك کە گرتیەبەر ڕێگریکردن بوو لە دەسەڵاتدارانی ناوچەو هەرێمەکان لە سەپاندنی باجو کۆکردنەوەی. هەروەها نەهێشتنی گەندەڵی بوو لە کۆکردنەوەی باج. بەهۆی ئەمەوە لە ماوەی ساڵانی1600-1610توانی ساڵانە یەك ملیۆن جونیە پاشەکەوت بکات. پاشا زۆر بەگەرمیەوە پشتیوانی لە سیاسەتی سۆلی کرد و هەستا بەکەم کردنەوەی هاوکاری ماددی هونەرمەندان و دۆستو نزیکانی، هەروەها فەرمانیدا بەناردنەوەی (تسریح)سوپا، لەمەدا هیچی نەهێشتەوە تەنها ژمارەیەکی پێویست نەبێ، ئەویش بۆ چەسپاندنی هێمنیو ئارامی فەڕەنساو زاڵ بوون بەسەر یاخی بووەکان.

سۆلی لە پێناوی ئاشتی جیهانی دا پێشنیازی شێوەیەك لە كۆنفیدراڵی كرد لە نێوان وڵاتانی جیهان‌و ناونرا پرۆژەی مەزنی سۆلی. وەلێ بەهۆی تێكگیرانی بەرژەوەندی ووڵاتانی ئەوروپا ئەم پرۆژەیە شكستی هێنا. لەڕاستیدا ئەمە سەرەتای بیركردنەوە بوو لەپرسی داماڵینی چەك‌و ئاشتی جیهانی. كەچی تاوەكو ئەمڕۆش كاتی جێبەجێ كردنی نەهاتووە.[1]

جگە لە هەموو ئەمانە، سۆلی هەوڵی بەدیهێنانی سەرچاوەی تری سەروەت‌و سامانیدا لە وڵاتدا، ئەمەش بۆ بڵاوكردنەوەی خۆشگوزەرانی و بەرزكردنەوەی گوزەرانی خەڵكی. "سۆلی" باوەڕی وابوو كە كشتوكاڵ سەرچاوەی سامانی وڵاتە، هەربۆیە بەپێویستی دەزانی دنەی كشتوكاڵ بدرێ، هەتا ئەگەر ئەم دنە دانە لەسەر حیسابی بازرگانی وپیشەسازی بێت. ئیدی لەپێناوی ئەم ئامانجەو جێبەجێ كردنی، گومرگی ناوخۆیی لەسەر بەرهەمی كشتوكاڵی لابرد لەنێوان هەرێمەكان‌و هاوكاری بەخێوكردنی ئاژەڵ و وشككردنەوەی زۆنگ و زەلكاوەكانی دا. وە بۆ پارێزگاریكردن لە دارستانەكان بڕینی دارودرەختی قەدەغەكرد. جگە لەمانە سۆلی ڕێگەو بانەكانی چاككردو پرۆژەیەكی دانا بۆ كردنەوەی نۆكەندو دروستكردنی پردو ئاوەڕۆ. بۆ پیشەسازی "ئاوریشم" كرمی ئاوریشمی هاوردەكرد، كە بە ناوبانگ بوو لە فەرەنساو بەهۆیەوە هەریەكە لە شارەكانی پاریس‌و لیۆن‌و مارسیلیا پێشكەوتن.

لەملاشەوە هنری گرنگی بە بازرگانی دەداو كەشتی بازرگانی بنیات ناو دەستی بە دامەزراندنی كەشتی جەنگی كردو قۆرغكاری بازرگانی‌و داگیركاری ئیسپانیای لەبەریەك هەڵدەوەشاند. هەروەها دەستیكرد بە كێبڕكێ كردن لەگەڵ هۆڵنداو ئینگلترا لەكایەی بازرگانی‌و دەریاوانی. لەمانەوە توانی شوێنی بازرگانی لە هیند بۆ فەرەنسا بەدەستبێنێ. هەروەك تۆوی ئیمپراتۆریەتی داگیركاری فەرەنسی لە ئەمریكا چاند.

---

1 David ogg،Europe in th 17 th Century.(London،1965،pp.72

بەم شێوەیە هنری چوارەم بناغەیەکی تۆکمەی دارشت بۆ مەزن بوونی فەرەنسا. هنری چوارەم لە ساڵی1610 پەنهانکوژ کرا. بەئاوابوونی ئەم گەورە سەرکردەش لەسەر شانۆی سیاسی فەرەنسا، خەریك بوو داڕمانێکی خێرا فەرەنسا بگرێتەوە، بەڵام سەرهەڵدانی چەند کەسایەتیەکی وەك "ڕیشیلیۆو مازارین" بوو بەهۆی ڕێگری لەم داڕمانەو درێژەدان بەکارکردن بۆ بەهێزو شکۆمەندکردنی فەرەنسا.

## شاژنە ماری میدتچی:-

کاتێك هنری چوارەم پەنهانکوژ کرا، لۆیسی سێزدە لە تەمەنی نۆساڵی دا بوو. بۆیە کەوتە ژێر سەرپەرشتیاری دایکی "ماری میدتچی". پڕۆتستانتەکان خۆشیان نەدەهات لە سیاسەتی ماری کاسۆلیك، هەروەك خانەدانانیش بە تەواوی پێی ڕازی نەبوون، بەهۆی ئارەزوومەند بوونیان بۆ دەسەڵاتو بەربژاریەکانیانو پەرۆشیان بۆ پارێزگاریکردن لێی. خەزێنەی دەوڵەت توشی مایەپووچی بوو بەهۆی ئەوەی ماری دەوری خۆی دەورە دابوو بە لایەنگرو دۆستانی خۆی، ئەمانەش خەرجی زۆریان دەویستو قورساییان لەسەر دەوڵەت دروست کردبوو. بۆیە حکومەت ڕووبەڕووی قەیرانی دارایی بویەوەو ناچار بوو بانگهێشتی ئەنجومەنی چینەکان بکات لە ساڵی 1614، بە مەبەستی دانانی باجی تازە. لە ڕاستیدا پاشاکانی فەرەنسا لە سەردەمی لۆیسی یازدەوە هەوڵی نەهێشتنی ئەم دامەزراوەیان دەدا، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ئەنجومەنی چینەکان لەپەرلەمان دەچوو دەسەڵاتی ڕەهای کەم دەکردەوە. بۆیە هیچ کات ئامادە نەبوون بانگهێشتیان بکەن، مەگەر لەکاتی قەیرانەکانی ئابووریو پەشێویو ئاڵۆزی ناوخۆ. دیارە لاوازی ئەنجومەنی چینەکان تەنها بەهۆی بەهێزی پاشاکانەوە نەبوو، بەڵکو ئەنجومەنی چینەکان بۆ خۆیشی نەیدەتوانی ڕۆڵی گرنگ بگێرێت لە پێکهێنانی حکومەتێکی دەستوری پەرلەمانی هاوشێوەی ئینگلترا. ئەمەش بەهۆی پێکهاتەی ئەم ئەنجومەنە، کاتێك دەبینین ئەم ئەنجومەنە خۆی لەسێ چین

دەبینیەوە. هەریەکە لەپیاوانی ئاینیو خانەدانان هیچ کات ڕازی نەبوون لە یەك هۆڵدا لەگەڵ چینی گشتی کۆببنەوەو ڕازی نەبوون دەنگدان بەگوێرەی تاکەکان یان کەسەکان بێت، بەڵکو دەبوو بەگوێرەی چینەکان بێت. هەروەها بەخشینی باجیان بەهەموو شێوەیەك ڕەت دەکردەوەو توڕەیی خۆیان دەرخست لە هەمبەر پرۆتستانتیەکان کە ژمارەیان زۆربوو لە چینی گشتیو سۆزو بەزەییان نەبوو بەرامبەر بە جوتیارانو بەلایاندا نەدەشکانەوە. جوتیارانێك کە زۆرینەی دانیشتوانی فەرەنسایان پێکدەهێنا. لەبەرئەم دوبەرەکیو ناکۆکیانە ئەنجومەن لە سێ هەفتە زیاتر نەیتوانی بەردەوام بێت لە کۆبونەوە. ئەم ئامانجەشی لەپێناویدا کۆبوونەوە شکستی هێنا. هەر بۆیە شاژن فەرمانی داخستنی هۆڵی کۆبونەوەی دا بەو بیانوەی ئیشی پێ هەیە بۆ سەما. نوێنەرانیشی بەرەو ماڵ ڕەوان کردنەوە. ئیدی لەدوای ئەمە ئەنجومەن بانگهێشت نەکرایەوەو کۆبونەوەی بەچاوی خۆی نەبینیەوە هەتاوەکو شۆڕشی فەرەنسی 1789.

لە دوای ئەمە کاروباری دەوڵەت تێکچووو بارودۆخ دژوار بوو، ئاژاوەو پەشێوی وڵاتی گرتەوەو دووبەرەکی نێوان خانەدانانو پرۆتستانتیەکان بەرەو بارگرژی هەنگاوی نا، وە لەنێوان ئەوان" خانەدانو پرۆتستانت"و دەرباری شاژن لەلایەکی ترەوە دوبەرەکی پەرەی سەند. سیاسەتی "ماری" لەسەر باشکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئیسپانیا دەڕۆیشتو دەیویست پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەم وڵاتە پەرەپێبداتو هەوپەیمانی بێت، بەو پێیەی کە ئیسپانیا دەوڵەتێکی بەهێزەو دەتوانێ هاوکاری بکات لە زاڵ بوونی بەسەر کێشە ناوخۆییەکان، ئەمە لە کاتێکدا "هنری چوارەم" ئیسپانیای بە دوژمنێکی دێرینی فەرەنسا دادەناو هەوڵی دەدا هەوڵەکانی فلیپی دووەم لە دەستخستنە ناو کاروباری فەرەنسا شکست پێ بێنێ.

ماری بەهۆی ئەوەی دەیویست کوڕەکەی هاوسەرگیری بکات لەگەڵ خانمی نەمساوی"ئان"ی کچی فیلپی سێیەمی پاشای ئیسپانیا، ڕووبەڕووی ناڕەزاییەکی

توندو دژوار بوویەوەو خانەدانان لە دژی شۆڕشیان کرد. بەم شێوەیە ماری لەسەر حوکم بوو، تا لۆیسی کوڕی گەیشتە تەمەنی پێگەیشتن. جا کاتێك لۆیس گەیشتە تەمەنی پێگەیشتن خۆی حوکمی گرتەدەستو دایکی ناچار کرد دەستبەرداری کاروباری دەوڵەت بێت.

## لۆیسی سێزدە

لۆیسی سێزدە وەکو باوکی خاوەن بەهرەی لێهاتوویو توانانداری نەبوو لە فەرمانڕەوایدا. ئەم شەیدای ڕاوکردنو گەمەو یارییو کۆڕی ڕابواردنو مۆسیقا بوو. بەهۆی ئەمەوە نەیدەتوانی ئەم پەشێویە بنبڕبکات کە لە دوای مردنی باوکیەوە فەرەنسای گرتبۆوە. بەڵام وەنەبێ لەم نێوانە بەتەنها مابێتەوەو کەسێ نەبوبێ پشتی پێ ببەستێ، بەڵکو ئەم بۆ کاروباری وڵاتاکەی و بەڕێوەبردنی کارەکان پشتی بەستبوو بە وەزیری بەناوبانگی خۆی کاردینالّ ڕیشیلیۆ.

## کاردینالّ ڕیشیلیۆ 1585-1642:ـ

کاردینالّ "ئارماند دی ڕیشیلیۆ" لەساڵی 1585 لەدیك بووە. شایستەیی ڕیشیلیۆ لەپۆستە ئاینیەکاندا وایکرد لە تەمەنی بیستویەك ساڵیدا ببێتە ئوسقوف لە یەکێ لە هەرێمە بچوکەکان. چاپوکیو لێوەشاوەیی ڕیشیلیۆ بۆ یەکەم جار لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی چینەکان لە ساڵی 1614 دەرکەوت، کاتێك بە زوبانێکی ڕەوان و پاراو پارێزگاریکرد لە پیاوانی ئاینی کاسۆلیکیو کاری کردە سەر خانم "ماری میدتچی"، کە هەر ئەم کارتێکردنە وایکرد "ماری"بانگهێشتی "ڕیشیلیۆ" بکاتە کۆشكو بیکاتە یەکێ لە ڕاوێژکارانی خۆی. ماری پێشنیازی بۆ پاپا کرد کە ڕیشیلیۆ بکاتە کاردینالّ لە کڵێسای فەرەنسا. ئەوەبوو بەرەبەرە پێگەی بەرز بویەوەو پلەو پایەی گەورەبوو تا بوو بە ڕاوێژکاری سەرەکی لۆیسی سێزدە لە ساڵی 1624.

"ڕیشیلیۆ" خاوەنی دانایی و بلیمەتی و ژیری بوو. سەرەڕای ئەوەی پۆستێکی بەرزی کڵێسای فەڕەنسی لەژێردەست بوو، بە کاروباری دەوڵەتیش شارەزاش بوو. ئەوەندەی ڕیشیلۆ کاری دەکرد لەپێناوی بەرز کردنەوەی پلەوپایەی وڵات، ئەوەندە لە پێناوی خودا کاری نەدەکرد. ڕیشیلیۆ ویستێکی بەهێزو بیرتیژیی‌و توانای سەرکردایەتی لەخۆیدا کۆکردبوویەوە. لە ڕەنگ‌وڕووی دەم‌وچاوە لاکیشەیەکەیدا دڵڕەقی و جەربەزەیی و توانایەکی زۆر دەدرەوشایەوە، ئەم دوژمنەکانی خستبووە دۆخێکی دڵەڕاوکێ‌و لە دەست‌و بازوی ترسیان لێ نیشتبوو.

## سیاسەتی ڕیشیلۆ:-

ڕیشیلیۆ بە زیرەکی‌و ژیریە بەهێزەکەی، پەی بە ڕەگ‌و ڕیشەی گەندەڵی‌و فەسادی فەرەنسا برد، هەر بۆیە بڕیاری ڕیشەکێشکردنی دا. ئەو کاتەی دامەزرا، ڕیشیلیۆ بەڵێنی دا کە هەرچی لە توانای دا هەیە بیخاتەکار بۆ لەناوبردنی هیگۆنۆتەکان‌و سەرکزکردنی خانەدانان‌و ئاراستەکردنی خەڵکی بەرەو ئەرکەکانیان‌و هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی پلە وپایەی پادشا لەناو وڵاتان. ئیدی ڕیشیلیۆ ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ جێبەجێ کردنی ئەو بەڵێنانە. کاتێک "ماری میدیتچی" نەیاری کرد، ڕیشیلیۆ فەرمانی دوورخستنەوەی دا. وەنەبێ لۆیسی سێزدەش خۆشی ویستبێ، بەڵام ئەم لێی دەترساو نەیدەتوانی دەستبەرداری بێت، بەتایبەت کاتێ خۆی بەدڵسۆز پادشاو فەڕەنسا پیشان دا.

## سەرکزکردنی پڕۆتستانت یا "هیگۆنۆت":-

بەڕاستی ڕیشیلیۆ کەسێکی سیاسی بوو، ئەم سیاسەتەشی لە خزمەتی دەوڵەتدا خستەکار. ئەو کاتێک دژ بە ئیمپراتۆر هاوکاری پڕۆتستانتەکانی ئەڵمانیای دەکرد، دەستی کرد بەوەشاندنی گورزەکانی لە دژی هیگۆنتەکان، لەسەر ئەوبڕوایەی ئەمانە سازکەری کێشەو گرفتن بۆ دەوڵەت. پڕۆتستانتی فەرەنسا کۆمەڵێکی سیاسی‌و ئایینی

بەهێز بوون، هۆکاری پارچە پارچەکردنی یەکیەتی وولات بوون. هنری چوارەم بەربژاریەکی زۆری پێ بەخشین. "ڕیشیلیۆ"ش-حەزی نەدەکرد ئەوان لە پەرستشکاری قەدەغە بکات، بەڵکو دەیویست لە ڕووی سیاسیەوە ملکەچیان بکات بۆ دەوڵەت. کاتێکیش لە ساڵی 1625 شۆڕشیان هەڵگیرساند، ڕیشیلیۆ بڕیاریدا تێکیانبشکێنێ. پرۆتستانتەکان هەرچەندە هاوکاری ئینگلیزیان دەستگیربوو، بەڵام نەیانتوانی خۆیان ڕابگرن لەبەردەم دەستە ئاسنینەکانی ڕیشیلیۆ. ئەوەبوو لەشاری لارۆشتیل بۆ ماوەی پانزە مانگ لەلایەن ڕیشیلیۆوە گەمارۆ دران و ناچارکران سەریان شۆڕ بکەن. ڕشیلیۆ ئازادی پەرستشکاری ئاینی بۆ دەستەبەر کردن و پۆستەکانی دەوڵەتی لەبەردەم خستنە سەر گازی پشت. ئەمەش بەگوێرەی فەرمانی"ئالی -Alais"ی ساڵی 1629، بەلام گرێدانی کۆبوونەوەی سیاسی لێ قەدەغەکردن و قەلاگانی خاپور کردن.

## تێکشکاندنی خانەدانەکان:-

ڕیشیلیۆ لە چارەسەرکردنی نەیاریی خانەدانان ڕووبەڕووی سەختیو ناڕەحەتیەکی زۆر بوویەوە. دامەزراندنی هەندێ لە خانەدانان بەحاکم و دەسەلاتدار لە هەرێمە جۆراوجۆرەکان، لەم کاتەی فەرەنسادا باوبوو،و نەریتی ئەو کاتەی فەڕەنسا وابوو. کەچی لە جیاتی ئەوەی ئەوان ببن بە فەرمانبەری ئیداری و ملکەچ بۆ دەسەلاتی ناوەندی، سەربەخۆبوون و بەربەرەکانێی فرمانەکانی حکومەتی ناوەندیان دەکردو سوپای تایبەتی خۆیان پێکدەهێنا. قەلاوبورجی خانەدانان لە ناوچە جیاجیاکانی فەڕەنسادا بلاوبوو، تاوایلێهات بووە هۆی ئەوەی هەرکاتێ بیانەوێ مەترسی دروستکەن و هەڕەشەبکەن لە دەسەلاتی ناوەندی. ئەوەی کە قورەکەی خەستترکرد، ئەوەبوو کە خانەدانان لە کۆشکی پادشایی هەستان بە داڕشتنی پیلان لە دژی کردینالْ ڕیشیلیۆ، ئەوپیاوەی گەیشتبووە پلەی بەرزی دینودنیا"کلێساو دەوڵەت".

"دیوك ئۆف ئۆرلیان"ی برای پادشاو ماری میدیتچی دایکی پادشا ڕابەرو پێشەوای ئەم خانەدانانە بوون کەهەستان بەسازکردنی پیلان[1].

جا لەپێناوی لە ناوبردنی خانەدانان، ڕیشیلیۆ هەستا بەبلاّوکردنەوەی سیخوڕو شۆفار لە سەرجەم ناوچەکانی فەرەنسا، بە مەبەستی ئاشکراکردنی پیلانو دەسیسەکانیان. "ڕیشیلیۆ" هیچ کات دوودلّی نەدەکرد لە کوشتنی گەورەو پێشەواکانیان و سەرکوتکردنی شۆڕشەکانیانو یاریدەدەرانی ئەمانی بەمردن سزادەدا هەرچەندە مەترسیشی هەبوایە. ڕیشیلیۆ لە هەڕەشەو گوڕەشەی خانەدانان نەدەترسا، هەروەك بە سکالاّو دادو فیغانو داواکانیان کاریگەرنەبوو، هەربۆیە ترسو بیمی خستبوە دلّیان. لەبەر ئەوانە ڕیشیلیۆ وەك لەناوبەری پێگەوپایەیان داهاتە بەرچاو.

بارودۆخ بەم شێوەیە ڕۆیشت تاوەکو لە سالّی 1626 ڕیشیلیۆ فرمانی خاپورکردنی قەلاّی خانەدانانی دەرکرد، بەو پاساوەی کە ولاّت پێویستی بە قەلاّی خانەدانان نەماوە بۆ بەرگری کردن لە مەترسی دەرەکی. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فرمانەش جوتیاران و شارنشینان هاوکاریان کردو ئامادەیی خۆیان نیشاندا. ئەوانەی بەهۆی زۆرداری خانەدانانەوە چەرمەسەری زۆریان چەشت بوو.

## بەناوەندی کردنی کارگێڕی ولاّت:-

وەنەبێ دەسەلاّتدارو دەرەبەگەکان هەمیشە بەتواناو لێهاتوو بووبن بۆ کایەی بەڕێوەبردن. ئەوان پێویستیەکانی دەولّەتیان لە ڕێگەی بەرتیلو لایەنگریەوە کەوتبووەدەست، هەربۆیە ڕیشیلیۆ بڕیاریدا دەسەلاّتی فەرەنسا بەناوەندی بکات. ئیدی دەسەلاّتداری تازەی دامەزراند لە پارێزەرانو ڕۆشنبیرانو هەموو دەسەلاّتێکی

---

1 Ibid;pp.183-226

پێدان وەك: سەرپەرشتی کردنی کۆکردنەوەی باجو ڕێکخستنی پۆلیسی ناوخۆو سوپاو پارێزگاریکردن لە هێمنیو ئارامیو چاوگێڕانەوە بە کاروبارەکانی دادوەری.

فەرەنسا لە سەردەمی ڕیشیلیۆ وەك ئەمڕۆ نەبوو کە سەرجەم ناوچەو دەڤەرەکانی بەیەکترەوە گرێ درابێ، بەڵکو ئەوکاتە فەرەنسا لە ڕووی کارگێڕییەوە بریتی بوو لە ڕیشیلیۆو دەسەڵاتداران، ئەو دەسەڵاتدارانەی فرمانەکانی ئەویان جێبەجێ دەکرد. ئەو کاتە حکومەتێکی ناوەندی بەهێزنەبوو کە دام و دەزگاکانی لەسەرجەم ناوچەکانی فەرەنسا بلاوکردبێتەوە، هەرروەك ڕیشیلیۆش نەیدەویست دامو دەزگایەکی لەم شێوە دروست بکات.

بەلاٌم لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ڕیشیلیۆ توانی دەسەلاتی دەرەبەگو خانەدانان کەم بکاتەوەو دەسەلاتی پادشا بەرزو بەهێز بکاتو خەڵکی گوێڕایەڵ بکاتو فەرمانەکانی بسەپێنێ بەسەر تەواوی بەشەکانی فەرەنساو ناچاریان بکات ملکەچی فەرمانەکانی بن. لەگەڵ ئەوەی ڕیشیلیۆ ئەنجومەنی چینەکانی بە فەرمی هەڵنەوەشاندەوە، بەلاٌم لە ترسی ئەوەی دەسەلاتی پاشا کەم ببێتەوە، فرمانی بە کۆبونەوەی ئەم ئەنجومەنە نەکرد، بەڵکو لەم نێوانەدا هێشتیەوەو فەرامۆشی کردن. بەم شێوەیە ڕیشیلیۆ بە لە ناوبردنی دەسەلاتی دەرەبەگو خانەدانان، وە کەمکردنەوەی لایەنی سیاسی هیگۆنۆتەکان، بناغەی پادشایی ڕەهایی خۆسەپێنی داڕشت، دوای ئەمەش سوپا بووبە سوپای پاشاو خەزێنەش بوو بە خەزێنەی پاشا.

هەروەك باسمانکرد ڕیشیلیۆ بەشداری کرد لە جەنگی سی ساڵە. فەرەنسا لە سەردەمی ئەودا پێگەو پلەو پایەی مەزنی دەستکەوت لەناو ولاٌتانی ئەورووپا، ئەمەش کاتێك بەسایەی جوتە سەرکردەی گەورە"تورین، کۆندی" سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەستهێنا. ڕیشیلیۆ کەسێکی نیشتمانیو دڵسۆز بوو بۆ بنەماڵەی بۆرۆن. بە لاوازکردنی ئیسپانیاو بنەماڵەی هبسبرگی نەمساوی، توانی فەرەنسا بکاتە دەوڵەتیکی مەزن. ڕیشیلیۆ لە جەنگی سی ساڵەدا هاوکاری هەر دەوڵەتێکی دەکرد کە جەنگی

کردبایە لەگەڵ بنەماڵەی هبسبرگ. وەلێ لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵو کۆششەی کە خستیە گەڕ، بەڵام نەژیا تا لە سیاسەتی دەرەوەیدا بەرهەمی ڕنجو هەوڵی ببینێ، کاتێك پێش کۆتایی هاتنی جەنگی سی ساڵە بە شەش کەوتە جێگەی مەرگو گیانی سپارد . پاش ساڵێك لەدوای مردنی ڕیشیلیۆ، لۆیسی سێزدەش بەهەمان شێوە کۆچی دوایی کردو، تەختەکەی بۆ کوڕی بچوکی تەمەن پێنج ساڵانە جێهێشت. ئەم منداڵەش پادشای مەزنی فەڕەنسا لۆیسی چواردە بوو.

## ڕۆژگاری لۆیسی چواردە

### کاردینالْ مازارین 1602-1661:-

فەرمانڕەوایەتی ڕەها لە ڕۆژگاری لۆیسی چواردە گەیشتە ترۆپك. ڕۆژگارێك کە زیاتر لەحەفتا ساڵی خایاند. ئەگەر هاتباو لە دوای مردنی ڕیشیلیۆ، کاردینالْ مازارین 1643-1661 بەدەستێکی پولاین حوکمی نەگرتبایە دەست، ئەوا دوور نەبوو فەڕنسا توشی کارەساتێکی گەورەو زیان و زەرەرێکی ترسناك بوبا.

مازارین خەڵکی ناپولی ئیتالیا بوو، لە ڕۆماو ئیسپانیا لەخزمەتی کڵێسا دابوو، هەستا بە ژمارەیەك کاری دیبلۆماسی بۆ پاپا کە دوایەمینیان لەپاریس بوو. مازارین لەڕیشیلیۆ نزیکبوویەوەو لۆیسی سێزدە دایمەزراندو بوو بە هاولاتیەکی فەرەنسی لە ساڵی 1639. لە پۆستە حکومیەکان بەرز بوویەوەو بووبە کاردینالو جێگری ڕیشیلیۆ لە دوای مردنی.

مازادین وەك ڕیشیلیۆ حەزی بە کاروباری دەوڵەت بوو، وە لە زیرەکیو لێوەشاوەییو لێهاتووی لە بەڕێوەبردنی سیاسەتدا کەمتر نەبوو لە ڕیشیلیۆ. جەنگی سی ساڵە لە سەردەمی ئەودا کۆتایی پێهاتو ئەوەی ڕیشیلیۆ چاندبووی ئەو دروێنەی کرد. هەروەك بە پەیمانی "برانس"ی ساڵی 1659 کۆتایی بە جەنگی درێژخایەنی دژ

بە ئیسپانیا هێنا. مازارین کۆتا شۆڕشی سەرکوتکرد کە خانەدانان لـە دژی دەسـەڵاتی ڕەها هەڵیانگیرساندبوو، کە بریتی بوو لەشۆڕشی فروند.

## شۆڕشی فـروند 1648–1652:ـ

شۆڕشی فرۆند دوایـەمین هـەوڵی خانـەدانان بـوو کـە پێـی هەسـتان بـۆ گێڕانـەوەی دەسـەڵاتو کـۆتکردنی دەسـەڵاتی پاشـا. ڕیـشیلیۆ تـوانی یـاخی بـوونو سەرکێـشان دابمرکێنیێو خەیاڵو هەوەسیان نـەهێڵێو زاڵ بێـت بەسـەر دەسـەڵاتیانو باڵادەسـتیان لەباربـەرێ. بـەڵام لـەپاش مردنـی ڕیـشیلیۆ خانـەدانان دەرفـەتیان قۆسـتەوە لـە دژی کاردینالی تـازە. مـازارینی ئیتـالی کـە لەلایـەن چـینی ناوەڕاسـتەوە هاوکـاری دەکـرا، تاوانباریـان کـرد بـە تـاڵان بردنـی خەزێنـەی فەرەنـساو دەسـتوەردان لـەکاری پەرلەمانەکانی فەرەنسا.

ئەم پەرلەمانانە بریتی بوون لە دەزگا دادوەریەکان و ژمارەیان سێزدە دەزگابوو لـە سـەدەی حەڤـدە. ئەمانـە بڕیاریـان دەدا لەسـەر پرسـە گرنگـەکانی دەوڵـەتو چـاویان دەگێڕایەوە بە تێهەڵچوونەکانی دادگـا بـچوکەکان. پەرلـەمانی پـاریس گرنگترینـی ئـەو پەرلەمانانـە بـوو. هـەروەها یـەکێکی تـر لـە ئـەرکو فرمانـەکانی تۆمـارکردنی ئـەرکو فرمانەکانی پاشایی بوو. دەسەڵاتی پەرلەمانی پاریس گەیشتە ڕادەیەك کە هەندێ جار تۆمارکردنی هەنـدێ لـە فرمـانو دەستورەکانیپاشـایان ڕەت دەکـردەوە، بـەوبیانوەی پادشا بە نەشارەزایی لە یاسای وولات ئـەم فرمانـەی داوە، یـاخود ئـەم دەسـتوردانەی پاشا لەگەڵ یاساو ڕێساکانی پێشوو یەکناگرێتـەوە. هەربۆیـە تکایـان لەپاشـا دەکـرد بیروڕاکەی بگۆڕێو فرمانەکەی هەمواربکات، یاخود هەڵیبوەشێنێتەوە.

شۆڕشی ئینگلیـزی کـە لـەم کاتـەدا هەڵگیرسـاو پـارێزراوی پەرلـەمانی ڕاگەیانـد لـە زەبـرو زەنگـی دەسـەڵاتی پاشـا، کـاری کـردە سـەر پەرلـەمانی پـاریس و ئـەوانیش بەرهەڵستی "لویسی چواردەو کاردینال "مازارین"یان کرد. ئەمـەش بـە ڕەوایـی نـەدان "شـەرعیەت نـەدان" بەسـەپاندنی بـاجو کۆکردنـەوەی بـاج، ئەگـەربێتو ئـەم باجـە

سەپێنراوانە لەلایەن نوێنەرانی گەلەوە ڕەت بکرێتەوە. هەروەها بە هەڵوەشاندنەوەی هەندێ لە دەزگاکانی حکومەتو ناڕەزایی دەبڕین لە دژی دەستەبەسەرکردنو زیندانی کردن بەبێ یاسا، دیسان بەرهەڵستی پادشایان کرد. ئەمانە لەلایەن خەڵکی پاریسەوە پشتگیری کران، بەڵام بەهۆی ئەوەی مازارین تا ئەم کاتەش سەرقاڵبوو بە جەنگی سی ساڵە، لە بەرامبەر داواکارییەکانی پەرلەمان ملی کەچ کرد. وەلێ کاتێك جەنگی سی ساڵە کۆتایی پێهاتو سوپای فەرەنسی گەڕایەوە نێو وڵاتەکەی، مازارین دەسەڵاتی پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە. بەڵام خەڵکی بەردەوام بوون لە شۆڕش تا ئەوەبوو لە ساڵی1652 بەتەواوی کۆتایی بەشۆڕشەکەیان هات.

هەڵگیرسانی شۆڕشی فروند بووبەهۆی:-

1- لە ناوبردنی دەسەڵاتی خانەدانان بەتەواوی.

2- دەست وەردانی پەرلەمان لە کاروباری سیاسیو دارایی کۆتایی پێهێنرا.

3- ڕێگری گرتن لە خەڵکی پاریس لەمەڕ هەڵگرتنی چەكو هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی شارەوانی.

4- زیادبوونی دەسەڵاتی پاشا لەچاو سەردەمی ڕشیلیۆ. واتا لە دوای کوژاندنەوەی ئەم شۆڕشە دەسەڵاتی پاشا زۆر زیاتر بوو لەپێشتر.

بەم شێوەیە مازارین هەموو هەلێکی دەقۆستەوە بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی پاشا. کاتێکیش لە ساڵی 1661 مرد، لۆیسی چواردە گەیشتبووە تەمەنی پێگەیشتووییو ڕێگەی بۆتەخت کرابوو. کە بەهەوڵو کۆششی ڕیشیلیۆو مازارینو باپیرەی هنری چوارەم بۆی فەراهەم هاتبوو.

## لۆیسی چواردە

### دەسەڵاتی ڕەها:-

لەدوای مردنی مازارین لۆیسی چواردە ڕایگەیاند: کە ئەم بەتەنها فەرمانڕەوایی وڵات دەکاتو سیاسەتی ناوخۆو دەرەکی بە تەنها بەڕێوەدەبات. لۆیس پیاوێکی شەنگو جوانو کەشخەو بەشکۆ بوو بەشێوەیەك "پادشایی ڕەها"ی تێدا دەدرەوشایەوە.

لۆیس پشتی بەستبوو بە تیۆری مافی خودایی پاشاکان، ئەم نازناوی شای مەزنی لێنرابوو چونکە ئەوەی مەبەستی بوایە جێبەجێی دەکرد. بەرجەستە بوونی دەوڵەت لە لۆیس دا بەشێوەیەکی جوان لەلای ئوسقوف "بوسویە"1627–1704 ڕوون بوویەوە.

بوسویە فێرکاری منداڵەکانی پادشا بوو. دەسەڵات لە ڕوانگەی "بوسویە" دا بریتی بوو لە "خەڵاتێکی خودا بۆ ڕێکخستنی مرۆڤو بەیەکەوە ژیان. ئەم پێی وابوو سیستەمێکە بەلێهاتووی‌و هێز جیادەکرێتەوەو سروشتیە، هەر بۆیە باشترین سیستەم‌و ڕێکخەرە. بۆسۆویە ئەم سیستەمە دەچوێنێ بە خێزان کە باوك سەرۆکایەتی دەکات، هەر بۆیە پێویستە سیستەمی پادشایی پشتاوپشت بێت. پادشا پیرۆزە چونکە لە کاتی تاج لەسەر نانی بەڕۆنی پیرۆز چەور دەکرێت. دوژمنایەتی کردنی پاشاو لە دژ بوونی گومڕایی‌و بێ باوەڕییە. پادشا لەجێگەی باوکە وەك باوکە بۆ گەلەکەی. دەسەڵاتەکەی ڕەهایەو جگە لە خوا هیچ کەس بۆی نیە لێ پێچانەوەی لەگەڵ بکات، یاخود لە فەرمانەکەی دەربچێ. پادشا سێبەری خودایە لەسەر ڕووی زەوی‌و بەهرەدارە بە ژیرییەکی جیاواز لە ژیری خەڵکی‌و پێویستە تەنها وەك مرۆڤێك سەیرنەکرێت، چونکە ئەو کەسایەتیەکی گشتگیرەو ڕەنگدانەوەی تەواوی خەڵکە. ئەگەر هەڵەیەکی کرد وکارێکی خراپی کرد، خەڵکی دەبێ تەنها داوا لەخودا بکات ڕێنوێنی بکات بۆسەر ڕێگەیەکی ڕاست".

ئەمە تیۆری مافی خودایی پاشاکانەو بۆسویە بەم شێوەیە ڕازاندیەوە. ئەم تیۆرەی لۆیسی چواردە لە فەرمانڕەوایەتیدا پشتی پێ دەبەست و هاوچەرخەکانی و هەروەها خەڵکانی دوای خۆیشی باوەڕییان پێ هەبوو.[1]

---

1 Ibid ;pp.281-322

## ڕێکخستنی کارگێڕی وولأت:ـ

لۆیسی چواردە ئیدارەی وولأتەکەی بەناوەندی کردو ژمارەیەك وەزارەتی وەك: دارایی‌و سوپاو دەریایی‌و ئیشغالی گشتی دامەزراند. لەپێش لۆیسی چواردەشدا ئەم وەزارەتانە هەبوون، بەلأم لە ژێردەستی یەك وەزیردابوون.[2] وەزیرانی ئەم وەزارەتانە کەوتنە ژێر دەسەلأتی خودی لۆیس، ئەم وەزیرانە فرمانەکانی و ئەو سیاسەتەیشی بڕیاری لەسەر دەدا جێبەجێیان دەکرد. وەزیران‌و ئەمیندارانی سڕ" ئەمینداری نهێنی"و یاریدەدەرانی لەپایتەخت لەفەرمانڕەوایی کردندا هاوکارییان دەکرد. دەسەلأتداران‌و فەرمانبەران لە هەرێمەکاندا ڕاپۆرتەکانیان سەبارەت بەکارەکانیان پێشکەشی پاشا دەکرد، وە هەتاکو ڕەزامەندی پاشایان وەرنەگرتبا، هیچ ڕێوشوێنێکی پێویستیان نەدەگرتەبەر. وە لە پێناوی لاوازکردنی خانەدانان، پۆستی حکومیان لە پایتەختدا پێشکەش بەخانەدانان کرد، بەبێ ئەوەی هیچ دەسەلأتێکی هەبێت. دەسەلأتی ئەوکەسانەی لە هەرێمەکاندا دەسەلأتیان هەبوو، زیاتر بوو وەك لەوەی لە سەردەمی ڕیشیلیۆ هەیانبوو، ئەمەش لەسەر حیسابی ئەنجومەنی شارەوانی‌و ئەنجومەنەکانی ئیدارە تەواو دەبوو. ئەم دەسەلأتدارانە بەرپرسیاربوون لە دارایی هەرێمی ژێر دەستیان وپیشەسازی‌و کشتوکاڵی ناوچەکانیان، سەرەڕای بەڕێوەبردن‌و بەرپرسیاریان لە دادوەری‌و هێمنی‌و ئاسایش ناوچەی بن دەستیان. پادشا خۆی ئەمانەی دادەمەزراندو ملکەچیشی دەکردن بۆ فرمانەکانی.

لۆیس دوای ئەوەی چووە سەرتەختی دەسەلأت، سی ساڵ کاری کرد بۆ ڕێکخستنی دام‌و دەزگای حکومی‌و چاکترکردنی، هەروەها بەهێزکردنی بەڕێوەبردنی‌و ئاسان کردنی. ئیدی ئەمە گەورەترین کارێك بوو کە لۆیس لە ماوەی دەسەلأتیدا ئەنجامی دا. لۆیس خاوەنی دەسەلأت بوو لە کارەکەیداو بەشەو بەڕۆژ کاری دەکرد بۆ

---

2 واتا پێشتر ئەم وەزارەتانە هەرهەبوون بەلأم دوایی لۆیس هەمووی لەیەك جیاکردنەوە

بەڕێوەبردنی وڵاتەکەی. کاتێکیش لەسەر تەخت دادەنیشت، دەستوپێوەندەکانی بەڕەنگو ڕوویەك بەپیریەوە دەچوونو پێشوازیان دەکرد کە خۆ فیدا کردن وگوێڕپەڵی دەنواند.

## ڤێرســـــای:-

لۆیسی چواردە لە دووری دوازدە میل لە پاریس کۆشکێی فراوانی بنیاتنا کە هیچ کۆشکێکی تر لە قەشەنگی و جوانیو گەورەیدا شانیان لە شانی نەدەدا. ئەم کۆشکەش ڤێرسابوو. کۆشکی ڤێرسای بەشێوەیەك فراوان بوو کە سەرەڕای ماڵ و منداڵەکەی سەدان لە خانەدانان و ژمارەیەکی زۆری لە خزمەتکارو سەربازانی لە خۆدەگرت. ژوورو هۆڵەکانی ڕازێنرابوویەوە بەجۆرەها کەلوپەلی ناومالۆو تابلۆو نیگاری نەخشکراو بەزێڕو جۆرەها وێنەوپەیکەر. هەرچی تێیدا بوو بە شێوازێك نەخشکرابوو کە گەورەیی لۆیسی چواردەی تیادا دەدرەوشایەوە. ڤێرسای شاکارێکی بیناسازی بوو لەجوانیداو بە جۆرەها پەیکەر ڕازێندرابۆوە. ئەم کۆشکە حەوزو مەلەوانگەی لە خۆگرتبوو، هەروەك دەورە درابوو بە دارستانو سەوزایی کە پاشا هەرکاتێك ئارەزووی کردبا ڕاوی تیادا دەکرد. جوانی ڤێرسای تاکو ئێستاش میوانانیو سەیرکارانی سەرسام دەکات.

پادشایان هەوڵیاندا لاسایی ئەو بکەنەوە لە دروستکردنی نشینگەی گەورەو سەرنج ڕاکێش، بەلاَم هیچ یەکێکیان نەیانتوانی شان لە شانی بدەن. ڤێرسای خانەدانانی بەلای خۆیدا کەمەندەکێش دەکرد، وەك چۆن ڕۆشنایی پەروانە بۆلای خۆی کێش دەکات. خانەدانان لەوێدا ژیانیان بەکەشخەییو خۆنواندن دەگوزەراند بەبێ ئەوەی هەستن بەئەنجام دانی هیچ کارێکی سەخت. "کۆنت یاخود دۆق" شانازی دەکرد ئەگەر هەندێ لە پۆشاکەکانی پاشای وەچنگ کەوتبا، یاخود پاشا دوای خۆشۆردنی خاولیەکەی پێبداباو بەدەستی کەوتبا. خانەدانانو دەرەبەگەکان لەوێدا ببوونە

کەلوپەلی جوانکاری. ئەوان کەلوپەلی ڕازاندنەوە بوون و خەرجیەکی زۆرو لە ڕەبەدەریان لێ خەرج دەکرا.

جگە لەمە ڤێرسای ببوە جێگەی هونەرمەندان و ئەدیبانیش، ئەمەش بەسایەی پاشاو برەودانی لۆیس بەهونەرو ئەدەب. لە وێژەی شانۆیی "کورنیلی" کە دامەزرێنەری شانۆی فەرەنسی و هۆزانڤان "مولێر" مەزنترین نوسەری دراما کە فەرەنسا بەخۆیەوە بینی بووی "لەم کاتەدا". هەروەها نوسەر "ڕاسین" و "ڕۆماننوس "لاڤۆنتین"، جگە لەمانە وێژەوان "مادام سیڤینی" کە لێهاتو بوو لە نوسینی یاداشتدا، لەوێدا خزمەتدەکران. ئەمانە بەپەرۆشەوە پێشوازیان لێ دەکراو بەهۆیەوە سودمەندی گەورەبوون.

بەڕاستی لۆیسی چواردە پشتیوانی هونەری بیناسازی و پەیکەر تاشی و نەخشەسازو وێنەکێش و مۆسیقاژەنان بوو. ڤێرسای ژمارەیەکی زۆری لە هونەرمەندانی بەلای خۆیدا کێشکرد، "لۆیس"یش خستنیە ژێرسایەی خۆی. ئیدی چاپوکی و سەلیقەی هونەری لەجوانکردنی ڤێرسا دەرکەوت. "مانزرت"ی بیناساز ئەو کەسە بوو کە بەشی سەرەکی ڤێرسای بنیاتنا، بەهەمان شێوە هۆڵی گەورەی ناسراو بە "بگراند تریانۆی"ی دروست کرد. جگەلەمە "مانزرت جیرادرون"پەیکەرتاشی فەرەمی و "لیبرن" وێنەکێشی تایبەتی لۆیس بوو. "لولی" مۆسیقا ژەنیش چەند پارچەیەکی بەجۆش و خرۆشی مۆسیقای ئۆپرای داهێنا. جگە لەم هونەرانە، سازکردنی چێشت و خواردەمەنیش لە سەدەمی لیسی چواردەدا ببووە هونەرێك. "ڤاتیل" کە سەرپەشیاری شێوسازان بوو، بەهۆی ناتەواویەکی هونەری لە بابەت جۆرێك لە جۆەکانی خواردن گیانی سپارد. شیاوی باسە "لۆیسی چواردە" تەنها مەبەستی ژیانێك نەبوو کە بەخۆشی و چێژەوە بژیت و تەواو، بەڵکو ئەم جگەلەوە ئاگاداری کارەکانی دەکردو هەڵدەستا بە خوێندنەوەی ئەو ڕاپۆرتانەی کە بالۆێزو دەسەلاتدارەکانی خۆی بۆیان دەنارد، هەروەها خۆی سەرپەرشتی ئەو دانیشتن و

کۆبونەوانەی دەکرد کە لەگەڵ گەورە وەزیران سازی دەدانو لەوێدا بڕیاری لەسەر سیاسەتی دەوڵەت دەدا لە کاتی جەنگو ئاشتی. هەروەك یاسای دادەڕشتو پیاوانی دەوڵەتی دادەمەزراند لە شوێنە جیاجیاکانی وڵات، چ وەك دەسەڵاتدار لەسەر ناوچەیەك، یاخود وەك فەرمانبەرێکی دەوڵەت.

## کۆلبێر 1619-1683:-

لۆیسی چواردە لە جێبجێ کردنی سیاسەتی ناوخۆیدا لەلایەن وەزیری بەناوبانگ "کۆلبێر" هاوکاری دەکرا. "کۆلیبێر" کوڕە بازرگانێك بوو، "مازارین" لە حکومەتدا دایمەزراندو بە پۆستەکاندا سەرکەوتو لە دوای مردنی مازارین بوو بە وەزیری سەرەکی لۆیسی چواردە. ئەم وەزیرە جگە لە جەنگ سەرپەرشتی تەوای وەزارەتەکانی دەکرد. کۆلبێر نۆبەرەی کارەکانی بەچاککردنی دارایی دەوڵەت دەست پێکرد. ئەم هەستا بە دەرکردنی هەرکەسێ کە بە ناپاکی کردن ناسرابێت لەکۆکردنەوەی باج دا. هەروەها باجی ناڕاستەخۆی سەپاند بەسەر کەلوپەلدا، بەو مەبەستەی قورسایی باج بکەوێتە سەرشانی سەرجەم چینەکانی وڵات. وە بۆ کەم کردنەوەی قورسایی لەسەر شانی جوتیاران، باجە ڕاستەوخۆکانی سەرزەوی‌و زاری سوککرد. جگە لەمە کۆلبێر برەوی دا بە بەخێوکردنی ئاژەڵی ماڵی‌و ڕێگەکانی‌و ئامرازەکانی هاتوچۆی چاککرد.

### برەو دانی بە بازرگانی‌و پیشەسازی:-

"کۆلبێر" بە پێویستی زانی بروبدات بە بازرگانی‌و پیشەسازی، بەهۆی ئەوەی هێزو توانای جەنگی پشت بەم دوو لایەنە دەبەستێ. باوەڕی وابوو گەلێکی هەژار ناتوانێ لە ڕێگەی باجەوە داراییەکی تەواوبدات بە حکومەت. هەربۆیە بە ئەرکی حکومەتی دەزانی کە بە هەر میکانیزمو ئامرازێك بۆی بلوێ ئابووری وڵاتەکەی ببوژێنێتەوە. لۆیسی چواردەش ڕەزامەندی لەسەر ئەمە نواند. کولبێر بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە بە

توانایییەکی بێ وێنەوە قوڵی لێهەڵماڵیو دەستی کرد بە پاداشت دانەوەی داهێنەرانو یارمەتی پێشکەشی هەرکەسێ دەکرد کە پرۆژەیەکی بازرگانی نوێی هێنابایە ئارا. هەروەها هانی کرێکارانی دەرەوەی فەرەنسای دەدا بۆ ئەوی لەفەرەنسادا کاربکەنو ڕێگەی گرت لە کرێکارە فەرەنسیەکان لەوەی ولآت جێبهێڵن. وە بۆ زیادکردنی ڕۆژانی کار، حەڤدە ڕۆژی لە ڕۆژانی پشوی هەڵوەشاندەوە کە لەناویاندا ژمارەیەك پشوی دێرینی تیادابوو. ئامانجی بەرزی کۆلبێر دروستکردنی ولآتێکی پیشەسازی بوو کە سەرجەم تاکەکانی سەرقاڵی کارکردن بن تیایدا.

کۆلبێر بانگەشەکاری مەزهەبی بازرگانی بوو، لەو بڕوایە دابوو کە ئەگەر بیەوێت فەرنسا بکاتە ولآتێکی دەوڵەمەند، ئەوا پێوستە هەناردەی زیاتر بێت لە هاوردە. ئەمەش لەڕێگەی زیادکرنی بەرهەمهێنانە خۆماڵیەکانو کەم کردنەوەی هاوردە کردن دهاتەدی. جا بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، کۆلیبێر برەوی دا بە پیشەسازیو بەرهەمە ناوخۆییەکانو کۆسپی خستە بەردەم هاتنە ناوەوەی بازرگانە بیانیەکان، هەروەها هاوکاری دارایی پێشکەش دەکرد بۆ دروستکردنی کەشتی لە ناوخۆی فەرەنساداو بارکردنی کەشتیە فەرەنسیەکان بە کەلوپەل. هەروەك باجی قورسی سەپاند بەسەر شتومەکی هاوردەکراوداو چەند مەرجێکی درێژی خستە سەر پیشەسازی فەرنسیو وای لێکرد بەرهەمەکە چاك بێتو سەرنجی بیانیەکان ڕاکێشێ بۆ کڕینی. کۆلبێر باوەڕی وابوو کە داگیرگەکان سودێکی بازرگانی گەورەیان تێدایەو دەتوانرێ بکرێتە بازاڕێکی گەرم بۆ کاڵای فەرەنسی. لەبەرئەمە دورگەی "مارتینك"و "کوادا لوب"ی لە هیندی خۆرئاوا کڕیو هانی نیشتەجێ بوونی فەرەنسیەکانی دەدا لە "کەنەداو لوێزیانا" لە ئەمریکای باکورو "سنت دومینکۆ" لە ئەمریکای ناوەڕاست. جگەلەمە ناوەندی بازرگانی لە هەریەکە لە "هیندو مەدغەشقەرو سەنیگال" دامەزراند. بەمەش فەرەنسا بووبە دەوڵەتێکی داگیرکاری گەورە.

وە لەڕووی بازرگانی ناوخۆی فەرەنسا، کۆلیبێر بە ئاسانکردنی هاتوچۆو گەیاندن‌و لابردنی گومرگ لە ناوخۆدا، کاری کرد بۆ ئاسانکردنی هێنان وبردنی کەلوپەل لەنێوان ناوچەکانی وڵات. کۆلیبێر لە هەریەکە لە "تۆلۆن ڕۆشفوردو وکالی‌و بریست هاڤر" بەندەرو وێستگەی دامەزراندو هەولێکی زۆریدا لە پێناوی بەهێزکردنی بواری دەریایی فەڕەنسی. هەر لەم نێوانەشدا چەند قوتاپخانەو کۆگاو جبەخانەیەکی بنیاتنا، ئەمەو جگە لە دروستکردنی کەشتی جەنگی فەڕەنسی. هەروەها دەریاوانانی ناچارکرد بۆ ماوەیەکی دیاری کراو لە ئاوەکانیان بمێننەوە. هەروەك فرمانی کرد بەدادوەران کە ژمارەیەکی گونجاو تاوانبارانی بۆهەنارده بکەن بەمەبەستی بەکارهێنانیان لەکاری صەوڵ لێداندا.

بەڕاستی کۆلیبێر پیاوی هەڵکەوتووی دارایی‌و ئابوری بوو. بەلام لەگەڵ ئەمەشدا دەسکەوتی لەبوارەکانی تردا هەیەو دەستکەوتی بوارەکانی تریشی کەمترنییە لەپڕۆژە دارایی‌و ئابوریەکانی. ئەوەتا دەبینین لەبواری زانستی‌و هونەریدا هەنگاوی ناوەو بە مەبەستی برەودان بەزانست وهونەرو مۆسیقا توانیویەتی چەندەها ئەکادیمیای زانستی یاخود پەیمانگەی فەڕەنسی"بەپێی گوتەی ئەمڕۆ" بنیات بنێ. ئەمجا فرمانی دا بە بەرزکردنەوەی ئاستی ئەکادیمیای فەڕەنسی کە ڕیشیلیۆ کاتی خۆی دایمەزراندبوو، هەروەها بەردی بناغەی نۆڕینگەی"مرصد" ئەستێرەیی لە پاریس دارشت. ئیدی بەهۆی کارەکانی کۆلیبێر، شێوە کارگێڕیەکەی ڕیشیلیۆ بەهێزتر بوو. وەلێ لەگەڵ هەموو ئەمانەدا کۆلیبێر خۆی لەبیرنەکردو زۆر گرنگی بەکاری تایبەتی خۆی دەداو، کاتێکی زۆری تەرخانکرد بۆ برەودان بەکارو بارەکانی. ئەمە بەشێوەیەك بوو کە کاتی لە ساڵی 1683لە دنیا دەرچوو سەروەت‌و سامانێکی زۆری بەجێهێشت، دوای ئەوەی وەك وەزیرێك نزیکەی بیست ساڵ خزمەتی وڵاتی کرد[1].

---

1 IBID;PP.323-364

## کەمووکورتیەکانی ڕۆژگاری لۆیسی چواردە

### پاشایەتـی ڕەهـا:ـ

سـەرەڕای ئـەوەی لـە سـەردەمی لۆیـسی چـواردە، بـەهۆی کارەکـانی کـۆلیبێر خۆشـگوزەرانی بلاّوبوویـەوەو کۆشـکی جـوان‌و قەشـەنگ بنیـات نـران. وەلێ شـتێکی ئاساییە ڕەخنەگەلێکی زۆر لە سیاسەتەکەی بگیرین. یەکێ لەوانە پادشـایەتی ڕەهایـە. کاتێك سـەیر دەکـەین لەپاشـایەتی ڕەهـادا هـەموو شـتێك بەسـتراوەتەوە بـە ویـستو مەبەستی پاشا، تاکە کەسێکەو هەردەم کەسێکی باشە، لەمەشدا کەم‌و کورتیـەکی زۆر هەیە. هیچ کەس ناتوانێ کاروباری وڵات بەڕێوەبـەرێ هەرچـەندە کەسـێکی لێوەشاوە بێـت. لـۆیس لەگـەڵ ئـەوەی کەسـێکی بـەتواناو چـالاك بـوو، بـەلاّم زۆر خۆهـەڵکێش‌و لەخۆبایی بوو. بەشەیدا بوونی بۆ سـەرکەوتن بـەلاّو کارەسـاتی توشـی فەڕەنسا کـرد. لـۆیس پـەی نـەدەبرد بـەو کێـشانەی کـە ڕووبـەڕووی دەبوویـەوە. ئـەم بـە لـە دەورهەڵـسوڕن‌و مـەرایی کردنـی ئـەو خەڵکـە کاڵفامانـەی دەورەیـان دابـوو، بەئاسـانی لەخشتەدەبرا. تەنانەت هەندێ جار لۆیس بەبیرو بۆچونەکانی ئەوان هەنگاوی دەنا.

### چەوساندنەوەی پرۆتستانتەکان:ـ

سیاسـەتی ئـاینی لۆیـسی چـواردە یەکێکـە لـە کەموکورتیـەکانی ڕۆژگارەکـەی. "پرۆتـستانتی یـان هیگۆنـۆت" کەمایەتیـەکی کـەم بـوون لـە فەڕنسا، بـەلاّم پیـادەی دەسەلاّتێکی گەورەیان دەکرد. ئەمانە بەهرەمەنـد بـوون لـەو بەربژاریانـەی کـە هنـری چوارەمی یەکەم پاشای بنەماڵی بۆربۆون لەساڵی 1598 پێـی بەخـشین. لـۆیس لـەم سەرو بەندەدا بەشێوەیەکی تر بـیری دەکـردەوەو حـەزی لـە یەکیـەتی ئـاینی بـوو لـە فەڕەنسا، لەبەرئـەوە سیاسـەتی چەوسـاندنەوەی هیگۆنۆتـەکانی گرتەبـەرو ئەوانەشـی دەبەخشی کە دەستبەرداری ئاینزاکـەیان دەبـوون‌و کاسـۆلیکیەتیان پەسـەند دەکـرد. بەم شێوەیە کارەکان ڕۆیشتن تا لـە سـاڵی1685 فرمـانی "نانـت"ی هەڵوەشـاندەوە،

بەمەش سەربەستی پەرستشکاری لێ قەدەغەکردن. هەربۆیە فەڕنسا لە کایەی کێبڕکێو پێشکەوتن ڕوەو ئازادی ئاینی دواکەوتو ئەو ژێرخانە ئابوریەی تێکشکا کە کۆلیبێری مەزن بنیاتینا. ئەمەش بەهۆی ئەوەی هیگۆنۆتەکان چینێکی بەرهەمهێن بوونو زۆرینەیان لە چینی ناوەڕاست بوونو بەهۆی ئەو ستەم زۆرداریەی لە دژیان پیادەکرا ناچاربوون ولآت جێبهێڵنو ڕووەو هۆڵنداو ئینگلتڕاو پڕوسیا ڕەوبکەن. تەنانەت ژمارەیەکی بەرچاویان چوونە پاڵ ئەو سوپایانەی کە لە دژی لۆیسی چواردە لە جەنگ دابوون. ژمارەی کۆچکردوە پڕۆتستانتەکان بە هەشت سەد هەزار کەس دەخەملێندریو بە کۆچکردنیان باری ئابووری فەڕنسا داڕوخاو هەریەکە لە هۆڵنداو ئینگلتڕا لە ڕووی ئابووریەوە بۆڕیان دایەوە.

## ناکۆکی لەگەڵ پاپاو لەناوبردنی جانسینیەکان:-

لەسەر کێشەیەکی بچوك ناکۆکی لەنێوان لۆیسو پاپا سەریهەڵدا. کێشەکەش خۆی دەبینیەوە لەو باجانەی کە لۆیس لە پیاوانی ئاینی وەردەگرت لەو کاتەی لە پۆستێکی کڵێسا دای دامەزراندن. جا پاپا ڕایگەیاندو ئەوەی بەمافی خۆی دەزانی، نەوەك مافی لۆیس. ئەم کێشەیە لە جوغزی گفتوگۆ نەمایەوەو سەری کێشا بۆ ناو دەستورو بوو بەپرسێك بەوەی ئایا پاپا مافی ئەوەی هەیە دەست لە کاروباری حکومەتی فەرەنسیو حکومەتەکەی وەربدات؟. بەمە ناکۆکی نێوان کڵێسای کاسۆلیکیو حکومەتی فەرەنسی توندتر بوو. لەم کاتەشدا داواکاری بۆ لەیەکتری جیا کردنەوەی کڵێسای فەرەنسی لەپاپای ڕۆما زۆربوو. فەرەنسیەکان گەرەکیان بوو کڵێسایەکی سەربەخۆ لەسەر شێوازی ئینگلترا بنیات بنێن، لەم نێوانەشدا کۆمەڵێك لە پیاوانی ئاینی پشتیوانی لۆیسی چواردەیان دەکرد. ئەوەبوو لە ساڵی1682 ئەنجومەنی ئەکلێرۆس ی فەرەنسی فەرمانێکی ڕاگەیاندو بەپێی فەرمانەکە:

1–پادشا لەمەڕ کاروباری دنیایی سەربەخۆیە لەپاپا. 2–ئەنجومەنی پاپەوی بالاترە لە پاپا. 3– ئەو بڕیارە پاپەویانە پووچن گەر پێچەوانەبن لەگەڵ نەریتی کلێسای فەرەنسی. 4–پێویستە ڕەزامەندی پیاوانی ئاینی لەسەرجەم بڕیارە پاپەویەکان وەربگیرێ.

ڕاگەیاندنی ئەو فەرمانە بووبە هۆی توندتربوونی ناکۆکی نێوان لۆیسی چواردەو پاپا "ئانوسنیتی" یازدە. ئەم ڕەوش و پەیوەندیە بارگرژە بۆ ماوەی یازدە ساڵ بەردەوام بوو. بەڵام ئەو جەنگە زۆرانەی لۆیسی چواردەیان بەخۆیانەوە خەریك کرد، بووە هۆی ئەوەی لۆیس بڕیاری سەربەخۆکردنی کلێسا هەڵبوەشێنێتەوە. هەرچۆنێك بێت "لۆیس" توانی ڕەزامەندی پاپا بەدەستبهێنێت بۆ کۆکردنەوەی باجی سەپێنراو لەسەر پیاوانی ئاینی لە کاتی دامەزراندیاندا و، پاپا ئەوەی بەمافی پاشا دانا لە کاتێکدا بنەچەی ناکۆکیەکانیان بوو.

بەلام ناکۆکی ئاینی هەر کۆتایی نەهات، ئەمەش کاتێك لە هەناوی کلێسای کاسۆلیکی ئاینزایەکی تر سەریهەڵدا بەناوی "جانسینەکان". ئەوانە شوێنکەوتەی "کورنیلس جانسن" بوون، کە یەکێ بوو لە زاناکانی لاهوت"خوداناسی"لە هۆڵندا لە سەدەی حەڤدە. "جانسن" کتێبەکانی "سانت ئۆگستین"ی– خوێندبوویەوەو گەیشتبووە ئەو ئاکامەی کە کالڤن لەمەڕ ئیمانو باوەڕ پێی گەیشتبوو. بەومانایەی کە باوەڕ بەناچاریو قەزاو قەدەرو ئیلهامە. ئەم بیروڕایە لەگەڵ بیروباوەڕی یەسوعیەکان تێکدەگیرا، کاتێ ئەوان باوەڕیان وابوو مرۆڤ ڕزگاربوونی دەستگیردەبێ لە ڕێگەی ئەنجامدانی کرداری چاکەوە، ئەمەش لە ژێر ویستی ئازادی خۆیو بەسەرپەرشتی قەشە دێتەدی. جانسینەکان لە سادەژینیو دەستگرتنیان بە ئاکارە بەرزو پەسەندەکانو جەخت کردنەوەیان لە کەم کردنەوەی خەرجیەکان، لە کالڤینیەکان دەچوون. هەربۆیە چینی ناوەڕاست بەلایاندا دەهاتن. بەڵام کەوتنە بەردەم هەڕەشەو بنبڕکاری یەسوعیەکان.

پاپا دەستی کرد بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست لە دژی جانسیەکانو ناچاری دەکردن دەستبەرداری زۆرێك لەبیروباوەڕەکانیان بن. ڕیزەکانی پارچە پارچە دەکردن لە سەردەمی لۆیسی چواردە. "لۆیس" هەرگیز بواری نەدەدا هیچ بزوتنەوەیەکی ئاینی سەرهەڵبدات. هەروەك کۆمەڵەی هادیئیەکانی لەناوبرد، ئەوانەی پێداگیریان دەکرد لەسەر خۆشەویستی خوداو ڕۆچوون لەخۆشەویستیداو بیرکردنەوەی قوڵ لەجیاتی ڕزگاربوون. لۆیسی چواردە ڕابەرانی ئەم ئاینزایەی وەك "فینیلون، مدام گۆیان"ی ناچارکردو ئەوانی خستە دوورییانی دەستهەڵگرتن لەپۆستەکانیان یاخود گەڕانەوە سەر بیروباوەڕی پێشوویان. ئەم بزوتنەوەیە نوشستی هێنا هەروەك چۆن جولانەوە ئاینیەکانی تریش شکستیان هێنا.

لۆیس ئەوەندەی پەرەی بە بەرژەوەندی بنەماڵەی بۆربۆن دەدا ئەوەندە گرنگی بەوڵاتەکەی نەدەدا. لۆیس زۆر شەیدای ڤێرسای بوو، هەڵدەستا بەسازکردنی کەرنەڤاڵو ئاهەنگ تیایداو خانەدانانی بۆ بانگهێشت دەکرد. حەزکردنی لۆیس بۆ ڤێرسای گەیشتە ڕادەیەك کە جگە لەخۆی گرنگی بە ژانو ژینی کەس نەدەدا، بەمەش ڕەچەیەکی خراپی بۆ ئەوانەی دوای خۆی کردەوە. کاتێك دەبینین ئەوانەی پێش "لۆیسی چواردە" بەناو فەرەنسادا دەگەڕان بە مەبەستی لە نزیکەوە بینینی بارودۆخی خەڵکی، بەلأم ئەوانەی لە دوای "لۆیسی چواردە"وە- هاتن بەهیچ شێوەیەك ڤێرسایان بەجێنەدەهێشت.

ئیدارەی وڵات بەئەوەوە بەسترایەوەو دەسەڵاتی ڕەهای بەرەو لوتکە دەڕۆی. لۆیس لە کۆتاییەکانی ژیانی کەسانی ناشیاوی دەکردە دەسەڵاتدار لەهەرێمەکانو گوێی بەسکاڵای خەڵکی نەدەدا لەدژی ئەوان. "لۆیسی چواردە" بەبێ ئەوەی لایەنە ئەکتیڤەکانی دەسەڵاتی خۆجێی بزانێ، سیستەمی ناوەندی بەلاوە پەسندتربوو. بەمەش گیانی داهێنانکاری لە ناو خەڵکی خامۆشکرد. ئەم باوەڕی وابوو کە ئەگەر حکومەت کار نەکات، ناگونجێ لەلایەن خەڵکانی ترەوە ئەنجام بدرێ.

سەرەڕای ئەوانەی باسمان کردن "لۆیس" لەهەمبەر خەڵکی بێ پەروابوو، هیچ هەوڵی نەدەدا بۆ لابردنی قورسایی دارایی لەسەر شانی گەلی فەرەنسی. جەنگە زۆرەکانیو ئەو خەرجیانەشی کە لە بنیاتنانی ڤێرسای سەرفی دەکرد، خەزێنەی دەوڵەتی توشی کورتهێنان کرد. هەرچەندە لۆیس هەوڵی دەدا باجەکان بەشێوەیەکی دادگەرانە گشت چینو توێژەکان بگرێتەوە، بەڵام چینی دەولەمەندەکان لەخانەدانانو پیاوانی ئاینی بەخشرابوون لەم باجانەو هەر چینی ناوەڕاستو هەژاران بوون خەرجیەکانی "لۆیسی چواردە"یان- کەتبووە ئەستۆ، کە لە ئاکامی دا بەفەتارەت چوونی گەلی فەرەنسی لێکەوتەوە.

جگەلەمە لۆیسی چواردە دەستکاری لایەنی ژیاری فەرەنسی کرد لە بواری وێژەو هونەرو ئارەزووەکانو لە بواری ڕەفتارە بەرزە کۆمەڵایەتیەکان. لەم نێوەندەدا هەستا بەدانانی چەند یاسایەك لە بارەی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی ڕاستودروست لە دەربارو کۆمەڵە یاسایەکی تریشی دانا بۆ ڕێکخستنی خوونەریتە شارستانیەکان، کەدواتر بەنەریتی لۆیسی چواردە ناسرا. هەروەها چەند یاسایەکیشی بۆڕێکخستنی بازرگانی کۆیلە داڕشت. ئیدی شارستانیەتی فەرەنسی لە ئەوروپادا بلاوبوویەوەو زمانی فەرەنسی وەك زمانی وێژەو دیبلۆماسی شوێنی زمانی لاتینی گرتەوە.

## سیاسەتی دەرەوەی لـــۆیـــس:-

یەکێکی تر لە ناتەواویو کەموکورتیەکانی ڕۆژگاری لۆیسی چواردە، بریتی بوو لە جەنگە زۆرەکانی، ئەو جەنگانەی کە داهاتو دارایی دەوڵەتی بەهەدەرداو هێزی لە گەلی فەرەنسی بڕی. سیاسەتی دەرەوەی لۆیس لە دوو بواردا خۆی دەبینیەوە کە بریتین لە 1-گەیشتن بەسنوری سروشتی، ئەمەش بە مانای گەیشتن بە چیاکانی ئەلپو بڕانس لە خۆرهەلاتو باشوروی فەڕەنسا، هەروەها ڕووباری ڕاین لە خۆرهەلات. 2- بەهێزکردنی پێگەی دەسەلاتی بنەماڵی بۆربۆنو بەرزکردنەوەی ناوو ناوبانگیان

لەسەرحیسابی بنەماڵەی هبسبرگی نەمساوی‌وئیسپانی. جا لەپێناوی بەدی هێنانی ئەم ئامانجانە لۆیس لەنێوان سالآنی 1667-1713 زنجیرەیەك جەنگی هەڵگیرساند.

## جەنگەکانی لۆیسی چواردە:-

لۆیسی چواردە پیاوێکی سەربازی نەبوو، وە لەژیانیشیدا بە جل‌و بەرگی سەربازی دەرنەکەوتووە، هەروەك پێشەوایەتی سوپاکەیشی نەکردوە بەرەو گۆڕەپانی جەنگ، هیچ شتێکیشی سەبارەت بەزانستی سەربازی نەزانیوە. بەڵام ئەم ناتەواویەی پڕکردەوە بە هەڵبژاردنی باشترین کەسە سەربازیەکان بۆ وەزارەتی جەنگ‌و سەرکردایەتی کردنی سوپا. لە وەزارەتی جەنگدا لۆیسی چواردە " لوڤوا"ی خستە سەرکار 1641-1691. "لوڤوا" لە بەڕێوەبردنی کاروباری سەربازی هیچی کەمتر نەبوو لە "کۆلیبێر" لە بەڕێوەبردنی باری دارایی فەرەنسا. واتا:"وەك چۆن کۆلیبێر شارەزابوو لە بەڕێوەبردنی باری دارایی، بەهەمانشێوە "لوڤوا" شارەزابوو لە سەروکاری کردنی کاری سەربازی". تەنانەت لە مێژووی ئەوروپای نوێدا ئەم یەکێکە لە گەورەترینی وەزیرانی جەنگ.

"لوڤوا" سوپایەکی دامەزراند کە باشترینی سوپاکانی ئەوروپا بوو لەم ڕۆژگارەداو تەیاری کردن بەسەرجەم پێداویستیەکانی جەنگی‌و بە ڕێکخستنێکی توندوتۆڵ ڕێکیخست. ئەمجا مەشقی ئەم سوپایەی دا بە باشترین مەشق‌و ڕاهێنان‌و ژیانی سەربازی خێوەتگەکانی تەندروست کردو پێشکەوتن‌و بەرزبوونەوەی لەسەر بنەمای لێهاتوویی‌و تواناداری دانا، نەوەك لەسەر بنەمای لایەنگری لێکردن.

یەکێکی تر لە ئەندازیارە سەربازیەکان "ڤوبان" بوو، کە ناوبانگی هەبوو لە دارشتنی نەخشەی بەرگری جەنگی‌و لە بنیاتنانی قەلآی بەهێز لە سنووری باکورو خۆرهەلآتی فەرەنسا. جگە لەوانە"کۆندی‌و تۆرین" بەناوبانگترین سەرکردە بوون لەنێو

سەرکردەکان. ئەم جووتە سەرکردەیە لە جەنگی سی ساڵە دا چەند سەرکەوتنێکی بێ وێنەو لە ڕادەبەدەریان بە دەستهێنا بۆ فەڕنسا.

لۆیسی چواردە مەزنترین دیبلۆماتکاری سەردەمی خۆی بوو، بەهاوکاری "کۆلیبێر، لۆڤوا" توانی سیاسەتی دەرەوەی جێبەجێ بکات. کاتێ لۆیس لە ساڵی 1661 هاتە سەرتەخت، ئیسپانیا لە خۆرهەڵاتی فەڕنسا فەرمانڕەوایی بەلجیکاو هەرێمی "فرانش ، کونتی" دەکردو بەسەر میلانۆشەوە دەسەڵات داربوو لە باکوری ئیتاڵیا. لەملاشەوە بنەماڵەی هبسبرگی نەمساوی فەرمانرەوایی ویلایەتەکانی "ڕاین"ی دەکرد لە سنورەکانی خۆرهەڵاتی فەڕەنسا. "لۆیسی چواردە" بۆ پاساودان بەجەنگەکانی جەختی دەکردەوە لەسەر سنوری سروشتی لە چیاو ڕوبارو دەریاچەکان، ئەمەشی بۆیە دەهێناوە چونکە کاتی خۆی فەڕەنسا دەورە درابوو بەسنوری سروشتی. ئەم سنورەش خۆی دەبینیەوە لە چیاکانی "ئەڵپ ، بڕانس"و ڕوباری "ڕاین"و زەریای "ئەتڵسی". جا بەپێی ئەمە لەسەر فەڕەنسا پێویستبوو ئەم زەویانە بگێڕێتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی فەڕنسا نەماوە لەجوغزی ئەم سنورەدا. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش لۆیسی چواردە خۆی خستە نێو چوار جەنگی گەورە. ئەمانەش بریتین لە جەنگی "گوێزانەوە، جەنگی دژبە هۆڵندا، جەنگی دەستەی ئۆکسبرگ، جەنگی دژ بە ئیسپانیا".

## جەنگی گوێزانەوە"حرب الانتقال" 1667-1668:-

کاتێك فیلپی چوارەمی پاشای ئیسپانیا لە ساڵی 1665 مرد، لۆیسی چواردە بانگەشەی ئەوەی کرد کە خێزانەکەی کچی فیلپی چوارەمە، بۆیە پێویستە زەویەنزمەکانی ئیسپانیا بۆ ئەوبێت" بەپیی ئەو ڕێکەوتنەی کە پێشتر واژۆکرا، کچی فیلپی چوارەم درایە لۆیسی چواردە". لەمەشدا دەیویست ئەم ناوچەیە بلکێنێ بەفەرەنسا. ساکاتێکیش ئیسپانیا ئەوەی ڕەت کردەوە، جەنگ لەنێوان هەردوولا دا هەڵگیرساو فەڕەنسا سەرکەوتنی بەدەستهێنا. فەڕەنسا توانی بێلایەنی هۆڵنداو سویدو

ویلایەتــە پرۆتــستانتیەکانی ئــەڵمانیا بەدەســتبێنێ. هــەروەها هەڕەشــەی لــە ئیمپراتۆریەتی نەمساوی کرد بەجەنگی ناوخۆ، ئەگەربێتو بۆ پارێزگاری ئیسپانیا خۆی بخاتە جەنگ. لەم ماوەیەشدا واتا لە ساڵانی 1665–1667ئینگلترا لە جەنگی بازرگانی دابوو لەگەڵ هۆڵندا لە ئەمریکاو زەریای باکور. دەوڵەتانی ئەورووپاش مەترسیان هەبوو لە فراوانخوازیەکانی فەرەنسا، لەبەرئەوانە هۆڵندا جیاوازیەکانی لەگەڵ ئینگلترا کۆتایی پێهێناو هاوپەیمانیەکی سیاسی پێکهێنا. کە پێکهاتبوو لە سویدو هۆڵنداو ئینگلیرا، بەمەبەستی هەلوێست وەرگرتن لەبەرامبەر لۆیسی چواردەو گێڕانەوەی هاوسەنگی نێودەڵەتی. بەمەش لۆیس ناچار بوو داوای ئاشتی بکات. ئیدی ولاتانی شەڕکەر کۆبوونەوەو پەیمانی "ئەکسی لاشبیل" بەسترا لە ساڵی 1668. بەپێی ئەم پەیمانە فەرەنسا بەشی باشووری بەلجیکاو کۆمەڵێ شاری قایمی پێدرا کە بریتی بوون لە "لیل ، تورینە، شالروا". بەلام بەشی گەورەی بەلجیکا لەژێر دەسەلاتی ئیسپانیادا مایەوە.

## دووەم: جەنگ لەدژی هۆڵندا:ـ 1672 –1678:ـ

لۆیسی چواردە فرمانی بەسوپاکەیدا هێرش بکەنە سەر هۆڵندا، بەو بیانوەی لە جەنگی فەرەنساو ئیسپانیادا، هۆڵندا لە دژی فەرەنسا ڕاوەستاوەو دەوڵەتانی لێ وەرژاندوە "ولاتانی لەسەر کۆکردبویەوە". بەلام لە ڕاستیدا بەمەبەستی گەیشتن بە ڕوباری "ڕاین"، لۆیس دەیویست هەندێ لە زەویەکانی هۆڵندای وەچنگ کەوێ. "لۆیسو کۆلیبێر" لەو باوەڕەدابوون کە چینی بازرگانی فەرەنسی کەڵکوسودی زۆر دەبینێ، ئەگەر بێتو قۆرغکاری بازرگانی هۆڵندا لە ناوبرێ. لەملاشەوە هۆڵندا نەیدەویست فەرەنسا لەتەکی دابێتو دراوسێی بێت بەتایبەت لە دوای سەرهەڵدانی کێرکێی توند لە نێوان هەردوولایاندا. لەم سەرو بەندەدا کۆلیبێر هەستا بە دامەزراندنی پڕۆژەی گەورە لە فەرەنسا، لەمەشدا دەیویست قۆرغکاری بازرگانی هۆڵندا تێکبشکێنێ. هەروەها لۆیس هەوڵیدا بە هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانی سێینە"سوید،

ئینگلتەڕا، هۆڵندا"، هۆڵندا گۆشەگیر بکاتو بەتەنیا بیهێڵێتەوە. بۆئەمەش لە ساڵی 1670 پەیمانی ژێربەژێری لەگەڵ ئینگلتڕا بەست. بەگوێرەی ئەم پەیمانە "لۆیسی چواردە" ساڵانە بڕی دووسەدهەزار پاوەندی ئیسترلینی دەبەخشێ بە پادشای ئبینگلتڕا، لەبەرامبەردا "چارلس" ئاینزای کاسۆلیکی پەسەند بکاتو بیسەپێنێ بەسەر گەلی ئینگلیزیو لە هاوپەیمانی سێینە پاشکشە بکاتو بێ لایەن بوەستێ. لەراستیدا ئەم برە پارەیە کە درا بەچارلس بۆئەوەش بوو کە چارلس بۆ خەرجیەکانی پێویستی بە پەڕلەمان نەبێت". بەهەمانشێوە لۆیس توانی سوید بێ لایەن بکات، ئەمەش دوای ئەوەی بڕێکی بەرچاو دارایی پێشکەش کرد. بەمەش هۆڵندا بە تەنها لە گۆڕەپانەکەدا مایەوە. هۆڵندا لەناوەوەدا بەهۆی کێبڕکێی ناوخۆیەوە توشی دووبەرەکیو لێکجودایی هاتبوو. ئەم دووبەرەکیە لەنێوان شوێنکەوتوانی بنەماڵەی "ولیەم ئۆرنج"و لایەنگرانی "جۆن دی ویت" دابوو. لایەنگرانی ولیەم ئۆرنج ئەوانە بوون کە دەیانویست پادشایەتی بگێڕنەوە وڵات. ئەمانە لەلایەن دانیشتوانی لادێکانو بەشێکی خانەدانان وپیاوانی ئاینی پشتیوانیان لێ دەکرا. لەملاشەوە "جۆن دی ویت" کە سەرۆکی کۆماربوو، لەلایەن چینی ئەرستۆکراتیو لیبرالەکانو خەڵکی شارەکان پشتیوانی لێدەکرا. بەڵام بەسەرهەڵدانی "ولیم ئۆرنج" "با" بەلای پادشاخوازەکان هەڵیکردو ڕەوشەکەبەلای ئەواندا شکایەوە.

لە هەمانکاتداو لە ساڵی 1672 لۆیسی چواردە جەنگی لە دژی هۆڵندا ڕاگەیاندو دەستیگرت بەسەر هەرێمی "لۆرین"، بەو بیانوەی میری ئەو هەرێمە هاوکاری هۆڵندیەکان دەکات، دوای ئەوە ڕووی کردە ئەمستردام. لەم کاتەشدا "جۆن دی ویت" لەلایەن هۆڵندیەکان کوژراو "ولیم ئۆررنج"ی– لە جێگەداندرا. "ولیەم ئۆرنج" فرمانی دا بەکردنەوەی بەربەستەکان، کە بەهۆیەوە ناوچەیەکی گەورەو فراوانی باکوری هۆڵندای بەئاو داپۆشی، ئەمەش هەڵکشانی سوپای فەرەنسی وەستاندو، وەستانەکەشی کردە کارێکی پێویست.

ساکاتێکیش لۆیس مەرجەکانی هۆڵندای بۆ ئاشتی ڕەفز کرد، هۆڵندیەکان لەگەڵ ئیمپڕاتۆر "لیوپۆڵد" ئیمپراتۆری نەمساو میری براندنبرگ"پڕوسیا" پێکهاتن لەسەر پێکهێنانی بەرەیەکی سەربازی هێرشبەری. دوای ئەوە ئەوەندەی نەبرد ئیسپانیاو هەندێ میرنشینی ئەڵمانیای باکور هاتنە ناو ئەم هاوپەیمانیەتیەوە. کاتێکیش فەرەنسا دەوڵەتی سەرکەوتووبوو لە کایەکەدا، ئینگلترا چوویە ناو جەنگ بەلایەنگری هۆڵنداو لە دژی فەرەنسا، چونکە ئینگلیزەکان وایان دەبینی کە فەرەنسا تاکە هێزی گەورەی وشکانیە کە بتوانێ کێبڕێیان لەگەڵ بکات لە بازرگانیو داگیرکاریدا. بەلام هۆڵندایەکی بچوکیان بە جێگەی مەترسی نەدەزانی، بەمەش لۆیس ناچاربوو پەیمانی ئاشتەوایی ناسراو بە "نیموینگ" لە ساڵی 1678 ببەستێ، کە پەیمانەکە لۆیس دانی نا بەسەربەخۆیی هۆڵندا. بەلام هەرچۆنێك بێت هەرێمی "لۆرینو فرانش کونتیە"لە ئیسپانیای چنگ کەوتو هەندێ قەڵاوپێگەشی لە بەلجیکا دەستکەوت. وە لەهەمان کاتیشدا میری براندنبرگ "پروسیا" ناچار بوو دەستبەرداری سەرجەم ئەو شوێنانە بێت کە دەستی بەسەرداگرتبوون لەپومیرانیا بۆ سوید بەگوێرەی پەیمانێکی تر لەهەمان ساڵدا، کە بە پەیمانی "سان جرمان" ناسرا.

لۆیس بەئاراستەی ڕاین هەرێم وناوچەیەکی زۆری دەستکەوت، هەرچەندە نەیتوانی تۆڵە بستێنێ لە هۆڵند. لە دەرەنجامی ئەم جەنگە خەزێنەی فەرەنسا توشی نابوتی هاتو "تۆرین" کە بەناوبانگترین سەرکردە سەربازییەکانی فەرەنسا بوو لە کۆتایی جەنگەکەدا کوژرا. لەملاشەوە "کۆندی" بەهۆی خراپبوونی باری تەندروستی لە کارو فرمان دوور کەوتەوە.

## جەنگی دەستەی ئۆکسبرگ 1689-1698

لۆیسی چواردە فرمانی کرد بەدەستوپەیوەنیەکانی کە لێکۆڵینەوەبکەن لەسەر تۆمارە فیودالیەکان، بۆ سەلماندنی ئەوەی کە هەر شوێنێك ڕۆژێك لە ڕۆژان سەر بەپاشای فەرەنسا بوبێتو ئەمڕۆ کەوتۆتبێتە ژێر دەستی وولاتێکی تر. واتا:"پارچە

خاکێکی ولاتێکی هاوسێ پێشتر هی فەڕەنسا بووبێ". لەسەر ئەو ئەساسە لۆیسی چوارده کۆمەڵەیەکی دروستکردو ناوی لێنان کۆمەڵەی گێڕانەوە، بۆگێڕانەوەی موڵکەکانی فەرەنسا. ئەم کۆمەڵەیەپێکهاتبوو لەو دادوەرانەی کە سەر بە لۆیسی چوارده بوون.

لەسەر لێکۆڵینەوەکانیان "لۆیس" بانگەشەی ئەوەی کرد کە شاری "سترازبرگ"ی ئازاد لە هەرێمی ئەلازاسی ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز لە بنەڕەتدا شارێکی فەرەنسیە. پاشان لە ساڵی 1681 سوپای فەرەنسی داگیریکرد هەروەك بەقۆستنەوەی هەلی بۆ ڕەخساو بەهۆی هێرشی سوپای عوسمانیەکان لەم کاتەدا بۆسەر ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆزو گەمارۆدرانی ڤیێننا لەلایەن عوسمانیەکانەوە، لۆیسی چوارده"لۆکسمبۆگ"و ژمارەیەك شاری ئەڵمانی داگیرکرد. ئیمپراتور لیۆپۆلد لەساڵی 1686 توانی هاوپەیمانیەتێك پێکبێنێ لەهەریەکە لەئیسپانیاو سویدو هەندێ لە میرنشینەکانی ئەڵمانیا "سەکسۆنیا- پاڤاریا-پلانتینات لەسەر ڕین-ساڤۆیی ئیتاڵیا". لۆیس لە داگیرکردنی پلانتینات داوای مافێکی ناڕەوای دەکرد لەم ناوچانەدا. لەم کاتەدا شۆڕشی ساڵی1688 لە ئینگلترا هەڵگیرساو "جیمس ی دووەم" تێکشکاو پەنای برد بۆ فەرەنسا، ولیەم ئۆرنج ی حاکمی هۆڵنداش بەناوی "ولیەمی سێیەم" بووبە پاشای ئینگلترا*. "ولیەم ئۆرنج" دوژمنێکی سەرسەختو ڕکەبەرێکی سەرڕەقی لۆیس بوو، خێزانەکەی کچی پاشای لادراوی ئینگلترا" جیمس" بوو. بەمە هۆڵنداو ئینگلترا لەژێر فەرمانڕەوایەتی یەك پاشادا یەکیگرتو ناکۆکیە بازرگانیەکانی نێوانیان کۆتایی پێهاتو بەیەکەوە چوونە جەنگ کردن لە دژی لۆیسی چوارده. جەنگ کردن بەردەوام بوو بۆماوەی هەشت ساڵو شێوە جەنگێکی جیهانی بەخۆیەوە گرت، بەهۆی ئەوەی هێزی وولاتە بەشەڕ هاتووەکان سەرەڕای ئەوروپا، لە دەریاکانو لە ئەمریکاش تێکهەڵدەچوون. ئەم جەنگە لە ئەمریکا ناونرا جەنگی شا "ولیەم". لۆیسی چوارده بەڵێنی دابوو بەجیمسی دووەم کە یارمەتی بدات بۆ گێڕنەوەی تەختەکەی، هەربۆیە

---

* ئەمە لەبەشی هەشتەم بەڕوونی باسی لێوەکراوەو بەدرێژی شرۆڤە کراوە..

جـیمس بەسـەرکردەیی سـوپایەك لـە ئێرلەنـدا لـە سـاڵی1690 دابـەزی، بـەلاّم لـە تێکهەڵچونی "پوین" تێشکا، کە لە نێـوان خـۆیو ولیـەم ئـۆرنج هەڵگیرسـا. سـەرەڕای هەنـدێ سـەرکەوتن کـە فەرەنـسیەکان لەسـەرەتای جـەنگ لـە کیـشوەری ئـەوروپا بەدەستیان هێنا، بەلاّم لە دوای ئەوە بـارودۆخی جـەنگ گۆڕنی بەسـەرداهاتو نەمـسا بەسایەی سـەرکردە "بـوجین" مـیری سـاڤۆی سـەرکەوتو لـۆیس ناچـار بـوو پـەیمانی "ڕیزویك" ببەستێ لەگەڵ هاوپەیمانان لەساڵی1697. بـەگوێرەی ئـەم پەیمانـە لـۆیس هیچ قازانجێکی نەکردو دەستی هەڵگرت لە داواکانی لەهەرێمی پلاننتینات لەسـەر ڕایـنو هەرێمی لۆرینی گێڕیەوە بۆ میرەکەی. هەروەك ڕێگەی دا بە هۆڵندیەکان کەقەلاّو بـورج دروستبکەن لەسـەر سـنوری فەرەنـسا، وە لەگەڵیـشیان پـەیمانێکی بازرگـانی بەسـت. لەملاشەوە دانی هێنا بەپاشایەتی ولیەم ی سـێیەم بەسـەر ئیـنگلتراو بـەڵێنی پێـدا کـە لەدژی ئەوهاوکاری جیمسی دووەم نەکات. بەلاّم هەرچۆنێك بێت شـاری "سـترازبرگی" لە هەرێمی ئەلازاس بۆخۆی هێشتەوەو پاراستی.

بەم شێوەیە دەبینین کە بەهاتنی دە ساڵی کۆتایی سەدەی حەڤـدە، فەرەنـسا لـە پێـشڕەوی کردنـی ئـەوروپا جێگـەی ئیـسپانیای گرتـەوەو بنەماڵـەی بۆربـۆن بـووە هاوئاستی بنەماڵەی هبسبرگو فەرەنسا لەلای ڕۆژهەلاّتیەوە فراوان بوو بـەبێ گەیـشتنی بەڕووباری ڕیـنو شـاخی بـرانس، سـەرەڕای دەسـتگرتنی بەسـەر "ئـەلازاسو فـرانشو کۆنتە". بەلاّم ئەمە بووە هۆی مایەپوچ بوونی خەزێنەی فەرەنسیو خـەڵکی سـکالاّیان دەکرد لە دەسەلاّتی ڕەهاو داوای چاکسازیان دەکرد لە سیستەمی دەسەلاّتی ولاّت.

## جەنگی ویراسەی ئیسپانیا1701-1713:-

ماوەیەکی کەم تێنەپـەڕی بـوو بەسـەر پەیمانبەسـتی ڕیزوریـك، کەلۆیـسی چـواردە هەلێکی باشو لەباری بینی بۆ مەبەستی لاوازکردنی بنەماڵەی هبسبرگو کردنی روباری ڕاین بەسنوری فەڕەنسا. چارلسی دووەم ی پاشای ئیسپانیا پیاوێکی نەخۆش بوو لـەو کاتەوەی لەدایك ببوو، هیچ کوڕێکیشی نـەبوو لـە دوای مردنـی جێگـەی بـۆ بگرێتـەوە. هەریەکەش لە لۆیسی چواردەو ئیمپڕاتۆری نەمساوی لیوپۆڵد بانگەشـەیان دەکـرد بـۆ جێگرتنەوەی تەختی ئیسپانی، واتا:"هەم لۆیس تەختەکەی بەمافی خۆی دەزانی هـەم

لیوپۆڵد". لۆیس پاساوو بیانوی جێگرتنەوەی تەختەکەی بەوە دەهێنایەوە کە دایکی "دایکی لۆیسی چواردە" خوشکی فیلپی چوارەمەو خێزانیشی کچیەتی و خوشکی چارلسی دووەمی پاشای نەخۆش و دەردەداری ئیسپانیایە. لەملاشەوە ئیمپرتۆر "لیوپۆڵد" بانگەشەی دەکرد کە چارلسی دووەمی پاشای ئیسپانیا، کوری کچیەتی واتا نەوەیەتی، وە ئەو نزیکترە بەتەختی ئیسپانیا لە دوای مردنی نەوەکەی چارلس، هەروەها بنەماڵەی پاشایی ئیسپانیا لقێکە لەبنەماڵەی هبسبرگ. جگەلەمە "لۆیسی چواردە" لەساڵی 1659 بەگوێرەی پەیمانبەستی برانس ی نێوان ئیسپانیاو فەرەنسا بەڵێنی دابوو بەوەی کە داوای تەختی ئیسپانیا نەکات، ئەمەش بەهیوای وەچنگ کەوتنی مارەیەکی زۆر لەکاتی هاوسەرگیری کردنی لەگەڵ "ماریا تریزا"ی خوشکی چارلسی دووەم. جا کاتێکیش لۆیس ئەوەی دەستنەکەوت وەك باسمان کرد، خۆی بینیەوە لەوەی کە هەوڵدا ئەو ماددەیە هەڵبوەشێنێتەوە. هەردولا فەرەنسیو نەمساوی هەوڵیاندا لەم کێشەیەدا بگەنە چارەسەرێکی ئاشتیانە. دەوڵەتانی ئەوروپاش ڕازی بوون بە گوێزانەوەی تەختی ئیسپانیا بۆ میری پاڤاریا، وەلێ ئەم میرە لەپێش چارلس مرد. ئیدی پێویست بوو لەسەر دەوڵەتان کە جارێکی تر کۆببنەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە. خۆ وەنەبێ ولآتانی ئەوروپی هاودەنگ بووبن، بەڵکو ئەوانیش لەلایەکەوە نەیاندەویست تەختی ئیسپانیاو داگیرگەکانی بدرێتە ئیمپراتۆریەتی نەمساوی لە ترسی دووبارە هاتنەوەی سەردەمی چارلسی پێنجەم، لەملاشەوە نەیاندەویست پاشایەتی ئیسپانیاو فەرەنسا ببن بەیەكو یەکیەتی لەنێوانیان بێتەدی، بەڵکو ئەمان زیاتر هاوسەنگی نێودەوڵەتیان گەرەك بوو، لەگەڵ پاراستنی بەرژەوەندی بازرگانی ئیسپانیا.

بەلآم چارلسی دووەم کە لەساڵی 1700 مرد، ڕایسپارد بە گواستنەوەی تەختەکەی بۆ فیلپی نەوەی لۆیسی چواردە، ئەمەش بۆ یەکنەگرتنی پاشایەتی فەرەنساو ئیسپانیا. پاش دوو دڵیەکی کەم لۆیسی چواردە ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە نەوەی ببێتە پاشای ئیسپانیا بەناوی فیلپی پێنجەم، بەلآم لەهەمانکاتدا پێشبینی جەنگی دەکرد لەگەڵ نەمساو ئینگلترا.

لەم کاتەدا "ولیمی سێیەم"و ئیمپراتۆری نەمساوی "لیوپۆلد" هاوپەیمانیەکیان پێکهێنا، کە هۆڵنداو براندبرگی بروسیاو هانوڤەرو پلانتینات چونەپاڵی و پرتوگالیش بە کاریگەری ئینگلترا چووە ناو ئەم هاوپەیمانیەتە. شیاوی باسە پرتوگال لەم کاتەدا لە ساڵی 1713 پەیمانێکی بازرگانی لەگەڵ ئینگلترا بەست، هەروەها میری ساڤۆی چووە ناو ئەم هاوپەیمانیە لەسەر ئەوەی کە لەدوای جەنگ دان بنێن بە دۆقیەکەی دا وەك شانشینێك. هاوپەیمانان داوایان دەکرد تەختی ئیسپانیا بگوازرێتەوە بۆ ئەرشیدۆق چارلسی دووەمی کوڕی ئیمپراتۆری نەمساوی لیویۆلدو، قۆرغکاری ئیسپانیا لەمەڕ بازرگانی لە نابڕیۆ سنورێك دابنرێت بۆ دەسەڵاتی زۆرداری پادشای فەرەنسا.

لە ڕاستیدا کاروبارو لایەنی بازرگانیو داگیرکاری تێکەڵ ببوو بە لایەنی سیاسیەوە. بەگوێرەی تیۆری مەزهەبە بازرگانیەکانی ئەوکاتە کە لە ئەوروپادا باوی هەبوو، وڵات ئەوەیە کە خاوەنی داگیرگەیەو مافی بازرگانی بۆ هاوڵاتیانی لەم داگیرگانەدا دەپارێزێ. جا ئەگەر بێتو فەرەنساو ئیسپانیا لەیەکترجودا بن ئەوا ئینگلتراو هۆڵندا دەگونجێ بۆیان بەربژاری بازرگانی لەداگیرگە فەرەنسیو ئیسپانیەکان وەرگرن، وەلێ ئەگەر بێتو هەردوو وڵات ببن بە یەك، ئەوا پاوانکردنی بازرگانیو داگیرکاری ئەوەندە بەهێز دەبێت کە ڕێگری دەکات لە فراوانبوونی بازرگانی ئینگلیزیو هۆڵندی. ئەمە لەکاتێکدا خۆشگوزەرانیو بوژانەوەی ئابووری ئیسپانیو فەرەنسی بەرز دەبێتەوە. هەر بۆیە ولیمی سێیەم بەهەموو توانای هەوڵی دەدا پارێزگاری بکات لەهاوسەنگی نێودەوڵەتی لە ئەورووپا.

جەنگی ویراسەی ئیسپانی لەساڵی 1702 تا 1713 بەدەوام بوو. لەگەڵ ئەوەی کە "ولیمی سێیەم" لە سەرەتای جەنگەکەدا مرد، بەلأم دڵنیا بوو لەوەی حکومەتی ئینگلیز بەردەوام دەبێت لەجەنگکردن. جەنگ لە داگیرگەکاندا بە جەنگی "شاژن ئان" ناسرا، ئەوەی کە لەدوای ولیمی سێیەم هاتە سەر تەخت ی ئینگلترا. جەنگ لەهەریەکە لەهۆڵنداو باشوری ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو ئیسپانیا هەڵدەسوڕا.

لەسەرەتا سەرکەوتن بەلای هاوپەیمانانی فەرەنسی دابوو، بەلاّم بەسایەی سەرکردە سەربازیە بەهێزەکانی هاوپەیمانان چەند سەرکەوتنێکی مەزنیان بەدەستهێنا، وەك سەرکردەی سەربازی ئینگلیزی "مالبور" 1650-1722، میر"بوجین میری ساڤۆیّ 1663-1736". "بوجین" توانی فەرەنسیەکان لەسالّی 1804 لە نەمسا دەربکات، پاشان لە سالّی 1706 لە ئیتالّیاش دەریپەڕاندن، هەروەها "مالبور" دوای تێکشکاندنی فەرەنسیەکان لە جەنگی "پلینهام" لە سالّی 1704 توانی ئەلّمانیا لە فەرەنسیەکان پاك بکاتەوە. وە لەهەمان سالّدا ئینگلترا دەستیگرت بەسەر "جبل گاریق"دا. "مالبورو" لە سالّی 1709 بەسایەی دلێریو بلیمەتیەکی جەنگی، سوپای فەرەنسیەکانی لە زەویە نزمەکان وەدەرنا. تێکشکانی یەك لەدوایەکی فەڕەنسیەکان بوو بەهۆی پێشڕەویکردنی سوپای هاوپەیمانان لەزەویەکانی فەرەنسادا، کەخەریك بوو بگەنە پاریس. بەلاّم درووستبوونی ناکۆکیو دووبەرەکی لە ناو ڕیزەکانی هاوپەیمانان ڕێگەی گرت لەپێشڕەویکردنی هاوپەیمانان بەرەو پاریس.

لەسالّی 1710 کابینە لە ئینگلترا گۆڕاو ئەوەی هاتە سەر دەسەلاّت ئارەزوی ئاشتی دەکرد. ئەوەبوو هەستا بەلادانی مارلبور لەسەرکردایەتی هەروەها ئیمپراتۆر "جوزێف" کە لە دوای ئیمپراتۆر "لیوپۆلد" لەسالّی 1705هاتبووە سەرتەخت، لە سالّی 1711مردو برای ئیمپراتۆر چارلس هاتەسەرتەخت. شیاوی باسە پێش ئەو "چارلس" کاندیدو پالّێوراوی هاوپیمانان بوو بۆ سەرتەختی ئسپانی. ولاّتانی ئەروپی حەزیان نەدەکرد تاجی ئیسپانیاو نەمسا یەکبگریّ، بەلاّم زۆرتر ڕەتی یەکگرتنی تاجی ئیسپانیاو فەرەنسایان دەدایەوە. واتا:"زیاتر یەکگرتنی تاجی فەرەنساو ئیسپانیایان بەلاوە ناخۆشبوو". ئەمەش بۆ پاراستنی هاوسەنگی نێودەولّەتی. هەر بۆیە ناچاربوون لە شاری "ئەتریختی" هۆلّندا لە سالّی 1713کۆببنەوەو پەیمان ببەستن .

## پەیمانبەستی ئەتریخت 1713

1–دەوڵەتانی هاوپەیمان هێنا بەفیلپی پێنجەم ی نەوەی لۆیسی چواردە بەپاشایەتی کردن بەسەر ئیسپانیاو داگیرگەکانی، بەومەرجەی لەداهاتوودا ئیسپانیاو فەرەنسا یەکنەگرن.

2– بنەماڵەی هبسبرگ ی نەمساوی هەریەکە لەناپۆلیو سەردینیاو میلانۆو بەلجیکایان دەستکەوت، کەناونرا زەوییەنزمەکانی نەمسا. ئەم ناوەش تا ساڵی 1797 بەردەوام بوو.

3– ئینگلترا بەپشکی شێر براوە بوو لەکایەکەدا، بەم شێوەیە:

أ– دەستکەوتنی بازرگانیو داگیرکاری، ئەمەش بەدەستکەوتنی نیوفاولاندو نوڤاسکوشیا.

ب– دەستکەوتنی کەنداوی "هوسن" لە فەرەنساو جبل تاریقو دورگەی مینورکە لە ئیسپانیا.

ج– دەستکەوتنی هەناردەکردنی زۆرترین کەلوپەل بۆبەندەری قادس واتا ""ئینگلترا لەهەناردە کردنی شتومەك بۆ ئەم بەندەرە جیاواز بوو لەولاتانی تر"ئەفچەلیەت"ی هەبوو""، ئەمە جگە لە پاوانکردنی بازرگانی کۆیلە. وە سالانە مافی ناردنی کەشتی هەبوو بۆ داگیرگەکانی ئیسپانیا.

و– فەرەنسا بەڵێنی دا هاوکاری بنەماڵەی ستیورات نەکات بۆ گێڕانەوەی تەختی ئینگلیزی بۆخۆیان.

4– هۆڵندیەکانیش توانای ئەوەیان پێدرا کەقەلاو بورج دروستبکەن لەسەر سنوری فەرەنسا بەلجیکا، نەمساش بەڵێنی هاوکاری ماددی دا بۆپارێزگاری لێ کردنیان. هەروەك هۆڵندا مافی پاوانکردنی بازرگانی دەستکەوت لە ڕووباری "شیڵت".

5–هەڵبژێردراوی"براندنبرگ"بوو بە پادشا بەسەر پروسیاو ئیمپراتور یش– لە ساڵی 1720 دانی پێدا هێنا، بەمەش تۆوی یەکیەتی ئەڵمانیا چەکەرەی کرد.

6- دۆقیـەی سـاڤویَ بووبـە ولأتێـكو دورگـەی صـقلیەی دەسـتكەوت، كـاتێكیش صقلیەی گۆڕیەوە بە سەردینیا، ناونرا شانـشینی سـەردینیا. بەمـەش تـۆوی یەكیـەتی ئیتاڵیا هاتە دروست بوون.[1]

## كۆتـایی لۆیسی چواردە:-

لۆیس چواردە هەسـتی بەهەڵـەی خـۆیی كـرد لـەپاش تێپـەڕینی ڕۆژگـار بەسـەریدا. لەكاتێكدا ئەو لەسەر جێگەی مردن پـاڵ كـەوتبوو، ئـەم لاو ئـەولای كـردو ڕووی كـردە نەوەكەی‌و، گووتی:"ئاگاداربە لەوەی شەیدای كۆشـكی جـوان‌و جـەنگ بیـت، هـەروەك من شەیدایان بووم. بەڵكو كاربكە بۆ سوككردنی ئێش‌و ئازارەكانی گەل. ئەگەر هاتبـاو فەرەنـسا توشـی ئـەم كارەسـاتانە نەبوایە،ئـەوا دەوڵەمەنـدترین‌و خۆشـگوزەرانترین دەوڵەت بوو لەئەوروپا".

لۆیس وەك سەرجەم پادشاكانی تـری دونیـا مـردن یەخـەی گـرت‌و لەسـاڵی 1715 تـالأوی مـەرگی نۆشـی. ئەمـەش لـە دوای فەرمانڕەواییـەكی حـەفتاو دوو سـاڵی كـە درێژترین فـەرمانڕەوایی بـوو لەمێژوویـەكی سـەخت كـە تیایـدا گـەلی فەرەنـسی توشـی جۆرەهـا ناخۆشـی‌و ئـێش وژان بـوون. كاتێـك لاشـەی لـۆیس بەشـەقامەكانی پـاریس تێدەپـەڕی لەلایـەن جـەماوەرەوە پەیتاپـەیتا نـەفرینی لیَ دەكـرا، بـەهۆی ئـەوەی لەسەردەمی ئەودا توشی تاڵی‌و چەرمەسەری‌و برسیەتی زۆر بوون.

---

1 games white. The Origins of modern Europe(New uork،1966)،pp.97.

## سەردەمی بنەماڵەی ستیوڕات

## (1714-1603)

شاژن ئیلازابێس لە ساڵی (1603) کۆتایی بەژیانی هات، بەڵام پێش ئەوەی بمرێ ڕاسپاردەی دا کە جیمسی شەشەم کوڕی ماری ستیوڕاتو پاشای سکۆتلەندا ببێتە پاشای ئینگلتەرا بەناوی "جیمسی یەکەم". گەلی ئینگلیزی زۆربەگەرمیەوە لە سکۆتلەندەوە تاوەکو لەندەن پێشوازیان لێی کرد، کە نزیکەی مانگێکی تەواو بەڕێگەوەبوو[1]. لەوێدا هیچ ڕکابەرێك نەبوو کێبڕکێ بکات لەگەڵ جیمس بۆ تەختی ئینگلیزی. لەبەرئەوەی ئیلازابێسو پێشینەکانی دەسەلاتو هێزی خانەدانانیان لەناوبردو پرۆتستانتیەتی ئینگلیزی ببووە کلێسای پەسەندکراوی گەلی ئینگلیزوپرسی ئاینی سەقامگیرکرابوو. جەنگی "ئارمادا" ئینگلیزی کردبووە بەهێزترین دەوڵەتی ئەوکاتەی ئەوروپا بەمەش کۆتاییان هێنا بە شالاوی دەرەکی. هەموو ئەوانە ئیلازابێسو پێشینەکانی تەواویان کرد، ئیدی ئینگلتەرا بەدڵنیاییو گەشاوەییو خۆشنودی کەوتە ژێردەستی جیمسی یەکەم. ساکاتێکیش گەلی ئینگلیزی پێویستیان بە پەشایەتیەکی بەهێزنەبوو لە شێوەی بنەماڵەی تیۆدۆر، بڕیاری ڕزگاربوونیان دا لە هەندێ لەو زەحمەتیو تەگەرانەی دەسەلاتی پێشوو. هەربۆیە لە کۆتایی فەرمانڕەوایی شاژن "ئیلازابێس" پەرلەمان دەستی کردبوو بە هەندێ بزاوتن بۆ کۆتکردنی دەسەلاتی پاشایەتیو جڵەو کردنی، بەلام خزمەتو کاری زۆری "ئیلازابێس" بۆ ئینگلتەراو نەرمی سیاسەتی لە بەرامبەر پەرلەمان وپیاوانی سیاسەتوانو گەلی ئینگلیزی، وایکردبوو ئیلازابێس جێگەی خۆی بکاتەوە لەدڵی خەڵکی. جا هەر لەبەرئەوانە پەرلەمان نەیدەویست لەکۆتایی ژیانیدا زۆری لێ بکەنو وەڕەسو بێ زاری

1LUNT‹W E HISTORY OF ENGLAND (NEW YORK.1957)P385

بکەن، ئەمەش بەهۆی وەفاو دڵسۆزی نواندن بۆی. بەلاّم کاتێك ئیلازابێس مرد پەڕلەمان لە گوێڕایەڵی کردن بۆ ویستی پادشا ڕزگاری بوو.

## جیمسی یەکەم

(1625- 1603)

جیسمی یەکەم پێشبینی کێشەو گرفتی نەدەکرد. لە تەمەنی سی‌و شەش ساڵیدا هاتە سەرتەختی ئینگلیزی‌و، ئەم تەمەنەی هەموو ئەزمون‌و تەجروبەو ململانێی بوو لەگەڵ خانەدانانی سکۆتلەندا. لەگەڵ شارەزابوونی لەپرسی ئایین‌و پەروەردە بوونە ئینگلیکانیەکەی، بەلاّم هیچ شتێکی نەدەزانی سەبارەت بە ئینگلتراو سروشتی گەلی ئینگلیزی.

لە ڕاستیدا جیمس لە خۆبایی‌و چەنەباز بوو، کەموکورتی هەبوو لە ناسینی خەڵکی‌و بڕیاردانی گونجاو لە کاتی گوجاو. بۆ نمونە لە کاتێکدا کە پێویست بوو لەسەر بیروڕاکەی سور بێت، ئەو لە بیروڕاکەی دەستی هەڵدەگرت‌و ڕاوێژی دەکرد. لەکاتێکیشدا کە پێویست بوو لەسەری نەرم بێت‌و لەیەك تێگەیشتن پیادەبکات‌و ڕاوێژ بکات، ئەم بە پێچەوانە سور دەبوو لەسەر ئەو ڕایەی کە هەیبوو. هەروەها یەکێ لە کێشەکانی جیمس نائاگایی بوو لە ئینگلتراو گەلی ئینگلیزی‌و دەستوری ئینگلیزی. جیمس بە گوتەو ڕاوێژی مێشك پوچەکانی دەکردو ئامۆژگاریەکانی "فرانسیس بیکۆن"ی– فەرامۆش کرد. جیمس "ڕوبەرت سیسلی" وەك ڕاوێژکاری سەرەکی‌و وەزیری یەکەم هێشتەوە، کە ڕێگەی خۆش کرد بۆچوونە سەر تەختی جیمس. هەروەك فرانسیس بیکۆنی کردە راوێژکاری دووەم. بەهەمان شێوە تەواوی پیاوانی سەردەمی ئیلازابێسی لە پۆستەکاندا هێشەوە جگە لەهەندێ لەکەسە سەربازیەکان. ڕوبەرت سیسل کاروبارەکانی چارەسەردەکرد پێش ئەوەی بەسەریەکدا بکەون‌و ئالۆز بن، بەلاّم لە دوای مردنی کەسێ نەبوو بتوانێ کارەکان بۆ جیمس بەڕێوەبەرێ‌و کێشەکانی بۆ چارەسەربکات.

## تیۆری مافی خودایی:-

جیمسی یەکەم هات بۆ ئینگلترا بۆ پیادەکردنی تیۆری فەرمانڕەوایی ڕەهاو مافی خودایی پادشاکان، لەکاتێکدا ئەمەی لەسکۆتلەندا بۆ نەچووە سەر. جیمس باوەڕی وابوو کە ژێردەستەکانی خاوەنی ماف نین، بەڵکو ئەوان بەهرەمەند دەبن لەوەی کە پادشا پێیان دەبەخشێت، لە بەرامبەر بەجێهێنانی ئەرکەکانیان. پادشا لە تێڕوانینی "جیمس"دا- دەگەڕێتەوە بۆ خوداو دەچێتەوە سەری، چونکە خودا خۆی پادشاکان دیاری دەکات بۆ فەرمانڕەوایی، پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل پادشاکانی یەهودیان پیرۆز کرد، هەروەك "قدیس بگرس‌و پۆڵس"یش- ئامۆژگاری مەسیحیەکانیان کردوە بە گوێڕایەڵی نواندن بۆ گەورەکانیان. هەروەك پێی وابوو: وەك چۆن باوك منداڵەکانی پەروەردە دەکات‌و ئاگاداریان دەکات، بەهەمان شێوەش پادشا کۆمەڵگە بەڕێوە دەبات. پادشا کۆمەڵگەی سیاسی دەباتبەڕێوە وەك چۆن سەر لاشە هەڵدەسوڕێنێ. هەربۆیە دەسەڵاتی پادشایی دەسەڵاتێکی سروشتییەو کاریگەرترین هێزە بۆ لەناو بردنی شەڕوئاژاوە. پادشا لەلایەن پەرلەمان‌و گەل بەپرسیار نییە، بەڵکو لە بەرامبەر خودا بەرپرسیارەو تەنها خودا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات. پەرلەمان‌و دام‌و دەزگاکانی تری حکومەت لە دەسەڵاتیان پشت بە پاشا دەبەستن. هیچ شتێك لەسەر گەل نییە جگە لەگوێڕایەڵی‌و ملکەچی‌و جێبەجێکردنی ئەرکەکان نەبێت. یاخی بوون‌و لاملی کردنی لە فەرمانەکانی پاشا گومڕایی‌و کوفرە، چونکە پادشا ئەو کەسەیە بەرژەوەندی گەلەکەی دەزانێ‌و هۆکارەکانی خۆشنودی‌و ئاشتی دەزانی. هەربۆیە پاشا لەسەرەوەی گەل‌و پەرلەمان.[1]

---

1 Lant، op. cit; p.386

## ململانێی پادشاو پەرلەمان:-

جیمسی یەکەم باوەڕی وابوو کە سیاسەتی تاقیکردۆتەوە شارەزا بووە لەسەرجەم لقو پۆپەکانی، وە ئەوەشی بۆ پەرلەمانو خەڵکی ڕوونکردەوەو وتی:"لێکدانەوەو سەرنجەکانم هەمووی حیکمەتو پەندەو گەل سودی لێدەبینێ". جیمس وەك چۆن سەیری پەرلەمانی سۆکۆتلەندەی دەکرد، بەهەمان شێوە سەیری پەرلەمانی ئینگلیزی دەکرد، کاتێك پەرلەمانی سکۆتلەندی بە هۆڵی پاشایی دادەنا بۆ تۆمارکردنی فەرمانەکانی پادشا.

"جیمس" مەبەستی ئەوەبوو کە هەموو دەسەلآت لە دەستی خۆی کۆبکاتەوە. باوەڕی وابوو کە پادشایی بێ کۆتو بەندە، ئەمەش وایکرد پەرلەمان دژایەتی بکات. بنەماڵەی تیۆدۆر توانیان فەرمانڕەوایی ڕەهای خۆیان بسەپێنن وە هەر کاتێك هەلیان بەرچەنگ کەوتبا وازیان لەپەرلەمان دەهێناو فەرامۆشیان دەکرد، تەنانەت لە قەیرانە داراییەکانیش هەوڵیان دەدا دەسەلآتیان زیاتر بسەپێنن، ئەمەش لە ڕێگەی کەمکردنەوەی خەرجیەکانو بایەخدان بە کۆکردنەوەی باجو دەستگرتن بەسەر سامانی کڵێساو دابەشکردنیو خۆپاراستن لە دروستبوونی قیرانی داراییو کارکردن بۆ برەودان بە بەرژەوەندی ئینگلترا. لەبەرئەوانە لەم کاتەدا جیاوازیەك نەبوو لە نێوان بیروڕاکانی پادشاو پەرلەمان.

بەلآم لە دوای ئەوان ململانێ دەستی پێکرد، نەوەك هەر لەسەر پرسی دەستورو دەسەلآت، بەڵکو سەریکێشاو ململانێ لەسەر سیاسەتی گشتی بۆ ولآتیش دەستی پێکرد. "جیمس" پیادەی سیاسەتێکی دەکرد کە نەیارو ناسازبوو لەگەڵ بەرژەوەندی ئینگلتراو گەلی ئینگلیزی، سەرەڕای مامەڵەکردنی لەگەڵ پیۆریتانە توندڕەوەکانو کاسۆلیکەکان. ئەم گرنگی نەدەدا بە ئارزو ویستی گەل، کاتێکیش پەرلەمان خەریك بوو ویستی گەلی بەسەردا بسەپێنێ، "جیمس" بە ڕاشکاوانە بە ئەنجومەنی گشتی گووت:" ئەمە لەئاستی شانی پەرلەمان نییە کە قسە لە پرسی سیاسی بکات، لە

کاتێکدا ئەمە پیشەی پاشاکان بێت و، پیشەی ئەوان نەبێتو لەسەروی تواناو لێهاتووی ئەوانە بێت". پەرلەمان سەرەتا ئەم تەنگ پێ هەڵچنینو ئەو کارانەی پاشای قبولکرد، بەلاّم کاتێك دووبارەبۆوە، پەرلەمان بڕیاریدا سنورێك بۆ دەسەلاٽی پاشا دابنێت. هەوڵەکانی پادشا بۆ زیادکردنی دەسەلاٽی بووە هۆی دروستبوونی ناکۆکی لەگەڵ پەرلەمانو دواتر بە شەڕی ناوخۆیی کۆتایی هات.

جیمس پاشایەکی دەست بلاوبوو، پێویستی بە ڕەزامەندی پەرلەمان هەبوو بۆ بەدەستهێنانی خەرجی. کاتێکیش پەرلەمان بەخشینی خەرجی بە تەواوی ڕەت کردەوە، "جیمس" بۆ دابین کردنی خەرجی پەنای بردە بەر کارە نادەستوریەکانی وەك سەپاندنی باجو گومرگو پێدانی قۆرغکاریو فرۆشتنی پۆستەکان. پەرلەمان لە دژی ئەم کارانەو لە دژی سیاسەتی ناوخۆو دەرەکیو بالآداستی ڕەها لەسەر دامەزراندنی پۆستەکان ناڕەزاییان دەربڕی. وەلێ ئەم ناڕەزاییە هۆکارێك بوو بۆ زیادبوونی قینو تورەیی پادشا.

## سەرهەڵدانی پیۆریتانە توندڕەوەکان لە پەرلەمان:-

سەرهەڵدانی پیۆریتانەکان دیسان بووە هۆیەك کە ململانێی پاشاو پەرلەمانی توندتر کرد. جیمسی یەکەم پەروەردە ببوو بە پەروەردەیەکی "ئینگلیکانی"و دەیویست ئەو پێکهاتنە پیادە بکات کە لە نێوان پادشاکانی بنەماڵەی تیدۆرو کاسۆلیکی ئینگلیزی سازدرابوو. ئەم پێکهاتنەش خۆی دەبینیەوە لە ملکەچ بووونی پیاوانی ئاینی کاسۆلیکی بۆ پادشا. وەلێ ئەم پێکهاتنە لەلای زۆرینەی زۆری گەلی ئینگلیزی ڕەت دەکرایەوەو قبوڵیان نەبوو کاتێك پرۆتستانتی بوونو بەشێکی زۆریشیان ببون بە کالڤنی. لە کاتێکدا کاسۆلیکەکان کەمینەکی کەمبوون لە سەردەمی جیمسی یەکەم. لە کۆتاییەکانی سەردەمی شاژن ئیلازبێس تاقمێکی پەڕگیرو توندڕەو لە پرۆتانیەکان سەریانهەڵدا، کە بەشی زۆریان بریتی بوون لە بازرگانو ڕووناکبیرو

سەرمایەدارەکان لە شارنشینان، سەرجەمی ئەمانەش لە چینی ناوەڕاست بوونو داوایان دەکرد هەرشتێ پەیوەندی هەبێت بە کاسۆلیکیزم یان پاپەویەت وازی لێبهێنرێ، هەروەك جەختیان دەکردەوە لەسەر دەستگرتنی تەواو بە ئینجیلو ناوەڕۆکی تەوراتو گرتنەبەری ئادابی جوان لە خواردنو پۆشینو ...هتد. هەروەها دەستهەڵگرتن لە مەلهاو سەماگەو هەرشتێك کە خۆی دەبینێتەوە لە ڕابواردنو چێژبەخشەکان. ئەمانە پێیان دەوترا "پاکخوازەکان ـ المتگهرین ـ پیوریتانەکان". پێشتریش شاژنە ئیلازبێس ئەمانەی بەدڵ نەبووو ترسی لێیان هەبوو.

بەشێك لە پیۆریتانەکان لە جوغزی کڵێسای ئینگلیزی مانەوەو هەوڵی چاکسازی کردنی کڵێسایان دەدا بەپێی بیروباوەڕی خۆیان، وە بەشێکی تریان پەرگیر بوونو دەیانویست کڵێسایەك لەسەر شێوازی کڵێسای سکۆتلەندی دامەزرێنن، بەشێکی تریشیان چەند کڵێسایەکی لێکجودایان دامەزراندو ناونران سەربەخۆکان[1].

بەڕستی سیاسەتی توندی ئیلازبێس پیۆریتانەکانی سەغڵەت کرد. کاتێکیش "جیمسی یەکەم" هاتە سەر تەخت پیۆریتانەکان لەساڵی 1604 داخوازیەکیان پێشکەشی پادشا کرد کە لەلایەن هەزارپیاوی ئایینی پیۆریتانی واژۆکرا بوو. تێیدا داوایان لە پادشا کرد، لە جێبەجێ کردنی تعالیمی کڵێسای ئینگلیزی میانگیر بێت.

لە توانای پاشادا هەبوو لەم کاتەدا لێبووردە بێت، بەهۆی ساکاری داواکاریەکانیان. بەڵام ناجێگیری جیمسو سروشتە توڕەکەی وای لێکرد لە بۆنەیەکەدا بەسەریاندا هەڵبشاخێو بیانخاتە دووریانێکەوە، بەوەی یائەوەتە خۆیان بگونجێنن لەگەڵ تەعالیمی کڵێسای ئینگلیزیو دروشمەکانی ئەم کڵێسایە، یا وڵات جێبێڵن. ئیدی لێرەوە ململانێ لەنێوان پیۆریتانو پاشا جیمس دەستی پێکرد.

پیۆریتانەکان ناڕەزایی خۆیان دەربڕی لەهەمبەر ئەونەرمیەی پاشا لەگەڵ کاسۆلیك دەینوێنیو پیادە نەکردنی هەمان ئەم نەرمییە لەگەڵ پیۆریتانەکان. ئەم نەرمیەی

---

1Ibid; p

جیمس دەگەڕێتەوە بۆ کاسۆلیکی بوونی دایکی جیمس"ماری ستیورات" و، نزیکی خێزانی جیمس "کچی پادشای دانیمارک" لە کاسۆلیکیەت. لە ڕاستیدا پادشا لەگەڵ کاسۆلیکیەکانیش توندو ڕەق بوو، وە ئەوانیش چەند جارێك پیلانیان لەدژ سازداوەو دوایەمینیان پیلانی "باروت"ی ساڵی 1605 بوو، کە خۆی بینیەوە لە تەقاندنەوەی هۆڵی پاشاو ئەنجومەنی گشتیو لۆردات کە تیایدا کۆبونەوە، پاشان بە دەستەوگرتنی جڵەوی وڵاتو گەیشتنیان بە دەسەڵات. وەڵێ ئەم پیلانە ئاشکرا بوو پیلانگێڕانیش سزادران. خەڵکی دەترسان لە هاتنەوەی کاسۆلیکیەت بۆ وڵات لە دوای جەنگی "ئارمادا"و سەقامگیربوونی وڵات. بۆیە پەرلەمان یاسای توندی داڕشت کە زۆربەیان دژی کاسۆلیکیەت بوون، بەلام پاشا ئەمەی جێبەجێنەکرد، بەمەش پرۆتستانتەکان بەگشتیو پیۆریتانەکان بەتایبەتی بەتوندی ناڕەزایی خۆیان دەربڕی[1].

## دەست وەردانی جیمس لەهەڵبژاردن:-

جیمسی یەکەم لە یەکەم دانیشتنی پەرلەمانی ساڵی 1604 لەگەڵ پەرلەمان تێکگیرا. جیمس بڕیاری ئەوەی دا کە دەرەنجامی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی گشتی دەبێت بچێتە بەردەم دەستەیەکی پایە بەرز بۆ ساغکردنەوەو خاوێنکردنەوەی. لە هەڵبژاردنەکەدا "گۆدۆن" سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەسەر ڕکەبەرەکەی "فۆرتیسکۆ" کە نزیك بوو لە پاشا، هەر بۆیە ئەم دەستەیە "گۆدۆنی" لە دەرەوەی قانون لە قەڵەم داو ڕەوایی نەدا کورسی هەبێت لەئەنجومەنی گشتی. ئەمجا فەرمانی دا بە هەڵبژاردنێکی تازە. لە هەڵبژاردنی دووەم جاردا فۆرتیسکۆ دەرچوو. کاتێکیش پەرلەمان کۆبوویەوە ئەنجومەنی گشتی بڕیاری شەرعی بوونی هەڵبژاردنی گۆدۆنی داو ڕایگەیاند کە ئەم لەدەرەوەی قانون نییە، خۆ ئەگەر لەدەرەوەی قانونیش بێت،

---

1 Ibid.

قەدەغەی ئەوەی ناکات کە خۆی بپاڵێویێو دەربچێ. جیمس بەمە تورە بوو لەپەرلەماندا وتی: " ئەنجومەنی گشتی مافی ئەوەی نییە دەستبخاتە ناو دەرەنجامی هەڵبژاردن". لەهەمانکاتدا ئەنجومەن هەستی بەمەترسی کردو ڕیگەیاند کە پادشا دەیەوێت ئازادی هەڵبژاردن نەهێڵێو لەناوی بەرێ. ئەنجومەن بڕیاری دا بەردەوام بێت لە پارێزگاری کردن لە دەسەلاتەکانی. هاوکات پادشا پۆزشی هێنایەوەو دانی نا بە مافو دەسەلاتەکانی پەرلەمانو مافی ئەنجومەنی گشتی لە هەڵبژاردنی ئەندامەکانی. بەم شێوەیە دەبینین کە پادشا پرسێکی وەك دەستوری خستۆتە بەردەم قسەلەسەرکردن، لە کاتێدا گەلی ئینگلیزی لە زۆر کۆنەوە دانیان پیادا هێنابوو، هەروەك پاشاکانی پێشووش ڕەزامەندبوون لەسەریو بێ ئەوەی پێویستیان بەم وروژاندنە هەبووبێت.

## ئەنجامی کارەکانی پەرلەمانی یەکەم:-

پەرلەمانی یەکەم لەساڵی 1604–1611 بەردەوامی دا بەخۆی. لەماوەی ئەم ساڵانەدا پێنج کۆبونەوەی گرێ دا، کە تێیدا وتووێژیان دەکرد لەسەر پرسەکانی دەسەلاتو مافو بەربژاریەکانی پەرلەمانو پاشا. هەندێ لەو ململانێیانەمان باسکرد کە لەنێوان هەردوو دەسەلاتدا هەبوو.

لەڕاستیداپرسی دارایی گرنگترین پرس بوو کە هەردوو لای وەرەسو بێ تاقەت کردبوو. پادشا بڕیارەکانی دادگای بۆخۆی دەقۆستەوەو بەکاری دەهێنا بۆ سەپاندنی باج، لە کاتێکدا پەرلەمان ڕەزامەندی لەسەر نەدەنواند. پادشا دانی نابوو بە مافو دەسەلاتەکانی پەرلەمان، هەروەك پەرلەمانیش ئەوەی بە پادشا ڕاگەیاندبوو کە سەپاندنی باج مافی پەرلەمانە وپادشایەتی لە ئینگلترا کۆتکراوەو یاسا سەروەرە لەسەر پاشاو گشت هاولاتیەك.

لەساڵی 1606 یەکێ لەوان بەناوی "بەیت" ناچارکرا بەشێوەیەکی نایاسایی باج بدات، چونکە پەرلەمان ئەم باجەی نەسەپاندبوو سەرەڕای ئەوەی لە سەردەمی ئیلازبێس کۆ دەکرایەوە. بڕیاری دادگا بۆ ئەمە لەبەرژەوەندی پاشادا بوو، کاتێ ئەوەی ڕوون کردەوە کە پاشا مافی ئەوەی هەیە داهات کۆبکاتەوە هەرکاتێك پێویستی پێبێ، چونکە ناگونجێ پادشا فەرمانڕەوایی بکات بەبێ خەرجیەك. لەگەڵ ئەوەی پەرلەمان ڕەخنەی لە شەرعیەتی باج گرت، بەلاّم پادشا ئەم باجەی کۆکردەوە لە هاوردەی مەی "خمر". هەروەها دەستیکرد بە کۆکردنەوەی پاشماوەی ئەو باجە دەرەبەگیانەی کە ماوەیەکی زۆربوو وازی لێهێنرابوو، بەبێ ئەوەی پەرلەمان بە فەرمی هەڵیوەشێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەنجومەنی گشتی بڕیاریدا ساڵانە بڕی 100هەزار پاوەندی ئیسترلینی ببەخشێتە پادشا بەرامبەر هەڵوەشاندنەوەی ئەم باجە، کەچی ئەم باجەکەی هەر کۆدەکردەوە. گفتوگۆو وتوویژ بەردەوام بوو لەسەر هەموو ئەم پرسیارانەی کەپەیوەندی هەبوو بەدارایی‌و ئازادی ڕادەربڕین‌و پاراستنی دەسەلاّتی پەرلەمان‌و ئەندامانی ئەنجومەنی گشتی، کە لە دواتر جیمس ناچار بوو ڕزامەندیان لەسەر بنوێنێ. بەلاّم لەهەمان کاتداو لە سەرەتاکانی 1611" جیمس" بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی دا.

لەدوای هەڵوەشانەوەی پەڕلەمانیش، داهات‌و دارایی کەمتربوو لەوەی جیمس پێویستی پێ هەبوو، وە نەیدەتوانی بژی لەناو ئەو جوغزەی کە پەرلەمان بۆی دیاریکردبوو لە داهات‌و دارایی، هەروەك نەی دەتوانی خەرجیەکان کەم بکاتەوە، شکستیشی هێنا لە هەوڵەکانی چاکسازی دارایی، لەبەرئەوە ناچار بوو بانگهێشتی پەرلەمان بکاتەوە لەساڵی 1611. کاتێك لەنیسانی ئەو ساڵەدا ئەنجومەن کۆبوویەوە دەمەتەقێیەکی توند بەڕێوە چوو کە گوزرشتی دەکرد لەبەرنگاری ئەندامانی پەڕلەمان لە بەرامبەر پادشا. ئەندامان گوێیان نەگرت بۆ داواکاریەکانی پادشا لە هەمبەر پێدانی خەرجیەکی تەواو. هەروەها بەردەوام لەمەڕ گەندەڵیەکانی ئیدارەو ڕێوشوێن گرتنە

"اجرائات" نایاساییەکان لەگەڵ پادشا دەدوانو خەریکی وتووێژکردن بوون لەگەڵیدا. کاتێک حکومەت پیادەی ئەم ڕێوشوێن گرتنە نایاسایانەی کردبوو. بەمە پادشا تورەبوو بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پەڕلەمانی دەرکرد لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا بەبێ دارشتنی هیچ یاساو ئەنجامدانی هیچ کارێک. لەپاش هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانیش جیمس ژمارەیەك لەو ئەندام پەرلەمانانەی دەستگیر کرد کە بەتوندی لەپەرلەمان لەگەڵی دوابوون قسەی زبریان لەگەڵدا کردبوو. ئیدی لەماوەی ساڵانی 1614 بۆ 1621پادشا بەبێ پەڕلەمان فەرمانڕەوایی دەکرد. تەنانەت یەك جاریش بانگهێشتی نەکردن.

## سیاسەتی دەرەوەی جیمس:-

جیمس لە سیاسەتی دەرەوەیدا شوێن سیاسەتێك کەوت کە لەگەڵ ویستو ئارەزووی گەلی ئینگلیزی تێکدەگیرا. لە ساڵی 1604 جیمس پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئیسپانیا بەستو کۆتایی بە دوژمنایەتی لە مێژینەی هەردوو وڵات هێنا. لەگەڵ ئەوەی هیچ پاساوێك نەبوو بۆ مانەوەی ڕەوشی جەنگو کێشە لەگەڵ ئیسپانیا، کەچی گەلی ئینگلیزی لەمە نیگەران بوون و ئیسپانیایان بە دوژمن سەیر دەکرد. لەڕاستیدا ئەوان بۆ ئەمە ناحەقیان نەبوو، چونکە ئەم پەیمانە هیچ دەستکەوتێکی بۆ گەلی ئینگلیزی تێدا نەبوو لە مەسەلەی مافی ئینگلیز لە بازرگانی کردن لەگەڵ داگیرگەکانی ئیسپانیا. بەمە ئینگلترا بازرگانیە بەرمێنەکەی توشی زیان بوو، کاتێك لەسەردەمی جەنگدا ئەنجامیان دەدا لەگەڵ داگیرگەکانی ئیسپانیا. لەگەڵ ئەوەی جیمس لەساڵی 1612 کچەکەی خۆی "ئیلازبێس"ی لە "فردریك"ی میری ویلایەتی پلانتنیاتی ئەڵمانیا لەسەر ڕوباری راین مارەکرد، کەچی لەجەنگی سی ساڵەدا هاوکاری فردریکی نەکرد. کاتێك فردریك ببوو بە سەرکردەی پرۆتستانتیەکان لەدژی کۆمەڵەی کاسۆلیکی (1618–1620). لەگەڵ ئەوەی گەلی ئنگلیزی پشتگیری ئەم هاوسەرگیریان کرد کە

جیمس پێکیهێنا لەساڵی 1612، بەلاّم لە دوو دڵ بوونی جیمس لە هەمبەر هاوکاری کردنی فردریك نیگەران بوون. هەروەها گەلی ئینگلیزی بەوەش پەستو نیگەران بوون کاتێك "جیمس" دەیویست کچی فلیپی سێیەمی پاشای ئیسپانیا بکاتە هاوسەری "چارلس"ی کوڕی لەساڵی 1623، تەنانەت لەسەر ئەوە جیمس توشی ناڕەزایەکی توند بوو. بەلاّم کاتێك چارلس بە توڕەیی لە کۆشکی شاهانەی ئیسپانیا گەڕایەوە، خەڵکی زۆر دڵخۆش بوون. ئەم توڕەبوونەش بە هۆی ویستی ئیسپانیا بوو بۆ بە کاسۆلیکی کردنی چارلس پێش هاوسەرگیری کردن.

کاتێك گەلی ئینگلیز سور بوون لەسەر چوونە نێوجەنگ لەدژی ئیسپانیا، ئەو وڵاتەی کە لەجەنگی سی ساڵەدا بوو، ویلایەتی پلانتیناتی داگیرکردبوو، فردریکی لەمیرنشینەکەی دەرپەڕاندبوو. جیمس ناچار بوو لە ساڵی 1621بانگهێشتی پەرلەمان بکات بۆ کۆبوونەوە بەمەبەستی ڕەزامەندی نواندن لەسەر جەنگ کردنو هاوکاری کردنی پرۆتستانتیەتو دابین کردنی بڕی خەرجیو تەواو بۆ ئەم مەبەستە.

گەلی ئینگلیزی بەم دەستپێشخەریە دڵخۆش بوون. ئەمجارەیان پەڕلەمان بەوهیوایەی کە پادشا دەچێتە جەنگەوە بۆ هاوکاری کردنی پرۆتستانتیەکان و، هەروەها بە ئومێدی هەڵکەوتنی دەرفەتێکی باش بۆ لەیەکتری تێگەیشتنو نەهێشتنی ناکۆکیەکانی نێوان هەردوولا، پەرلەمان کۆبویەوەو تەواو ملکەچی فرمانەکانی پاشا بوو، وە هیچ توڕەییو ناڕەزاییەکی خۆیان نیشان نەدەدا لەبەرامبەر کارە نادەستوریەکانی پاشا، کە لە ساڵی 1611 وە- بەتایبەت لەدوای ساڵی 1614ەوە -پادشا حوکمی دەکرد بەشێوەیەکی نادەستوری. بەلاّم پادشا بەبێ ئەوەی باس لەهیچ هۆکارێك بکات داوای خەرجی کرد. پەرلەمانیش بڕێك پارەی بەخشی، بەهیوای ئەوەی هاندەرێك بێت بۆ پادشا بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ لەدژی کۆمەڵەی کاسۆلیکیو پشتگیری کردنی پرۆتستانتیەت.

جـیمس وای دەبینـی کـە هەڵگیرسـاندنو ڕاگەیانـدنی جـەنگ مـافی خۆیـەتیو لـە دەسەڵاتی خۆیدایەو نەوەك پەرلەمان. سا کاتێکیش ئەندامان هـەر چاوەڕوانی ولأمێـك بوون لەلایەن پاشاوە بەلأم هیچیان دەستگیر نەبوو، دەستیانکرد بە وتوێژکردن لەسەر کارە نادەستوریەکان، بەتایبەت قۆرغکاریو ڕێگەدان بە کاری نایاسایی کە گەیشتبووە ڕادەیـەك قبـولٚ نـەدەکرا. پەرلـەمان یـەکێ لەوانـەی بەهرەمەنـدبوون لـە قۆرغکـاری تۆمەتبارکرد. تۆمـەتبارو ژمارەیـەك لەوانـەی تۆمـەتبارکرابوون بـە دزینـی سامان، لـە کارەکانیـان دوورخرانـەوە. جـیمس ویـستی ڕێگـری بکـات، بـەلأم ئەنجومـەنی گـشتی فرمـانی کـرد بـە دەرکردنـی "سێرفرانـسیس بـیکن" لـە وەزارەت بـەهۆی وەرگرتنـی بەرتیل. لەڕاستیدا ئەمە تۆڵە بوو کە لەفرانسیس کرایەوە، بەهۆی پشتگیری کردنی بـۆ پاشا لەسەرجەم کارەکانی، وە هۆشداریەکیش بوو بۆ هـەموو ئەوانـەی کـە ئامۆژگـاری پاشایان دەکرد بۆ دژایەتی کردنی پەرلەمان. پـێش ئـەوەی پەرلـەمان قۆرغکاریـەکانی هەڵوەشێنێتەوە، جیمس ئەنجومەنی دواخست، لـەم لاشـەوە هـەژدە قۆرغکـاری لابـرد لەخراپترینی قۆرغکاریەکان.

کاتێـك پەرلـەمان جـارێکی تـرو لەهـەمان سـاڵدا کۆبوویـەوە، دووبـارە پاشـا بـەبێ ڕونکردنەوەی هیچ هۆیەك داوای خەرجی کرد. بەلأم ئەنجومەن گەرەکی بوو جـەنگ لـە دژی ئیسپانیا هەڵگیرسێنیو نێردەی ئسپانیا دەربکات، ئەمەش لە ترسی هاوسەرگیری کردنی جێ نشین "ولی عهد" لەگەڵ خـانمی ئیـسپانی. شـیای باسـە نێـردەی ئیـسپانی "گونـد مـار" هەسـتی بـەخاڵی لاوازی جـیمس کردبـوو، هـەر بۆیـە ئەمـەی بـۆ بەرژەوەندیەکانی ئیسپانیا بەکاردەهێناو، دەیویست خزینی ئینگلترا بۆ جـەنگ لـەدژی ئیـسپانیا ڕاگـریو جـیمس لـە دژی پەرلـەمان بجـوڵێنێ. جـیمس ئەنجومـەنی گـشتی ئاگادارکرد بەوەی کـە دەسـت لـەکاری دەوڵـەتو هاوسـەرگیری کوڕەکـەی وەرنـەدەن، چونکە ئەمە لـە دەسـەڵاتی ئەوانـدا نییـە، وەئەگـەر بـەردەوام بـن لەسـەر ئەمـە، ئـەوا سزایان دەدات. لە هەمانکاتداپەرلەمان داوای لە جیمس کرد ڕونکردنەوەیـەك بـدات بـۆ ئـەو هەڕەشـانەی کـە کردوونـیو هـیچ پاسـاوێکیان نییـە. هـەروەك ڕایگەیانـد ئـازادی

گوتوێژو گفتوگۆکردن مافی پەرلەمانە هەر لە کۆنەوە. لەگەڵ ئەوەی جیمس دانی نا بە سەربەستی قسەکردن، بەلاّم ڕێگریشی کردن لەوەی دەست لە سیاسەت وەردەن، چونکە ئەمەی بە مافی خۆی دەزانی. لە هەمانکاتدا پەرلەمان ناڕەزاییەکیان پێشکەش کرد. پەرلەمان ڕایگەیاند کە مافی ئەوەیان هەیە لێکۆڵینەوەو وتوێژ بکات لەو پرس‌و مەسەلانەی کە تایبەتە بەپاشاو هەروەها لەبارەی ڕەوشی ولاّت‌و بارودۆخی دەوڵەت‌و هی تریش لە کاروبارەکان. وە هەموو ئەندامێك مافی تەواوی هەیە کەگفتوگۆ بکات سەبارەت بە هەریەکە لەم پرس‌و بابەتانە بەوپەڕی ئازادیەوە. لەم کاتە جیمس پەرلەمانی دواخست‌و ئەو ڕەش نوسەشی "پەڕە – صفحە"ی دڕاند کە ناڕەزایی پەرلەمانی تیادا نوسرا بوو، پاش ئەمەش ئەنجومەنی هەڵوەشاندەوە[1].

بەڕاستی "گوندمار"نێردەی ئیسپانیا توانی "جیمس" هەڵخەڵەتێنێ‌و لەو باوەڕەشدا بوو کە "جیمس" لەو کەسانەیە دەتوانرێ بەردەوام هەڵخەڵەتێنرێ. "گۆندمار" ویستی ناردنی شالاّوی ئینگلز ڕاگرێ‌و دوای بخات، هەربۆیە بە پادشای ووت: "کە ئیسپانیا لە داهاتوودا لەپلانتینات پاشەکشە دەکات". بەمەش توانی هێرشی ئینگلیزی دوابخات. لەم کاتەشدا هەوڵەکانی سازکردنی هاوسەرگیری چارلس لەگەڵ خانمی ئیسپانی شکستی خوارد. "چارلس" باوکی هاندا بۆ بانگکردنی پەرلەمان‌و ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژی ئیسپانیا.

پەرلەمانی ئینگلیزی لەساڵی 1624 کۆبوویەوە. گەلی ئینگلیزی لە چارلس یان ڕادەبینی کە کەسێك بێت بتوانێ ڕابەرایەتی ئینگلترا بکات‌و بەرەو خۆشی‌و خۆشگوزەرانی ببات.

لەکاتێکدا پەرلەمان دەیویست جەنگێکی دەریایی هاوشێوەی جەنگی ئارمادا لەگەڵ ئیسپانیا سازکات بۆئەوەی سەرکزی کات، کەچی "جیمس" دەیویست جەنگی دژی ئیسپانیا لەپلانتینات هەڵبگیرسێنێ. نێردەی ئیسپانیش بە هەرچی لەتوانای داهەبوو هەوڵیدەدا ڕێگری بکات لە ڕوودانی جەنگ لە دژی وولاّتەکەی. کاتێکیش چارلس هەستی کرد کە باوکی بە ووتەکانی وەزیری دارایی لایەنگر بە ئیسپانیا هەڵدەخەڵەتێ،

---

1Davies‹ G‹ theEearly Start‹ 1603- 1660( oxord‹ 1959) ‹ PP. 1-33

هانی ئەنجومەنی گشتی دا بەدەرکردنی، هەربۆیە ئەنجومەنی گشتی دەریکرد، لەبەرئەوەی ئامۆژگاری پادشای کردوە لە دژی ویستی پەرلەمان. پادشا پەرلەمانی دواخستو لەهەمانکاتیشدا هەوڵیدا هاوپەیمانی لەگەڵ فرەنسا ببەستێ بەمەبەستی ئەوەی فرەنسا سوپایەك بنێرێ بۆ پلانتینات لە دژی ئیسپانیا، هەروەها ویستی"هناریتا ماریا"ی– خوشکی لویسی سێزدەی پاشای فرەنساو چارلسی کوڕی بکاتە هاوسەرو هاوسەرگیریان لەنێوان پێکبێنێ. لەگەڵ ئەوەی فرەنسا بەڵێنی تەواوی نەدا بەناردنی سوپا بۆ پلانتینات لە دژی ئیسپانیا، بەڵام جیمسی دڵنیا کردەوە کە ئەوە دەکات "ناردنی سوپا بۆ پلانتینات" بەمەرجێ ئینگلترا لەمامەڵە کردنی لەگەڵ کاسۆلیکەکان باش بێتو زیندانیەکانیان ئازاد بکات. جیمس ئەوەی بەڵێنی دابوو بردیە سەر، وەلێ فرەنسا جەنگی ڕانەگەیاند. بارودۆخیش– بەم شێوەیە مایەوە تا کاتێك جیمس لە سەرەتای ساڵی 1625 ماڵئاوایی لە دنیا کرد.

"دین جۆنز" لەبارەی جیمسی یەکەمەوە دەڵێ[1] : "جیمس" لەڕووی فکریەوە لە زۆربەی لایەنەکاندا ڕاستو تەواو بوو، کاتێك خۆی نەکردە بەرپرسیاری هەڵسوکەوتو کردارەکانی فردریکی سەرەڕۆو کەودەن. وەئەم حەقی بوو کاتێك ڕێگری کرد لەبەفیڕۆدانی سەروەتو سامانی ئینگلیز لەسەر فردریکو پرۆتستانتیەکان هەروەك وولاتەکەشی ڕزگار کرد لەو وێرانکارییەی کە ئەورووپای باکورو ناوەڕاست توشی هاتبوو. بەڵام لەڕووی سیاسیەوە پێویستە سەرزەنشتی جیمس بکرێ، بەهۆی ئەو ئامرازانەی بەبێ هۆ گرتنیە بەر. دیبلۆماسیەتە ناڕۆشنەکەی سیاسەتەکەی تێکداو دەسەڵاتەکەی لاوازکرد. جیمس بە دڕاندنی ڕەشنوسەکەی پەڕلەمانو چەند جارێك هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەن سوکایەتی بەگەلی ئینگلیزی کرد[1].

---

1Lunt ،OP.Cit;pp.394-401

1 Deane Jones، The English Revolution، 1603- 1714( London، 1931) ،pp. 17-18.

## پادشا چارلسی یەکەم

چـارلس بەپێـچەوانەی بـاوکی ڕەنـگـو ڕوویـەکی پاشـایانەو جوامێرانـەی هـەبوو، هەروەها خۆشەویست بوو لەلای گەلی ئینگلیـزی. بـەخۆی دەنـازیو لافـو گـەزافی بـە پادشایی ڕەهاو مافی خودایی پاشایان لێدەدا. خەڵکی دڵخۆش بوون بـە شکستی ئـەو هاوسەرگیریەی کە خەریك بوو لە نێوان ئەوو کچی فلیپـی چوارەمی پاشـای ئیسپانیا ئـەنجام بـدرێ، بـەلاّم وەنـەبێ لـە دوای نـەبوونی ئـەم هاوسـەرگیریە، کەسـێکی تـری خواسـتبێ بـە دڵـی گـەلی ئینگلیـزی بـووبێ، بـەڵکو هاوسـەرگیری کـرد لەگـەڵ "هنریتامارىای" کچی هنری چوارەمی پاشای فەرەنساو خوشکی لۆیسی سێزدە. جا ئەم هاوسەرگیریە جێگەی دڵخۆشی گەلی ئینگلیـزی نـەبوو، بـەهۆی کاسـۆلیکی بـوونی ئەم خانمە.

لەگەڵ ئەوەی چارلس وەك باوکی نەبوو لەڕوی ڕەوانبێژیو وتـاردان، بـەلاّم بـاوەڕی تەواوی بە تیۆری مافی خودایی پاشاکان هەبوو پێداگریشی لەسەر دەکرد.

کاتێك چارلس لە ساڵی 1625 چـووە سـەرتەختی دەسـەلاّت، پێویست بـوونی بـە داهاتو ماڵ ناچاری کرد بانگهێشتی پەرلەمان بکات بۆ کۆبوونەوە. خۆ ئەگەر دەوڵـەت لە جەنگدا نەبووایە لەپلانتینات لە دوای هەناردەکردنی سوپا بۆ ئەم هەرێمە، ئەوا ئـەو بەو پارەیەی پەرلمان پێی بەخشی بـوو بەسـی بـوو بـۆ پڕکردنـەوەی پێداویستیەکانی پاشا. بەلاّم ڕەوشی جەنگ داراییەکی زۆر زۆر لەمە زیـاتری لـەباربرد کـە هـەر ئەمـەش وای لەپەرلەمان کرد حەوت یەکی خەرجی پێبدات[1]. ئەندامانی پەرلەمان دەستیان کرد بە وتوێژکردن لەسەر پێشێلکاریەکان، ئەمەشـیان ڕاگەیانـد کـە هۆکـاری جـەنگ کـردن لەگەڵ ئیسپانیا شکستی هاوسەرگیریەکەی پادشا بوو، نەوەك هۆکاری تـری، هـەروەها پێویستە لەسەر پاشا ڕاوێژ بکات بە ڕاوێژکارنی لە ئەنجومـەنی ڕاوێـژ لـە جیـاتی گـوێ

---

1 Dravies. Op. Cit; p. 34

گرتنی لە یەکێك دوان لەلایەنگرانی. هەروەها پەرلەمان لێکۆڵینەوەی لە هاوسەرگیری چارلس کردو نزیکی ئەم خانمەی لە کاسۆلیکیەت دەرخست، وە ڕێککەوتنێکی ژێر بەژێریشی بۆ دەرکەوت، کە بەگوێرەی ئەم ڕێککەوتنە سیاسەتی لێبوردەیی بگرێتە بەر بەرامبەر کاسۆلیکیەکان‌و زیندانیەکانیش ئازاد بکرێن. پەرلەمان بەئەرکی سەرشانی زانی‌و وای بەباشتر دەبینی کە پاشا کاسۆلیکیەت لەناوبەرێ.

وەزیری یەکەم‌و سیقە پێکراوی پاشا "بیکینگهام" کوێرانە کەوتەپارێزگاری کردن لەسیاسەتی پاشاو داواکردنی خەرجی بۆ تێچونەکانی جەنگ، چونکە پەرلەمان گەرەکی سازکردنی جەنگێکی دەریایی بوو لە دژی ئیسپانیا لەسەر شێوەی جەنگی ئارمادا، ئەمەش بەهۆی کەمی تێچوونی جەنگ‌و هەبوونی ئەگەری سەرکەوتن لەجەنگی دەریاییدا. هەروەك ناڕازی بوون لە بەرامبەر فکرەی "بکینگهام" لەبارەی ئەنجامدانی ئەم جەنگە، چونکە بکینگهام باوەڕی وابوو کەپاشا سوپا بنێرێ بۆ پلانتینات بە مەبەستی سەرخستنی پرۆتستانتەکان‌و هاوکاری کردنی هۆڵندیەکان‌و دانیمارکەکان. جا ئەندامەکان ئەم فکرەیان بەهەڵەزانی‌و لایان وابوو ئەم پلانە فراوانە مەترسیدارەو تێچوونی زۆرەو ئەگەری سەرکەوتنیشی کەمە. هەر بۆیە ئەندامان "بکینگهام"یان– بەمە تۆمەتبارکرد.

لەلایەکی تریشەوە کاروبار بە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان چارەسەر نەدەکرا، هەتاوەکو پەرلەمان ڕەزامەندی نەنواندبایە لەسەر خەرجی تر. لەملاشەوە ڕەوشی جەنگ تێکچوبوو، چونکە ئینگلترا سوپای بۆ ئەڵمانیا ناردبوو بەڵێنی هاوکاری بە دانیمارك دابوو. لەلایەکی تریشەوە پەیمانی هاوپەیمانی بوونی لەگەڵ فەرەنسا دابوو. جگەلەمە هاوسەرگیری چارلس لەگەڵ خوشکی لویسی سێزدە، ماددەیەکی لەخۆگرتبوو، کەبە گوێرەی ئەم ماددەیە ئینگلترا هەشت کەشتی ڕادەستی فەرەنسا دەکات، بە مەبەستی جەنگ کردنی لە دژی ئیسپانیا. بەڵام لە هەمانکات دەرکەوت کە ڕیشیلیۆ ئەم کەشتیانەی بە مەبەستی گەمارۆ دانی لارۆشیل لەدژی پرۆتستانتەکان

ویستووە، ئەمەش ئەوندەی تر ئینگلترای تووڕەو نیگەران کرد. جابۆ ڕزگار بوون لەم تەنگو چەڵمەیە "بکینگهام" شالاوێکی کردە سەر "قادس" ی بەندەری ئیسپانیا بە مەبەستی تالانکردنی بەندەرەکانی ئیسپانیاو کەشتیەکانی. بەلام ئەم شالاوە شکستی هێناو دەریاوانان بە ئەسپاییو تاسەوە گەڕانەوە. کەچی چارلس نەیدەویست بەم شێوەیە دەست لەجەنگ هەڵبگرێت لە کاتێکدا شورەییە بۆی. هەروەك بەهۆی کەمی خەرجیش نەیدەتوانی بەردەوام بێت لەجەنگ، چونکە پەرلەمان خەرجی تەواوی پێنەدەدا. هەربۆیە چارلس لەساڵی 1626 ناچار بوو بانگهێشتی پەرلەمان بکات.

بەڕاستی پادشا ڕێگەی خۆشکرد بۆ پەرلەمانی دووەم بەوەی سەرکردەکانی خۆیان لەپۆستەکان دابمەزرێننو قانون لەدژی کاسۆلیکەکان جێبەجیٚ بکەن. هەروەك ئوسقوف (لود) یان" وەك وتاربێژ لەئەنجومەنی گشتیو ئەنجومەنی لۆردات دامەزراند لە کاتی کۆبونەوەکانیان. گوتارەکەی نمایشێکی گشتی بوو بۆ یەکگرتنەوەی دینو دەوڵەت، کاتیٚ ووتی:" گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پادشا وەك سوپاس کردنو بەندایەتی کردنی خودایە. پادشا لانادا لەگوێڕایەڵی خوداو خزمەتکردنی گەلو گرنگی پێدانیانو بەڕێوەبردنی خەزێنە بە بەڕێوبردنێکی لێزانانەو حەکیمانە"[1]

لەگەڵ ئەوەی پەرلەمان پشتیوانی لەو گوتانە کرد بەلام زۆر گرنگی پیٚ نەداو، گوێی گرت بۆ گوتەکانی سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن"سێرجۆن ئیلیوت". ئیلیوت جەختی کردەوە لەسەر ئەو کارەساتەی ڕووبەڕووی وڵاتانی ئەوروپا بوویەوەو گوتی:"کەشتیەکانمان نوقم بوون، پیاوەکانمان لەناوچوون، بەلام نەك بەشمشێری دوژمنان بەڵکو بەهۆی ئەو کەسانەی متمانەمان پێیان هەیە.

پەرلەمان گوێی نەدایە دواکاری پادشا لەمەڕ پێدانی خەرجی، بەڵکو بڕیاریدا لێپێچانەوەبکات لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بەرپرسیاری ئەو کارەساتانە بوون کە سوپاو

---

1Ibid; pp. 35-36.

هێزی دەریایی ئینگلترا لە ئەڵمانیاو قادس توشی هاتبوو، بۆ ئەمەش بکینگهام یان" تۆمەتبار کردو داوای دەرکردنیان کرد. لەهەمان کاتدا پادشا"چارلس"، "ئیلیوت"ی سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن و"دودلی دیگز"ی سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی دەستگیرکرد. ئەنجومەنیش کاروبارەکانی ڕاگرت تاوەکو ئازادکردنیان، واتا "ئازادکردنی ئەوان وەك مەرج دانرا". بۆیە پادشا ئەمەی کردو داوای گفتوگۆی کرد سەبارەت بەپێدانی خەرجی، کاتێکیش ئەنجومەنی ئەمەی نەکرد، پادشا فرمانی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی دەرکرد.

ئەو نەهامەتیانەی کە بەدوای یەکدا بەسەر سوپای ئینگلیزی داهات، دەرەنجامی کەمی خەرجیو تفاقو ڕەتکردنەوەی داواکانی پادشا بوو لەلایەن پەرلەمانەوە، کاتێ داوای خەرجی تەواوی دەکرد. پادشا داوای بەخششو دیاری لە خەڵکی کرد، بەڵام گەلیش ڕەتی کردەوە، نەك هەرئەمە بەڵکو خەڵکی ئەو قەرزەشیان ڕەت کردەوە کە پادشا دەیویست بە زۆر لێ یان وەربگرێ. بەهۆی ئەمەوە ژمارەیەك لە خەڵکی دەستگیرکران کە لەنێوانیاندا پێنج ئەندام هەبوون داوای ڕوونکردنەوەی هۆکاری زیندانی کرانیان دەکرد. بیکینگهام شاڵاوێکی دەریایی ئامادەکرد کەخۆی سەرکردایەتی دەکرد، بەمەبەستی هاوکاری کردنی پرۆتستانتەکان لەلارۆشیل. بەڵام شاڵاوەکەی شکستی خوارد، دوای ئەوەی بیکینگهام لە دورگەی "ڕەی" تێکشکا. شیاوی باسە هۆکاری ئەم تێکشکانەش کەمی خەرجیو تفاق بوو. دەریاوانەکانی ئینگلیز بەڕێکەوتنیان بۆ لارۆشیلو دوای گەڕانەوەشیان بۆ ئینگلتەڕا، بەمەستی دابینکردنی خواردنو خەوتن، بەسەر ماڵەکاندا دابەشبوون، بەڵام هەندێ جار ڕوبەڕووی ڕەت کردنەوەو دەرکران دەبونەوە، هەروەها دەبوونە هۆی ناڕەحەتی بۆ ماڵەکانو تەنانەت بۆ ئەو شوێنانەشی لێی دەگیرسانەوە.

لە ئەنجامی ئەم بارودۆخە ئاڵۆزو شێواوەو مایەپوچیەی خەزێنەو بێزاری خەڵکی، پادشا لەسەرەتای ساڵی 1628 فرمانی ئازاد کردنی زیندانیەکانی دەرکرد، هەروەك فرمانی جێبەجێ کردنی هەڵبژاردنی دا بۆ پەرلەمانی سێیەم.

بەدبەختی پاشا لەوەدا بوو کە گەل لەم هەڵبژاردنەدا ئەو کەسانەیان هەڵبژارد کە دژی پاشا بوون، بەتایبەت ئەوانەی زیندانی بوون. ئیدی کاتێك پەرلەمان کۆبویەوە، پرسی قەدەغەکردنی کۆکردنەوەی خەرجیو داهاتیان تاوتوێ کرد، کاتێك بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان کۆکرابوویەوە. هەروەها نەهێشتنی زیندانی کردنی خەڵکی بەبێ هەبوونی هۆکارو ڕوون کردنەوەی هۆکاری زیندانی کردن بە شتێکی پێویست لە قەڵمدا. پەرلەمان گەلاڵەنامەیەکی خستە بەردەم پاشا، بەناوی "داواکاری ماف". کە تیایدا هاتبوو:

1- بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان نابێ باجو قەرزی زۆرەملێ وەربگیرێ، هەروەها بەخششو دیاریش بەبێ ڕەزامەندنەبوونی پەرلەمان داوانەکرێت. 2 - دەستەبەرسەرکردنو دەستگیرکرانی خەڵکی بەبێ فرمانی فەرمی دادگا قەدەغە بکرێ. 3- کۆتایی هێنان بە دابەزینی سەربازو دابەشبوونیان بەسەرماڵی هاوڵاتیانو نەهێشتنی حوکمی عورفی لەکاتی ئارامیدا.

پاشا ڕەزامەندی لەسەر ئەمانە نواند، پەرلەمانیش ڕازی بوو بە پێدانی خەرجی پێویست. بەختی پاشا لەوەدابوو کەپێش ئەوەی پەرلەمان دەستبکات بە گفتوگۆکردن لەسەر پێشێل کاریەکان، "بیکینگهام" کوژرا. ئەمەش بووە هۆی سوککردنی ناکۆکی نێوان پاشاو پەرلەمان. کوژرانی "بیکینگهام" لەکاتی پشووی پەرلەمان دابوو، لەم ماوەیەشدا پاشا هەستا بەکۆکردنەوەی گومرگ لەسەر ئەو هاوردانەی کە پەرلەمان لەسەری نەسەپاند بوون. هەندێ لە بازرگانانو ئەندامانی پەرلەمان کە ئەمەیان ڕەت کردەوە، توشی دەستگیرکران هاتنو نێردرانە دادگای هۆڵی ئەستێرە، ئەو هۆڵەی کە گەلاڵەنامەی داواکاری مافەکان نەیدەگرتەوە.

کاتێك پەرلەمان لەساڵی 1629 کۆبونەوەی خۆی سازدا، هێرشیان کردە سەر ئەو باجانەی کە پەرلەمان ڕەزامەند نەبوو لە سەری، هەروەها دژی هەندێ پرسی ئاینیو پیادەکرانی بوون. هۆکاری دروست بوونی ئەم ناکۆکیو دووبەرەکیەش دەرکەوتنی ژمارەیەکی بەرچاوی پیۆریتانەکان بوو لە ئەنجومەنی گشتیداو، پاشان نەیاربونیان

لەگەڵ پیاوانی ئاینی کڵێسای ئینگلیزی. لەم نێوانەشدا مەیلیان بەلای کالڤنیزم داکردو دژایەتی پیاوانی میانڕەوی کڵێسای ئینگلیزیان دەکرد. یەکێ لە ئوسقوفەکانی کڵێسای ئینگلیکانی بەناوی "مۆنتگ" لە بەرامبەر ئەم دژایەتیە وتی:"پاپەویەت پشتیوانی دیکتاتۆریە، لەهەمان کاتیشدا پیۆریتانیزم هۆکاری پەشێوی‌و ئاژاوەیە، هەردوولاشیان دووژمنی سەقامگیری‌و میانڕەوین"[1]. ناکۆکی ئاینی لەنێوان "ئیلیوت‌و سەرکردەکانی پەرلەمان، وایکرد پاشا لایەنگری ئەساقیفەی کڵێسای ئینگلیزی بکات. لە دانیشتنی دوایدا ئەنجومەن پشتیوانی کردنی لە کاسۆلیکیەت بە خائینی‌و ناپاکی کردن لەقەڵەم دا. هەروەك هەموو ئەو کەسانەی کە بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان باج لە هاوردە دەسەنن بەخائین‌و ناپاك لەبەرامبەر وڵات لەقەڵەمی دان. لە ئەنجامی ئەم دووبەرەکیەدا پاشا فرمانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی دەرکرد.

ناکۆکی ئاینی هەر ئەوە ئەنجامی نەبوو، بەڵکو بووە هۆی دروستبوونی دووبەرەکی لەنێوان ئەنجومەنی لۆردات‌و ئەنجومەنی گشتی. مامەڵەی "ئیلوت" و"پیم"و ئەنجومەنی گشتی بووە هۆی ئەوەی ئەنجومەنی لۆردات دورەپەرێزبن‌و هەندێ جاریش لایەنگری پاشا بن. پادشا تا ئەو کاتەش دەرکی بەوە نەکردبوو کە گەلی ئینگلیزی پشتیوانی سیستەمی پەرلەمانی دەکەن، وە عەقیدەو بیروباوەڕی پیۆریتانی بڵاو بووەتەوەو زۆرینەی ئینگلیزەکان پشتگیری دەکەن. "چارلس" باوەڕی وابوو کە مامەڵەی ئەنجومەنی گشتی بەهۆی وتاری هەندێ لەسەرکردەکانە. هەربۆیە "ئیلویت"ی دەستگیر کردو لەزیندانی بورجی لەندەن زیندانی کرد. "ئیلیوت" لە زیندان مایەوەو بە زیندویی چاوی بە دەرەوە نەکەوتەوە، بەڵکو هەر لەوێداو لە ساڵی 1632 چاوی لێکنا.

---

Ibid; pp: 41-44 1
bid; pp. 44-45 I
bid; pp 44-46 I

هەڵبــژاردنی نــەیارانی پاشــا لەلایــەن گەلــەوە بەشــێوەیەکی بەرچــاو لــە هــەموو هەڵبژاردەنەکاندا زیادی دەکرد. ئەمـەش بەڵگـەی پـشتیوانی گـەلی ئینگلیـزی بـوو بـۆ داواکـانی ئەنجومــەنی گـشتی، هــەروەها بـۆ سیـستەمی پــەرلمانی. کەچــی پادشــاو نەدەستوپێوەندەکانی دەرکی ئەمەیان نەکرد[1].

## دەسەلاتی تاکڕەوی 1629-1640:

چارلس دەستی کرد بەفەرمانڕەوایی کردنـی ئینگلترا بەشێوەیەکی تاکڕەوانـە بـۆ ماوەی یازدە ساڵ، بەبێ بانگهێشت کردنـی پەرلـەمان. چـارلس بـە هەڵوەشـاندنەوەی پەرلەمان هەستی کرد کە ڕزگاری بووە لەبارێکی گران. وە خۆی دادەنـا بـە پـارێزەری کڵێسای ئینگلیزیو دەستور، لە دژی ئاژاوەگێڕانو ئەوانەشی پیرۆزیە ئاینیـەکان پـیس دەکـەن. هــەروەها خــۆی بــە پــارێزەری دروشــمو تقوســی ئینگلیــزیو مــافو ئــازادی ژێردەســتەکانی دادەنــا[1]. چــارلس وای دادەنــا دەســتگرتن بــە کڵێــسای نیــشتمانی، نیشتیمان پەروەریەکی ڕاستە، پیاوانی ئـاینیش بەتـەنها دەتـوانن چارەسـەری پرسـە بیروباوەڕیەکان" عەقیدە" بکەن، ئەمەش بە کۆبونەوەیان لەگەڵ ئەنجومەنێکی ملکەچ بۆ پادشا. هەروەها بۆ خەڵکی ڕەشۆکی ڕەوا نیە وتوێژو قسە بکەن لەسەر بڕیارەکـان، بەڵکو پێویستە بەبێ پرسیارو وەڵام ملکەچ بن بۆی.

هــەروەها هــاوڵاتی مــافی ئــەوەی نییــە قــسە لەســەر بڕیارەکـانی کڵێـسا بکـات، وە جەختی لەسەر گوێڕایەڵی ملکەچی نواندن دەکردەوە بۆ قانون. چارلس بـاوەڕی وابـوو کە "ئەو لۆژیك دەزانـێ، وە دەزانـێ پێویـستە قـانون بـە چ شـێوازێك بێـت"، وە ئـەو دادوەرەشی کـە لەگـەڵ بیروڕاکـەی نەبوایـە دەری دەکـردو جێگاکـەی بـەدادوەرێك پـڕ دەکردەوە کە ملکەچی خۆی بوایـە. لەئـەنجامی ئـەم بارودۆخـەدا بڕیـارە دادگاییـەکان

Ibid; pp. 45-46 2
*Ibid; pp. 82 3*

لەلای خەڵکی هیچ نرخو بەهایەکیان نەما، داوەر لەلای خەڵکی وەك ئامرازێك وابوو بەدەستی پاشایەکی تاکڕەو. لەڕاستیدا دادگا کرنگیەکی زۆری هەبوو، چونکە جێگەی پشت بەسترانی پاشا بوو لەجێگای پەرلەمان[1].

پێشتر پاشا ناچار بوو دەستبگرێتەوە لەو خەرجیانەی کە دەیکرد، بۆ ئەوەی بتوانێ لەو داهاتەی کە پەرلەمان بۆی دیاری کردبوو هەڵبکات. کاتێك پاشا بینی داهاتەکەی بەشی جەنگە دەرەکیەکان ناکات، پەیمانبەستی ئاشتی لەگەڵ ئیسپانیاو فەڕەنسا کرد، بەمەش بەشێکی زۆری پارەو پوڵی بۆخۆی گلێ دایەوە. وەلێ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا چارلس لەو قەیرانە داراییە ڕزگاری نەبوو کەلەسەر شانی مابوویەوە. قەرزی نیشتیمانی گەیشتە یەك ملیۆن پاوەندی ئیسترلینی، ئەمەش بەهۆی ئەو جەنگانەی کە بەرۆکی گرتبوو، ئەم قەیرانەماڵیە بەشێوەیەك بوو کە داهاتی وڵات بەشی تێچونەکانی دەوڵەتی نەدەکرد، ئەمە لەکاتێکدا پاشا قەرزەکانی فەرامۆش کردبوو. ئیدی پادشا بە هەموو هۆکارێك دەستی کرد بە کۆکردنەوەی ماڵو داهات،چا چ یاسایی بوایە، یاخود نایاسایی، وە نەبێ چارلس لە جوغزی داواکاری مافەکان چوبێتە دەرێ، بەلام ئەمانە لەگەڵ روحیەتی گەلی ناڕازیو پەرلەمان نەدەهاتەوە .

لەو بوارانەی کە چارلس پەنای بۆ برد، بەمەبەستی کۆکردنەوەی داهاتو دارایی، وەرگرتنی سالانەی هەر ئەرزو عەقارێك بوو لەشێوەی غەرامە، کە لە چل پاوەند کەمترنەبوو. هەرچەندە ئەمە شتێکی یاسایی بوو بەڵام لەسەردەمی هنری حەوتەمەوە پشت گوێ خرابوو،پادشا جگە لەمە داهاتی لەباجی دارستانەکانیشەوە دەست دەکەوت، جاهەر زەویەك پێشتر دارستان بوایە بەلام لەم کاتە دارستان نەبوایە، ئەوا پێویست بو سەوز بکرێتەوەو باجی بخرێتەسەر. چارلس لەپال ئەمانەدا لەگەل کۆمپانیاکانیش رێککەوت، بەوەی قورغکاری پێدان لەبەرامبەر وەرگرتنی برێك دارایی،

---

Ibid; p. 82 1

بۆ نمونە قۆرغکاری پیشەسازی صابونو مەیو خوێ. جگە لەمانە چارلس باجی کەشتی گێڕایەوە کە ئەمەش بوە هۆی تورەکردنی خەڵکی . بەندەرەکانی ئینگلیز پێشتر کەشتی لێ دروست دەکرا بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە وڵات، بەڵام کاتێک حکومەتی ئینگلیزی گەلە کەشتی دامەزراند هەر بۆ ئەم مەبەستەی پێشوو، ئەم بەندەرانە لەپیشەسازی کەشتی قەدەغە کران. چارلس داوای لەم شارانە کرد سالانە برێك پارە بدەن بۆ گەلە کەشتی ئینگلیزی، لە بەرامبەر لاچونو نەمانی دروستکردنی کەشتی. کاتێکیش یەکێ لەخەڵکی ئەم شارانە بەناوی جۆن هامرن، بەخشینی ئەم باجەی ڕەت کردەوە، بەبیانوی ناقانونی بوونی ئەم باجە، بەرەو دادگایان ڕاپێچ کردو هەر لەوێش سەر زەنشت کرا. بێوریتانەکان لە هەموو ناوچەکانی ئینگلتەرا نارەزاییان دەربریو باجی کەشتیان بە باجێکی ناشەرعی دایە قەڵەم، هەروەك ڕایانگەیاند: ئەم باجە پێچەوانەیە لەگەڵ داواکاری مافەکان کە چارلس خۆی لە ساڵی 1628ڕەزامەندی لە سەری نیشانداوەو پەسەندی کردوە. لە هەمان کاتدا چارلس پەنای برد بۆ دادگا بۆ ئەوەی ئەم باجە بە یاساییو شەرعی دابنێت، ئەمانیش لە بەشەرعیبونی ئەم باجە پێداگریان کردو تەئکیدیان لە سەرکردەوە [1]. جگە لەهەموو ئەمانەی بوونە هۆی نارەزایی بوونی خەڵکی، هۆکارێکی تریش پاڵنەربوو بۆ بێزاری دەربڕین، ئەمیش هۆکاری ئاینی بوو.

پرسی ئاینی لایەنێکی گرنگی گەلی ئینگلیزی بوو. چارلس "ولیم لود"ی کردە سەرۆکی ئەساقیفەی "کانتربەری" بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری کلێسای ئینگلیزی، کە بەرزترین پۆستی ئاینی بوو لە ئینگلتەرا. کاتێك "ولیم لود" ئەم پۆستەی پێدرا، هەموو یاسا توندو تیژەکانی دەرهەق بە کاسۆلیکی سوك کرد، وە مۆلەتی پێدان ئاهەنگ سازکەنو بەرەو یانەی شەوانە بڕۆن بە مەبەستی گوێ گرتن لە مۆسیقاو کات

---

1 Ibid:pp.83-85

بە سەر بردنو ڕابواردن "مەبەستمان لەڕابواردن ئەو مانایە نیە کە لە کوردیدا هەیەتی"، ئەمە لە کاتێکدالەلای پیۆریتانەکان حەرام کرابوو. ئەمانە بەشێوەیەك پیۆریتانەکانی پەستو بێزارکردو ناڕەزاییو نیگەرانیان گەیشتە ڕادەیەك، کە هەزارانیان ولاتیان جێهێشتو ڕوویان کردە ئەمریکا. شیاوی باسە "ولیم لود" لەگەڵ پیۆریتانەکان بە توندی دەجولایەوەو باش نەبوو لەگەڵیان.

**شۆڕشی سکۆتلەندە (1638):-**

"چارلس" دەیویست تعالیمی کڵێسای سکۆتلەندی کالڤنی بگۆڕێو ڕێکیبخات بەگوێرەی تعالیمو سیستەمی کڵێسای ئینگلیزی، کەپاشماوەی سیستەمی کاسۆلیکی بوو. لەم کاتەدا پیاوانی ئاینی سکۆتلەندی پەیمانێکیان لە نێوان خۆیاندا بەستو، سوێندی یان خوارد کە پارێزگاری لە کڵێساکەیان بکەنو هەموو ئەو ئوسقوفانە دەربکەن کە "چارلس" دەیاننێرێ بۆ جێبەجێ کردنی پرۆسەی گۆڕانکاری. پاش ئەمە شۆڕشیان بەرپاکرد. کاتێك چارلس لە یەکەم تێکهەڵچوندا لە ساڵی 1639 نەیتوانی بەسەر شۆڕشگێڕاندا زاڵ بێت، لەساڵی 1640 بانگهێشتی پەرلەمانی کرد بۆ کۆبوونەوە، بە مەبەستی دەستکەوتنی خەرجی پێویست بۆ سەرکوت کردنی شۆڕش. کاتێك پەرلەمان کۆبویەوەو پادشا ئامارەی نەدا بە پێشێلکاریەکان، سەرکردەی نەیاران دەستیان کرد بە گفتوگۆکردن لەسەر پێشێلکاریەکان بەبێ ئەوەی ئامارە بدا بە خەرجی، هەروەك کردەوەکانی حوکمی تاکڕەوی یان خستە بەرباس کە لەساڵی 1629 ەوە دەستی پێ کردبوو. کاتێك پاشا بێ ئومێدبوو لە دەستکەوتنی خەرجی، دووبارە پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە. شیاوی باسە ئەم پەرلەمانە بە پەرلەمانی کورت خایەن ناسرا، چونکە لەسێ هەفتە زیاتر بەردەوام نەبوو. هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان لە 5/مایسی 1640 لەلایەن پاشاوە هەڵەیەکی گەورەی سیاسی بوو کەپاشا ئەنجامیدا. بەهۆی ئەوەی پەرلەمانی کورت خایەن ئەو کارانەی ئەنجام نەدا کە

پەرلەمانی دوای خۆی ئەنجامی دا، واتا:"پەرلەمانی دوای پەرلەمانی کورت خایەن، بەو کارانە هەستا، کە پەرلەمانی کورت خایەن ئەنجامی نەدا". ئەنجومەنی لۆردات ئامادە بوو بۆ ناوبژی نێوان پاشاو ئەنجومەنی گشتی، بە تایبەت کاتێ کە بڕیار وابوو باس لە شۆڕشی سکۆتلەندی بکرێ، هەروەها کاتێك داواکاری ئەم پەرلەمانە کورتخایەنە کەم بوون‌و نەدەگەیشتە ڕادەی بێ ئومێدبوون، بەو شێوەی کە پەرلەمانی دواتر پێی گەیشت.

## جەنگی ناوخۆیی‌و شۆڕشی ئینگلیزی

## 1649-1644

پادشا بە مەبەستی تەیارکردنی سوپا بۆ دەرپەڕاندنی سکۆتلەندیەکان لە باکوری ئینگلترا، ویستی بە هەموو هۆکارێك ماڵ‌و دارایی کۆبکاتەوە. پادشا نەیتوانی پەرلەمان لە تشرینی دووەمی 1640 کۆبکاتەوە. چونکە 60٪ ی ئەندامە هەڵبژێردراوەکانی لەپەرلەمانی پێشوو دانیشتبوون. گوتراویشە کە زۆرینەی ئەندامانی هەرێمە دەوڵەمەنەکان دژو نەیاری پادشاو کۆشکی شاهانە بوون.

### پەرلەمانی درێژخایەن:-

پەرلەمانی درێژخایەن بۆیە پێی دەوترێ درێژخایەن، چونکە لە ساڵی 1640 تاوەکو ساڵی 1660 بەردەوام بوو. ئەم پەرلەمانە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بەهرەمەند بێت بە دەسەلاتی باڵای دەوڵەت، هەروەها خۆی گێل دەکرد لە فەرمانەکانی ئەنجومەنی لۆردات‌و پادشا کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی گەل تێکدەگیرا. کاتی خۆیشی "جیمسی یەکەم" دانی نابوو بە مافی پەرلەمان لە دەرکردنی وەزیر. لەم کاتەشدا ئەنجومەنی گشتی دەیتوانی زیندانیان بکات‌و لە داریان بدات، لەم نێوانەشدا سەرۆکی ئەساقیفەی کەنتربری"ولیەم لود، توماس‌و ینتوروس" ناسراوبە

"ئـایرل ئـۆف سـترافۆرد" دەسـتگیرکرد، تەنانـەت بـە تۆمـەتی ناپـاکی گـەورە "سـترافۆرد"ی – لـە داردا. ناپـاکی "سـترافۆرد" ئـەوە بـوو کـە ویـستبووی سـوپای ئێرلەندی بهێنێتە ئینگلترا بۆ سـەرکزکردنی پەرلـەمان. شـیاوی باسـە "سـترافۆرد" لـە ساڵی 1629 تا ئەو کاتە ڕاوێژکاری چارلسی یەکەم بوو. هەرچەندە ئەنجومەنی گشتی بەڵگـەی تـەواوی لـە بەردەسـتا نـەبوو بۆسـەلماندنی تۆمەتەکـە، بـەڵام گـەورەکانی ئەنجومەنی گشتی ترسان لە "سترافۆرد". لەبەرئـەوە بـە لـەداردان خۆیـان لێـی ڕزگـار کرد. "ولیەم لود"یش– کە سەرۆکی ئەساقیفەی "کەنتەربەری"بـوو چارەنوسـی لـەهی هاودەردەکەی خۆی باشتر نەبوو، چونکە ئەویش تا ساڵی 1645 لـە زینـدان مایـەوەو دواتـر لـە داردرا. بەڵگـەکان ئـەوەیان دەسـەلماند کـە سـترافۆرد بـێ تاوانـە، وەلێ نەیانهێشت پارێزگاری لەخۆی بکات.

## چاکسازیەکانی پەرلەمان:ـ

پەرلەمان بەردەوام بوو لە چاکسازیە دەستوریەکانی بە:

1– هەڵوەشاندنەوەی دادگە تایبەتیەکانی وەك دادگـەی هـۆڵی ئەسـتێرە، دادگـەی باڵا. هەروەها بە نەهێشتنی دروستکردنی هەر جۆرە دادگەیەکی لەو شێوە لە داهـاتوو، جگە لەمە بە داماڵینی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری لەهەموو دەسەڵاتیك.

2– ڕێگری کردن لە سەپاندنی باج و کۆکردنەوەی، تا ئەوکاتەی ئەنجومـەنی گـشتی بڕیارنەدات، نابێ پەرلەمان لە کاربخرێ یا هەڵپەسێردرێ یاخود هەڵوەشێنرێتەوە.

3– دادوەر لەسەر بنەمای ڕێزو جـوان ئاکـاریو خـۆش ڕەفتـاری دابمـەزرێ نـەوەك لەسەر بنەمای ڕەزامەندنی پاشا. شیاوی باسە پاشا لەسەر هـەموو ئەمانـە ڕەزامەنـدی دەربڕی.

پەرلـەمان جـەختی لەسـەر ئـاینزای پرۆتـستانتی دەکـردەوە وەك ئـاینزای وڵاتو پارێزگاری لێدەکرد، کەچـی ئەنجومـەنی گـشتی بڕیاریـدا پیـاوانی ئـاینی دووربخاتـەوە

لەکاری دەوڵەتو ڕێگری لێکردن لە ئەندام بوونی ئوسقوفە لە ئەنجومەنی لۆردات. دووبەرەکی لە نێوان ئەنجومەنی گشتیو ئەنجومەنی لۆردات ڕویداو، دواتر ئەندامانی ئەنجومەنی گشتیش بوونە دوو بەش. چاکسازی ئاینی زیاتر مەیلی بەلای پەیامو بنەماکانی ئاینزای پیۆریتانی دابوو. پیۆریتانەکان زۆرینەی پەرلەمانیان پێکهێنابوو، ئەنجومەنی لۆرداتیش نەیدەویست پێکهاتەکەی بگۆڕێ. کاتێك ئەنجومەنی گشتی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کردە فرمانو بەسەر لایەنی بەرپرسیاری داسەپاند، ئەنجومەنی لۆردات ناڕەزایی دەربڕی، بەوبیانوەی کە ئەوەی ئەجومەنی گشتی پێی هەڵدەستێ چاکسازی نییە، بەڵکو شۆڕشێکە لە هەموو بوارەکانی وڵات. بەو بیانوە ڕەزامەندی لەسەر بڕیارەکان نەنواند.

لەهاوینی 1641 پادشا بەمەبەستی ڕاکێشانی سەرکردەکانی سکۆتلەندا بەلای خۆیدا، سەردانی سکۆتلەندای کرد. وەلێ پەرلەمانی سکۆتلەندی سوربوو لەسەر ئەوەی کە دامەزراندنی فەرمانبەرانی پادشا دەبێ لەلایەن پەرلەمانەوە بێت، پادشاش ئەمەی ڕەتکردەوە. بەمەش پادشا ڕێسەکەی بوویەوە خوریو نەیتوانی هاوکاری سکۆتلەندیەکان بەدەستبێنێ[1].

کاتێك پادشا گەڕایەوە ئینگلترا بینی کە ئەنجومەنی لۆردات چاکسازی ئاینی پەسەند نەکردوەو قبوڵی نییە، لەمەشدا بەشێك لەئەندامانی ئەنجومەنی گشتی پیشتیوانیان دەکردن. پاشا لەلێدوانێکدا ووتی:" کۆمەڵێك لەپیۆریتانەکان دەیانەوێ ویستی خۆیان بەسەر ئینگلترا بسەپێنن". بەشێکی زۆر لە خەڵکی هەستیان کرد کەمافی پاشا زیاد لە پێویست لەلایەن پەرلەمانەوە پێشێل دەکرێ. ئەنجومەنی لۆردات نەیدەویست ئەنجومەنی گشتی بەهرەمەند بێت لە دەسەڵاتێك کە زیاتر بێت لەهی پاشا، بەڵکو دەیویست دەسەڵاتی پاشاو پەرلەمان یەکسان بێت. سەرەڕای ئەوانە چەندین دەستەو گروپی ئاینی پەیدابوون کە بەبێ وابەستە بوون بە تەعالیەمەکانی

---

Ibid; pp. 99-105 1

کلێسا ئینجیلیان ڕاڤەدەکرد بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان. لە ڕاستیدا هۆکاری سەرەکی بۆ بە جەماوەرنەبوونی پادشا، ترسان بوو لە گەڕانەوەی کاسۆلیکو پاپەویەت بۆ وڵات بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕش لە ئێرلەندا. پەرلەمانیش بۆ ئەوەی جەماوەربوونی خۆی بگێڕێتەوە، لە پایزی 1641 ڕەشنوسێکی 119مادددەیی لەژێرناوی "ناڕەزایی گەورە" پێشکەشی پاشاکرد. مەبەستی سەرەکیشی لەم ڕەشنوسە ڕاکێشانی میللەت بوو، وە وڵامێکیش بوو بۆ ئەوانەی لایەنگری پاشا بوونو دەیانوت: "پەرلەمان خەریکە دژایەتی مافە سەرەکیەکانی پاشا دەکات". لەبەرامبەر هەموو ئەمانەداپاشا ڕەزامەندی نواند لە هەمبەر هەموو ئەو چاکسازییانەی کە پەرلەمان پێی هەستابوو.

"ناڕەزایی گەورە" دادەنرێت بە ڕەشنووسی مەترسیدارو گرنگترین بەڵگەنامەی مێژوویی دەستوری ئینگلیزی کە خەڵکی لە سەردەمی خۆیدا دانیان پێیداهێنا. پاشا ویستەکان پێیانوابوو مەبەست لەم ڕەشنوسە تۆمەتبارکردنی پاشایە بەشتێك کە نەیکردووە. لە دیدی خەڵکانی بیانی "ناڕەزایی گەورە" فێڵێك بووە کە سەرکردەکانی ئەنجومەنی گشتی ویستویانە بەهۆیەوە جەماوەری خۆیان دروست بکەنەوە، ئەو جەماوەرەی کە لە هاوینی 1641 لە دەستیان چووبوو، بەهۆی تۆمەتبارکردنی پادشاو بە سوك دانانی کارەکانی پاشا لەڕابردووو ئەم کاتە. ئەم ڕەشنوسە تێکپەڕێندرا بە زۆرینەیەکی کەم[1] واتا: "نیوە کەمێ زیاتر دەنگیان لەسەری داوە". دواتر پێشکەشی پاشاکرا بۆ پەسەندکردنی[2].

"چارلس" خۆی بەرپرسیار نەکرد بەڕەت کردنەوەی ئەم ڕەشنوسە و، ڕایگەیاند کە لە ماوەیەکی دیاری کراودا دەیەوێت نەك هەر ڕەزامەندی دەنوێنێ لەسەر ئەو یاسانەی داندراون، بەڵکو ئەو ئازادیانەش دەبەخشی کە لە سنوری دادو ویژدان دایە، پارێزگاریش دەکات لە کلێسای ئینگلیزی. لە ڕاستیدا چارلس لەم کاتەدا خاوەنی

---

Ibid;PP.118-123 2

هێزبوو، زۆرینەی ئەنجومەنی لۆردات لەگەڵی دابوون و دەیتوانی زاڵ بێت بەسەر سەرکردەکان و گەورەکانی ئەنجومەنی گشتی، ئەگەر هاتبایە وابەستەی ئارام گری و دانایی و حیکمەت بوایە.

شۆڕشی ئێرلەندی لە دوای لە داردانی "ستراففۆرد" هەڵگیرسا، ئەم بە دەستێکی ئاسنین زاڵ ببوو بەسەر ناوچەکەدا. ئێرلەندیەکان زۆرێك لە پرۆتستانتیەپیۆریتاتیەکانیان کوشت. کەهەر ئەمە وایکرد پەرلەمان سوپایەك دیاری بکات بۆ سەرکوتکردنی شۆڕش، لەپاڵ ئەوەشدا پەرلەمان مەبەستی ئەوەبوو کە خۆی سەرکردەی سوپا دیاری بکات، لە ترسی ئەوەی پادشا نەتوانێ سوپا بخاتەکار بۆ ملکەچکردنی پەرلەمان. لەم کاتەدا درۆیەك لە ئینگلترا بڵاوبوویەوەو کەوتە سەرزاران، بەوەی کە ئێرلەندیەکان بەناوی پادشاوە شۆڕش دەکەن. لە بەرامبەر ئەمەدا پەرلەمان لە دەسەڵاتی دەستوری و پادشا تێپەڕاند، سەرەڕای ئەوەی ئەنجومەنی گشتی بەوەندە نەوەستا، بەڵکو ویستی سوکایەتی بکات بە پادشا، بەتایبەت بە هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی ئوسقوفیەت لە ئینگلتراو کردنی بە کالڤیزم، ئەمەش بە دامەزراندنی منستر لە جیاتی ئەساقیفەو دەرکردنی دوانزە ئوسقوف لە ئەنجومەنی لۆردات.

کاتێك قوڕەکە خەستر بوو گەورەکانی ئەنجومەنی گشتی لیستەیەکیان پێشکەشی پەرلەمان کردو تیایدا پێشنیاری دامەزراندنی سەرکردەیەکی گشتیان کرد بەمەبەستی هەستانی بەکاری سەربازی و کۆکردنەوەی باجی پێویست بۆ موچەی سوپاو ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی.

لەم کاتەدا چارلس خۆی بە خاوەن نەکردو بڕیاری دەستگیرکردنی پێنج سەرکردەی ئەنجومەنی گشتی دەرکرد کە گرنگترینیان "جۆن پیم"ی سەرکردەی نەیاران و "هامدن" و "هالس" بوون. چارلس ئەمانی تۆمەتباری کرد بەوەی کە هەوڵدانیان داوە یاساکانی وڵات پێشێل بکەن و سکۆتلەندیەکان بانگهێشت بکەن بۆ

هێرش کردنە سەر ئینگلترا. ئەمجا بەشی باکوری ولاتە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان. بەلام ئەم پێنج ئەندامە دەست پێشخەریان کردو زوو بە فریای خۆیان کەوتنو هەلاتنو خۆیان حەشاردا. ئیدی پاشا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە جەنگی ناوخۆیی هەردەبێ ڕوویداتو قۆناغێکە دەبێ پێیدا گوزەر بکات[1].

## جەنگی ناوخۆیی:-

چارلس لە سەرەتای 1642 لەندەنی جێ هێشتو لە گەلێشدا جگە لە سی کەس کەسی تری لەگەلٚ نەبوو، ئینجا دەستی کرد بە ئامادەکاری بۆ بەرەنگاری کردنی سوپای پەرلەمانی، ئەمەشی تەواو کردو لە دوای دە مانگ "10مانگ" لە "ئەیدج هێل" توانی ڕووبەڕوی سوپای پەرلەمانی ببێتەوە بەهۆی ئەو سیاسەتەی کە"ئیدوار هاید" بۆی داڕشت بوو. "ئیدوارد هاید" ئەندامێکی دیاری ئەنجومەنی لۆردات بوو، بەلام بوو بەپشتیوانی پاشا. "ئیدوارد هاید" لە ئەنجومەنی گشتی هەندێ لە گوتەکانی "جۆن پیم"ی بەکار هێناو، ئەمەی کردە بنچینەیەك بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتی خۆی. "جۆن پیم" لە یەکێ لە بۆنەکانو لە پەرلەمان ووتی: "یاسای ڕاست ئەو یاسایەیە کەدەتوانێ ڕەوا لە ناڕەوا جیاکاتەوە. پادشا لەپێداگیریەکانی لە مافی شەرعی خۆیو نایاسایی کردنی داواکاری پەرلەمان پشت دەبەستێ بە لە دەستدانی ویستی پەرلەمان لە دانپێدانان بە دەستوری پەیڕەو کراو، بەو پێ یەی کە ناگونجێ بۆ وولات وپێویستە بگۆڕدرێ. بەشی زۆری پەرلەمان ڕەزامەند نی یە لەسەر یاسایەك کەلە بەهرەمەند بوون لە هەرێمەکان دیاندەمالێت، لە کاتێکدا یاسا پارێزگاری دەکات لە پەرلەمانتارانو لە لێپرسینەوە دەیانپارێزێ. سەرکردەکانی پەرلەمان لە کاتێك گۆڕان لە دەستوردا دەکەنو نەیارەکانیان دەردەکەن کە ئەوان نوێنەرایەتی تەواوی خەلکی ناکەن، ئیدی

1 Ibid;PP.124-125.

زۆر بـە ئاسـانی دەتوانرێـت تۆمـەتی ئـەوەیان بخرێتـە پـاڵ کـە ئـەوان حکومـەتێکی خۆسەپێن دادەمەزرێنن".

مەبەستی "پیم" لەم قسانە ئەوەبوو کە بڵێ: "ڕای گشتی ئینگلیزی لە ماوەی دوو ساڵدا گۆڕاوەو زۆرینەی بۆتە چەپڕەو". کەواتە ئەگەر بێت هەڵبژاردنێکی نوێ بەڕێوە بـچێ ئـەوا چـەپڕەوەکان زیـاتر دەتـوانن حکومـەتێك دامـەزرێنن کـە زیـاترو تـەواوتر نوێنەرایـەتی خـەڵکی دەکـەن. وە هـەر حکومـەتێکیش پەرلـەمانی ئـەمڕۆ دایمـەزرێنێ نوێنەرایـەتی گـەل ناکـات، چـونکە حکومەتەکـە ڕاسـتڕەوەو بـەلای چـەپڕەوەکان حکومەتێکی خۆسەپێنە.

نەخشەو بەرنامەی سیاسی پەرلەمان لە (19) مادەدا کورت ببوویەوە کە پەرلـەمان لـە حـوزەیرانی (1641) پێـشکەشی پاشـای کـردو بـوو بـە بناغـەو ئەساسـی شـەڕی ناوخۆ. پوختەکەیشی بریتی یە لەوەی کە بە ڕەزامەندی پەرلەمان ڕاوێژکاری دەوڵەتو گەورە فەرمانبەرانو دەسەڵاتدارانی قەڵا دابمەزرێنن، تەنانەت پەروەردەو پێگەیانـدنو ڕۆشنبیرکردنی منداڵانی پاشا بەڕەزامەندی پێویستە پەرلـەمان بێـت، نـەك هـەر ئەمـە بەڵکو هاوسەرانیان کەسانێك بن پەرلـەمان متمانـەی پێیـان هـەبێت. هـەروەها یاسـای توندو ڕەق لە هەمبەر کاسۆلیك پیادەبکرێو لۆردە کاسۆلیکەکانی ئەنجومەنی لـۆردات دەربکرێن، هەروهاپادشا بـە گـوێرەی ڕێنماییـەکانی پەرلـەمان چاکسازی لـە کڵێـسادا بکاتو وازۆ بکات لەسەر دامەزراندنی میلیشیا. وە ئەو لۆردانەی کە چارلس هـەقی بـوو بەتوندی ڕەتی کاتەوە، چونکە هیچ دەسەڵاتێکی بۆ پاشا نەهێشتبوویەوە. ئەوەبوو لە وەڵامـی دا ووتـی: "ئەمـە هەسـتی گاڵتـەکاری سـوکایەتی پێکـردن دەجـوڵێنێو هـیچ دەسەڵاتێك بۆ پاشا ناهێڵێتەوە جگە لە ناوێکی بـێ نـاوەڕۆك". سـەبارەت بـە کڵێـساو دەوڵەتیش چارلس ووتـی: "لێرەدا هیچ شتێك نییە بگاتە کڵێسای ئینگلیزیو بنەماکانی لەڕاستیو پاکیدا، وە هیچ حکومەتێكو یاسـاو کـارێکی جـوانترو باشـتری نییـە لـەوەی ئێمە. منیش دەیپارێزم لەپاپەویەتو پیۆریتانیە جوداخوازەکان[1] ".

---

I bid;PP.126

ئەوانەی کە لە ژێر بەیداخی پادشایەتی ڕادەوەستان، ئەوانە بوون کە بەپاڵنەری گوێڕایەڵی بۆ تەختی ئینگلیزیو پارێزگاری کردن لە کڵێسا پاڵ دەنران. زۆرێکیش لە بەرئەوەی باوەڕییان بە تیۆری مافی خودایی‌و پیرۆزی پادشا هەبوو بەلای پادشادا هاتن. ئەوەتە "ئایدمۆند ڤیرنی" دەڵێ:" من حەز ناکەم دووبەرەکی دروست بێت، بەڵکوپڕبەدڵ حەز دەکەم پادشا داواکاریەکانی پەرلەمان جێبەجێ بکات، تاوەکو ویژدانم ئارام دەبێت‌و شوێنی پاشای گەورەم دەکەوم، ئەو پاشایەی بەنیعمەتەکانی ئارامشی پێدام. من خواردنی ئەو دەخۆم‌و ماوەیەکی زۆر خزمەتم کردوە، لە خۆشم ڕازی نابم لەکاتێکی تەنگانەدا جێیبهێڵم".

جگەلەمە هۆکاری کۆمەڵایەتیش هۆکارێکی تربوو بۆ پیشتیوانی پادشا، کاتێك دەبینین خاوەن زەوییەکان لە گوتارەکانی دژە پادشا دەترسان کاتێك دەیانووت:"هەتا ئێستا ئەوان خزمەتی خانەدانانیان کردو ئەوان گەورە بوون، ئێستاش دەوری ئەوان کۆتایی هاتووەو پێویستە خزمەتمان بکەن". لەبەرئەوە زۆرێك لە خاوەن زەوییەکان‌و خانەدانان لایەنگری پاشا بوون‌و بینیان بەرژەوەندییان دەکەوێتە مەترسی ئەگەربێت‌و پاشایەتی بکەوێت.

ئەوانەی کە لایەنگری پەرلەمانیان کرد زۆربەی زۆریان لە چینی ناوەڕاست‌و بازرگانان‌و فرۆشیاران بوون، ئەوانەی بەهۆی لێپێچانەوەو سەندنی باج لێیان زیانیان بەرکەوتبوو. ئەوانە زۆرینەیان لە پیۆریتانیەکان بوون‌و نوێنەرەکانیان زۆرینەی پەرلەمانیان پێکهێنابوو. بەشێکیش لەوانە ئەوانەبوون کەلە دەسەڵاتی پاپەویەت دەترسان‌و لەو بڕوایەدابوون کەپادشایەتی بایەخی پێدەدات. هەروەها هۆکاری ئاینی لەگەڵ هۆکاری سیاسی‌و ئابوری بوو بە یەك، زۆرینەی پشتیوانانی پەرلەمان گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیان گەرەك بوو، پەرلەمانیش سەروەری پەرلەمان‌و ئازادییان دەویست‌و دژی پادشایەتی ڕەها بوون.

پەرلەمان باوەڕی وابوو کە پادشا ناتوانێ سوپا ڕێکبخاتو دایمەزرێنێ، چونکە کاتێك لە کانونی دووەمی 1642 لەندەنی جێ هێشت، بێ هیوا بوو. پادشا لە مانگی ئازار گەیشتە شاری "یۆرك"، دواتر ڕووەو باشور ئاراستەی گرت. لە ئابی هەمان ساڵدا "نوتنگهامی" خستە ژێرپارێزگاری خۆی، تەنانەت لەم کاتەشدا جگەلە "800" سوارو "300" پیادە، هیچی تری لەگەڵ نەبوو، بەمەش توشی بێ هیوایی بوو. تەنانەت هەندێ لە ڕوێژکارانی پێشنیازیان بۆکرد کە لەناکاو بگەڕێتەوە لەندەن.

لەڕستیدا پادشا پێش ئەوەی لەندەن جێ بێڵێ، هەرلە سەرەتاوە خێزانو منداڵەکانی ناردە فەڕەنسا. لە شەشی ئەیلولی هەمان ساڵدا پەرلەمان بەیانێکی دەرکردو تیایدا هاتبوو: "کە ئەوان سەربازەکانیان لە خزمەتی سەربازی دەرناکەن، مادام "چارلس" ملکەچی داوای پەرلەمان نابێت. ئەو کەمتەرخەمانەی پەرلەمان دەنگی لە دژ دەرکردن پێویستە لەسەریان ئەرکی سوپا بخەنە ئەستۆی خۆیان، وە پێویستە نەیارانی پەرلەمان قەرزەکانی پەرلەمان بدەنەوە. ئەم گوتارەی پەرلەمان گشتیگربوو. هەر کەسێ لە خۆی ترسابووایەو بێلایەن بووایە خۆی چەکدار دەکردو بەلای پادشادا دەچوو بە مەبەستی پارێزگاری کردن لە خۆی. ئیدی لەپێش کۆتایی هاتنی ئەیلول پادشا توانی هەزار سووارو شەش هەزار پیادە بۆخۆی کۆبکاتەوە، بەلاّم سیابەختی لەوەدابوو چەكو تفاقی کەم بوو. "هناریتا ماریای" خێزانیشی لە هۆڵنداوە نەیدەتوانی چەكو تفاقی پێبدات، بەهۆی ئەوەی هێزی دەریای ئینگلیزی لایەنگری پەرلەمان بوون. جگە لەمە پادشا بواری مادیشی کەم بوو. هەر ئەمەش ناچاری کرد موڵکەکانی زانکۆی "کمبرجو ئۆکسفۆرد"و کەلوپەلی زێروزیو بفرۆشێو بڕێ ماددەو خەرجی لە بنەماڵە دەوڵەمەندەکان دەست خۆی بخات.

بەپێچەوانەوە پەرلەمان لە ڕووی چەكو ماددە وە لە بارێکی زۆر باشدا بوو، بەلاّم پەرلەمانیش لەلایەکی ترەوە کەمو کوڕی هەبوو، کەخۆی دەبینیەوە لە سەربازەکانی. بەو پێیەی سەربازەکانیان ئەزمونی جەنگیان کەم بوو شارەزاییو چاونەترسیو

جەرەبەزیان کەم بوو. سوپا سالاری پەرلەمان " ئاسیکس"بوو کە پێشڕەوی پینج هەزار سوارەو بیستو پێنج هەزار پیادەی چەکداری دەکرد. هەموو ئەم هێزە لە تشرینی یەکەمی 1642 لە ئیدج هێلّ ڕووبەڕوی پادشا بویەوە.

سوارەکانی پادشا توانیان سوپای پەرلەمان لە "ئیدج هێلّ" گەمارۆ بدەنو بەسەریاندا سەرکەون، وەلێ هەلێکی زێرینیان لەدەستدا بۆ لە ناوبردنی دوژمانانیان، کاتێك بەدوای سوارەکانی پەرلەمان کەوتن، کە بەهۆیەوە پیادەکانی پەرلەمان توانیان سەرکەون بەسەر پیادەکانی پاشادا، بەلاّم کاتێك سوارەکانیان گەڕانەوە هەردوو سوپا هاوسەنگ بونەوەو جەنگەکە یەکلانەبوویەوە. چارلس توانی بالاّدەست بێت بەسەر شاری "بانبری"و بگەڕێتەوە ئۆکسفۆرد، لە کاتێکدا هێزەکانی پەرلەمان گەڕانەوە لەندەن.

سوارەکان لە دوو سالّی یەکەمی جەنگ سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. سوارەکان توانیان دەستبگرن بەسەر باشوری خۆرئاوای ئینگلترا، کە بە هۆیەوە پادشا ویستەکان بەهێز بوون لەخۆرئاواو باکور. لە کاتێکدا پەرلەمانیەکان لە خۆرهەلاّتو باشور خاوەن هێز بوون. پەرلەمان بەسەرکردایەتی "بیم" توانی لەگەلّ سکۆتلەندیەکان پێکبێتو ناکۆکیەکانیان نەهێلّن، دوای ئەوەی کلّێساکانیان کردە یەك کلّێسای کالّڤنی لە هەردو ولاّت لەسەر شێوازی کلّێسای سکۆتلەندی. بەمەش پێش ئەوەی مانگی دیسمبر "کانونی یەکەم"ی 1643 بێت، "پیم" توانی سکۆتلەندیەکان لە خزمەتی خۆیدابخاتەکار، وەلێ لەمانگی دیسمبر "پیم" لە دونیا دەرچوو چاوی لێکنا. پاش هەشت مانگ لەمردنی پیم هەردوو سوپای پادشاو پەرلەمان لە تەموزی 1644 کەوتنە جەنگ. سوپای پادشا بە هەژدە هەزار سەربازەوە بە سەرکردایەتی "ڕوبرت"ی کوڕی خوشکی چارلس، ڕووبەڕووی سوپای پەرلەمانی سەرخڕ بوونەوە"سوپای سەرخڕ: هی پەرلەمان بوو، کەسەریان دەتاشی. پێدەچێ تاشینی سەریان بە شێوەیەك بووبێ، کە سەریان شێوەیەکی خڕی نواندبێ". سوپای پەرلەمان لەگەلّ

سوپای سکۆتلەندی ژمارەیان دەگەیشتە "27" هەزار سەربازو لە بەرامبەر "18" هەزارسەربازی سوپای پادشا کەوتنە جەنگو لە تێکهەڵچونی "مارستن مور" سوپای پەرلەمانی توانی سەرکەوێ بەسەر باشترین سەرکردەی سوپای پادشا "ڕوبرت". بەڕاستی ئەم تێکهەڵچوونە گەورەترین ڕووبەڕووبونەوە بوو لە جەنگی ناوخۆداو بەهۆیەوە باکوری ئینگلترا لە بەردەم پەرلەمان ئاوەڵا بوو کەوتە دەستیان. لەملاشەوە پادشا ویستەکان بەهۆی سەرکەوتنیان بەسەر هێزەکانی "ئیسکیس"ی سەرکردەی پەرلەمان، باشوری خۆرئاوای ئینگلترایان کەوتە بن دەست، دوای ئەوەی ئەم سەرکردەیە لە ئەیلولی "1644" خۆی ڕادەستی پادشاخوازەکان کرد.[1]

ڕۆڵی کرۆمۆویل لەم کاتەدا دەرکەوت، کاتێك هەستا بە ڕێکخستنی سوپاو ناوی لێینان سوپای نمونەیی. پەرلەمان لە توانای دا هەبوو سوپاکەی بە ماددەو چەك تەیار بکات، ئەمە لە کاتێکدا پادشا خوازەکان لەم دوو بوارەیان کەم بوو.

جەنەڕاڵ "فیرفیکس" بووبە سەرۆکی گشتی سوپاو "کرۆمۆویڵ" بووبە جێگری وفەرماندەی سوارەکان. جوتە سەرکردە لە هاوینی 1645 لە جەنگی نیسبی لە "12/حوزەیران" توانیان سەرکەوتنێکی مەزن بە دەست بێنن بەسەر سوپای پادشا. سوپای پەرلەمانی توانی ناوچەکان لە بەرهەڵستکاری سوارەکان پاك بکەنەوە. ئیدی پادشا وەك پەنابەر لە "ئۆکسفۆرد" بە تەنها مایەوەو لە 24/ حوزەیرانی 1646 خۆی ڕادەستی سکۆتلەندیەکان کرد[1].

---

1 Trevelyan.G M England under the Stuarts(Penguin،1960)،pp.226-227. also pp.245-246 -
1 Ibid;pp.254-259.

## شۆڕشی دووەمی ئینگلیزی ( 1647-1649 )

جەنگی ناوخۆیی بە خۆبەدەستەوەدانی پادشا کۆتایی هات، پەرلەمانش هەر وابەستە بوو بەو پەیمانەی کە لەگەڵ سکۆتلەندیەکان مۆری کردبوو. سکۆتلەندیەکان ڕۆڵی سەرەکیان گێڕا لە هەردوو جەنگی یەکلاکەرەوەی "مارستن مۆرو، نیسبی"، کە لە هەردووکیاندا پەرلەمان سەرکەوتنی بەدەستهێنا. ناوەڕۆکی پەیمانەکە باس لە دامەزراندنی کڵێسای سکۆتلەندی"پریسپیتاری"دەکات لە ئینگلتەرادا، کە ملکەچی دەوڵەتە. بەبۆچونی زۆرینەی پیۆریتانەکان کڵێسای سکۆتلەندی جیاوازی نییە لەگەڵ کڵێسای ئینگلیزی لە هەمبەر دەسەلاتی دەوڵەت بەسەریداو سەپاندنی دروشمە پەرستشکاریەکان. ئەم پیۆریتانانە دەیانویست کڵێسای سەربەخۆو ئازاد دابمەزرێنن، کە بەهۆیەوە ناونران سەربەخۆخوازان. بەرەبەرە ژمارەیان زیادی کردو بوونە خاوەن هێزو کەسی خاوەن پێگە لەسوپای نمونەییدا.

لەهەمان کاتدا پەرلەمان پەیمانەکەی بەجێهێناو کڵێسای پریسپیتاری سکۆتلەندی لە ئینگلترا دامەزراند بێ گوێدانە سەربەخۆخوازەکانو ئامانجی ئەوان لە دامەزراندنی کڵێسای ئازاد. لە سەرەتایسالی (1647) پەرلەمان فرمانی دا بە ئافرۆز " تسریح" بوون لە سوپای نمونەیی بەبێ پێدانی پاشماوەی موچەکانیان. بەلام سوپا ئەمەی ڕەت کردەوەو بە هەڵبژاردنی سەرکردە بۆسوپا نەخشەی کاری خۆی داڕشت. کاتێك پەرلەمان هەستی بە سازبوونی شۆڕشی سوپا کرد، ویستی لەگەڵ پاشا ڕێککەوێتو بیگێڕێتەوە سەر دەسەلات. بەلام سوپا دەست پێشخەری کردو خێرا پادشای دەستگیرکرد. لەم ماوەیەشدا بیرە سیاسیە تازەکان لەسوپادا لە پەرەسەندن دا بوون. وەك تیۆری "مافە سروشتیەکان بۆ مرۆڤ"، کە کاریگەری هەبوو بەسەر نوسەرانو بیرمەندان لە ئینگلتراو ئەمریکاو فرەنسا. ئەم تیۆرە پێداگیری دەکرد لەسەر ئەوەی کە "حکومەتی شەرعی پشت دەبەستێ بە ڕەزامەندی ژێردەستەکانی. حکومەتی پەرلەمانیش پێویستە پێکبێت لە یەك ئەنجومەن، ئەم ئەنجومەنەش لە ڕێگەی دەنگ

دانێکی گشتی هەڵبـژێردریٚو تـەنها نێرینـەکان بەگشتی دەنـگ بـدەنو دیموکراتیـەتی سیاسی پێکبێت".

کرمۆویل باوەری بە دیموکراتیەت نەبوو، خۆیشی لـەم بارەیـەوە دەڵـێ: "زۆرینـەی گەلی ئینگلیز دیموکراتیـەتیان ناوێت، هەرچـەندە لـە ڕوویـی تیۆریشەوە چـاك بێـت." کرۆمۆویل بە پێشکەش کردنی "سەری پێشنیازەکان" سوپای هێنایە ئەو بڕوایـەی کـە نـەیاری کردنـی پادشـا چارەسـەرە. ئەمـەی کرۆمۆویـل باسـی لـە لێبـوردەیی ئـاینیو باڵادەستی پـەرلـەمان بەسـەر میلیـشیاو کاروبارەکـانی دەوڵـەت دەکـرد بـۆ مـاوەی دە ساڵ. هەروەها داوای دەکرد هیچ کەس ناچار نەکریٚ کلێسای پریسپیتاری سـکۆتلەندی پەسـەند بکـات، وە دەسـەلاتێك نـەدریٚ بـە ئەسـاقیفە کـە بتـوانیٚ زۆرە ملێـی بکـات. هەروەك داوای هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی درێژخایەنو هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی نوێی دەرکـرد لەسـەر بنـەمای بەخـشینی مـافی زیـاتری هەڵبـژاردنو دامەزرانـدنی بازنـەی یەکسانی زۆرتر بۆ هەڵبـژاردن. سـاکاتێکیش چـارلس ئـەم داواکارییانـەی ڕەتکـردەوە، کرۆمۆیـل کەوتــە هەڵوێـستێکی ناڕەحەتــەوە. ڕادیکاڵیـەکان کـە خۆیـان نـاو نـابوو "ئیلیـڤێر[1]"، کاریگـەریان هـەبوو بەسـەر سـوپا. کرۆمۆیـل هەوڵیـدا خـۆی بپـارێزیٚ لـە شـۆڕش. سـەربازانی سـوپا بـە کاریگـەری "ئیلیڤێـر" دەسـتورێکیان دانـا بـەناوی "ڕێککەوتنی گەل"و، تیایدا داواکرابوو بە ڕیفراندۆمێکی گشتیو وازهێنـان لـە پادشـاو پەرلەمانو گەڕانەوە بۆ گەل وەك سەرچاوەیەك بۆ تەواوی دەسەلاتەکان. "ڕێککەوتنی گەل" پاشایەتیو ئەنجومەنی لۆرداتی ڕەت دە کردەوەو دەسەلاتی دەخستە پەرلەمان ، پەرلەمانێك کە لە یەك ئەنجومەن پێکبێتو لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی گشتی "نێرینـە" هەڵبژێردریٚ. جگـە لەمـە بەندوباریـشی لەسـەر پەرلـەمان دانـا، بەوپێیـەی کـە هەنـدیٚ

---

1 بۆیە ئەم ناوەیان لە خۆیان نابوو، چونکە دەیانویست خـەڵکی والێبکـەن یەکسان بـن لـە ڕووی سیاسەتەوە.

ئازادی تاکە کەس هەن پەرەلمانیش ناتوانێ قەدەغەی بکاتو لە خەڵکیان بستێنێ. کرۆمۆیل دەیگوت:" ئایا بەڕاستی گەلی ئینگلیزی ئامادەیە ئەم سیستەمە وەرگرێ؟". کرۆمۆویل سەختیو قورسی دەدیت لە جێبەجێکردنی ئەم دەستورە. ئیدی لەگەڵ هاوەڵانی توانی بڕوا بە سوپا بێنێ کە زیاتر میانگیربن لە داواکاریەکانیان. ئەم گوتوێژو گفتوگۆیانەی کە لەنێوان ئەندامانی سوپا بڕێوەچوو بوو بە بەشێك لە دەستوری ویلایەتە یککگروتوەکان.

کرۆمۆیل هەوڵیدا پاشایەتی ڕزگاربکات، بەلام نەیتوانی چارلس ڕزگاربکات. وتوێژەکانی نێوان سوپاو پادشا دەریخست کە پاشا هەوڵدەدات سود وەرگرێ لە جیاوازیو ناکۆکی نێوان شۆڕشگێران، بەو مەبەستەی ئەوەی لەجەنگ لەدەستی دا، بەدەستی بێنێتەوە. هەروەك یەکێ لەپیاوانی سوپا دەڵێ :" کاتێ چارلس پێشنیازەکانی سوپای ڕەتکردەوە، پەرلەمانیش متمانەی خۆی لە بەرامبەر سوپا لەدەستدا. کاتێکیش پاشا ڕێککەوتنی کرد لەگەڵ سکۆتلەندیەکان لەسەر ئەوەی کە سوپاو تەخت بگێڕێتەوە بۆ پاشا لەبەرامبەردا پاشا بۆماوەی سێ ساڵ کلێسای پریسپیتاری دابمەزرێنێ، سوپای بەتەواوی لە خۆی تورەکرد". لەم کاتەدا سکۆتلەندیەکان شالاویان هێنایە سەر ئینگلتراو، زۆرێك لەپادشا ویستەکانیش پشتیوانی پادشایان کرد. بەلام سوپا دووبارە یەکی گرتەوە، دوای ئەوەی ناکۆکیەکانیان نەهێشت، وە لەساڵی 1648 ڕووبەڕووی سوپای سکۆتلەندی بوونەوەو سەرکەوتن بەسەریاندا. لەم ماوەیەی کە سوپا لەجەنگدا بوو لەگەڵ سکۆتلەندیەکان، پەرلەمان لەگەڵ چارلس ڕێککەوت بەوەی کە چارلس بگەڕێتەوە سەرتەخت بەو مەرجەی نەرم ونیانی لە ئایندا نەنوێنێ. ئەمەش کۆتایی سەردەمی پادشایی بە دیارخست.

کاتێك سوپا بەسەرکەوتویی گەڕایەوەو بڕیاری کۆتایی هێنانی پادشاو پەرلەمانی دەرکرد. ئیدی لە (6/کانونی یەکەمی/ 1648) سەرهەنگ "پراید"[1] لەگەڵ دەستەیەك

---

1سەرهەنگ :عەقید

لە سەربازان لە بەردەم دەروازەی پەرلەمان ڕاوەستاو پشتیوانانی کڵێسای سکۆتلەندی لە چوونە ژوورەوە قەدەغە کرد. ئەوە بوو پەرلەمان لە هەموو ئەو ئەندامانە پاك کرایەوە کە پشتیوانی سوپایان نەدەکرد. بەهۆیەوە لە کۆی 504 ئەندام کە لە ساڵی 1604 هەڵبژێردرابوون تەنها شەست ئەندام مانەوە. پەرلەمان پاك کرایەوەو، ناوی ڕامپ Rampی بەسەردا بڕا، ئینگلترا لە ئێستاوە بەرەو داهاتوو کەوتە ژێر فەرمانی سوپا[1].

## لەداردانی چارلسی یەکەم:-

دوای ئەوەی سوپا کۆتایی هێنا بە پاك کردنەوەی پەرلەمان، ئەو ئەندامانەی کە لە ئەنجومەنی گشتی دا مابوونەوە داوایان کرد ئەنجومەنی لۆردات لیژنەیەك پێکبێنێت بۆ دادگایی کردنی چارلسی یەکەم. کاتێکیش ئەنجومەنی لۆردات بڕیاری ئەنجومەنی گشتی ڕەت کردەوە، ئەنجومەنی گشتی لەسەرەتای ساڵی 1649 بڕیاریدا دەسەڵاتی دادوەری بۆ گەل بێت، مادام پەرلەمانیش نوێنەرایەتی گەل دەکات، ئەوا بەهرەمەندە لە دەسەڵاتی باڵا، وەپەرلەمان هەر یاسایەك دەربکات یاسایە، جا پادشاو ئەنجومەنی لۆردات لەگەڵ ئەم یاسایە بن یا لەگەڵی نەبن. لە ژێر ڕۆشنایی بارودۆخی تازە چارلس لە 30/کانونی دووەمی 1649 لە سێدارە درا. لەڕاستیدا ئەو لیژنەیەی دانیشت بۆ دادگایی کردنی چارلس، نوێنەرایەتی گەلی ئینگلیزی نەدەکرد لەم کاتەدا، لەبەرئەوە ئەم دادگایی کردنەو ئەم لە سێدارەدانە نا یاسایی بوو. لە سێدارە درانی پادشا کاریگەری دروستکرد لەسەر گەلی ئینگلیزیو کیشوەری ئەوروپا، زۆرینەی زۆری خەڵکی پەرۆش بوون بۆی، تەنانەت ئەوانەیشی کە لە دژیشی ڕاوەستانو لەگەڵیدا دەجەنگان حەزیان نەدەکرد چارەنوسی بەم ڕۆژە گەیشتبا. کاتێك سەری خوێناوی پادشا کەخوێنی لێ دەتکا لە بەرامبەر خەڵکی بەرزکرایەوە دوای لە سێدارەدرانی بە

---

[1] I bid;pp.260-276.

شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هوتاف کێشانی سەربازان لە نێو گریان‌و شین‌و شەپۆڕی جەماوەر وون بوو[2].

وەنەبێ شۆڕشی ئینگلیزی بەهۆی تێکچوونی کۆمەڵگەی ئینگلیزی ڕوویدابێ، یاخود بەهۆی ململانێی چینایەتی هەڵگیرسابێ، وەك ئەو ململانێی چینایەتیەی کەفرەنسا پێش شۆڕش‌و لەکاتی شۆڕش بەخۆیەوە بینی. بەڵکو شۆڕشی ئینگلیزی لە ئەنجامی ململانێ کردن بوو لەسەر جێبەجێ کردنی پرسی ئاینی‌و سیاسی لە کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران‌و بەهێز سەریهەڵدا. لەمەوە دەتوانین بڵێین: کە هۆکارەکانی شۆڕش تەنها ئابوری یان کۆمەلایەتی نەبوو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ. بەڵکو ئەمە گەلی ئینگلیزیش بوو کە بوویە دووبەرەی ناکۆك‌و دژ بە یەك، لەهەر بەرەیەکدا ژمارەیەك خانەدانان‌و چینی ناوەڕاست هەبوون. هۆکاری ئاینیش ڕۆڵێکی سەرەکی گێڕا هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە تاکۆتایی. کاریگەری ئەم پرسەش کەمتر نەبوو لەپرسی سیاسی.

## دیکتاتۆریەتی سەربازی ئۆلیڤەر کرۆمۆویل

## 1658-1649

ئەنجومەنی گشتی پاك کرایەوەو ڕایەگەیاندرا کە ئینگلترا کۆماریەو پادشاو ئەنجومەنی لۆرداتی نی یە. ئەم کۆمارە دیموکراتی نەبوو، کاتێك دەبینین ئەفسەرە پیۆریتانیەکان نەیانهێشت هەڵبژاردن بەڕێوەبچێت، بەهۆی ئەوەی دەیانزانی کە زۆرینەی گەلی ئینگلیزی لە دژیانن. هەر لەبەرئەوەش پشتیان بە سوپا بە بەستبوو، بەمەبەستی بالادەست بوونیان بەسەر دام‌و دەزگاکانی دەوڵەت. پەرلەمان دەسەلاتی جێبەجێ کردنی گەڕاندەوە بۆ ئەنجومەنی دەوڵەت، کەپێکهاتبوو لە چل‌و یەك ئەندام، کە سی ئەندامیان لە ئەنجومەنی گشتی ئەندام بوون. دەسەلاتی یاسادانانیش لەپەرلەمانی کۆن دامایەوە کە لە شەست ئەندام پێکهاتبوو. ئەوانە نوێنەرایەتی کەمێك لە گەلی ئینگلیزیان دەکرد، ئەم کەمەش پیۆریتانیە توندڕەوەکان

بوون. کۆماریەکان پشتیوانیەکی گەرمو گوڕی لە دەرەوە بەدەستنەهێنا، چونکە کۆماریەکان کەمینە بوون لە ئینگلتراو بەکوتەك خۆیان بەسەر گەلی ئینگلیزی دا سەپاندبوو. ئەو کۆماریانە پیاوانی سوپا بوون و تانیبوویان دەسەلاّتیان بەدەستەوە بگرن.

حکومەتی کۆماری لە دوای لەداردانی پاشا لەژێر هەڕەشەی هەلگەڕانەوەی پاشا ویستەکان دابوو. سکۆتلەندیەکان هاوکاری ئینگلیکانە ئینگلیزەکانیان کرد بۆ پارێزگاری کردن لە چارلسی دووەمی کوڕی چارلسی یەکەم. کاسۆلیکەکانی ئێرلەندیش شۆڕشی سەرکەوتوویان لەدژی حکومەتی ئینگلیز ئەنجامدا. وەلێ حکومەتی ئینگلیز ڕووبەڕووی ئەم کێشانە بوویەوە زۆر بە ئاسانی بەهۆی ئەوەی لە ڕووی ئابوریو سەربازیەوە بەهێزبوو. ئەمە لەکاتێکدا دژەکانیان لە هەردوو ڕووەکەوە لاواز بوون.

کرۆمۆویل لەساڵی1650 توانی سوپای ئێرلەندی بەخراپی تێکبشکێنێ، پاش ئەمە لەساڵی1651 ڕووی کردە سکۆتلەنداو تێکیشکاندن، ئیدی چارلسی دووەم جگە لەڕێگەچارەی هەلاّتن هیچی تری بۆنەمایەوە، هەربۆیە ڕای کردە فەرەنسا. کرۆمۆویلّ لە کێبڕکێی بازرگانیدا لەگەلّ هۆلّندا سەرکەوتنی بەدەست هێناو پەرلەمانی ئینگلیزیش بۆئەم مەبەستە یاسای کەشتیوانی دەرکرد. بەپێی ئەم یاسایە دەبوایە کالاّی ئینگلیزی لەسەر پشتی کەشتی ئینگلیزی یاخود لەسەر کەشتی داگیرگەکانی بێت. هەرچەندە کرۆمۆویلّ ئەم کارانەی ئەنجام دا، وەلێ لە دامەزراندنی دەسەلاّتێکی بەردەوام شکستی هێنا. دەسەلاّتێك کەبتوانێ جێگەی سیستەمی پاشایەتی دێرین بگرێتەوە کە ساڵەهابوو ئینگلیزەکان پێی ڕاهاتبوون. هاوکات هەر گەلی ئینگلیز پیۆریتانو سوپایان بەشومو نەگبەت سەیر دەکرد.

## کرۆمۆویلّ دەبێتە چاودێری بالاّی دەولّەت (1653 -1658):-

"ئۆلیڤەر کرۆمۆویلّ" لەساڵی(1599) لەدایك بووەو سەر بەخاوەن زەویە بچوکەکان بوو، وە لە ساڵی (1629) دەبێتە ئەندام پەرلەمان . دەرکەوتنی کرۆمۆویلّ

دەگەڕێتەوە بۆ جەنگی ناوخۆ، چونکە لەوێدا وەك سەرکردە هەرە بەرچاوەکان ڕۆڵی دەگێڕا. کرۆمۆویلْ خاوەن ویستێکی پۆلاینو سروشتێکی ئاگرینو بیروباوەڕێکی قوڵو بەهێزبوو، هەمیشە تێکستەکانی ئینجیلی لەسەر زمان بوو، هەروەك خۆیشی دەڵێ:" کاردەکەم بۆ ئەو ئەرکەی خودا خستویەتیە ئەستۆم". ئینگلتەرا لەسەردەمی ئەودا گەیشتە خۆشگوزەرانیو پێشکەوتنێك کە مەگەر لەسەردەمە کورتکانی پادشا بەهێزەکان پێی گەیشتبێ، ئەگینا پێی نەگەیشتبوو.

کرۆمۆویلْ پۆستەکەی بە زەبری هێز بەدەست هێنا، بۆیە سەخت بوو بۆی کە بتوانێ فەرمانڕەوایی بکات بەفەرمانڕەوایەکی دەستوری پەرلەمانی. هەبۆیە فرمانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی دەرکرد، کاتێکیش پەرلەمان فرمانەکەی ڕەت کردەوە، کرۆمۆویلْ لەساڵی (1653) گەمارۆی دانو فرمانی چۆڵ کردنی دەرکرد. ئیدی دەستی کرد بە دەسەلاتێکی دیکتاتۆری بۆماوەی پێنج ساڵو نیو. پاش ئەمە لەژێر سەرپەرشتیاری ئەنجومەنی سەربازی دەستورێکی دەرکرد بەناوی "دەستوری نوێ". بەگوێرەی ئەم دەستورە خۆی بووبە سەرۆکی دەوڵەت تا کۆتایی ژیانی و، خۆی ناونا چاودێری بالای ئینگلتەراو ئێرلەنداو سکۆتلەندا. هەروەها ئەم دەستورە دەسەلاتێکی فراوان پێ بەخشی، تەنانەت مافی ئەوەی پێدا کە لە دوای خۆی سەرۆکی دەوڵەت دیاری بکات.

لە فەرمانڕەوایی کردنیدا ئەنجومەنی دەوڵەت هاوکاری دەکرد، کەپێك هاتبوو لە ئەندامە مەدەنیەکانو هەڵدەستان بە مشورگێڕانی دەسەلاتی جێبەجێ کردن. "دەستوری نوێ" وازی لە پەرلەمان نەهێناو دەستبەرداری نەبوو، بەلام پەرلەمانیش ئەو پەرلەمانە بەهێزە نەبوو، بەڵکو داردەستێك بوو بە دەستی کرۆمۆویلو بەئارەزوی خۆی هەڵیدەسوڕاند. دیکتاتۆریەت لە ئینگلتەرا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، چونکە کرۆمۆویلْ کەسێکی چاپوكو بەهێزو کارا بوو، لەژێر سەرکردایەتیو بالی ئەمدا سوپا شکانی بەخۆوە نەدەبینیو خەزێنەش بەتالْ نەدەبوو، سیاسەتێکیشی لە دەرەوە

پـەیڕەودەکرد کەبەرژەوەنـدی ئینگلتـەڕای تیـادا ڕەنـگ دەدایـەوەو پێگـەو سـەنگی ئینگلتەڕاشی دەپاراست.

## گەڕانەوەی پاشایەتی بۆ ئینگلتەڕا

کاتێك کرۆمۆیل سالّی 1658 مرد، "ریچاردی" کـوڕی بـوو بـە چاودێری بـالاّ. ئـەم گەنجە نیازپاکو بیّ توانا بوو، نەیدەتوانی بەسـەر ئـەم ناکۆکیانـەدا زالّ بێـت، کـە لـە ولاّتدا پەرەی سەند بوو. لەوێدا سـەرکردە هـەبوو دەسـەلاّتێکی دیکتـاتۆری دەویـست، هەشبوو کۆماری گەرەك بوو، هەروەك تیایاندا هەبوو دەیویست بەگێڕانەوەی بنەمالّەی سـتیورات پادشـایەتی بهێننـەوە سـەر دەسـەلاّت. هەربۆیـە ڕیـچارد دەسـتبەرداری پۆستەکەی بوو. ئیدی هەر لەم کاتەدا جەنەراڵ "مۆنك" یـەکیّ بـوو لـە سـەرکردەکانی هێزی کرۆمۆیل" ڕێگـری کـرد لـە کەسـی سـەربازی کـە جێگـەی کرۆمۆیـلو کوڕەکـەی بگرێتەوە.

پاش ئەمە سوپاسالار فرمانیدا بە کۆبونەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی، بە مەبەسـتی هەلّبـژاردنێکی ئـازاد. وتوێـژیش لەگـەلّ بنەمالّـەی سـتیورات دەسـتی پێکـرد، بـۆ گەڕانەوەیان بۆ سەر دەسەلاّت لەسەر ئەو مەرجانـەی کـە چارلـسی دووەم لـە نیسانی 1660 لە "بریدای" هۆلّندا ڕایگەیاندو دەلّیّ: "ئەو پارێزگاری دەکات لـە "ماگناگـارت ،پەیمانی مەزن"و "داواکاری مافەکان"، ئەوەی کە باوکی لەسـالّی 1628 ڕەزامەنـدی لەسەر دابوو. هەروەك ئەوەشی ڕاگەیاند کە کاروباری ئاینیو دارایی بۆ پەرلـەمان جـیّ دەهێلـیّو ڕادەسـتی ئـەوانی دەکـات. پاشـان لێبـوردنێکی دەرکـردو، تـەنها ئەوانـەی نەگرتەوە کە پەرلەمان بە پێویستی دەزانی سزا بدرێن، بەهۆی ئەوەی دەنگیـان دابـوو لەسەر لە سێدارەدانی بـاوکی. جگـە لەمـە چارلـسی دووەم بڕیاریداڕێکخستنی زەویو موڵـكو سـامانەکان بخرێتـە سـەر کارەکـانی پەرلـەمانو بـۆ ئـەمانی جێبێلـیّ، کـە لـە سەردەمی شۆڕشەوە لەدەستیان بوو. هەروەك ڕەزامەندی نیـشاندا لەسـەر گشت ئـەو قانونو یاسانەی کـە بـاوکی لەسـالّی 1642 واژۆی کردبـوو، وە سـەرجەم ئـەو بڕیـارو

گەلاڵەنامانەی هەڵوەشانەوە کە لە دوای ئەم مێژووە داڕێژرابوو. ڕۆژی لەسێدارەدانی باوکیشی کردە مێژووی هاتنی بۆ سەرتەخت 1649.

چاررلسی دووەمی کوڕی چارلسی یەکەم لە "دۆڤەر" دابەزیو لە مایسی 1660 بوو بەپاشای ئینگلترا. بەگەڕانەوەی بنەماڵەی ستیورات بۆ سەر تەختی دەسەلات کۆتایی بەسەرجەم ئەم بارگۆڕانانە هات کە وڵات پێیدا تێپەڕیو دەسەلاتی تاکڕەویش ئاوابوو، کە جیمس ی یەکەمو چارلسی یەکەم دەستیان پێوە گرتبوو. گەلی ئینگلیزی بە گەرمو گوڕیەکی زۆرەوە پێشوازیان لە چارلسی دووەم کرد. لەژێر سایەی پادشایەتیدا کاروبارەکان چونەوە شوێنی خۆیانو کلێسای ئینگلیزی بوو بە کلێسای ڕەسمی.

چالس پیاوێکی زیرەكو ڕوخۆشو جوانپۆش بوو، سەرەڕای دەستگرتنی بەدەسەلاتی ڕەها، بەلاَم دەیزانی تاچەندو تاکوێ بەردەوام بێت لەسەری، بەبێ تێکگیرانی لەگەڵ پەرلەمان. چارلس ئەزمونی دەبینیو دەیدی کە بە جەخت کردنەوەی باوکی لەسەر مافی خودایی پاشاکان، خودا دەستی نەخستە ڕزگارکردنی. هەربۆیە هەر کاتێك کارێك لەنێوان خۆی پەرلەمان ئاڵۆزبووایە، ئەوا خۆی دەخستە ژێربار. چارلس چەند جارێك دووپاتی کردبوویەوە، کە ئەم حەزناکات جارێکی تر دوورکەوێتەوەو بچێتە وڵاتانی بیانی. ئەم خۆی بە پاشایەکی دەستوری پەرلەمانی لە قەڵەم دەدا. هەروەك لە لێدوانەکانی "بەریدا" ئاماژە بەوە بوو.

بەلاَم چارلسی دووەمو براکەیشی جیمس کاریگەر بوون بە ئایینزای کاسۆلیکیو دەسەلاتی ڕەها. ئەمەش شتێکی ئاسایی بوو کاتێ دەبینین دایکیان "هنریتا ماریا" کچی هنری چوارەمی کاسۆلیکیە، وە چارلسو جیمس هەر لە منداڵیەوە لەکۆشكو دەرباری لۆیسی چواردەدا پەروەردە ببونو کاریگەر بوون بە دەسەلاتی فەرەنسا. جا کاتێك چارلس لە ساڵی 1660 گەڕایەوە، نەیتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بێتو خۆڕاگرێ لە دەسەلاتداریەتی پەرلەمانو دەستگرتن بە کلێسای

ئینگلیزی. لەگەڵ ئەوەشدا کە کاسۆلیکیو دەسەلاتی ڕەهای لە خۆدا دەرنەخست، بەلام لە ناکۆکیەکی بەردەوام دابوو لەگەڵ پەرلەمان، ئەم ئاشکرانەکردنەش نهێنی مانەوەی بوو لە دەسەلات. چارلس بەهۆی زمان لوسیو شاردنەوەی ڕووی ڕاستی خۆی ئامانجەکانی خۆی دەشاردەوەو بەخۆ هەلکێشانەوە سەرزەنشتی وەزیرو ڕاوێژکرانی دەکرد، ئەوانەی ببوونە قوربانی هەڵەکانی چارلس.

پەرلەمان پاش ماوەی مافە دەرەبەگیەکانی هەڵوەشاندەوە، ئەو مافانەی پادشا بە کۆکردنەوەی داهات پشتی پێدەبەست. ئەم هەڵوەشاندنەوە لە ترسی دووبارەبوونەوەی هەمان ئەو ڕەوشە بوو کە لەسەردەمی چارلسی یەکەمو جیمسی یەکەم هاتە ئارا لە ناکۆکیان لەگەڵ پەرلەمان. ئەم ڕێوشوێنەی کە پەرلەمان لەهەمبەر مافە دەرەبەگیەکان گرتییە بەر، خالی وەرچەرخان بوو بۆ ئاوابوونی هەموو تیۆرە دەرەبەگیەکان لە ئینگلترا، هەروەك پێداگریش بوو لەسەر تیۆرە سەرمایەداریەکان و کەرتە تایبەتیەکان. خاوەن زەویەکان سودێکی زۆریان بینی لە هەڵوەشاندنەوەی پاشماوەی کارە دەرەبەگیەکان، لەم نێوانە چارلس لەبەرامبەر ئەمەدا 100000پاوەندی ئستریلینی لە پەرلەمان وەچنگ کەوت، کە وەك باجێك دانرا بوو لەسەر مادده کهولیەکانو، سەرجەم چینەکانی گەل دەیاندا. ئەمەو لەگەڵ کۆی باجەکانی تری وەك باجی عقاراتو داهاتی بەرید، کە سالانە دەگەیشتە 1200000 پاوەندی ئەستریلینی، ئەمەش بەس بوو بۆ خەرجیەکانی دەربارو حکومەت. بەلام بە نسبەت چارلسی دووەم ئەوەندە بەس نەبوو، کاتێ دەبینین چارلس کەسێکی دەست بلاوو مسریف بوو، بەرتیلی دەدا بە ئەندامانی پەرلەمانو دەیویست سوپایەکی سیستماتیك دابمەزرێنێ بۆ بەهێزکردنی دەسەلاتی خۆی.

بێزاریو ناڕەزایی بالی بەسەر خەلکیدا کێشا، تەنانەت خاوەن زەویەکانیش بێزار بوونو خەرجی دەربارو کۆشکی پاشایان بە زۆر دادەناو ئیدانەی ئەم هەموو خەرجیە زۆرەیان دەکرد، هەروەك لەناو خەلکی ئەمە بلاوبوویەوە کە گوایە چارلس سوپای

بێگانە بەکاردەهێنێ بۆ ملکەچکردنی ئینگلیز. لە ئەنجامی ئەوەدا پەرلەمان زۆر زیاتر لە جاران بە وردیو خەرجیەکانی دەرباری هەڵدەسەنگاندو بودجەی پاشایی دادەنا بەگوێرەی پێداویستیەکان، هەروەك داوای لیستەی حیساباتیشی دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا چارلس بە هەموو هۆیەك بەردەوام بوو لە قەرزکردنی سەروەتو سامان. لەم نێوانە هەستا بەقەرز کردنی بڕی ملیۆنێكو دووسەدوپەنجا هەزار پاوندی ئیسترلینی، پاشان لە ساڵی 1672 ڕایگەیاند کە پێویستە ئەم قەرزە ببێتە قەرزێکی بەردەوام. هەروەها لە ساڵی 1672 ڕێکەوتنێکی ژێربەژێری لەگەڵ لۆیسی چواردەدا سازدا. بەگوێرەی پەیمانەکە لۆیس دەبوایە ساڵانە بڕی دووسەد هەزار پاوند بدات بە چارلس لەبەرامبەر هاوکاری کرانی لە جەنگی هۆڵنداو ئیسپانیاو خۆیشی بچێتە پاڵ کڵێسای کاسۆلیکی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە هاوکاری لۆیسی کرد، نەچووە پاڵ کڵێسای کاسۆلیکی.

لەبارەی سیاسەتی ئاینیەوە، چارلس بە هاوکاری چینی ئەرستۆکراتی توانی پرۆتستانتیە پەڕگیرەکان"پیۆریتانیەکان" ناچار بکات خۆیان بگونجێنن لەگەڵ کڵێسای ئینگلیزی، ئەمەش بەگوێرەی یاسای گونجان کە پەرلەمان لە ساڵی 1662 دایڕشت. بەڵام جوداخوازەکان لە پیاوانی ئاینی لەپۆستەکانیان داماڵرانو ناچارکران لە دوری پێنج میل لە کڵێساکانیان جێگیر بن، ئەمەش بەپێی یاسای "پێنج میل" کە پەرلەمان لە ساڵی 1665 دایڕشت. تەنها کاتێك ئەمەیان لەسەر هەڵدەگیراو وازیان لێ دەهێنرا ئەگەر ڕەزامەندیان لەسەر تعالیمی کڵێسای ئینگلیزی نواندبایەو سوێندی گوێڕایەڵیان خواردبا بۆ پاشا. وە ئەگەر سەردانی کردنی جواداوازەکان بەمەبەستی کۆبوونەوە بۆ کڵێساکانیان دووبارە بێتەوە ئەوا بەگوێرەی یاسای کۆبوونەوەی ساڵی 1664 سزادەران بە کارکردنی قورسو زەحمەتی هەمیشەیی لەدورگەی هیندی خۆرئاوا.

کاتێك پەرلەمان زانی کە دژایەتی کردنی پیۆریتانەکان لەلایەن چارلسی دووەمەوە بەهۆی سۆزو خۆشەویستی چارلس نی یە بۆ ئینگلیکانی ئەوەندەی بەهۆی سۆزو لایەنگریەتی بۆ کاسۆلیکیەت. لەگەڵ پیۆریتانەکان ڕێککەوتن لەدژی سیاسەتی پادشا. جیمسی برای پادشاش لە ساڵی 1672 بە ڕاشکاوانە کاسۆلیکی بوونی خۆی ڕاگەیاند، لەهەمانکاتدا چارلس بەیانی لێبوردەییو ڕاگرتنی ئیجرائاتەکانی لە بەرامبەر کاسۆلیكو جوداخوازەکان ڕاگەیاند. لەم کاتەشدا ئەوەبڵاوبۆوە کە چارلس پارەی وەرگرتوە لە لۆسی چواردە.

پادشا مافی ئەوەی هەبوو کە یاساکان لە نێوان کاتێك بۆ کاتێکی تر هەڵپەسێرێ. بەڵام ئیدی پەرلەمان ئەوەندە بەهێز ببوو دەیتوانی ئەم یاسایانەی دایان دەڕێژێ بیان سەپێنێ، ئەوەبوو داوای لە پاشا کرد ئەم بەیانە هەڵوەشێنێتەوە. لەم کاتەدا ئەوە بڵاوبۆوە کە کاسۆلیکەکان پیلان دەگێڕن لەدژی ئاسایشی وڵات، کە ئەمە بووەهۆی چەوساندنەوەی کاسۆلیكو کوژرانی ژمارەیەك لەکاسۆلیکە دیارەکان.

لە ساڵی 1679 پەرلەمان گەلاڵە نامەیەکی دەرکرد، بۆ لادانی جیمس ی برای چارلس لەسەر تەخت. لە ماوەی دەمەتەقێ کردن لەسەر لادانی جیمس، پەرلەمان ڕەزامەندی نواند لەسەر یاسای "هیبس کورپس، Habeus cor pus "، بە گوێرەی ئەم یاسایە دەست بەسەرکردنو زیندانی کردن بەبێ بڕیاری فەرمی دادگاو ڕوونکردنەوەی هۆی گیران وبەندکرن قەدەغە دەکرێ. ئەرستۆکراتیەکان لە پەرلەمان لەبارەی پرسی لادانی جیمس کە ببوو بە کاسۆلیکی، ببوون بە دووبەش. بەشێکیان پشتیوانی لادانیان دەکردو لەمەدا پیۆریتانو جواداواز پڕۆستانتەکان بە شێوەیەکی گشتی پشتگیریان دەکردن، ئەمانە ناونران "هویگ، شۆڕشگێڕان"،"چونکە پڕۆتستانتەکان هەستان بە شۆڕش کردن" بەشەکەی تریشیان کە زیاتر میانڕەو بوون بەلای جیمس داو، دەیانویست ئەو بارودۆخەی کە لەکلێساو دەوڵەتدا هەیە ڕایبگرن لەپێناوی ڕێگری کردن لە دووبارە بوونەوەی جەنگی ناوخۆیی. ئەمانە پابەند بوونو

دەستیان گرتبوو بە کڵێسای ئینگلیزی‌و ڕایانگەیاند کە پادشا دەستەبەرکاری ئاسایشی ململانێی نێوان ئەرستۆکراتی‌و بازرگانانە. هەر بۆیە مل دان بۆ پادشایەکی کاسۆلیکی باشترە لەوەی وولات ڕووبەڕووی جەنگێکی تری ناوخۆیی بێتەوە. ئەمانە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا لە دوای ئەوەی ئەنجومەنی لۆردات گەلاڵە نامەی لادانی جیمسی ڕەت کردەوەو لە ساڵی 1680. ئەمانە کە پشتیوانی "جیمسی کاسۆلیکیان کرد ناسران بە "تۆری".

لە ساڵانی کۆتایی فەرمانڕەوایی چارلسی دووەم، نەیاری کردنی هویگز بە سەرکردایەتی لۆرد "شافستبری" دای لە زیادی. پڕوپاگەندەیەك بڵاوبۆوە بەوەی کە "هویگز" پیلان دەگێڕن بۆ کوشتنی چارلس‌و لەسەر تەخت لادانی کوڕە ناشەرعیەکەی "مونماوت". ئەمەو چەند پڕوپاگەندەی تریش کاردانەوەی دروست کرد لەلای تۆریەکان، بۆیە بەبێ بانگ کردنی پەرلەمان لە 1681تا 1685، سەرکردەکانیان دوورخرانەوە بۆ تاراوگە. کاتێکیش چارلسی دووەم کۆچی دوایی کرد لە ساڵی 1685، مونماوت هەستا بە هەڵگیرساندنی شۆڕش، بەڵام بەخێرایی شۆڕشەکەی سەرکوت کراو جیمس بەناوی جیمس ی دووەمەوە بوویە پادشا.[1]

## جیمس ی دووەم 1685-1688 :-

جیمس ی دووەم وەك براکەی چارلس زمان لوس نەبوو، لەبەر ئەوەی ئەو سروشتێکی توڕەی هەبوو، هەروەك کاسۆلیکی بوونی خۆی‌و دەستگرتنی بە حوکمی ڕەها ڕاگەیاند. وە ئەوەشی خستەڕوو کە ئەو مافی خۆیەتی تاکەکانی گەلەکەی والێبکات لە یاساکانی پەرلەمان ئازاد بن. جیمس هەوڵیدا سوپایەکی سیستماتیك دابمەزرێنێ کە ئەفسەرەکانی کاسۆلیکی بن. لەمەدا "هویگز" دژایەتی ئەم سیاسەتەی

1 Ibid.

جیمس یان کردو تۆریش هەم دیس پێی ڕازی نەبوون. جیمس لە ساڵی 1687 یاسای لێبوردەیی دەرکرد، کە بەگوێرەی ئەم یاسایە کاسۆلیکو پرۆتستانتە جوداخوازەکان بەخشرابوو لەسەرپێچی کردنیان بەرامبەر ئەو یاسایانە. هەروەها فەرمانبەرە کاسۆلیکەکانی لەپۆستە سەربازیو مەدەنیەکان دامەزراند. لەگەڵ هەبوونی ناڕەزاییەکی توندیش جیمس دووەم لە ساڵی 1688 یاسای دووەمی لێبوردەیی دەرکردو فەرمانی دا بە خوێندنەوەی ئەم فەرمانە لە کڵێسا ئینگلیکانیەکان. کاتێکیش حەوت ئوسقوف خوێندنەوەی ئەم فرمانەیان ڕەت کردەوەو ڕازی نەبوون بە خوێندنەوەی یاسایەکە، جیمس بەسەرپێچی کردن تاوانباری کردن. وە کاتێك سوێند خۆران لە دادگە تۆمەتباریان نەکردن، ئەو ئەساقیفانە ئازاد کران. "توری" لە هێرشەکان بۆ سەر کلێسای ئینگلیزی نیگەران بوون، هەروەها بە دامەزراندنی سوپایەکی هەمیشەیی قەڵس بوون، لەملاشەوە هویگز ناڕەزاییان دەربڕی لەهەمبەر لایەنگری کردن لە کاسۆلیکەکانو نزیك خستنەوەیانو فەرامۆش کردنی یاساکانی پەرلەمان .

لەڕاستیدا ئاسان بوو ئارام بگرن لە بەرامبەر ئەو گەندەڵیانەی کە لەسیاسەتی توندڕەوی جیمس کەوتبوونەوە، مادام هیوایەکی گەورەیان هەبوو بە هاتنی "ماریو ئان" بۆ سەر تەختی دەسەڵات. ئەم دووانە کچی پرۆتستانتی جیمس بوون. بەلاّم جیمس لەساڵی 1688 لە هاوسەری دووەمی کوڕێکی بوو، کە بێگومان ئەوە وادەکات کوڕەکەشی کاسۆلیکی بێت. ئیدی هیواکان تێکشکان لەهەمبەر باشکردنی بارودۆخەکان لە دوای جیمس. ئەوەبوو شوێنکەوتەکانی کلێسای ئینگلیزی لە پارتی "هویگزو تۆری" لە پرۆتستانتیە جوداخوازەکان لەگەڵ یەکتری ڕێککەوتنو بانگهێشتی

"ماری" هاوسەرەکەی "ولیم ئۆرنج" ی دەسەلاتداری هۆڵندایان کرد بۆ ئەوەی تەختی ئینگلیزیان پێشکەش بکرێ بەناوی "ولیەم ی سێیەم" [1].

## شۆڕی جەلیلە( 1689 )

بە بانگهێشتی سەرکردەکانی تۆری‌و هویگز، "ولیم‌و ماری" هاوسەری بە سەرکردایەتی سوپای هۆڵندی لە ئاوەکانی نێوان ئینگلتراو هۆڵندا پەڕیەنەوە ئینگلتەڕا بۆ مەبەستی وەرگرتنی تەختی ئینگلیزی، بەبێ هاتنەڕێی هیچ بەرەنگاریەك. کاتێك جیمس بینی سوپاکەی ئافەڕۆزی لێکردو وازی لێهێنا، ڕایکردە فەرەنسا. بەمەش شۆڕش کاری خۆی تەواو کرد بەبێ ڕژانی خوێن. ئیدی لەلایەن کۆنگرەی نیشتیمانی ئینگلیزی کە لەساڵی 1689 بۆ ئەم مەبەستە کۆبوویەوە، تاجی پاشایەتیان پێشکەشکردن.

ولیەم ئۆرنج فەرمانڕەوای هۆڵندا بوو، وە کوڕی خوشکی چارلسی دووەم‌و جیمسی دووەم بوو. بەناوی ولیەمی سێیەمەوە بوو بەشای ئینگلترا. پەرلەمانیش لادانی جیمسی دووەمی ڕاگەیاند، ئەوەشی ڕوون کردەوە کە هۆکاری لادانی جیمس سەرپێچی کردن بوو لە دەستوری ئینگلیزی‌و نەریتی وڵات.

شۆڕشی"جەلیلە" کۆتایی هێنا بە دەسەلاتی ڕەها لە ئینگلترا، وە داکۆکی کرد لە سەروەری کردەیی پەرلەمان لە دامو دەزگای وڵات، ئیدی لەم کاتەوە پادشایەتی بەشێوەیەکی کۆتکراو مایەوە.

## یاسای مافەکان 1689 :-

پەرلەمان ڕەزامەندی نیشاندا لەسەر گەلاڵەنامەی مافەکان، کە تیایدا دەستەبەری تەواوی دەسەلاتی پەرەلمانی دەکردو ئینگلیکانی بوونی پادشایی بە پێویست دادەنا، هەروەها دەسەلاتی پەکخستنی یاسای لە پادشا دەسەندەوەو ڕێگری دەکرد لەپاشا

---

1 Ibid.

کە باج کۆبکاتەوەو لە تاوانباران ببورێ. پەرلەمان داکۆکی دەکرد لەسەر پاراستنی ئەندامەکانیو مافی گەلی ئینگلیزی لە هەلگرتنی چەكو پێشکەشکردنی سکالاو، دەستەبەرکردنی ئازادی قسەکردنو ئازادی دەربڕینی بیرو بۆچونەکان بەبێ هیچ کۆتو بەندێك. هەروەها پێداگری دەکرد لەسەر هەلبژاردنی ئازادو بەستنی کۆبوونەوەی پەرلەمانی بەشێوەیەکی بەردەوامو دادوەری کردنی ڕۆڵەکانی گەل لەلایەن دادوەری دادگەرو پیادەکردنی سوێندخواردنو خۆبەدورگرتن لە سزا قورسو گرانەکان[1].

بەپێی ئەم گەلالەنامەیە پەرلەمان مافی سەپاندنی باجی هەیە، وە دەتوانێ سوپا تەیار بکات بۆ ماوەی سالێك بە خەرجی تەواوە. وە دەبێ سالانە پەرلەمان داوابکات بۆ موچە، ئەگەر داوای نەکرد ئەوا موچەی سەربازان نادرێ، هەروەها ئەگەر پەرلەمان داوانەکات هیچ سەربازێك لەژێر باری نائاسایی سزا نادرێ لە ڕەوشێکی پەشێوو ئالۆزدا.

لەڕوی ئاینیشەوە کۆتو بەندەکان لەسەر کاسۆلیکیزم هەر مایەوە، لەکاتێکدا بەپێی یاسای لێبوردەیی پرۆتستانتە جوداخوازەکان ئازادی پەرستشکاریان پێ بەخشرا[1].

لەماوەی دەسەلاتی ولیەمی سێیەمو شاژنە ئان، پەرلەمان ژمارەیەك یاسایی دەرکرد. لەوانە: یاسای کۆبوونەوەی پەرەلمان 1694، کە باس لەوە دەکات، نابێ هەلوەشاندنەوەی پەرلەمان لە سێ سال زیاتر بێت. جگە لەمە یاسای جێگرتنەوەی لەسالێ ( 1701) دەرکرد، بەپێی ئەم یاسایە لەدوای مردنی ولیەم، تەختی ئینگلیزی دەگوازرێتەوە بۆ"ئان"ی کچی جیمسی دووەم، وە لە دوای مردنی کوڕی شاژنە ئان، بڕیاردەدرێ کە تەخت بگوازرێتەوە بۆ هەلبژێردراوی بنەمالەی هانۆڤەر. هەروەها

1Clark، G.M. The laler Start (oxord، 1955)، pp. 144-145; Also pp. 145-FF
2Ibid.

پەرلەمان لەساڵی (1707) یاسای یەکیەتی دەرکرد، بەگوێرەی ئەم یاسایەش سکۆتلەنداو ئینگلترا بەیەکخستنی پەرلەمانەکانیان بوونە یەك دەوڵەتو وڵاتێکی نوێیان دروستکرد بەناوی بەریتانیای مەزن.

## سەرهەڵدانی پارتە سیاسیەکان لە ئینگلتەڕا

لەکۆتایەکانی سەردەمی چارلسی دووەم دوو پارتی سیاسی لەیەکتر جیاواز هاتنە سەر شانۆی سیاسی ئینگلتەڕا. ئەمانیش "هویگز، تۆری"بووون. پارتی هویگز بەشێوەیەکی گشتی پشتیوانی دەکران لەلایەن هەمان ئەو گروپو کۆمەڵانەی کە لەجەنگی ناوخۆیدا پشتیوانی پەرلەمانیان دەکرد. ئەمانەش بریتی بوون لە پرۆتستانتە پیۆریتانەکان وجوداخوازەکان ئەرستۆکراتیەکان. بەلآم تۆری لەو ئەرستۆکراتیانەبوو کەپشتیوانی کلێسای ئینگلیزیوسیاسەتە کۆنو پادشایەتیان دەکرد. جیاوازیەکی ئەتۆو ڕوون نەبوو لەنێوان ئەم دوو پارتە جگە لەوەی کە هویگز بە سەۆکایەتی "ایرل شافستبری" زۆر نەیاری سیاسەتی مەیل بوونی چارلس ی دەکرد بۆ فەڕەنسا. بەلایانەوە ئاسایی بوو، کە پادشا دینی خۆی پارێز پێوەبکات، بەمەرجێ نەبێتە نەیاری کلێسای ئینگلیزیو دژایەتی نەکات واتا ( پادشا وەك خۆی هەر ئاینزایەکی هەبێت بەلایانەوە ئاسایی بوو، بەو مەرجەی کە دژی کلێسای ئینگلیزی نەبێت".

لە دەرەنجامی شۆڕشی ساڵی 1688 پێگەو گرنگی ئەم دوو حیزبە زیادی کرد، کە هەر دوولایان پشتیوانی دەسەلآتی پەرەلمانیان دەکرد بۆ هەبوونی هەژمونی بەسەر کاروبارەکانی دەوڵەت. ئەم دوو حیزبە لە سەردەمی "ولیم"دا بە نۆرە لە حوکم دا بوون. هەرچەندە "ولیم" مەیلی بەلای حیزبی تۆری دابوو، بەلآم کاتێ بینی کە مەی دەخۆنەوە. پشتی بە هویگز بەست، بەتایبەت کاتێ تێبینی ئەوەی کرد، کە سیستەمو دامو دەزگای دەوڵەت ڕێكو پێك بەڕێوەدەچێت بەنسبەت خۆی ئەگەر بێتو هویگز لە حوکم دابن. "ولیمی سێیەم" لە ئازاری 1702 کۆچی دوایی کرد، ئەمە لە کاتێکدا

دەوڵەتەکانی ئەوروپا لە دژی لۆیسی چواردە بەیەکەوە کۆبوونەوەو لەگەڵ یەك بوونو جەنگیان لەدژی ڕاگەیاند. هەروەك لە شوێنی خۆی باسمان کرد. ئەم دوو پارتە لە سەردەمی خانم "ئان" بەردەوام بوون لەسەر حوکم کردن بە نۆرە. "ئان" لە سەرەتادا تاوەکو ساڵی ساڵی 1710پشتی دەبەست بە پارتی هویگز، بەلام لە دوای ئەم مێژووە پارتی تۆری هاتە سەر حوکمو وەزارەت لەوان پێکهێنرا تاوەکو ساڵی مردنی خانم "ئان" 1714. ئەم باودۆخە بەنسبەت ئەم دوو پارتە بەردەوامی دا بەخۆی، سیستەمی دوو پارتی بوو گرنگترین دیاردەو ڕوخساری ژیان سیاسی لە ئینگلترا.

## پەیدابوونی وەزارەت ( کابینە )

سیستەمی وەزاری بوو بە نایابترین دۆخی سیاسی لە ئینگلترا. پادشاکانی بنەماڵەی ستیورات واڕاهاتبوون کە کەسێکی خاوەن دەسەلاتی سیاسی لە خانەدانان هەڵبـژێرنو پشتی پێ ببەستن لە بەڕێوەبردنی کاروباری دارایيو سەربازی. ئەو کەسەش چەند ڕاوێژکاری هەبوون کە هەریەکەی دەکردە سەرپەرشتیاری یەکێ لەدامو دەزگانی دەوڵەت. هەروەها جارجارە بۆ چاوگێڕانەوە بە کاروباری دەوڵەت لەگەڵ پادشا کۆ دەبوونەوە. ئەم کۆمەڵە کەمە لە پیاوە دیارەکانی دەوڵەت ناونران وەزارەت یاخود کابینێت، ئەمەش بەهۆی کۆبونەوەکانیان لەگەڵ پادشا لە ژورێکی بچوك، کە پێی دەگوترا کابینێت.

وەزیرانی دەوڵەت لەپێش شۆڕشی جەلیلە لەو کەسانە پێکدەهاتن کە پاشا هەڵیدەبژاردن، بەلام بەرەبەرە لە دوای شۆڕش بارودۆخ گۆڕانی بەسەرداهات، هەتا پادشا وای لێهات ناچار بوو ئەندامانی وەزارەت لە بەرپرسەکانی ئەم پارتە هەڵبـژێرێ کە لەپەرەلمان زۆرینەن. لەسەردەمی پاشا ولیمی سێیەم پارتی هویگز بە بەردەوامی لەسەردەسەلات بوون، بەهۆی ئەوەی زۆرینەی پەرلەمان لەئەوان بوو. هەمان ڕەوش لە

سەردەمی شاژنە ئان بەردەوام بوو. لەگەڵ ئەوەی پادشاکان مەیلیان بەلای پارتی تۆری دابوو، بەڵام وایان بە چاك دەزانی کە ڕەزامەندی لەسەر زۆرینە بنوێنن‌و سەرپێچیان نەکەن. پادشا سەرپەرشتی کۆبوونەوەی وەزیرانی دەکرد. بەڵام لەسەردەمی بنەماڵەی "هانۆڤەر " بە هۆی ئەوەی"جۆرجی یەکەم" زمانی ئینگلیزی نەدەزانی خۆی بە دوور دەگرت لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران و، وەزیری یەکەمی لە جێگەی خۆی دانابوو جڵەوی کارەکانی بۆ ئەم وەزیرە جێ هێشتبوو. ئیدی لەم کاتەوە وەزیری یەکەم ناونرا سەرۆك وەزیران. بەم شێوەیە:

1- بالآدەستی وەزارەت بەسەر کاروباری دەوڵەت.

2- پشت بەستن بە زۆرینە لە پەرلەمان لە هەمبەر دەسەلآتداری.

بوون بە خاسیەتی سیستەمی دەسەلآتی ئینگلترا.

## سەرهەڵدانی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا

لە بەشی یەکەمدا باسی ڕزگارکردنی ڕوسیامان کرد لە دەسەلاتی مەغۆل. ئەمەش لە سەردەمی ئیڤانی سێیەم کاتێك کە توانی هەرێمی نوڤگۆرد بخاتە پاڵ میرنشینەکەی‌و بە هاوسەرگیری کردنیشی لەگەڵ یەکێ لە نزیکانی قوستنتینی یازدە بەناوی خانم "صوفیا"، ئیڤان بانگەشەی جێنشینی قەیسەری بۆخۆی کردو ئەموستیلەی خێزانی بەکارهێنا کە هەڵۆی دووسەری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆزی لەسەر نەخش کرابوو. ئیمپراتۆر ماکسیملیانی یەکەم ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریای ڕۆمای پیرۆز نازناوی پادشا "ڤاسیلی" سێیەمی کوڕی ئیڤانی پێبەخشی. بەڵام ئەم ڕەتی کردەوە، چونکە نازناوی ئیمپراتۆری بۆخۆی هەڵبژاردبوو[1].

## ئیڤانی تۆقێنەر:-

لە سەردەمی ئیڤانی چوارەمی 1533–1584 کوڕی ڤاسیلی، میرنشینی مۆسکۆ بەهۆی دەستگرتنی بەسەر قازان‌و ئەستراخان فراوانی بەخۆیەوە بینی‌و توانی بالادەستی بنوێنێ بەسەر حەوزی ڕوباری ڤۆلگا. ئیڤان توانی چینی دەرەبەگو خانەدانان کە ناسرا بوون بە "بویارس" لەناوبەری‌و زەوی‌و زارەکانیان دابەش بکات بەسەر دەست‌و پێوەندەکانی، بەمەش چینێکی نوێی ئافراند لە خاوەن زەوی‌و زار کە ملکەچی خۆی بوون. لەملاشەوە جوتیارانی ناچار کرد لەسەر زەویەکانیان بمێننەوەو ئۆقرە بگرن بۆ خزمەتی ئەم چینە. پاشان بە یاسای ڕەق‌و توند بە زەویەکانی پەیوەست کردن. ئیڤانی چوارەم بەهۆی مامەڵەی توندو ڕەقی لەگەڵ "بویارس" بە ئیڤانی تۆقێنەر ناسرا. ئیڤان نازناوی قیصری بۆ خۆی هەڵبژارد بەو پێیەی کەنەوەی صۆفیای خانمی بێزەنتیە. "ئیڤانی تۆقێنەر" هەستا بە کاری ئاوەدانکاری‌و

---

Koenigs burdg, op. Cit, pp. 196-203 1

تەلارسارسازی. ئەندازیاری ئەڵمانیو هونەرمەندانی ئیتالی بەکارهێنا لە بنیاتنانی مۆسکۆی نوێ، کە "کرملن"و کڵێساو چەندەها کۆشکی تریان بنیاتنا. پاشان هەستا بە پەیمانێکی بازرگانی لەگەڵ ئینگلترا. کە ئەوەی دواییان کۆمپانیای "مۆسکۆ ڤی" دامەزراند لەساڵی 1558. هەروەها دەستیگرت بەسەر بەشی خۆرئاوای سیبیریا. کە بەهۆیەوە دەرگەی ئاوەڵاکرد لەبەردەم نەوەکەی بۆ گەیشتن بە زەریای ئارام.

## بوریس گۆدۆنۆڤ:-

ئیڤانی تۆقێنەر لە ساڵی 1584 مرد. کوڕە گەورەکەی خۆیشی کوشت بەناوی "ئیڤان" لەساڵی 1582. کوڕەکەی تریشی بەناوی "تیودۆر" لە ڕووی عەقڵیەوە تەواو نەبوو، هەربۆیە خاڵی "بۆرسین گۆدۆنۆڤ" کرا بەوەصی لەسەری. کاتێکیش تیۆدۆر" ڤیدۆر" لەساڵی 1598 مرد ، بارودۆخی وڵات تێکچوو بەهۆی بەردەوام بوونی "بۆریس" لەسەر سیاسەتی ئیڤانی چوارەم لە برەودان بە بەرژەوەندیەکانی بازرگانو خاوەن زەویە بچوکەکان لە دژی چینی "بویارس"، کە بووە هۆی بێزارکردنو تورە بوونی ئەم چینە لە سیاسەتی "بوریس" و، دەیانویست دەسەڵاتو بەربژاریەکانیان بگێڕنەوە. لەملاشەوە بۆریس ناچار بوو تەنگ بە جوتیاران هەڵچنێ، بەمەبەستی ڕازی کردنی خاوەن زەویە بچوکەکان. کە ئەمەش بووە هۆی تورەبوونی جوتیاران بشێوەیەکی توند[1] .

جا لە دوای مردنی "تیۆدۆر"، خێزانەکەی تەختی قەیسەری ڕەت کردەوە، براکەیشی کە توشی شەلەل ببوو لە ساڵی 1591 خۆی کووشت. هەربۆیە پەرلەمان کۆبوویەوە بۆ هەڵبژاردنی قەیسەر. پەرلەمان "بوریس گۆدۆنۆفی" هەڵبژارد بە قەیسەر. کە دڵ کراوەو کارزان بوو، حەزی لەچاکە بوو بۆ گەلەکەی. ئەم یەکەم کەس

Vernadskv. B.A. History of Russia ( New york, 1967) pp.98- 107. 1

بوو کە گەنجانی ناردە ئەوروپا بۆ ئەوەی لە شارستانی ئەوروپی شارەزابن[1]. بەڵام قەدەر دژایەتی کردو هیچ یەکێکیان نەگەرانەوە. بەهەمانشێوە برسیەتیش گەلی روسی هیلاك وشەپرێو کردو خەڵکی تاوانباریان کرد بە دەرمانخواردکردنی ئیڤانی چوارەم و کورەکەی قیسەر سیۆدۆر، کە بوریس خۆی وەصی بوو بەسەریەوە. هەروەها تۆمەتباریان کرد بە کوشتنی دیمیتری برای بچوکی قەیسەر سیۆدۆر.

مێژوونوسی ڕوسی " کرمزین" ئەو تۆمەتانە بەدرۆ دەخاتەوە تەنها کوشتنی دیمیتری نەبێت، زۆربەی مێژوونوسانیش لەمەدا پشتیوانی کرمزین دەکەن تەنها کەمێکیان نەبێت. بەڵام بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە دیمتری خۆی خۆی کوشتووە.

## جەنگی ناوخـــۆ:-

لەساڵی 1601ەوە- بەهۆی شکست هێنانی بەرهەمی کشتوکاڵی برسیەتی لەڕوسیا بلاوبوویەوە. لەملاشەوە "بوریس" کوێرانە هەوڵیدا کار بۆ خەلکی وە دۆزێ بە سەرقاڵ کردنیان لە دروستکردنی تەلارو کاری ئاوەدانکاری. ڕێژەی مردن زیادی کردو چەتەو ڕێگر دایانە زیادیو کاری دزیو ڕاووڕووت پەرەی سەند. لەم نێوانەشدا چینی "بویارس" سودیان لە ڕەوشی شێواو وەرگرتو ویستیان بەربژاریەکانیان بسەننەوە کە کاتی خۆی ئیڤانی تۆقێنەر لێی سەندبوون. هەربۆیە هەستان بە تۆمەتبار کردنی بوریس بە ناپاکیو پیلان دانان بۆ ئاسایشی وڵات. یەکێ لە سەرکردەکانی ئەم چینە "سیۆدۆر ڕۆمانۆفی" یەکێ لە کوڕە مامەکانی "ئیڤانی چوارەم"ی ناچار کرد بچێتە سەر ژیانی رەهبەنیەت، هەروەك خێزانەکەیشی ببوو بە

---

1 ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە نوسەر لەسەرەتادا بە خراپ باس لە "بوریس گۆدۆنۆڤ" دەکات، کەچی دواتر بە باشو کارزانو دڵ کراوە وەسفی دەکات. بەڵام لێرەدا دەتوانین بڵێین کە بوریس گۆدۆنۆڤ لەگەڵ ئەو خراپیانەی کە هەیبوو، خاوەنی ئەم ڕەوشتە باشانەش بووە. ئەمەشیان بیرورای خۆمانە سەبارەت بە نوسینەکەی نوسەر. چونکە باسەکە بە باشی ڕوون نییە. " وەرگێڕ"

ڕەهبەنە. ئەمجا تەواوی ئەندامانی بنەماڵەی "ڕۆمانۆف" دورخرانەوە بۆ باکوری ڕوسیا. لێرەوە "بویارس" دەستیانکرد بەهاندانی گەلی ڕوسی بۆ شۆڕشکردن لەدژی "بوریس گۆدۆنۆف"و بەهاوکاری پۆڵەندا توانیان شۆڕش بەرپابکەن. لەناو چینی "بویارس" گەنجێك بانگەشەی ئەوەی بۆ خۆی کرد کە ئەو "دیمیتری کوڕی ئیڤانی چوارەم"ەو- خۆکوشتنی خۆی بە هەڵبەستراو دایە قەڵەم. دیمیتری لەساڵی 1603بەسەرکردایەتی سوپایەك لەخۆبەخشان دەستیکرد بەسازدانی شۆڕش. بەڵام بەخت یاوەری نەکرد بۆ سەرکەوتن تەنها لەدوای مردنی "بوریس گۆدۆنۆڤ" نەبێ لە نیسانی ساڵی 1605. "دیمیتری" دوای ئەوەی لەلایەن هەندی لەسوارە زویربووەکانی قۆزاخ هاوکاری کرا، توانی لەمایسی 1605بچێتە ناو مۆسکۆ.

دیمیتری بەو جۆرە نەبوو کە چینی بویارس پێشبینیان کردبوو بەوەی وایانزانی ئالەتێك دەبێت بەدەست خۆیانەوە. بەڵکو هەرزوو کەسایەتی خۆی دەرخستو سەلماندی کە ئەم لە لێوەشاوەییو زیرەکیدا لەپێشینەکانی کەمتر نییە. هەر کەهاتە سەر دەسەڵات ویستی حوکم هەر بۆ خۆی بکات. لەبەر ئەوە چینی بویارس هەر لەڕۆژی یەکەمەوە پیلانیان بۆی ساز کرد. لەخۆبایی بوونو فیزنواندنی دیمیتری سەریکێشا بۆ سازبوونی شۆڕشێك لەلایەن دانیشتوانی مۆسکۆوە کەبەهاندنی چینی بویارس سازیان کرد. کە دواتر هەر ئەوانیش بۆی چوونە کۆشكو کوشتیان. پاشان میر "باسل شوسکی"یان- کردە قەیصەر [1].

ڕەوشەکە بۆ "شوسکی" هێمنی بەخۆیەوە نەبینی، بەڵکو هەرزوو لەلایەن جوتیارانو کۆیلەکانەوە شۆڕش سەریهەڵداو بەشێوەیەکیش پەرەیسەند کە لەدوای داپلۆسینیشی پەشێوی ونائارامی هەربەردەوام بوو. دوای ئەمە کسێکی هەڵبژێرداو بانگەشەی قەیصەر بوونی بۆ خۆی کردو خەڵکێکی زۆر شوێنی کەوتنو توانی سوپای

---

Ibid, PP. 113- 121.– 1

"شوسكی" تێكبشكێنێ. ئەمەش وای لە"شوسكی" كرد داوای هاوكاری لەسوید بكات. ساكاتێكیش سوید لەجەنگ دابوو لەگەڵ پۆڵەندا، ڕازی بوو هاوكاری ڕوسیا بكات بەو مەرجەی كە هاوپەیمانی سویدبكات بە بەردەوامی. ئەوەبوو كارەكەی "شوسكی" بەری گرتو توانی ڕكەبەرەكەی بەهاوكاری سوید بشكێنێ. بەڵام پاشای پۆڵندا "سیگسمۆند" بەمە ڕازی نەبوو و، لەدژی ئەم هاوپەیمانیەتیە ڕاوەستاو جەنگی لەدژی ڕوسیا ڕاگەیاندو لەساڵی 1610 سوپای شوسكی تێكشكاند. لەم كاتەشدا خەڵكی مۆسكۆ شوسكیان لەسەر دەسەڵات لادا.

لەدوای گفتوگۆو وتووێژكردن لەگەڵ پاشای پۆلەندا، بڕیاریاندا "ڤلادسلاڤ"ی كوڕی سگسمۆند وەك قەیصەر هەڵبژێرن. بەڵام پاشای پۆلەندا دەیویست خۆی قەیصەر بێت نەوەك كوڕەكەی. وەلێ گەلی ڕوسی ئامادە نەبوون خۆیان ملكەچ بكەن بۆ دەوڵەتێكی بیانی. هەربۆیە كلێسای ئەرسەدۆكسی داوای لەتەواوی گەلی ڕوسی كرد كە سوپایەك پێكەوە بنێن بۆ ئەوەی پۆڵەندیەكان لەمۆسكۆ بەدەرەوە بنێن. ئەوەبوو بەداهاتنی ساڵی 1613گەلی ڕوسی توانیان پۆڵەندیەكان دەرپەڕێنن.

## میخائیل ڕۆمانۆف:-

لەكانونی دووەمی 1613، ئەنجومەنی نیشتیمانی كە هەڵبژێردراوی سەرجەم ناوچەكانی ڕوسیا بوو، بەمەبەستی دەستنیشان كردنی قەیصەری تازە لە مۆسكۆ كۆبونەوەی سازدا. لەپاش وتوێژێكی زۆر میخائیل ڕۆمانۆفی كوڕی سیۆدۆر ڕۆمانۆف بە قەیصەر هەڵبژێردرا.

میخائیل توانی هێمنیو ئارامی لە ڕوسیا بەرقەرار بكاتو سنورەكانی وڵات لە دەستدرێژی بێگانە بپارێزێو شاری "نۆڤگورد" لە سوید بستێنێو ڕووباری دانیپر بكاتە سنووری نێوان خۆیو پۆڵندا. بەلام ڕوسیا هەر دوور بوو لە دەریای بەلتیق و،

ئەنگارياو كاريلياش هەر لە ژێر دەستی سویدا مانەوە. میخائیل لە ساڵی 1645 مردو "ئەلیکسس"ی کوڕی جێگەی گرتەوەو بوو بە قیصر.

## فراوان خوازیەکانی ڕوسیا:-

گەلی روسی لە دەشتەکانی باشووری خۆرهەلاتو بە ئاراستەی سیبیریا پەرتوبلاو بوونەوەو بەدرێژایی ڕوبارەبەلق جۆگەکان سەرقاڵی کشتوکاڵو ئاژەڵداری بوون. خەڵکە سەرەتاییەکانیان بریتیبون لە قۆزاقیەکان کە لە حەوزی روباری "ڤۆلگاو دونو دانيپر" نیشتەجێبون. ئەمانە لەماوەی سەدەی شازدەهەمو حەڤدەهەمدا بەئاراستەی سێبیریا بلاوبونەوەو هەستان بە بنیات نانی شاری "توبولسك" لە ساڵی 1587و "تومسك" لە 1604و "باكوتسك" لەسەر ڕووباری "لينا" لە ساڵی 1632و "ئاركوتسك" لەسەر دەریاچەی "بایکاڵ" لە ساڵی 1653. پێش كۆتايی هاتنی سەدەی حەڤدە نیمچە دوورگەی "كامشتكاوە يان" داگیرکردو بەمەش گەیشتن بە زەریای ئارام. وە لەسەرەتای سەدەی هەژدە "ئالاسكا"يان- داگیرکرد. سیبیریا لە ساڵی 1662 حەفتا هەزار ڕووسی تیادا نیشتەجێ بوو. ئەم ژمارەیە لە پاش سەدەیەك گەیشتە یەك ملیۆن کەس، ڕاست لە ساڵی 1783. ڕووسیەکان لە نێوان ساڵانی 1640-1650 پەلیان هاویشت بۆ دۆڵی "ئەمور"و، بۆ یەکەمجار لەگەڵ چینیەکان بەریەك کەوتن. بە داهاتنی هەشتاکانی سەدەی حەڤدە 1680 چینیەکان تەگەرەیان خستە بەردەم پێشڕەویەکانی ڕووسیا بەم ئاڕاستەیە. لەهەمان کاتداجەنگاکانی نێوان مۆسکۆو پۆڵندا، لەسەر ئۆکرانیا دروستبوو. لە ساڵی 1569 ئۆكرانيا چوویە پاڵ پۆڵنداو لەهەمان ساڵدا لیتوانیا لەگەڵ پۆڵندا یەکیەتی یان پێکهێنا. خانەدانانی پۆڵندا زەویو زارێکی زۆریان لە ئۆکرانیا کردە هی خۆیانو هەوڵیاندا جوتیاران بگێڕنەوە سەر سیستەمی کۆیلایەیی زەوی. بەلام ئەمان کۆیلە بوونیان بۆ زەوی ڕەت کردەوەو نەیانویست، هەر بۆیە لەگەڵ میرەکانی قرم ( نیمچە دوورگەی قرم لەسەر دەریای ڕەش) ڕێککەوتن دژی پۆڵندا. لە جەنگێکدا کە لە ساڵی 1648 هەلگیرسا ئۆکرانیا بە هاوکاری سوارەکانی قۆزاف سەرکەوتن بەسەر

پۆڵندیەکان. وە بەگوێرەی پەیمانبەستێك کەلە نێوان هەردوولادا سازبوو، دەرەبەگە پۆڵندیەکان زەوییەکانیان لە پۆڵندا بەدەست خۆیان هێشتەوە بەبێ هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆیلەیی زەوی، هەرئەمەش بوو بەهۆی تورە بوونی جوتیارانی ئۆکرانیاو قۆزافیەکانیان تۆمەتبار کردبە ناپاکی. ئیدی بە هەزاران جوتیار کۆچیان کرد بۆ دەووروبەری مۆسکۆو لەسەر کەناری ڕووباری "دونیتز" نیشتەجێ بوون.

جەنگ لەنێوان پۆڵنداو قۆزاقیەکان هەڵگیرسایەوەو پۆڵندیەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. ئۆکرانیەکان داوایان لە قیصر "ئەلیکیس" کرد ئۆکرانیا بخاتە پاڵ دەوڵەتەکەی. قیصریش لە پاش ڕەزامەندبوونی پەرلەمانی ڕووسی لە ساڵی 1653، ئەمەی پەسەند کرد. وە بەگوێرەی پەیمانبەستێك کەلە نێوان قیصرو ئۆکرانیەکان بەسترا، ئۆکرانیەکان بەربژاری فراوانیان دەستگیر بوو، لەگەڵ حوکمی خۆجێیو سوپایەك کەپێك بێت لە (60000 ) سەرباز. بەو مەرجەی بە قیصر فەرمانڕەوایی باڵا دادەنرێت. جەنگ لەنێوان مۆسکۆو پۆڵندا سەریهەڵداو ئۆکرانیا لە نیری دەرەبەگە پۆڵندیەکان ڕزگارکرا. بەڵام لە ساڵی 1657 ناکۆکی کەوتە نێو خودی ئۆکرانیەکانو بە شێك لەخاوەن زەویە ئۆکرانیەکان پۆڵندایان بەباشتر زانیو چوونە پاڵی. لە هەمان کاتدا سوید هێرشی کردەسەر پۆڵنداو جەنگیش لەنێوان ڕوسیاو پۆڵندا هەڵگیرساو بە دابەشکردی ئۆکرانیا لە ساڵی 1667 لەنێوان خۆیاندا کۆتایی هات. بەم پێیە بەشی خۆرئاوای ڕووباری دانیپر بووە بەشی پۆڵندا و، خۆرهەڵاتی ڕووبارەکەش چوویە پاڵ مۆسکۆ. واتا (لە خۆرهەڵاتی ڕووبارەکەوە کەوتە دەستی مۆسکۆ، وە لەخۆرئاوای ڕووبارەکەوە کەوتە دەستی پۆڵندا).

## شۆڕشە نێوخۆییەکان :-

لەماوەی نێوان 1650-1700 پەشێویو ئاڵۆزی سیاسیو کۆمەڵایەتی ڕووسیای گرتەوە. جوتیاران بەهۆی یاسای سیستەمی کۆیلەیی زەوی تورەبوونو ناڕازی بوون. ئەم یاسایەی کە حکومەتی مۆسکۆ لە ساڵی 1649 دەریکرد. هەربۆیە هەستان بە سازدانی چەند شۆڕشێك، گرنترینیان شۆڕشی "ستیڤن ڕازین" بوو لە ساڵی 1667.

ئەم شۆڕشە قۆزاقیەکان پێشڕەویەکان دەکرد لەدژی حکومەتی مۆسکۆ. شۆڕشگێڕان توانیان شارەکانی سەر ڕووباری "ڤۆلگا"یەك لەدوای یەك بگرنو داگیریان بکەن، لەناویاندا "ئستراخان، ساراتوف، سامارا". لە ئەیلولی 1670 حکومەتی مۆسکۆ سوپایەکی مەشق دراوی نارد بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی شۆڕشگێڕانو لە تێکهەڵچوونێکی توندو تیژ کەلە نێوان هەردوولادا ڕوویدا لەمانگی تشرینی یەکەم سوپای حکومەت هێزی شۆڕشگێڕانی پەرێشانو تەفروتونا کردو دەسەلاتی قەیصەری گێڕایەوە ئەم ناوچەیەی کە شۆڕشی تیادا بوو. پاشان "ستیڤن ڕازین" دەستگیر کراو لە سالی 1671 لە سێدارە درا.

لە پاش ئەم شۆڕشە دەسەلاتی قیصر بووبە دەسەلاتێکی دیکتاتۆری و، ئەو شوێنانەی کە شۆڕشی تیادا هەلگیرسا بوو خەلکەکەی ناچار کرا سوێندی گوێڕایەلی بخۆن بۆ قیصر. پاشان پەرلەمانی "زیمسك سوبور"ی پشت گوێ خست. لەکاتێدا پەرلەمان لە بەڕێوە بردنی وولات هاوکاری قیصری دەکرد. هەربۆیە دوا ئەمە قیصر لەسەرجەم کۆتو بەندێك ڕزگاری بوو.

### ناکۆکی بنەماڵەی پاشایی:-

قیصر "ئەلیکسیس" لە سالی 1676 مرد، کوڕە گەورەی خۆی لەخێزانی یەکەم جێگەی گرتەوە. ئەمەشیان لە سالی 1682 مرد، بەبێ ئەوەی هیچ جێگرەوەیەك جێ بهێلێ. هەر بۆیە برای بچوکی خۆی "ئیڤان"ی لە جێگا دانرا. بەلام ئەمیش بەهۆی نەخۆشیەوە نەیدەتونی فەرمانڕەوایی بکات. گەورە بەرپرسانو سەردارانی کلێسا لە هاوسەری دووەمی ئەلیکسیس بترس یان هێنا، کە برای بچوکی ئیڤان بوو وە لەم کاتەدا تەمەنی دە سالێ بوو. بەلام پشتگیریان کردو بۆ ئەم مەبەستە گەورە خانەدانان لەگۆڕەپانی سور لە مۆسکۆ کۆبوونەوەو کردیان بە قیصری ڕووسیا. بەلام صوفیای خوشکی ئیڤان دامەزراندنی بترسی بە قیصر ڕەت کردەوەو هانی پاسەوانانی مەلەکی

(پاشایی) دا بەیاخی بوونو هەڵگەڕانەوە. لە دەرەنجامی ئەوەدا بڕیاردرا ئیڤانو بترس شانبەشانی یەکتر دامەزرێندرێنو صوفیاش بەوەصی لەسەریان دابنرێت، چونکە تائەم کاتەش ئیڤان تەمەنی لە پانزەساڵ تێپەڕی نەدەکرد.

**قیصرە صوفیا:-**

صوفیا هەستی کرد کە حکومەتەکەی لە ژێر ڕەحمەتی پاسەوانانی پاشایی دایەو هەردوو قیصر ( ئیڤانو بترس)ی بردە دەرەوەی شاری مۆسکۆ. لەوێدا گوێبیستی ئەوەبوو کە پاسەوانانی قەیصر پلانێك ڕێکدەخەن بۆ لادانی. هەر بۆیە صوفیا بانگهێشتی میلیشیای دەرەبەگیو هەندێ لەبەشەکانی سوپای کرد. بەمەش پاسەوانانی مەلەکی ترساندو وولآتی خستەوە ژێر کورسی خۆی لە ئەیلولی 1682.

صوفیا حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی کردو سیاسەتی پێك هاتنی گرتەبەر لەگەڵ پۆڵندا. کۆیلایەیی زەوی هەڵوەشاندەوەو شارستانی ئەورووپی هێنایە وولآت. لە سەردەمی ئەودا بارودۆخی ناوخۆی وولآت ئارامو هادی بوو، صوفیا بە هاوبەشی لەگەڵ پۆڵندا توانیان ڕێگری بکەن لەو شالآوەی تورکەکان کردیانە سەر ئەوروپا. لە ساڵانی 1687-1689 دوو هەڵمەتیشکست خواردووی کردە سەر نیمچە دوورگەی قرم. هەروەك چینیش" سین" ڕێگری کرد لەپێشڕەوی کردنی ڕووەو دۆڵی ڕووباری ئەموور لەو پەڕی خۆرهەلآت. وە بەگوێرەی پەیمانبەستی (نیرچینکس) ڕووسیا دەست بەرداری دۆڵی ڕووباری ئەموور بوو.

شکستەکانی لەسیاسەتی دەرەوەیدا زیانی بە ڕێزو شکۆی صۆفیا گەیاند. لەم کاتەشدا هەستی بە لێ هاتوویو چالاکی بترس کرد، هەربۆیە پێشبینی ئەوەی کرد کە لە تەمەنی پێگەیشتوویدا کودەتای لەدژ ئەنجام دەدات. لەبەر ئەوە دووری خستەوە لەخۆی لەگوندێکی نزیکی ڕووسیا. لەوێدا بترس لە شارەزایانی هۆڵندا فێری دروستکردنی کەشتی بوو، هەروەك بیرکاریشی خوێندو لە هاوڕێیانی خۆی دوو

دەستەی سەربازی دروستکرد. کاتێك گوێبیستی ئەوەبوو کە بەکرێگیراوانی صوفیا هەوڵی کوشتنی دەدەن، هەستا بە سازکردنی کودەتایەكو دەستی گرت بەسەر کۆشکی قیصرو صوفیان ی دەستگیر کردو ناردیە دێرێك. خۆیشی کردە قیصر لە ساڵی 1689. لەم کاتەشدا تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو[1] .

## پترسی گەورە ( 1725-1689 )

### ڕەوشتو ئاکاری:—

بترسی گەورە کەللە ڕەقو تورەو ترشو جل شڕو بەهێزو ئازاو زیرەك بوو. هەر لەمنداڵیەوە ئارەزووی دروستکردنی کەشتی هەبوو، تاوای لێهات گەشتێکی سازدا بە نهێنی ڕووەو ئەورووپای خۆرئاوا بە مەبەستی ئاگادرابوون لە پێشکەوتنەکانیان. لەم گەشتەیەدا سەردانی ئینگلتراو فرەنساو هۆڵندای کرد. ئەم گەشتانە گرنگی گەورەی هەبوو بۆ گەشەسەندنی ڕووسیا. چونکە ئەم گەڕانە بترس ی دڵنیاکرد لە گرنگی شارستانی خۆرئاواو هاوردەکردنی ئەم شارستانیەتە بۆ ڕووسیا. وە وای لێکرد هەوڵبدات وولاتەکەی بگەێنێتە ئاستی ئەوان.

بەهۆی دابو نەریتی کۆمەلآیەتی کە وەرگیرابوو لە مەغۆلەکان، ڕوسیا وەك ولآتێکی خۆرهەلآتی بوو. بەهەمانشێوە مەزهەبی ئەرسەدۆکسی کە ڕووسەکان باوەڕییان پێی هەبوو خۆرهەلآتی بوو. هەربۆیە ڕووسەکان زیاتر خۆرهەلآتی بوون نەوەك خۆرئاوایی. وە لەڕوویەکی تریشەوە ئەگەر سەیر بکەین دەبینین ڕووسیا داخراو بوو بەڕووی دەرەوەدا. چونکە دەوڵەتی عوسمانی دەستی گرتبوو بەسەر باکوری دەریای ڕەشو وولآتی بەلقان، لەم لاشەوە سویدو پۆڵندا بالآدەست بوون بەسەر کەنارەکانی خۆرهەلآتی دەریای بەلتیق، ئەمەش هۆی دروست بوونی تەگەرە بوو

---

1 Ibid; pp. 121-138

لەبەردەم بازرگانییان. کاتێکیش" خانەدانان و پیاوانی ئاینی خاوەن دەسەڵات و هێز بوون، دەسەڵاتی قیصر بەهۆیەوە کۆت کرابوو. بۆیە لەسەر بترس پێویست بوو لەهەموو ئەمانە خۆی ڕزگار بکات بۆئەوەی ڕووسیا بکات بە دەوڵەتێکی خۆرئاوایی.

## چاکسازییەکانی بترس:-

هیچ هەلێك نەبوو تێپەڕێت کە بترس نەیقۆزێتەوە لە پێناوی بەهێزکردنی فەرمانڕەواییەکەی. تەنانەت دەیگوت: "قیصر گەورەی ڕەهایە بەرامبەر هیچ کەسێ بەرپرسیار نیە لە جیهان". هەروەك باسمان کرد سەردانی ئەوروپای کردو لە هۆڵندا فێری دروستکردنی کەشتی و شیکاری و زەخرەفە بوو، لە ئینگلتراش لە بواری بازرگانی پیشەسازی لێکۆڵینەوەی کرد، وە لەپروسیا ڕێکخستنی سەربازی بە ووردی تێبینی کردو لێی ڕووانی. لە هەموو ئەم شوێنانە هونەرمەندو دەست ڕەنگین و ئەندازیارانی کۆکردەوەو ناردنی بۆ ڕووسیا بە مەبەستی فێرکردنی ڕووسەکان لەم بوارانەی کە شارەزانەبوون تیایدا. کاتێك بترس لە ڕێگەی نێوان ڤیەننا و ڤینیسیا بوو، یاخی بوونی پاسەوانە تایبەتیەکانی لە مۆسکۆ زانی. بۆیە گەرایەوەو تۆڵەی لە یاخی بووان سەندەوەو (7000)هەزار کەسی لێ لە سێدارەدان و ڕێکخستنە سەربازییەکەیانی هەڵوەشاندەوەو بڕیاری گۆڕانی گشتی دا لە وولاتدا. لەم گۆڕانکارییانەش:-

### 1-ڕێکخستنی سەربازی:-

بترس کەسێکی سەربازی بوو، بڕیاری دروستکردنی سوپایەکی بەهێزی دا لە دانیشتوانی ڕووسی کە سەرپەرشتیاران و ڕێکخەرانیان لە خەڵکانی غەیرە ڕووسی بن و بۆ هەموو شتێکیش پشت بە قیصر ببەستن. ئەم دەیویست ئەم سوپایە شوێنی سوپای ڕابردوو بگرێتەوە. چونکە سوپای پێشو پێکهاتبوو لەپیاوانی دەرەبەگ کە بە تەواوی ملکەچی خۆیان نەدەنواند بۆ قیصر. سوپای تازە کە بڕیاری دروستکردنی درابوو، لەسەر شێوازی سویدی و ئەڵمانی ڕێکخرا. بەرزبوونەوە لەم سوپایەدا لەسەر بنەمای لێهاتووی و لێوەشاوەیی بوو، نەوەك لەسەر بنەمای بنەماڵەو لایەنگری.

## 2-کارگێڕی:-

بـترس ئەنجومـەنی دۆمـا "پەرلـەمان"ی هەڵوەشـاندەوە. ئـەو ئەنجومەنـە لـە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بە هەندێ دەسـەڵاتی یاسـادانان بەهرەمەنـد بـوو. بـترس لـە جێگەی ئەو ئەنجومەنە، ئەنجومەنی ڕاوێژکاری دامەزراند کە خۆی ئەندامـەکانی دیـاری دەکرد. بەڕێوبەرایەتیە ناوچەییەکانی نەهێشتو وڵاتی دابەشکرد بۆچەند هـەرێمێك کـە هەریەکەیان لەلایەن خەڵکانی خۆیەوە بەڕێوە دەبران. بەهۆی زۆری دژایەتیو نـەیاری، بترس پشتی بەخەڵکانی دەرەوەی ڕووسیا بەست بۆ جێبەجێ کردنی چاکسازییەکانی. هەروەها هەستا بە دامەزراندنی پۆلیسی نهێنی بۆ گەڕانو زانینی ئـەو پیلانانـەی کەلـە دژی سـاز دەکـرێن. شـیاوی باسـە بـترس کاریگـەر بـوو بـە لۆیـسی چـواردە و، وای بیردەکـردەوە کـە حـوکمی ڕەهـا لـە بەرژەوەنـدی ڕووسـیادایە. هەربۆیـە خـۆی کـردە گەورەی ڕەهای وڵات.

## 3-خانەدانانو جوتیاران:-

بـترس تـوانی بـە هـەژانێکی گـەورە کۆمەڵگـەی ڕووسـی بهـەژێنێ. ئەمـەش بـە دروستکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خانەدانانی نوێ، کە دواتر خستنیە پاڵ چینە کۆنەکە. خانەدانانی تازە خزمەتێکی کارایان لە سوپادا دەکردو "پـترس"یش- زەوی بەسـەردا دابەشـکردن. ئەمانـە بوونـە دڵـسۆزترین پیـاوانی سـوپا. بەمـە پـترس چـینێکی لـە خانەدانانو خاوەن زەویو زار دروستکرد کە خاوەنی زەویەکی زۆری کشتوکاڵی بـوون لە ڕووسـیا. لەسـاڵی" 1700" 2985 بنەماڵـەی خانـەدانی هـەبوون. بـەڵام لـە دوای پرۆژەکـەی بـترس 100هـەزار بنەماڵـەی خانـەدان لـە ڕووسـیادا هـەبوو. واتـا لەساڵی1737.

جوتیارانیش، ئەوانەی کـە لەزەویـەکانی دەوڵـەت کاریـان دەکـرد ئـازادبوون، بـەڵام باجیـان دەداو بێگاریـان دەکـرد. ئـەو جوتیارانەشـی کاریـان لـە زەوی خانەدانـەکان دەکرد، دەچوونەوە سەر چینی کۆیلە، بەپێی یاساش ئەمانە ئازاد نین. ئـەوەی بـترس

کردی دارشتنی چەند یاسایەکی توندو ڕەق بوو لەهەمبەر جوتیارانو بە زەویەکانیەوە بەستینەوەو کردنی بە کۆیلەی زەوی. بە شێوەیەکی گشتی بترس بەرپرسیارە لە ڕەوشی نالەبارو پڕ لە چەرمەسەری جوتیاران.

## 4-کلێسا:-

کلێسای ئەرسەدۆکسی ملکەچی بە تریاریکی مۆسکۆ بوو. کلێساش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر گەلی ڕووسی، هەر ئەمەش وایکرد بترس هەڵبدات بالأدەست بێت بەسەر ئەم هێزە کاریگەری ولأت. بەرتریارکی مۆسکۆ لەلایەن پیاوانی ئاینیەوە هەڵدەبژێردرا. بترس ئەمەی هەڵوەشاندەوەو ئەنجومەنێکی ئاینی بالأی دامەزراند کەپێکدەهات لەژمارەیەك ئوسقوفو بترس خۆی هەڵیدەبژاردنو لەلایەن کەسێکی غەیرە پیاوی ئاینی سەرپەرشتی دەکرا کە ئەمیش بترس خۆی دیاری دەکرد. بەم شێوەیە بترس توانی بالأدەستی بنوێنێ بەسەر کلێساو بیکاتە پایەك لە پایەکانی دەوڵەت.

## 5- دابو نەریت لەڕووی کۆمەلأیەتیەوە:-

بترس تێبینی بلأوبوونەوەی ڕیشی درێژو سمێڵی زلی کرد لە ڕووسیا. هەربۆیە فرمانی تاشینی سمێڵو ڕیشی دا. هەروەها سزای سەپاند لەسەر هەرکەسێ کە فەرمانەکانی جێبەجێ نەدەکرد. بەهەمانشێوە بڕیاری نەهێشتنی پۆشاکی فراوانو فشی دەرکردو پۆشینی پۆشاکی خۆرئاوایی سەپاند. هەروەها ڕێگری کرد لە دابڕانی ئافرەت لە کۆمەڵگاو ، فرمانی گێڕانی ئاهەنگی دەرکرد.

## 6-پەروەردەو فێرکردن:-

بترس ژمارەیەك خوێندنگەی دامەزراند بە مەبەستی دەرچواندنی ئەندازیارانو ئەفسەرو دەریاوانان. ئەم بوارە لەسەرەتادا سنورداربوو، وە سەرەتایی دزەکردنی ڕۆشنبیری خۆرئاوا بوو بۆ ڕووسیا. خوێندنو فێرکاری کورت ببویەوە لە خوێندنەوەو نوسینو ژمێرەو ئەندازەو دروستکردنی کەشتی.

ئەوەی بترس پێی هەستا بەکارهێنانی هونەرمەندان‌و دەستڕەنگینانی ئەوروپابوو لە دروستکردنی هەموو ئەو ئامرازو پێداویستیانەی کە سوپاو بواری دەریایی پێویستی پێبوو. ئەمانە دنەدەرو هاندەری بە هێزبوون بۆ خەملێنی پیشەسازی لە ڕووسیا. جگەلەمە بترس ڕووی کردە باری ئابوری وولات‌و ئاوڕ لێدانەوەی. بترس جەختی لەسەر کشتوکاڵ کردەوەو برەوی پێدا. ئەم هەستی کرد کە ڕووسیا لەچینی ناوەڕاستی کەمە، هەربۆیە دەستی کرد بەبرەودان بە بازرگانی‌و پیشەسازی بە مەبەستی دروستکردنی ئەم چینە. بترس حەزی لە دامەزراندنی پیشەسازی دەکرد کە دەوڵەت خاوەنی بێت‌و حەزی لە پێکهێنانی سەندیکادەکرد. بەلأم جەنگە زۆرەکانی ئەمەی هێشتەوە بەبێ هێنانەدی پرۆژەکانی‌و جێبەجێ کردنی.

## سیاسەتی دەرەوەی پترس

سیاسەتی دەرەوەی بترس لەسەر فراوانخوازی ڕاوەستابوو لە چەند ڕوویەکەوە. لەوانە فراوانخوازی ڕووەو خۆرهەلأت بەئاڕاستەی سیبریاو ناوەڕاستی ئاسیا، هەروەها ڕووەو باشور بەئاڕاستەی ئێران‌و دەوڵەتی عوسمانی‌و دەریای ڕەش، وە ڕووەو خۆرئاوا بەئاڕاستەی دەریای بەڵتیق، لەلایەکی تریشەوە پتەوکردنی پەیوەندی بازرگانی‌و ڕۆشنبیری لەگەڵ ئەوروپا.

بترس وای دەبینی کە دەریای بەڵتیق‌و دەریای ڕەش دوو ڕێگەی گەیەنەرن بە ئەوروپاو ئاوە گەرمەکان. بەلأم دەریای بەڵتیق دەریایەکی سوید بوو، لەملاشەوە دەریای ڕەش لەژێر دەسەلأتی دەوڵەتی عوسمانی دابوو، ئەمەش لەسەری پێویست دەکرد کە جەنگ لەدژی ئەم دوو دەوڵەتە ڕاگەیەنێ. بەلأم نەیدەتوانی شتێك بکات لەدژی دەوڵەتی عوسمانی، چونکە تا ئەو کاتەش دەوڵەتێکی بەهێزبوو. وەلێ لە بەرامبەر سوید جەنگی ڕاگەیاندو سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە ململانێ کردن لەگەڵیدا.

سوید لەم کاتەدا دەوڵەتێکی گەورە بوو لە جەنگی سی ساڵەوە باڵادەست ببوو بەسەر دەریای بەڵتیق و باکوری ئەڵمانیا.

لێرەوە کەمێك باسی سوید دەکەین لە پێش ئەوەی ململانێ بکات لەگەڵ بترس.

## سوید لەسەدەی حەڤدە:-

گوستاف ئەدۆلف پاشای سوید بەسایەی بەژداری کردنی لەجەنگی سی ساڵە توانی دەریای بەڵتیق بکاتە دەریایەکی سوید. سوید فەرمانڕەوایی فنلەنداو هەرێمەکانی کاریلیاو ئینگریاو ئیستوانیاو لیڤونیای دەکرد. وە بەگوێرەی پەیمانبەستی ویستڤالیا هەرێمی پومیرانیای خۆرئاواو ڕێژگەی ڕووباری "ئیلپ و ئودرو ویزری" دەستکەوت، هەربۆیە سوید زۆردەستی لە کاروباری ئەڵمانیا وەردەدا. بازرگانی سوید لەگەڵ دەوروبەری دەریای بەڵتیق پەرەی سەندو گەشایەوە، ڕووسیاو پۆڵنداش کەلوپەلەکانیان لەڕێگەی بەندەری "ڕێگە"ی سویدو بەندەرەکانی تر لەباکوری ئەڵمانیا بەڕێ دەرکردو لەکەشتی سویدی باریان دەکرد.

پۆڵنداو دانیمارك و براندنبرگ هەوڵیاندا قۆرغکاری سوید لەهەموو ئەم ناوچانە بۆ بازرگانی نەهێڵن. سویدیش بەردەوام سەرکەوتوو بوو، هەروەك بەپێی پەیمانبەستی 1660 دەیتوانی ئەم ناوچانەی دەستی بەسەردا دەگرێ خۆی بەخاوەن بکات. لەم کاتەشدا سوید ناوچەیەکی بەرفراوانی لەبەر دەست بوو کە بەقەدەر وولاتی ئەسکەندەنافیاو ئەڵمانیا دەبوو. ستۆکهۆڵم پایتەختی ئیمپراتۆری مەزنی سویدبوو. سویدپێشڕەوی پرۆتستانتتی دکرد لەئەورووپا. بەڵام گەورەیی هەژموونی سوید کاتی بوو چونکە نەیدەتوانی فەرمانڕەوایەتی بکات بەسەر نەتەوە جیاجیاکان کە هیچ هەل و دەرفەتێکیان لەدەست نەدەدا بۆ ڕزگاربوون لە دەسەڵات و چنگی سوید، بەتایبەت ئەڵمان و ڕووس و پۆڵندیەکان. جابۆ ملکەچ کردنی ئەم وولات و ناوچانە، لەسەری پێویست بوو زۆرینەی سویدیەکان بکاتە سەربازو بوجەیەکی زۆر لەسوپا سەرف بکات.

ئەمە لەکاتێکدا ئەو شوێنانەی لەژێردەستی دابوون دانیشتوانی کەم بوو، جوتیارانیش لە ئاستێکی نزمی هەژاریدا ژیانیان دەگوزەراند وباج و سەرانەیەکی قورسیش خرابووە سەر شانی گەلی سوید. هاوکارییەکانی فەرەنسا وایکرد بوو بالادەستی سوید بەسەر ئەو ناوچانە بەردەوام بێت. بەلام بەسەر هەڵدانی ڕووسیاو پروسیا وەك دوو دەوڵەتی بەهێزو نزم بوونەوەی هەژموونی لۆیسی چواردەو دابەزینی دەسەلاتی لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدە، دەسەلاتی سویدی بەسەر ئەم ناوچەو شوێنانەدا لاواز کرد.

ئەوەی بوو بەهۆی نوشوستی هێنانی ئیمپراتۆریەتی سوید بریتی بوو لە پاشاکانیان. پاشاکانی ئەم ئیمپراتۆریەتە بەگشتی شەڕخواز بوون و گرنگیان نەدەدا بە کاروباری ناوخۆی سویدو بەهێزکردنی و چەسپاندنی هێمنی و ئاسایش کە هەریەکە لەمانە گەلی سوید زۆری پێویست پێبوو. سەرەڕای هەزاران قوربانی کە گەلی سویدی کردبووی بە سوتەمەنی جەنگە زۆرەکانی، باج و سەرانەی قورس و تێچونەکانی جەنگ لە ڕادە بەدەر بوون و شانی گەلی سویدی دا دابوو و، بوو بەهۆی بلاوبوونەوەی پەشێوی و گەڕەلاوژەیی لە ئیدارەداو بەرەبەرە هاتنە خوارەوەو خزینی دەسەلات لەدەستی پاشاکان. ئەمە لەکاتێکدا هەبوونی دەسەلاتی پاشا زۆر پێویست بوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی مەترسی دەرەکی. ئەوەی سودی بینی لەم ڕەوشە خانەدانان بوون، کە توانیان بەربژاریە سیاسی و ئابوریەکانیان بگێڕنەوەو چاوچنۆکی و هەڵپەکاریان بوو بەهۆی دارمانی وولات.

## چارلسی دوانزە پاشای سویدو جەنگی باکور:-

چارلسی دوانزە لە تەمەنی پانزە ساڵی و لەساڵی 1697 چوویە سەرتەختی دەسەلات. وولاتە دراوسێ یە هاوپەیمانەکانیش ئەمەیان بە دەرفەت و هەلێکی باش زانی بۆ گێڕانەوەی زەوییەکانیان و هێنانەدەری لە دەستی سوید. لەمەوە ڕوسیاو پۆڵنداو دانیمارك و ساکسۆنیا ڕێککەوتن لەسەر ڕاگەیاندنی جەنگ لەدژی سوید.

پادشای ساکسۆنیا ئۆغصتسی دووەم پادشاش بوو بەسەر پۆڵنداو بڕیاری دا پۆڵنداو لیوڤینیا بگرێتەوەو ئیستوانیاشی بخاتە پاڵ. بەهەمان شێوە ڕووسیا ویستی دەستبگرێ بەسەر ئەنگریاو کریلیاو بەندەری دەریای بەلتیق. هەروەها براندنبرگ مەبەستی بوو هەرێمی هۆڵشتاین‌و ڕێژگەی ڕووباری ئلپ‌و وینریر بخاتە ژێر دەستی خۆی. چارلسی دوانزە لەم نێوانەدا تەنها سویدو فنلەندای بۆ دەمایەوە. کاتێکیش جەنگی ویراسەی ئیسپانیا لە ساڵی 1700 لەلێواری هەڵگیرسان بوو، وڵاتانی ئەوروپای خۆرئاوا نەیاندەتوانی ڕێگری بکەن لە داڕووخانی ئیمپراتۆریەتی سوید. بەڵام چارلسی دوانزە بلیمەت‌و عەبقەریەکی دەگمەنی تیابوو لەجەنگداو بە خێرایی دانیمارکی تێك شکاندو پادشاکەی ناچارکرد بەبەستنی پەیمانی ئاشتی بە تەنها. دوای ئەمە سوپای ڕوسی بە سەرکردایەتی بترس بەتوندی لە جەنگی ناڤار لەبەرامبەر پاشای سوید تێکشکاو سوپاکی تەفروتونا بوو. پاش ئەمە سوپای سوید ڕووی کردە باشورو پۆڵەندی‌و سەکسۆنی‌و ڕوسەکانی لەلۆڤینیاولیتوانیا لەکەناری خۆرهەڵاتی دەریای بەلتیق دەرپەڕاند. پاشان ڕووی کردە دڵی پۆڵنداو دەستی گرت بەسەر "وارشۆو کراکاو"و پەرلەمانی پۆڵەندای ناچار کرد پاشاکەیان ئۆغصتس لابەرن وپادشایەکی نوێ لەناوخۆیانداو لەساڵی 1704هەڵبژێرن. چارلس هەموو ئەم کارانەی بەتەنها کردو لەم کاتەشدا تەمەنی لەنێوان هەژدەساڵ بۆ بیست ساڵ دابوو. هەربۆیە ئاسایی بوو کە ئەمە چارلس توشی لەخۆبایی بوون‌و مەغروری بکات‌و وای لێبکات شانازی بکات بە لێهاتووی ولێوەشاوەیی خۆی. جنگ چارلسی کردە کەسێکی دڵڕەق وتوند، ئەوەبوو خەڵکی دەکوشت وکێڵگەکانی وێران دەکرد.لەسەر ئەو بڕوایەی کە کوشتنی بێ تاوانان باشترە لەوەی تاوانبارێك لەناویاندا هەڵبێت.

بترس لە سەرقاڵی چارلس بە پۆڵنداو سەکسۆنیا کەڵکی وەرگرت بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی سوپاکەی لەسەر شێوازی سویدی. لە هەموو ئەم ماوەیەشدا خۆی دوور

دەگرت لەجەنگکردن لەگەڵ چارلس. بترس بەرەو کەناری دەریا پێشڕەوی کردو لەساڵی1703شاری پترۆگرادی بنیاتنا.

بترس دەیویست لەگەڵ چارلس پێکبێتو تەنها بەهەندێ سەرزەمین لە کەناری خۆرهەلاتی دەریای بەلتیقو بەندەرێك لەسەر دەریا ئۆقرەی دەگرت. بەلام چارلس حەزی بە پێکهاتن نەدەکردو بەسوپاکەی ڕووەو مۆسکۆ پێشڕەوی پێکردو لەساڵی 1707 چوویە قولایی ڕوسیا. گەلی ڕوسی وەك خووی خۆیان هەر پاشەکشەیان کردو سوپای چارلسیش دەچوونە ناو ڕوسیا تا زستانی سەخت وساردی ڕوسیا هاتو کاری کردە سەر سوپای چارلسو دەستەپاچە مانەوە لە پەیداکردنی خواردن وکەرەستەی ڕۆژانەیان.

کاتێك چارلس ئارەستەی گرت ڕووەو سوارەکانی قۆزاق لەباشور، لەناکاو کەوت بەسەر سوپای بترسو لەوێدا لاوازی سوپاکەی دەرکەوت. ئەمجا لەجەنگی باتاڤا لەساڵی 1707سوپای ڕوسی بەتەواوی سوپای سویدی تێك وپێکشکاندو پەرتەوازەی کردن. لەباتاڤا چارلس لەگەڵ پاشماوەی سوپاکەی ڕای کردە ئەستەمبوڵو توانی سوڵتان والێبکات جەنگ لەدژی ڕوسیا هەڵگیرسێنێ. هەربۆیە عوسمانیەکان بەهۆی ئەم جەنگانە توانیان ئەو زەویانە بگێڕنەوە کە بترس دەستی بەسەردا گرتبوون, وەك: بەندەری ئازۆف لەنیمچە دوورگەی قرم. چارلس لەلای سوڵتان پێنج ساڵ مایەوەو سوڵتانی هاندەدا بۆ جەنگ کردن لەدژی ڕوسیاو سوڵتانیش لەسوربوونی چارلس بێزاربیبوو. چارلس لەپڕ ئەستەمبوڵی جێهێشتو گەڕایەوە وڵاتەکەی کە لەم کاتەدا لەڕەوشێکی نالەباردابوو. ئەمجارەیان هەندێ لەدەوڵەتانی وەك: ئینگلتەڕاو هانۆڤەرو پرۆسیا لەپاڵ هاوپەیمانەکانی پێشو لەدژی سوید بوون بەیەك، لەپێناوی دەستگرتن بەسەر هەندێ لەزەویەکانی سوید. چارلسیش لەجەنگێکدا لەگەڵ نەرویج لەساڵی 1718کوژرا[1].

---

Ibid, PP. 138- 158. 1

## پەیمانی ستکۆهۆڵم ونیستاد

لەدوای مردنی چارلس ئاشتی لەنێوان سویدو دوژمنانی شتێکی چاوەڕوانکراوبوو. بەگوێرەی پەیمانی ستۆکهۆڵمی ساڵی 1719 ، سوید دەستبەرداری سەرجەم زەویەکانی بوو لەئەڵمانیا جگە لەبەشێکی پومیرانیای خۆرئاوا کەشاری سترازەندی تیادا بوو. دانیمارکیش جگە لە قەرەبووی جەنگی، هۆڵشتاین دەستکەوت. هەروەها هانۆڤەر ڕێژگەی ڕووباری ئیلپو ویزری کەوتە چنگ. پروسیاش توانی ڕێژگەی ڕووباری ئۆدەرو پومیرانیای خۆرئاواو شاری ستاتنی وەچنگبخات. لەملاشەوە هیچ ڕێگریەك نەمایەوە لە چوونەوەی ئۆغصتسی دووەم بۆ سەر تەخت، هەربۆیە ئۆغصتسیش چوویەوە سەر تەختی پۆڵندی.

بەگوێرەی پەیمانی نیستاند لەگەڵ ڕوسیا لەساڵی 1721، بترس توانی کریلیاو ئانگریا لەسەر کەناری دەریای بەڵتیق بخاتە پاڵ خۆی، هەروەها توانی ئیستوانیاو لیوڤینیاو بەشێکی کەم لەباشوری فینلەندا کە قەڵای ڤایبرگی تیادا بووو، بخاتە پاڵ ناوچەکانی پێشوو. بەمانە بترس ئەو خەونەی هێنایە دی کە بریتی بوو لە گەیشتن بە دەریای بەڵتیق. ئیدی ڕوسیا شوێنی سویدی گرتەوە لە پێشڕەوی کردنو سیادەکردنی ئەوروپای باکور. لەگەڵ ئەوەی بترس ئەوەی نەهێنایە دی کە مەبەستی بوو بیهێنێتەدی لەسەر دەریای ڕەش، بەلاّم ئیمپڕاتۆریەتێکی فرراوانو سوپایەکی بەهێزی جێهێشت کە ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕا لە گۆڕەپانی سایاسەتی ئەوروپا لەدوای مردنی لەساڵی 1725. ئیدی ڕوسیا بووبە دەوڵەتێکی مەزن وەك چۆن بترس بووبە پاڵەوانێکی مەزنی نەتەوەیی.

## کۆمەڵگەی ئەورووپی لەسەدەی هەژدە[1]

سەرەڕای پێشکەوتنی زانستیو گەشەکردنی فەلسەفی، بەڵام کۆمەڵگەی ئەورووپی لەسەدەی هەژدە گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەردا نەهات، وەك ئەوەی لەدووسەدەی پێشوو بەسەری داهات. چینەکۆمەڵایەتیەکان وەك پێشترمابوونەوە، کە خۆیان دەبینیەوە لە بنەماڵەی پاشاییو چینی ئەرستۆکراتیو پیاوانی ئایینیو چینی بۆرجوازی خاوەن پیشەو پیشەسازیە جۆربەجۆرەکانو چینی ڕۆشنبیرینو هەروەها جەماوەری ڕەشۆك یاخود جوتیاران کەبەشی زۆری کۆمەڵگەی ئەورووپایان پێکدەهێنا

### پادشایەتی ڕەها:-

پاشایەتی ڕەها جگە لە هۆڵنداو ئینگلترا، ئەگینا لەسەرجەم وڵاتانی تری ئەورووپا سیستەمی کارپێ کردن بوو. پادشاکان لەفەرمانڕەوایەتیان پشتیان بەتیۆری "مافی خودایی" دەبەست. فرمانەکانیان بریتی بوون لەیاسا. سەرەڕای هەبوونی دەوڵەتی نەتەوەییو نیشتیمانیو مافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلان لە شۆڕشی فەرەنسیەوە، بەڵام دەوڵەت چەندین گەلی لێکجیاوازی لە ڕووی زمانو ڕەگەز لەخۆدەگرتو هەموویان تەنهاو تەنها لەسەر گوێڕیەڵی بۆ پاشا بەیەکەوە لە وڵاتێکدا کۆکرابونەوە. وولاتیش وەك میراتی خانەوادە بۆ پادشا گوزارشتی لێ دەکرا. هەربۆیە بەمانای نوێ وڵاتی "نەتەوەیی"و "نیشتمانی نەتەوەیی" بوونی نەبوو.

### خانەدانان:-

خانەدانان یاخود ئەوانەی خاوەن زەویو زاربوون لەکۆمەڵگە، چینی ئەرستۆکراتی باڵایان پێك دەهێنا. ئەم چینە بەهرەمەند بوون لە چەندین بەربژاری بەرفراوانی وەك پاوانکردنی پۆستی بەرزی دەوڵەت لەڕووی مەدەنی وسەربازییەوە.

---

1 Anderson‹M.S.Europe in the 18th Centry (London‹961‹pp.24-58

ئەگەر دەرگەی شوێنە جۆربەجۆرەکان یان بەرز وپێشکەوتووەکان بۆ ڕۆڵەکانی ئەم چینە ئاوەلآ بووبێت، ئەوا دەبێ ئەوەبزانین کەهەمان ئەم دەرگایانە بۆچینی نزمی کۆمەڵگا کلۆم درابوو. جگە لەمانە نازناوی گەورەو قۆرغ کردنی بازرگانی تایبەت بوو بە ئەوان. ئەوەندە بەسە کە بڵێن: هەموو خانەدانێك خاوەنی کۆشکێكو ڕووبەرێکی بەرفراوانی زەوی کشتوکاڵیو بەربژاری دەرەبەگی بوو. خانەدانان پێش ئەوەی بمرێ ڕایدەسپارد کە"موڵكو ماڵم لەدوای خۆم بۆکوڕی گەورەمە". سەرەڕای ئەو دیاریو بەخششانەی کە دەم نا دەمێك لەلایەن پاشاوە پێ یان دەبەخشرا، ئەوان لەباج دانو جێبەجێ کردنی ئەرکەکان بەخشرابوون، لە کاتێکدا لەسەرشانی تەواوی گەل بوو.

## پیاوانی ئایینی:-

پیاوانی ئایینی هیچیان کەمتر نەبوو لە خانەدانان. ئەوانیش خاوەنی هەمان ئەو بەربژاریانە بوون کەخانەدانان خاوەنی بوون. پیاوە ئاینیە گەورەکان خاوەنی چەندین ئوسقوفەو ئەبرشیە بوون، موڵکی ئەوانەش هەزاران دۆنم زەویو زاربوو کەپێی دەوترا موڵکی کلێسا. گوتراوە کە ئوسقوفی سترازبورگ لە هەرێمی ئەلازاس ئەو داهاتەی لە موڵکی کلێساوە چەنگی دەکەوت ساڵانە500 هەزار فرەنك بوو، سەرەڕای ئەو کۆشك وزێڕو سەروەت وسامانەی دەچویە کلێساو کلێسا خاوەنی بوو. ئەی کەواتە جیاوازی لەنێوان ئەوانو خانەدانان چی یە؟ دەتوانین بڵێین: جیاوازییان خۆی دەبینیەوە لەوەی کە پیاوانی ئایینی لە هەڵبژاردنێکدا هەڵدەبژێردرانو موڵكو بەربژارییان بەمیرات نەدەگرتو میرات گرتن تایبەت بوو بە خانەدانان.

هەریەکە لەخانەدانانو پیاوانی ئاینی خاوەنی پێنج یەکی زەوی فەنسا بوون. هەروەها کلێسا خاوەنی سێیەکی زەوی ئەورووپاو چواریەکی داهاتو سێیەکی سەرمایە بوو. ژمارەی خانەدانان لەفەرەنسا دەگەیشتە"150" هەزار خانەدان، هەروەها

پیاوانی ئاینیش ژمارەیان دەگەیشتە "130" هەزار. ئەمە لە کاتێدا ژمارەی خەڵکی فەرەنسا لەپێش ساڵی 1789 بیستوپێنج ملیۆن کەس بوو.

دەرەبەگ یاخود خانەدانو پیاوانی ئاینی هیچ خزمەتێکیان بە دەوڵەت نەکرد، هیچ قورسیو گرانیەکیان نەدەخستە سەر شانی خۆیان. هەرچەندە جارجارە کلێسا ساڵانەیەکی دەبەخشی بە دەوڵەت کە خۆی دەدا لە سەدان هەزار دۆلار، بەڵام نەدەگەیشتە سەدا یەکی داهاتەکەی. باجی دەوڵەت کلێساو پیاوانی ئاینی نەدەگرتەوە. بەهەمانشێوە خانەدانانیش لە باجی ڕاستەوخۆ خۆیان دەبوارد، جگە لە ئینگلترا کە لەم بارەوە هەڵاوێرە.

## جوتیاران (کشتاکار):-

جوتیاران زۆرینەی زۆری خەڵکی ئەوروپایان پێکدەهێناو بە کشتوکاڵەوە خەریک بوون. هیچ جیاوازیەك نەبوو لەنێوان جوتیاری وڵاتێك لەگەڵ وڵاتێکی تر لەڕووی گوزەرانو ئامرازی کشتوکاڵو شێوازی کارکردنیو چۆنیەتی کارو ئاستی بژێویو کۆمەڵایەتیان مەگەر لە بەریتانیا کە کەمێ جیاوازی هەبوو لەم ڕووەوە. لەوانەیە ڕەوشی جوتیاری فەرەنسی زۆر باشتربووبێت لە ڕەوشی جوتیارانی وڵاتانی تری ئەوروپا. جارێ وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئەوروپاو بەتایبەت ڕوسیا ئەوە هەر لێی گەڕێ، لەوێدا جیاوازی نەبوو لەنێوان جوتیارو کۆیلە.

ئامرازو میکانیزمی کشتوکاڵ لە سەدەی هەژدە هەمان ئەو ئامرازو میکانیزمانە بوون کە لەسەدەی پێشتر هەبوون، هەر چەندە لە بەریتانیا چاککردنو بەرەو پێشچوون کشتوکاڵو میکانیزمەکانی گرتەوە، هەندێ وڵاتی وەك پروسیاو هۆڵنداش ئەم ئامرازە تازەباوەیان هاوردە کردە وڵاتیان، کە لەبواری کشتوکاڵو ئاژەڵداری لەبەریتانیا ئیشی پێدەکرا.

جوتیاران باجەکانی دەوڵەتیان دەداو هەموو قورسیو کارە ناهەموارە کانیانی دەوڵەتیان دەخستە سەرشانی خۆیان، ئەوان سەرەڕای ئەو باجانەی کە دەیاندا دەبوایە کارو ئەرکەکانی کڵێساو دەرەبەگیان ڕاپەڕاند بوایە. جوتیار باجی داهاتو سەرانەو باجی زەویانەو چەندین باجی تری لە ژمار نەهاتویان لێ دەسەنرا. ئەمە بارودۆخی جوتیاران بوو، وەلێ نارازیش نەبوون لەم بارودۆخەی کە تێیدابوون، چونکە باوەڕیان وابوو ویستو قەدەری خوا وای کردوە ئەمان بەم شێوەیە گوزەران بکەنو بێ بەش بن لە هەرچی بەربژاریە.

## بارودۆخی کۆمەلآیەتی لە شارەکاندا :ـ

خانەدانو پیاوە ئاینیە بچوکەکان بەشدار نەبوونو هاوەبەش نەبوون لەو خۆشگوزەرانیەی کە ڕۆڵەی گەورە خانەدانو پیاوەئاینیە گەورەکان لێی بەهرەمەند بوونو لەو ژیانە دەیانگوزەراند. چینی بۆرژوازی پێگەیشتوش ببوو بە خاوەن پیگەو قورسایی خۆی لەناو کۆمەڵگەدا، ئەمەش بەهۆی سەروەتو سامانو سەرمایەی بازرگانیو پیشەسازیو ئەو ڕۆشنبیریە بەرزەی کە پێی دەناسرانەوە. بۆرژوازیەت واتا دانیشتوانی شار، ئەمانە لەگەڵ هاتنی سەدەی هەژدە بەرەبەرە ژمارەیان دای لەزیادی لە ئەوروپای خۆرئاواو ناوەڕاست، بەتایبەتی دانیشتوانی لەندەن، کە لەنیوەی ئەم سەدەیەدا ژمارە دانیشتوانی گەیشتە نیو ملیۆن کەس، پاریسو ڤییەناش ژمارەیان گەیشتە 250 هەزار کەس، هەروەها دانیشتوانی بەرلین ژمارەی دانیشتوانی خۆی دا لە 120 هەزار کەس. ڕێژەی مردن لەناو منداڵو زارۆکاندا کەم بوویەوە. بەلآم لەسەرتای سەدەی هەژدە ڕێژەی مردن لە شارەکاندا زیاتر بوو لەڕێژەی لەدایك بوون. وەلێ بەهۆی کۆچکردنی خەڵکی دێهاتەکانەوە بۆ شار، ئەم ڕێژەیەی هاوسەنگ دەبۆوە. وەزیری دارایی لۆیسی شازدە "نیکەر" 1776-1781 ئەم ڕێژەیەی بەم شێوەیە داناوە کە دەڵێ:"چارەکی خەڵکی فرەنسا پێش گەیشتنیان بە تەمەنی سێ

ساڵان دەمردن واتا منداڵان، وە چارەکی خەڵکی پێش گەیشتنیان بە تەمەنی بیستو پێنج ساڵی دەمردن، هەروەها چارەکی دانیشتوانی دەمردن بەرلەوەی بگەنە تەمەنی پەنجا ساڵی، ئەوەشی کە لە پەنجا ساڵی تێدەپەڕی بەتایبەت لەناو چینی کرێکاردا ئەوا ژێری وجەستەی داهێزراوە.

ئەنجومەنی گشتی بەریتانی پرۆژە یاسایەکی لەساڵی 1772 گەلاڵە کرد، سەبارەت بە پێدانی خانەنیشی بە پیرو بەساڵا چوان، بەڵام ئەنجومەنی لۆردات ئەمەی ڕەت کردەوەو، ئەوەشی ڕونکردەوە کە ئەم گەلاڵەنامەیە هیچ پێویست نییە، چونکە خەڵکی پێش گەیشتنیان بەتەمنی پیری دەمرن. هۆکاری مردن بەم ڕێژە زۆرە بەهۆی نەخۆشی بوو، کە هەرکاتی دەهات خەڵکی شڕ دەکرد بەتایبەت بۆ هەژارو کەم دەستەکان کە دەردە سەریان زۆر زیاتربوو. نەخۆشی ئاوڵەو مەلاریاو گرانەتاو سیلو بەدخۆراکی بەشێوەیەکی گشتیو چەندەها نەخۆشی تریش، لەو نەخۆشیانە بوون کە هەرکاتێ دەهاتن خەڵکێکی زۆریان دەخستە ئاوزینگی سەرە مەرگ.بەهۆی نەبوونی خۆپارێزی تەندروستیەوە دەردو پەتا بەخێرایی بەناو خەڵکدا بڵاو دەبوویەوە بەتایبەت نەخۆشی ڕشانەوەو کۆلێرا. بەڵام گولی لە سەدەی هەژدە لە ئەوروپادا کەم بوویەوەو نەخۆشی سفلس یاخود زوهری مەترسی کەم بوویەوەو ئەمەش بەهۆی پێشکەوتنی زانستی بەتایبەت پزیشکیو تەندروستیەوە کە کاریگەری بەرچاوی هەبوو لە کەم کردنەوەیان.

پێشکەوتنی تەندروستیو بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەران کاریگەری زۆری هەبوو لە زیادکردنی چینی هەژارو نەدارەکان، ئەمەش هۆیەك بوو بۆ ئەوەی کرێکارانو کارکەران بە بەلێشاو ڕووبکەنە کارگەو کارخانەکان. ئەوەتا یەکێ لە مێژونوسان دەڵێ:" ئەگەر زۆری هەلی کار نەبووایە، لەکوێ شۆڕشی پیشەسازی سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا".

لەشارەکاندا باخچەو گەشتیاری زۆر بوون، حکومەت دەستی کرد بە ڕوناك کردنەوەی شەقامەکان بە چرای کیرۆسین.

## پیشەسازیو بازرگانی:ـ

گەشەسەندنی شارەکان لەگەڵ بازرگانیو پیشەسازی بەیەکەوە دەچونە پێش، بەرهەمی پیشەسازی سنوری داواکاریو خواستی ناوخۆی تێپەڕاند، هەروەك لەسەدەی پێشتر بوو بە هۆی ئەوەی بەرهەم لە بواری فراوان بەهەم بێتو بۆ زۆربەی شوێنەکانی جیهان هەناردە بکرێ.

لەسەدەی هەژدە لە ئینگلترا دا شۆڕشی پیشەسازی بە داهێنانی هەندێ ئامێرو ئامراز دەستی پێکرد، وەك دەکارهێنانی هێزی ئاویو هێزی هەڵمی بۆ بزواندن، بەتایبەت لەپیشەسازی چینینی کوتاڵ. بەرهەمی سەرمایەداری لەبوارێکی فراوان خرایەکارو سەرمایەی پیشەسازی بە گەشەسەندنێکی گەورە گەشەی سەند. ئەم گەشەکردنە کایەی بازرگانیشی گرتەوەو ئەوێ بوو بە بازاڕێکی جیهانی بۆ بەرهەمی ئەورووپاو سەرمایەی تەواوی هەبوو بۆ خستنەکاری. بازرگانی نێوان ئاسیاو ئەمریکاو ئەوروپا بە جوڵەتر کەوت، بەرهەمەکانی ئەوروپاو ئەمریکاو ئاسیا بازاڕەکانی جیهانیان سیخناخ دەکرد. بازرگانی دەرەکی بەریتانیا لە سەرەتای سەدەی هەژدە دەگەیشتە"60" ملیۆن دۆلار، هی فەرەنساش خۆی دەدا لە"40"ملیۆن دۆلار. حکومەتەکان بازرگانی ناوخۆیان ئاسان دەکرد، ئەمەش بە دروستکردنی ڕێگەو بانی ڕێك وپێكو بیناکردنی پردو نۆکەندو بەکارهێنانی ڕێگەی ئاوی بۆ ئاسان کردنی گواستنەوەی کاڵاکان، پاشان خستنە ڕووی ئەم کاڵایانە بۆ هاوڵاتیان.

## گەشەسەندنی بۆرژوازی:ـ

گەورە وڵاتانی ئەوروپا لەسەدەی هەژدە ببوونە خاوەنی ئیمپراتۆریای بەرفروان، کە بووە هۆی فراوانکردنی بازرگانی، کە دەوڵەتەکان پێی هەڵدەستانو ئەنجامیان دەدا لەگەڵ وڵاتانی دەرەوەو داگیرگەکانیان. بازرگانو پیشەسازی سەرنجی جوتیارانی بۆ لای شارەکان ڕکێشاو بەدەیان هەزاری ڕاکێشانە شارەکان. چینی بۆرژوازی کە پێکهاتبوو لەسەرمایەدارو خاوەن کار لە بازرگانو خاوەن کارگەو بانكو هەروەها

چینی ڕۆشنبیر لە پزیشك وماف ناسانو ....هتد، تا دەهات پێگەیان گەورەو بەهێز دەبوو لەکۆمەڵگەی ئەوروپیداو، سەروەت و سامانیان زیاتر دەبوو. چینی بۆرژوازی چینێکی بەهەڵپە بوو، بە فەرمانبەرانی توانیبووی لەکایە جۆربەجۆرەکاندا جێگە بۆ دەوڵەت پڕ بکاتەوە "کاریان بۆ دەوڵەت ئاسان کردبوو". ئەم چینە لە سەرەتاکانی سەدە نوێیەکان پشتیوانی پادشا ڕەهاکان بوونو توانیان لە ئینگلترا هەندێ بواری سیاسی بۆ خۆیان دەستگیر بکەن، ئەمەش بە نوێنەرایەتی کردنیان لە ئەنجومەنی گشتی. بەلأم لەگەڵ ئەوەنەشدا ئەوان داوای یەکسانیان دەکردو داخوازی ئەوەیان دەکرد هاوکوفی خانەدانە ئەرستۆکراتیەکان بن، هەروەها هاوبەشی بکەن لە فەرمانڕەوایەتیدا.

کاتێ ئەم چینە بووبوونە خاوەنی سەروەت وسامان دەیانویست لەبارەی سەپاندنی باجو کۆکردنەوەی قسەی کۆتایی لەدەستی خۆیان دابێت. وە کاتێك بینیان خۆیان خاوەنی زانیاریو مەعریفەتن خۆیان پێ لەهەموو چینەکان بەشیاوتر دەبینی بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری حکومەتو دەوڵەت بەڕێگەیەکی نوێ. ئەمانە هانی چینی ڕۆشنبیریان دەداو نوێترین کتێبیان دەخوێندەوە کاتێ دەردەچوو، هەربۆیە پشتیوانی داواکاری سەروەری گەلیان دەکردو پشتگیری نوێنەرایەتیو حکومەتی دەستوریان دەکرد.

## خواستی چاکسازی:-

لەسەر ئەوەی کە باسمان کرد، ئەم چینە داخوازی لە حکومەت دەکرد بە چاکسازیەکی ڕادیکالانە[1]. چینی بۆرژوازی لە ڕێگەی شۆڕشی پیۆریتانی ساڵی 1648و شۆڕشی جلیلەی ساڵی 1689، ڕۆڵێکی کارای گێڕا لە چاکسازی کردنی ئینگلترا. شۆڕشی ئەمریکیش سەرکەوتنێکی گەورەو وزەبەخش بوو بۆ چینی

---

1 ڕادیکاڵ واتا: دەستەیەك یان کەسانێ داوای چاکسازیەك بکەن کە ڕەگو ڕیشە بگرێتەوەو، هەموو شتێ سەر لەبەر بگۆڕن. ( وەرگێڕ).

ناوەڕاستو فەلسەفەی ئاوەزگەریو ڕۆشنگەری. ئەم چینە وای لێهات داوای چاکسازی سیاسیو کۆمەڵایەتی دەکرد لە ئەوروپا. شۆڕشی هزریش ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ ئەم چاکسازیانە. بەڵام فەرەنسا ئەو وڵاتەی کە لە دوای بەریتانیا دەهات لە ڕووی پیشەسازیو بازرگانیو داهاتو سامانو معریفەوە، لە دژی چاکسازی ڕاوەستا بەهۆی لاوازی پاشاکانی بەتایبەت لۆیسی پازدە.

## فەرەنسا لەسەردەمی لۆیسی پازدە

### وەصی (ڕاسپێردراو):

لۆیسی چواردە ئەنجومەنێکی دیاری کرد بۆ چاودێریو سەرپەرشتی کردنی نەوەکەی تاوەکو دەگاتە تەمەنی پێگەیشتوویی. بەڵام دۆق "ئۆلیریان" ی کوڕی مامی لۆیسی چواردە لەم ماوەیەدا هەمووشتێك بوو.

فیلپ "دۆق ئۆلیریان" پیاوێکی بەهرەمەند بوو، بەڵام ئەوەی لە ئارەزوو هەوەسیدا بەزایەداو، تێگەیاندنو ڕۆشنبیرکردنی شای بچوکی خستە پشتگوێ. ئەو سیاسەتێکی لاوازی لە دەرەوەدا گرتەبەرو هیچ سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا لە هەوڵەکانی بۆ چاکسازیو لادانی گەندەڵی لە دامو دەزگای ئابوریو سیاسی دەوڵەت، کە لۆیسی چواردە دوای خۆی جێیهێشت بوو. یەکێ لە سکۆتلەندییەکان بەناوی "جۆن لو"(1671–1729) توانی فریوی بدات، کاتێك لە ساڵی1717 پێشنیازی دامەزراندنی کۆمپانیایەکی کرد بۆ کاری بازرگانی لەداگیرگە فەرەنسیەکانو فرۆشتنی پشك و بەش لە سەرجەم وڵاتو خستەنەکاری دەستکەوتەکەشی بۆ نەهێشتنی قەرزە نیشتیمانیەکان. "جۆن لو" ساڵێك پێشتر بەڕەزامەندی ئۆلێریان بانکێکی دامەزراند، سەرکەوتنی بەدەستدەهێنا ئەگەر تەنها بەبانکەکەوە سەرقاڵ بوایە، بەڵام ئەو هەستا بانکەکەی بەچەند کۆمپانیایەکی تر وابەستە کرد، وەك کۆمپانیای میسیسپیو کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵاتی فەرەنسیو کۆمپانیای ئەفریقی. ئیدی ئەم بانكو

کۆمپانیایانە وەك دامەزراوەیەکی حکومی لێهات. لە ساڵی 1720 "جۆن لو" بوو بە بەڕێوەبەری گشتی دارایی فەرەنسی کە بەرزترین پۆستی دارایی بوو لە وڵاتی فەرەنسا. بەڵام لەئەنجامی چەند هەڵەیەك کە ڕوویدا، وەك کۆتو بەند خستنەسەر دراوی کانزاو داشکاندنی نرخی دراوی کاغەز بۆ نیوە، بووە هۆی ئەوەی کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا نرخی پشكو بەش بەخێرایی دابەزیۆ متمانەی خەڵکی بەم پرۆژەیە کەم ببێتەوەو هەرەس بهێنێ. "جۆن لو" شکستی خوارد. ساکاتێکیش حکومەت ئەوەی ڕاگەیاند کەئەو پارەی کاغەز وەرناگرێ، ئەوەندەی تر نرخی پشكو بەش دابەزی تاگەیشتە سێ یەك. وەلێ دامەزراوەیەکی دارایی لە پاریس بەناوی "برایانی دۆفرو" بەسەر کێشەکە ڕاگەیشتنو بۆ ڕزگارکردنی کەوتنەکار، تائەوەبوو کێشەکە کۆتایی هات.

## کردینال فلۆری:-

دۆق ئۆرلیان لەساڵی 1723 کۆچی دوایی کردو لەم کاتەشدا لۆیسی پازدە گەیشتە تەمەنێکی گونجاو، ئەمجا کاردینال "فلۆری" دانا بەڕاوێژکار وسەرۆکی وەزارەت. "فلۆری" هەوڵیدا ئاشتیەکی بەردەوامو درێژخایەن بۆ فەرەنسا دەستەبەر بکات، هەروەها چاکسازییەکی گەورە لەناوخۆدا بکات، بەتایبەت لەبواری دارایی. هەربۆیە خەرجیەکانی کەم کردەوەو برەوی بەبازرگانیو پیشەسازی فەرەنسی دا. هەروەك هەوڵیدا هاوسەنگی ڕابگرێت لەبودجەی دەوڵەت، ئەمەش بۆ بەرژەوەندی چینی ناوەڕاست. بەڵام فلۆری پیاوێکی پیرو بەساڵا چووبوو، لە کۆتاییدا خۆی بە شکست خواردویی بینیو هەستیکرد نەیتوانیوە سەرکەوتووبێت لەچاکسازی کردنو چەسپاندنی ئاشتی، بەهۆی ئەوەی بۆربۆنیەکان حەزییان بەجەنگو دەست بڵاوی دەکرد.

لۆیسی پازدە هاوسەرگیری کرد لەگەڵ"ماری لیبنیسکا"ی کچی پادشای پۆڵندا. ماری ئافرەتێکی ناحەز وناشیرین بوو، نەبووە جێگەی سەرنجی پاشاو نەکەوتە دڵی، هەربۆیە مەیلی کرد بەلای دۆستو عاشیقەکانی،بە شێوەیەك کۆشکی ڤێرسای لێ پڕکردن. بەناوبانگترینیان"مدام دی باریو مدام بمبادور" بوون. لۆیس بەمەبەستی سەرخستنی سەرۆکی پۆڵنداو لەدژی دەستوەردانی ڕوسیا لەکاری پۆڵندا، هەروەها لە دژی هەوڵی ڕوسیا بۆلادانی سەرۆکی پۆڵنداو دانانی کەسێکی تری لایەنگری ڕوسیا، چوویە نێو جەنگی ویراسەی پۆڵندا(1733-1738). دواتر ئیسپانیاش چویە پاڵ فەرەنساو لەدژی ڕوسیاو نەمسا.

ئەم جەنگە بەپەیمانی"ڤیننا" کۆتایی پێهات لە ساڵی1738. لە ئاکامیدا تەختی ناپۆلیو صقلیە درایە ئیسپانیا. دواتر لە ساڵی1744 دۆقیەی بارماش گواسترایەوە بۆ ئیسپانیاو بەخشرا بە ئەو وولاتە. دۆقیەی لۆرین یش لە ساڵی 1766 خرایە پاڵ فەرەنسا. بەم شێوەیە بنەماڵەی بۆربۆن جێگەی بنەماڵەی هبسبرگی گرتەوە لە ئیسپانیاو هەردوو صقلیەو بارما. تەختی ئیسپانیا لەدوای فلیپی پێنجەم بوو بە بەشی کوڕەکەی چارلسی سێیەم دواتر نەوەکەی لە1759-1788.

## داڕوخانی فەرەنسا لە سەردەمی لۆیسی پازدە:-

فەرەنسا لە سەردەمی لۆیسی پازدە "1715-1774" دەستیکرد بە هەرەسهێنان، ئەم هەرەسهێنانەش لە بواری بەڕێوەبردنی گشتیو دارایيو زیادبوونی دەسەلاتی خانەدانان بەڕوونی دەرکەت. لە دوای کاردینال فلۆری لە ساڵی1743 لۆیس بۆخۆی حوکمی دەکرد. لۆیس هیچ هەوڵی چاککردنی بارودۆخی وولاتی نەدا، نەك هەر ئەمە بەڵکو ئەو لەچاکسازی کردن خۆی گێل دەکردو کاتەکانی لەڕاوکردنو نێچیرگرتنو کۆڕی شەوانە بەسەر دەبرد. "مدام بمادور" بەشێوەیەکی کردەیی بۆ ماوەی بیست ساڵ 1745-1764 دەستی لەبەڕێوەبردنی وولات وەردەدا.

فەرەنسا لەم ماوەیەدا لەجەنگێکی سەختو دژواردا بوو، کە جەنگی ویراسەی نەمساوی‌و جەنگی حەوت ساڵە بوو"1740-1748" "1756-1763". ئەم جەنگانە دارمانی فەرەنسی خێراترکردو خەزێنەی وڵاتی مایەپوچ کرد، هەروەك ڕێگەی خۆشکرد بۆ شۆڕشی فەرەنسی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەرەنسا تا ئەوکاتەش بەهێزترین‌و دەوڵەمەندترین دەوڵەتی ئەوروپا بوو، شارستانی فەرەنسی لە هەموو شوێنەکان ئەوروپیەکانی سودمەنددەکرد وێژەو هونەروژیانی کۆمەڵایەتی باڵای فەرەنسا شکۆمەندترین و بەرزترین ئاست بوو لەم کاتەدا کە ژیاری ئەوروپا پێی گەیشتبێ.[1]

## ئیمپراتوری نەمساو سەرهەڵدانی پروسیا:-

ئیمپراتوری ڕۆمانی پیرۆز بە درێژایی هەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە مایەوەو ئەو ڕەگەزانەی دەگرتەوە کە بەزمانی ئەڵمانی قسەیان دەکرد، "دایت"یش وەك جاران مابوویەوەو ئیمپراتور سەرپەرشتی دەکرد. بەڵام ئەڵمانیا دابەش ببوو بەسەر کاسۆلیك‌و پرۆتستانت، تەنانەت پرۆتستانتیەکان لەنێوان خۆیاندا دوویەش بوون‌و بریتی بووون لە لۆسەری‌و کالڤنی،و هەردەم لەنێوانیاندا ناکۆکی هەبوو. جەنگی سی ساڵە لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدە وێرانکاریەکی گەورەی هێنا بەسەر ئەڵمانیا. ئەڵمانیا نیوەی دانیشتوان‌و سێیەکی موڵك‌وداهاتی لەدەستدا. ئەم جەنگە وێرانکارە هەروەك چینی بۆرجوازی لە باربرد، باری ئابوری ئەڵمانیاشی دارماندو کۆمەڵەی هنسی هەڵوەشاندەوە، بەهۆی خراپ بوونی باری ئابوری ئەم کۆمەڵەیە.

ئەم جەنگە کارەساتبارە وەنەبێ جوتیارانی نەگرتبێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوانیش مایەی مەینەتی‌و ناسۆری بوو. لە هەمانکاتدا میرە ئەڵمانیەکان بۆ بەهێزکردنی

---

1 Gottschalk ،op. Cit;pp.481-48

دەسەلآتیان هەلیان قۆستەوە بۆ لەناوبردنی ئەو دامەزراوە دیموکراتیانەی پێشتر هەبوون.

لەکۆتایەکانی سەدەی حەڤدە چەند قەوارەیەکی بەهێز لە ئەلّمانیا دەرکەوتن و توانیان ڕۆلێکی گرنگ بگێڕن لەسەر شانۆی سیاسی سەدەی هەژدە. گرنگترینی ئەمانەش پروسیا بوو.

## پڕوسیا:-

پڕوسیا لەسەر دەستی بنەماڵەی "هوهنزلن" چەکەرەی کردو گەشەی سەند. ئەم بنەماڵەیە لە کۆتایەکانی سەدەی پازدە توانی هەرێمی براندنبرگ بخاتەپاڵ خۆیو دەستی بەسەردابگرێ. ئەم هەرێمە کەوتۆتە نزیکی شاری بەرلین. بەرلین لەم کاتەدا جگە لەدێهاتێکی بچوك هیچی ترنەبوو. بەلاّم ئەو هەرێمانەی کە پێیان دەگوترا: پروسیا، کەوتبوویە خۆرهەلاّتی براندنبرگ. ئەمانە تاوەکو دەوروبەری سەدەی حەڤدە نەچونە ژێرباری سەروەری بنەماڵەی "هوهنزلن" تائەوەی لە ساڵی "1618"ئەم دوو هەرێمە لەژێر سایەی ئەم بنەماڵەیە یەکیانگرت. لە ئاکامی جەنگی "سی ساڵە" بنەماڵەی هوهنزلن توانی پروسیا بکاتە دەولّەتێك لە دەولّەتە گەورەکانی ئەوروپا، دوای ئەوەی لەپەیمانی "ویستڤالیا" ئیمپراتور هەر جۆرە دەسەلاّتێکی کرداری لەسەر دەولّەتۆچکەکانی ئەلّمانیای لێ سەندرایەوە.

## "فردریك ولیەم"، ناسراو بە هەلّبژێردراوی گەورە:-

میرەکانی پروسیا لە بنەماڵەی هوهنزلن لە سەدەی حەڤدە ناودەبران بە هەلّبژێردراوانی براندبرگ. فردریك ولیەم 1640- 1688لەبەر گرنگیو گەورەیی بە هەلّبژێردراوی گەورە ناوی دەهێنرا. فردریك ولیەم لە جەنگی "سی ساڵە" بۆ فراوانکردنی ولاّتەکەی سودی وەرگرت، ئەمەش بە قۆستنەوەی هەلی لاوازی ئیمپراتۆر.

لەونێوانە توانی "پومیرانیای خۆرهەلاتو ژمارەیەك ئوسقوفە بخاتە دەستخۆی، کە ئوسوقوفەی "مکدبرگ" لە گرنگترینیان بوو. دواتر بوویە خاوەنی سوپایەکی بەهێز.

فردریك باوەڕی بەپێویستی دەسەلاتی ڕەها هەبوو، هەروەك پادشاکانی ئەوروپای خۆرئاوا، وە ئەو تیۆری مافی خودایی بۆ پاشاکان بە ڕەوا دەزانی. کاتێك فریدریك دەسەلاتی ڕادەستکرا، بینی ولاتەکەی "پڕوسیا، براندنبرگ" بەگوێرەی سیستەمی دەستوری بەڕێوەدەچێت، چونکە ئەوانەی پێشخۆی بەهاوبەشی لەگەلْ "دایت" فەرمانڕەوایان دەکرد، واتا دەسەلاتی ڕەها نەبووە. هەربۆیە هەولەکانی خۆی لە لەناوبردنی دەسەلاتی ئەم ئەنجومەنە چڕکردەوە. جا بەتێپەڕینی کات دەسەلاتی بالای لە دەستی خۆیدا کۆکردەوە. هەر لەبەرئەوە لە کاتێ مردنیدا دەولەتێکی بەجێهێشت، کە بەپاشایی ڕەها فەرمانڕەوایی دەکراو مافی خودایی بەکردارکی بوونی هەبوو.

## سەرهەلْدانی پاشایەتی لە پڕوسیا:-

پروسیا گەشەی کردو بووبە دەولەتێکی گەورەو بەهێزی ئەوروپا. دانیشتوانی شاری بەرلین لە کۆتایی سەدەی حەڤدە دەگەیشتنە بیست هەزارکەس، ئەوە لەکاتێکدا لە نیوەی ئەم سەدەیە "سەدەی حەڤدە" ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە لە هەشت هەزار کەس تێنەدەپەڕی. ئیمپراتور "لیۆپۆلدی یەکەم" لە سالی 1701 نازناوی پاشای بەمیری پروسیا بەخشی، بەهۆی ئەوەی میری پروسیا لەجەنگی ویراسەی ئیسپانیا لەدژی لۆیسی چواردە وەستاو لایەنگری ئیمپراتوری کرد. هەروەها لەپەیمانی ئەتریختو لە سالی 1713 ولاتانی ئەوروپا دانیانهێنا بەپروسیا. وە هەر ئەو پروسیایە لە سەدەی هەژدە لە گەورەییو بەهێزیدا گەیشتە ڕادەیەك کە لە پێشەوایەتی کردنی ئەلمانیادا هاوبەشی نەمسای دەکرد. ئەمەش هەر بەهۆی ئەوەوەبوو، کە ببوو بە دەولەتێکی مەزنو بەشکۆ.

## فردریك ولیەمی یەکەم1713-1740:-

بەهۆی هەوڵ و کۆششەکانی فردریك ولیەمی یەکەم نەوەی فردریك ولیەم "هەڵبژێردراوی گەورە". پروسیا لە سەدەی هەژدە بووبە دەوڵەتێکی گەورەو خاوەن پێگە. فردریك ولیەمی یەکەم زۆر بەتوندی دەستی گرتبوو بەدەسەلاتی ڕەها. ئەم زۆر دژی بێکاری بوو هەوڵی نەهێشتنی دەدا وبایەخی تەواوی بەسوپاکەی دەدا، کە هەر ئەوسوپایە لە سەدەی هەژدە بوو بە جێگەی شانازی ئەڵمانیا. بەڕاستی فردریك سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەوەی کە توانی پروسیا بکاتە خاوەن پێگەیەکی سەربازی بەهێزو مەزن لەناو ولآتە ئەوروپیەکان. لەگەڵ ئەوەی پروسیا لەڕووی ڕووبەرو ژمارەی دانیشتوانەوە دوازدە دەوڵەت لە پێشیەوە بوون، بەلآم بووبە چوارەمین دەوڵەت لەڕووی سەربازییەوە. ژمارەی سوپاکەی"85" هەزار سەرباز بوو.

پادشا فێرکردنی سەرەتایی زۆرەملێی لەپروسیا خستەکار، بەهۆی ئەوەی باوەڕی وابوو کە فێرکردنو پەوەردەکردن سەرباز چاکتر دەکات. هەروەها هەولیدا ولآتەکەی لە ڕووی ئابوریەوە بەرەوپێشەوە بەرێت، چونکە دەوڵەتی دەوڵەمەند دەتوانێ خەرجی سوپایەکی بەهێز ئامادەبکات. فردریك هەروەك چۆن سودی لە سوپاکەی بینی لە کاتی جەنگدا، بەهەمانشێوە لە کاتی مەترسیدا سودی لێ دەبینی. فردریك توانی زەوییەکانی سوید کە لەسەر کەناراوەکانی باشوری دەریای بەلتیق بوو "پومیرانیای خۆرئاوا" بخاتە سەر وولآتەکەی. بەم شێوەیە فردریك سوپایەکی بەتوانا وسامانێکی زۆری بەجێهێشت بۆ ڕۆڵەکەی.

## پادشا فردریکی دووەم "فردریکی گەورە"1740-1786:-

ئەو فردریکەی ئێستا باسی دەکەین، دادەنرێ بەمەزنترین پاشای بنەماڵەی هوهنزل. لەسەردەمی ئەودا پادشایەتی ڕەها لە پروسیادا زیاتر چەسپی. فردریکی گەورە توانی سوپاو سەروەتو سامانی زۆری باوکی بۆ مەبەستە هەمەجۆرەکانی

بەکاربێنێ. لە ڕووی جەستەیەوە فردریك کەسێکی کورتەبالا بوو، لەسەر ڕوویدا دووچاوی شین دەدراوشایەوە. ئەم خاوەنی هەستێکی ناسك بوو هەربۆیە ئارەزووی هونەر ومۆسیقاو شیعرو سەمای دەکرد. کاتێکیش تەختی ڕادەستکرا ئارەزووی دەکرد لەڕێگەی جەنگو فراوانخوازیەوە ناوبانگو شکۆداری پەیدابکات. فردریك بە"دادگەری خۆسەپێن"یش ناودەبرا. سەرەتای کارەکانی بە دەستگرتن بەسەر ناوچەی "سیلیزیا" دەستی پێکرد، کە شاری "برسلاوی" لەخۆگرتبوو، جا لەپێناوی پاراستنی ئەم ناوچەیە لەدەستی خۆی، چووە ناو دووجەنگی وێرانکارو نزیکەی پازدە ساڵ پێیانەوە خەریك بوو. بلیمەتی فریدریك بوو بەهۆی ئەوەی لە هەردوو جەنگەکەدا بەسەرکەوتوویی بێتەدەرو ئەو ناوچەیەشی دەستی بەسەرداگرتبوو لەژێر ڕکێفی خۆیدا بیهێڵێتەوە. دواتر لەساڵی 1772 لەگەڵ ماریاتریزا "دایکی ماری ئەنتوانێت" ئیمپراتورەی نەمساو کاترینای دووەمی قەیسەرەی ڕوسیا ڕێککەوتنیان بەست لەسەر دابەش کردنی پۆلۆنیا. بەمەش وولاتەکەی فراوانتر کرد.

## فردریکی خۆسە پێنی دادگەر:-

لەماوەی دووەمی سەدەی هەژدە شەپۆلێکی هزری بەسەر ئەوروپادا هات، کە پاشا ڕەهاکانی ئەوروپای بەڕۆشنگەر ناودەبرد. چونکە ئەوان گەرەکیان بوو کاروبارەکانی دەوڵەت بەوپەڕی ڕێکوپێکیو گرنگی پێدانەوە بەڕێوەببەن. ئەوان لە بواری چاککردنی کاروباری خەڵكو بەرزکردنەوەی ئاستیان شوێنی بنەماکانی ئاوەزو لۆژیك دەکەوتن. "فردریکی گەورە" بە یەکەمینی ئەو پاشایانە دادەنرێ بەپێی ئەم دەربڕینە. فردریك خزمەتکاری یەکەمی ولات بوو، لەم بارەیەشەوە دەڵێ: "گەلەکان لەپێناوی سەرکردەو فەرمانڕەواکانیان ناژین، بەڵکو ئەوە سەرکردەو فەرمانڕەواکانن لەپێناوی گەلەکانیانو بەرژەوەندیەکانیانو بەرزکردنەوەی ئاستی تەندروستیو گوزەرانو ڕۆشنبیریان دەژین". فردریك زۆر بە کارو سەرقاڵ بوو، زۆرینەی کاتەکانی ڕۆژی لە کارەکانی

دەوڵەتدا دەبردەسەر. پۆستەکانی دەوڵەتی پڕکردەوە بەو کەسانەی بەناوبانگ بوون بە توانادارى لە کارکردنداو دڵسۆزبوو بۆ ئەرکەکانیان. سەرەڕای ئەوەش ئەم پاشایە جوانخاسە بەوردی چاودێری کارەکانی دەکردن. فردریك گرنگی زۆری دەدا بەڕەوشی ئابوری وولآت، بەتایبەتی کشتوکاڵ، ئەمەش بەبەکارهێنانی ئامرازی زانستی. جگە لەمەو هەر لەچوارچێوەی گرنگی دانی بەکشتوکاڵ فردریك هەستا بە وشککردنی زۆنگو زەلکاوەکان، بە مەبەستی زۆرکردنی زەوی وزاری کشتوکاڵیو چاندنی داری میوەو سەوزەواتو بەخێوکردنی ئاژەڵ بەشێوەیەکی زانستی. هەر لە درێژەی کارەکانی، فردریك هەوڵی سوك کردنی باجەکانیدا لەسەر شانی جوتیاران. جا بەهۆی ئەم سیاسەتە ئابوریەی کەپیادەی کرد توانی سامانی ولآت زۆر بکاتو ژمارەی سەربازانی بگەیەنێتە دووسەد هەزار سەرباز. فردریك سەرپەرشتی مەشقدانو پێشڕەوانی دەکردن. ئیدی پڕوسیا گەیشتە ئاستێك کە ولآتە ئەوروپیەکان ئێرەییان پێی دەبرد. فردریك لەدوای ساڵی 1763 خۆی نەخزاندە ناو هیچ جەنگێك جگە لە ساڵی1779، ئەمەشی بۆڕێگریکردن بوو لەپاڤاریا کە نەچێتە پاڵ نەمسا.

هەروەها فردریکی مەزنو لێهاتوو گرنگی زۆریدا بەڕەوشی دادگاو پیادەکردنی دادگەری. زۆر ڕقی لە کاری ڕۆتینی بوو لە دادگەکان، ئەم جێبەجێ کردنی یاسای مەبەست بوو لەدادگەکاندا. هەروەك لە یەکێ لە دادوەرییەکاندا فردریك دوای ئەوەی بۆی دەرکەت دادوەرێك بڕیارێکی ستەم کارانەی لەسەر بێ دەسەلآتێك دەرکردوە، دەریکردو پاشان بۆماوەی ساڵێك زیندانی کردو ناچاریشی کرد قەرەبووی ئەو کەسە بکاتەوە کەبۆتە قوربانی ستەمکارییەکەی.

فردریك ئەشکەنجەدانی بەندکراوانی لەپێناوی دانهێنان هەڵوەشاندەوەو چەند چاکسازییەکی تری لەزیندانەکاندا ئەنجامدا. ئەم کەڵەپیاوە کەسێکی توندڕەو نەبوو، تەنانەت لە ئاینی مەسیحیو ئینجیلو هەندێ بنەمای تر بەگومان بوو، ئەو لەگەڵ سەرجەم ئاینو ئاینزاکان لێبوردەو سینەفراوانبوو. هەروەك لەیەکێ لەبۆنەکاندا

گووتبووی: "ئەگەر موسڵمانان لە وولاتمان هەبوان مزگەوتم بۆ بنیات دەنان". بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ڕقی لە جوولەکەکان بوو، ئەمەش نەك لەبەرهۆی ئاینی، بەڵکو بەهۆی هەندێ ئاكارو ڕەفتار كە لەناویاندا بوونی هەبوو، وە باوەڕیشی وابوو ئەم ڕەوشتانە لە ڕەگەزی یەهوددا ڕەگی دا كوتاوە. هەربۆیە چەندەها كۆتو بەندی لەسەر دانان.

فردریك ئەكادیمیایەكی زانستی لە برلین دامەزراندو گرنگی زۆریدا بەپێشكەوتنی زانستیو هەڵسەنگاندنی ژیریانە، هەروەها بۆ فێركردنو خوێندەواركردنی چینی گشتیو بلاّوكردنەوەی مەعریفەت لە ناویاندا، لە ڕادەبەدەر قوتابخانەی سەرەتایی كردەوە. ئەم برەوی بە وێژەوانانو نوسەران دەداو زۆر حەزی لە وێژەی فەرەنسی بوو، بانگهێشتی نوسەرە فەرەنسیەكانی دەكرد بۆكۆشكەكەی، تەنانەت "ڤۆڵتێر"بەناوبانگترین هاوڕێی بوو.

## ئیمپراتورە "ماریا تریزا" ئیمپراتورەی نەمسا:-

لەم كاتەدا نەمسا لەلایەن ئیمپراتۆرە ماریا تریزا فەرمانڕەوایەتی دەكرا، ئەوەشیان دادەنرا بە خۆسەپێنە ڕۆشنبیرەكان، بەلاّم نەشدەگەیشتە ئاستی فردریكی گەورە. ڕۆشنبیری ئەو بەشێوەیەكی سۆزداری ئایینی بوو، خێروخۆشی دەویست بۆگەلەكەیو بە كەسێكی لێبوردە ناسرابوو، هەردەم هەوڵی چاككردنی دامو دەزگاكانی دەوڵەتی دەدا. لەم ڕووەشەوە هاوسەرەكەی "فرانسیسی یەكەم"و كوڕەكەی "جۆزیفی دووەم" هاوكارییان دەكرد. بەلاّم بەپێچەوانەی فردریك لە بلاّو بوونەوەی مەعریفەو زانست دەترساو زیاتر جەختی دەكردەوە لەسەر دەسەلاّتی ڕەها لە دەوڵەتدا. "تریزا" فرمانی داخستنی پەرلەمانە خۆجێیەكانی دەركرد، كە ناسرابوون بە دایت. هەروەها دەسەلاّتی كردە دەسەلاّتێكی ناوەندیو سوپای ئیمپراتوری یەكخستو لە جیاتی زمانی لاتینی زمانی ئەڵمانی كردە زمانی فەرمی سوپاو باجەكانی زیاد كردو

یەسوعیەکانی لەناوبرد، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هاوکاری مۆسیقاژەنانی دەداو، وەبە کردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەقوتابخانە خوێندنی سەرەتایی بلاّو کردەوە.

پاش ئەوەی ماریا تریزا لەساڵی 1780 مرد، کوڕەکەی "جۆزیفی دووەم" جێگەی گرتەوە، "جۆزیف" لەساڵی 1765 ەوە" هاوکاری دایکی دەکرد لەفەرمانڕەوایەتی کردندا. جۆزیف پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو، کایگەر بوو بە "ڕۆسۆو ڤۆلتێر" . لە گەرمو گوڕی بۆ چاکسازی کردنو بلاّو کرنەوەی مەعریفەتو هۆشیاری کێبڕکێی فردریکی گەورەی دەکرد. لەم بارەیەوە دەلّیّ"من فەلسەفەم کردۆتە سەرچاوەیەکی یاسا بۆ ولاّت، بنچینە لۆژیکیەکانی نەمسا دەگۆڕیّ". "جۆزیف" گەشەسەندنی نەمسای لەسەر فەلسەفەی سیاسی ڕۆسۆو سەروەری گەل دەبینی.

ئێمە نازانین تا چەندێك جۆزیف توانیویەتی چاکسازییەکانی جێبەجیّ بکات، بەلاّم ئەوەندە دەزانین کە گەرمو گوڕ بوونی بۆچاکسازی زۆر زیاتر بووە لە توانای ئەو بۆجێبەجیّ کردنی. کاتێك دەبینین ئەو دەیویست هەموو شتێك لەیەك کاتدا چاك بکات، دەرکەوت کە هیچ شتێکی چاك نەکردووە.

پوختەی سیاسەتی ئەو بریتی بوو لە فراوانکردنی وولاّتەکەی بە ئاراستەی خۆرهەلاّت تاوەکو دەریای ڕەشو ئەدریاتیك، هەروەها ڕزگاربوون لەئەنجومەنە ناوخۆییەکانو دامەزراندنی فەرمانبەران یاخود کەسانی ملکەچ بۆ ئیمپراتۆر، کە هەر ئەوان جێگەی ئەنجومەنەکان بگرنەوە، هەروەها هەولّدان بۆ بەرزکردنەوەی چینی گشتیو نزمکردنەوەی خانەدانان بەشێوەیەك تا لە بەرامبەریدا هەموویان وەك یەکیان لێدێتو هەموویان لەبەری بپارێنەوە. هەروەها هەولّدان بۆ دەستکەوتنی پاڤاریا، ئەمەش بەگۆڕینەوەی زەوییەنزمەکان پێی. کەچی جۆزیفی دووەم لەهیچ لەم هەولاّنەی بەخت یاوەری نەکردو سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا. فردریکی گەورە لە بەرامبەریدا وەستا لەدژی دەستکەوتنی پاڤاریا. وە لە جەنگەکانیشی لەگەلّ دەولّەتی عوسمانی هیچی دەستنەکەوتو نەیتوانی بەلقان بەدەستبێنیّ. "جۆزیفی دووەم" لە سیاسەتی

کارگێڕی یاخود ئیداریشدا توشی شکستێکی گەورە بوو. کاتێك جۆزیف دایتی مەجەڕی هەڵوەشاندەوەو تاجی قەدیس"اصتفانی" لەپوداستەوە بۆ ڤیێنا لەسەرنا، کە بووە هۆی پەرێشانبوونی مەجەڕییەکان. جۆزیفی دووەم سوپای لەسەر شێوازی پروسی ڕێکخستو ئیدارەی کردە ناوەندی. بەلاّم زەوییەنزمەکانی نەمساوی لێی هەلگەڕانەوەو دواتریش ئەم هەلگەڕانەوەیە "تیرۆلی" باکوری ئیتالیاشی گرتەوە، مەجەڕییەکانیش لەبەرامبەر سیاسەتەکەیدا ناڕازیو سەغلەت بوون. لەملاشەوە خانەدانانو چینی ناوەڕاستیش ڕقیان لە سیاسەتی جۆزیف بوو، ئەمەش کاتێك جۆزیف هەلی دەدا جوتیاران لە چنگی خانەدانان ڕزگار بکاتو بەربژارییەکان لابەرێو باج لەسەر هەموو چینەکان بسەپێنێ. بەلاّم وەنەبێ جوتیاران جۆزیفیان بە دلّ بوو بێت، بەلکو ئەوانیش ناڕازی بوونو نەیاندەویست بچنە ژێر باری بەسەربازی کردن. بارودۆخ بەم شێوەیە بوو تا جۆزیف لەساڵی 1790 مرد، بەبێ ئەوەی شتێك جێبەجێ بکات. ئەوەی بەرچاومان کەوتو خوێندمانەوە بارودۆخی نەمساو ئیمپراتۆریەتی پیرۆز بوو بەشێوەیەکی گشتی لەسەدەی هەژدە.

لەنیوەی سەدەی هەژدە هەردوو دەوڵەتی پروسیو نەمساوی لەچەند جەنگێکی پلّیشێنەردا تێکهەلّچون. هەموو ئەم جەنگانەش لە پێناوی فراوان کردنی زەوییەکان بوو. بەلاّم فردریکی گەورە بە دەستگرتنی بەسەر سیلیزیا سەرەتا دەستی پێکرد.

## جەنگەکانی فردریك:-

### جەنگی ویراسەی نەمساوی 1740-1748 :-

ساڵی 1740 ئەو ساڵە بوو کە هەریەکە لە ماریاتریزاو فردریکی گەورە چونە سەرتەخت، فردریك چووبە سەر تەختی پروسیو ماریاتریزا تەختی ئیمپراتۆریەتی نەمسای ڕادەستکرا. پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە فردریك یەکەمین کارێکی دەستگرتنی بوو بەسەر سیلیزیا لە ئیمپراتۆریەتی ماریاتریزا. ئەم کێشەیەش بەشێکە

لەو کێشە گەورەیەی کە لەسەرەتای چونە سەرتەختی ئیمپراتۆرە ماریا ڕووبەڕوی بویەوە، هەروەها ناڕازی بوونو نەیاری کردنی ئەوانەی چاوچنۆك بوون بەرامبەری، لەهەمبەر وەرگرتنی تەختی هبسبرگ لەلایەن ئافرەتەوە کێشەیەکی تر بوو بۆ ماریا تریزا. ئەمەو سەرەڕای ئەو فرمانەشی کە باوکی دەریکرد لەهەمبەر ڕێگەدانی بە کچەکەی بۆ چوونە سەر تەختی ئیمپراتۆری،و بەدەستهێنانی ڕزامەندی دەولەتانی ئەوروپا لەسەر ئەم فرمانە. بەلأم هەندێ لەپاشایانی ئەوروپا چوونی ئافرەتێکیان بۆ سەر تەختی ئیمپراتۆری بە ڕەخسانی هەلو دەرفەت دەزانی بۆ دابەشکردنی مولكو مالی بنەمالەی هبسبرگ. لەم نێوانەشدا هەریەکە لە فردریکی گەورەو پاشای فەرەنساو پاشای ئیسپانیای کە لە بنەمالەی بۆربۆن بوو لەسەر ئەوە ڕێککەوتن. بەلأم ئەم جارەشیان بەرژەوەندی پالی نا بەهەریەکە لە ئینگلتراو هۆلندا، کە بەلای نەمسا بنو دژی پروسیاو فەرەنساو ئیسپانیا بوەستن، ئەمەش بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی نێودەولەتیو پارێزگاری لێ کردنی. کێبڕکێی داگیرکاری نێوان ئینگلتراو فەرەنساش هۆیەك بوو بۆئەم دووبەش بونەی ئەوروپا بەرامبەر یەك. ئەم جەنگەشی کەبە هۆی ئەم گۆبەندە سازبوو، ناونرا جەنگی ویراسەی نەمساوی 1740-1748.

ئەم جەنگە وێرانکارە لە داگیرگەکانیشدا شوێنەواری دەرکەوتو کاریگەری هەبوو. لە ئەمریکا ئەم جەنگە ناونرا جەنگی شا جۆرج " دەدرێتە پالْ جۆرجی دوومی پاشای ئینگلترا"لە کۆتاییشدا ئەم جەنگە بە پەیمانی "ئەکسی لاشبیل" لەسالی 1748 کۆتایی پیهات. بەگوێرەی ئەم پەیمانە، هیچ یەکێ شتێکی دەستنەکەوت، تەنها پروسیا نەبێ کە توانی سیلیزیا لە دەستی خۆیدا بهێلێتەوە. بەلأم هەر ئەم پەیمانەش هاوکاری ماریای کرد بۆ پاراستنی مولکەکانی.

## جەنگی حەوت سالە 1756-1763

سیلیزیا کەوتبووە دەستی فردریکی گەورەو ماریاتریزاش هەر چاوی بەدواوە بوو. تا ئەوە بوو بۆ گێڕانەوەی بۆ ژێر دەسەلاتی خۆی، لە میرە ئەلمانیەکان نزیك بوویەوەو دەستەیەکی لێ پێکهێنان. سەکسۆنیاش یەکێ بوو لەو دەولەتانەی کە

دەگونجا پشتی پێ ببەستێ، هەروەك ئەمیش بە هەوڵە دیبلۆماسیەکانی "کۆینتز"، فەرەنسای هێنایە بەرەی نەمسا، دوای ئەوەی هەرێمی ڕاینی پێببەخشێ.

هەروەها کاتێك قیصرەی ڕوسیا دژی فردریك وەستا، ماریا توانی بەلای خۆیدا کێشی بکات. بەڵام ئینگلترا لە ناکۆکیو دوبەرەکیەکەی لە هەمبەر داگیرگەکان لەگەڵ فەرەنسا بەردەوام بوو. جەنگی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە لەساڵی 1754 لە ئەمریکاو هیند نوێ بوویەوە، هەر لەهەمان کاتدا ئینگلترا بەلای فردریکدا شکایەوە، بۆ ئەوەی ئەڵمانیا بەگشتیو هانۆڤەر بپارێزێ. لەو کاتەدا ئینگلترا بڕیاریدا هاوکاری ماددی فردریك بکات لەکاتی جەنگ کردنی لەگەڵ فەرەنساو نەمسا.

فردریك چاوەڕێی ڕاگەیاندنی جەنگی نەکردو هێرشی کردە سەر سەکسۆنیاو سزای جەنگی بەسەردا سەپاندو سوپایەکی بەهێزی لەوێ پێکهێنا، پاشان بەرەو بۆهیمیا ئاراستەی گرتو پێشڕەوی کرد، بەڵام هەر لەم سەروبەندەدا سوپای فەرەنسی لەخۆرئاواوەو، سوید لەباکورو ڕوسیا لە خۆرهەڵاتو نەمسا لە باشورەوە پێشڕەویان کردو سوپای بروسیایان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دا. ئیدی لەوێدا بلیمەتی فردریکی گەورە دەرکەوت، ئەمەش بە خۆ ڕزگارکردنی لەو تەنگەژەو مەترسیە گەورەیە. فردریك بلیمەتیەکەی خۆی دەرخست کاتێك بەخێرایەکی بروسك ئاسا هێرشی کردە سەر سوپای فەرەنساو لەتێکهەڵچونی "ڕوزباخ" لە ساڵی 1757 تێکی شکاند، شیاوی باسە سوپای پروسی کەمتربوو لەسوپای هەریەکە لەوانەی جەنگیان لەدژی هەڵگیرساند بوو. پاش ئەمە گەڕایەوە سیلیزیاو سوپای نەمسای لە "لیۆسین"و لە ساڵی 1758 بەزاند، پاشان سوپای ڕوسیای لە "زروندورف" تێکشکاند. بەهۆی کەمی سوپایەکەیەوە فردریك ناچاربوو هەڵوێستی بەرگری بنوێنێ. فریدریك لە بەرامبەر هەڵاتوەکانی سوپاکەی چاو پۆشی دەکردو دوژمنانی دەخستە سوپاکەی، جا بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەهۆی نەتوانینی هێرش کردن هەر لەبەرگری دابوو. سوپای ڕوسیا لە پروسیای خۆرهەڵات پێشڕەوی کرد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا فردریك توانی

سوپای فەرەنسا لەساڵی 1759 تێکبشکێنێ. پاش ئەمە ئیسپانیاش وەك هێزێکی تر هاتە ناو ئەم گۆبەندەو هاتە لای فەرەنسا لەساڵی 1761. بەلاّم بەخت یاوەری فردریکی کرد کاتێ قیصرە مرد، ئیسپانیا لای بەلای فردریك کردو پاشەکشەی کرد لە جەنگ، بەمەش هەریەکە لەنەمساو فەرەنسا ناچاربوون پەیمانی ئاشتەوایی لەگەڵ ببەستن. دەوڵەتە ئەورووپیەکانو فەرنسا کۆبونەوە بۆ بەستنی ئاشتەوایی لەگەڵ پروسیا، ئەم دەوڵەتانە لەپاریس کۆبوونەوە بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی لەساڵی 1763.

پەیمانی "هبرنسبرگ" لەنێوان فردریك و ماریاتریزا سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ پروسیا. ماریا دانی هێنا بە دەسەلاّتداریەتی پروسیا بەسەر سیلیزیادا، فەرنساش داگیرگەکانی لەدەستدا جگە لە کەمێك لە ئاوەکانی ئەمریکاو هەندێو وێستگەی بازرگانی نەبێت لە هیندستان. بەم شێوەیە بالآدەستیو شکۆمەندی بەریتانیا لە ئەمریکای باکورو هیندستان دەستی پێکردو، ئینگلترا بوو بە مەزنترین دەوڵەتی دەریایی لە جیهاندا. یەکێکی تر لە ئاکامەکانی جەنگی حەوت ساڵە نوشستی هێنانی دەسەلاّتی ڕەها بوو لە هەریەکە لە ئیسپانیاو فەرەنسا. دەسەلاّتدارە ڕەهاکان لە هەریەکە لەم دوو دەوڵەتە لەو جەنگانەی کە لە سەدەی هەژدە سازیان کرد، تێکەوتنو بەهۆیەوە کەوتنە ئاوزنگی سەرەمەرگ. فەرەنسا توشی خەسارەیێکی گەورەی ماددیو گیانی بوو کە زۆربەیان لە گەنجان بوون، ئەمەو سەرەڕای لە دەستدانی داگیرگەکانی. *ئیدی بارودۆخێك لەناو فەرەنسا هاتەکایەوە کە هۆشداری دەدا بە هەڵگیرسانی شۆڕشێکی گەورەی وەها کە دەسەلاّتی ڕەها لەناوی دەبات ژێراوژووری دەکات.*

یەکێکی تر لە ئاکامەکانی جەنگی حەوت ساڵە بەهێز بوونی پروسیا بوو، ئەم بەهێزبوونەی پروسیا بەشێوەیەك بوو، پرووسیای کردە دەوڵەتێکی بەهێزی ئەورووپا.

هەروەها بنەماڵەی هوهنزلی کردە ڕکەبەری بنەماڵەی هبسبرگ لەسەرکردایەتی کردنی ئەڵمانیا[1].

## روسیا لە ڕۆژگاری کاترینای دووەم

پترصی گەورە لە ساڵی 1725 کۆچی دوایی کرد، بەبێ ئەوەی کەسێ لە جێگەی خۆی دابنێ. ئەمەش بەهۆی ئەوەی کوڕەگەورەی خۆی کووشت بوو. کووشتنەکەیشی لەسەر سەرپێچی کردنو نەیاری نواندن بوو لەهەمبەر بیروڕاکانی پترص. ئیدی کاتێ پترص مرد لەژێر فشاری پاساوانانی کۆشك کاترینا بوویە قیصر. بەلاّم دەسەلاّتی تەواوی نەبوو، بەڵکو دەسەلاّتی کردەیی گواسترایەوە بۆ ئەنجومەنی بالاّ، کەپێکهاتبوو لە گەورەپیاوانی دەوڵەت. ئەنجوومەن بەبەردەوامی پیادەی ئەم دەسەلاّتەی دەکرد تا ئەو ڕۆژەی کاترینا لەساڵی 1727 لە دنیادەرچوو. پترصی دووەمی کوڕی، جێنشین"ولی عهد" ئەلیکسیسو نەوەی پترصی گەورەبوو. بەلاّم هەر بە منداڵی بە هۆی نەخۆشی ئاوەڵە لەساڵی1730پێش ئەوەی ببێتەپاشا مرد. هەربۆیە ئەنجومەنی بالاّ هەندێ لەنزیکانی قیصرەی ڕوسیاو خێزانی پترصی بانگهێشت کرد، ئەوانیش ئانو ئیلیزابێس بوون، کەبە دوای یەکدا فەرمانڕەوایی ڕوسیایان کرد. بەلاّم هەمدیس دەسەلاّتی کارا لەدەستی ئەنجومەنی بالاّدا بوو. وەلێ پاسەوانان ئەوەیان قبولْ نەبوو، ئیدی لەم کاتەدا ئیمپراتۆرە هەلی قۆستەوەو بەڵێنیدا بەپاسەوانان کە بارودۆخی ئابورییان چاك بکاتو ئاستی گوزەرانیان باش بکاتو بەربژاریان چاکتر بکات. ئەمجا ئەنجومەنی بالاّی هەڵوەشاندەوەو دەسەلاّتی گێڕایەوەو ئەوانەی لەخۆ نزیك کردەوە کە بە لای ئەڵمانیادا بوون. سا کاتێکیش کۆچی دوایی کرد شلەژاویو بارودۆخێکی ئاڵۆز هاتەکایەوە هاوشێوەی بارودۆخە ئاڵۆسکاویەکەی دوای مردنی پترص. پاشان

1 Ibid;pp. 424-26; 478-79; 507-508; Hayes، op. cit; pp. 320-56.

"ئیلیزابێس" لە سەرەتای ساڵی 1742 چووە سەرتەختی ڕوسیا. خانەدانانی ڕووس پشتگیریان لە ئیلیزابێس کرد، ئەویش ئەوانی لە خۆی نزیک کردەوەو ئەو خانەدانانەشی کە مەیلی ئەڵمانیایان هەبوو لەخۆی دوورخستنەوە. هەروەها ئیلیزابێس لەجیاتی سەقافەتو ڕۆشنبیری ئەڵمانیا برەوی بە ڕۆشنبیری فەرەنسادا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شارستانی خۆرئاوا بە ڕۆشنبیری ئینگیلیزیو فەرەنسیو ئەڵمانی لە کۆشکی ڕووسیدا باو بوو. لەماوەی فەرمانڕەوایەتی جێگرەوەکانی پترۆسی گەورەدا واتا لەسەردەمی هەریەکە لەکاترینو ئانو ئیلیزابێس، ڕوسیا نەیتوانی هیچ دەستکەوتێکی سیاسی بەرچاوو گەورە بەدەستبهێنێ. قیصرە "ئان" بەژداری لەجەنگی ویراسەی پۆڵندا کرد، لەسالانی 1732–1738، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ڕوسیا ناڕازی بوو لە کاندیدیفەرەنسی بۆ تەختی پۆڵندا. شیاوی باسە ئەم ململانێیە هیچ بەرژەوەندیەکی ڕوسیای تیادا نەبوو. جگەلەمە ئەو جەنگەشی کەلە دژی دەوڵەتی عوسمانیدا هەڵیگیرساند هیچ بەرهەمێکی نەبوو.

بەهەمان شێوە ئیلیزابێسیش خۆی خستە جەنگێکی تری ویراسیەوە، کەخۆی دەبینیەوە لە جەنگی ویراسەی نەمساوی1740–1748. هەروەك خۆشی خستە ناو جەنگی حەوت ساڵە 1763–1765، لەبەرەی فەرەنسا جەنگی دەکرد لەدژی پروسیا. بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ دەستکەوتێکی گەورە یا سودێك کەشیاوی باس بێت بەدەستبێنێ.

جاکاتێك ئیلیزابێس کۆچی دوایی کرد، کوری براکەی"پترۆسی سێیەم" هاتە سەرتەخت. بترصی تازە لەگەڵ ئەڵمانیا ئاشتەوایی کرد. بەڵام نەیتوانی زۆر لەسەر تەخت بمێنێتەوە، بەڵکو مردن یەخەی گرتو تەختی جێ هێشت بۆ هاوسەرە ئەڵمانیەکەی. هاوسەرەکەی ناوی "کاترینا" بوو بە کاترینای دووەم ناودەبرا. بەم شێوەیە ڕوسیا لەدوای بترسی گەورە تا هاتنی کاترینای دووەم چل ساڵی زڕو بێ بەرهەمی گوزەراند.

کاترینای دووەم 1762-1769 شاژنێکی پرۆتستانتی ئەڵمانی بوو. دەگوترێ: کاترینا کچی فردریکی گەورە بوو، باوکی هەڵیبژارد بۆ هاوسەرگیری کردن لەگەڵ پترصی سێیەمی قیصری ڕوسیا. کاترینای دووەم خانمێکی زیرەك بوو، توانی خۆی بگونجێنێ لەگەڵ بارودۆخی تازەو، فێری زمانی روسی بوو. وە لەجیاتی ئەڵمانەکان لە ڕووسەکان نزیك بوویەوەو نیشتیمان پەروەری خۆی دەرخستو ئەرسۆدۆکسیەتی بوونی خۆی نیشاندا. خەڵکی بەرەو لای دەچوونو کێشەکانی خۆیان دەخستە بەردەمی. لەڕوویەکی ترەیشەوە کاترینا لەگەڵ زۆرزانیو زیرەك بوونیشی ئافرەتێکی بەدرەفتارو دڵرەق بووە. کاترینا فەرمانڕەوایی ڕوسیای کرد بە دەستێکی پۆڵاینو کارەکانی پترصی گەورەی تەواو کرد.

## سیاسەتی ناوخۆ:-

کاترینای دووەم هەستا بەڕێکخستنی حکومەتو کارگێڕی گشتیو هەرێمەکان. کاترین کارگێڕی کردە ناوەندی، ئینجا لەڕێگەی ئەو دەسەلاتدارانەی کە خۆی کردبوونی بە دەسەلاتدار بەسەر هەرێمەکان کارگێڕی سەرجەم ناوچەکانی پەیوەست کرد بەخۆیەوە. هەروەها دەستی گرت بەسەر موڵکی کڵێساو کردی بە موڵکی دەوڵەت. ئینجا پیاوانی ئاینی خستە ژێر دەسەلاتی دەوڵەت.

کاترینا لەژێر کارگەری فەلسەفەی ڕۆشنگەری بەربلاوی ئەم کاتەدا بوو. ئەو یەکێ بوو لە ڕۆشنگەرە خۆسەپێنەکان. ڤۆلتێرو دیدرۆی بانگهێشت کردە ڕوسیا. کاترین بۆ فێرکردنی چینی سەرووی ڕوسیا چەندەها قوتابخانەو ئەکادیمیای دامەزراند، زمانی فەرەنسی کردە زمانی دیبلۆماسیو کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو. گەنجانی چینی ئەرستۆکراتی ناردە ئینگلترا، بەمەبەستی ئاگاداربوون لە دوا گەشەسەندنە زانستیو هونەرییەکان "فننی"، بەتایبەت لە بواری کشتوکاڵ.

کاترین هیچ سۆزێکی نەبوو بۆ جوتیاران، باشکەری بارودۆخو گوزەرانیان نەبوو، هەوڵی نەدا ڕزگارییان بکات لەهەژاریو نەزانی. ڕاشکاوانەش ووتی: "یەکێ

لەخانەدانان ئەگەربێتو بارودۆخی جوتیاران چاك بكات یان بیگۆڕێو فێریان بكات، ئەوا حوكمی قیصرو خانەدانان كۆتایی پێ دێت". وە هەڕەشەی كرد لە خانەدانە پیلان گێڕەكان ئەمەش بەبەخشینی شەرەفی خانەدانی بە ژمارەیەك لەشارنشینان لەسالی 1767. ئەوانە بوون بە خزمەتكاری بە وەفای كاترین. كاترین ئەو شۆڕشەی سەركوت كرد كە جوتیاران بەڕابەرایەتی "بیكاشیف" هەڵیانگیرساند بوو. بیكاشیف داوای هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی كۆیلایەتی زەوی دەكرد لە ڕوسیا، وەلێ "بیكاشیف" دەستگیركراو لە سالی 1775 لەدار درا. بەلام ئەو شۆڕشە كاریگەری دروستكرد لەسەر خانەدانانو خاوەن زەوییەكان، وای لێكردن پشتگیری لە قیصر بكەنو چیتر نەیاری نەكەن.

## سیاسەتی دەرەوەی كاترین:-

ڕوسیا، ڕوسیای جاران نەما، بەڵكو لەسەردەمی كاترین بوو بە دەوڵەتێكی گەورەی ئەوروپا. پێشتر پترصی گەورە توانی دەسەلاتی سوید لە باربەرێو دەستبگرێ بەسەر ئەو هەرێمانەی لەخۆرهەلاتی دەریای بەلتیق دا بوونو لە ژێردەستی سوید بوون، بەلام پۆڵندا"پۆلۆنیا"و دەوڵەتی عوسمانی لەخۆرئاواو باشور هەر زیندوو بوونو پێویست بوو لەوانیش ڕزگاربێت. لەڕاستیدا پۆڵندا وولاتێك بوو سێ ڕگەزی لەخۆ گرتبوو، ئەوانیش بریتی بوون لەپۆلۆنییو لیتوانیو لاتڤینیەكان لە "كورلاند". پۆڵندا لە سەدەی حەڤدە ڕۆڵێكی دیارو بەرچاوی لەسیاسەتی ئەوروپادا دەگێڕا. تەنانەت لەسالی 1683 پشتگیری لەنەمسا كرد لەدژی دەوڵەتی عوسمانی. بەلام ئەمە هەروا نەمایەوە بەڵكو لەگەڵ هاتنی سەدەی هەژدە لاوازی وپوكانەوەی پۆڵندا دەستی پێكرد. لە ڕستیدا پۆڵندا دەوڵەتێك بوو ئابووری لاواز بوو، نەیدەتوانی سوپایەكی هەمیشەیی دابمەزرێنێ كە لەبەرامبەر ڕوسیاو پروسیاو نەمسا ڕووبەرو بوەستێ. لەپۆڵندادا چەند ڕەگەزێكی تری ڕوسینی هەبوون لە باشور وە ئەلمانی لە حەوزی بەلتیق. واتا" ئەلمانەكان لەحەوزی بەلتیقو ڕوسینیەكان لەباشور نیشتەجێ بوون".

حکومەتی پۆڵەندی شێوەیەك لەسەربەستی ئاینیو ڕەگەزی پەیڕەو دەکرد بۆ هەموویان، بەهۆی ئەوەی ڕوسینیەکان ئەرسەدۆکس بوونو ئەڵمانیەکانیش پرۆتستانتی بوون. هەریەکە لەم دوو ڕەگەزە لەیەکتر جیاوازە، داوای یەکسانیو مافی زیاتریان دەکرد لە حکومەتی پۆڵندا. سا کاتێکیش داواکارییەکانیان وەرنەگیرا، ئەڵمانیەکان پەنایان بردە بەر پروسیاو ئەرسەدۆکسیە ڕۆسینیەکانیش پەنایان بردە لای ڕوسیا. فردریكو کاترینای دووەمیش بەسەرپێیەوە بوون بۆ قۆستنەوەی وەها بارودۆخێك، هەربۆیە ئامادە بوون بۆ بەدەنگەوە چوونیان.

لەڕاستیدا ڕەوشی سیاسیو کۆمەلایەتی پۆڵەندا زۆر شێواو بوو. بالادەست بوونی سوید بەسەر بەلتیق دا لەکۆتایی سەدەی حەڤدە بوویە هۆی بەرتەنگبوونی باری ئابوری پۆڵندا، چینی ناوەڕاستی ئەم ولاتە لەبەریەکهەلوەشاو سەروەت وسامانیان دای لەکزیو شارەکانی پوکانەو. لەملاشەوە چینی ئەرستۆکراتو خاوەن زەویو خانەدانان پیادەی دەسەلاتێکی سیاسیایان دەکردو لەنێوخۆیشیاندا لە دووبەرەکیو ناکۆکیەکی بەردەوام دابوونو جوتیارانیان دەچەوساندەوە، هەربۆیە لەسەدەی هەژدە پۆڵەندا لە گێژاوو قەیرانێکی سیاسیو کۆمەلایەتیو ئابوری دا دەژیا. وە بەهۆی ئەوەی پادشایەتی پۆڵندا بەشێوەیەی هەلبژاردن بوو، پادشاکان پێش ئەوەی هەلبژێردرێن بەربژاری فراوانیان دەبەخشی بە خانەدانان، ئەمەش دەسەلاتی پاشایەتی لاواز کردو تەنها وەك ڕەمزێك هێشتیەوە. زۆرینەی پادشا دوایەمینەکانی پۆڵندا بیانی بوونو لە ئەڵمانیە سەکسۆنیەکان بوون، جا ئەمانە سەروەت و سامانیان خەرج دەکرد لەپێناو سەر بلندکردنی سەکسۆنیا.

دەستوری پۆڵندی ڕێککەوتنێکی خانەدانانی لەخۆگرتبوو بەناوی "لیپرام ڤیتو"، بەگوێرەی ئەمە هیچ یاسایەك دەرناچێ لەپەرلەمان ئەگەربێتو یەکێ لەوان بەدژی بەرژەوەندی خۆی بزانێو ڕەتی بکاتەوە. جا ئەم یاسایە بوو بەهۆی دروستبوونی

شێوەیەك لە بێ سەروبەرەیی‌و پەشێوی، چونکە خانەدانان هەر جۆرە یاسایەکیان ڕەت دەکردەوە کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان تێکگیرابوایە.

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی حەوت ساڵە، ئۆغستسی سێیەمی پاشای پۆڵندا لەدنیا دەرچوو، دوابەدوای ئەمە کاترینای دووەم دەستی خستە ناو کاروباری پۆڵندا. لەلایەکی ترەوە خانەدانانی پۆڵندا بە هاندانی فردریکی گەورە،"بونیا توفسکی یان" لە ساڵی1764 وەك پاشای پۆڵندا هەڵبژارد. شیاوی باسە توفسکی یەکێ بوو لەنزیکانی قیصرەو بەناوی"ستانسلاوس"ی دووەم بوو بە پادشا. کاتێکیش بوو بە پادشا، ڕوسەکان بەسەر پۆڵندا بالآدەست بوون و بە ئارەزووی خۆیان دەستیان لەکاری ناوخۆی پۆڵندا وەردەدا. کاتێك پۆڵندییەکان ویستیان چاکسازی لەدەستوردا بکەن، ڕوسیا دەستی خستە ناو ڕەوشەکەو ناچاری کردن ئەم فکرەیە لەبیربەرنەوە.

ساکاتێکیش بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجەو لەدژی دەستتێوەردانی بێگانە شۆڕشیان هەڵگیرساند، کاترینا بۆ سەرکوتکردنی شۆڕش سوپای وەڕێخست. کاتێکیش سوپای ڕوسی هەندێ لە زەویەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەزاندو پێیداتێپەڕی بە مەبەستی گەیشتن بە پۆڵندا، جەنگ لەنێوان هەردوو دەوڵەت هەڵگیرسا.

جەنگی ڕوسیاو دەوڵەتی عوسمانی:–

جەنگ لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی‌و ڕوسیا بە درێژایی ساڵانی 1768-1774 بەردەوام بوو. دەوڵەتی عوسمانی لە سیاسەتی دەرەوەی ڕووسیا ترسی لێ نیشتبوو، ئەم سیاسەتە وەستا بوو لەسەر بالآدەست بوون بەسەر پۆڵنداو پاشان خۆ ئەرخانکردن بۆ دەوڵەتی عوسمانی. لەملاشەوە فەرەنسا هانی دەوڵەتی عوسمانی دەدا بۆ شەڕکردن لە دژی ڕوسیا، بەلام لۆیسی پازدە خۆی لە بارودۆخێکی دارایی خراپ دابوو نەیدەتوانی بۆ ڕزگارکردنی پۆڵندا بچێتە ناو جەنگو هاوکاری ماددیش پێشکەشی دەوڵەتی عوسمانی بکات.

دەوڵەتی عوسمانی لە داڕووخانێکی بەردەوام دابوو. سوپای عوسمانی هەر لەسەر شێوەی جاران مابوویەوەو هیچ تازەگەرییەکی تێدا نەکرابوو، چ لەڕووی ڕێکخستن، چ لەڕووی مەشقی سەربازی. ئیدی تێکشکان لەدوای تێکشکان بووە بەشی سوپای عوسمانی، سوپای ڕوسیا دەستی گرت بەسەر ئازوفو ویلایەتی ولاکیاو مولدافیا لە ڕۆمانیا، هەروەها سوپای ڕوسی چووە ناو بوخارست. ڕوسیا خەریك بوو دانۆب تێپەڕێنێو بگاتە بەلقان، بەڵام پەیماننامەی "کوچك کنارچی" لەساڵی 1772 بەسترا. بەگوێرەی ئەم پەیمانە دەوڵەتی عوسمانی

1- دەستبەرداری ئازۆفو دەوروبەری بوو لە زەوییەکانی باکوری دەریای ڕەش بۆ ڕوسیا.

2- دەوڵەتی عوسمانی ڕۆمانیای بۆ خۆی هێشتەوە، بەهەمان شێوە یۆنانیش لە بەرامبەر ئەوەی سوڵتان بەڵێن بدات بە ئیدارەیەکی باشتر ئیدارەی یۆنانو بەلقان بکات.

3- کەشتیە بازرگانیەکانی ڕوسیا لە ئاوەکانی دەوڵەتی عوسمانی هاموشۆ بکەن.

4- ڕوسیا پارێزەری کلێسای ئەرسەدۆکسە لەناو دەوڵەتی عوسمانی .

پاش ئەمەلە ساڵی1792 پەیمانێکی تر لەنێوان هەردوولایندا بەستراو، پێی ئەم پەیمانە ڕووباری "دنیستر" بووبە سنوری نێوان ڕوسیاو دەوڵەتی عوسمانی.

بەم شێوەیە، ڕوسیا گەیشتە سنوری سروشتی خۆی لەباشور، وە ڕوسیا بوو بە دەڵەتێکی سەرەکی لەسەر دەریای ڕەشو کەشتیەکانی بە ئاسانی لە تەنگەکاندا هاموشۆیان دەکردو توانی بگاتە ئاوە گەرمەکان. ڕوسیا خۆی بە دۆستی مەسیحیەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی دادەنا. لەپاش پەیمانی "کوچك کینارچی" دەوڵەتی عوسمانی دەستی کرد بە هەرەسهێنانێکی خێرا.

دابەش کردنی پۆڵندا:-

کاتێك ڕوسیا لەجەنگ کردندا بوو لەگەڵ عوسمانیەکان، لەساڵی1772 لەگەڵ هەریەکە لەڕوسیاو نەمسا پێکهات لەسەر دابەشکردنی پۆڵندا. ڕوسیا سەرجەم زەوییەکانی کەوتوو لەسەر خۆرهەڵاتی ڕووباری "دوناودبنر" بۆخۆی سەند، پروسیاش پروسیای خۆرئاوای پێبڕا بە هەڵاوێری بەندەری "دانزك". بەهەمان شێوە نەمساش "غالیسیا"ی بۆخۆی پچڕاند جگە لەشاری "کاراکاو". بەمشێوەیە پۆڵندا چواریەکی زەوییەکانیو پێنج یەکی دانیشتوانەکەی لەدەستدا. وەڵێ ئەوەندەشیان پێ ڕەوانەبینیو هەم دیس لە ساڵی1793 لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کردەوەو لەسەر نەخشەی ئەوروپا سڕیانەوە. ئەم جارەیان پروسیا ڕێژگەی ڕووباری "ڤستولا"ی بەرکەوت، نەمساش دەستیگرت بەسەر ئەو بەشەی تری، وە ئەوەشی کە مابوویەوە بوو بە بەشی ڕوسیا.[1]

دوای ئەوەی کاترینای دووەم ڕوسیای کردە دەوڵەتێکی مەزن، لەساڵی 1796 مرد. مەزن بوونی ڕوسیا بەهۆی گەیشتنی بوو بە دەریای بەلتیقو دەریای ڕەش، هەروەها بە دەستگرتنو خستنەپاڵی ڕوسینیا"ئۆکرانیا"و بەشێکی گەورەی پۆڵندابوو.[2]

## ئینگلترا لە سەردەمی بنەماڵەی هانۆڤەر

شازنە"ئان"ی کچی جیمسی دووەم لەسەرەتای مانگی ئابی1714کۆچی دوایی کرد، تەختەکەی چۆڵ بوو چاوەڕوانی پاشایەکی تازەی دەکرد. "ئان" برایەکی کاسۆلیکی هەبوو، بەڵام پەرلەمان ڕێگری گرت لەوەی کە تەختی ئینگلیزی

---

1دوای دابەشکردنی یەکەم، لە ساڵی1793دوبارە لەنێوان خۆیاندا دابەشیان کرد، دواتر لە ساڵی1795بە تەواوی دابەشیان کردو هیچیان لێ نەهێشتەوە.

2 Verna dsky‹of Russia(New Haven‹1967).pp.158-170.

بگوازرێتەوە بۆ برای کاسۆلیکی ئان"جیمسی سێیەم"، بۆیە تەختی ئینگلیزی گوازرایەوە بۆ هەڵبژێردراوی بنەماڵەی هانۆڤەرو بانگهێشت کرایە لەندەن، بۆ ئەوەی ببێتە پادشا بەناوی جۆرجی یەکەم[1].

پادشای تازە وەزارەتی لە هویگز بە سەرکردایەتی"تاوەزن" پێکهێنا. پەرلەمانیش لەگەڵ ئەوەی زۆرینەی تۆری بوون، بەڵام نەیاری نەبوون. زۆرینەی تۆرییەکان داواکاری پاشایان ڕەت کردەوە لە هەمبەر پۆستە وەزارییەکان، کاتێك پادشا داوای لێ کردن. پاش ئەمە لەساڵی 1715 هەڵبژاردن ئەنجام دراو هویگز زۆرینەی لەپەرلەمان بەدەست هێنا. ئەمجا هویگز ڕێوشوێنی لەدژی هەندێ لە گەورە سەرکردەکانی تۆری گرتەبەر، بەو بێنوەی ئەمانە نەخشەدەکێشن بۆهێنا سەر تەختی جیمسی سێیەمی کاسۆلیك. هەربۆیە ژمارەیەك لە تۆرییەکان ڕایانکردە بەشەکانی تری ئەورووپا، کە لەنێوانیان "بولینبروك"و "ئارمەند" هەبوون. لەملاشەوە ئۆکسفۆرد لەزیندان ڕزگاری بوو ئەنجومەنی لۆرداتیش دەستی لێ هەڵگرت، دوای ئەوەی ئەنجومەنی گشتی سوور نەبوو لەسەر دەرکردنی، هەروەها پەرلەمانیش نەیتوانی بەژداری کردنی تۆری لە سازکردنی پیلان بسەلمێنێ. لەڕاستیشدا تۆری بەژدارنەبوون لەدانانی پیلان و دەسیسە، تەنها ئەوەندەنەبێ کەئەوان هەوڵیان داوبوو جیمس والێ بکەن ئاینزای خۆی بگۆڕێ بۆپڕۆتستانتی.

چەوساندنەوەی تۆری لەلایەن هویگزەوە، بوو بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشێك لە ساڵی 1715، ئەمەش بۆ پشتگیری کردنی جیمسی سێیەم. جێگەی باسە زۆرینەی

---

1- بە گوێرەی یاسای گرتنە دەستی دەسەلأت، یان جێ گرتنەوەی تەخت) ساڵی 1701، تەخت گوازرایەوە بۆ بنەماڵەی هانۆڤەر، جۆرجی یەکەمیش" بوو بە پاشای ئینگلترا. شیاوی باسە جۆرج کوڕی خانم صۆفیاو نەوەی جیمسی یەکەمی پاشای ئینگلترا بوو. (نوسەر)

ئەندامانی تۆری خۆشیان بەجیمس دەهاتو نامەو دیاریان بۆ دەنارد. وەلێ شۆڕشی جیمس شکستی هێنا. ئەم شۆڕشە ناسرابوو بە شۆڕشی تۆڵەو بۆ گێڕانەوەی تەختی ئینگلیزی بوو بۆ بنەماڵەی ستیوڕات. لەگەڵ ئەوەی شۆڕش شکستی هێنا بەلاّم بنەماڵەی هانۆڤەر هەتاوەکو ساڵی 1745 لەلایەن بنەماڵەی ستیوڕاتەوە لەژێرمەترسی دابوون، کاتێ لەم ساڵەدا توانیان دواین شۆڕشیان کۆتایی پێبێنن، کە چارلس ئیدواردی کوڕی جیمسی سێیەم هەڵیگیرساندبوو. لەڕاستیدا هۆکاری کوژانەوەی شۆڕشی تۆڵەو شکستهێنانی لەساڵی 1715 خودی جیمس بوو، کاتێ ئەم نەیتوانی ڕابەرێکی لێهاتوو بێتو دەستەوستان بوو لە دانانی نەخشەیەکی سەربازی گونجاو بۆ شۆڕشەکەی، هەروەك بۆ پشتگیری کارانی ئەوەی دەرنەخست کە پشتیگری کڵێسای ئینگلیزی دەکات یاخوو نا. جگەلەمە لۆیسی چواردەش لەم کاتەدا ماڵئاوایی لە دنیاکرد، ئەمە لەکاتێکدا کە بەڵێنی هاوکاری پێ دابوو، لەملاشەوە وەصی پادشای بچووك لۆیسی پازدە، کەخۆی دەبینیەوە لەدۆق ئۆلێریان، بەهۆی هەبوونی ناکۆکی لەگەڵ فلیپی پێنجەمی پادشای ئیسپانیا نەیتوانی بەڵێنی لۆیسی چواردە بەجێبێنێ بۆ جیمس. هەروەها کاتێك شۆڕش دەستی پێکرد جیمسی سێیەم لە بەرزایەکانی سکۆتلەندا بەبێ هیچ نەخشەیەکی پێش وەخت سەرکەوت. بەلاّم کەمی پشتیوانی جیمس وایکرد حکومەت بتوانێ بەخێرایی شۆڕشەکە لەناوبەرێ. شیاوی باسە شۆڕشی تۆڵە هۆکارێ بوو بۆئەوەی کە شا جۆرج تاماوەیەکی زۆر مەیلی بەلای هویگز دابێو پشتیان پێ ببەستێ.

ڕەوشی سیاسی ئەورووپا شێواوبوو بەهۆی ئەوەی پەیمانی "ئەترێخت" شوێنەواری توورەیی جێهێشت بوو لەناوەندەکانی ئەورووپا. ئیسپانیا نارازی بوو لەوەی نەمسا باڵادەست بوو بەسەر ئیتاڵیادا، لەپاڵ ئەوەشدا هەوڵی دەدا تەختی فەڕەنسی وەچنگ خۆی بخات، لەملاشەوە ئیمپرتۆری نەمساوی چارلسی شەشەم تەختی ئیسپانیو دوورگەی صقلّیەی دەویست، لەکاتێکدا ساڤۆی بۆخۆی داپچڕی بوو. وەهەر

لەهەمانکاتدا وڵاتانی باکور لە گەرمەو کێشەدابوون لەگەڵ سویدو جەنگیان لەدژی دەکرد، هەروەها ئەو جەنگەش کە لەنێوان پترصی گەورەی قیصەری ڕوسیاو چارلسی دوازدەی پادشای سوید هەڵگیرسابوو لە ساڵی1707 کەمترنەبوو لەجەنگە گەورەکانی تر. جالەم بێنەو بەردەیەدا شاجۆرجی یەکەم توانی دوو ڕێکەوتننامە گرێ بدات. یەکەمیان ڕێکەوتن نامەی "ویستمنسەر" لەساڵی 1716 لەنێوان ئینگلتڕاو نەمسا، ئەمەش لەسەر هاوکاری کردنی هەریەکەیان بۆیەکتری لەمەڕ پارێزگاری کردن لەوڵات. دووەمیان لەنێوان فەڕەنساو ئینگلیتڕا بوو لەدژی ئەوانەی چاویان بڕی بوویە تەختی فەڕەنسی یاخود ئینگلتڕا. هەرچەندە ئەم ڕێکەوتن نامەیە لەپێناوی پشتیوانی کردن بوو بۆ بنەماڵەی پاشایی هانۆڤەر لەدژی جیمسی سێیەم کەچاوی بڕی بوویە تەختی ئینگلیزی، وە فەڕەنسا پێشتر پشتیوانی دەکرد، هەروەها لەپێناوی پشتیوانی کردن بوو لەبنەماڵەی فەڕەنسا لەدژی فلیپی پێنجەمی پاشای ئیسپانیا. بەڵام ئەمەیان واتا ڕێکەوتن لەگەڵ فەڕەنسا بەزیانی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا تەواو دەبوو، چونکە فەڕەنسا ڕکەبەرو دوژمنی لەپێشتربوو بۆ چالاکی بازرگانیو داگیرگەکاری. لەسەر ئەمە ( تاوزەند) لەدژی ئەم ڕیککەوتنە ڕاوەستاو دەستی لەکارکێشایەوە، پادشاش "ستانهوب"ی خستە جێگەی "تاوزەند". ستانهوب پشتگیری ئەم ڕێککەوتنەی دەکرد بەو بێنوەی کە هێمنیو ئاسایشی بەریتانیا لەژێر مەترسی ئەوانە دایە کە داوای تەخت دەکەن، جا دۆستایەتی کردنی فەرەنسا ئەم هێمنیو ئاشتیە چەسپاو تر دەکات.

ستانهوب بەهۆی پێکهێنانی هاوپەیمانی چوارینە لەساڵی 1718 توانی پارێزگاری لەئاشتی ئەوروپا بکات، ئەمەشی بەمەبەستی ملکەچکردنی ئیسپانیابوو کاتێك ئیسپانیا ساڵێك پێشتر هێرشی کردبوویە سەر نەمسا لە ئیتالیادا. بەڵام کاتێ ئیسپانیا ملی نەدا، فەرەنسا لە باکورەوە شاڵاوی کردە سەرو کەشتیگەلی ئینگلیزیش کەشتیگەلەکانی تێکشکاند، ئیدی ئیسپانیا تەمێ خواردو کراو ناچار کرا لە ئیتالیا پاشەکشە بکات. پاش ئەمە وڵاتانی ئەوروپا لە کۆنگرەی ئەوروپی لەساڵی 1722

کێشەکانیان چارەسەر کرد. جەنگی نێوان سویدو ڕوسیاش ساڵێك پێشتر کۆتایی پێ هێنرا.

لە ڕاستیدا جەماوەری "ستانهوب" کاتی بوو. لەساڵی 1721 ئەو کۆمپانیایەی "جون لو" لە فەرەنسا دای مەزراندبوو هەرەسی هێنا. "جۆن لوو" پشتگیریەکی بەهێزی لەئینگلترا بەدەستهێنا بوو، ئەم کۆمپانیایە چووە نێو چەند گرێبەستێکی داراییو چەندین وەزیر بەرتیلیان لێوەرگرت. هەرەسهێنانی ئەم کۆمپانیایە کاریگەری دروستکرد لەسەر متمانەی خەڵکی بە حکومەتەکەیان. ئەگەر"سێر روبرت پۆل" نەبوایە، کە توانی بارەکە ڕاست بکاتەوە ئەوا هویگز دەکەوت.

## سێر ڕۆبەرت وەلپۆل، یەکەم سەرۆك وەزیرانی ئینگلیز 1721-1742:

"سێر رۆبەرت وەلپۆل"، کوڕی یەکێ لەخاوەن زەویەکان بوو لە هەرێمی "نورفولك". ولپۆل قوتابی بوو لەزانکۆی کمبرج. هێشتا هەر قوتابی بوو، کە برا گەورەکەی کۆچی دوایی کرد، هەربۆیە سەرجەم موڵكو ماڵی باوکی بووە بەشی. جا لەبەرئەمە باوکی لە زانکۆ هێنایە دەرەوە بۆ ئەوەی کاروباری ئەو موڵكو ماڵە بەڕێوەبەرێت. ئیدی ولپۆل بوو بە پیاوێکی چاپوك لە کرکردندا. "ولپۆل" لەساڵی 1700 چووە پەرلەمانو توانی لە پۆستەکاندا بەرەو پێشەوە بچێتو بەرز بێتەوە. لێهاتویی ئەم لە ژمێرەو بیرکاریدا هۆیەك بوو بۆ ئەم بەرز بوونەوەیە. لەساڵی 1714 بوو بە وەزیر لەحکومەتی هویگز. کاتێك کۆمپانیای "جۆنلوو" هەرەسی هێنا، وەلپۆل تاکە کەسێ بوو کە لە کێشە داراییەکان لەگەڵ کۆمپانیاکە تێوەنەگلا، هەربۆیە بە وەزیری دارایی دیاریکراو، پاشان بوو بە وەزیری یەکەمو سەرۆکی حکومەت. ئیدی چاکسازیو چاکردنی ڕەوشی درایی کەوتە ئەستۆی.

وەلپۆل لە ساڵی 1721 تاوەکو ساڵی 1742 بەردەوام لەم پۆستەدا بوو. لەم ماوەیەدا تواناداری لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا دەرکەوتو، سەلماندی کە ئەو پیاوی

دەوڵەتە. ئەم سیاسەتێکی گرتبووە بەر کە لەگەڵ نەیاران کۆك نەبوو، لە کاتێکدا نەیارانی تۆڵە بەهێز بوو، وە بنەماڵەی هانۆڤەر جەماوەریان لەدەستچوو بوو. وەلپۆل کاتێ هەستیکرد کە چاکسازی کردن لە باجەکاندا ڕووبەڕووی ناڕەزاییەکی توندی خەڵکی دەکاتەوە، چاکسازی خستە پشتگوێ. ئەمە لەکاتێکدا زۆرینەی پەرلەمان پشتگیری چاککردنی باجیان دەکرد.

لە سیاسەتی دەرەوەشدا وەلپۆل سەیری کرد کە بەرژەوەندی بەریتانیا لەگەڵ هەریەکە لە فەرەنساو ئیسپانیا بەریەکدەکەوێ لە بواری بازرگانیو داگیرکاریدا. بەڵام ئەم سیاسەتێکی ئاشتیانەی گرتەبەر لەگەڵیانو ئاشتی بە پێویست دەزانی بۆ بڵاوکردنەوەی خۆشگوزەرانیو خۆشنودی ئابووریو سەقامگیری لە بەریتانیا. لە سیاسەتی ناوخۆشدا "وەلپۆل" گرنگیدا بە پیشەسازیو هەناردە کردنی کاڵا، بەمەبەستی دەستکەوتنی دراوو کەلوپەلی بیانی. هەروەها باجی سەپێنراوی سەر هەناردەکانی هەڵگرتو باجی لەسەر ئەو هاوردانەش کەم کردەوە کە بەریتانیا پێویستی پێبوو. بەمشێوەیە بازرگانیو پیشەسازی لەسەردەمی ئەودا جموجۆڵی تێکەوتوو بەریتانیا بوو بە خاوەنی باشترین سیستەم لەناو دەوڵەتەکانی تردا، لەڕوی ئابووریەوە.

ڕوبروت ولپۆل بەمانای نوێ دادەنرێ بەیەکەم سەرۆك وەزیران. لەژێر فەرماندا ری ئەودا سیستەمی وەزاری گەشەی سەندو سەربەخۆ بوو لەپاشا. کەم جار پادشا لەدانیشتنەکانی وەزیران ئامادە دەبوو. پادشا لەبەرئەوەی بە زمانی ئینگلیزی قسەی نەدەکرد سەرۆکایەتی دانیشتنەکانی بەجێهێشت بۆ وەزیری یەکەم "روبۆرت ولپۆل". ئیدی ئەم دیاردەیە بوو بە بنەمایەکی گشتی لە سەردەمی جۆرجی دووەم 1727-1760، کاتێك ئەمیشیان زمانی ئینگلیزی باش نەبوو. ئیدی بوو بەشتێکی ئاسایی بۆ وەزیرەکان کە جیاوازیەکانیان یەکلایی بکەنەوە پێش ئەوەی پەیوەندی بەشاوە بکەن.

کاتێك پاشا لەتوانایدا نەبوو کاریگەری لەسەر بڕیارەکانیان دروست بکات، بە پێویستی دەزانی کابینەی حکومەت لەم قەوارەیە پێك بهێنێ کە زۆرینەیە لە پەرلەمان، ڕۆبەرت ولپۆل تاکەکەسێ بوو بتوانێ ئەنجومەنی گشتی بەڕێوە بەرێو لێیان تێبگات "لێك تێگەیشتن"، هەر بۆیە لەپۆستەکەی خۆی مایەوە.

پێشتر کابینەی حکومەت بەتەواوی لە قەوارەیەك پێکنەدەهات هەرچەندە زۆرینە بوایە، کاتێك سەیر دەکەین کابینەی هویگز ژمارەیەك لە تۆریەکانی بەخۆیەوە گرتبوو، بەهەمانشێوەش کابینەی تۆری هەندێ لە "هوینگز" بەشداریان تیادا کرد. بەلام ئەمە لەسەردەمی ڕۆبەرت ولپۆل گۆڕا، بەشێوەیەك کە کابینەی هویگز سەرجەمی ئەندامو بەشداری کارانی لە قەوارەی هویگز پێکدەهات. هەروەك گونجانی وەزارەتو بەرپرسیاری وەزارەت بوو بە شتێکی پێویست، کە یارمەتی پیادەکردنی هەرجۆرە سیاسەتێکی دا. وە بۆ یەکەم جار وشەی سەرۆك وەزیران لە سەردەمی "سێر ڕۆبەری ولپۆل" بەکاهێنراو کابینە لە پاشا سەربەخۆ بوو، پشتی دەبەست بە متمانە پێدانی زۆرینەی ئەنجومەنی گشتی بۆ مانەوەی لەسەر حوکم.

لەساڵی 1742 دوای ئەوەی "ڕۆبرت ولپۆل" متمانەی زۆرینەی پەرلەمانی لەدەستدا، دەستی لەکار کێشایەوە. نەمانی متمانە بەهۆی یەکگرتنی هەندێ لە گەنجە دیارەکانی قەوارەی هویگز بوو، ئەوانەی "وەلپۆل" لە کابینە دووری خستبوونەوە بەهۆی دژایەتیان بۆ سیاسەتی دەرەوەی وەلپۆل. لەڕاستیدا ئیسپانیا لەم کاتەدا مەترسی دروستکردبوو لەسەر سەقامگیری ئەورووپاو لەگەڵ فەرنساش لە ساڵی 1733 کێشەی خانەوادەییان لەنێوان خۆیان چارەسەرکردو بە ڕێککەوتنێکی ژێربەژێر لەگەڵ یەکترپێکهاتن لەسەر برەودانی هەردوولایان بە سیاسەتی بازرگانیو داگیرکاری دژ بە بەریتانیا،واتا:"بەیەکەوە پێکهاتن لەسەر دژایەتی کردنی بەریتانیا. هەر بەهۆی ئەم پێکهاتنەش کێشەی خانەوەدەییان چارە کرد". بەلام سەرقاڵبوونی فەرەنسا لەم کاتەدا بەجەنگی ویراسەی پۆلندیەوە 1733-1738 هۆیەك بوو بۆ دەرنەکەوتنی

ئاكامی ئەم ڕێككەوتنەو دەرەنجامەكانی. "رۆبەت ولپۆل"یش-بێلایەنی بەریتانیای لەم جەنگەدا ڕاگەیاند، سەرەڕای ئەوەی "ڕۆبەرت ولپۆل" بۆ كۆتایی هێنان بە جەنگو پێكهێنانی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ فەرەنساو ئیسپانیا ڕۆڵی ناوبژیوانی دەبینی. ئاشكرابوونو زانینی ئەم ڕێككەتنە ژێربەژێرییە بوو بە هەلێك بۆ نەیارانی" وەلپۆل" لە هەردوو قەوارەكە، ئیدی ئەم هەلەیان قۆستەوە بۆ هێرش كردنە سەر سیاسەتی ولپۆل، كە زیانی گەیاند بوو بە بەرژەوەندی بریتانیا لەبواری بازرگانیو داگیركاریدا. ئیسپانیا تا ئەو كاتەش بازرگانیو داگیرگەكانی ئەمریكای قۆرغ كردبوو، هەروەها كەشتیە ئینگلیزیەكانی لە دەریاكاندا دەپشكنیو بەمامەڵەیەكی خراپو ڕەق مامەڵەی دەكرد لەگەڵ دەریاوانانی ئینگلیز. نەیارانی "ڕۆبەرت وە لپۆڵ" دەستیانكرد بە هێرش كردنە سەر سیاسەتی سەرۆك وەزیران، بەهۆی ئەوەی پارێزگاری نەدەكرد لە بەرژەوەندی بازرگانی بریتانیاو تۆڵەی لە ئیسپانیەكان نەدەسەندەوە.

هاوكات ئەنجومەنی گشتی ژمارەیەك لەو دەریاوانانەی بانگهێشت كرد كە لەلای ئیسپانیەكان توشی سزای جۆربەجۆر ببوون، یەكێ لەوان ئەوەی باسكرد كە ئیسپانیەكان گوێیان بڕیوە، بۆ ئەمەش قتویەكی دەرهێنا هەر دوو گوێچكەی بڕاوی خۆی نیشان دان. جا كاتێك یەكێ لەئەندامانی ئەنجومەنی گشتی پرسیاری لە گوێ بڕاوەكە كردو پێی گووت: "چیت كرد دوای ئەوەی گوێچكەیان بڕی"؟ ئەویش ووتی: "پشتم بە خوداو وولاتەكەم بەست بۆ تۆڵە سەندنەوەم(داوام لە خوداو وولاتەكەم ئەوەیە كە تۆڵەم بستێنن)" شیاوی باسە ئەو دەریاوانەی بەم شێوە دڕاندانە مامەڵەی لەگەڵدا كرابوو ناوی"كابتن جینكنز" بوو.

ئەم بەسەرهاتەو نمونەی ئەم بەسەرهاتانە ئەوەیان دەردەخست كە دەریاوانانی ئینگلیز لە زیندانەكانی ئیسپانیاو لەسەر دەستی دادگاكانی پشكنین ئەشكەنجە دەدرێنو بە زنجیر كۆت دەكرێن. جا ئەمانە بەس بوون بۆ دەربڕینی بێزاریو ناڕەزایی گەلی ئینگلیزی. "وەلپۆل" هەوڵیدا كێشەكە بە وتووێژ چارەسەربكاتو ئیسپانیا

والێبکات قەرەبووی زیانەکان بدات، بەلاّم نەیارانو ئەوانەی نەیاری ولپۆل بوون، تۆمەتی ملکەچیو بێ هێزییان دایە پالّی. جا کاتێك ڕای گشتی گەلی ئینگلیزی دژی پەیمانبەستنو ڕێککەوتن بوونو بە توندی نارەزاییان دەربڕی، ڕۆبەرت ولپۆل لە سالّی1739جەنگی ڕاگەیاند. بەلاّم بەهۆی ئەوەی ئەم جەنگە دژبە ویستو ئارەزووی بوو، دەستی لەکار کێشایەوە. بەلاّم شا "جۆرج" سوور بوو لەسەر مانەوەی.

جەنگەکە لە بەرژەوەندی بریتانیا بوو کاتێ توانی هەندێ سەرکەوتن بە دەستبێنێ. بەلاّم هەلگیرسانی جەنگی ویراسەی نەمساوی لەسالّی1740، پاشان چوونە ناوەوەی فەرەنسا بۆ جەنگ، بە مەبەستی پارچەپارچەکردنی ئیمپراتوریەتی نەمساوی، وایکرد بەریتانیا ئارەزووی چوونە ناو جەنگە بکات لەدژی فەرەنساو بۆ پاراستنی نەمسا. بەلاّم شا "جۆرج" لە ترسی لە دەستچوونی هەرێمی هانۆڤەر بێ لایەن مایەوە، هەر بۆیە ڕای گشتی گەلی ئینگلیزی نارازی بوونو ڕەزامەند نەبوون لەحکومەتی ئینگلیزی و، ئەو حکومەتەیان تۆمەتبار کرد بەوەی بەرژەوەندی هانۆڤەر لەسەروی بەرژەوەندی بریتانیا دادەنێت.

دوای ئەوە لە سالّی1741هەلّبژاردن بەڕێوەچوو. ئەم هەلّبژاردنە بووبە هۆی بردنەوەی ئۆپۆزسیۆن، هەربۆیە "سێرڕۆبەرت وەلپۆل" لەسەرەتای سالّی1744 دەستی لەکارکێشایەوە.

شا "جۆرج"ی– دووەم پێشەوایەتی شالاّوێکی کرد لە دژی فەرەنساو توانی سەرکەتن بەدەستبهێنێ، بەلاّم کوڕەکەی لەتێکهەلّچوونی"فونتینو ی"سالّی1745لە بەرامبەر فەرەنسیەکان تێکشکا. لەم کاتەدا "چارلس ئیدواردی" نەوەی جیمسی دووەم" لە بنەمالّەی ستیوڕات" هەلی قۆستنەوەو بە هاوکاری سکۆتلەندیەکان جەنگیان لەسەر ئینگلترا ڕاگەیاند. وەلێ ئینگلیزەکان توانیان سەربکەون بەسەریانداو لە تێکهەلّچوونی "کلودین" لە سالّی1746 تێکیانشکاندن. بەمەش دواین هەولّی بنەمالّەی ستیورات بۆ گێڕانەوەی تەخت کۆتایی پێهات.

جێگرەوەکانی ڕۆبەرت وەلپۆل تواناداروو چاپوك نەبوون، جگە لە"ولیەم پیت"، بەڵام پادشا بەهۆی ئەوەی ڕقی لە "ولیەم پیت" بوو، ڕێگەی نەدا بچێتە سەر کورسی. وەلێ ڕۆیشتنی ئینگلترا بۆ جەنگی حەوت ساڵەو بێ توانایی کابینە لە هەڵسوڕاندنی جەنگ، پادشای ناچار کرد بانگهێشتی "ولیەم پیت" بکات بۆ سەرۆکایەتی کردنی کابینە.

ولیەم پیتو جەنگی حەوت ساڵە:—

ولیەم پیت بەبێ ئەوەی بەهرەمەند بێت لەهیچ پێگەیەکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو سامانێکی زۆر یا پێگەیەکی خانەوادەیی، وەك پیاوێکی دیارو هەڵکەوتوو لە پەرلەمانی ئینگلیزی دەرکەوت. "پیت" خۆی پێگەیاندو لە ڕێگەی بازرگانیەوە سامانێکی زۆری بەچنگ کەوت. بە پشت بەستنیش بەم سامانە چووە ئەنجومەنی گشتی. چاپوکیو سەلیقەیی ئەو لە گفتوگۆکانی پەرلەمان دەرکەوت، بە شێوەیەك بە زمان پاراوترین کەس دادەنرا. هەر لەیەکەم ڕۆژدا نەیاری وەلپۆلی کردو بووبە سازمانی جەماوەر. بەهۆی سیاسەتە وردو جوانەکەی توانی وڵاتەکەی ڕزگار بکات و لەجەنگی حەوت ساڵەدا هێزەکانی فەڕەنسا تێکبشکێنێو کۆتایی بێنێ بە ئیمپڕاتۆریە داگیرکاریەکەیو خۆی شوێنی بگرێتەوە.

ولیەم پیت هەستی کرد کە ئیسپانیا ڕێکەوتنی ژێربەژێری هەیە لەگەڵ فەڕەنسا بۆ ڕاگەیاندنی جەنگ بەسەر ئینگلتەرادا، هەرچەندە لە جەنگی حەوت ساڵەدا بێ لایەن بوو تاساڵی1759. جا کاتێك پیت پێشنیازی هەڵگیرسانی جەنگی کرد بەسەر ئیسپانیادا، یاوەرانی ڕەتیان کردەوە. بە هۆیەوە"پیت" دەستی لەکارکێشایەوە.

جۆرجی دووەم مردو جۆرجی سێیەمی نەوەی هاتە سەر تەختی ئینگلیزی. "جۆرجی سێیەم" لۆرد بیوتی کردە سەرۆك وەزیران. "لۆردبیوت" جەنگی لەدژی ئیسپانیا ڕاگەیاندو ئینگلیزەکان لە ساڵی 1762 دەستیانگرت بەسەر کوباو مانیلا لەفلیپین. بەڵام هەردوولا لە ئینگلزیو فەڕەنسی جەنگ شەپرێوی کردبوون، هەربۆیە

لـە سـاڵی 1763لـەپاریس ئاشـتەواییان بەسـت. بـەگوێرەی ئـەم پەیمانـە ئینگلیـز دەستیگرت بەسەر کەنەداو دەسەلاّتی نواند بەسەر ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا تاوەکو ڕوباری میسیسپی، هەروەها فلۆریدای لە ئیسپانیا چنگ کـەوتو "هاچـانا"ی- بۆ گەڕاندەوە، بەمەش ئیمپراتۆریەتی داگیرکاری فەرەنسی کۆتایی پێهات.

## سەردەمی شاجۆرجی سێیەم: 1760- 1820:.

جۆرجی سێیەم لەساڵی 1738 لە ئینگلتەرا لەدایك بووە. باوکی ناوی فردریـك بـوو کە لە ساڵی 1757 کۆچی دوای کرد بە سێ ساڵ پێش مردنی باوکی خـۆی "جـۆرجی دووەم". لەبەرئـەوە تـەخت لـەدوای مردنـی جـۆرجی دووەم درایـە جـۆرجی سـێیەم. "جۆرجی سـێیەم" لەسـەرەتایی دەسـەلاّتیدا گـەلی ئینگلیـزی خۆشدەویسـتو گرنگـی بەکاروباری ولاّتەکەی دەداو وەك پاشایەك دەیویسـت خـۆی حـوکم بکـات. ئـەم مـەیلی بەلای تۆری دابوو، وە بـەهۆی بـەرتیلو ڕاکپـشان تـوانی لەهـەردوو پارتەکـە زۆرینـەی پەرلەمان بەلای خۆیدا کێش بکات.

"جـۆرجی سـێیەم" ولیـەم پیـت ی خۆشنەدەویـست. ئـەم بەرەبـەرە خـۆی لـە وەزیرەکانی هویگز ڕزگار کردو بە تۆریەکان جێگەی گرتنەوە. پاشان "لۆرد بیوت"ی- کردە سەرۆکی وەزیران لە ساڵی 1761. بیوت تا سـاڵی 1763و "پـەیمانی پـاریس" لەسەر تەخت بەردەوام بوو، کە بەگوێرەی ئەم پەیمانـە جـەنگی حـەوت سـاڵە کۆتـایی پێهات. لەگەڵ ئەوەی نەیاری کردنی ئەو ڕێکەوتنە لـە پەرلـەمان زۆر تونـد بـوو، بـەلاّم زۆرینە دەنگی پێدا. ئەوانەش کە دژی ڕێککەوتنەکە بوون، سـەرۆکی وەزیـران"بیـوت" لەسەر کارەکانیانو لە پەرلەمان دەریکردن.

بەهۆی ئەوەی بیوت لـە نزیکـانی پاشـا بـوو نـەیتوانی خـۆی بەجـەماوەری بکـات، هەربۆیە ناچار بوو دەست لەکاربکێـشێتەوە. لـەدوای ئەمـەو لـە شەسـتەکانی سـەدەی

هەژدە ژمارەیەك سەرۆك وەزیر هاتنە سەر دەسەلاّت، لەم ماوەیەشدا كێشەی "جۆنوێلّكس" سەریهەلّدا كە ماوەیەك بەریتانیای بەخۆیەوە سەرقالّ كرد.

## كێشەی جۆن وێلكس:-

جۆن وێلّكس خاوەنی ڕۆژنامەی "نورس بریتۆن" بوو. ئەم ڕۆژنامەنوسە بە توندی هێرشی دەكردە سەر سیاسەتی لوردبیوت، هەروەك ڕەخنەی توندی گرت لەوتارەكانی پادشا، كە لەپەرلەمان بۆ پارێزگاری كردن لەپەیمانی پاریس پێشكەشی كرد. بەلاّم بێ ئەوەی ناوی پادشا بێنێ لەڕەخنەو توانج گرتنەكانیدا. ڕێسای ئەم كاتە وابوو كە وەزیران وتاری پاشایان دەنوسی، هەربۆیە شتێكی بەلّگەنەویستە كە بەرپرسیاری دەكەوتە ئەستۆی ئەوان. بەلاّم پادشا دەورێكی گرنگی دەگێڕاو نەدەترسا لەئەنجام دانی پەیمانەكە، لەبەرئەوە ڕەخنەكان ڕووەو ئەو لێكدەدرایەوە. ئەمە وایكرد فرمانبدا بە گرتنە بەری ڕێوشوێنی یاسایی لەدژی جۆن وێلّكس. وە بە ئاشكرا كابینە فرمانیدا بەپشكنینی مالّی وێلّكس لە كاتێكدا وێلّكس ئەندامی ئەنجومەنی گشتی بوو. جا ئەم ڕێوشوێن گرتنەبەرە لەدژی جۆن وێلّكس، سەرپێچی ئاشكرای قانون بوو. لە هەمانكاتدا وێلّكس داوای جێبەجێ كردنی یاسای "هیبس كوریس"ی دەكرد، كە بەپێی ئەم یاسایە بەبێ ڕێپێدانی دادگاو روون كردنەوەی تۆمەت، كەس بۆی نەبوو هیچ كەسێ دەستبەسەربكات یان بەند بكات.

بەلاّم پادشا بەردەوام بوو لەچەوساندنەوەی جۆن وێلّكس و توانی پەرلەمان ڕازی بكات بە دەركردنی لەئەنجومەنی گشتی. ئەمجا وێلّكس هەلاّت بۆ فەرەنسا. لەمەوە پەرلەمان بە غیابی بڕیاری لەسەرداو لە دەرەوەی یاسای لە قەلّەم دا.

ئەم توند ڕەویەی كە گیرایەبەر ڕقی خەلّكی هەستاند وسۆزیان بۆ وێلّكس جولاّو بە قوربانی دەستی زۆرداریان لە قەلّەم دا، لەمەوە بۆ دەربڕینی پشتگیریان بۆ وێلّكس و داخوازی بۆ ئازادكردنی، خۆپیشاندانیان دەستپێكرد. لەم ماوەیەدا چەند كابینەیەك

بەدوای یەکتریدا هاتن و چوون. "وێڵکس"یش- لەساڵی 1778 گەڕایەوە ئینگلتراو خۆی پاڵاوت بۆ نوێنەرایەتی. جالەپاش ئەوەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا بۆ ئەندام بوون لە ئەنجومەنی گشتی، زیندانیان کرد بەهۆی ئەو بڕیارەی کە بە غیابی بەسەریدا درابوو. بەهۆی ئەوەوە خۆپیشاندان دەستیپێکردو پەرلەمانیش هیچ گرنگی پێنەدا، دواتر ئەم خۆپێشاندانەتەشەنەی سەندو بووە هۆی کوژرانی ژمارەیەك لەخەڵکی. "وێڵکس" بەیانێکی دەرکردو کابینەی تۆمەتبارکرد بەنەخشەکێشی ئەم کوشتارە. لەم کاتەدا سەرجەمی ئەندامانی پەرلەمان ڕێککەوتن لەسەر دەرکردنی وێڵکس لەئەنجومەنی گشتی. پاش دەرکردنیشی چەند جارێك لە هەڵبژاردن دەردەچوو، بەڵام ئەنجومەنی گشتی ڕەتی دەکردەوەو ئەندام بونی وێڵکسی لە پەرلەمان پەسەند نەدەکرد.

## لوردنورسی1770-1782

جۆرجی سێیەم کابینەی ڕێکخست بەسەرپەرشتی "لورد نورسی"و تاساڵی 1782 لەم پۆستە مایەوە. "لۆردنورس" پیاوێکی زمانپاراوو ڕەوان بێژبوو لەوتووێژی پەرلەمان، توانی ئەنجومەنی گشتی بەڕێوەبەرێ‌و زۆینە بەدەستبێنێ. لەبەرئەوە پاشا خۆشی دەویست. ئەگەر لەپرس‌و ڕاوێژدا بیرکردنەوەیان جیاواز بوایە، "نورس" ناچار بوو فرمانی پاشا جێبەجێ بکات. لەسەردەمی ئەودا شۆرشی ئەمریکی سەریهەلداو بوو بەهۆی سەربەخۆی ئەم ئەمریکا. پەرلەمانی ئینگلیزی لە ماوەی سەدەی هەژدە لەپەشێوی دابوو، بەشێوەیەك کە گەیاندیە ئاستێکی نزم.

### دەستوری ئینگلیزی لە سەدەی هەژدە:-

یەکێ لە خاڵە جیاکاریەکانی بەریتانیای ئەمڕۆ لەچاو وڵاتانی تر، نەبوونی دەستورێکی نوسراوە. دەستوری ئینگلیزی بریتی یە لە کۆمەڵێك دابونەریت‌و کەلتوری بۆماوەیی‌و گرتنەبەری ڕێوشوێنە حوکمیەکان، کەحکومەتی بەریتانی بەهۆیەوە ڕێکدەخراو هەڵدەسوڕێندرا بەبێ ئەوەی بنوسرێتەوە: دەستوری ئینگلیزی

بەشێوەیەکی تەدریجی"بەرەبەرە" گەشەی سەندو گۆڕانکاری بەسەرداهات بە درێژایی مێژوو. بەتایبەت لە ئاکامی شۆڕشی ئینگلیزی لە سەدەی حەڤدە. کە دەستوری کردە بەخاوەن تایبەتمەندی خۆی:ـ

بەگوێرەی یاسا پادشا وەك سەرۆکی دەوڵەتو مەملەکەت مایەوە. وە ئەو یاسایانەی کە دەردەکران و ئەو پەیمانانەی کە دەبەستران و ئەو فەرمانبەرانەبەرانەشی کە دادەمەزران بەناوی ئەوەوەبوو، وتا"بەناوی پادشاوە هەموو ئەمانە ئەنجام دەدران". پادشا سەرۆکی دەوڵەتو کڵێسایە. وەلێ لەڕووی کردەیەوە کابینە بەمانە هەڵدەستاو هەر ئەوانیش بەرپرسیاربوون بەرامبەر پەڕلەمان. ئیدی دروشمی "پادشا خاوەنەو حوکم ناکات" بووبە دروشمی باوو بەربلاو.

پادشا موچەیەکی ساڵانەی هەبوو، دەسەلاتیشی کۆتکراو توانای باج سەپاندنو کۆکردنەوەی نەبوو. شا ولیەمی سێیەم لەساڵێکدا"700" هەزار پاوەندی ئیستەرلینی وەردەگرت. وەلێ نەیدەتوانی یاسا دابنێ یاخود لەکاری بخاتو هەڵیوەشێنێتەوە، بەلاَم مافی ڤیتۆی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەڕووی کردەیەوە لەسەردەمی شاژنە "ئان"ەوە پەنایان بۆ ئەم مافە نەبردبوو. پادشا دەسەلاَتی بەسەر دادگاکانەوە نەماو نەیدەتوانی دادوەر لەکاربخات، هەرچەندە بڕیارەکانیشی دژی پادشا بوایە. هەروەك یاسای "هیبیس کوربوس" قەدەغەی بەندکردنی هەر کەسێکی کردبوو، مەگەر بەنوسراوی فەرمی دادگاکان، وە دەبوایە تێیدا هۆکاری تۆمەت بارکردنو بەندکردنی ڕوون بکرێتەوەو بە دادوەرییەکی دادگەرانە دادگایی بکرێت.

پادشا بۆی نەبوو سوپا دابمەزرێنێ لە کاتی ئاشتیو بۆی نەبوو حوکمی عورفی ڕابگەیێنیو جەنگ بەرپا بکات. بەهەمانشێوە دامەزراندنی کابینەو هەڵوەشاندنەوەی لەتوانادا نەبوو، ئەم مافەبوو بە مافی پەرلەمان.

کابینە دروستدەکرا لەو پارتەی زۆرینە بوایە لە پەرلەمان، خۆ ئەگەر کابینەی حکومەت متمانەی زۆرینەی لەدەستدابایە، ئەوا کابینەی حکومەت دەکەوت.

دەسەلاَتەکانی پادشا گواسترایەوە بۆ پەرلەمان، کە بەهرەمەندبوو لەئازادی ڕادەربڕین. ئیدی پەرلەمان بوو بەدەسەلاَتی بالاَی دەولّەتو پێویست بوو نوێنەرایەتی دەسەلاَتی بالاَی دەولّەت بکات. وە دەبووایە پەرلەمان نوێنەرایەتی گەلی بەریتانی بکات. بەلاَم لەڕاستیدا ئەم نوێنەری بوونە نادادگەری بوو. پەرلەمان پێکدەهات لەدوو ئەنجومەنی یاسادانان، کەچی یەکێکیان نەیدەتوانی یاسا دابنێت.

بەهۆی ئەوەی کورسیەکانی پەرلەمان بەشێوەیەکی دادگەرانە دابەشنەکرابوو بۆ سەرجەم خەلّکی، شارە تازەکان بێ بەشبوون لە نوێنەری پەرلەمانی یا ئەندامی پەرلەمان، کەچی شارە کۆنەکانو تەنانەت شارە وێرانو کاولەکانیش ئەندامیان هەبوو بەبێ ئەوەی لە ئاراداهەبن یاخود قەرەبالّغ بن بەدانیشتوان. هەرچەندە لە هەندێ لە شارەکان هەلّبژاردن لەژێر دەسەلاَتی خاوەنکارەکان دابوو، بەلاَم لە شارەکانی تر خانەدانانو گەورە بازرگانەکان بالاَدەست بوونو هەندێ جار بەبێ هەلّبژاردن ئەندام بوون لەپەرلەمان. خاوەن سامان وخاوەن کارو ئەرستۆکراتو گەورەسەرمایەدارەکان لەئەنجومەنی گشتی ئەندام بوون و، هەموو هۆکارێکی وەك: هەرەشەو بەرتیل ودامەزراندنیان دەگرتەبەر بۆبەیهێنانی ئامانجەکانیان.

ئائەوە بوو پەڕلەمانی بەریتانی لە سەدەی هەژدە، کە نوێنەرایەتی کەمێك لە دانیشتوانی بەریتانیای دەکرد. ئەم کەمە خەلّکەش بریتی بوون لەخانەدانو دەولّەمەندو خاوەن سامانەکان. سیستەمی دەسەلاَت هیچ کات دیموکراتی نەبوو، بەلّکو ئۆلیگاریکی بوو کە دەستەیەك لەخانەدانان بالاَدەست بوون تیایداو سیاسەتیان وەك پیشەیەکی تایبەت بەخۆیان سەیردەکرد.

لەسالّی 1707 سکۆتلەنداو ئینگلترا بەتەواوی یەکیەتیان پێکهێناو پەڕلەمانیش ڕەزامەندی لەسەر نیشاندا. ئیدی لۆردو ئەندامە ئینگلیزو سکۆتلەندیەکان لەپەڕلەمانی لەندەن بەیەکەوە کۆدەبوونەوە. لێرەوە ئینگلترا ناونرا بەریتانیا. بەلاَم ئەمە بواری ئاینی نەگرتەوە کاتێك کلّێسای سکۆتلەندی مایەوەو جیاوازبوو لەکلّێسای ئینگلیزی.

پەڕلەمانی نوێ باڵادەست بوو بەسەر دورگەی بریتانیاو ئیمپراتورییەکەی. حکومەت حاکمی بەسەر داگیرگەکان دادەناو یاسای دەردەکرد بۆ بەڕێوەبردنو کۆکردنەوەی باج تیایدا.

سەبارەت بە ئێرلەندە، لە سەدەی دوازدەوە پاشاکانی ئینگلیز هێرشیان دەکردەسەرو پەلاماریان دەدا، جا بەتێپەڕینی ڕۆژگار کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئینگلترا. ئێرلەندییەکان بێگانە بوون بەلای ئینگلیزەکانەوەو دەستیانگرتبوو بەکڵێساکەیانەوە کە کاسۆلیکی بوو، ئینگلتراش نەیتوانی ئاینزای خۆی بسەپێنێ بەسەریانداو وایان لێبکات دەستبەرداری کاسۆلیکیزم بن. ئێرلندیەکان لە هەمبەر ئینگلیز لەسەر بنەمای"دوژمنی دوژمنم دۆستمە" کاریان دەکرد. ئەوان هاوکاری هەر دەوڵەتێکیان دەکرد کە دژایەتی ئینگلترای بکردایە، وەك ئیسپانیاو فەرەنسا. هەروەها پارێزگارییان لەچارلسی یەکەمو جیمسی دووەم دەکرد دژ بە پیۆریتانە توندەکانی پەرلەمانی ئینگلیزی. پڕۆتستانتەکان لەباکوری ئێرلەندەو لەهەرێمی "ئالستر" نیشتەجێ بوون بۆ گەردن کەچکردنی کاسۆلیکەکان، بەڵام لەم سیاسەتە هیچ سودو کەڵکیان نەبینی، جگە لەدروستبوونی ڕقو کینە لەنێوان ئێرلەندیە قین لە دڵەکان. ئێرلەندە پەرلەمانێکی هەبوو، بەڵام لەسەدەی پازدەوە پەرلەمانی ئینگلیز دەبوایە ڕەزامەندی بنوێنێ لەسەر ئەو یاساو بڕیارانەی کە دەریاندەکرد. بارودۆخیان لەسەدەی حەڤدە خراپتر بوو، کاسۆلیکەکان لەپەرلەمان یاساغ کران و پەرلەمان کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەرستۆکراتە پڕۆتستانتەکانی ئینگلیز، لەوانەی کە کرمۆویل لە ئێرلەندە نیشتەجێی کردبوون.

بە کورتی سیستەمی دەسەڵاتی ئینگلیز لەسەدەی هەژدە دەسەڵاتێکی دەستوری پەرلەمانی ئۆلیگاریکی بوو، بە دەستی ئەرستۆکراتیەکان لەخانەدانانو گەورە سەرمایەداران بوو، هیچ کات دیموکراسی نەبوو. ئەم پەرلەمانە فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرییەکی فراوانی دەکرد. هەموو هۆکارێکی دەگرتە بەر بۆ زیادکردنی دەسەڵاتی بریتانیاو پەیداکردنی سامو شکۆمەندیو بەڕمێن خستنی بەرژەوەندیە ئابوریەکانی.

لەسەردەمی کابینەی درێژخایەنی "لۆرد نورس" شۆڕشی ئەمریکا هەڵگیرساو دواتر سەربەخۆی ئەمریکای لێکەوتەوە لەساڵی 1783. ئەمە گورزێکی گەورەبوو کە بەریتانیای حەپەساند. توانجو ڕەخنەگرتن لە سیستەمی دەسەڵاتی ئینگلیزی دای لەزیادبوون. "تۆماس پین" یەکێ بوو لەڕەخنەگرانو دەڵێ:"سیستەمی دەسەڵاتی تازەی ئەمریکا نزیکە لەفەلسەفەی جۆن لۆكو بیروڕاکانی جۆن مڵتن، وە ئەمان نزیکترن لەم ئایدیاو فکرانە وەك لە سیستەمی دەسەڵاتی ئینگلیزی ڕاوەستاو لەسەر پەرلەمان، کە تیایدا ئەرستۆکراتیەت باڵادەستەو ئازادی خەڵکی کۆتو تەوقی خراوەتە سەرو لەگەڵ فەلسەفەی ڕۆشنگەری ناسازێت. کاتێك شا"جۆرجی سێیەم" بینی کە حکومەتە کۆنەپارێزەکەی ناپەسەند بووەو لەلایەن خەڵکیەوە نەویستراوە، "لۆردنورس"ی- لاداو حکومەتێکی تازەی دامەزراند لەساڵی 1782بۆ چاکسازی کردن.

## چاکسازیەکان پەرلەمان:-

لەناو ئەو چاکسازیانەی کە حکومەتی ئینگلیزی پێی هەستا، سەربەخۆکردنی پەرلەمانی ئێرلەندی بوو لەساڵی1782، هەروەها کاسۆلیکەکان مافی ئەوەیان پێدرا کە لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ئێرلەندیدا دەنگ بدەن. پاش ئەمە لەساڵی 1800 ڕەوشەکە زیاتر بەرەپێشەوە ڕۆیشت، ئەمەش کاتێ پەرلەمانی ئێرلەندیو پەرلەمانی ئینگلیزی بەیەکەوە گرێدران، لەسەر هەمان ڕەچەی پەرلەمانی سکۆتلەندیو ئینگلیزی ساڵی 1707. ئیدی دوای ئەمە بۆماوەی سەد ساڵ ئینگلتەڕا بە دەوڵەتی یەکگرتووی بەریتانی ئێرلەندی ناودەبرا.

داواکاری بۆچاکسازی پەرلەمانو دانانی کۆت لەسەر سیستەمی پاشایی هەربەردەوام بوو، پێویست بوو پەرلەمان زیاتر نوێنەرایەتی کردنی خەڵکی بنوێنێ، ئەمەش بەفراوان کردنی بنکەی هەڵبژاردنو نەهێشتنی بەرتیلو لایەنگری"خزم

خزمێنە"و بەدیهێنانی بنەماکانی دیموکراتی دەهاتەدی. ئەو بنەمایانەی کە هەموو دەم شۆڕشگێڕانی شۆڕشی ئینگلیزیو شۆڕشی جەلیلەی ساڵی1688بەسەر زاریانەوە بوو.

## چارلس جیمس فۆکسو بانگەشەکانی چاکسازی:-

زۆرینـەی ئەوانـەی داواکـاری چاکسازیان دەکـرد لـەحیزبی هـویگز بـوون. هـویگز ئەوپارتە بوو کە بەهۆی گەندەڵکاریەوە پارتی تۆری بۆ بەشـی کردبـوو لـە دەسـەلآت. گەندەڵیش لە ڕێگـەی لایـەنگریو بـەرتیلکاری یـەوە پـەیدا دەبـوو. "چارلس جیمس فـۆکس"1749- 1806یـەکێك بـوو لـە بـەناوبانگترینی ئـەو کەسـانەی کـە داوای چاکسازیان دەکرد. فۆکسو جێنیشین"وەلی عەهد"ناویـان دەرکـرد بـوو بەسـەرخۆشو هەوەسباز، ئەمەش بووبە هۆی ئەوەی کە نەتوانێ بێتـە سـەر دەسـەلآت. وەلێ لەگـەڵ ئەوەشدا فۆکس پیـاوێکی بـەتواناو ووتاربێـژێکی زمـان پـاراوبوو، حـەزی لەچاکەکردن دەکرد لەگەڵ هەژارانو چەوسـاوانو هێرشـی دەکـردە سـەر سیاسـەتی کۆنەپەرسـتیو فەرمانبەرە گەندەڵەکان. بەلآم بەهۆی ئەوەی نەیتوانی پێگـەی سیاسـی خـۆیو ژیـانی تایبەتی خۆی لەگەڵ یەکتر بگـونجێنێ سـەرکەوتنی بەدەستنەهێنا. لەخـەم خـواردنی بۆچاکسازی پرۆژەیەکی پێشکەش کـرد بۆچاکسـازی پەرلـەمان کـە لەشـەش داواکـاری پێك هاتبوو:

1-دەنگدانی تـەواو بـۆ نێرینـە2-نوێنەرایـەتی پەرلـەمانی بـە گـوێرەی دانیـشتوان بێت.3-پێدانی موچە بە ئەندام پەرلەمان بۆ ئەوەی هەژارانیش بتوانن خۆیان بپـاڵێون بۆ پەرلەمان.4- لابردنی مەرجی خاوەنداریەتی بۆ ئەندام پەرلەمان. 5- پیـادەکردنی دەنگدانی نهێنی. 6- هەڵبژاردن سالآنە بێت بۆ پەرلەمان.

فوکس بەهۆی کەمی پشتیوانی لەئەنجومـەنی گـشتی، نـەیتوانی ئـەم پرۆژەیـە بـەم شـێوەیە بنێـریۆ پێـشکەشی پەرلـەمانی بکـات. ئیـدی ئـەم ڕێوشـوێن گرتنـە کەوتـە ئەستۆی ولیەم پیتی بچوکی.

## ولیەم پیتی بچوك:- 1759-1806:-

"ولیەم پیت"کوڕی پیتی گەورەی ناسراو بە "ئێرل ئۆف جاتام"ە. پیتی بچوك لە کلاسیکدا دەیخوێندو لەگفتوگۆ کردندا چاپوكو لێهاتوو بوو، خۆی ڕاهێنابوو لەسەر وتاربێژی. لە تەمەنی بیستو یەك ساڵی پیاوێکی زمان پاراوو سیاسیو زیرەك بوو، هەرچەندە لەڕووی جەستەییەوە لاواز بوو، بەڵام کەسێك بوو متمانەی بەخۆی هەبوو. "پیت" خۆی کاندید کرد بۆ پەرلەمانو توانی ببێتە ئەندامی پەرلەمان لەپارتی هویگز، لەگەڵ ئەوەی کە لەسەرجەم ئەندمان بچوکتر بوو، بەڵام توانی ڕێزو سەنگی خۆی بپارێزێو وابکات لە ئەنجومەندا ڕێزی لێ بگیرێ.

ولیەم پیتی بچوك توانی پارتێکی نوێ دروست بکات، بۆ کۆنپارێزەکانی تۆری. ئەوانەی چاکسازی پەرلەمانو نەهێشتنی گەندەڵی ویستو مەبەستیان بوو. "پیتی بچوك" کەسێکی خۆشەویست بوو جوامێریو حەزکردنی بە چاکسازی هۆیەك بوو بۆ بە جەماوەر بوونی، هەروەك هۆیەکیش بوو وای کرد ببێتە سەرۆك وەزیران لەلایەن شاجۆرجی سێیەم. "ولیەم پیت" بووە جێگەی سەرنجی کۆنپارێزەپێشینەکانو پیاوانی ئاینی لەوانەی پشتیوانی پاشا بوون. وە لەهەڵبژاردنی1784 "پیت" زۆرینەیەکی زۆری بەدەستهێنا.

پاش ئەوە چاکسازی نزیك بوویەوەو "پیت" کاتی بە گونجاو زانی بۆچاکسازی. ئەمەش بەکەمکردنەوەی بازرگانی کۆیلەو ئازادی ڕۆژنامە گەری. "پیت" گەلاڵەنامەیەکی پێشکەشی پەرلەمان کردو تیایدا داوای کرد ئەو ناوچانە لەهەڵبژاردندا لا ببرێن، کە وێرانەو بێ دانیشتوانن. ئەمجا دابەشکردنی کورسی ئەم ناوچانە بەسەر ئەو ناوچانەی کە دانیشتوانی تیادا کۆبۆتەوە. بەڵام پێش ئەوەی ئەم چاکسازیانە کۆتاییان پێ بێت، شۆڕشی فەرەنسی سەریهەڵداو چاکسازییەکانی پەنجا ساڵ دواکەوت، واتا نزیك تاساڵی1832[1].

---

[1] W.E.op.cit;pp.505-526;541-563،cunt

## گەشانەوەی ئابوری‌و پێشکەوتنی کشتوکاڵی لە ئینگلترا

ئینگلترا نزیك تا کۆتایی سەدەی حەڤدەیش ولاتێکی کشتوکاڵی بوو. حکومەتە جۆراوجۆرەکان بەتایبەت "تۆری" سیاسەتی کشتوکاڵیان دەگرتەبەر. شایانی باسە زۆربەی ئەوانەی لە پارتی "تۆری" دابوون لەخاوەن زەوییەکان بوون. پەرلەمانی ئینگلیزی ڕەسم‌و باجی خستەسەر دانەوێڵە بەمەبەستی پاراستنی بەرهەمی ئینگلیزی لەکێبڕکێی دەرەکی. لەهەمان کاتیشدا حکومەت بڕێك هاوکاری پێشکەشی خاوەن زەویەکان دەکرد لەهەر بشلێك دانەوێڵە کە بەرهەمیان دەهێنا ئەگەر هاتباو نرخی فرۆشتنەکەی کەمتر بوایە لەشەش شلن لەیەك بشل دا. ئەم سیاسەتە لەسەدەی هەژدە بەردەوام بوو تاوەکو پەرلەمان زنجیرەیەك یاسای تایبەت بەدانەوێڵەی دەرکرد. مەبەستیش لەمە زیادکردنی ڕێژەی کشتوکاڵی دانەوێڵە بوو، هەروەها بەرزکردنەوەی نرخی مەوادی خواردەمەنی بوو بۆ دەوڵەمەندانی دێهات. لەملاشەوە پەرلەمان‌و گەورە خانەدانەکان هاوکاری پرۆسەی پەرژین کردنی زەویە کشتوکاڵیەکانیان دەکرد، ئەمەش بە بەیەکتر بەستنەوەی ناوچەکان‌و پاشان پێکهێنانی کێڵگەیەکی گەورە‌و فراوان بۆ خۆیان، ئینجا قەدەغەکردنی جوتیاران لە سود وەرگرتن لەو زەوییانە.

ئەو جەنگە ئەوروپیانەی کە لۆیسی چواردە لەنێوان1689-1714 هەڵگیرساندن، ئاکامەکەی بەسودی ئینگلترا تەواو بوو، کاتێك توانی داگیرگەی زۆر لە ئەمریکای باکورو دورگەی هیندی خۆرئاوا بۆخۆی مسۆگەر بکات، کە بەهۆیەوە بازرگانی ئینگلیزی گەشانەوەی بەخۆیەوە بینی. هەروەك بووەهۆی بەستنی چەند پەیمانێکی بازرگانی. وەك ئەوەی هەستا بەبەستنی پەیمانی"میسون" لە ساڵی1703 لەگەڵ پرتوگال، کە بەهۆیەوە پرتوگال بوو بە دۆستی ئینگلتراو هەڵدەستا بەناردنی بادە[1]، لەبەرامبەریشدا کەلوپەلی ئینگلیزی هاوردە دەکرد.

---

1بادە-عەرەق

حکومەتی ئینگلیزی لەساڵی 1694هەستا بە دامەزراندنی بانکی ئینگلترا، گەلی ئینگلیزیش نزیکەی یەك ملیۆنو دووسەد هەزار پاوەندی ئیسەرلینیان خستە ناوی، حکومەتی ئینگلیزیش پارەی لەم بانکە بە سودی 8٪ قەرز دەکرد. بەم شێوەیە سامانو داهات لەم وڵاتەدا لەئەنجامی فراوان بوونی بازرگانیو داگیرکاری کەڵەکە بوو. هەروەها بەکۆبوونەوەی سەرمایە لەدەستی خاوەن زەویەکان، شێوازێکی نوێ لە سەرمایەداری کشتوکاڵیو بازرگانی سەریهەڵدا. ئەمانە ئەندامی دیارو گەورەبوون لەکۆمپانیا بازرگانیە گەورەکان، ئەم ئەندامانە هەستان بە بەکارهێنانی سەروەتو وسامانیان لە چاککردنی بواری کشتوکاڵیدا.

زیاد کردنی بەرهەمی کشتوکاڵی بوو بە پێویستیەکی سەرەکی بەهۆی ئەم جەنگانەی کە لە چارەگی کۆتایی سەدەی حەڤدەو سەرەتای سەدەی هەژدە لەنێوان ئینگلتەراو فەرەنسا هەڵگیرسابوون. هەروەك پیشەسازی خوری گەشەی سەندو بازرگانی ئینگلتەرا فراوانی بەخۆیەوە بینیو ژمارەی دانیشتوان بەخێرایی زیادی کرد، ئەمەش بارودۆخی زۆرێك لەخەڵکی ناجێگیر کرد، بەوەی کە هۆیەکی تریان شك نەدەبرد بۆ زیادکردنی موادی خۆراکی وماددەی خاو. ئەویاسایانەشی کە "کرۆمۆویڵو چارلسی دووەم" دەریان کرد"یاسای کەشتیوانیو یاسای دانەوێڵە" تەنها جەخت کردنەوە بوو لەسەر پارێزگاری کردن لە بازرگانی ئینگلیزیو بەرهەمی کشتوکاڵی لەکێبڕکێی دەرەکی، هەروەها هەولێکیش بوو بۆ زیاتر بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ لەئینگلترا. ئەوەی کەجێگەی سەرنجە ئەوەیە کە زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی هەروا کارێکی سانا نەبوو، چونکە ئەمە پێویستی بە دەکارهێنانی میکانیزمی زانستی هەبوو، لەم کاتەشدا ئامێری تازەی کشتوکاڵی لەئارادا نەبوو، هەروەك زانیاری زانستی لەبواری کشتوکاڵی لە بەردەستدا نەبوو، بەهەمانشێوە لەڕووی داراییەوە توانادار نەبوون، بەڵکو دارایی تەنها لەدەستی گەورە سەرمایەدارەکانو خاوەن زەوی وسامانەکان بوو. هەربۆیە دەبێت بەلامانەوە ئاسایی بێت کاتێك ببینین ئەوانەی هەستاون بە شۆڕشی

کـشتوکاڵی دەوڵەمەنـدو خانەدانـەکان بـوون، ئەوانـەی کـە زەویـەکی زۆریـان لـە بەردەستدابوو.

## شۆڕشی کشتوکاڵی:-

یەکەم کەسێ کە دەستیکرد بە شۆڕشی کشتوکاڵیو بەناوبانگترینیان "جیسرۆ تول" (1674-1740) بوو. "جیسرۆ تول" کوڕی یەکێ لەخاوەن زەویەکانی "یۆرك شایەر" بوو لەئینگلترا. "جیسرۆ" یاسای لە لەندەنو کلاسیکی لەئۆکسفۆرد خوێند، پاش ئەمە هەستا بە سازدانی گەشتێك بەناو کیشوەری ئەورووپاو دوای گەڕانەوەشی لەناوچەکەیدا نیشتەجێ بوو. جیسرۆ هەوڵێکی زۆریدا بۆ زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی. بەهۆی ئەزمونی تایبەتی خۆی لە کشتوکاڵدا توانی تۆوی چاكو گەنـد لەیەکتری جیا بکاتەوە، وە دەریخست کە چاندنی تەنك دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوە و، کێڵانی بەردەوام هۆیەکە بۆ بەرهەمهێنانی تازە( زیاد بوونی بەرهەم). جیسرۆ بە کرێکارانی خۆی هۆشداریدا لەوەی کە تۆودان بە شێویەکی کەڵەکەو خڕبوونەوە نەچێنن، وە لەسەر یەکتریو لەیەك جێگادا نەیان وەشێنن، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕیز ڕیزو لەیەکتری دوور تۆودان بوەشێنن، بۆ ئەوەی بە جوانی سود وەرگرێ لەڕوناکیو هەوا، هەروەها بۆ ئەوەی گیای زیانبەخشی لێ جیابکرێتەوە. کاتێك کرێکارانی لەسەر ئەمە سکالاًیان لێی کرد بەوەی کاری زیادەیان پێدەکات، "جیسرۆ" ئامێری کێڵانی زەوی داهێنا کە تۆودانەکەی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی خێرا دادەچاند. بەم شێوەیە جیسرۆ توانی بەرهەمی خۆی زیادبکات لەشەش بوشل لە یەك دۆنم دا، بۆ بیستو چوار بوشل لە یەك دۆنم.

لە هەمان کاتیشدا "فیسکۆت تاونسید1674-1738"، بە بەکارهێنانی شێوازو میکانیزمی جیسرۆ لەکشتوکاڵ کردندا توانی بەرهەم زیادبکات. هەروەها ڕێگەیەکی تازەشی خستە سەر داهێنانەکەی "جیسرۆتول"، کە خۆی دەبینیەوە لەبەکارهێنانی

خولی داچاندنی یەك لەدوای یەكو لەیەكتر جیاواز لەچەند ساڵێكی بەدوای یەكدا، بەچاندنی گەنمو جۆو لۆبیاو شێلم، كە ئەمانە چوار ساڵێ دەخایاند واتا" هەر ساڵەو بابەتێكی دەچاند". هەروەها بە بەكارهێنانی پەینی چاكو نایاب، "تاونسید" توانی دوو ئەوەندەی جوتیاران بەرهەم بهێنێ.

لەلایەكی ترەوە "ڕوبرت پاكویل 1725-1775" شێوەیەكی تری خستە سەر شێوازەكانی "تاونسیدو جیسرۆ"، ئەمیش چاككردنی ئاژەڵ بوو، بەتایبەتی ئاژەڵی شیرەمەنیو ئاژەڵی بەكارهێنراو لە كشتوكاڵ. گرنگترینیان چێڵو پەزو ئاژەڵی بەرز "ئەسپو ئێستر". لەئەنجامی تاقیكردنەوەكەیدا گۆشتی فرۆشراو لەنێوان ساڵانی 1710-1795 سێ ئەوەندە زیادی كرد. ئیدی دوای ئەمانە خانەدانانو پادشاكان هەستان بە بەكارهێنانی ڕێگەو شێوازی تازەو نوێ لەكشتوكاڵداو هەروەها چاكتركردنی ئاژەڵان. لەم نێوانە جۆرجی دووەمی شای ئینگلترا هەستا بە بڵاوكردنەوەی كتێبەكەی جیسرۆ، كە لەبارەی كشتوكاڵدا نوسی بووی لەساڵی 1730. "جیسرۆ زانیاریو ئەزمونەكانی لەكتێبێكدا نوسی لەساڵی 1730". خەڵكیش دەستیان كرد بەبڵاوكردنەوەی ئەم زانیاریانە لەئینگلتراو كیشوەری ئەوروپا.

بەناوبانگترینی ئەوانەی كە زانیاریان لەبارەی كشتوكاڵی تازە بڵاوكردەوە "ئارسەرپونك" بوو 1741-1820. ئارسەر نوسەرێكی ئینگلیز بوو، هەروەك یەكێكیش بوو لەخاوەن زەویەكانی ئینگلترا. ئارسەر نەیدەتوانی بەو داهاتە كەمەی زەویەكانی بژی، هەربۆیە دەستی كردە نوسین لەبارەی كشتوكاڵی تازە لەڕۆژنامەی"ڕوداوە كشتوكاڵیەكان" كە بە هۆیەوە كاریگەری لەسەر خەڵكێكی زۆر دروست كرد لەئینگلتراو كیشوەری ئەوروپاو ئەمریكا.جگە لەمە ئارسەر هەستا بەڕێكخستنی گەشتێكی زۆر لەئینگلتراو ئەوروپا و، لیكچەری پێشكەش دەكرد لەفەرەنساو پروسیاو ئەمریكاو، هانی خەڵكی دەدابۆ پیادەكردنی ڕێگەو شێوازی نوێ لەكشتووكاڵ كردندا. جا لەئەنجامی بەكارهێنانی ئامرازو میكانیزمی زانستی لە

کشتوکاڵدا کێڵگەکانی ئینگلترا بوون بە کێڵگەی تاکەکەسی"تایبەت"، کە ژمارەیەك خانەدانان‌و سەرمایەدار لە چینی ئەرستۆکراتی خۆیان دەکردە خاوەنی. کێڵگە بچووکەکان کەم بوونەوەو خرانە پاڵ کێڵگە فراوانەکان، ئەمەش لەڕێگەی پەرژین کردن. بەو بیانوەی کەمیکانیزمی نوێ لە کشتووکاڵدا ناتوانێ بەرهەم زیادبکات ئەگەر لەناوچەیەکی فراون نەبێت. ساکاتێکیش ئەمەپێویستی بەخەرجیو تێچونێکی زۆر بوو لەتوانای کەسێك دانەبوو پێی هەستێ، جگە لە دەوڵەمەندو خانەدان‌و سەرمایەداران، کە ئەمانە بەهۆی بالآدەستیان بەسەر پەرلەمان‌و هەروەها هەبوونی توانای دارشتنی یاساو قانونی پێویست لەهەمبەر پاراستنی کێڵگەکانیان، وەك یاسای دانەوێڵە، دەیانتوانی پرۆسەکە جێبەجێ بکەن‌و قازانجی زۆر بەدەستبێنن.

ئەوەبوو لە ئەنجامی پێشکەوتنی زانستی لەبواری کشتوکالدا، بەرهەمی کشتووکاڵی دای لەزیادیو کرێی زەوی کشتووکاڵی بەرز بوویەوە، هەروەك داهاتی ساڵانەی کشتووکاڵ زیادیکردو نرخی کرێی کرێکارانی کشتووکاڵیش لەسەدەی هەژدەدە بەرزبۆوە.

## ململانێی داگیرکاری لە هەردوو سەدەی

## حەڤدەو هەژدە.

### پێشەوا پێشینەکان:-

ئیسپانیاو پرتوگال دوو دەوڵەتی داگیرکار بوون‌و بازرگانی خۆرهەلآت‌و داگیرگەکانی ئەمریکایان لەسەرەتای دۆزینەوە جوگرافیەکانەوە تاوەکو کۆتایی سەدەی شازدە بۆ خۆیان قۆرغ کردبوو. ئینگلیزو فەرەنسیەکانیش ئەو گەڕان ودۆزینەوە کەمانەیان نەقۆستەوە کە لەکۆتایی سەدەی پازدەو سەرەتای سەدەی شازدەپێی هەستان.

بەلآم کاتێك بازرگانی خۆرهەلآت‌و داگیرگەکانی ئەمریکا بەرهەم‌و قازانجێکی زۆری باراند بەسەر پرتوگال‌و ئیسپانیا، ئینگلیزو فەرەنسیەکانیش چاویان لە ئەوان کردو دەرکیان بەگرنگی بازرگانی‌و داگیرگەکان کرد. لەسەردەمی شاژنە ئیلیزابێس 1558 -1603 ئینگلترا دەستیکرد بە شالآوێکی دەریایی کە لەڕێگەی ڕفاندن‌و چەتەکاری‌و بازرگانی کۆیلەوە ئەنجامی دەدان. لە بەناوبانگترینی ئەوانەی کە هەڵدەستان بەو کارە، جون هوکنز بوو 1532-1595. "هۆنگنز" شاری بلیموس شوێنی لەدایکبوونی بوو، هەر لەوێش دەستیکرد بە کاری بازرگانی زنجەکان لەگەڵ پرتوگالیەکان. ئەوان زنجەکانیان لەغینیا لە کەناری خۆرئاوای ئەفریقاوە دەهێناو پاشان دەیانگواستەوە جیهانی نوێ، هەر لەوێش دەیانفرۆشتن بە داگیرکەرە ئیسپانیەکان. جا "هوکنز" لە شەستەکانی ئەم سەدەیە دەستیکرد بە شالآوەکانی‌و لە قازانجیشدا بەشی شاژنە ئیلیزابێسی دیاری کرد. هۆکنز لەحەفتاکاندا بەشێوەیەك دەوڵەمەند بوو، کەوەك سەرمایەدارێك خۆی نواند. چەندان هەڵمەتی ڕێکخست بۆ کارکردن‌و سەرقاڵ بوون بە بازرگانی کۆیلەو هێرش کردنە سەر داگیرگەکانی ئیسپانیا لەئەمریکاوڕفاندنی کەشتیە پڕ لەزێڕەکانی ئیسپانیا لەکاتی گەڕانەوەیان لەئەمریکا. هەروەها هەستا بەڕێکخستنی کەشتیگەلی ئینگلیزی لەژێر سەرپەرشتیاری پاشایەتی.

جگەلەمە وەك ئەدمیرالێك لەجەنگی ئارمادا ڕۆڵیکی گرنگی گێڕا لەڕێگری کردن لە کەشتیەکانی ئیسپانیا. شیاوی باسە هۆکنز خۆی وەك پیۆریتانە توندڕەوەکان حیساب دەکرد.

ئیلیزابێس بە فەرمی ئامۆزای "جۆن هۆکنزی" کرد بەبریکاری خۆیو دەسەلاتی پێدا، کە ناوی "سێرفرانسیس دریك"(1545-1595) بوو. ئیلیزابێس بۆ مەبەستی هەستانی بە کاری چەتەییو ڕفاندن ئەوی بەم شێوەیە لەخۆی نزیك کردەو. دریك توانی لەسەر حیسابی ئیسپانیەکان ناوبانگو سامانێکی زۆر بەدەستبهێنێ. لە سالی 1577 هەستا بە ئەنجامدانی گەشتێکی دەریایی بە دەوری جیهان، کە سێ سالی خایاند، ئەم گەشتە دووەمین گەشت بوو لە دوای گەشتەکەی ماجەلان. دریكو یاوەرانی لەڕێگەیاندا هەڵدەستان بەکاری چەتەییو ڕفاندن. ئەمانە کەشتەیەکانیان بەو شتومەکانە پڕکردبوو کە لەئیسپانیەکانیان بە تالان بردبوو لە ڕێگەدا. هەروەها "تۆماس کافیدش" یەکێکی تر بوو لەپیاوە سەرکێشەکانی ئینگلیزو، هەستا بە ئەنجامدانی گەشتی سێیەم بەدەوری جیهان 1586-1587، کە نزیکەی دوو سالو پەنجا ڕۆژی خایاند. ئەویش وەك پێشینەکەی خۆی لەهەرکوێ بۆی لوابا چەتەیی دەکرد. هەربۆیە کاتێك گەڕانەوە دەریاوانەکان ئاوریشمیان دەپۆشی، هەتا گوتراوە:" چارۆگەی کەشتیەکەی داپۆشرا بوو بە ئاوریشمی بەزێڕ نەخشکراو".

"سێر همفری گیلبرت 1539-1583، والتر ڕایلی 1552-1618 " لەو سەرکێشە بەناوبانگانە بوون. "گیلبرت" بەهۆی ڕێگریو چەتەییەوە قازانجێکی زۆری کردو بەژداری کرد لەجەنگی هۆڵندای دژ بە ئیسپانیا. بەلام هۆی ناوبانگی ئەو هیچ کام لەوانە نەبوو، بەڵکو بەهۆی ئەمەوە بوو کە باوەڕی وابوو دەتوانرێ لەڕێگەی باکور واتا ڕێگەی دەریای باکور، یاخوود باکوری ڕۆژهەلات بگەی بە هیندو چین، بەو پێیەی ئەم ڕێگەیە کورتترین ڕێگەیە بۆ گەیشتن بە هیند لە ئینگلتراوە. جا باوەڕەکەی خۆی خستە بواری جێبەجێ کردنو لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێیانی لەسالی ( 1578-

1579) ڕێگەی باکوری گرتە بەر. کەچی هەوڵەکانی بەهۆی سەهۆڵبەندی دەریاکان شکستی خوارد، بەلاّم هۆکارێکیش بوو بۆ زیادبوونی زانیارییە جوگرافیەکانو بالاّدەستبوونی بەریتانیا بەسەر ڕاوگەی ماسی لە دەریاکانی باکور، بەتایبەت نەهەنگ. لەلایەکی تریشەوە "گلیبرت" داگیرگەی "سنتجون"ی لە نیوفاولاندو لە ساڵی 1583 بنیاتنا. لەگەڵ ئەوەی نیشتەجێگەی یەکەم شکستی هێنا، بەلاّم بەردەوامیان لەکاری داگیرکاری بووە هۆی پێکهێنانی ئیمپراتوریەتی داگیرکاری لە کەنەدا.

"والتد ڕایلی" کە لەسەرەتادا ناومان هێنا، یەکێ بوو لەنزیکانی شاژنە ئیلیزابێس، بەهۆی هێرشکردنی بۆ سەر داگیرگە ئەمریکیەکانو بازرگانیەتی ئیسپانیا، سامانو ماڵێکی زۆری بەدەستکەوت. ئەم سامانەیشی بەوپەڕی دەستکراویەوە لەپرۆژەکانیدا خستەکار. گلیبرت بەژداریکرد لە دامەزراندنی داگیرگەی نیوفاولاندو ناوی لێینا ڤیرجینیا. هەروەها لە دورگەی "رونوك" لە"نورس کارلانیا" چەند داگیرگەی تری دامەزراند، جا هەرچەندە ئەم داگیرگەیە بەردەوام نەبوو، بەلاّم بەهۆی ئەم شەپۆلە کۆچکردنانە کە لەدوایدا بەردەوام بوون بۆ سەری، ئەم ناوچەیەی بەتەواوی ئاوەدان بوویەوە.

ژمارەیەکی بەرچاو لە سەرکێشە توندو چاوقایمەکان، ویلایەتە یەکگرتووەکانو کەنەدایان ئاوەدانکردەوە، وە لە پشتەوەی کارە سەرکێشیەکانیان قازانجێکی بێ شوماریان دەستکەوت، لەم قازانجەش بەشی ئیلازابێسیان دابین دەکرد، هەمویشی بەناوی پرۆتستانتیەتی دژ بەکاسۆلیکیەت بوو.

بەڕاستی ئینگلترا ئەو دەوڵەتە بوو، کە بە هاوکاری هۆڵندیو فەرەنسیەکان قۆرغکاری ئیسپانیای تێکشکاند. لەدوای جەنگی ئارماداش دەریاوانانی ئینگلیز لە دژی ئیسپانیا لەدەریاو زەریاکان بلاّوبوونەوەو دەستیانکرد بە بازرگانی کردن لەگەڵ خۆرهەلاّتو خۆرئاواو هەستان بە دامەزراندنی چەندین کۆمپانیاو شەریکە. ئیدی

بەهۆی ئەمانەوە سامانێکی زۆر بۆ ئینگلترا هەڵڕژاو ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی لەئەرستۆکراتیو چینی ناوەندو خەڵکانی سەرکێش بوونە خاوەنی سامانێکی زۆر.

لەسەردەمی جیمسی یەکەم بازرگانی کردن هەربەردەوام بوو، بەلاّم هێرشو پەلامار بۆ سەر کەشتی ئیسپانیەکان کۆتایی پێهات، ئەمەش بەهۆی سیاسەتی ئاشتی خوازانەی جیمس لەبەرامبەر ئیسپانیا. هەروەها شەریکەو کۆمپانیای بازرگانیان دامەزراندو یەکەمینی ئەو کۆمپانیایانە کۆمپانیای "مۆسکۆڤی" بوو، کە لە سەردەمی "ماری تیۆدۆر" بۆ بازرگانی کردن لەگەڵ ڕوسیا دامەزرێندرا. ئەم بازرگانیە لەگەڵ ڕوسیا لەسەردەمی ئیلازابێسو جیمسی یەکەم هەر بەردەوام بوو، بەلاّم بەهاتنی "پترسی گەورە" پچڕانی تێکەوت.

لە پێناوی قۆرغکردنی بازرگانی خۆرهەلاّتی لوتکەی ئاواتو بازرگانی کردن لەگەڵ ئەو ولاّتانەی کە لەژێر دەستی ئەوروپادا نەبوون، لەساڵی 1600 بەریتانیا کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاّتی دامەزراند. لە سەرەتادا هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەلاّم دوای نوێ کرانەوەی بەربژاریەکان لە ساڵی 1609، وە زیادبوونی سەرمایەداران بە بەردەوامی، کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاّتی بوو بە سەرچاوەیەکی گەوری سەروەتو سامانی ئینگلیز لەهیند. ناوەندی ئەم کۆمپانیایە لە شاری"سورات" لە کەناری خۆرئاوای هیندستان بوو. کەشتیگەلی ئینگلیزی توانی پرتوگالیەکان لە هەندێ لە شارەکانی کەناری خۆرئاوا دەربکاتو دەستیش بگرێت بەسەر بەندەری گرنگی "مزولی باتام" لە کەناری خۆرهەلاّت. لەساڵی 1622 کەشتیگەلی کۆمپانیا دەستیگرت بەسەر دورگەی هورمز یاخود تەنگەی هورمزو پرتوگالیەکانی لەوێ دەرپەڕاند. بەهۆی ئەمەش بناغەی ئیمپراتۆریەتی بازرگانی ئینگلیزی لەهیندو ئێران داڕێژرا.

لە سەردەمی جیسمی یەکەم پیۆریتانە توندڕەوەکان دەستیانکرد بە کۆچکردن ڕووەو ئەمریکا. شاری "جیمس تاون" لەسەردەستی ئەوان بنیات نرا، هەروەها شاری "بلیموس" لە کەناری "نیوئاینگلند" لەسەر دەستی بەشێکی تر لەو پیۆریتانانەی کە

کۆچیان کردبوو لە ساڵی 1620بنیات نرا. ئیدی لەم کۆچڕەوانەوە کۆچکردنی ئینگلیزەکان بۆ ئەمریکا ڕێچکەی گرت. دواتر لە بەشێکی تایبەت باسی دەکەین.

هەروەها چەند نیشتەجیگەیەکی تری ئینگلیزی لەساڵی 1630لە بوستن پەیدابوو، هەروەها لە"پرۆڤیدس" لە 1636، وە لە "هارتفۆرد" لە 1636،جگە لەمەو لە ساڵی 1638 لە "نیوهایڤن" نیشتەجێگە دروستکرا. ژمارەی دانیشتوانی فەرجێنیا دای لەزیادیو "لۆرد بیتیمۆر" نیشتەجێگەی "میریلاند"ی- لە ساڵی1634 بنیاتنا. هەروەها ئینگلیزەکان دەستیانگرت بەسەر دورگەی "سنت کریستۆڤەر"و "باربادوس" لەساڵی 1625. وە توانیان دەستبگرن بەسەر "نیفیس"و "مونتیسیرات" لەدورگەی هیندی خۆرئاوا.

## گەورەبوونی بازرگانیو داگیرکاری فەرەنسی:-

وەنەبێ تەنها بەریتانیا چاوی بەدوای بازرگانیەتی ئیسپانیاوە بوبێو تەنها ئەویش هەوڵی نەهێشتنی ئەم قۆرغکاریەی دابێ، بەڵکو فەرەنساش هەوڵی زۆریدا بۆ لەباربردنی قۆرغکاری ئیسپانیا لەبواری بازرگانیو داگیرکاری. سەرمایەداریەت لەفەرەنسا گەشەی دەکردو فەرەنسیەکان بە خەستی کێبڕکێیان لەسەر بازرگانیو قازانج دەکرد. کێبڕکێی داگیرکاریش لەنێوان ئینگلتراو فەرەنسا لە هەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە زۆر خەستو خۆڵ بوو. فەرەنسیەکان لەسەردەمی لۆیسی دوازدەو فرانسوای یەکەم، دەستیان کرد بە دامەزراندنی ناوەندو مەرکەز لەئەمریکا. هەروەها دۆزەرەوەیان هەبوو بۆ گەڕانو پشکنینو بە جیهاندا. بەناوبانگترینی دۆزەرەوەکانیشیان "فیرازانواو کارتیل" بوون. بەمەبەستی دەستبەسەرداگرتنی کەشتیو داگیرگەکانی ئیسپانیا، ئەدمیراڵ "کۆلینی" هانی فەرەنسیەکانی دەدا بۆ هەڵکوتانە سەر کەشتیو داگیرکەکانی ئیسپانیاو پرتوغالو تالآن کردنیان، بەتایبەت لەفلۆریداو بەرازیل. داگیرکاریەکانی فەرەنسا لەسەردەمی هنری چوارەم هەر بەردەوام

بوو. یەکێ لەو سەرکێشە فەرەنسیانە ناوی "سموئیل چاپلن" بوو، کە توانی ڕووباری سنت لۆرنس بدۆزێتەوەو شاری کیویکیش لەساڵی 1608 بنیات بنێ. فەرەنسیەکان پێش ئەوەی بگەنە نیوەی سەدەی حەڤدە، کەنداو ئاکادیا "نوڤاسکوشیا"یان- داگیرکردو بازرگانی فەرو"کەوڵ" ماسیو تەختەیان لەئەمریکای باکور بۆخۆیان قۆستەوە. جگە لەمانەش فەرەنسەیەکان بەشداریان دەکرد لەبازرگانی کۆیلە لە کەناری خۆرئاوای ئەفریقا.

## بازرگانی هۆڵنداو داگیرکاری هۆڵندی:-

لە نیوەی سەدەی حەڤدە هۆڵندا لەدوای ئیسپانیاو پرتۆگال دەهات لە چالاکی بازرگانیو داگیرکاریدا. هۆڵندا وڵاتێك بوو کە سودمەندبوو لە داگیرگەکانی ئیسپانیاو بازرگانی پرتوگال. هەربۆیە بووبە دەوڵەمەند ترین دەوڵەتی ئەورووپا لە سەردەمی چارلسی پێنجەم. ساکاتێکیش هۆڵندا جەنگی هەڵگیرساند لە دژی فلیپی دووەمو شوێنگرەوەکانی، ئاکامەکەی بۆ ئەوان زیانو کارەسات باری نەبوو، بەڵکو سەرکەوتنو سەربەخۆیی بوو. هۆڵندا لەساڵی1595-ەوە-دەستیکردبوو بە ئەنجام دانی بازرگانی کۆیلە لە کەناری غینیای ئەفریقای خۆرئاوا. وە لەساڵی 1595 یەکەم شالآویان بۆ هیندو دورگەی هیندی خۆرهەلآت (دورگەی بهار) نارد. پاش ئەمەو لە ساڵی 1602 دوای ئەوەی بە کۆمپانیای پێشوویان گرێ دا، کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵاتی هۆڵندیان دامەزراند. دواتر پرتوگالیەکانیان لە "سەیلانو جاوەو سومترا" دورگەی بهار "ملاقە" دەرپەڕاند. ئەو سەرکەوتنەی کە هۆڵندیەکان لەساڵی 1606 لە ملاقە بەدەستیانهێنا لەبەرامبەر کەشتیگەلەکانی پرتوگالیو ئیسپانیو هەروەها تێکشکاندنی پاشماوەی کەشتیگەلەکانی ئیسپانیا لە"جبل تاریق" لە ساڵی 1607، هۆیەکی کاریگەربوو بۆ نشوستی هێنانی ئیسپانیاو پرتوگال، هەروەك هۆیەکیش بوو بالآدەستبوونی هۆڵندا بەسەر دەریاو ڕێگە بازرگانیەکان.

دوای زاڵ بوونیان بەسەر ناوچەکاندا "جۆن کوین" هەستا بە بەڕێوەبردنی ئەم ناوچانەو بەستنی پەیمان لەگەڵ سەرکردەی ناوچەکان لەو شوێنانەی کە دەیانکرد بە ناوەند یاخود دامو دەزگایان لێ دادەمەزراند. ئەمەش نیمچە دورگەی "مالایەو فورامۆزاو بورینوو سیلیبیس"، هەروەها بەشێکی "نیوگینیا"و کەناری خۆرئاوای ئوستورالیای گرتەوە. هەموو ئەمانە هۆڵندایان کردە ئیمپراتۆریەتێکی بازرگانیو داگیرکاری. نابراو"کوین" شاری "باتاڤیا"ی لە ساڵی 1619 لە دورگەی "جاوە" بنیاتنا، وەك ناوەندێك بۆ ئەم ئیمپراتۆریەتە.

ئیدی لە دوای ئەمە هۆڵندا لە بواری بازرگانی خۆرهەلأت بەتایبەت خۆهەلأتی دوور"چین، یابان، هیند" جێگەی دەوڵەتە گەورەکانی گرتەوە. پاش ئەمە دەریاوانی هۆڵندی "ئەبیل تاسمان" (1603–1653) بەدەوری ئوستورالیادا سوڕایەوەو نیوزلەنداو دورگەی "تونگاو فیجی" دۆزیەوە. بەهەمانشێوە دەریاوانێکی تریان لەساڵی 1645 دەستیگرت بەسەر دورگەی "سنت هیلانە". لە ساڵی 1645 کاتێك لە نزیك لوتکەی ئاوات گەردەلولو باوبۆران کەشتیەکانی تێکشکاندن، ئەوان لە نزیك شوێنی ڕوداوەکە هەستان بە بنیاتنانی شاری "کاپتۆن"و داگیرگەی ئەفریقای باشور.

لەهەمان کاتدا بناغەی داگیرکاری هۆڵندیان لەئەمرکا داڕشت، ئەمەش بە دەستگرتنیان بەسەر بەڕازیل لەساڵی 1624، هەروەها دورگەی "توبوگو"و "کراسا"یان–لەهیندی خۆرئاوا 1632–1632 لە ئیسپانیایان سەند. هەندێ لە هۆڵندیەکان لەدۆڵی ڕوباری هەندسن نیشتەجێ بوونو لەسەر ڕێژگەی ئەو ڕوبارە شاری نیو ئەمستردام یان– بنیاتنا "نیوۆرك ی ئەمڕۆ"، وە بە 150 میل لە باکوری ئەم شارە قەلأیەکیان دروستکرد بەناوی قەلأی ئۆرنج و، سەرجەم ناوچەکەشیان بە نیوزلاند"زەویە نزمە نوێیەکان" ناوزەد کرد. بەم شێوەیە لەنیوەی سەدەی حەڤدە هۆڵندا جێگەی ئیسپانیاو پرتوگالی گرتەوە لە بواری بازرگانیو هەبوونی داگیرگەدا لەئاسیاو ئەفریقیاو ئەمریکا. وە بووبە ڕکەبەری سەرەکی ئینگلتراو فەرەنسا

بەشێوەیەك ولاَتە ئەوروپییەکان ئێرەییان بە خۆشگوزەرانی هۆڵندا دەبردو چاویان تێبڕیبوو.

## جەنگی بازرگانی لەنێوان ئینگلتەراو هۆڵندا :-

دەوڵەمەندبوونی هۆڵنداو هەوڵدانی بۆ پاوانکردنی بازرگانیو قۆرغکردنی داگیرگەکانو دورخستنەوەی خەڵکانی تر لەم کایە، بووە هۆی پەیدابوونی ناڕەزاییو ڕکەبەری کرانی. هەروەها بووە هۆیەك بۆ دەوڵەتە گەورەکان کە هەوڵدەن قۆرغکاری هۆڵندا تێکبشکێنن. فەرەنساو ئینگلتراش لەپێشەوەی ئەم دەولاَتانە بوون. بێ گومان گەشەکردنی سەرمایەداری دەوری گرنگی لەم کایەدا دەگێڕاو وای لەهەریەکە لە دەوڵەتە سەرمایەدارەکان کرد کە بەرژەوەندی ئابووری بخەنە پێش تەواوی پرسە نەتەوەییەکان.

لەماوەی سەدەی حەڤدە زنجیرەیەك جەنگ لەنێوان ئینگلتەڕاو هۆڵندا هەڵگیرسا. کێبڕکی کردنی ئەم دوو ولاَتە لەزەریای باکوری ئەتڵەسی لەسەر ڕاوگەکانی ماسی دەستی پێکرد، وە لە هیندی خۆرئاواو کەناری ئەفریقای خۆرئاوا لەسەر بازرگانی کۆیلەو ناوەندە بازرگانیەکان دەستی پێکرد. دامەزراندنی داگیرگەی زەویە نزمەکان "لەباشوری نیوئاینگلاند" کاریگەری گەورەی هەبوو لەدروستکردنی مەترسی لەسەر فەرجێنیا. کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاَتی هۆڵندی ڕێگری کرد لەنوێنەرانی کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاَتی ئینگلیزی لەمەڕ ئەنجامدانی هەر چالاکیەکی بازرگانی لەگەڵ دوورگەی بەهار" هیندی خۆرهەلاَتی". وە لەساڵی 1623 کەشتیگەلی هۆڵندی هەستا بە سازدانی کوشتارگەیەك بۆ بازرگانە ئینگلیزەکانو سەرجەم بازرگانە ئینگلیزەکانی لەوێدا کوشت. شیاوی باسە ئەم کوشتارگەیە بە کوشتارگەی "ئامبۆیانا" ناوی دەرکرد.

لەساڵی 1651، حکومەتی کرۆمۆویل یاسای کەشتیوانی دەرکرد، کە بەگوێرەی ئەم یاسایە دەبوایە بازرگانی ئینگلیزی لەسەر کەشتی ئینگلیزی بێت. لەمەوەشەوە ڕێگری کرد لە هۆڵندیەکان لە بازرگانی کردن لەگەڵ ئینگلیزەکان بەشێوەیەکی ڕستەوخۆ. لەم کاتەشدا زنجیرەیەك جەنگ لەنێوان هەردوولادا هەڵگیرسا. ئەم جەنگانە لەنێوان سالآنی 1652- 1654هەڵگیرساو هۆڵندیەکان بەسەرکردایەتی ئەدمیراڵ "دی رویتر" و" فان ترومب" سەرکەوتن بەسەر ئینگلیزەکان. بەلآم هەندێ سەرکەوتنی ئینگلیزەکان هۆڵندیەکانی والێکرد بە پێی پەیمانی "ویستمنسری" ساڵی 1654دەستبەرداری ناوەندەکانی بازرگانی ببن لە هیندی خۆرهەلآت بۆ ئینگلیزەکان. هەروەها هۆڵندا قەرەبووی کوشتارگەی "ئامبۆیانا"ی بۆ ئینگلیزەکان کردەوە. وە لەئەنجامی شۆڕشێك کە لەبەڕازیلو لەدژی هۆڵندا بەرپابوو لەساڵی 1623، هۆڵندا دەستبەرداری بەرازیلو تەواوی داگیرگە بچوکەکانی ئەمریکای باشور بوو بۆ پرتوگال.

جەنگی دووەمیش کە لەنێوان ئینگلتەڕاو هۆڵندا هەڵگیرسا، لەساڵی 1665 دەستی پێکردو تا 1667بەردەوام بوو. "دی رویترز" کەشتیەکی ئینگلیزی لەڕێژگەی ڕوباری تایمز سوتاندو دانیشتوانی لەندەنی تۆقاند. بەلآم سەرکەوتنی ئەمجارەش بۆ ئینگلیزەکان بوو کاتێك توانیان دەستبگرن بەسەر شاری نیو ئەمستەردامو ناویان لێینا نیویۆرك.

جەنگی سێیەمیش لەسالآنی 1672 تا ساڵی 1674 بەردەوام بوو. ئەم جەنگەش لەئەنجامی کارە دوژمنکاریەکانی لۆیسی چواردە بوو بۆسەر هۆڵندا. چارلسی دووەمی پاشای ئینگلتەڕا لەم کاتەدا بەهۆی ئەوەی باوەڕی وابوو کە هۆڵندا مەترسی گەورە دروستدەکات لەسەر بازرگانی ئینگلیزی، هاوپەیمانی لۆیسی کرد. وەلێ پەرلەمانی ئینگلیزی باوەڕی وابوو کە هۆڵندا بەهیچ شێوەیەك لەشێوەکان نابێتە مەترسی لەسەر بازرگانی ئینگلیزی، بەڵکو ئەوە فەڕەنسایە کە دەبێتە دوژمنی یەکەم لەداهاتوودا. لەمەشەوە هەریەکە لە چارلسو جیمسی برای سیاسەتێکی ئەم بەرەو ئەم بەرەیان

پیادە کرد لەهەمبەر هۆلنداو فەرەنسا. واتا" هەرجارەو لایەنگری لایەنێکیان دەکرد".
لەم ماوەیەداو تا ساتی هەڵگیرسانی شۆڕشی جەلیلە، ئینگلتەڕا هاتە ئەو باوەڕەی کە ڕۆڵی هۆڵندا کۆتایی پێهاتو فەڕەنسا تاکە ڕکەبەری بەردەم مەزنبوونیانە. ئیدی لەساڵی 1689ەوە- ململانێی ئینگلیزیو فەڕەنسی دەستیپێکردو تا سەدەی نۆزدەی خایاند.

## ململانێی ئینگلیزیو فەڕەنسی

### فەڕەنسا لەئەمریکا:-

لەکۆتاییەکانی سەدەی پازدەوە فەڕەنسیەکان بە ڕاوکردنی ماسیەوە خەریك بوون لەکەنارەکانی کەنەدا. فرانسوای یەکەمی پاشای فەڕەنسا لەساڵی 1524 "فیرانزاوای" ناردە ئەمریکا. دواتر لەساڵانی 1534-1542سێ شاڵاوی تری وەڕێخست بەسەرکردایەتی "جاك کارتر". ئەمەیان توانی دۆڵی ڕوباری "سنت لۆرنس" تاوەکو "مۆنتریاڵ" بدۆزێتەوە. وە کاتێك "سموئیل چاپلن" لەساڵی 1608شاری "کیوبك"ی دامەزراند، ئینگلیزەکان پێش ئەوان بەساڵێك شاری "جیمس تاون"یان- لەفەرجێنیا بنیات نابوو. "چاپلن" ژمارەیەك دەریاچەی دۆزیەوەو پەیوەندیەکی دۆستانەی بەهێزی لەگەڵ هیندیە سورەکان بەست. کاتێك "چاپلن" لەساڵی 1635مرد، فەڕەنسیەکان دەستیانگرتبوو بەسەر ڕووبەرێکی بەرفراوانی کەنەدا کە فراوانتر بوو لەڕووبەری فەڕەنسا. ئەم ناوچەیەش بریتی بوو لە نێوانی دۆڵی ڕووباری "سنت لۆرنس"و دەریاچە گەورەکان. ئەم ناوچەشیان ناونا فەڕەنسای نوێ.

کاردینال "ڕیشیلیۆ" لەساڵی 1627 بۆ وەبەرهێنانی ناوچە داگیرکراوەکان "فەڕەنسای نوێ" کۆمپانیایەکی فرە بەشی دامەزراند. ئەوەندەی نەبرد کە ئەم کۆمپانیایە بازرگانی فەروی قۆرغکرد لەم ناوچانەی کە ئەم بازرگانیە دەیگرتەوە. حکومەتی ڕیشیلیۆ مەرجی کرد لەگەڵ کۆمپانیا بەوەی چوار هەزار فەڕەنسی

نیشتەجێ بکات لەماوەی پازدە ساڵو بۆماوەی سێ ساڵیش بیانژیێنێ لەدوای گەیشتنیان بە ئەمریکا. لەساڵی 1637 کۆمپانیا تەنها دوو کێڵگەی دامەزراندبوو، فەرەنسیە دواینەکانیش بریتی بوون لە سەربازانو قەشەو بازرگانانی فەروو فەرمانبەران. هەندێ لەفەرەنسیەپرۆتستانتەکان نیشتەجێ بوون لەناوچەکانی بەرازیلو فلۆریدا، بەلام لەناو دانیشتوانی ئەم ناوچانە توانەوە. ڕێگە نەدەدرا فەرەنسیە پرۆتستانتەکان کۆچ بکەن بۆ ئەمریکا، ئەوانەیشی توانیان کۆچ بکەن، دوورگەی "کاریبی" یان- هەڵبژارد، ئەمە لەکاتێدا ژمارەیەکی زۆر لەفەرەنسیەکان لەکەنەدا بوون.

لەسەردەمی لۆیسی چواردەش کۆلیبێر سیاسەتێکی نوێی گرتەبەرو لەساڵی1674کۆتایی هێنا بە کۆمپانیاو کارگێڕیەکی ڕاستەوخۆی بەسەر ناوچەکەدا سەپاند. لەساڵی 1672 کۆلیبێر "کومت دی فۆرتیناک"ی- دامەزراند وەك فەرمانڕەوای گشتی بە سەرناوچەکە بۆ بەڕێوەبردنی فەرەنسای نوێ. "فۆرتیناک" تا ساڵی 1698بەردەوام بوو لەفەرمانڕەوایی کردن. بێجگە لەساڵانی 1682 بۆ 1689. "فۆرتیناك" فەرەنسای نوێی بە ئاراستەی خۆرئاواو باشور فراوان کرد. لە ساڵی 1673"لۆیس جولێت" لەڕوباری میسیسپی تاوەکو ئۆرکنسا دۆزیەوە. هەروەها "سوێر دی لاسال" ویلایەتی "وێنوی" دۆزیەوە. وە لەساڵی 1682لە ڕوباری میسیسپی دابەزیو تەواوی ڕوبارەکەی دۆزیەوەو دۆڵی ئەم ڕوبارەی بەهی فەرەنسا دانا بەبێ گەیشتنی بە "نیو ئۆرلین". وە ناوی لێینا "لویزیانا". "لاسال" لەیەکێ لەشاڵاوەکانیدا لەلایەن کۆمەڵەکەیەوە کوژرا. بەلام هەرچۆنێك بێت نیشتەجێگەیەکی فەرەنسی دامەزراند لە کەنداوی مەکسیك لەساڵی 1699. بەم شێوەیە فەرەنسا تۆوی ئیمپراتۆریەتی خۆی لە ئەمریکادا چاند، کە لە ڕێژگەی ڕوباری سنت لۆرنس ەوە- درێژ دەبوویەوە بۆ ڕێژگەی ڕوباری میسیسپی.

فەڕەنسیەکان تەنها بە نیشتەجێبوونیان لە دۆڵی ڕوباری سنت لۆرنسو کەنەدا ئۆقرەیان نەگرت، بەڵکو بەشێکیان لە " نیوئاینگلاند" نیشتەجێبوون. بەهەمانشێوە چوونە دۆڵی ڕوباری میسیسپیو لەساڵی 1717شاری " نیوئۆرلین"یان- بنیاتنا. هەروەك چەند شارێنکی تری وەك: سنت لویسو دیترویبیان بنیاتنا.

## ئینگلیزو فەڕەنسیەکان لەئەفریقا:-

ئینگلیزەکان داگیرگەیان دروستکرد لەکەناری زیڕو کامبیا لەئەفریقای خۆرئاوا. ئەمە لەکاتێدا فەڕەنسیەکان نیشتەجێ بوون لەڕێژگەی ڕوباری سەنیگال ومەدغەشقەر لەکۆری. ئەم ناوەندە ئەفریقیانەش وێستگەی بازرگانی کۆیلەو زێڕو عاج بوون. وە ئەفریقا ئاوەدان نەبوویەوە تا هاتنی سەدەی نۆزدە. لە زێڕی غینیاشەوە وشەی جنیە "گینیا"ی ئینگلیزی وەرگیرا.

## ململانێی ئینگلیزی وفەڕەنسی لە هیند

## هیندستان لەسەدەی حەڤدە:-

هیندستان لەهەموو وڵاتێکی جیهان زیاتر سەرنجی ئەوروپیەکانی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە. هەربۆیە ئامانجی وڵاتە ئەوروپیەکان لەکۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە گەیشتن بووە بە هیند. نیمچە کیشوەری هیند لە ڕووی ڕووبەرەوە بە قەدەر نیوەی ئەوروپا دەبێتو ژمارەی دانیشتوانی لەسەدەی حەڤدەدا نزیکەی دووسەد ملیۆن کەس بوو. دەمێك بوو ئەوروپیەکان دەیانویست بەرهەمەکانی هیند لە لۆکەو کەتانو بەهاراتو ئاوریشمو بەردی بەنرخو دروستکراوە ڕەنگینەکان بەدەسبخەن.

هیندستان لەلایەن بنەماڵەیەکی مەغۆلی موسڵمانەوە لەسەدەی شازدەوە فەرمانڕەوایی دەکرا. ئیمپراتۆری گەورە لە ساڵانی 1555 بۆ 1605مەزنترین

ئیمپراتۆری ئەم بنەماڵەیە بوو کە سیاسەتێکی لێبوردەییانەی پیادە کرد لەگەڵ ڕەگەزو ئاینە جۆربەجۆرەکانو دەرفەتی بۆ کایەی بازرگانی ڕەخساندو لەسەردەمی ئەودا هیند یەککگرتووی بەخۆیەوە دی. لەدوای ئەمیش چەند ئیمپراتۆرێکی بەهێز هاتنە سەر دەسەلأت کە هونەر لەسەردەمی ئەواندا پێشکەوتنی بەخۆیەوەبینی. لە جوانترین شاکارە هونەریو تەلارسازیەکانی ئەوکاتەش مزگەوتی "تاج المحل"ە-کە لەبەردی مەڕمەڕی سپی بنیاتنراوە لەنێوان ساڵانی 1635- 1653، ئەم شاکارە بۆتە جوانترین شاکاری هونەری لەجیهانداو ڕەنگدانەوەی هونەری ئیسلامی لەخۆیدا بەرجەستە دەکات.

لەڕووی کارگێڕییەوە ئیمپراتۆرە دواینەکان لە"دەلهی"ەوە- فەرمانڕەواییان دەکرد بەسەر ناوچەیەکی بەرفراوان کە دابەشکرابوو بەسەر ژمارەیەك ویلایەتو لەڕێگەی نوێنەرەکانەوە فەرمانرەوایی دەکران. ئەوانە زۆرینەیان شێوەیەك لەسەربەخۆیان هەبوو لە هەرێمەکانیان. بەلأم زۆرینەی هیندۆسەکان گوێڕایەڵیان بۆ ئیمپراتۆری مەغۆلی هەبوو. ئەوروپیەکانیش ئەمەیان بەخاڵی لاوازبینیو قۆستیانەوە بەشێوەیەك کە لەسەدەی دواتردا خۆیان سەپاند بەسەر هیندو ئیمپراتۆرەکان.

پرتوگالیەکان لەناو ئەوروپیەکان یەکەم خەڵکانێك بوون کە لەسەردەمی "ڤاسکۆدیگاما" وە- ناوەندی بازرگانیان لە هیند دامەزراند. هۆڵندیەکانیش لە کۆتایی سەدەی شازدەوە بەسەر پرتوگالیەکاندا سەرکەوتنو شوێنیان گرتنەوە لەسەرەتاکانی سەدەی دواتردا. لەم کاتەشدا ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە ڕێکخستنی شالأوەکانیان بۆ هیندو باشوری خۆرهەلأتی ئاسیا. وە لە ساڵی 1611ئینگلیزەکان یەکەم وێستگەی بازرگانیان لە" مزولی بتام" دامەزراندو، لە1612 لەساڵی لە "سورات" وێستگەیەکی تریان کردەوە. کەشتیگەلی کۆمپانیای هیندی خۆرهەلأتی ئینگلیزی چەند جارێك لەگەڵ پرتوگالیەکان ڕووبەڕوو بوویەوەو توانی لەساڵی1622پرتوگالیەکان لە

دوورگەی "هۆرموز" دەرپەڕێنیٚ کە دەکەوێتە دەروازەی کەنداوی عەرەبی. هەروەها لەساڵی 1689 ئینگلیزەکان سیٚ ناوەندی سەرەکی بازرگانیان لە هیند وەچنگ کەوت.

یەکەم: کیلیکتا: لەڕێژگەی ڕووباری کەنج لەسەر کەنداوی پەنغاڵ, کە لەساڵی 1786 بنیاتیان نا. بەلاٚم دڵنیانین لەوەی کە ئینگلیزەکان توانیان بەرگری لێبکەن و بیپارێزن لەئیمپراتۆری مەغۆلی یاخود نەیانتوانی. دووەم: "سێر فرانس دەی" کە قەلاٚی "سەنت جۆرج"ی بنیات نا لەساڵی1640لە باشوری میدراس. سێیەم: شاری "بۆمبای" لەسەر کەناری خۆرئاوای هیند کە ئینگلیزەکان لەساڵی 1662 وەچنگ خۆیان خست. ئەمەش وەك مارەیی کچی پاشای پرتوگال بوو کە درایە چارلسی دووەمی پاشای ئینگلتەڕا.

## فەرەنسیەکان لە هیندستان:-

لە سەردەمی "هنری چوارەم" لە ساڵی 1604 حکومەتی فەرەنسی" کۆمپانیای هندی خۆرهەلاٚتی فەرەنسی" دامەزراند. وەلیٚ دامەزراندنی ناوەندی بازرگانی لە سورات تاساڵی1668 بە درەنگ کەوت. فەرەنسیو هۆڵندیو ئینگلیزەکان تاوەکو کۆتایی سەدەی حەڤدە کێبڕکێیان لەگەڵ یەکترنەدەکرد. بەلاٚم دامەزراندنی مەرکەزی بازرگانی لە"شاندرناغار" لەساڵی1672 لە نزیك "کیلکتا"، هەروەها مەرکەزێکی تریش لە دووری سەد میل لە"میدارس"، بوونە مەترسی گەورەو پەیوەندی هەردوو دەوڵەتی بەرەو ئاڵۆزی برد لە هیندستان.

## تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان ئینگلیزو فەرەنسیەکان لە داگیرگەکان:-

پێشتر ئەوەمان ڕوونکردەوە کە فەرەنسا بە لەسەرخۆیی هاتە نێو گەمەی داگیرکاری، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بوو بە دەوڵەتێکی ڕکابەرو بەهێزی بریتانیا. لێرەوە سەلماندنی هەبوونی خۆیانو پیشاندانی هێز وەك جاران نەمایەوە کە بریتی بێت لە بنیاتنانی ناوەندی بازرگانیو دروستکردنی قەلاٚ، بەڵکو سەلماندنی بوونی هێزو

دەسەلاَت لە گۆڕەپانی جەنگدا نیشان دەدراو دەسەلمێنرا. بۆیە لەسەر هەردوو دەولَەت پێویست بوو هەبوونی خۆیان لە گۆڕەپانی جەنگ دا بسەلمێنن. پێشتر ئەوەمان خستە بەرچاو کە فەرەنسا دەولّەمەندترو لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە لەئینگلترا بەرەو ژوورتربوو، وە لە گۆڕەپانی سیاسی ئەوروپاش لە هەموویان بەهێزتر بوو. بەلاّم هەردوولایان لاواز بوون لە دروستکردنی ئیمپراتۆریەتی جیهانی. هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئینگلترا بە بەردەوامی گرنگی دەدا بە بەهێزکردنی کەشتیگەلی، فەرەنساش خۆی خستبووە ناو گێژاوی سیاسەتو جەنگی ئەوروپا، سەرەڕای ئەو برەودانەی کە " کاردینالّ ڕیشیلۆ" بە دروستکردنی کەشتیگەلی دا. لۆیسی چواردە بەهۆی جەنگە زۆرەکانی پرسی بەهێزکردنی کەشتیگەلی بەجێهێشت. ئەمە لەکاتێکدا ئینگلترا بەهۆی پێگە جوگرافیەکەی لەناوەڕاستی دەریاو دابڕانی لە کیشوەری ئەروپا، زیاتر گرنگی دەدا بەهێزی دەریاییو دروستکردنی کەشتیگەلی، بەتایبەت لەدوای جەنگی ئارمادای سالّی1588. هەربۆیە دەبینین لە زۆرینەی جەنگە دەریاییەکان ئینگلیز سەرکەوتن بەدەست دێنێت.

ئەدمیرالّی ئینگلیزی" ڕۆبرت بلیك" توانی چەند سەرکەوتنێکی دەریایی لەبەرامبەر هۆلّندیەکان بەدەستبێنێ. ئەم سەرکەوتنە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە یاسای دەریاوانی سالّی(1651-1660) قازانجێکی زۆرو سامانێکی گەورەی بۆ خاوەن کەشتیە ئینگلیزەکان هاورد، ئەمەش بەهۆی ئەوەی یاسای کەشتیوانی بازرگانی کردنی لەنێوان ئینگلتراو داگیرگەکان بەکەشتی غەیرە ئینگلیز قەدەغەکردبوو.

ولاّتانی ئەوروپا زۆر لەوە دەترسان کە لەناو دەریادا ڕووبەڕووی کەشتیگەلی ئینگلیزی ببنەوە، هەربۆیە پیشەسازی بازرگانی ئینگلیزی کە لەژێر سایەی بنەمالّەی تیۆدۆرو ستیورات گەشەی کرد، چینێکی دەولّەمەندی سەرمایەداری وای دروستکرد، کەتوانیان مافو بەربژاری لەپەرلەمانی ئینگلیزی بەدەست بێنن.

بەپێچەوانەوە فەرەنسیەکان کێشەی تایبەتی خۆیان هەبوو، ئەمەش بەهۆی ئەو باج‌و ڕەسمە زۆرانەی کە لەنێوان هەرێمە فەرەنسیەکان بەسەریاندا سەپا بوو. کەهەر ئەمەش بازرگانی فەرەنسی دواخست. پاشماوەی سەندیکاکانی سەدەکانی ناوەڕاستیش ئەوەندەی تر تەگەرەی خستەبەردەم بازرگانی‌و سەمایەداری. فەرەنسا تەنها بەهۆی ئەمەوە کاری دوانەکەوتبوو، بەڵکوو جەنگە ئایینی‌و نێوخۆییەکانیش هەڵیان پڕوکاندبوو چینی کارکەری بەرەو نەمان برد بوو مولْك‌و سامانی بازرگانیەتی بەهەدەردابوو، بەشێوەیەك لەپێشهاتنی ساڵی 1600 بازرگانی فەرەنسی وێران بوو، هاتە ئەو پەڕی نزمی.

بەلاّم باروِدۆخ لەسەردەمی هنری چوارەم بەرەو پێشەوە ڕۆیشت. فەرەنسا لەسەردەمی ئەودا بوژایەوەو چالاکی بازرگانی دووبارە ژیایەوەو ئابوری وولاّت گەشەی سەندو خۆشگوزەرانی‌و خۆشنوودی لەدەیەی یەکەمی سەدەی حەڤدە بلاّوبوویەوە. بەلاّم زیادبوونی دەسەلاّتی پاشایەتی وایکرد بە دەستهێنانی دەسەلاّتی سیاسی لەلایەن بازرگانەپرۆتستانتیەکان لە فەرەنسادا یەکجار قورس بێت. ئیدی چینی بازرگانی فەرەنسی نەیاندەتوانی ڕێگری بکەن لە لۆیسی چواردە کەچیتر بەهۆی جەنگەکانیەوە ولاّت کاول نەکات. باروِدۆخی فەرەنسا واتێکچوبوو پیشەسازی بەشێوەیەك لە دوابوو، کە ئەگەر کەسانی پسپۆریش ڕێوشوێنی گونجاویان گرتبایەبەر، ئەوا زەحمەت بوو فەرەنسا بەتەواوی هەستێتەوە. ئەوەتا هەرچەندە کۆلیبێر بە سیاسەتەوە ووردو گونجاوەکەی توانی دووبارە برەوبدات بە پیشەسازی‌و بازرگانی، بەتایبەت ئاوریشم، هەروەها دانانی یاسای پێویست بۆ چاککردنی پیشەسازی، وە دانانی باج لەسەر کەلوپەلی هاوردە بۆ ئەوەی بتوانێ کێبڕکێ بکات لەگەڵ کەلوپەلی بیانی. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پیشەسازی فەرەنسی نەیتوانی کێبڕکێی پیشەسازی ئینگلیزی بکات‌و شان لەشانی بدات. خۆ هەرچەندە کۆلیبێر بە سەپاندنی باج لەسەر کەلوپەلی بیانی هاوردە، سیاسەتەکەی گونجاو بوو، بەلاّم لەڕاستیدا جەنگە زۆرو

بۆرەکانی لۆیسی چواردەو ڕیشیلیۆ و، ئەو باجە زۆرانەی داسەپا بوون بۆ تەواوکردنی جەنگەکان، بوویە هۆی بەهەدەرچوونی سەروەتو سامانو نەمانی زیندەگیو نشوستی هێنانی فەرەنسا لەهەرسێ بواری سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتی.

سیاسەتی داگیرکاری فەرەنسا بەشێوەیەکی گشتی توندتر بوو لە سیاسەتی ئینگلیز. فەرەنسیەکان توانیان بالادەستبن بەسەر فەرەنسای نوێ لە ئەمریکاو، کۆچبەریان لەماوەی بیست ساڵدا بە ڕێژەی 300٪ زیادی کرد. هەروەك توانیان پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ دانیشتوانی ڕەسەنی ئەوێ ببەستن. ئەمە لەکاتێکدا ئینگلیز لەجەنگی بەردەوام دابوو لەگەڵ هیندیەسورەکان. لەلایەکی ترەوە فەرەنسیەکان ڕێگربوون لەکۆچکردنی فەرەنسیە پرۆتستانتیەکان بۆ داگیرگەکان، کەچی ئینگلیزەکان گوێ یان نەدەدا بەجیاوازی ئاینو ئاینزاکان، هەموویان بە جیاوازی پێکهاتە ئاینیەکان کۆچیان بۆی دەکردو لەوێشدا هاوکاری ئینگلیزیان دەکرد لەجەنگەکاندا لەدژی دوژمنانیان.

## هاوپەیمانی ئینگلیزیو هۆڵندی لەدژی فەرنسا :-

هەتا کاتێك بنەماڵەی ستیوڕات لە ئینگلتەڕا دەسەڵاتدار بوون، بارودۆخ گونجاو نەبوو بۆ تێککگیرانی ئینگلتەڕاو فەڕانسا، بەهۆی ئەوەی ئەم بنەماڵەیە مەیلیان بەلای کاسۆلیکی دابوو، وە دۆستایەتیان لەگەڵ لۆیسی چواردە بەهێز بوو. بەڵام کاتێك شۆڕشی جەلیلە هەڵدەگیرسیو ئەوان لەسەر تەخت لادەچنو پەرلەمان بەسەر وڵاتدا بالادەست دەبێ و، ولیەمی سێ یەم دێتە سەرتەخت، بارودۆخ گۆڕانی بەسەردا دێت. بەهۆی ئەوەی ولیەم پرۆتستانتی بوو، لەلایەکی تریشەوە بەسەر هۆڵنداشەوە دەسەڵاتدار بوو، سەرسەخترین ڕکەبەری لۆیسی چواردە بوو. ئەمەش بەمانای یەکگرتنی دوو وڵات دەهات بەرامبەر فەڕەنسا.

## جەنگی شا ولیــەم:ـ

کاتێك ولیەم ئۆرنج هاتە سەر تەختی ئینگلیزی، ئەوەندەی نەبرد جەنگی دەستەی ئۆکسبرگ هەڵگیرسا. ئەو جەنگانە لەساڵی 1689دەستی پێکرد تاوەکو ساڵی 1697بەردەوام بوو. لەجەنگی "پوین" ولیەم بەسەر جیمسی یەکەمو فەرنسیو ئێرلەندیەکاندا سەرکەوت، کەهەر سێ لایان هاوپەیمان بوون. هەروەها کەشتیگەلی "ولیەم" سەرەڕای تێکشکانی لەسەری "بێچی" لە ساڵی 1690، بەلاّم هەرچۆنێك بێت لەساڵی 1692، بە تەنها لەجەنگێکی دەریای سێ ڕۆژی دا لەنزیك لاهای توانی کەشتیگەلی فەرەنسی تێکبشکێنێ.

ئەم جەنگانە لە داگیرگە ئەمریکیەکان بە جەنگی شاولیەم ناسرابوون. ئینگلیزەکان لەداگیرگەکانی ئەمریکا توانیان دەستبگرن بەسەر بورتو ڕیاڵو کیوبك لە کەنەدا. فەڕەنسیەکانیش هەستان بەسوتاندنی هەندێ شوێن لە نیوهامشەرو نیویۆرك. بەلاّم بەپێی پەیمانی ڕیزوریکی ساڵی 1667فەڕەنسا ئەم زەویانەی گێڕییەوە.

## جەنگی شاژنەئــان:ـ

جەنگی ویراسەی ئیسپانیا کە لەنێوان ئینگلتراو هاوپەیمانەکانی لەگەڵ فەڕەنسا هەلگیرسا لەساڵی1702-1713. ئەم جەنگە لەئەمریکا بەجەنگی شاژنە"ئان" ناسرا. هیندیە سورەکان "نیوئاینگلاند"یان- وێرانکرد، لەملاشەوە ئینگلیزەکان دەستیانگرت بەسەر "بورتو ڕیاڵ وکیووبك". فەڕەنسا لەگەڵ ئەو خەسارەتانەی بەهۆی جەنگەوە لێی کەوت، بەلاّم تائەوکاتەش زۆرێك لەداگیرگەکانی لەئەمریکاو هیند بەدەستەوەمابوو.

## سەرکەوتنەکانی ئینگلتەڕا بەسەر فەرەنسادا :-

ململانێی ئینگلیزو فەرەنسی لەئەمەریکاو لەهیندو لە دەریاکاندا زۆر توندوتیژبوو. لەئەمریکادا فەرەنسا تائەوکاتەش لەدوای پەیمانی "ئەترێخت "، دۆڵی ڕوباری سنت لۆرنس و دوورگەی کەپ بریتۆن و بەربژاری ڕاوگەکانی ماسی لەرنیوفاوندلاندی بەدەستەوە مابوو. هەروەها سەربەستی بازرگانی هەبوو لەدوورگەی خۆرئاوا. ئەمەو جگە لەداگیرکردنی دۆڵی ڕوباری میسیسپی. فەرەنسا ژمارەیەکی زۆری بورج و قەلای دروست کردبوو بەمەبەستی پارێزگاری کردن لەموڵکەکانی لەدەریاچەی چاپلن تاوەکو نیاگرا وسەنت ماری و دەریاچەی وێنبیك و ڕوباری واباش و وێنوی، وە بە درێژایی ڕوباری میسیسپی تاوەکو کەنداوی مەکسیك. جگەلەمە فەرەنسیەکان لەساڵی 1760 لەمۆبیل وە لەساڵی 1718 لەنیوئۆرلین نیشتەجێ بوون. کە پاش ئەمە فەرەنسا بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ڕوباری میسیسپی موڵکی خۆیەتی.

لەهیندستانیش حاکمی گشتی فەرەنسی "دوپلی" لەسەرکردە هیندیەکان نزیك بوویەوەو سوپایەکی پڕمەشقی سازکرد لە سیبوی "هیندەکان". هەروەها شاری "بوندشیری" قایم کرد کەبارەگای گشتی بوو. جگەلەمە بەڕووکەش پۆست و پلەی بەخشی بەمیرە هیندیەکان.

لەماوەی ئەو جەنگەی کە لەنێوان هەردوو وڵات لەسەردەمی شاجۆرج هەڵگیرسا، گۆڕانێکی یەکلاکەرەوە ڕووی نەدا لەباڵادەستی هەردوو وڵات بەسەر داگیرگەکانیان.ئەوەندە نەبێ کە ئینگلتەڕا بەگوێرەی پەیمانی "ئەترێخت"، "نیوفاسکوشیا"و "نیوفاندلاند"و کەنداوی "هندسن"ی– بەدەست مایەوەو توانی پارێزیان پێوە بکات. ئەوەی کە پێویست بوو لەنێوان هەردوولادا یەکلابێتەوە خۆی دەبینیەوە لەو پرسەی کە ئایە فەرەنسا بەسەر دۆڵی ڕوباری میسیسپی دا باڵادەستی دەمێنێ؟. ئایە ئینگلتەڕا بەگۆشەگیری لەکەناری خۆرهەڵاتی ئەمەریکا دەمێنێتەوە؟. یان ئایە فەرەنسا لەهیند هەر باڵادەست دەبێت و دەتوانێ ئیمپراتۆریەتی هیندی

دروستبکات؟. هەموو ئەم پرسانە لەجەنگی حەوت ساڵەدا وڵامیان درایەوەو یەکلایی بوونەوە. ئەم جەنگە لەداگیرگەکاندا نۆ ساڵی خایاند 1754-1763. فەڕەنسا لەم جەنگەدا نزیکەی هەموو داگیرگەکانی لەدەستدا. فەڕەنسا نەوەك هەر لەداگیرگەکان بەڵکو سوپاکەی لەئەوروپاشدا لەبەرامبەر فردریکی گەورە خۆی نەگرتو تێکشکا. ئینگلیزیش هێزە دەریایەکەی لەناوبردو کردی بەپوشی دەم ڕەشەباو دەستیگرت بەسەر زۆرینەی داگیرگەکانی لەهیندی خۆرئاواو بازرگانی فەڕەنسی هەرەس پێهێنا. لەهیندستانیش کلایف توانی نەخشەکانی دوپلی پووچەڵ بکاتەوە. بەمەش هەڵپەی فەڕەنسا لەئەمریکا کۆتایی پێهات.

ئینگلیزەکان دوای کۆمەڵێ شکستو تێکشکان توانیان لەساڵی 1756 چەندین سەرکەوتنی بێ وێنە لەئەمریکا بەدەستبێنن، ئەمەش لە دوای هاتنە سەرتەختی "ولیەم پیت" بۆسەر تەختی ئینگلیزی لە ساڵی 1757، کە لەدوای ئەمە ئینگلیزەکان دەستیانگرت بەسەر پێگەو شوێنە گرنگەکانی فەڕەنسا. جەنڕاڵ "وۆڵف"ی- ئینگلیزیش لەساڵی 1759-1760 توانی دەستبگرێ بەسەر کیوبكو مۆنتریاڵ. ئیدی دوای ئەمە ئینگلیزەکان توانیان فەڕەنسای نوێ داگیر بکەن.

لە وڵاتی هیندیستان ئیمپڕاتۆری مەغۆلی لە سەدەی هەژدە هەرەسیهێنا. بەمە فەرمانڕەوای ویلایەتەکان خۆیان سەربەخۆ کرد، بەتایبەت فەرمانڕەوایانی دیکن. "دوپلی" هاوپەیمانیەتی لەگەڵ زۆرێك لە فەرمانڕەوایانی "پەنغالو ئۆز" بەست. وە لە ساڵی 1750 توانی بەسەر دەسەڵاتداری کەناری "کارناتیك"سەرکەوێ. کلایف پێشتر فەرمانبەرێ بوو لە کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵاتی ئینگلیزیو لەمیدراس کاری دەکرد. ئەم خۆی خزاندە نێو سوپاو لێهاتویو بەتوانایی خۆیی لەجەنگدا دەرخستو لەدوای جەنگ چوویەوە سەرکاری پێشووی. "ڕۆبەرت کلایف" توانی فەڕەنسیو لایەنگرانی لە هیندیەکان لە کارناتیك دەرپەڕێنیو ئەم ناوچەیەیان لێ پاك بکاتەوە.

ئەمەش حکومەتی فەڕەنسی ناچارکرد لە ساڵی 1754"دوپلی" بانگهێشت بکاتەوە فەڕەنسا. ئیدی کلایف بووبە گەورەو سەرداری ئەم ناوچەیە.

لێرەدا دەچینە سەرباسی بەنغاڵ، کە یەکێ لەجێنشینەکانی بەناوی "سیراج الدوله" لەساڵی 1756دەستی گرت بەسەر کیلکتا وپاشان 146کەسی لەئینگلیزەکان زیندانی کرد، کە بیست ودوو کەسیان نەبێت ئەوانی تر هیچی ڕزگاریان نەبوو. هەربۆیە کلایف بەمەبەستی سزادانی "سیراج الدەولە"و تۆڵە لێسەندنی، لە"میدراس"ەوە- بەرەو کیلیکتا کەوتەڕێ‌و دەستیگرت بەسەر "شاندرناغار" کە لە ژێر دەسەڵاتی فەڕەنسیەکان دابوو. "کلایف" هەربەمە نەوەستا، بەڵکو لەپاش جەنگێکی خوێناوی لە دژی "سیراج الدەولە" لە"سهل پلاس" لە ساڵی 1757سەرکەوتنێکی گەورەو بەرچاوی بەدەستهێناو بڕی یەك ملیۆن ونیو پاوەندی ئیستەرلینی لە"میر جعفر" دەست کەوت. "میر جعفەر" ئەوکەسە بوو کە جێگەی "سیراج الدەولە"ی- گرتەوە. ئیدی ئینگلیزەکان بەسەر پەنغاڵ دا زاڵ بوون. بەهەمانشێوەو لە ساڵی1758ئینگلیزەکان دەستیان گرتەوە بەسەر "مزولی باتام". هەروەها لە ساڵی 1761"بوند شیریان" خستە ژێر ڕکێفی خۆیان. بەم شێوەیە دەسەڵاتی ئینگلیز بەسەر کەناری خۆرهەڵاتی هیندا قاچی چەسپاند. دەتواین بڵێین: بەکەوتنی مۆنتریاڵ لە ساڵی1759، کیوبك لەساڵی1760، بوندشیری لە 1761، کۆتایی بەداگیرکاری فەڕەنسی هات. بەلام جەنگ تاوەکو ساڵی1763 بەردەوامبووو بە پەیمانی پاریس لەهەمان ساڵدا کۆتایی پێ هات. بەڕاستی فەڕەنسا توشی زیان وخەسارەتێکی گەورە بوو کاتێك کەنەداو دۆڵی ڕوباری سنت لۆرنس و هەموو زەویەکانی خۆرهەڵاتی ڕوباری میسیسپی‌و دورگەی کاراناداى لە دەریای کاریبی لەدەستدا. فەڕەنسا جگە لەهەندێ دورگەو بەشێکی غینیا لەئەمریکای باشور هیچی تری بۆنەمایەوە. بەریتانیاش لەئیسپانیا نیمچەدورگەی فلۆریدای دەست کەوت، لە بەرامبەردا ئیسپایا لۆیزیانای لە خۆرئاوای ڕوباری میسیسپی پێدرا. هەروەها بۆ فەڕەنسیەکانیش مۆڵەت درا کە

لەناوەندە لەمێژینەکانیان لەهیند بازرگانی بکەن. هەروەها کوباو فلیپین گەڕێنرایەوە بۆ ئیسپانیا.

بەم شێوەیە ئیمپراتۆریەتی داگیرکاری فەڕەنسی لە سەدەی هەژدە ئاوابوو، بەریتانیاش لە هەریەکە لەئەمریکاو هیندو لەدەریاکاندا شوێنی گرتەوە. فەڕەنساش جگە لەدوو دوورگە لە نیوفاوندلاند هیچی تری بۆ نەمایەوە.

## هیندی بەریتانیا

بریتانیا لە ساڵی1763 وەك دەوڵەتێکی داگیرکاری گەورە دەرکەوت. ئەمەش بەسەرکەوتنی بەسەر فەرەنساو داماڵینی ئەم وڵاتە لە داگیرگەکانی. بریتانیا بوو بە خاوەنی ئەمریکای خۆرهەڵاتی ڕووباری میسیسپیو کەنداو هیند، ئەمەو جگە لە ناوەندە بازرگانیەکان لە دوورگەی هیندی خۆرهەڵات "ئەندۆنیسسا"و زۆرینەی هیندی خۆرئاواو کەناری ئەفریقا. ئیدی بەهۆی ئەوانەوە زۆر ئاساییەو شتێکی چاوەڕوان کراوە کە سەروەتو سامان بڕێژێ بەسەر بریتانیادا. بازرگانی ئینگلیزی زیاتر لەهەموو وڵاتان گەشانەوەو فراژوبوونی بەخۆیەوە بینی. بریتانیا زیاتر لەمەش فراوانی بەخۆیەوە بینی لە هیندستان، ئەمەش لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدە.

کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵاتی ئینگلیزی تاوەکو نیوەی سەدەی هەژدە ناوەندی بازرگانی دادەمەزراندو بەهێزی دەکردو هەڵدەستا بەکاری بازرگانی. بەڵام لەدوای ئەم مێژووە 1763، گۆڕانکاری بەسەر ڕەوشەکەداهات. ئیدی کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵاتی وەك جاران نەما، بەڵکو کارمەندو ڕێکخەرانی ئەم کۆمپانیایە دەستیان لە کایەی سیاسی هیندستان وەردەدا، سەرەڕای کاری سەرەکیان کە بریتی بوو لەبازرگانیو دەستکەوتنی قازانج. جا بەتێپەڕینی ڕۆژگار زۆرینەی میرەکانی هیند کەوتنە ژێردەسەڵاتی بریتانیا. شیاوی باسە ئەم وانەیە کلایف لەڕکەبەرە فەرەنسیەکەی "دوپلی" فێری بوو. واتا: ئەم شێوە سیاسەتە.

ئینگلیز ڕکەبەرو کێبڕکێ کاری لە بەرامبەردا نەما لە بواری بازرگانی داگیرگەکاندا. جەنگی حەوت ساڵەو ڕکەبەریەکان کۆتایان هاتو سەرۆکایەتی کردنی بریتانیا گەیشتە لوتکە. کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵاتی ئینگلیزی ئیمپراتۆری سیاسیو ئابوری لە هیندستان دامەزراند. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زەویانەی کە بریتانیا لە هیند خاوەنی بوو کەم بوون، کە کلیکتاو دەلتای ڕووباری کەنج(بنغال)ی لە باکوری خۆرهەڵاتو میدراسو هەندێ لە زەویەکانی کەناری باشوری خۆرهەڵاتو بۆمبای لەژێردەستبوو. شیاوی باسە بۆمبای کەوتبووە سەرکەناری خۆرئاوا.

داگیرکاری خۆرئاوایی هەروا بەئاسانیو لەخۆیەوە نەهاتە ئەم ناوچانە، بەڵکو ئەو بەهۆی بارودۆخی شڵەژاو ناهەموار هاتو خۆی باڵادەستکرد. جا هەر ئەم بارودۆخە لە هیندستانو لەسەردەمی ئینگلیز هەر بەردەوام بوو. ئینگلیزەکانیش ئەم ڕەوشەیان بەدەرفەت زانیو قۆستیانەوە بۆدەستگرتن بەسەر زەویو زاری زیاترو دەستەبەری کردنی فراژوبوونو خۆشنودی ئابوری لەخودی بریتانیادا.

میرەکانی هیندستان لەجەنگو تێکهەڵچوونی بەردەوام دابوون لەگەڵ یەکتر. ئەم جەنگانەش لەسەرەتاکانی سەدەی هەژدە هەر لەداڕمانی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلیەوە لە هیندستان دەستی پێکردبوو. کارەکانی "دوپلی"و جەنگی ویراسەی نەمساویو جەنگی حەوت ساڵەش سوتەمەنی ئاگرەکەیان زیاترو زیاتر کرد. جا کاتێك جەنگەکان کۆتاییان هات باڵادەستی بریتانیا بەسەر هیندستان جێگیربوو. بریتانیا هەستی کرد کە میرەکانی "مهراتا" لە ناوەڕاستو خۆرئاوای هیند یەکیەتی کۆنفیدرالیان پێکهێنانەوەو هەڕەشەو مەترسین لەسەر ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی داڕماو، هەروەك مەترسین لەسەر نیشتەجێگەکانی ئینگلیز لەسەر کەنارەکانی هیند.

لەم نێوانەدا کلایف لەلایەن خۆیەوە سیاسەتێکی ووردی داڕشت بۆ فراوانکردنی ئیمپراتۆریەتەکەیو پارێزگاری لێکردنی.

لە ساڵی1765 "کلایف" گەڕایەوە ئینگلتراو نازناوی لۆردی پێ بەخشراو کرایە حاکمی گشتی هیند. جا کاتێک گەڕایەوە کیلیکتا هاوکاری ئیمپراتۆری مەغۆلی دەستەبەرکرد لە دژی میرە دەسەڵاتدارەکان. "کلایف" مەبەستی بوو دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بگێڕێتەوە هیندستانو پارێزگاری بکات لە هێمنیو ئارامی کە بۆ بازرگانی بریتانیاپێویستی سەرەکی بوو. پاش ئەمە لەگەڵ ئیمپراتۆری مەغۆلی چەند پەیمانێکی بەستو لێیەوە چەندین بەربژاری بۆخۆیو کۆمپانیای ئینگلیزی وەرگرت. کلایف وای دەبینی کە دەتوانێ بەهۆی گێڕانەوەی هێمنیو ئارامی باج بسەپێنێو بەهۆی فەرمانبەرو کارمەندە بریتانیەکان کۆی بکاتەوە. کلایف سوپایەکی سیستماتیکی بەسەرکردایەتی ئەفسەرە بریتانیەکان پێکهێناو خۆیشی کردە سەرکردەی باڵای سوپاکە. ئیدی لەدوای ئەمە بنغال بەتەواوی چوویە ژێر سایەی حوکمی ئینگلیزی، وە لەوێشەوە باڵادەست بوون بەسەر هەرێمی بەهارو بەرزاییەکانی ڕووباری گەنج و لە کەناری خۆرهەڵات. ئینجا دوای دەسەڵاتداربوونی لەم هەرێمانە هەستا بەگرتنەبەری هەمان سیاسەتو میرەکانی پابەند کرد بەچەند پەیمانێك لەگەڵ بریتانیا. شایەنی باسە ئەم میرانە هەریەکەیان لەهەرێمێك دەسەڵاتداربوون. دوای ئەوەی کلایف بە سیاسەتەووردو بەهێزەکەی دەسەڵاتی بریتانیای لەهیندستان پتەو کردو جێگیری کرد، لەساڵی 1767 گەڕایەوە بریتانیا. کەچی لەجیاتی پاداشتو سوپاس کردن، لەلایەن هەندێ لە کارمەندە ئینگلیزەکانی هیندستان تۆمەتبار کرا بەوەرگرتنی بەرتیلو سوود بۆخودی خۆی. لە بریتانیاش لەژێر فشاری دادوەری بریتانیا ژیری تێکچوو، پاش ئەوە لەساڵی1774 خۆی کوشت. حکومەتی ئینگلیزی کەسێکی بەناوی"ویرن هستنگ" خستە جێگەی کلایف. هستنگ لەتەمەنی حەڤدە ساڵی چووبووە ناو کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵاتیو لەو کاتەوە کاری تیادا دەکرد. لەماوەی بیست ساڵی کارکردنی لەهیند ئەزمونو شارەزایی زۆری پەیداکردبوو لەبارەی سیاسەتی هیندو باری دەرونی(نفسیەت)ی هیندیەکان. سەرەتا حکومەتی ئینگلیزی

کردی بەحاکمی هەرێمی بنغال، لەپاش دوو ساڵ لە بە حاکم بوونی لەساڵی1774 کرایە حاکمی گشتی سەرجەم ئەو ناوچە هیندیانەی کە لەژێردەستی ئینگلیز بوون. لێرەوە بۆیەکەم جار سێ هەرێمی ئینگلیزی یەکانگیرکران، کەبریتی بوون لە: "بنغال، میدراس، بۆمبای". ئیدی ئەمانە کەوتنە ژێردەسەڵاتی یەك فەرمانڕەوا. بۆ ئەمەش یاسایەکی ئینگلیزی لە پەرلەمانو لەساڵی1773 دەرکرابوو، سەرەڕای ئەمەش یاساکە ئاماژەی بەوەدا بوو کە پێویستە سەرجەم فەرمانبەرانی کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاتی پادشا ڕەزامەند بێت لەسەر دامەزراندنیان. ئەمەش مانای ئەوەی دەگەیاند کە هیند بۆتە بەشێکی گرنگی ئیمپراتۆریەتی بریتانی. پاشان لە ساڵی1785 یاسایەکی تریش دەرکراو فەرمانی بە دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتیەکی حکومی دەدا لە لەندەن بۆ سەرپەرشتی کردن و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاتی.

هستنگ وەك حاکمی گشتی تاوەکو ساڵی 1785 مایەوە. لەم ماوەیەدا جەنگی لەدژی میرەکانی مهراتا بەرپا کرد، لە ساڵانی 1774-1782، وە بەهاوکاری هەندێ لەو میرانەی کە مەیلیان بەلای بەریتانیادا بوو، توانی لە باکوری هیند خۆی زاڵ بکاتو سەرکەوێ بەسەر میرەکانی مهاراتا. هەروەك توانی پارێزگاری بکات لە بۆمبایو بەربەست لەبەردەم هێرشەکانی مهراتا دابنێ. پاشان توانی سەرکەوێ بەسەر"حیدەر علی".

حیدر علی دەیویست دەسەلاتێك بۆخۆی لەهەرێمی میسوری باشور بنیات بنێ. لە کۆتایدا میرەکانی مهراتا ناچار بوون پەیمانی ئاشتی لەگەڵ هستنگ ببەستن، وە بەپێی ئەم پەیمانە شاری"سالسیت"ی نزیك بۆمبای ڕادەستی ئینگلیزەکان کرا. لەم نێوانەشدا شاری "بنارس" ی پیرۆز لەسەر ڕووباری کەنج کەوتە ژێر دەسەلاتی بریتانیا.

هستنگ توانی لەهیندستان بەڕێوەبەرایەتیەکی ناوەندی بریتانی بەهێز دابمەزرێنیّ، هەروەها توانی دامو دەزگای دارایی چاك بکاتو یاساو ڕێوشوێن بۆ پۆلیس دابنیّو ئیدارەی سەربازی بکاتە ئیدارەیەکی مەدەنی بەهێزو سەقامگیر. هستنگ لەپشت کارەکانیەوە توانی سودی ماددی بۆخۆیو بۆ کۆمپانیا دەست بخات. لە کۆتایدا "هستنگ" بانگهێشتی لەندەن کرایەوە بۆ ئەو تۆمەتەی سەبارەت بە بەڕێوەبردنو کاروبارەکەی لە هیندددا دەدرێتە پالّی. ڕکەبەری سەرتەختی ئەو، نوسەرو سیاسەتمەدار "ئارمندبرگ" بوو. بەلاّم لە شانسی "هستنگ" پەرلەمانی ئینگلیزی لای بەلای ئەودا کردو ئەویان بەیەکیّ لەو کەسانە هەژمار کرد کەپایەو کۆلّەگەی ئیمپراتۆریەتی بریتانیایان لە هیندستاندا چەسپاندووە.

لەدوای "هستنگ" دووکەسی تر لەهیندستان بوونە دەسەلاّتدار. "کورنوالس"1786-1793، کە سەرکردەی ئینگلیز بوو لەجەنگی نێوان ئینگلتراو شۆڕشگێڕە ئەمریکیەکان، بەلاّم ئەو خۆی ڕادەست کرد. دووەمیان: "مرکیز ولنز"ی-بوو1798-1805. ئەم دووکەسە بە تەواوی بەرەنگاری میرەکانی"مهاراتا"یان-لەناوبردو موڵكو زەوی ژێر دەسەلاّتی بریتانیایان فراوان کرد لەهیند. لە خۆرهەلاّتدا بریتانیا زالّ بوو بەسەر ئۆراسیاو گونتور، وە لە باشور مایسور. هەروەها لە کەناری خۆرئاوا توانیان دەسەلاّتی خۆیان بنوێنن بەسەر کەناری مالاریاو بروج، لە باکوریش میرەکانی هەرێمی "ئۆز" بوونە لایەنگری بریتانیا. دوای ئەمە بریتانیا توانی لە سالّی1803 دەستبگریّ بەسەر دەلهی پایتەخت، بەمەش ئیمپراتۆری مەغۆلی جگەلە هێمایەك دەنا هیچی تری لیّ نەمایەوە. جاکاتێك "ولزی" لە سالّی1805 گەڕایەوە بریتانیا، ولاّتەکەی بالاّدەستبوو بەسەر ئیمپراتۆرە فراوانەکەی لە هیندستانو، زۆرینەی میرەکان موچەیان لە ئینگلیز وەردەگرتو لێی دەترسان. دەسەلاّتی بریتانیا هاوئاستی سەروەتو سامانو گەشەسەندنە ئابوریەکەی بوو.

## فراوانخوازی ئینگلیز لە دەرەوەی هیند:-

بریتانیا لەدەرەوەی هیندستانیش فراوانخوازی ئەنجام داو توانی خۆی زاڵ بکات بەسەر گەرووی مەلاقا، کەڕێگەیەك بوو دەگەیشتەوە خۆرهەڵاتی دوور. پاشان دەستی گرت بەسەر پننگ. هەروەها لە ساڵی1795 دەستی گرت بەسەر گەرویەکی ترکە لەژێر دەستی هۆڵندییەکان دابوو. لەهەمان کاتیشدا بریتانیا دوورگەی سەیلانی لە هۆڵندیەکان داگیرکرد. ئینگلیز هەر بەوەندە نەوەستا، بەڵکولەئەفریقاش زیاتر فراوانخوازی بە ئەنجام گەیاندو داگیرگەی سیرالیونی لەساڵی1787 لەسەر کەناری ئەفریقای خۆرئاوا دروستکرد، بەو بیانووەی کە ببێتە پەناگەیەك بۆ کۆیلە ئازاد کراوەکان. هەروەها لەساڵی1794 دەستی گرت بەسەر کۆمەڵێك دوورگەی تر لەکەناری ئەفریقای خۆرهەلات. ئینجا لە ساڵی1795 ئەفریقای باشورو "کێپ تاون"ی– لە هۆڵندیەکان سەند.

## دۆزینەوەی ئوستورالیا

لەسەدەی شازدەوە دەنگۆیەك لەناو دەریاوانانو دۆزەرەواندا هەبوو سەبارەت بەهەبوونی کیشوەرێك لەئۆقیانوسی باشور. لەسەرەتای سەدەی حەڤدە"دی کیرۆز" دەریاوانی پرتوگالی لە ئوستورالیا نزیك بوویەوە. لەدوای ئەمە زۆری نەبرد دەریاوانە هۆڵندیەکان کەناری خۆرئاوایان لە ئوستورالیا دۆزیەوەو ناویان لێینا "هۆڵندای نویێ". وە لەساڵی 1624 دەریاوانی هۆڵندی"تاسمان" کەناری باشوری خۆرهەڵاتی دۆزییەوەو دورگەیەکی بچوکی لەباشوری ئەم کیشوەرە بەناوی خۆیەوە کرد. دوای ئەوانە سەرکێشی ئینگلیز "ولیەم دامبیر" لەساڵی1688 هەستا بە ئەنجامدانی خولێك بە دەوری زەوی‌و سەبارەت بە هۆڵندای نوێ هەندێ شتی نوسی. جا لەپاش دە ساڵ حکومەتی ئینگلیزی چەند نێردراوێکی نارد بۆ زانینی ڕووبەری ئەم ناوچەیە. بەڵام ئەم نێردراوانە هیچ سودێکی پێ نەگەیاندن.

ئوستوراليا هەروا بەناڕۆشنی مايەوە هەرچەندە لەلايەن ئينگليزو هۆڵنديەكان ناسرابوو وە زانياريان لە بارەيەوە هەبوو. ئەوروپيەكان كيشوەری ئوستوراليايان داگير نەكرد تائەو كاتەی "جيمس كوك" لەنيوەی سەدەی هەژدە سەردانی ئەم كيشوەرەی كرد.

جيمس كوك"1779-1728" كوڕی كرێكارێكی كشتوكاڵ بوو لە هەرێمی يۆركشايەری ئينگلترا. بەمنداڵی لەلای خاوەن كارگەيەكی كەشتی كاری دەكرد، ئينجا بەهۆی گەشتە دەرياييەكانی بۆ نەرويجو دەريای بەلتيق، بەچاكی فێری دەرياوانی بوو. جيمس كوك لەتەمەنی بيستو حەوتساڵی چوويە نێو كەشتيگەلی پاشايی بريتانیو لەجەنگی حەوت ساڵەدا بەژداری لەجەنگە دەرياييەكاندا كرد لەدژی فەرەنسيەكان لە ئاوەكانی ئەمريكا. هەروەها وەك ڕووپێوێكی دەريايی بۆ ڕووپێوكردنی نيوفاوندلاند چوار ساڵ خزمەتی كرد. پاش ئەمە حكومەتی ئينگليزی ناردی بۆ دەرياكانی باشور بۆ گەڕانو پشكنين. "كوك" هەستا بە سازدانی سێ گەشتی گرنگو لێوەشاوەيی ئەو لەسەركردايەتی كردنی دۆزينەوەكاندا دەركەوت. ووردبونەوەو تێبينی كردنی هەروەها باسكردنی گەشتو دۆزينەوەكانی كردی بەيەكێ لەدۆزەرەوە گەورەكان لەمێژوودا. گەلی ئينگليزی بەيەكێ لەو شوێنگرە گەورانەی دادەنێنن كە ئيمپراتۆريەتی بريتانيايان بيناكرد.

كابتن كوك سەردانی دورگەی "تاهيتی"1770-1769" كردو لەدەوری نيوزلەندا سوڕايەوەو نەخشەی ئەم ناوچەيەی كێشا. هەروەها هەستا بە ڕووپێوكردنی كەناری خۆرهەڵاتی ئوستوڕالياو ناوی لێنا "نيوسوس وێڵز"، يا "وێلزی نوێی باشور". پاش ئەمە لەم شوێنەی شاری "سدنی" دروستكراوە دابەزیو بەشێوەيەكی فەرمی ئەم ناوچەيەی بەموڵكی بريتانيا هەژماركرد. لە گەشتی دووەميدا(1775-1772) جارێكی تر سەردانی ئوستوڕالياو نيوزلەندای كردو "نيوكالدۆنيا"ی دۆزيەوەو بەدەوری كەناری باشوری ئوستوڕالياو ئەفريقاو ئەمريكای باشوردا سوڕايەوە. "جيمس كوك"

ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون کردەوە کە لەنیوە گۆی باشوری زەوی جگە لەهۆڵنـدای نـوێ یاخود ویلزی نوێ هیچی تری لێ نیە. ئەمەشیان بەبەراوورد لەگەڵ کیشوەرە گەورەکان بچوکە. لە گەشتی سێهەمدا(1776-1779) "کوک" جارێکی تـر دوورگـەی "هـوای" دۆزیەوە کە پێشتر ئیسپانیەکان لەسـەدەی شـازدە دۆزیبوویانـەوەو دواتـر لێیـان وون ببـوو. کـوک بـە نـاوی وەزیـری دەریایی ئینگلیـزی "سـندویچ" نـاوی لـەم ناوچـەیە نـا "سندویچ". پـاش گەشـت کردنـی بۆگـەرووی "بهرنـك" گەڕایـەوە بـۆ "هـوای". بـەڵام ئەمجارە نەیتوانی ئینگلترا بەچاوی خـۆی ببینێتـەوە لەوێـداو لەدەسـتەویەخە بوونێك لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە کوژرا.

حکومەتی ئینگلیزی هەرگیز دانی نەهێنا بەکابتن کوك، وەك دەریاگـەڕو دۆزەرەوەو زانایـەکی جـوگرافی کـە خزمـەتێکی زۆری کـردووەو زانیـارێکی زۆری پێـشکەشی مرۆڤایـەتی کـردووە. هـەروەها وەك دروسـتکارێکی ئیمپراتـۆری بریتـانیش دانـی پێـدا نەهێنا، بەڵکو حکومەتی بریتانی دۆزینەوەکانی ئەوی قۆستەوەو خستیەکار. هـەر زوو لەساڵی1786 نیوەی خۆرهەڵاتی ئوستوڕالیا خرایە سـەر هـەرێمی "نیوسـوس ویلـز". وە لە ساڵی1788 ئینگلیزەکان لەهەرێمی "بوتنی بی"و بەندەری "جاکسن" (پێگەی شـاری سـدنی ئـەمڕۆ) نیـشتەجێ بـوون. نیـشتەجێ کـانی سـەرەتا بریتـی بـوون لـەو تاوانبارانـەی کـە حکومـەتی ئینگلیـز لەزیندانەکانـەوە گواسـتبوونیەوە ئـەوێ. ئەوانـە تێکـەڵ بـوون لەگـەڵ ئەوانـەی کۆچـیان بـۆی کردبـوو، وە بـە یەکـەوە ئـەم ناوچـەیان ئاوەدان کردەوە. بەتێپەڕینی ڕۆژگارو لەماوەی نیوەی یەکەمی سـەدەی نـۆزدە بەشـی خۆرهەڵاتیو باشوری دابـەش بـوو بـۆ چـەند هـەرێمێکی جۆراوجـۆرو تیایانـدا چـەندین شاریان دروستکردو بەرەبەرە بـەهۆی کـۆچ کردنـی خـەڵکی بـۆی دانیـشتوانی زۆربـوو. ئیدی ووردە ووردە ئوستوڕالیایان دەکارهێنا.

هەرچۆنێك بێت بریتانیا لەکۆتایی سەدەی هـەژدە بـوو بـە ئیپراتۆریـەتێکی مـەزن. ئـەو خەسـارەتو زیانانـەی کـە بـەهۆی ڕزگـاری ئـەمریکا بـەری کـەوتن، لەهینـدو

ئوستوڕالیاو ئەفریقای باشورو ناوچەکانی تر قەرەبوو کردەوە. ئیپراتۆریەتی بریتانی بوو بە فراوانترینو دەوڵەمەندترین ئیمپراتۆریەت کە مێژوو دانی پێدا هێنا. زمانی ئینگلیزی بوو بە زمانی مەلاین خەڵك، بەهەمانشێوە شارستانیەتی ئەوروپیش لەڕێگەی ئینگلترا لەداگیرگەکاندا بلاّوبویەوەو بەریتانیا بە تەواوی بەسەر دەریاکاندا بالاّدەست بوو. بازرگانی بریتانیا گەشایەوەو سەروەتو سامان ڕووی کردە ئینگلتراو بازاڕەکانی دراوو پارەگۆڕیو بازرگانی لەئەمستردامەوە گوازرایەوە لەندەن. ئیدی لەندەن وەك: بازاڕێکی ئالۆگۆڕکاری دراو لەجیهان دەرکەوت. بانکی ئینگلیزی کە لە ساڵی1694 دامەزرا، بوو بە گەورەترین دامەزراوەی ئەم کایە لەجیهاندا . بانکی تر لەئینگلتراو دەرەوەی ئینگلترا دروستبوون، وەك: برکلی لەسەرەتاکانی سەدەی هەژدە، لوید بانك لە1765، بۆرصەی لەندەن لە 1773. سەرمایەو سەرمایەداریەتی ئینگلیزی گەشەی کردو شەوقی دەدا، هەروەك فاکتەرێك بوو بۆ چالاك کردنی کایەی کشتوکاڵو پیشەسازی. بەمەش بریتانیا بوو بە بەهێزترین دەوڵەت لە ئەوروپاو لەهەموویان زۆرتر سەروەتو سامانی هەبوو، ڕێگەشی خۆشکرد بۆ دروستکردنی سەرمایەی پیشەسازی لە داهاتوودا.[1]

1 Hayes،op.cit;pp.384-422;Gottschalk;op.cit;pp.66-76;211-217.

# بەشــی دوازدەم

# سەرهەڵدانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا[1]

1 Ibid; pp. 243- 87; 437-458; 595.

## سەرهەڵدانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا1

لەئەنجامی سیاسەتی توندڕەوی شاجیمسی یەکەم (1603–1625) ژمارەیەك لە چەوساوە پیۆریتانیەکان لەساڵی 1607 کۆچیان کرد بۆ ئەو شوێنەی ئەمڕۆ پێی دەوترێ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەمانە لەویلایەتی ڤەرجینیا لە شاری "جیمس تاون" نیشتەجێ بوونو ساڵی دواتر ئەوانی تریش پەیوەندیان پێوەکردن.

لەڕاستیدا تەنها سیاسەتی چەوساندنەوەی سیاسیو ئاینی پاڵنەر نەبووە بۆ کۆچکردن ڕووەو ئەمریکا، بەڵکو پێشترو لەکاتی زووتر حکومەتی ئینگلیزی بەرەو فراوانخوازیو بنیاتنانی کەشتیگەلی بەهێز هەنگاوی دەناو، بازرگانو کەسە سەرکێشەکان پشتیوانی ئەم فراوانخوازیەیان دەکرد بۆ دروستکردنی ئیمپراتۆریەتی داگیرکاری لەپشت دەریاکان. کۆچکردووە سەرەتاییەکان لەکۆمەڵو دەستە دەستەی جیاواز پێکدەهاتن. توندڕەوە چەوساوە ئاینیەکانو هەڵپەکارانو تەماعکارانی دەوڵەمەندیو هەژارانو نەداران کەوایان دەزانی جیهانی تازە هۆیەکە بۆ خۆشگوزەرانی، وە ئەوانەیشی کە لە سیاسەتی حکومەتی ئینگلیزی ڕازی نەبوون، وڵاتیان جێ هێشت و ڕووەو ئەمریکا کۆچیان کرد. هەموو ئەمانە کۆچردووەکانیان پێك دەهێنا. دواتر بە لێشاو کۆچکردوە ئینگلیزەکان ئینگلترایان جێ دەهێشت بەرەو ئەو وڵاتەی ئەمڕۆ پێی دەوترێ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

جەنگی جووتە گوڵ لە ساڵی 1485 کۆتایی هاتو لەئینگلتەڕا حکومەتێکی بەهێزی ناوەندی دامەزرا کە زاڵ بوو بەسەر ڕەوشی سیاسی نەتەوەیی دوورمەودایی وڵاتەکەیداو توانی گەلەکەشتیەکی بەهێز دابمەزرێنێ وبیکاتە سوپەرو قەڵغانێکی پتەوی پاراستنی ئینگلتەڕا. تێکشکانی ئیسپانیاش لەساڵی 1588لەبەرامبەر کەشتیگەلی ئینگلتەڕا ئەوەی دەرخست کە ئینگلتەڕا قەلایەکی سەختە لەبەردەم

---

1 Ibid; pp. 243- 87; 437-458; 595.

هەموو دەست تێوەردانێکی بیانی. بەهەمانشێوە کەشتیگەلی ئینگلیزی یاریدەی ئینگلتەڕای دا بۆ ئەوەی پەلبهاوێتە ناو دەریاکانو فراواخوازی لەناو جیهانی دەرەوەدا ئەنجام بداتو لەکیشوەرە نوێیەکان نیشتەجێبێت.

لەکاتێدا ولاتانی ئەورووپی سەرقاڵی جەنگە ناوخۆیەکانیان بوون لە پێناوی دەستخستنی سەرزەمینەکانی دەوروبەریان لەئەورووپا کە بەتەنها تێکشکانێکی جەنگی لەدەستیان دەدا، کەچی ئینگلتەڕا خۆی دووردەگرت لە ململانێکانی ناوخۆی ئەورووپی کە ئەگەری لەدەستانی سەرکەوتنەکانی لەناو ئەورپا نزیك بوو، لەهەمانکاتیشدا لە هەوڵی بەدەستهێنانی داگیرگەکانی دەرەوەی کیشوەری ئەورووپا بوو. وە بەهەڵگیرساندنی جەنگ لە دژی بەهێزترین ولاتی ئەورووپا، کەشتیگەلەکەی کردە قەڵغانێکی پتەوو چەکێکی کارا بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتی گرنگ لە ئەمریکاو ئاسیاو پاراستنی هەمان ئەو دەستکەوتانە بۆ خزمەتی ئینگلتەڕا.

بێگومان لایەنی ئابووری پاڵنەرێکی گرنگ بوو بۆ ئەنجامدانی سەرکێشیەکانو دامەزراندنی داگیرگەکان. داگیرکارە پێشینەکان وەسفی ویلایەتی فەرجێنیایان دەکرد بەزۆری زێڕ تیایدا، بەوەی گوایە دانیشتوانەکەی ئەڵماس ومەڕجان لەسەر کەنارەکانی دەریای لوێزیناکۆدەکەنەوەو پۆشاکی منداڵەکانیانی پێ دەڕازیننەوە.

سەرەڕای بێ کاری بەربڵاوی ئینگلتڕاکەبەهۆی پرۆسەی پەرژین کردنو گۆڕینی زەویە کشتوکاڵیەکان بۆ لەوەڕگەو نەهێشتنی دێرەکانو دەستگرتن بەسەر موڵکەکەی بڵاو ببوویەوە. هەرئەمەش وای لێکردن بگەڕێن بە دوای هۆکاری تر بۆژیانو دەوڵەمەندی. لەم سەروبەندەدا ئەمریکا بۆ ئەوان زەوی بەڵێن پێدراوو پەنگەبوو.

لەپاڵ ئەوانەشدا جەنگی سی ساڵە هۆیەکی تری ئەم کۆچ کردنە بوو، جەنگی سی ساڵەی ئەورووپا لەنیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدە، بازاڕەکانی ئینگلیزی لەکیشوەری ئەورووپادا بەڕووی کاڵای ئینگلیزی دا داخستو پیشەسازی ئینگلیزی لەباربردو بەهەزاران خاوەنکارو کریکار بێکار مانەوە.

هەروەها ساڵانێکی وشکە ساڵی بەرهەمی خراپو بێ کەڵکی لەگەڵ خۆی هێناو نرخەکانیش بەرزبونەوە، هەربۆیە خەڵکی کەوتنە بیری کۆچ کردن ڕووەو ئەمریکا، ئەمەش بۆ دەستکەوتنی قوتی ژیان. خەڵکی وایان دەبینی کە ئینگلترا پڕو سیخناخ بووە بە دانیشتوانو ژمارەی دانیشتوان گەیشتۆتە پێنج مەلاین کەس، جا چارەسەری ئەم ڕەشەو لابردنی ئەم فشارەی دانیشتوانو نەهێشتنی بێ کاری لایان وابوو تەنها بەکۆچکردن چارەسەر دەبێ.

هاوکات بانگەشەکارانی مەزهەبی بازرگانی هانی داگیرکاریان دەدا، چونکە داگیرگە ماددەی خاو دەبەخشێتە وڵاتو خۆیشی دەبێتە بازاڕێکی بەبرەوی کاڵاو بەرهەمی پیشەسازی وڵات. لەبەرئەمانە لە ئینگلتڕادا باوەڕیان وابوو کە دەستگرتن بەسەر دارگیرگە بۆ ئەم مەبەستانە ئەرکی سەرشانی حکومەتە. هەروەها باوەڕیان وابوو دەستگرتن بەسەر ماسی داگیرگەکان زۆر باشترە لە کڕینی ماسی لە هۆڵندیە ڕکەبەرو چاوچنۆکەکان. ئەوەتا یەکێ لەوان دەڵێ: "بازرگانان جەختیان دەکردەوە لەسەر مەترسی ئەوەی کە کەشتیگەلی پاشایی پشت ببەستێ بە داروو تەختەی وڵاتانی بەڵتیقو زفتو قاڕی ئەوان. لەبەرئەوانە ئەقڵو لۆژیك ئەوە دەخوازێ کە ئەم ماددە سەرەکیانە لە جێگایەکەوە هاوردە بکرێت کە لەکاتی جەنگدا بتوانرێ دەست پێی بگات.

لەپاڵ هۆکاری ئابووری ئاینیش بەهەمان شێوە، لەگەڵ هۆکارەکانی تر پاڵنەر بوون بۆ داگیرکاری. ژمارەیەك لە ئینگلیزەکان هەوڵیاندا مەسیحیەت لەناو هیندیە سورە بت پەرستەکان بلاوبکەنەوە، لەنێو ئەو بەندانەی کە لە بڕوانامەی (وەسیقە) ئیمتیازەکانی کۆمپانیای فرجیباو ئەوانی تریشا هەبوو، پرسی بلاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی وکتێبی پیرۆز بوو لەنێو هیندیە سورەکاندا. دواتر دەرکەوت کە کۆمپانیا ئەوەندەی گرنگی دەدا بە داگیرکاری ناوچەکە ئەوەندە گرنگی نەدەدابە بلاوکرنەوەی ئاینی مەسیحی لەناو هیندیە سورەکان. ئەکمان ئاینیان کردبووە، پەردە پۆشێك بۆ جێبەجێ کردنی

ئارەزوی کەمایەتیە ئاینیەکانی ئینگلترا وەك بیۆریتانە توندڕەوەکانو کاسۆلیکەکانو کویکرسەکان و، ئەوانەی دونیای تازەیان بە پەناگە دەزانی بۆ پیادەکردنی ئاینیان. لەڕاستیدا ئینگلترا لەگەڵ ئیسپانیاو فەرەنسا، سەبارەت بەم پرسە جیاواز بوو، چونکە ئینگلترا ڕێگای دەدا کەمایەتیە ئاینیەکان کۆچ بکەن بۆ دونیای نوێ بۆ ئەوەی بەزووی لەدەستی ئەوان ڕزگاری بێت، ئەمە لە کاتێکدا ئیسپانیاو فەرەنسا، ڕێگر بوون، لە کۆچ کردنی کەمە ئاینیەکان. جگە لەم پاڵنەرانە، پاڵنەری تاکەکەسی"شخصی" زۆربوو، بۆ ئوم کۆچکردنە. سەرکێش مانو سسەربەرزی ناوبانگەوە بوون. هەیانبوو دەیویست خۆی ڕزگار بکات لە ڕابردوی سامناكو ناوبانگی خراپو ناوزڕاوی خۆی، هەر بۆیە لە دەشتەکانی ئەمریکا خۆی وون دەکرد. هەشیان بوو گەرەکی بوو خۆی ڕزگار بکات لە داوو شوێن پێ هەڵگرتنی، پۆلیس، ئەمەش بەهۆی ئەنجامدانی تاوانێك کە توشی ببو. بەشێکیان دەیانویست خۆیان ڕزگار بکەن لە نەداریو کەساسیو کوێرەوەیو بچن ڕووەو ژیانێکی خۆش لە جیهانی نوێ. وەلێ زۆرترینیان توشی لەناوچوون هاتن، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکیان دەستکەوێ، چارەنوسیان خراپتر بوو، لەوەی کە لێیەوە هاتبوون.

دروستکردنی داگیرگە ئینگلیزەکان لە ئەمریکا:-

سەرەتای هەوڵەکانی ئینگلیز بۆ داگیرکاری ئەمریکا شکستی هێنا. "سێر هامفری گیلبرت" هەستا بە سازدانی دوو شالاّو بۆ ئەمریکا، شالاّوی یەکەمیان بەهۆی گەردەلولی دەریای شکستی هێناو، هی دووەمیان لەساڵی 1583 بە ونبوونی لەدەریادا کۆتایی پێهات. لەپاش ئەمە "سێر والتر ڕایلی" کە هەر برای ئەوەی پێشو بوو لە دایکیەوە، دوای ئەوەی توانی شاژن ئیلازابێس ڕازی بکات، هەستا بە سازدانی شالاّوێکی دەریایی. ئیلازابێس ڕەزامەندی نیشاندا بەو مەرجەی کە "ڕایلی" بەشێك لە کانزا گرانبەهاکان بدات بە شاژنی ئینگلیز. جا لەپاش دۆزینەوەکەی لەساڵی 1584 ڕاپۆرتێکی هاندەری پێشکەش کرد سەبارەت بەو "وڵاتەو گونجاوی ئاو وهەواو

بەروبومو سازگاری ئەو ناچەیە زیاتر لە هەر ولاتێکی تر". "ڕایلی" جگە لەمە دوو شالاوی تریشی وەڕێخست، بەلام لەهەردووکیان شکستی هێنا. ئەوەی دووەمیان لەسالی 1587 بوو، کاتێ لەم سالەدا کەوتە ڕیو لەچارەنوسێکی نادیاردا لەدورگەی "ڕونك" گۆشەگیر مانەوەو وون بوون، وە جگە لەوشەی ناڕۆشنی "کرواتیان" کە لەسەر لقی دارێك هەلی کەند بوو، هیچ ئاسەوارێکی تری جێنەهێشت.

"والتر" بەهیچ هەولێکی داگیرکاری تر هەلنەستاو سەدەی شازدەش کۆتایی هات بەبێ هەبوونی داگیرگەیەکی هەمیشەیی ئینگلیزی. بەهۆی ئەم ئەزمونانە ئینگلیزەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەم جەربەزەیانە بە تاك تاك بۆ مەبەستێکی ئائەوە گەورەو مەزن کەخۆی دەبینێتەوە لەپرۆسەی داگیرکاریو نیشتەجێ بوون، لە توانای تاکە کەسێكو دەستەو کۆمەلێك دانیە، بەلکو پرۆژەی لەم شێوەیە پێویستە حکومەتو کۆمپانیا گەورەکان پێی هەستنو ڕۆلی تیا بگێڕن.

کۆمپانیا بازرگانیە گەورەکان کە پێکهاتبوو لە چینی ئۆرستۆکراتی ئینگلیزیو خاوەن پۆستە بەرزەکانی ولاتو گەورە سەرمایەداران، توانیان بەربژاری لە پاشایەتی بەریتانی بۆخۆیان دەستەبەر بکەن لە بواری "کۆکردنەوەی باجو لێدانی دراو ڕێکخستنی بازرگانیو کڕینو فرۆشتنەوەی زەویو ڕاگەیاندنی جەنگو دەستگرتن بەسەر ئەو زەویانەی کە دەیاندۆزیەوە". وەسیقەی ئەم بەربژاریانە کە کۆمپانیاکان دەستیان کەوتبوو، گوزارشتبوو لە دەستوری کۆمپانیاو سیستەمی کۆمپانیا، هەرئەمەش بوو بە بناغەی دەستورو یاساکانی ئەو ویلاتانەی کە دواتر لەبەریتانیا سەربەخۆ بوون. شیاوی باسە کۆمپانیاکان ڕۆلی گەورەیان گێڕا لەم کایەداو دەوری گرنگیان بینی.

دوو لەداگیرگە ئینگلیزەکان بەهۆی کۆمپانیای بازرگانی ئینگلیزی دامەزرێندران، "فەرجینیا" لەسالی 1607 لەلایەن کۆمپانیای لەندەن دامەزرێندراو "مساجوسیت" لەسالی 1630 لەلایەن کۆمپانیای کەنداوی "مساجوسیت" بنیاتنرا. کۆمپانیاکان هیچ

کاتیَ بیَ بەش نەبوون لەبەربژاری‌و پشك‌و بەش‌و هەردەم بە دوای دەکەوتن، لەم نێوانە کۆمپانیای "فەرجینیا" لە ساڵی 1606 لەلایەن شا"جیمسی یەکەم"ەوە چەندین بەربژاری پێدراو ڕێگەیدرا دوو کۆمپانیای تری ناسەرەکی دروستبکات، کە بریتی بوون لەکۆمپانیای لەندەن‌و بلیموس. کۆمپانیای لەندەن مافی بازرگانی کردنی پێدرا، هەروەها ڕێگەی پێدرا کە لە نێوان هێڵی 34-41پرۆسەی نیشتەجێ کردن ئەنجام بدات. بۆ کۆمپانیای بلیمۆس"یش- مافی دامەزراندنی پێدرا لەنێوان هێڵی پانی 38-43. لە هەموو ئەمانەشدا پادشا دەسەلاتی دەوڵەتی بەسەردا هێشتنەوەو وایکرد نەتوانن لەدەسەلاتی دەوڵەت دەربچن. کۆمپانیاکان بەربژاری‌و پشك وبەش‌و ئازادیان دەدا بە نیشتەجێبووەکان لەو زەویانەی بەکاریان دەهێنا.

کاتێك سیَ کەشتی لەمایسی 1607لەفەرجێنیا دابەزین‌و نزیکەی سەدوپێنج کەسی هەڵگرتبوو، توانای ئەوەیان نەبوو گۆڕانکاری بەسەر زەوییەکەدابێنن هەرچەندە بەشێك لەوان کرێکارو کەسانی میکانیکی بوون، بەڵام زۆرینەیان لەوانە نەبوون کە بتوانن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەو زەوییە چۆڵ‌و بەکارنەهێنراوانەدا. خۆ لەڕاستیدا ئەوان ناحەقیان نەبوو، کاتێك سەیر دەکەین کە ئەو ناوچەیەی شاری "جیمس تاونی" لیَ بنیات نراوە ناچەیەکی پڕ لەزۆنگ‌و زەلکاو بووە، هەر لەساڵی یەکەمدا دانیشتوانەکەی بە نەخۆشی شڕ ببوون. کاتیَ شالاوی دووەمیش گەیشتە ئەمریکا وەنەبیَ خەڵکەکەی لەوانەی پێشوو ئازاو بەهێزتر بووبن، بەڵکو ئەوانیش لەڕووی ئامادەگییەوە زۆر لەوانەی پێش خۆیان جیاواز نەبوون، جاریَ بەشێك لەوان زێڕنگەر بوون‌و هاتبوون بۆ دەرهێنانی زێڕو شۆرینی‌و پاك کردنەوەی‌و پاشان بارکردنی.

لەم دوو شالاوەی کە ئامازەمان پێدا جگە لەچوارەیەکیان هیچی تریان لیَ نەمایەوە. مانەوەی ئەم داگیرگەیەش بەسایەی سەرپەرشتی کارو کەشتیوان "جۆن سمیس" بوو، ئەو کەسەی کە بۆ کۆمپانیاکان ئەوەی خستەڕوو کە پێویستە کەسانیَ بنێرن توانای کارکردنیان هەبێت‌و دەستەکانیان بخەنەکار. جگە لەمەش "سمیس"

یاسایەکی توندو ڕەقی بەسەر کۆچکردووە تازەکان سەپاند کە خۆی دەبینیەوە لەوەی ئەوەی "کاردەکات دەخوات".

کۆمپانییای لەندەن پێشبینی سەروەتو سامانێکی بێ شوماری کرد بوو لەماوەیەکی کەمدا، کەچی توشی نالەباریو تەنگو چڵەمەی زۆر بوون و سودو قازانجیش هەروا بەئاسانی دەستیانەکەوت. ساکاتێکیش هیچ یەکێ لەمان زێڕو ئاڵتونیان دەستنەکەوت، یەکێ لەوان بەناوی "جۆن رالف" لە ساڵی 1612 توانی سودو قازانجێکی زۆری دەستکەوێت لە کشتوکاڵی توتن. بەهاتنی ساڵی 1619 نزیکەی هەزار کەس لە فەرجینیا نیشتەجێ بوون. لەهەمان ساڵیشدا کۆمپانیا "90" ئافرەتی گەنجی لێوەشاوەی گەیاندە ئەم ناوچەیە، لەوێش هاوسەرگیریان پێکرا لەگەڵ ئەو پیاوانەی کە لەبەرامبەر کرێ دا ئەوانیان گواستبوویەوە. منداڵو نەوەی ئەمانە لە یەکەمین خێزنەکانی فرجینیا بوون. ساڵ لەدوای ساڵ ئافرەتانیش بەرەو فەرجینیا کۆچیان دەکردو منداڵەکانیان دەبوونە دانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکا.

لەساڵی 1619 ڕوداوێك لەمێژووی ئەمریکاو وە لەمێژووی ئەم پرۆسەیەدا ڕویدا، ئەمەش کاتێك کەشتیەکی هۆڵەندی یەکەم باری خۆی لەزنجو کۆیلە داگرت و هەرزوو لەلایەن دانیشتوانی فەرجینیاوە بیست لەم کۆیلانە کڕدران. نیو سەدە بەسەر ئەمەدا تێپەڕی کاتێك زنجیەکی زۆر لەکشتوکاڵدا کاریان پێدەکرا، بەتایبەت لە کشتوکاڵی توتن. هەر لەساڵێ 1619 کۆمپانیا مافی دروستکردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی بەخشی بە نیشتەجێ بووان. ئەم ئەنجومەنە بووە یەکەم یاسا داڕێژی ویلایەتی فەرجینیا لەدوایداو یەکەم حکومەتی نوێنەرایەتی لە ئەمریکا.

لەساڵی 1624 شاجیمسی یەکەم بەربژاری کۆمپانیای فەرجێنیای هەڵوەشاندەوە، بەهۆی ئەوەی بەرژەوەندیەکانی کۆمپانیای بازرگانی تێکدەگیرا لەگەڵ ئەو سیستەمە باجەی کە جیمس سەپاندبووی، بەمەش ویلایەتی فەرجینیا بووبە هەرێمێکی پاشاییو لەلایەن حاکمێکی سەر بەپاشا ئینگلیزی فەرمانڕەوایی

دەکرا، ئـەمیش لەلایـەن ئەنجومـەنی بـچوك و چـڤاتی[2] یاسـاداڕێژەوە هاوکـاری دەکـرا، ئەمانیش لەلایەن جوتیاران و کشتکارانەوە هەڵدەبژێرران. بەم شێوەیە فرجینیا بوو بـە یەکەم هەرێمی شاهانی ئینگلیزی لەئەمریکا.

## پیۆریتانە توند ڕەوەکان لە مساجوسیت:-

پیۆریتانـە تونـدەکان لەگـەڵ کڵێـسای ئینگلیـزی هـەڵیان نـەدەکردو نـەدەگونجان، ئەوان دەیانویست چاکسازی لەکڵێسادا بکەن، وە گەرەکیان بوو پەیامەکانی پیۆرتـانی "دنیا نەویستی" لەگەڵ کڵێسادا بگونجێنن. بەڵام کاتێـك پاشـا ئەمـەی ڕەت کـردەوەو هەڕەشـەی لێکـردن بـەوەی یـا خۆیـان لەگـەڵ کڵێـسای ئینگلیـزی سـازکەن یـان وڵات جێبێڵن، بەشێك لەمانـە ڕویـان کـردە هۆڵنـدا. هەرچـەندە بـە بـەراورد لەگـەڵ ئینـگلترا بارودۆخی هۆڵندا بۆ ئەوان سانا ترو باشتر بوو، بـەڵام دوورە پـەرێزیو تـەنهاییان لـەم ناوچەیەدا وایکرد بارودۆخ بۆیان لەبار نـەبێت، هـەر بۆیـە بڕیـاری کۆچـکردنیاندا ڕووەو ئـەمریکا لەسـەر پـشتی پـاپۆڕی سـپیدوڵ، کۆمەڵەیـەکی تـریش لـە پیۆریتانـەکان ئینگلترایان جێ هێشت بە پاپۆڕی "میگلاور" و لەهـەمانکاتو لەئـەیلولی 1620 شـاری "بلایموس" یان- جێهێشت. ئـەو کۆمەڵەیـەی هۆڵنـدایان جێهێـشت، کاتێـك نـەیانتوانی ڕێگە بـبڕن، لەڕێگـەدا خۆیـان خـستە پـاڵ کۆمەڵـەی "مـیفلاور". گـەردەلولو تـەوژمو شەپۆلی ئاو کەشتیەکەی لـەڕێڕەوی خـۆی لادا. شـیاوی باسـە ژمـارەی سەرنشینەکان 102 کەس بوون لەپیاوانو ئافرەتو منداڵان. ئەوە بـوو لەتـشرینی دووەم "مـیفلاور" ڕێگەی بڕی بۆ کەنارەکانی نیوئاینگلاند. بەڵام بەهۆی ئەوەی ئەم ناوچەیە لەدەرەوەی سـنوری کۆمپانیـای لەنـدەن بـوو، ئـەمان بەگەشـتکار Pillims لەقەڵـەم نـەدەدران، هەروەك پیۆریتانەکان لەسەر کەشتی خۆیـان بـەوە هـەژمار کردبـوو. وە بۆئـەوان هـیچ

---

2 چڤات: کۆمەڵ-دەستە.

مافێك نەبوو لەسەر ئەو زەویەی کەلەسەری دادەبەزین. جا بۆ ئەوەی مافی ڕەوایی خۆیان پێبدرێ دەستوروو وەسیقەی خۆیان دارشت. بەگوێرەی ئەم دەستورە حکومەتی خۆیان دادەمەزراند. لەم سەنەدو نوسراوەدا هاتووە "دادەمەزرێ بنیات دەنرێ شێوە یاساو دەستورو دامو دەزگای دادگەر، ئەمانە لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی گۆڕان بەسەر ئەم سەنەدەدا دەهێنن" ئەم گرێ بەستە یەکەم دەستوری نوسراو پەیمانی کۆمەڵایەتیە کە بە ڕەزامەندی خەڵکەکە دانرا. ئەوانە کەژمارەیان چلو یەك کەس بوو "جۆن کارڤر"یان وەك حاکم بەسەر خۆیاندا هەڵبژارد.

پیۆریتانەکان لەبەندەری بلیموس لەنیو ئینگلاند "باکوری خۆرهەڵاتی ویلایەتە یەککرتوەکانی ئەمڕۆ" دابەزین، بەڵام بارودۆخیان زۆر سەختو نالەباربوو، سەرماو سۆڵەی زستان نیوەی لێ کوشتن، وەلێ ئەوانی تر بێ ئومێد نەبوونو بەردەوامیان دا بەخۆیانو هەوڵو کۆششیان دەدا لەپێناوی مانەوەو، لەسەر بیست دۆنم زەوی خۆیان خەریکی کشتوکاڵ کرد. پاش ئەمە ژمارەیەکی تر لەپیۆریتانەکان پەیوەندیان پێوە کردن، دواتر لەساڵی 1628 کۆمەڵەی دووەم گەیشتنو لەمساجویت نیشتەجێ بوون. بلیمۆسیش هەر بەسەربەخۆیی مایەوە لە مساجوسیت. "لە مساچوسیت سەربەخۆ بوو پەیوەندی بە مساجوسیت نەبوو، تاوەکو ساڵی 1691". گرنگی ئەم نیشتەجێگەیە تەنها لە ڕووی ئابووریەوە نەبوو، بەڵکو لە حکومەتەکەیان دابوو، کە حکومەتێکی سەربەخۆو جەماوەری بوو "لەلایەن گەلەوە دامەزرا بوو".

جیمسی یەکەم پیۆریتانەکانی بنبڕکرد، کاتێك ئەوان دەیانویست مەزهەبی ئینگلیکانی بگۆڕنو بنەماو دروشمی ئاینی دنیانەویستی خۆیان لەگەڵیدا بسازێنن. ساکاتێکیش چارلسی یەکەم هاتە سەرتەخت، زۆر لە باوکی ڕقاوی تر کەوتە چەوساندنەوەیان. هەربۆیە وەك تاکە چارەسەرێك پیۆریتانیەکان ڕوویان کردە ئەمریکاو ئەمەشیان بە تاکە چارەسەر دەزانی بۆ ئەو تەنگو چەڵەمانەی کە ڕووبەڕوویان دەبوویەوە.

لەساڵی 1629 کۆمەڵێك لەپیۆریتانیەکان بەربژاریان وەچنگ کەوت بۆ کۆمپانیای کەنداوی "مساجوسیت"، کە کۆچکارانی دەگواستەوە بۆ ئەمریکا.

ئەم دەستیەی کە ئێمە باسی دەکەین بەوەی کە باڵا دەست بوون بەسەر کۆمپانیای مساجوسیتو کۆچیان کردە ئەمریکا، لەچینی هەژار نەبوون بەڵکو لەچینی دەوڵەمەند بوونو ڕۆشنبیربوونو خاوەن زەوی بوون لە چینی ناوەڕاست. ئەمانە خۆیان ڕێکخست لەئەمریکا بۆ پێکهێنانی حکومەت، هەرچەند ئەم حکومەتە سەر بە ئینگلترا بوو، بەڵام بە بەڕێوەبەرایەتی سەربەخۆ بەهرەمەند بوو. لەساڵی 1630 کۆمپانیا بەیازدە کەشتی کە حاکم جۆن سەرپەرشتی دەکرد "700" کەسیان لەگەڵ خۆیان هێناو لە مساجوسیت دابەزین. دوای ئەمە شاری "بوستنو چارلستنو دورجستر"یان درستکرد. ژمارەی کۆچکردووەکان هەر ڕووی لەزیادبوون دەکرد، بەشێوەیەك لەدوای ئەم مێژووە بەماوەی دەساڵ نزیکەی پازە هەزار کەس کۆچیان کردە ئەمریکاو لە مساجوسیت دابەزین. لە ڕاستیدا هۆکاری ئەم کۆچکردنە زۆرە دەگەڕێتەوە ئەو چەوسانەوەی کە دارو دەستەی چارلسی یەکەم لەدژی پیۆریتانەکان لە ئینگلترا پیادەیان دەکرد، ئەمانیش بەناچاری کۆچیان دەکرد. ئەوەبوو داگیرگەی مساچوسیت بووە پەناگەیەك بۆ هەموو چەوساوەیەك لەپیۆریتانەکان.

پیۆریتانی کۆچکردو کۆمەڵگەیەکی دیموکرتیان لە مساجوسیت دروست نەکرد، بەڵکو سەرکردەکانیان کۆمەڵگەیەکی چینایەتیان دروستکرد، ئەمەش بە سازکردنی کێڵگەی گەورەو فراوان کە کرێکاران کاریان تیادا دەکرد، یاخود کرێکاران بەگرێ بەستێك کاری تیا دەکرد کە بەزەویەکەوە پەیوەستی کردبوون، یان ئەوەتا کۆیلە ئیشی تیادا دەکرد. کەچی لەگەڵ ئەوانەشدا کێڵگەکانی مساجوسیت نەگۆڕا بۆ داگیرگەیەکی کشتوکاڵی فراوان، هەروەك فەرجینیا لەباشور وەها گۆڕا. بەهەمانشێوە بازرگانی کۆیلە لەوێدا بەقازانج نەبوو. هەربۆیە نیو ئینگلاند گۆڕا بۆ کێڵگەی بچوك کە جوتیاری ئازاد خاوەنی بوو. ئەم شێوە گەشەسەندنە ئابووریە کاریگەری هەبوو لەسەر

گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی، ئەوە بوو چەندین شار لەمەساچوسێت دروستبوون کە بوونە ناوەندی چالاکی سیاسیو کۆمەڵایەتی.

لەساڵی 1624 سیستەمی نوێنەرایەتی لەم داگیرگەیە سەریهەڵدا، بەوەی کە خەڵکی هەموو شارەکان لەکۆبوونەوەیەکی کراوەدا کۆدەبوونەوە بۆ هەڵبژاردنی ئەندامێك یان دوو ئەندام بۆ ئەوەی لە بوستن نوێنەرایەتیان بکات، کاتێك لەوێدا ئانجومەنی یاسادانان دادەمەزراو دەسەڵاتی کۆکردنەوەی باجو دانانی یاسای لەدەست دەبوو.

حکومەتی "جۆن وینسروب"و دەستەکەی لەمساجوسیت، حکومەتێکی سیوکراتی بوو لەسەر شێوەی کالڤن، کە جگە لەوانەی پابەند بوون بە پێشەوا کالڤنیەکانیان لە ڕووی بیروڕایان سەبارەت بە ئایینو دەوڵەت، کەسی تر نەیدەتوانی دەنگ بدات.

بۆیە ئەم سیستەمە ڕەقو بە بەرد بووە لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی "روجرویلمس" هەرەسی هێنا. "روجر ویلمس" یەکێ بوو لە قەشەکانی شاری "سیلم"، باوەڕی بە لەیەکتری جیاکردنەوەی ئاینو دەوڵەت هەبوو، دژ بە دیکتاتۆریەت. "ویلمس" لەو کەسانە بوو کە پشتیوانی سەربەستی ئاینی دەکرد، هەروەها ئەم دانی نەنا بە "جون ویسروب"و کۆمەڵەکەیو شەریعەتی حکومەتەکەیان، حکومەتێك کە ڕەزامەندیو مۆڵەتی لەئینگلترا وەرنەگرتووە بۆ دامەزرانی. هەر بۆیە ویلمس لەمساچوسێت دەرکرا، ئەمیش لەدوای دەرکرانی لەنزیك رودایلند نیشتەجێگەیەکی بنیانا. پاش ئەمە "مسزئان هچنسن" پەیوەندی پێوەکرد، ئەمیش وەك "روجر ویلمس" نەیاری دیکتاتۆریەتی حکومەتەکەی مساچوسێت بوو، وە لە بانگەشەکارانی سەربەستی ئاینی بوو. جا بەتێپەڕنی ڕۆژگار ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی کە حکومەتی مساچوسێت دەیچەوساندنەوە پەیوەندیان کرد بەو نیشتەجێگە تازەیە.

ئەم نیشتەجێگە تازەیە لەسەرەتایی دامەزراندنی ناویان نا نیشتەجێگەی برۆڤندس. لە ساڵی 1644 پەرلەمانی درێژخایەنی ئینگلترا"لەسەروبەری شۆڕشی ئینگلیزی"

بەربژاری بەخشی بەم نیشتەجێگەیە. چارلسی دووەمیش لەساڵی 1663ڕەزامەندی لەسەر نیشاندا. ئیدی داگیرگەی رودایلند دواتر بوو بە نمونەیەکی جوانی دیموکراتی نویَ. خەڵکی ئەم شارە لەپیاوو ژن پەیمانی کۆمەڵایەتیان بەست، بەڵام پەیمانی ئەوان جیاواز بوو لەپەیمانەکانی تری مساچوسیتو بوستن، چونکە هی ئەوان پەیمانێکی سەربەستانە بوو، لەژێر کاریگەری کڵێسا یاخود شای بەریتانی دا نەبوو. جا لەبەر ئەمانە "رودایلند" زیاتر دیموکراتی بوو، لەهەر نیشتەجێگەیەکی تری ئینگلیزی لە ئەمریکا. دەستوری "ڕودایلند"یش لە ساڵی 1647 بەڵگەیەکی ڕونەو ئەمە دەسەلمێنێ. بەگوێرەی ئەم دەستورە رودایلەند کۆمارێکی یەکگرتووەو پێکهاتووە لە کۆمەڵێك شاری سەربەخۆ.

لە ساڵی 1636 کۆچڕەوێکی تر بە سەرۆکایەتی "توماس هوگر" دەستیپێکرد. توماس هوگر ئەوەی دەرخست کە پێویستە دەسەڵات بە ڕەزامەندی گەل بێت، ئەمەشی بەئازادی تەواو لێك دایەوە. ئەم بیرو بۆچونانەش لەگەڵ حکومەتی سیوکراتی لە بۆستن نەدەهاتەوەو تێکدەگیرا، لەبەرئەوە خۆیو کۆمەڵەکەی کۆچیان کرد بۆ ویلایەتی "کناتیکتو لە شاری هارتفەردو چەند شارێکی تر نیشتەجێ بوون. لەساڵی 1662 ئەوان توانیان بەربژاری لەچارلسی دووەم وەرگرن بۆ بنیاتنانی نیشتەجێگەی کناتیکت، کەژمارەیەك شاری لەخۆدەگرت، گرنگترینیان: "هرتفرد، ندستور، نرڕسفیلدو نیو هاڤن".

چەند نیشتەجێگەی تر سەریانهەڵداو لەدەوروبەری کناتیکتو مەساچوسێت بلاَوبونەوەو جیابوونەوە. لەم نێوانە "نیوهامشەر" لە ساڵی 1679 لەمەساچوسێت جیابوویەوە. ئەم نیشتەجێگانەش چەندان لقی تریان لێبوویەوە وەك : "ڤیرمۆت، مین"، بەڵام ئەمانە لەپێش شۆرشی ئەمریکی سەربەخۆنەبوون.

لەناوچەی نیو ئینگلاند کۆمپانیایەکی بازرگانی دروستبوو، بەربژاریشی لە شای ئینگلترا وەچنگ کەوتو دەستیکرد بەدامەزراندنی نیشتەجێگەی تر. دامەزراندنی ئەم

نیشتەجێگانە بەپێدانی چەندان پارچە زەوی بەکەسێك کە بەژدار نەبوو لەکۆمپانیا ئەنجام دەدرا. ئەم کەسانەی کە لەلایەن کۆمپانیاوە زەویان پێدرابوو لەچینی بالآو دۆڵەمەندو سەرمایەداران بوون یاخود لەنزیکانی پاشابوون. ئەمانە توانیان ڕوبەرێکی زۆر لەزەوی ئەمریکا دەستبخەن‌و چەندان نیشتەجێگەی تێدا بنیات بنێن، ئەمەشیان تەنهابۆ مەبەستی ماددی ئەنجام دەدا. ئەمانە توانیان حەوت نیشتەجێگە لەسەر ئەم شێوازە دروست بکەن، وەك: "میریلاند، نیویۆرك، نیوجزری، پەنسلڤانیا، دیلاویر، ساوتکارۆلینیا". هەروەك ویلایەتی جۆرجیاش بەهۆی تاکەسێکەوە بنیاتنرا. بەلآم جۆرجیا لەسەرەتادا ئەنجومەنی ڕاسپاردن بەڕێوە دەبرد.

میریلاند ناوچەیەك بوو کە چارلسی یەکەم لەساڵی1632 بەخشی بە"لۆرد تیمور"ی کاسۆلیکی، بەرامبەر بەوەرگرتنی پێنج یەکی خاوی زێڕو زیوی ساڵانەی ئەم هەرێمە. جا بۆ ئەوەی ئەم هەرێمە ئاوەدان بکرێتەوە، "لۆردتیمور" هەزار دۆنمی بەخشی بە هەر خانەدان‌و دەرەبەگێك کە لەگەڵ خۆیدا پێنج جوتیاری دەهێنا بە کەلوپەل‌و پێویستیەکانیەوە. بەهەمانشێوە ڕووبەری سەد دۆنم تاوەك‌و پێنج سەد دۆنم دابەشکرا بەسەرئەو خانەوادانەی کۆچیان کردبوو بۆی. "لۆرد تیمور" هەرێمەکەی کردبوو بە پەناگەیەك بۆکاسۆلیەکە چەساوەکانی ئینگلتراو ڕێگریشی نەدەکرد لەپرۆتستانتیەکان کە لە"میریلاند نیشتەجێ بن. لەساڵی1649ئەنجومەنی یاسادانانی میریلاند یاسای سەربەستی ئاینی دەکرد بۆ کاسۆلیك و پرۆتستانتیەکان. لەملاشەوە بریاری لە سێدارەدانی دەردەکرد بەسەر یەکیەتی خوازان‌و غەیرە مەسیحیەکان. "لۆرد تیمور" تەنها خۆی بە کاسۆلیکی مایەوە لە دوایدا، چونکە لەنێوان ساڵانی1690-1715 نەوەکانی بوون بەپرۆتستانتی. ئەمەش وایکرد لەدەسەڵاتی میریلاند دەرکرێن، بەلآم داهات‌و موڵکە ویراسیەکانیان لێ زەوت نەکرا.

## دامەزراندنی نیشتەجێگە لە کارولاینای باکورو باشور:-

کاتێـك چارلـسی دووەم لەسـاڵی1660چـووە سـەر تـەختی دەسـەڵات، زۆرێـك لەشوێنکەوتووەکانی لەخانەدانان خـەلات کـرد، ئەوانـەی یارمـەتی خـۆیو باوکیـان دا لـەکاتی هەڵگیرسـانی شۆڕشـی ئینگلیـزی، ئەمـەش بەپێدانی زەویوزار لـە پـشتەوەی دەریـاو زەریاکـان. جـا هەشـت کـەس لەوانـە لەسـاڵی1663 ڕووبـەرێکی بـەرفراوانیان لەباشـوری فـەرجینیا دەسـتکەوت و، نـاونرا کارولاینـا. گـەورە خـاوەن زەوییـەکان "ئەوانەی زەوییەکی زۆریان هەبوو" ئازادی پەرستشکاریو لێبوردەیی ئاینیان بەخشی بەدانیـشتوانە کۆچـکردووەکان لـە زەویەکانیانـدا، لەبەرئـەوە "کـویکریس"و هیگۆنتـە فەرەنسیو ئەڵمانیو سویسرپیەکان ڕوویان تێکردو زەنجیـەکانیان لـەکاری کشتوکاڵیدا خـستەکار، بەتایبـەت لەکـشتوکاڵی بـرنجو نیلـە. بـەلام دواتـر پادشـایی ئینگلتـەڕا ناوچەکەی کڕیەوە لەخاوەنەکانی و لەساڵی1729بووبە موڵکی شاهانەی ئینگلترا.

## بنیاتنانی نیویۆرك:-

هۆڵەندیەکان بۆگەیشتنیان بە خۆرهەلاتی دوور "هنری هندسن"ی ئینگلیزیان بەکرێ گرت. هندسـن بـۆ ئـەم مەبەسـتە لەسـاڵی 1609 لەڕێژگـەی ڕوبـاری هندسـن"بـەناوی خۆیەوە ناو نراوە" بەڕێکەوت و لەڕێگەدا گەیشتە هۆزە هیندیە سـورەکانی ناسـراو بە "موهاك" کە توانی دۆستایەتیان لەگەڵ پێکبێنێ. ئەم گەشتەی چوار گەشتی تـری بە دواداهات بۆ چوار گەشتکار"بازرگان" کـە بەهۆیـەوە کـەنارەکانی ڕوبـاری "دیلاویـر"و کەنـداوی "لونکئایلانـد" دۆزرایـەوە. دواتـر لەسـاڵی 1614 ناوەنـدی بازرگانیـان لە"منهاتن" دامەزراند.

لەسـاڵی1621 کۆمپانیـای هینـدی خۆرئـاوایی هۆڵـندی دامــەزرا بـۆ مەبەسـتی پاوانکردنی بازرگانی بـۆ مـاوەی بیستو چـوار سـاڵ، لـە نێـوان ئـەفریقای خـۆر ئـاواو ئەمریکا، بەوەی "کە کۆمپانیا هەڵبـستێ بـە ئـاوەدان کردنـەوەی ناوچـە چۆڵەکان بـە

ئاوەدان کردنەوەیەکی بەرهەمدار"، هەرچەندە مەبەستی سەرەکی کۆمپانیا لەناوبردنی قۆرغکاری ئیسپانیا بوو.

یەکەم کۆمەڵی کۆچکردووەکان لەساڵی 1624 گەیشتنە منهاتنو هەر زوو قەڵای "ئەستردام"یان-تێدا بنیاتنا، کە دواتر بوو بە ناوەندی حکومەت. هەروەها نیشتەجێگەی "ئۆرنج"یان- لەناوچەی "بانی" بنیاتناو قەڵای "ناساو"یان- لەسەر ڕوباری "دیلاویر" دروستکرد، ئەمەو جگەلە دروستکردنی قەڵایەکی تر لە "کناتیکت". بەمەش هۆڵندیەکان شاری نیوئەمستردام یان دامەزراند، دواتریش ئینگلیزەکان ناویان لێینا نیویۆرك. هەرچەندە ئەم ناچەیە بە شێوەیەکی هەرزان دەبەخشرا، بەوەی کە بۆ هەر پەنجا خێزانێك گەر ڕووی تێکردبا بەدرێژایی ڕوباری هندسن زەوی پێدەدرا، بەڵام خواستی لەسەر کەم بوو، تەنها کەمێك لەخانەدانان یاخود "ئەوانەی کە بەم کارە گەورە هەڵدەستان" خۆیان تێی خزاند. وەلێ هیچ لەمان سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، تەنها "ڤان ڕیسلی" بازرگانکاری ئەڵماسو خشڵ نەبێت، کە توانی زەوی لەناوچەی بانی بەدەستبێنێ. وەلێ بەشێوەیەکی گشتی نەیتوانی دانیشتوانی بۆ کەمەند کێش بکات.

لەساڵی 1664بەبێ تەقاندنی تفەنگێك ئەم ناوچەیە کەوتەژێر باڵادەستی ئینگلیزەکانی دەوروپشتی خۆی. هۆکاری شکستی هۆڵندیەکان لەپاراستنی دۆڵی رووباری "هندسنو منهاتن"، دەگەرێتەوە بۆخودی هۆڵندیەکان. چونکە هۆڵندیەکان حەزیان نەدەکرد کۆچ بکەن بۆدەرەوەی وڵات. بازرگانی و پرۆسەی دۆزینەوەش لەسەدەی حەڤدە وڵاتەکەیانی نغرۆ کردبوو لەسەروەت سامانو خۆشگوزەرانی. لێبووردەی ئاینیو لایەنی رۆشنبیریو پەرەسەندنی ئابووری، هۆڵندای بەشێوەیەك خۆشنود کردبوو کە ئێرەیی پێ دەبرا. ئەمەش وایکرد خەڵکی هۆڵندا بیر لەبەجێهێشتنی وڵاتەکەیان نەکەنەوە. لەلایەکی تریشەوە داگیرگەی "نیونیزرلاند"و "نیویۆرك" توشی جەنگێکی سەختو دڕندە ئاسابوون لەگەڵ دانیشتوانە ڕەسەنەکەی،

کەناسرابوون بە"کونکسن". کاتێکیش لەساڵی 1665 ئاشتی ئەم ناوچەیەی گرتەوە، ئەم داگیرگەیە هەزارکەسی لە دانیشتوانەکەی لەدەستدابوو. جگەلەمە هۆڵندا لە ماوەی چل ساڵدا 1624-1664سەرقاڵ بوو بەجەنگە خوێناویەکانی لەگەڵ ئیسپانیاو ئینگلترا، ئەمەش تاڕادەیەك بێ ئاگای کردبوو لەداگیرگەگانی ئەمریکا، کە نەیتدەتوانی بەسەریان ڕابگات. کۆمپانیای هیندی خۆرئاوای هۆڵندیش زیاتر مەبەستی ڕووتکردنەوەی کەشتیە ئیسپانیەکان بوو لە زەریاکانو لەئەمریکای باشور، هەروەها ئارەزووی لەبازرگانی کۆیلەو بەهاراتو شەکر بوو، گرنگی نەدەدا بەداگیرکردنی نیونیزرلاند لەئەمریکا. لەلایەکی تریشەوە باڵادەستی کۆمپانیای هیندی خۆرئاوایی لەسەر بەڕێوەبەرایەتی داگیرگەکان توانای داهێنانی تاکەکەسی لەباربرد. جگەلەمە ئەم ناوچەیە بە فەرمانڕەواییەکی دیکتاتۆریانە فەرمانڕەوایی دەکرا. حکومەتی هۆڵنداش هیچ گوێی بەسکاڵای دانیشتوانەکان نەدەدا کە لەئازادیو سەربەستی بەڕێوەبردن قەدەغە کرابوون. دووبەرەکیو ناکۆکی لەنێوان کۆمپانیاو دانیشتوانەکان بووە هۆی ڕێگری کردن لەکۆچ کردنی هۆڵندیەکان. ساکاتێکیش ئینگلیزەکان لەساڵی1664 ویستیان پەلاماری داگیرگە بدەن دانیشتوانەکەی هاوکاری کردنی حاکمی هۆڵندی"پیتەر ستایفیزانس"یان ڕەت کردەوە.

کاتێك "نیونیزرلاند" کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز، ئینگلیزەکان بەتەواوی باڵادەستبوون بەسەر ناوچە کەناریەکان. لە ساڵی1664 "دیۆك ئۆف یۆرك" "ئەمە نازناوی شاجیمس ی دووەم بوو پێش چوونە سەر تەختی" هەموو ناوچەکانی لە"کناتیکت" تاوەکو ڕوباری "دیلاویری" لەبرای خۆی چارلسی دووەم دەستکەوت. لەم ناوچەیەش هەریەکە لە"ڤێرمۆنت - نیویۆرك - نیوجیرزی" جیابوونەوە. "دیۆك ئۆف یۆرك" نیۆرکی بۆ خۆی هێشتەوەو ناوەکەیشی لە "نیوئەمستردام"ەوە گۆڕی بۆ نیویۆرك. "دیوك ئۆف یۆرك" لە"نیویۆرك" مایەوە تا ئەوکاتەی لەساڵی1685

بانگهێشتیان کردەوە بۆ ئینگلترا، بۆئەوەی بچێتە سەرتەختی دەسەڵات. هەر لەم کاتەشدا نیویۆرک بوویە ناوچەیەکی شاهانەی ئینگلیزی.

لێبوردەیی ئاینیو ڕەگەزی لە ویلایەتی "نیویۆرك" لە ئاسەوارەکانی شارستانیەتی هۆڵندان. تەنانەت گوتراوە: کاتێ ئینگلیز دەستیگرت بەسەر "نیویۆرك"دا ئەو زمانانەی کە لە شەقامەکانی "نیویۆرك" بەکاردەهات ژمارەیان دەگەیشتە نۆزدە زمان. ناوە هۆڵندیەکانیش وەك خۆیان مانەوە، وەك: "بروکلن، ئۆرنج،ڕینلسر.....هتد"، بەهەمانشێوە هەندێ خانەوادەی بەڕەسەن هۆڵندی تائێستاش ماون وەك: "ڕۆزفلت شویلرو ڤان بیورن، ڤاندربیلت". سەرەڕای ئەمانە شارستانی هۆڵندی لە کاڵتەو گەپدا ڕەنگی دەدایەوە، وەك: یاری گۆلف"خلیسکانی سەر بەفر"و "سنت کلوز_بابا نۆئێل". جگەلەمانە شارستانی هۆڵندی لەبیناکردنیشدا تا ئێستاش لەم ناوچەیەدا کاریگەری ماوە.

"لورد برکلیو سێرجۆرج کاتریت" بەهۆی "دیوك ئۆف یۆرك"و، لایەنگری کردنی "دیوك یۆرك" بۆ هەردووکیان، توانییان بەربژاری دەستبخەن بۆ بەدەستهێنانی زەویوزار لە نیوجیزری "لەنێوان دیلاویرو ڕوباری هندسن". نیوجرزی ناوی دورگەیەك بوو لەکەناڵی ئینگلیزی، کە "کارتیر" لەکاتی شۆڕشی ئینگلیزی پارێزگاری لێ کرد.

پەشێویو ئاڵۆسکاوی لەم ناوچەیەدا زۆر بوو درێژەی کێشا تاوەکو سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەمریکی.

پەنسلڤانیا وەك ویلایەتێك لەسەدەی حەڤدە لەشێوەی نیشتەجێگەیەك دروست کرا. ئەم ویلایەتە لەلایەن کەسێکەوە دروستکرا بەناوی "پین". پین کەسێکی توندو گەرمو گوڕ بوو بۆ ئاینزای "کویکر". ئەم ئاینزایە دان ناهێنێ بە خوایەتی مەسیح، هەروەها باوەڕی بە هەڵەی ئادەم نەبوو، بەوەی کە لەوەچەکانیدا بە بۆماوەیی بۆیان دەمێنێتەوە. "ولیەم پین" داوای بڕی شازدە هەزار پاوەندی ئیستەرلینی لەشاچارلسی دووەم کرد، هەروەها داوای ناوچەیەکی کرد لە ئەمریکا بۆ شوێنکەوتەکانی لە ئاینزای

"کویکر". لەبەرئەوە چارلس لەساڵی 1681 فرمانی کرد ناوی بنێن "پەنسلڤانیا "دارستانی پین". لەڕاستیدا ئەم ناوچەیە پێشتر سویدیەکان تێیدا نیشتەجێ بوون‌و ناویان لێ نابوو سویدی نوێ، پاش ئەوان هۆڵندیەکان تێیدا گیرسانەوەو دوای ئەوانیش ئینگلیزەکان لەساڵی1664 دەستیان بەسەرداگرت.

"ولیەم پین" دەستیکرد بە گەشەپێدانی پەنسلڤانیا لەڕوی ئابووریەوەو لەساڵی 1682 چوو بۆ پەنسلڤانیاو شاری "فیلادلفیا"خۆشەویستی برایی"ی تێدا دروستکرد، هەروەها ڕێکەوتنی کرد لەگەڵ هیندیە سورەکان بەچەند مەرجێکی ئاسایی و، لێبوردنی بۆ هەمویان دەرکرد. پاش ئەمە ئەنجومەنی گەلی دامەزراند. "پین" بەمەبەستی کەمەندەکێش کردنی کۆچکاران لەئەوروپاوە بۆ "پەنسلڤانیا"، بە بانگەشەیەکی سەرنج ڕاکێشانە بانگەشەی بۆ دەکرد. لەیەکێ لەبانگەشاکاندا دەڵێت: " هەوای پاك، ڕووباری گونجاو بۆ کەشتیوانی، دەستکەوتی زۆر، خۆشگوزەرانی‌و گەشانەوەی ژیان لە شاری فیلادلفیا، بەشێوەیەك هەموو تاکێکی هەژار لە ئافرەت‌و پیاو سێ ئەوەندەی دەستدەکەوێ کە لەئینگلتڕا پێی دەبڕێ. "

## جـۆرجیـا:ـ

ئەمەش ویلایەتێکی ترە کە لە پێش شۆڕشی سەربەخۆیی وەك نیشتەجێگەیەك لەلایەن سەربازێکەوە بە ناوی "جیمس" لەساڵی 1733 دروستکرا. لەم سەروبەندەدا خراپی ڕەوشی زیندانیەکان بەدیارکەوت، بۆیە بڕیاریدا ئەم ڕەوشەیان لەسەر سوك بکات، ئەمەش بەدروستکردنی نیشتەجێگەیەکی تر. حکومەتی ئینگلیزیش ڕەزامەندی لەسەری نیشاندا، چونکە ئەم ناوچەیە ئسپانیاو ئینگلیزی لە فلۆریدا لەیەکترجوێ دەکردەوە. ئەوەبوو پادشا بەڕێوەبردنی ئەم ولایەتەی سپارد بە ئەنجومەنی ڕاسپاردن بۆ ماوەی بیست‌و یەك ساڵ. شیاوی باسە لەوێدا پێشوازی لەهەمووکەس دەکرا تەنها کاسۆلیکی نەبێت، هەروەها فرۆشتن‌و خواردنەوەی بێ هۆشکەرەکان قەدەغەکراو

بازرگانی کۆیلە ڕێگری لێ کرا. وەلێ بەهۆی هاتنی کۆچکردوانی نوێ بۆ ناوچەکە، پەشێوی‌و ئاژەوەی تێدا دروستبوو، دواتر هەڵوەشاندنەوەی یاسای قەدەغەکردنی مادده بێ هۆشکارەکان‌و بازرگانی کۆیلەی لێ کەوتەوە. لەکۆتایدا ئەنجومەنی ڕاسپاردن بەڕێوەبردنی ئەم نیشتەجێگەیەی بەلاوە گران بوو، بۆیە ڕادەستی پاشایەتی کردەوە، ئیدی ویلایەتی جۆرجیا بووبە ویلایەتێکی شاهانەی بەریتانیا.

## گەشەکردنی دانیشتوان:-

کۆچڕەوی گەورە کە ڕووی لە ئەمریکا کردبێ لەنێوان سالآنی 1620-1642 بوو. کۆچکردوە ئینگلیزەکان لەساڵی کۆتایی بە 65000 کەس دەخەملێندرا، وە ژمارەی دانیشتوانی ئەمریکا لە"نیوئاینگلاند" لەساڵی 1689 دەگەیشتە هەشت هەزارکەس و، هەریەکە لە نیویۆرك‌و نیوجرزی‌و پەنسلڤانیاو دیلاویر چل هەزار کەس دەبوون، بەلاّم چوار ویلایەتە باشوریەکانی وەك میریلاند، فەرجینیا، کارۆلینیای باکورو باشور زیاتربوون لەهەشتا هەزار کەس‌و خۆیان دەدا لە دووسەد هەزار کەس. ئەم گەشەسەندنە خێرایەی دانیشتوان لە ساڵی 1689 دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کۆچکردنە زۆرو زەبەندەی کە ئەم ناوچەیەی گرتەوە. ژمارەی دانیشتوانی شارە گەورەکان هەریەکەو بەشێوەیەك بوو لەڕووی زۆری‌و کەمیەوە، بۆ نمونە شاری فلادلفیا ژمارەی دانیشتوانی دەگەیشتە چوار هەزار کەس، "بۆستن" حەوت هەزارکەس‌و "نیویۆرك" سێ هەزارو نۆسەد کەس دەبوو. لایەنی ڕۆشنبیری‌و سەقافی بەربلاّو زیاتر ئینگلیزی بوو لەگەڵ تێکەڵیەك لە کلتوری ئەڵمانی‌و فەرنسی وهۆڵندی.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە جیاوازی چینایەتی لە داگیرگە ئەمریکیەکان کۆتایی پێ نەهات‌و نەفەوتا، خاوەن زەوی تا ئەو کاتەش سودمەند بوو لەو پێگەیەی کە بەرزتر بوو لەکرێکار. بەهەمانشێوە بازرگانانیش لەشارەکاندا خۆیان بەجیاواز دەبینی لەخەڵکی دێهاتەکان. وەلێ ناوچە سنوریەکان لەنێوان ناوچەکانی خۆرهەلاّتی *ئاوەدان بەدانیشتوان‌و زەویە چۆڵ‌و بەکارنەهاتوەکانی خۆرئاوا، توانای تاکە کەس‌و*

ئازایەتی‌و هێزو کۆڵنەدان و توانای داهێنان‌و متمانە بوون بەخود هۆکاری گەورەی سەرکەوتن بوون، وەك لە هەبوونی ماڵ‌و ڕۆشنبیری‌و ڕەوشتی جوان‌و وەجاغزادەیی. ڕۆشنبیری‌و سەقافەتە لێکجیاوازەکان لە ئەمریکا تێکەڵ بوون‌و ڕۆشنبیریەکی تازەی ئەمریکی لێ بەرهەم هات کە هەڵقولاوی شارستانی ئەوروپی بوو، بەلام لێی جیاواز بوو. شێوە کۆمەلایەتیەکان لەنێو خۆیدا کۆتایی پێ هات، بەلام بەچاوی دوژمنێکی سەرسەخت سەیری هیندیەسورەکانیان دەکردو زنجیەکانیان بەئاژەڵی دروستکراو بۆکار لەقالەم دەدا.

ئاکامی ئەم تێکەلاو بوونە سەرهەڵدانی هەستێکی نوێ بوو، کە بە واتای هەستکردن بوو بەنەتەوەیەکی نوێ‌و هەستکردن بوو بە سەربەخۆبوون لەئینگلتەڕای دایك. ئەم هەستە بەرەبەرە لەسەدەی هەژدە گەشەی کردو پەرەی سەند.

ئەمریکایەکان خۆیان بە ئەوروپی دەدایە قەڵەم لەڕووی ڕەگەزو زمان وشارستانیەتی، هەتا گەر لە ئەمریکاش لەدایکبوون ئەم هەستە هەرهەبوو، بەلام لەدوایدا جیاوازێکی ڕوون دەرکەوت، کە خۆی دەبینیەوە لەوەی کە ئەمریکایەکان بریتی بوون لە کۆچکردوانی دنیای نوێ‌و، ناچار بوون خۆیان بگوجێنن لەگەڵ بارودۆخی تازەو سەرەتایی. هەروەها پێویستبوو هەوڵ بدەن دوور لەشارستانیەتی ئەوروپی لەنوێی ولات بینا بکەن. بۆ بەدیهێنانی ئەمەش پێویستیان بە هێزو وزەو چاپوکی‌و داهێنان‌و ڕوبەڕوبونەوەی نەبوونی‌و نەداری هەبوو بەشێوەیەکی ئازایانەو بەردەوام لەسەرجەم زەوییە بەکارنەهاتوو چۆڵ‌و سەختەکان. کۆچکەران‌و وەچەکانیان ڕووەو خۆرئاوا وەرچەرخان‌و لەم کیشوەرە تەنها خاسیەتی سەرکێشی‌و جەربەزەییان لەگەڵ خۆیان هەلگرتبوو، هەرجارێکیش زیاتر بەرەو خۆرئاوا پەلیان دەهاویشت، پەیوەندی‌و پەیوەستیان بە ئەوروپاوە کەمتر دەبوویەوە. نیشتەجێگە کۆنەکانی ئەمریکا، گەرەکیان بوو زۆرخۆیان بەئەوروپا بچوێنن، وەلێ نیشتەجێگە نوێ یەکان دووردەکەوتنەوە لەمە. بەلام کۆچ کردنی بەردەوامی مرۆیی‌و مادی‌و شارستانی

لەئەوروپاوە، ئەم پەیوەست بوونەی تازە دەکردەوە. شارو دێهاتەکان بەئاراستەی خۆرئاوا بڵاو دەبوونەوەو بەردەوام ڕەوشتو سروشتو شێوازی گوزەرانیان لەگەڵ ژینگەی نوێ دەگونجاند. پاش هەموو ئەمانە هەستیان بەوەکرد کە هیچ پێویستیان بەوەنییە ئەوروپا دەست لەکاروباری وولآتیان وەربدات.

## ئابوری ئەمریکی:-

بەشێکی زۆری دانیشتوانی سێزدە ویلایەتەکان بەکشتوکاڵەوە سەرقاڵ بوون، بەلآم کشتوکاڵی ئەوێ جیاواز بوو لەو کشتوکاڵەی کە لەئەوروپا کاریان لێ دەکرد. لە ئەوروپا دەستی کار زۆربوو، بەلآم زەوی کەم بوو. بەپێچەوانەوە لە ئەمریکا ڕووبەرێکی بەرفرانی زەوی هەبوو، وەلێ دەستی کار کەمو دەگمەن بوو"کاتێ بەراوردی بکەی لەگەڵ ئەو هەموو زەوییە زۆرو زەبەندە". هەروەها کشتوکاڵ لەئەوروپا چالاکیەك بوو لەنێوان خاوەن زەویو جوتیاران، واتا پەیوەندیی نێوان خاوەن زەویو جوتیار، ئەمەش جیاوازییەکی قوڵی کۆمەلآیەتی بوو. ئەمە لەکاتێکدا ئەمریکا کۆچ کردووەکان گشتیان بێ ووچان لە بەرامبەر سروشت دا کاریان دەکردو هەوڵیان دەدا ڕامی بکەنو بەکاری بخەن. ئەو هەوڵو کۆششەش بوو بەهۆیەك بۆ زیادبوونی هەستی متمانە بوون بەخود لە ناویانداو نەمانی پەیوەندیان بە نیشتیمانی ڕەسەنی خۆیان لەئەوروپا. زەوییەکانی "نیوئایندگلاند" بە بەراورد لەگەڵ ویلایەتەکانی باشور بێ پیت بوو بەهۆی زۆری بەردو چەوی پەرشو بڵاوی سەر زەوییەکانو چیای سەختو ڕەقەن لەناوچەکەدا. بەلآم هەندێ بەشی خۆرهەلآتو ناوەڕاستی لەم شەقڵە هەلآوێر بوون. بەهەمانشێوە ڕووبارەکانی "نیو ئاینگلاند" لەبواری کەشتیوانی دا ناساز بوو، هەروەها هاوینی کورتو زستانی درێژخایەن بوو، ئەمەش کاریگەری لەسەر بواری ئابوریو کۆمەلآیەتی هەبوو. "نیوئایندگلاند" بەکەڵکی ئەوە نەدەهات کێڵگەی بەرفراوانی تیادا دامەبمەزرێندرێو بێگاری تێدا ئەنجامبدرێو زەنجیەکانی تێدا بخرێتەکار، بەڵکو ئەم

ناوچەیە گونجاو بوو بۆ دامەزراندنی کێڵگەی بچوك کە خاوەندارییەکی بچوك خاوەنیەتی بکاتو پێیەوە سەرقاڵ بێت. بەلام خۆ وەنەبێ "نیوئایندگلاند" بێ پەروا مابێتەوەو بێ بەرهەم بووبێت، بەڵکو لەکایەی تردا ئەو کەمو کورپیەی قەرەبوو دەکردەوە. "نیوئاینگلاند"بە ناوچە بەرفراوانە دارستانیەکانی پاڵی دەنا بە دانیشتوانەکەی کە خۆیان سەرقاڵی پیشەسازی تەختە بکەن، وە هەر بەتەختەکانی پیشەی کەشتی سازی بەرەو پێشەوە بەرن، هەروەك هۆیەکیش بوو بۆسازکردنی بەرمیلو کەندو کە جوتیارانی توتنو شەکر پێویستیان پێی هەبوو. هەروەها ڕاوکردنی ماسی ببوو بە پیشەیەکی بەرمێن لە نیوئاینگلاندو هەر لەوێوە بڕێکی زۆری ماسیو ڕۆنی جگەری نەهەنگ بۆ ئەوروپا هەنارده دەکرا. لەمەوە نیوئایگلاند بە پیشەسازیو بازرگانی ناوبانگی دەرکردو پشتی نەدەبەست بە خستنەکاری کۆیلەو چالاکی کشتوکاڵی.

وەلێ "دیلاویر"و شوێنەکانی تر بەپیت بوونو ناوچەیەکی خاکین بوونو بەهۆیەوە دەستکەوتیان دەبەخشی. جگە لە "دیلاویر" هەریەکە لە ناوچەکانی "نیۆرکو پەنسلڤانیاو نیوجیرزی" لەسەر پشتێنەیەکی فراوان چالاکی کشتوکاڵیان ئەنجام دەدا. ئەم ناوچانە کشتوکاڵیان دەکرد بەشێوەیەك کە زۆر زیاتربوو لەبەپیترین ناوچەی نیوئایینگلاندو زیاتر لەخۆیان بەرهەمیان دەدا. خەڵکانی ئەو ناوچانە بڕێکی زۆری دانەوێڵەو گۆشتیان بەرەو ئەوروپاو دورگەی هیندی خۆرئاوا دەنارد.

ویلایەتەکانی باشور ئەگەر باسیان بکەین دەتوانین بڵێین: کە ئەو ناوچانە لە سەدەی حەڤدە کێڵگەی فروانیان تیادا نەبوو، چونکە لەم کاتەدا ئەمە بەرمێنو قازانج نەبوو. هۆکاری دانەمەزراندنی کێڵگەی فراوانیش کەمی دەستی کار بوو لەم کاتەدا. کرێکارانی کێڵگەکان لەم کاتەدا لە سپیەکان بوونو ئەوانەبوون کە هاتبوون بۆ ئەمریکا بۆئەوەی ببن بە خاوەنی زەوی، بەلام کرێی ڕێگە ئەوانی قەرزاربار کرد بوو، بۆیە لەسەریان پێویست بوو کاربکەن تاوەکو قەرزەکان بدەنەوە. جا بەتێپەڕینی کات

ئەوان قەرزەکانیان دایەوەو بوونە خاوەنی زەوی بچوك. وەلێ بە داهاتنی سەدەی هەژدە ڕەوشەکە گۆڕانی زۆری بەسەردا هات. لەم سەدەیەدا بۆ ئەوەی زەوی پڕ قازانج بێت پێویست بوو دەستی کاری هەرزانی بۆ دابین بکرێ، بەلاّم ئەم جارە ئەو دەستی کارە لەئەوروپا نەدەهات، بەڵکو لەئەفریقاوە هاوردەکرا. بازرگانی کۆیلە لەنێوان ئەفریقاو ئەمریکا بووە پرۆسەیەکی زۆر پڕ قازانج و خاوەن کێڵگە فراوانەکان ژمارەیەکی زۆری کۆیلەیان لە کێڵگەو لە کاری کشتوکاڵی دا خستەکار. ئابوری کشتوکاڵی لەباشوردا هۆیەك بوو بۆ زاڵ بوونی گەورە خاوەن کێڵگەکان بەسەر لایەنی سیاسیو کۆمەلاّیەتیدا. فەلسەفەی سیاسیو کۆمەلاّیەتیش جەختی دەکردەوە لەسەر بەکارهێنانی کۆیلە لە کاری کشتوکاڵی، کشتوکاڵیش خۆی دەبینیەوە لە لۆکەو توتن، پاشان ئاڵوگۆڕی ئەم بەرهەمانە بە بەرهەمی پیشەسازی. ئیدی لێرەوە جیاوازی قوڵی سیاسیو کۆمەلاّیەتی لەنێوان باکورو باشور دەرکەوت، کە دواتر جەنگی ناوخۆیی لێ کەوتەوە.

کشتوکاڵو ئامرازەکانی کشتوکاڵ لەم کاتەدا واتا لەساڵی1750 سەرەتایی بوون. لەئەمریکاش هەمان ئەو میکانیزمانە دەگیرانە بەر کە لەئەوروپای پێش شۆڕشی پیشەسازی دەیانگرتەبەر. پشتبەستن بە ئەستێرەو بورجو مانگ بە مەبەستی زانینی کاتی چاندنو دروێنە تاکە ڕێگە بوو لەکاتێکدا ڕۆژمێر دەگمەنو جێگای پشت پێ بەستران نەبوو، هەواڵزانی لە بارەی کەشو هەوا لە ئارادا نەبوو.

کشتکاری ئەمریکی خۆبژێوی پەیڕەو دەکرد. ئەم لەکاتێکدا هەڵدەستا بە کاری چاندنو دروێنەکردنو چاودێری کردنی کشتوکاڵەکەی، لەهەمان کاتیشدا پێویستیو پێداویستیەکانی پۆشاكو کەلوپەلی ناوماڵی دروستدەکرد، هەندێ جاریش گەر لێی زیاد بووایە ئەوا دەیفرۆشتەوە ئەگەر هاتباو پیشەسازێکی لێزان بووایە لە کارەکەی.

ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی نیشتەجێگەکان جگە لە کشتوکاڵ بە پیشەی تریشەوە خەریك بوون، وەك: ماسیو نەهەنگو بڕینی داری دارستانەکان بۆ بازرگانیو

کەشتی سازیو کاری بازرگانیو پیشەسازیەکانی تر. ناوچەی نیوئاینگلاند ناوبانگی دەرکرد بە زۆری دروستکراوەکانی. ئابووریە پیشەوەریەکەی زۆر زیاتر بوو لە کشتوکاڵ، لەکاتێکدا ناوچەی نیویۆرك تاوەکو باشور بەندەری گونجاوی تێدا هەڵکەوتبوو بۆ لەنگەری کەشتیو ڕاوە ماسی. بەڵام باشوری ویلایەتە یکگرتووەکان سەرقاڵ بوون بە کشتوکاڵ، لەمەشدا کۆیلەیان دەخستە کار. ویلایەتی فەرجینیاش زۆرتر خەریکی کشتوکاڵی توتن بوو، کارۆلینیای باشورو باکورو جۆرجیاش بە برنج بە ناودێر بوون. شاری "جیمس تاون" هۆڵندیو پۆڵۆنیو ئیتاڵی تێدابوو، کە کۆمپانیای لەندەن هێنابوونی بۆ مەبەستی بەرهەمهێنانی قیڕ وزەفتو بوتاس پیشەی ئاسنسازیو شوشەسازی. بەڵام ئەمانە ژیانی خۆیان بەزەحمەت دەبینی وایان هەستکرد کە تونای بردنە سەری ژیانیان نییە لەنیوان ئینگلیزو هیندیە سورەکان، لەبەرئەوە ناوچەکەیان جێهێشت. فەرجینیاش وەك ناچەیەکی کشتوکاڵی مایەوە.

هەرچەندجارێك کشتوکاڵو پیشەسازی نیشتجێگە ئەمریکیەکان پێش دەکەوت، پشت بەستن بە بازرگانی ئینگلیزی کەم دەبوویەوە، لەئاکامی ئەمەشدا حکومەتی ئینگلیز هێنانی شتومەکی ئینگلیزی بەسەر ئەمریکەکاندا فەرز کرد. وە هەرچەندە پیشەسازی ئەمریکی پێش دەکەوت، ویستی ڕزگاربوونی ئابووریو سیاسی لەدەستی ئینگلیزی زیاتر دەبوو. بازرگانی کەوڵو پێستەی ئەمریکی لەگەڵ ئەوروپا پڕ قازانج بوو. لەم میانەدا کۆچکردووە پێشینەکان لە کاری بازرگانی کەوڵو پێستە سودی باشیان دەبینی. بۆ یەکەمجار ئەم بابەتە لە ساڵی 1621 بەرەو ئەوروپا هەناردە کرا. نیشتەجێ بووە یەکەمینەکان لە نیوئینگلاند کەوڵو پێستەیان لە هیندیە سورەکان دەستدەکەوت، ئەوان لەبەرامبەر ئەمەدا پۆشاكو چەقۆو نقێمو مورووو ویسکیان پێشکەش دەکردن. ئەمان بەهۆیەی ئەمەوە قازانجێکی زۆریان دەستکەوت. کەوڵو پێستە بەنرخی "30" هەزار باوەندی ئیستریلینی لە بەندەرەکانی کارولینیای باشورەوە ساڵانە دەنێردارا ئەوروپا.

کاتێك دانیشتوان دای لەزیادی کەوڵ کەم بوویەوە، بازرگانان بۆ گەڕان بەدوای پێستە دەچوونە خۆرئاوا. لەوێش بەهۆی تێکگیرانیان لەگەڵ فەڕەنسیەکان جەنگی فەڕەنساو ئینگلتەڕا هەڵگیرسا. لەڕاستیدا جەنگی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە چاوەڕوانکراو بوو ئەم تێکگیرانەش بووە هۆیەك بۆ زیاتر خۆشکردنی جەنگی نێوانیان. ئەوە لەکاتێدا کە بازرگانی کەوڵ وپێستە بەرەو کۆتایی دەچوو، کەچی بوویە هۆی ڕودانی جەنگ.

نیوئاینگلاند دارستانی چڕوپڕی هەبوو دانیشتوانەکەی سودیان لێی دەبینی. دارە بڵندو بەرزەکانیان دەبڕیو بەهۆیەوە پیشەسازی تەختە گەشەی کردو بەرەوئینگلتەڕا بەڕێخرا، کە لەم کاتەدا ئینگلتەڕا پێویستی بەتەختە هەبوو بۆ بواری کەشتی سازی. بەهەمانشێوە نیشتەجێگە ئەمریکایەکانیش پێویستیان بەتەختە هەبوو بۆ مەبەستی بیناکردن، هەروەها بۆ دروستکردنی فارگۆن "گالیسکە"و کەلوپەلی ناوماڵو هەناردەکردنی بۆ دەرەوە.

بەهۆی زۆری دارودرەخت لایەنی کەشتی سازی لە"نیوئاینگلاند" گەشە سەندنی بەخۆیەوە بینی و، ئەوە بوو یەکەم کەشتی لەساڵی 1635 دروستکرا بەناوی کەشتی "وێنسروب" حاکمی مساچوسێت. بەرەبەرە کەشتی سازی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیو لە ماوەیەکی کەمدا ڕۆخی ئاوەکان قەرەباڵغ بوون بەکەشتی. ڕاوکردنی ماسی هۆیەك بوو بۆ گرنگی دان بەدروستکردنی کەشتی، هەروەك یاسای کەشتیوانی ئینگلیزی کە لە سەردەمی "کۆڕمۆویلو چارلسی دووەم" دەرچوو بەهەمانشێوە ڕۆڵی هەبوو لەپێشخستنی ئەم پیشەسازیە، کەجەختی دەکردەوە لەسەر بازرگانی کردن لەسەر پشتی کەشتی ئینگلیزیو داگیرگەکانی. ئەوبوو کەشتی سازی لەساڵانی1700-1735گەیشتە چڵەپۆپە. گەشەکردنی کەشتی سازی پێشکەوتنی بەخشی بەڕاوکردنی ماسی بەشێوەیەك داهاتی ڕاوکردنی ماسی لەساڵی1760 گەیشتە ملیۆنێك دۆلار.

پیشەسازی ئاسن یش– شان بەشانی ئەو بوارانەی ئاماژەمان پێدا گەشەی کرد. وە بەهۆی هەبوونی خاوی ئاسن‌و خەڵوز لە"فێرجینیا" تاوەکو "نیوئاینگلاند" ئاسنسازی لەهەموو نیشتەجێگەکان پەرەی سەند. لەسەرەتادا ئاسنی نەرم دەنێردرا بۆ ئینگلترا، بەڵام بەتێپەڕینی کات پێویستی ناوخۆیی ئەم هەناردە کردنەی ڕاگرت. ئیدی ئەوان ئاسنیان بەکاردەهێنا بۆ تۆپ‌و ئامرازەکانی کشتکاری‌و ئەو ئامێرو ئامرازانەی کە لەپیشەسازی کەشتی دا بەکار دەهات. ئەم پێشکەوتن‌و پەرەسەندنانە ئینگلترای بەشێوەیەك هەراسان کرد، کە لە ساڵی1750 پەرلەمان یاسایەکی دەرکردو، تیایدا هانی خاوەن کارگەکانی دەدا ئاسنی نەرم بەرهەمبێنن بۆ بەکارهێنانی لەبریتانیا، وە ڕێگریشی دەکرد لە بەکارهێنانی لە پیشەسازییە ناوخۆییەکانی ئەمریکا. بەڵام کارخانە ئاسنیەکان بەردەوام بوون لە بەرهەمهێنانی ئاسن بۆ پیشەسازی ناوخۆیی، سەرەڕای ئەو کۆت‌و بەندانەی خرابووە سەریان.

چالاکی بازرگانی لەنێوان ویلایەتە یەکگرتوەکان‌و ئەوروپا گەرم وگوڕی تێکەوت. دەرفەتێکی گونجاو ڕەخسابوو بۆ بازرگانان بەوەی کە دەستکەوتی زۆر وەچنگ خۆیان بخەن لە بازرگانی نێوان ئەمریکاو ئەوروپا. ئەمەش بە هەناردەکردنی دانەوێڵەو گۆشت‌و دارو تەختەو ماسی و، هاوردەکردنی کەلوپەلی ئەوروپی‌و ئینگلیزی‌و پێویستیەکانیان لە ویسکی‌و میوە پڕ دەکردەوە. لەم هێنان‌و بردنەشدا قازانجی زۆرییان دەستگیر دەبوو. ئەوان جگە لەم بازرگانیە، بازرگانیان لەگەڵ هیندی خۆرئاواش دەکرد، ئەمەش بۆ دەستکەوتنی شەکرو بەرهەمی ناوچەکانی هێڵی یەکسانی. بازرگانی نێوان ویلایەتەکانی باشورو بەریتانیا زۆر زۆر زیاتر بوو لەنیشتەجێگەکانی تر، بەهۆی پێویستی بەریتانیا بۆ بەرهەمی کشتوکاڵی لەتوتن وبرنج ولۆکەو...هتد، لەملاشەوە ویلایەتەکانی باشور پێویستیان بە کاڵای ئینگلیزی بوو بەهۆی نەبوونی پیشەسازی لەباشور. بەرهەمی پیشەسازی ویلایەتەکانی باکور وەك نیوئاینگلاند کێبڕکێی دەکرد لەگەڵ کاڵاکانی ئینگلیزی، کە کاری کردە سەر بازرگانان

وپیشەسانی ئینگلتڕا، کە دواتر تێکگیرانی نێوان ئینگلتەڕاو نیوئلاینگلاندی لێ کەوتەوە. شیاوی باسە هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ لێکچونی ئاووهەوای هەردوو ناوچەکە "ئینگلتەڕا-نیوئاینگلاند"، ئەمە لەکاتێدا ئاوهەوای باشوری ویلایەتەیەکگرتوەکان زۆر جیاواز بوو لەئاووهەوای ئینگلتەڕا. لەلایەکی تریشەوە ئابوری هەردوو ناوچەکە لەیەکتری جوێ بوو. جا لەبەرئەوە بازرگانی نێوان ویلایەتەکانی باشورو ئینگلتەڕا پڕقازانج بوو.

## پەیوەندیەکانی ئینگلیزی وئەمریکا لە پێش شۆڕش:-

کۆچکردووەکانی ئینگلیزی لەئەمریکا کەلتورو کەلەپوری ئینگلیزیان لەسەربوو لەڕووی سیاسیو ئابووری. ئەرستۆکراتە ئینگلیزەکان لەئەمریکا کێڵگەی فراوانیان دادەمەزراندو لەولاتی خۆشیاندا پیادەی دەسەلاتیان دەکرد. ئەمانە ئەندامی پەرلەمان بوونو یاسایان دادەڕشت، یاخود فەرمانبەری بەرزبوون لە دەوڵەتداو خاوەنی شارەزاییەکی زۆری کایەی سیاسیو کارگێڕی بوون. لەهەمان کاتیشدا پیۆریتانە توندەکان کۆچیان کردە نیوئاینگلاندو لەگەڵ سروشتی ڕەقی ئەم ناوچەیە ڕووبەڕوو بوونەوەو تێدەکۆشانو بەرنگاری برسیەتیو نەخۆشیو زستانی ساردو سەختیان دەکردو لەگەڵ دۆستانیان لەئینگلتەڕا لەخەبات دابوون لەدژی پاشایەتی خۆسەپێن تاوەکو ئەوساتەی مافەکانیان لەئازادی پەرستشکاریو گوزەرانێکی ئاسودە بەدەست دەهێنا. بەڕاستی سەرکەوتنی پەرلەمانی ئینگلتەڕا سەرکەوتن بوو بۆ دانیشتوانی نیشتە جێگەکانی ئەمریکا.

کاریگەری حکومەتی ئینگلیزی لەسەر ئەمریکا کۆتایی نەهات. حکومەتی ئینگلزی بەربژاری دەبەخشی بەدامەزرێنەری نیشتەجێگە لەئەمریکا. هێزی دەریایی ئینگلیزی بەرگری لێدەکردن لەدژی دوژمنانیانو دەیپاراستن دنەی بازرگانی دادەو یاریدەی

چالاکی ئابووری دەدا لەنیشتەجێگەکان، لەکاتێکدا نیشتەجێگەکان پێویستیان بەم هاوکاریە بوو.

سیستەمی سیاسی لەنیشتەجێگە ئەمریکیەکان لەیەك دەچوو بەڵام وورده کاریەکان لەیەکترجوودا بوو. لەهەموو نیشتەجێگەکان چڤاتی یاسادانانو ئەندامانیان لەلایان دانیشتوانەوە ئەوانەی کە خاوەنی زەوی بوون یاخود باجیاندەدا لەنێرینەکان هەڵدەبژێردران. شاهانەی ئینگلیز تارادەیەك لەم چڤات وکۆمەڵانە مەترسی هەبوو، جابۆ ئەوەی ئەم چڤاتانە کۆت بکات، پەنای بردە بەر بەموڵك کردنی نیشتە جێگەکان، بەمەش دەسەڵاتی جێبەجێکردنی گوسترایەوە بۆ حاکمی گشتی ئەمیش لەلایان پاشاوە دیاری دەکرا. بەڵام ویلایەتی "ڕود ئاینلاندو کناتیکت" لەمەدا هەڵاوێر بوونو خۆیان کۆمەڵەو بەڕێوبردنی خۆیان هەڵدەبژراد تا ئەو کاتەی ئەمریکا سەربەخۆیی بەدەست هێنا. ئیدی لەم گۆرانو بێنەو بەردەیەدا داگیرگەی ئینگلیزکان لەئەمریکا لەڕووی سیستەمی دەسەڵاتەوە سێ شێوەی لێ دروست بوو، کە بریتی بوون لە:

1–حکومەتی ئینگلیزی حاکمی گشتی دیاری دەکرد بۆ داگیرگە، کەنوێنەری پاشایی ئینگلیزی بوو.

2–بەرژەوەندی بازرگانی نێوانی بەڕێوبەرایەتی داگیرگەو ئینگلتەڕای دەکرد.

3–ئەنجومەنی نوێنەران پیادەی دەسەڵاتی خۆجێی دەکرد.

بە پلەی یەکەم حاکمی گشتی لەپیاوانی سیاسی دادەنرا، دواتر یائەوەتە کەسانی سوپایی بوو یاخود کەسانی یاساناس بوون، وە بەشێکیان بەتوانا بوون وە هەندێکیان چاوچنۆكو چڵێس بوون. وە لەناو ئەوانەدا هەبوو تەنها گرنگی دەدا بەخەزن کردنی سەروەتو سامان. "سێر ولیەم بیرلکی" بۆ ماوەی سی ساڵ حاکم بوو لەڤێرجینیا. "بیرکلی" لەحاکمێکی بەڕێزو هەڵبژێردراوەوە گۆڕا بۆ حاکمێکی خۆسەپێنو زۆردار، ئەمەش کاتێك ڤەرجینیا بوو بەداگیرگەیەکی پاشاییو لەساڵی1676 شۆرشی تیادا هەڵگیرسا. بەشێوەیەکی گشتی دەسەڵاتدارەکان سودمەند بوون لەدەسەڵاتی

فراوانیـان، تەنانـەت دەسـەلاّتی لەسـێدارەدانو هەلّوەشـاندنەوەی چـڤاتی یاسـادانانو هەلّپەساردنی هەبوو. لەوێدا ئەنجومەنی جێبەجیّ کردنو ڕاوێژکاری هـەبوو، ئەنـدامانی لەو کەسانە بوون کە دەسەلاّتداربوونو دەیانتوانی فشار بخەنە سەر چڤاتی یاسادانان. بەلاّم هەرچۆنێك بێت چـڤات چـونکە بـواری دارایـی لـەژێر دەسـەلاّت بـوو هێـزی خـۆی پاراسـت. داگیرگـە ئینگلیزیـەکان لـەپێش شـۆڕش توانیـان تاڕادەیـەك سـەربەخۆیی بەدەست بهێنن. ئەم داگیرگانە بەرەبـەرە ئـەزموونیان لەبـەڕێوەبردنو بـواری سیاسـی بەدەستیان هێنا. ئەوانە پێویستیان بەهاوکاری یـەکتری هـەبوو، لەبەرئـەوە بەیەکـەوە کۆدەبوونـەوە بـۆ گفتوگـۆکردن سـەبارەت بەکێـشەو ئاسـتەنگەکانو هەولّـدان بـۆ چارەسـەرکردنیان. مەترسـی هیندیـە سـورەکان لەسـالّی1643 وای کـرد ویلایـەتی "ماساچوسێتو کنانتیکتو تیوهافتن" لەیەکتری نزیك ببنەوە بەمەبەستی پێك هێنـانی یەکیەتی نیوئاینگلاند. بەهەمان شێوە مەترسی هیندیە سورەکان پالّی نـا بـەڤێرجینیا کـە پارێزگـاری لـە کارولینیـا بکـات. سـا کـاتێکیش مەترسـی نـەما، یەکیـەتیو هاوپەیمانیەتی کۆتایی پێهات. مەترسی هیندیە سورەکان نەگەڕایـەوەو کۆتـایی هـات، بەلاّم ئەمجارە داگیرگەکان مەترسی ولاّتانی ئەوروپایان کەوتە سەر.

### جەنگی ئۆکسبرگ 1689-1697 :-

کاتێك لۆیسی چواردە جـەنگی لەبەرامبـەر ئیمپراتۆریـەتی پـیرۆز ڕاگەیانـد، ولاّتـانی ئەورووپی بەیەکەوە لەدژی لۆیس کۆبونەوە. شاولیەمی سێیەم کە دوژمنی سەرسـەختی لـۆیس بـوو، چـووە پـالّ هاوپـەیمانان. ئـەم جەنگـە لەئـەمریکا پێـچەوانە بوویـەوەو بەجەنگی شا ولیەم ناسرا. فەرەنسیەکان بـە هاوپەیمانیـەتی لەگـەلّ هـۆزە هیندیـەکان لەکەنـەدا هێرشـیان کـردە سـەر نیـشتەجێگە ئینگلیزەکـان لەئـەمریکا. لـەم نێوانـە هێرشـیان کـردە سـەر نیویـۆركو مـساچوسێت ومـین. ئینگلیزەکـانیش لەبەرامبـەردا

هەڵمەتێکیان ڕێکخستو هێرشیان کردە سەر فەرەنسیەکانو دەستیان گرت بەسەر بورتو ڕیاڵ، بەڵام شکستیان هێنا لە دەستگرتن بەسەر کیوبکو مۆنتریاڵ.

## جەنگی ویراسەی ئیسپانی 1702-1713:-

جەنگی ولیەمی سێیەم لەنێوان ئینگلیزو فەرەنسیەکان لەئەمریکا نەگەیشت بەئاکامێك، بەڵام چالاکی لەنێو دانیشتوانی نیشتەجێگەکاندا زیادکرد بۆ دەرخستنی گیانی نیشتیمانیو هاوکاری کردن لەجەنگدا. کاتێکیش جەنگی ویراسەی ئیسپانی دەستی پێکرد، پاش کەمێك لەئەمریکا بە جەنگی "شاژن ئان" ناسرا. فەرەنسیەکان لەگەڵ هیندیەسورەکان هاوپەیمانیەکی تازەیان پێك هێنا لەدژی ئینگلیز. ئینگلیزەکانیش سوپایەکیان وەڕێخست بۆ هێرش کردنە سەر پێگە گرنگەکانی فەرەنساو قەلاکانیان. میلیشیای نیوئاینگلاندیش توانی جارێکی تر دەست بگرێ بەسەر بورتو ڕیاڵ لەکەنەداو تا کۆتایی جەنگیش توانی لەژێردەستی خۆیدا بیهێڵێتەوە. ئیسپانیەکان بوونە هاوپەیمانی فەرەنساو لەشکریان کردە سەر کارۆلینیا. جەنگی شاژن ئان بە پەیمان بەستنی ئەترێخت کۆتایی هات. بەگوێرەی پەیمانەکە ئینگلیزەکان زەوییەکی زۆریان خستەسەر ئیمپراتۆریەکەیان لەئەمریکاو توانیان ئارکاردیا دەست بخەنو پاشان ناوی بنێن "نوڤاسکوشیا"، هەروەها نیوفاوندلاندو ناوچەی کەنداوی هندسن لەکەنەدا کەوتەدەستیان. بەمەش لۆیسی چواردە زۆرترین بەشەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی لەئەمریکای باکور لەدەستدا.

## جەنگی ویراسەی نەمساوی 1740-1748:

لۆیسی چواردە ئەوەی کە بۆی مابوویەوە لەداگیرگەکان، لە جەنگی ویراسەی نەمساوی لەدەستی دا. ئەم جەنگە لە ئەمریکا بەجەنگی شا جۆرجی یەکەم ناسرا بوو. ئینگلیزەکان بەهۆی کێبڕکێی داگیرکاری، خۆیان لەم جەنگە ئالاند. هەڵمەتێکی نیوئاینگلاند دەستی گرت بەسەر قەلای لویس برگ لە دورگەی ( کاب بریتۆن) کە ئەم

جێگەیە پەنایەك بوو بۆ چەتەو جەردەكان كە ناوبەناو هێرشیان دەكردە سەر بازرگانانی نیوئاینگلاند. بەڵام كاتێك جەنگ كۆتایی هات، ئەم دورگەیە گەڕایەوە بۆ ژێردەستی فەرەنسا، ئەمەش بوویە هۆی پەستیو دڵگران كردنی دانیشتوانە ئینگلیزەكان لە نیوئاینگلاند.

## جەنگی حەوت ساڵە:-

هێشتا جەنگی شا "جۆرجی دووەم" دەرەنجامی دەرنەكەوت بوو، جەنگی دووەمیش لە ئاسۆدا دەركەوت، بەتایبەت كاتێك داگیرگە ئەمریكیەكان ناچاركران ئەو زەویانە بگێڕنەوە كە دەستیان بەسەریدا گرتووە. لەگەڵ ئەوەی ئینگلیزەكان ژمارەیان لە ئەمریكا زیاتر بوو "لە كەنەداو هەندێ بەشی ئەمریكا"، بەڵام لەكاتێكدا ئینگلیزەكان لە نیشتەجێگەكان سەربەخۆ بوون، هەریەكەیان بەڕێوبەرایەتی تایبەتی هەبوو. داگیرگە فەرەنسیەكان بەشێوەیەكی ناوەندی بەهێز بەڕێوە دەبران. ئینگلیزەكان هەوڵیاندا پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ هیندیەسورەكان ببەستنو شێوەیەكیش لە یەكیەتی نێوان نیشتجێگە ئەمریكیەكان ساز بكەن. لەساڵی 1754 حكومەتی ئینگلیز داوای لە نوێنەری نیشتەجێگە ئینگلیزەكان كرد، كە كۆنگرەیەك ببەستن لە "ئەلبانی" نزیك نیویۆرك. نوێنەران لە"میری لاندو پەنسلڤانیاو نیویۆرك"و نیشتەجێگەكانی نیۆئینگلاند بەدەم داواكەی حكومەتەوە چوون. مەبەستی ئەم كۆنگرەیەش پێكهێنانی شێوەیەك بوو لە یەكیەتی كۆنفیدڕاڵی لە نێوان نیشتەجێگە ئینگلیزەكان لە ئەمریكا، وە بەیەكەوە پارێزگاری كردن لە خۆیانو لە بەرژەوندیەكانیان لە كاتی جەنگو ئاشتی.

ئەندامان لەسەر ئەوە یەك ڕابوون كە یەكیەتی پێویستیەكی سەرەكیە. "بنیامین فرانكلین" نەخشەیەكی بۆیەكگرتنی داگیرگە ئەمریكیەكان لەژێر دەسەڵاتی سەرۆكی گشتیو ئەنجومەنی یەكیتی پێشكەشكرد، بەمەبەستی تەیاركردنی سوپایەكی

سیستماێکو کۆکردنەوەی باجو قەڵەمڕەوی کردن بەسەر سەرزەمینەکانو زامنکردنی پەیوەندی لەگەڵ هیندەسورەکان. لەگەڵ ئەوەی ئەندامانی کۆنگرە ڕەزامەند بوون لەسەر ئەم نەخشەیە کە ناسرابوو بە پرۆژەی ئەلبانی. بەڵام حوکومەتە خۆجێیەکانی ویلایەتەکان نەیاندەویست دەستبەرداری دەسەڵاتو سەربەخۆییان بن. لەملاشەوە حکومەتی لەندەن لەم پرۆژەیە مەترسی هەبوو، پێی وابوو کە زیان دەگەیەنێ بە بەرژەوەندی پاشایەتی. گەلو نەتەوەو خەڵکانی داگیرگەکان بەگەرم وگوڕییەوە وتوێژیان دەکرد لەسەر ئەم پرۆژەیەو یارمەتی پێکهێنانی یەکیەتیاندا.

بە دووساڵ پێش هەڵگیرسانی جەنگ لە ئەوروپا، لە ئەمریکا جەنگ هەڵگیرسا. دروستبوونی جەنگ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە "جۆرج واشنتن"ی ئەفسەری ڕووپێوی تەقەی کرد لە کۆمەڵێك فەرەنسی لە"پەنسلڤانیا". ئەم کارە مێژووی ئەم ناچەیەی گۆڕیو بوو بەهۆی سەرهەڵدانی جەنگ لە ئەوروپا پاش دوو ساڵ لەئەنجام دانی. ئەم جەنگە جیاوازە لەگەڵ جەنگەکانی تر، کاتێك دەبینین جەنگەکانی پێشوو تر لە ئەمریکا، ڕەنگادانەوەی جەنگەکانی ئەوروپا بوو، بەڵام جەنگی حەوت ساڵە لە ئەمریکاو لەساڵی 1754 سەرهەڵداو بەجەنگی فەرەنسیو هیندیەکان ناسراو تاساڵی 1763 بەردەوام بوو. ئەم جەنگە کاتێ دەستی پێکرد کە فەرەنسییەکان ژمارەیەك قەڵاو بورجیان لە دۆڵی ڕوباری "ئۆهایۆ" بنیاتنا، ئەمەش هەرەشە بوو لەسەر پێشڕەوی دانیشتوانە ئەمریکیەکان ڕووەو خۆرئاوا.

لەبەرئەوە ئینگلیزەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم مەترسیە پێشڕەویان کرد. سەرکەوتنی هیندیە سورەکان بەسەر جەنەراڵ "ئیدوار برادۆك"و سوپاکەی کە ڕانەهاتبوون لەسەر جەنگکردن لەگەڵ هیندیەسورەکان لە جەنگەڵەکان، پێشڕەوی ئینگلیزی ڕاگرتو دوودڵی وگومانیشی خستەدڵو بیری خەڵکی لەمەڕ لێوەشاوەییو تواناداری سوپای ئینگلیزی لەئەمریکا.

سەرکەوتنی سوپای فەڕەنسیەکان بەسەر ئینگلیزەکان بەدوای یەکدا دەهات، ئەمەش کاتێك سوپاسالاری فەڕەنسی "مونتکالم" پەیوەندی پێوەکردن. لەملاشەوە تێکشکان لەدوای تێکشکان بەشی سوپای ئینگلیزی بوو. بەڵام بارودۆخ گۆڕانی بەسەرداهات کاتێك "ولیەم پیت" کابینەی نوێی ڕاگەیاند"بووبە سەرۆك وەزیران". ولیەم پیت وای بینی کە ئەم ململانێیەی نێوان ئینگلتەڕاو فەڕەنسا لە جوغزی دامەزراندنی ئمپراتۆریەت دەسوڕێتەوە لەسەرپاکی جیهان، لەبەرئەوە بڕیاریدا داهاتو سامانو وزەو توانای ئینگلیز بۆ ئەم ئامانجە بخاتەگەڕ. جاکاتێك جەنگی ئەورووپی جێهێشت بۆ هاوپەیمانەکەی فریدریکی گەورەی پاشای پرۆسیا، هێزو کۆششی خۆی تەرخان کرد بۆ جەنگان لە ئەمریکا. ئیدی ئینگلیزەکان ڕووەو سەرکەوتن هەنگاویان نا. لەم نێوانەدا سوپای ئینگلیز دەستیگرت بەسەر "لویزبرگ" وژمارەیەك قەڵای فەڕەنسیەکانی لەناوچە ئاویە گەورەکانو دۆڵی ڕوباری ئۆهایۆ خستە ژێر ڕکێفی خۆی.

لەساڵی 1759 سوپاسالاری ئینگلیز "وۆلف" لەگەڵ 4500سەرباز ڕووەو شاری کیوبك پێشڕەوی کردو لە دەشتی ئابراهام"تەختایی ئابراهام" گەیشت بەسوپای "مونتکالیم"ی– فەڕەنسیو لەجەنگێکی یەکلاکەرەوەدا ئینگلیزەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێناو بەهۆیەوە ڕۆڵی فەڕەنسا لەئەمریکا کۆتایی پێهات. بەڵام لەم جەنگەدا "مۆنتکالیم" تێکشکانی سوپاکەی نەبینی، هەروەك چۆن "وۆڵف" سەرکەوتنی نەبینی، بەهۆی ئەوەی هەردووکیان لەجەنگەکەدا کوژران. فەڕەنسیەکان توانیان ئیسپانیەکان والێبکەن خۆیان بخەنە جەنگەوە، کە لەئاکامدا ئیسپانیا زۆر لەزەویەکانی لەئەمریکا لەدەستچوو ئینگلیز دەستی بەسەرداگرت.

پاش ئەم سەرکەوتنانەی ئینگلیز، پەیمانی پاریس لەساڵی1763 هاتەگۆڕیو بەپێی ئەم پەیمانە کۆتایی بەجەنگ هاتو ئیسپانیا ناچار بوو دەستبەرداری فلۆریدا بێت بۆ بەریتانیا، هەروەك فەرەنساش دەستبەرداری کەنەداو دۆڵی ڕوباری میسیسی بوو جگە لە نیوئۆرلین نەبێت لە ڕێژگەی ڕوبارەکە. ئیسپانیاش لەبەرامبەر ئەوەی کە

بەلای فەرەنسادا چوبوویە نێو جەنگ هەرێمی لیوزانای لەفەرنسا سەند. لەدوای ئەمانە جگە لەهەندێ دورگەی نزیک "نیوفاوندلاند" لە ئەمریکا هیچی تر بۆ فەرەنسا نەمایەوە، جگە لەوەی کە لەدەریای کاریبی "نیوگینیای" لە ئەمریکای باشور لەژێر دەسەلاتدا مایەوە.

بەریتانیا لەم جەنگەدا گیانو ماڵێکی زۆری بەهەدەرداو قەرزی نیشتمانی گەیشتە 140000000 ملیۆن پاوەندو پێویست بوو لەسەر گەل ئەم قەرزە هەڵبگرێت. حکومەتی ئینگلیزی هەستیکرد کە سەپاندنی باجی نوێ بۆتە پێویستیەکی زۆر پێویست، بەتایبەت کاتێ ئەم جەنگە بۆ سودی دانیشتوانی ئینگلیز لە ئەمریکاو بۆ سودی ئینگلتراو پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان ڕاگەیەنرا، هەروەها ئەوەشی دەزانی کە دانیشتوانی ئەمریکا وەك جارانی پێشوو هەژارو کەم دەرامەت نین.

ژمارەی دانیشتوانی ئەمریکا لە ساڵی 1763 گەیشتبووە 12500000 کەس. ئەم زیادبوونە بەرچاوەی دانیشتوان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کۆچکردنە زۆرەی کە لە سەدەی هەژدە ڕوویدا. زۆرێك لە ئەڵمانو سکۆتلەندیو ئیرلەندی سویسری کۆچیان کرد بەمەبەستی دەستپێکردنی ژیانێکی نوێ لە ئەمریکا. شارەکان سیخناخ بوون بە خەڵك، کە پاڵی نا بەخەڵکی ڕوو بکەنە خۆرئاوا. نیشتەجێکە ئەمریکیەکان دەوڵەمەندو پڕ سامان بوون، لەبەرئەوە حکومەتی ئینگلیز وای بینی کە هیچ هۆیەك لەئارادا نییە بۆ ئەوەی نیشتەجێکە ئەمریکیەکان لەباج دان ببەخشرێنو بەشدار نەبن لە هەڵگرتنی قەرزی نەتەوەیی.

دانیشتوانی ئەمریکا ئەوەیان ڕون کردەوە کە ئەوان پۆشاکی (25) هەزار سەربازیان دابین کردووەو لەماوەی جەنگدا خەرجیان کێشاونو ناتوانن باجی گران لە ئەستۆبگرن. لەگەڵ ئەوەی ئەوان زۆر سودیان بینی لەجەنگ، بەڵام ئەمە وای لێکردن ئارەزوی لەئەستۆ گرتنی خەرجی جەنگیان نەبێت، بەتایبەت بۆ بەرژەوەندی

بەریتانیا. داگیرگە ئەمریکیەکان لە مەترسیو هەڕەشەی فەرەنسیەکان ڕزگاریان بوو، چیتر پێویستیان بە پارێزگاری بەریتانیا نەما.

کۆچی گەورە بۆ ئەمریکا گۆڕانی هێنا بەسەر پێکهاتەی دانیشتوان لە ئەمریکا. ئەمەش بەهاتنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکانی ئەوروپی نا ئینگلیز. ئەم خەڵکانە نەیاری ئینگلیزو سیاسەتی ئینگلیکانیو کێشانی خەرجی جەنگەکان بوون. ئیدی لێرەوە ململانێ دەستیپێکردو کۆتایی پێ نەهات، تا هەڵگیرسانی جەنگو ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی.

## شۆڕشی ئەمریکا

### کۆمەڵگای ئەمریکی پێش شۆڕش:-

زۆرینەی کۆمەڵگەی ئەمریکی لەسێزدە داگیرگەکان لە پێش شۆڕشدا ئینگلیز بوونو لە ئینگلتراوە کۆچیان کردبوو. لەگەڵ خۆیان شارستانی ئینگلیزیان لە زمانو یاساو وێژەو ڕۆشنبیریو دامەزراوە سیاسیو ئابوریو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیەکانیان هێنایە ئەمریکا. جا ئەم دامەزراوە سیاسیە ئینگلیزیانە لە ئەمریکا دەستی کرد بەگەشە کردنو لەدوای سەدەی حەڤدە قاڵبێکی ئەمریکی وەرگرت. لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە پابەندیو پەیوەست بوونی خانەوادە لەشێوەی خانەوەدەی ئینگلیزی بوونی هەبوو، وە ڕاوەستا بوو لەسەر خوونەریتی ئینگلیزی، بەوەی باوك سەرۆکی خانەوادەیەو هەموویان بەیەکەوە زەوی بەکاردێنن. بەڵام ئەم جۆرە پەیوەست بوونە ئەوروپیە بەهۆی بارودۆخی ئابوری تازە بەرەو کاڵ بوونەوە چوو لەدنیای نوێ. ئەمریکا زەوی بە پیتو پیشەی زۆرو تازەی پێشکەش کردنو بەهۆیەوە لاوانی کەمەندکێش کردو وای لێکردن ماڵی باوانیان جێبهێڵنو دەست بکەن بەژیانێکی نوێ کە تیایدا پشت بەخۆیان ببەستن. دەرەنجامە کەشی کاڵ بوونەوەو بەرەو نەمان چوونی دەسەڵاتی باوك بوو لەخێزاندا.

بەهەمان شێوە دەرفەتی ئابوری زۆر دابو نەریتی کۆمەڵایەتی بە بەردبووی لەکارخست، کە تیایدا پێگەی خانەوادە بڕیاردەرە. بۆیە ئاسایی بوو کە خزمەتکارێك ببێتە خاوەن زەوییەکی فراوان یا خاوەن کارخانەیەکی گەورە. ئەوەتە دەبینین جوتیارێکی نەداری وەك تۆماس جیفرسن ببێتە سەرۆك کۆمارو، بنیامین فراکلین ی بێ دەست مایە ببێتە زاناو داهێنەرو سەفیری وولاتەکەی خۆیو خاوەن ماڵو سامان.

لەوەی خستمانە بەرچاو سەبارەت بە داگیرگە ئەمریکیەکان، دەتوانین بڵێین: کە گەلو ئوممەتێکی نوێ هاتە بوون، کە لە کۆچی یەکەمەوە لەساڵی1605 دەستیکرد بەگەشەکردن تا ساڵی1776 ساڵی هەڵگیرسانی شۆڕش هەر لەگەشە دابوو. "جۆن ئادمز" دووەم سەرۆکی ویلایەتە یەککگرتووەکان دەڵێ:"لەپێش هەڵگیرسانی جەنگ، شۆڕش دەستی پێکرد. کاتێك شۆڕش لەناوبیرو دڵی گەل بوو". جا ئەگەر بێتو بەشوێن گەشەکردنی ئەم نیشتەجێگانەدا بڕۆین، هەر لە سەرەتاوە تێبینی ئەوە دەکەین کە ڕێڕەوی مێژووی ئەمریکا کارتێکراو بووە بەکارتێکەرە دەرەکیەکان. ئەمریکا لەدایك بوو گەشەی کرد لەتەوژمو شەپۆلی مێژووی ئەوروپاو جیهان بەگشتی.

ئەم تەوژم وشەپۆلانەی لەسەرەتاکانی سەدە نوێیەکان گۆڕانی دروست کرد لەئەوروپا، کایگەریەکەی لەئەمریکاش دەبینرا. تەنانەت بەشێك لەگەلی ئەمریکی بەهۆی کاریگەری شۆڕشی ئاینی کۆچیان کرد بۆ ئەمریکا. هەروەها شۆڕشی سیاسی لەسەدەی حەڤدە کاریگەری هەبوو لەسەر دامەزراوەکانی، هەروەك چۆن شۆڕشی هزری ڕۆژگاری ڕێنسانسو ڕۆشنگەری لەسەدەی هەژدەمدا ڕەنگدانەوەی لەئەمریکا دەبینرا. سەروەتو سامان کە لە ئەنجامی دۆزینەوە جوگرافیەکان بەسەر ئەوروپادا ڕژا، وە بازرگانی تازەش کەهەر لەئەنجامی ئەم پرۆسەیە زیاتر گەشەی کرد، کێشەو دووبەرەکی لە ئەوروپاو ئەمریکا دروست کردو هیچ کات لەتوانای سیاسەتی قۆرغکاری بازرگانیدا نەبوو چارەسەری بکات. جەنگە فراوانخوازیو داگیرکاریە ئەوروپیەکان، لەداگیرگە ئەمریکیەکاندا ئەو هەستەی هێنایە بوون کە داوای دەکرد جیاببنەوەو پێی

دەگوتن لەدوای ڕۆژگارێکی درێژ لەسەرپەرشتیکرانو دەسەڵاتی خۆجێی، کاتی جودابوونەوە هاتووە. لەم دەمانەدا واتا لەنێوان ساڵانی1763-1776جگە لە ڕووداوی ئاساییو سوکە ناکۆکیەك هیچ شتێکی ترلە ئارادا نەبوو تا ئەو کاتەی لەساڵی1776 داگیرگەکان جودابوونەوە. دەبێ ئەوەش بزانین لەشوێنەکانی تر بریتانیا زاڵ بوو بەسەر کێشەو ناکۆکیی گەورەتر چ لەپێش شۆڕش یا لەدوای شۆڕش. بەڵام ڕووداوو پێشهاتەکانی ئەمریکا شێوەیەکی تربوو کە بە هۆیەوە شۆڕشو جەنگ لەنێوان بریتانیاو داگیرگەکان لە ئەمریکا سەریهەڵدا.

تێکگیرانو دەستەو یەخەبوون لەنێوان بریتانیا وداگیرگە ئەمریکیەکان دەرەنجامی فراوان بوونی درزی نێوانیان بوولە ماوەی دەیان ساڵدا لە ڕووی ئابوریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری. سیستەمی سیاسیو کۆمەڵایەتی نەدەگونجا لەگەڵ بارودۆخی گۆڕاوی ئەمریکا، کە دوتر شۆڕشو سەربەخۆیی لێکەوتەوە. دوورەدەستیو بوونی زەریاو ئۆقیانوس، هەروەها ڕەهەندی مێژوویی لەو هۆیانە بوون کە گیانی نەتەوەیی ئەمریکی گەشەپێدا. لەگەڵ ئەوانەشدا هۆکاری ئابووریو دارایی هۆیەکی تربوو بۆ شڵەقاندنی ڕەوشەکەو هەژاندنی لەشەستەکانی سەدەی هەژدە تاوەکو هەڵگیرسانی شۆڕش لەساڵی1776.

سەرەڕای ئەوەی باسمان کرد هەستێك هەبوو لەناو داگیرگە ئەمریکیەکان بەوەی کە ئەوان لەژێر چاودێری بەریتانیادانو خوێنی ئینگلیزی لەناو دەمارەکانیان هاتوچۆدەکات. تەنانەت کاتێ پەیوەندیەکانی نێوان دانیشتوانی داگیرگەکانو بەرییتانیا گرژی تێکەوتو ئاڵۆز بوو، خەڵکی ئەم گۆریانیەیان دەچڕی کەناسراوە بە "ڤیرجینیا هرتس ئۆف ئوك" کە دەڵێ: لایەنداری بەریتانین، هەرچەندە لەسەر خاکی ئەمریکا ئاهەنگ دەگێڕینو قەڵەو دەبین بەڵام ئێمە لەژێر چاودێری دورگەی بەریتانین چ کەسێکە نکوڵی لەناوی ئێمەدەکات مادام خوێنی بەریتانی لەناو هەناومان هاتوچۆدەکات جا ئەمە گوزارشت دەکات لە گوێڕایەڵیو پابەندی دانیشتوانی

داگیرگەکان بۆ نیشتیمانی دایك، ئەمەش هەر بەردەوام بوو تا ساتی هەڵگیرسانی شۆڕش.

## کۆت و بەند لەسەر داگیرگەکان:-

ماوەیەکی زۆربوو داگیرگە ئەمریکیەکان سوودمەند بوون لە شێوەیەك لەسەربەخۆیی ئابوری هەرچەندە بەتەواوی هەستیان پێی نەکردبوو. دەرەنجامی ئەم سەربەخۆیە ئابوریە سەربەخۆیی سیاسی لێکەوتەوە، بەلاَم ئەوان داخوازی ئەم سەربەخۆیەیان نەدەکرد، تائەو کاتەی هەستیان کرد کەسەربەخۆیی ئابوریان لەمەترسی دایەو ناتوانرێ پارێزگاری لێ بکرێت تەنها بەسەربەخۆیی سیاسی نەبێت.

ڕەگ وریشەی تێکگیرانی ئابوری لەنێوان بریتانیاو ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ بنەمایەکی بنەڕەتی لەمەزهەبی بازرگانی. مەزهەب پێداگیری دەکرد لەسەر هەبوونی داگیرگە، هەروەها جەختی دەکردەوە لەسەر ئەوەی کە داگیرگە ببێتە بازاڕێکی بە ڕمێنی کالاَکانی ئینگلیزیو سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ ماددەی خاو یا ماددەی سەرەتایی کە لەبریتانیا دەست نەدەکەوت، هەروەك ببێتە قەلاَیەکی پتەو بۆ پاراستنی ئیمپراتۆریەتی بریتانی. هەروەها پێی وایە هیچ گرفتو کێشەیەکیش لەنێوان هەر دوو لادا دروستنابێ، مادام بەرژەوەندی نیشتیمانی دایك لەگەڵ بەرژەوەندی داگیرگە ئەمریکیەکان تەریبو شانبەشانی یەکتر دەڕۆن. بەلاَم لەدوای جەنگی حەوت ساڵە، سەردەمی بەرژەوەندی هاوبەش بەسەرچوو، چونکە داگیرگەکان وەك جارانی پێشوو نەما بوون، بەڵکو لە نیشتیمانی دایك دەوڵەمەند تر بوونو دەیانتوانی پارێزگاری لەخۆیان بکەن.

ئینگترا لەسەردەمی "ئۆلیڤەر کرۆمۆویل" ەوە– کۆتو بەندی خستبووە سەر بازرگانی. بە گوێرەی یاسای کەشتیوانی ساڵی 1651، باروبارگەی بازرگانی نێوان بریتانیاو داگیرگەکانی دەبوایە لەسەر کەشتی ئینگلیزیو دەریاوانی ئینگلیز بێت.

لەپاڵ ئەوەی باسمان کرد، لە ساڵی1660 یاسایەکی تر دەرچوو بەگوێرەی ئەم یاسایەش دەبوایە کەشتی یا لە بریتانیا بوایە یاخود لەداگیرگە بوایە واتا(کەشتی تری لێ نەبێت). هەروەها یاسایەکی تر دەرچوو کە داوای دەکرد هەندێ بەرهەمی وەك "توتن‌و لۆکەو کەتان‌و شەکر" لەداگیرگەکان تەنها بۆ بریتانیا وەڕێ بخرێت، دواتر بەتێپەڕینی کات بەرهەمی تریش خرایە جوغزی ئەم یاسایە، تا وای لێهات بە هاتنی ساڵی1764 زۆرینەی بەرهەمەکانی ئەمریکا کەوتە چوارچێوەی ئەم یاسایە، وەك: ئاسن‌و مس‌و کەوڵ‌و پێست‌و ئاوریشم وتەختەو گوێز هیندی‌و خام‌و زفت‌و قیڕو هەموو ئەوانەی کە کەشتی پێویستی بوو. پاش ئەمە کۆت‌و بەندی توندتری خرایە سەرو وای لێهات حکومەتی ئینگلیز ئەوەی قەدەغە کرد لە داگیرگە ئەمریکیەکان کە هاوردە ڕاستەوخۆ بێنن لە وولاتانی بیانی، بەتایبەت ئەوانەی کێبڕکێ دەکەن لەگەڵ کاڵای بریتانی. حکومەتی ئینگلیزی بەمەندە نەوەستا، بەڵکو بڕیاری دا هەموو کاڵایەکی بیانی بە بریتانیادا ڕەت بێت. لەساڵی1699 کۆت‌و بەندیان خستەسەر بەرهەمی پیشەسازی داگیرگەکان، کاتێ بەرەو ولاتانی دەرەوە بەڕێ دەخرا، بەتایبەت کوتاڵی خوری ئەمەش بۆ ئەوەی ئەم هەناردانە نەتوانن کێبڕکێ بکەن لەگەڵ بەرهەمە پیشەسازییەکانی بریتانیا. پاشان حکومەتی بریتانی هەناردەکردنی "کڵاوو شەبەقە"ی قەدەغەکردو کۆتی خستە سەر بازرگانی داگیرگەکان لەگەڵ دوورگەی هیندی خۆرئاوا.

لە ساڵی1750 پەرلەمانی ئینگلیزی بەهۆی پێویستی پیشەسازی بریتانیا بۆ ئاسن، ڕێگەی دا لەداگیرگەکانەوە ئاسنی خاو بەڕێ بخرێت بۆ بریتانیا، بەڵام ڕێگەی ئەوەشی گرت کە داگیرگەکان سەرقاڵی پیشەسازی ئاسن بن، بۆ ئەوەی کێبڕکێ دروست نەبێت لەگەڵ پیشەسازی بریتانی.

لەگەڵ ئەم هەموو کۆت‌و بەندانەی کە خرابووە سەریان، بەڵام خەڵکی داگیرگەکان هەربێ دەنگ بوون. ئەمەش بەهۆی پێویستی ئەمان بە هەبوونی بریتانیا بۆ ئەوەی پارێزگاریان لێ بکات و، بەریتانیاش پارێزگاری لێدەکردن، لەکاتێدا فەرەنسا بەسەر

کەنەدا دا باڵادەست بوو، بەهاودەستی هیندیە سورەکان لادێکانی ئەوانی دەسوتاندو دێهاتەکانی دەکردن بە سوتماك. هەر لەم کاتەشدا "سێر ڕۆبەرت وەلپۆل" سیاسەتی چاوپۆشی کردنی گرتبوویە بەر لەهەمبەر کاری قاچاغچێتیو جێبەجێ نەکردنی ئەم کۆتو بەندانەی کە لەسەر ئەم کیشوەرە سەپێنرابوون. چونکە ئەو وای دەبینی جێبەجێ کردنو پیادەکردنی ئەم کۆتو بەندانە ئەرکی سەرشانی بریتانیا قورس دەکات، لەڕووی دامەزراندنی فەرمانبەرو دانانی کەشتیوان، کە ئەمەش پێویستی بەخەرجیەکی زۆر بوو. هەربۆیە ئەم سەرۆك وەزیرانە سیاسەتی بێ دەنگیو گوێ پێنەدانی هەڵبژارد.

بەکۆتایی هاتنی جەنگی حەوت ساڵە بارودۆخ گۆڕانی بەسەرداهات و"جۆرج کرانڤڵ" لەساڵی 1763 بووە سەرۆك وەزیران. "کرانڤڵ"و هاوەڵانی ویستیان کۆتایی بێنن بە سیاسەتی پێشو لەهەمبەر قاچاخچیەتیو پیادەنەکردنی کۆتو بەندەکان، بەتایبەت کاتێکیش بەریتانیا دەستیگرت بوو بەسەر زەویەکی بەرفراوانی فەرەنسا وەك دۆڵی ڕوباری "سنت لۆرنسو میسیسپی". لەلایەکی تریشەوە جەنگ ئەرکی سەرشانی بەریتانیای قورس کردبوو لەبواری داراییەوە. هەربۆیە لەسەریان پێویست بوو:

1- داگیرگەکان ناچار بکەن بەشێك لە خەرجیەکانی جەنگ بخەنە ئەستۆی خۆیان.

2- سەپاندنی دەسەلاتی تەواو بەسەر سەرزەمینە نوێیەکان، ئەوەی کە دەستیان بەسەریدا گرتبوو.

3- جێ بەجێکردنی یاسای بازرگانی، بەتایبەت یاسای کەشتیوانی.

بەلام ئەم پێشنیارانە ڕووبەڕووی ناڕەزاییەکی توند بوویەوە لە داگیرگەکاندا.

باجی شەکر:

لەساڵی 1764 "کرانڤل" بڕیاریدا باج بەسەر ئەو شەکرەدا بسەپێنێ کە هاوردەی ئەمریکا دەکرێ، بۆ ئەوەی ساڵانە "150" هەزار پاوند کۆبکرێتەوە. هەروەها بڕیاریدا یاسای کەشتیوانی جێبەجێ بکرێو قاچاغ ڕێگری لێبکرێ. پاش ئەمە لە ساڵی 1765 بڕیاریدا باج لەسەر چاپو چاپ گەریش دابنرێت. لەمەوە پێویست بوو لە هەموو کاروبارەکاندا "پول" بەکاربهێنرێ، بەوەی پول بخرێتە سەر ڕۆژنامەو نامیلکە. بەمەش قورسایی دەکەوتە سەرشانی خەڵکی. ئیدی خاوەن ڕۆژنامەو مافناسانو بازرگانان زۆر پەستو نیگەران بوونو ناڕەزایی هەموو جێگایەکی گرتەوە. یەکێ لە مافناسان وتی: سەپاندنی باج بەبێ نوێنەرایەتی پەرلەمانی کارێکی زۆردارانەیە". دواتر ئەم وتەیە کەوتە سەرزاری خەڵکیو دەیانگووت:" دانیشتوانی ئەمریکا ئینگلیزی ڕەسەننو سودمەندن لە هەمان ئەو مافانەی کە دەستورو نەریتی ئینگلیزی پێی بەخشیون. وەلێ سەپاندنی باج بەبێ نوێنەرایەتی پەرلەمانی، شکاندنی ئاشکرای دەستورە وپێشێلکردنی مافە سروشتیەکانە. هەروەها ئەوان لە هەمانکاتدا باج دەبەخشن بە حکومەکانیان، بەهۆی ئەوەی نوێنەری خۆیان هەڵدەبژێرن بۆ دەسەلأتی یاسادانان لەم ویلایەتانە، ئەمە لەکاتێکدا پەرلەمانی بەریتانی هیچ نوێنەرێکی ئێمەی لێنییە، چونکە نوێنەری خۆیان هەڵنابژێرن بۆ ئەم پەرلەمانە" هەروەها دەیانگووت:" ئێمە بەڕەت کردنەوەی باج بۆ پەرلەمانی ئینگلیزی پارێزگاری دەکەین لە بنەماو مەبدەئی ئازادیو دەسەلأتی خۆجێی".

ناڕەزاییو نیگەرانی بووە هۆی ئەوەی کۆنگرەیەك لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی1765 لە نیۆرك ببەسترێو ناونرا کۆنگرەی"پول". لەم کۆنگرەیەدا مافەکانیان ڕاگەیاند، وەك: مافی دادگای کردن بەئامادە بوونی سوێندخۆران. وە ڕایانگەیاند کە ئەوان مافی سەپاندنی باجیان هەیە بەسەر خۆیان و، مافی ئەوەیان هەیە یاسای پول ڕەت بکەنەوە.

ناڕەزایی‌و نەیاری‌و وازهێنان لە کالآی ئینگلیزی‌و کاری توندو تیژی، بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی یاسای پول لەئینگلترا. لەهەمانکاتدا وەزارەت گۆڕانی بەسەر داهات‌و لە ساڵی1766 "ڕوکینگهام" لەپارتی هویگز بووە سەرۆکی وەزیران‌و پەرلەمانیش مافی دەستوری خۆی ڕاگەیاند لەمەڕ دانانی یاسا بۆ داگیرگەکان. وەزیری گەنجینە"خەزێنە- بوجە" "چارلس تاوسەند" ئەم جەختی لەسەر ئەم مافە کردەوە. ئینجا ژمارەیەك پێشنیاری پێشکەشی پەرلەمان کرد بۆ سەپاندنی باج بەسەر هاوردەو زیادەی داهات.

### یاسای تاونسند 1767:-

لەنێو ئەو باجە سەپێنراوانەی کە خرایە سەر بەرهەم‌و هاوردەو ناردەنیەکانی ئەمریکا. سەپاندنی باج بوو لەسەر چا، هەروەها لەسەر شوشەو کاغەز و، دادگایی کردنی سەرپێچیکاران بەبێ ئامادەبوونی سوێندخۆران. ئەم یاسایە بووە هۆی ناڕەزایی‌و تورە بوونی سەرجەم چینەکانی گەل‌و کەم بوونەوەی هاوردە کردنی کالآی بەریتانی، کە دواتر هەڵپڕژانێکی خوێناوی لێکەوتەوە لە بۆستن. لەم کاتەو لە ساڵی1770 پادشا وەزارەتی نوێی ڕاگەیاندو "لۆرد نورس" کرایە سەرۆك وەزیران. نورس لە پارتی تۆری لە دڵسۆزانی پادشا بوو، هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی باجەکانی تاوسەند. بەلآم باری خراپی دارایی کۆمپانیای هیندی خۆرهەلآتی ئینگلیزی، کۆمپانیای هێنایە سەر لێواری نابوتی‌و مایەپوچ بوون. جا بۆڕزگارکردنی کۆمپانیا،پەرلەمانی ئینگلیزی لە ساڵی1773 ژمارەیەك بەربژاری بەخشیە کۆمپانیا، لە ناویاندا گێڕانەوەی باجی لابراوی سەر"چا"ی هیندی عەمبارکراو لە لەندەن بۆ کۆمپانیا، بەو مەرجەی تەنها بینێرێتە ئەمریکا. چای هیندی عەمبار کراوی لەندەن لە جۆری نایاب بوو، کە دەکڕدرا بە نرخێکی هەرزانتر لەچای جۆر خراپی هۆڵندی کە ئەمریکیەکان ڕاهاتبوون لەسەر کڕینی.

خەڵکە توندو سروشت ڕەقەکانی ئەمریکا ئەم کارەی پەرلەمانیان بە جۆرێك لە بەرتیل لێك دایەوە، کە هەر ئەمەش سەردەکێشێ بۆ زیندە بە چاڵبوونی مافو ئازادیەکانیانو سەپاندنی باجی تر بەسەریاندا. لەمەوە کۆمەڵێك لە خەڵکی شاری "بۆستن" قەڵسو تورە بوونو لەبەرگی هیندیە سورەکانداو لە یەکێ لە شەوەکانی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی1773، کەشتیەکی بریتانی بارکراو بە سندوقی "چا"یان بەتاڵ کرد.

تۆڵەو کاردانەوەی ئەم کارە بە توندی گیرایە بەرو حکومەتی بریتانی بەندەری "بوستن"ی لە ساڵی 1774 داخستو حوکمی خۆجێی هەڵوەشاندەوەو، ویلایەتی مساچویستیان داگیر کرد. وە بەگوێرەی یاسای کویبیك ی حوزەیرانی ساڵی1774، حکومەتی بریتانی ئازادی ئاینیو مافی پیادەکردنی یاسا فەرەنسیەکانی بەخشی بەو داگیرگانەی"کیوبیكو کەنەدا" کە لە فەرەنساو لە جەنگی حەوت ساڵە دەستی کەوتبوو، وە تا ئەوکاتەش بێ بایەخ مابونەوە. لەهەمانکاتیشدا بریتانیا سەرجەم زەوییەکانی باکوری ڕووباری "ئوهایۆ"ی– بەستەوە بە هەرێمی کویبیك. بەمەش حکومەتی بریتانیا سنورێکی دانا بۆ کۆمپانیایەکانی زەوی لە ڤێرجینیاو غەیری ڤێرجینیا لە وەبەرهێنانی دۆڵی ڕووباری ئۆهایۆ. مەبەست لەیاسای کویبیك تۆڵە سەندنەوە بوو لە دانیشتوانی "نیوئاینگلاند" کە بیۆریتانی بوون. ئەم بەستنەوەیەی ئەوان بە کاسۆلیکە فەرەنسیەکان لەکاتێکدابوو کە هەردوولا بەیەکتری پەست بوون. ئەمەش تۆڵەی بریتانیا بوو لە ئەوان.

## کۆنگرەی یەکەمی کیشوەری:ـ

ساڵی1774 نوێنەرانی ویلایەتە ئەمریکیەکان لە فلادلفیا کۆبوونەوە بە مەبەستی تاوتوێ کردنی بارودۆخو بڕیاردان لەسەری، بۆ ئەوەی ویلایەتەکان هەوڵ بخەنە گەڕ بۆ هێنانەوەی مافەکانیانو ئازادیە ئاینیو مەدەنیەکانیان، هەروەها سازکردنەوەی پەیوەندیەکی دڵسۆزانە لە نێوان ویلایەتەکانو بریتانیا. پاش ئەم کۆنگرەیە

سکالآنامەیەکیان بۆ شاجۆرجی سێ یەم ناردو، هەر بەردەوام یش بوون لە نەویستنی کالآکانی بریتانیا. شاجۆرجو حکومەتیش دژی هەرجۆرە نەرم گیریەك بوونو ئامادە نەبوون لە بەرامبەریاندا دەست لەهیچ هەلگرن. لە ئەمریکاش خەلکانێ هەبوون دەیانویست ڕووبەڕووی بریتانیا بوەستن و، ناوی "نیشتیمانی"یان- بۆخۆیان هەلبژاردو گەرەکیان بوو لەحکومەتی بەریتانیو پەرلەمان هەتەریبنو بەربەرەکانی بکەن. کە دواتر هەر ئەمەشیان بەکردەوە ئەنجام داو شۆڕشیان بەرپا کرد. لە نیسانی1775 تێکهەلچوون لە " مەساچوسێتو لیکسنکتن" لەنێوان هێزەکانی بریتانیاو دانیشتوانی داگیرگەکان دەستی پێکرد. پاش مانگێك کۆنگرە سکالآنامەیەکی تری خستەبەردەم پاشای بەریتانیا بەمەبەستی کەم کردنەوەی بارگرانی لەسەر دانیشتوانی داگیرگەکان. لەهەمان کاتیشدا دانیشتوانی داگیرگەکان"جۆرج واشنتۆن"یان- کردە سەرۆکی هێزە چەکدارەکان.

هەرچەندە داگیرگەنیشینەکان بەم هەنگاوانە هەستان، بەلآم لە نێو خۆیاندا بوون بە دووبەش. بەشێکیان بوونە نیشتیمانیەکانو بەشەکەی تریش بەلای بریتانیادا دەشکانەوەو لایەنگری بوون و، خۆیان ناونا دلسۆزان "مخلیصین". ئەمانە هەولیان دەدا برەو بدەن بە سیاسەتی بریتانیا لەئەمریکاو شیرینی بکەن. لەنێوان ئەم دوو ڕەوتەشدا خەلکێکی زۆر هەبوو لەدانیشتوانی ئەمریکا کە گرنگیان بەهیچ نەدەداو گوێیان نەدەدا بەو ڕووداوانەی کە ڕووی دەداو هیچ کام لەم دوو ڕەوتەیان بەلاوە گرنگ نەبوو. وەلێ لەگەل ئەوەشدا نیشتیمانیەکان ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەیان زیادی دەکردو دواتر بالآدەستبوون بەسەر ئەنجومەنەکانی یاسادانان لەداگیرگەکان و، بەسەر کۆنگرەی کیشوەریەکانیش دەسەلآتیان پەیداکرد. نیشتیمانیەکان بلأوکراوەیان بلأودەکردەوەو نامیلکەی تایبەت بەشۆڕشیان دەخستە بەردەم جەماوەر. بەناوبانگترینی ئەو نامیلکانەش، نامیلکەی "تۆماس پین بوو" کە بەناوی "ئاوەزی تەندروست" بلأوی کردەوە. "پین" لەڕووی نەتەوەییەوە ئینگلیز بوو، کۆچی کردبوو

بۆ ئەمریکاو لەگەڵ شۆڕشگێڕان دابوو. لەم نامیلکەیەدا دەڵێ: "هیچ پاساوێك نییە کەبمانهێڵێتەوە بە دڵسۆزی بۆپاشا، وە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە داگیرگەکان بڕیاری جیابونەوەی خۆیان بدەن لەبریتانیا. پادشاکانیش هیچ مافێکی خوداییان نییە بۆئەوەی بەسەر مرۆڤەکاندا فەرمانڕوایی بکەن. پادشاکان ڕیسوانو ئەگەر دەسەڵاتیان ڕەها بێت ئەوا یاخی دەبن، وە ئەگەر پادشایی دەستوری بن، وەك شاکانی ئینگلترا هیچ کەڵکیان نییەو کارێکی زۆر دەخەنە سەر شانی گەل". نامیلکەی تۆماس پین لە کانونی دووەمی 1776 لە فلادلفیا بڵاو کرایەوە.

لەکاتێکدا جۆرجی سێیەم بێ ئاگابوو لە داواکاری ئەمریکیەکان بۆ ئاشتی، داوای بەڕێخستنی سوپای کرد بۆ ئەمریکا بۆ سەرکوتکردنی شۆڕش. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بڵاوکراوەکانی توماس لە داگیرگەکاندا بە هەزارانیان لێ دابەش بکرێو برەوێکی زۆر پەیدا بکەن. بەم شێوەیە ناڕەزاییو نەیاری کردنی باج گۆڕا بۆ شۆڕش.

## ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا 1776:-

لە چواری تەموزی 1776 کۆنگرەی "فلادلفیا" بە کۆی دەنگ ڕەزامەندی نواند لەسەر ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی. ئەو سەربەخۆیەی پێشتر توماس جیفرسۆن لە نوسینێکدا نوسی بووی و تیایدا دەڵێت: "دروستکاری خۆیان"خودا" مافی پێداون و نابێ لێ یان زەوت بکرێ. هەموویان مافی ژیانو ئازادیو هەوڵدانو بەدواکەوتنی ژیانێکی ئاسودەیان هەیە، هەموو حکومەتێك دەسەڵاتی پشت دەبەستێ بە گەلو ڕەزامەندی گەل. لەمەوە گەل بۆی هەیە حکومەتێکی ستەمکار بڕوخێنێو حکومەتێکی میللی دروست بکات. خۆ ئەگەر پێویستی کرد چەك بەکاربێنێت، پێویستە چەك بخاتە کارو مافی شۆڕشکردنی هەیە." بەم شێوەیە مافی سروشتیو سەروەری گەلو مافی شۆڕش بووبە بناغەی یەکگرتنی داگیرگەکانی ئەمریکاو پێکهێنانی دەوڵەتێکی

سەربەخۆی ئازاد. جەماوەریش بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە پێشوازی لەم سەربەخۆییە کرد.

لە نیویۆرك خۆشیەکی زۆر بەسەر خەڵکی داهات و پەیکەری "جۆرجی سێ یەم" یان- تێکشکاندو چەکیان لێ دروست کردو لایەنگرانی بریتانیایان بێدەنگ کرد. ئینجا ڕایانگەیاند ئەوان وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ بەربەرکانی بریتانیا دەکەن و، داوایان لە وولاتان کرد دانیان پێدا بنێنن.

## کاردانەوەی بەریتانیا:-

هەریەکە لە جۆرجی سێیەم و پەرلەمان ڕاگەیاندنی سەربەخۆییان بەکارێکی ناپاکانە لەقەڵەم داو شۆڕشگێڕانیان بە یاخی و تێکدەر ناودەبرد. شۆڕشگێڕان هەوڵیاندا "هویگز" لە ئینگلتراو کەنەدیە فەرنسیەکان لە "کویبیك و نوفاسکوشیا" بەلای خۆیاندا کێشبکەن. کەچی کەنەدیە فەرنسیەکان وایان بیردەکردەوە کە خۆیان کاسۆلیکین و ئازادیان لەلایەن بەریتانیاوە بۆ دەستەبەرکراوە و بەریتانیاش لە ئەمریکیە پرۆتستناتیەکان میانڕەوترن. بۆیە خۆیان وەك لایەنگری بەریتانیا هێشتەوە.

لەڕاستیدا بەریتانیا لەتوانای دا هەبوو بەهۆی سەروەت و سامان و دەسەڵاتی، شۆڕش کپ بکاتەوە. بەتایبەت کاتێك زۆرینەی دانیشتوانی ئەمریکا لەگەڵ شۆڕشگێڕان دا نەبوون. بەڵام ئینگلترا بەشێوەیەکی کارا ئیشی نەدەکرد. هەر لەسەرتای شۆڕش "30" هەزار سەربازی بەڕێکرد کە زۆرینەیان بەکرێگیراوە ئەڵمانەکان بوون. بۆ ئەوەی دەستبگرن بەسەر نیویۆرکدا.

ئینگلیزەکان سەرکەوتنی زۆریان بەدەستهێناو "جۆرج واشنتن" خەریك بوو لە بەردەم سوپای ئینگلیز پاشەکشە بکات و لەلایەکیترەوە بکەوێتە جەنگ، بەڵام خۆ بەدەستەوەدانی جەنەڕاڵی ئینگلیزی "برکوین" لە ساڵی 1777 لە "ساراتوکا" لەگەڵ شەش هەزار سەربازی تر پاش ئەوەی هێرشیانکردە سەر نیویۆرك، لەهەمان ئەو

کاتەی کە "فرانکلن" حکومەتی فەرەنسی قەناعەت پێدەهێنا کە هاوپەیمانی ئەمریکا بکات، ڕەوشەکەی گۆڕیو فەرەنسا لەساڵی 1778 جەنگی لەدژی بەریتانیا ڕاگەیاند.

پاش ئەوەی هەریەکە لە هۆڵنداو ئیسپانیا چوونە بەرەی فەرەنساو ئەمریکاو لەگەڵ بەریتانیا کەوتنە جەنگ، جەنگ چووە بارێکی جیهانیەوە. ئیسپانیا لەساڵی 1779 لەدژی ئینگلترا هاتە نێو جەنگ و، هۆڵنداش کە ئینگلترا پێشتر ڕێگری کردبوو کە بازرگانی بکات لەگەڵ داگیرگە ئەمریکیەکان، چوویە پاڵ بەرەی دژ بە بەریتانیا. جگە لەمانە دەوڵەتانی تریش لە جەنگەکە تێوەگلان. کەشتیگەلی ئینگلیزی تەگەرەی دەخستە بەردەم ڕۆیشتنی کەشتیەکانو کاڵاکانی ناوەوەی دەپشکنی لەترسی گوێزرانەوەیان بۆ ئەمریکا.

جگە لەم دەوڵەتانە دەوڵەتانی تریش چوونە جەنگ لەدژی بەریتانیا، وەك "کاترینای دووەم"ی– قیصەرەی ڕوسیاو سویدو ئیمپراتۆریەتی نەمساویو دانیمارك. بەلاّم جەنگی ڕاستەقینە لە نێوان ئینگلتراو فەرەنساو هۆڵنداو ئیسپانیا دابوو. جەنگی هۆڵندا بەشێوەیەکی بەرفروان بەڕێوە نەدەچوو، بەڵکو تەنها لەدەریای باکور جەنگ گەرمو گوڕ بوو. بەلاّم کەشتیگەلی ئیسپانیو فەرەنسی لەهەموو جێگەیەك هێرشیان دەکردە سەر ئیمپراتۆریەتی بەریتانی. تەنانەت دوورگەی بەریتانی لەساڵی 1779 کەوتە ژێر هەڕەشەی هێرشی شەستو شەش کەشتی گەورە کە بەهەمویان شەست هەزار سەربازیان هەڵگرتبوو. بەلاّم ئەو هێزە ئینگلیزەی لە جبل تاریق خۆیان مەلاّس دابوو، توانیان پێشبگرن لەو هێرشەو هێرشەکە شکستی هێنا.

بەلاّم لە داگیرگە ئەمریکیەکان ڕەوشەکە بەزیانی ئینگلیز هەڵدەسوڕا. شۆڕشگێڕان بەهاوکاری کەشتیگەلی فەرەنسی توانیان بەسەر سوپای ئینگلیزدا سەرکەون. سوپای ئەمریکی بەسەرکردایەتی "جۆرج واشنتن"، وە سوپای فەرەنسی بەسەرکردایەتی "میرکزدی لاڤایت" بەهاوکاری کەشتیگەلی فەرەنسی توانیان زاڵ بن بەسەر سەرکردەی سوپای ئینگلیز جەنەڕاڵ "کورنوالس" لە "یۆرك تاونو فەرجێنیا" ناچاریان کرد لە

تشرینی یەکەمی ساڵی 1781 لەگەڵ حەوت هەزار سەرباز خۆی بدات بەدەستەوە. خۆبەدەستەوەدانی "کورنوالس" کۆتا جەنگی ئەمریکا بوو. چونکە بەریتانیا پێویستی بەسەربازەکانی بوو بۆ ئەو جەنگانەی لە بەشەکانی تری ئیمپراتۆریەکەی دەرۆی بەڕێوە.

بەریتانیا لە ساڵی 1782 توانی لەدورگەی "کاریبی"سەرکەوتن بەدەستبێنێ بەسەر کەشتیگەلی فەرەنسی، بەمەش توانی هاوکێشەی جەنگ لەگەڵ فەرەنسیەکان لە هیند هاوسەنگ بکاتەوە، ئەمەش لەساڵانی 1778-1781. بەهەمانشێوە توانی بەسەر هۆڵندیەکاندا سەرکەوێتو لەجەبەل تاریقیش بەربەست لەبەدەم ئیسپانیەکان دروستبکات. بەلاّم درێژخایەنی جەنگو تێکشکانی لە ئەمریکا، بەریتانیای ناچار کرد پەیمانی لەگەڵ ئەمریکیەکان ببەستێ لە پاریس لەساڵی 1783. وە لەگەڵ ئیسپانیاو فەرەنسا لە ڤێرسای.

## پەیمانی پاریسو ڤێرسای 1783:-

بەگوێرەی پەیمانی پاریس بەریتانیا دانی هێنا بە سەربەخۆیی سێزدە ویلایەتی ئەمریکا بەناوی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. سنورەکەی لە باکورەوە دەگەیشتە کەنەداو دەریاچە گەورەکان، لە خۆرهەلاّتیشەوە دەگەیشتە ڕوباری میسیسی، وە لە باشورەوە فلۆریدا. ویلایەتە یکگرتووەکان مافی ڕاوکردنی ماسی لە نیوفاوندلاندو کشتیوانی کردن لە ڕوباری میسیسی پێبەخشی. وە بەگوێرەی پەیمانی ڤێرسای "سنفال" گەڕێندرایەوە بۆ فەرەنسا، کە پێشتر لە جەنگی حەوت ساڵە لەدەستی دابوو، لەگەڵ "توباگو" کە دورگەیەکە لە دەریای کاریبی. ئیسپانیاش بەپێی پەیمانەکە دورگەی "مینوکارو فلۆریدا"ی پێدرا، کە لەم کاتەدا درابووە پاڵ بەشی

باشوری "باماو" لە میسیسی[1] بەلاّم هۆلّندا بەتەنها لەگەلّ بەریتانیا لەسالّی 1784 پەیمانی بەست.

## ویلایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا:-

جەنگی سەربەخۆیی کۆتایی هێنا بە بالاّدەستی بەریتانیا لە داگیرگە ئەمریکیەکان‌و گورزێکی کەمەر شکێنی وەشاند لە تیۆری مافی خودایی پاشاکان‌و چینی ئەرستۆکراتی، سەرکەوتنێکیش بوو بۆ بنەماکانی شۆڕشی ئینگلیزی سالّی 1648و شۆڕشی جلیلەی سالّی 1689، هەروەها سەرکەوتن بوو بۆ تیۆری پەیمانی کۆمەلاّیەتی کە لەسەر دەستی جۆن لۆك گەشەی کرد. هەروەك بۆ بنەما دیموکراتی‌و فەلسەفیەکان سەرکەوتن بوو کە لە سەدەی هەژدە دەرکەوتن‌و "ڕۆسۆو مۆنتسیکۆو جیفرسۆن تۆماس بین"و ئەوانی تر پەرەیان پێدا. کۆماری تازە پێداگری دەکرد لەسەر سیستەمی کۆماری پەرلەمانی ئازاد، سەروەری گەل‌و مافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلان. حکومەتی تازە بەتاقی کردنەوەی دیموکراسی بۆ خۆی‌و هەناردەکردنی بۆ دەرەوە، بۆیە نمونەیەك بۆ گەلان‌و بنبڕکەری ستەم‌و پاشایی‌و بەکۆیلەکردن. بە هەلّوەشاندنەوەی مەرجەکانی پاشایی‌و مەرجەکانی دەنگدان، ویلایەتە کۆماریەکان بەربەرە بوونە حکومەتە دیموکراتیەکان. هەلّبژاردن بوو بە هەلّبژاردنی ئازادو بێ کۆت‌و بەند. یەکگرتن لەسەتادا بەهێزنەبوو، ئەمەش بەگوێرەی دەستوری کۆنگرەی

---

1 بەگوێرەی پەیمان بەستی پاریس بەریتانیا کەندای بۆخۆی پاراست، وە لە فلۆریداو خۆرئاوای ڕوباری میسیی بەخشی بە ئیسپانیا. ئەمریکیەکان هەستیان کرد لەهەمو لاکانەوە بە دوژمن دەورە دراون، بەریتانیا دەرگای بازرگانی هیندی خۆرئاوا لەڕووی کالاّو کشتیەکانی ئەرمیکا داخست بەهەمان شێوە ئیسپانیا وای کرد گوزەری ( نیوئۆرلین) ی بەڕوی کەشتیوانی ئەمریکی داخست. وە بەهەمان شێوە فەرەنساش کۆتی خستە سەر بازرگانی‌و توتنی فەرجینیاو ماسی نیوفاوندلاندی لەبازاڕەکانیدا یاساغ کرد. هەموو ئەمانەش مانای تۆلّە سەندنەوەی بەریتانیاە لە خەلّکی ئەمریکا.

شۆڕشی کیشوەری ساڵێ 1777. بەلاّم لەساڵی 1778 دەستوری یەکگرتن دانراو سێزدە ویلایەتەکانی کرد بەیەك.

# بزوتنەوەی هزری

# لەهەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە

## پێشکەوتنی زانستی لەڕۆژگاری ئاوەزو ڕۆشنگەری:ـ

گرنگی زانستەنوێ یەکان لەوەدایە کە بیروبۆچوونێکن، دەرچوون لەتێبینیو وردبوونەوەی زاناکان لەبارەی حەقیقەتی ماددیو پێکهاتنی گریمانەکان کە هەیانبوو. ئەوان بۆئەم مەبەستە ماددەکانیان دەخستەژێر تاقیکردنەوە، جا ئەگەر ئەنجامەکەی پشتگیری گریمانەکانی کردبا، ئەوا دەبووبە بنەمایەکی زانستی و، ئەو کاتەش یا ئەوەتا فەرامۆشیان دەکرد یان بەشێوەیەك لەشێوەکان چاکیان دەکردو ڕێکیان دەخست. ساکاتێکیش زاناکان وایان لێهات کە گرنگی نەدەن، تەنها بەوانە نەبێت کە پێوانەیەکی بیرکاری یان فیزیایی هەبوایە، گومانو ناڕۆشنەکانیان پشتگوێ خست.

لەسەرەتاکانی سەدەنوێ یەکان ژمارەیەك زانا هەڵکەوتن کە جیادەکرانەوە بە زۆر زیرەکیو تواناداری بیرکردنەوەو بیرتیژی، ئەوانە توانیان گریمانەی بەسود دابهێنن، وە لەدوای تاقیکرنەوەیان گریمانەکان دەبوونە تیۆرو بنەمای زانستی. بەناوبانگترینی ئەو زانایەنەش "کۆپەرنیکۆسو گالیلۆو کیپلەرو نیپیرو هارڤی"و ئەوانی تر، زۆرینەی ئەوانە لەسەدەی شازدەو نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدە ژیانیان بەسەربرد، نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدە ئەوروپا شاهێدی بینیی شۆڕشێك بوو لە ئاقاری زانستی ،دواتر ئەمەسەری کێشا بۆئەوەی کەبە بزوتنەوەی ئاوەزگەری وڕۆشنگەری ناوبرێ. شیاوی باسە سەدەی هەژدەش هەمان ناوی بەسەردا بڕا. لەبەناوبانگترینی ئەم زانایەنە "ڕێنیی دیکارت"ی– فەڕەنسیو "ئیسحاق نیوتن"ی– ئینگلیزی بوون.

### ڕێنی دیکـــارت1650-1596:ـ

زانای بیرکاریزانی فەڕەنسیو ئاوەزگەری ڕێنـی دیکارت، ئـەو زانایـەی لەفەڕەنساو هـەنگاریاو هۆڵنـدا لەهاموشـۆدا بـوو، تـا ئـەوەبوو گەشـتی ژیـانی لەسـویدو لەسـاڵی 1650کۆتایی پێهات.

دیکارت وەك زانایەكی بیركاری لەساڵی 1627توانی ئەندازەی شیكاری بدۆزێتەوە، ئەمەش بەشیکارکردنی ئەندازە بەشـێوەی جـەبری، ئـەمجا بەدەسـتهێنانی پەیوەنـدی نێوانیانو گۆڕینی ئەندازە بۆ هاوكێشە جەبریەكانو پیـادەكردنی ئەمـە لـەفیزیادا، كـە بەهۆیەوە لێكدانەوەو تەعبیر كردنی دیـاردە گەردوونیـەكان وزانینـی جوڵـەی تەنـەكان لەئاسماندا ئاسان بوو.

هــەروەها وەك فەیلوســفێكی ئاوەزگــەر دیكــارت كتێبێكــی لــەبارەی "پرنــسیپی فەلسەفی" دەنووسێو لە ساڵی 1637 چاپی دەكات. لەم كتێبەدا لێكۆڵینەوە دەكات لەبارەی فەلـسەفەی دوانـەییو تێیـدا لاشـەو گیـان، وە مـاددەو ئـاوەز لەیـەكتر جـوێ دەكاتـەوەو پـەردە لـەنێوانیان دادەنـێ. هـەروەك دەڵـێ":گیـان وئـاوەز حەقیقـەتێكی ئەساسین، بەڵام لەناوەڕۆكو كرۆكدا لەیـەكتر جیـاوازن، بـەوەی گیـان مـاددە نـی یـە، چـونكە بەرجەسـتەنابێ، وەلێ جیهـانی مـاددە لەهـەموو ئەوانـە پێكـدێت كـەدەتوانرێ پێوانەیەكی ماددی بۆبكرێ". دیكـارت پێـی وایـە ئەسـتەمە بونـەوەرپێكهاتبێ لەچـەند گەردیلەیەك كەجیاوازبن لە گەردیلەكانی مـاددەو بەهەڵواسـراوی لەبۆشـایدابن، چـونكە ئەستەمە بۆشایی هەبێت بەڵام شتێكی ماددی تێدانەبێت.

كەواتە لێكدانەوەی گیان بریتیە لەوەی كەبونەوەر پڕە لە تەنۆكـەی بـچوك بـچوك. ئەم گەردیلە ووردانە بەردەوامن لـە سـوڕانەوەیەكی زۆر گـەورە وفـراوان دان بـەدەوری خـۆردا. كۆمـەڵێكیش لــەو گەردیلــە ووردانــە بەخێرایــەكی زۆر بــەدەوری خــۆردا دەسوڕێنەوەو لەگەڵ ئەوانیش ئەستێرە گەڕۆكەكان دەسوڕێنەوە، لەم میانەدا زەویش سوڕانێكی بەردەوامو بچوكتری هەیە.

"دیکـارت"و ژمارەیـەکی زۆر لەخـەڵکی باوەڕیـان بـەم لۆژیکـە هـەبوو، کـە بـۆ جوڵانەوەی بونەوەر ڕاڤەی کردبوو، چونکە ئەوە لە تێڕوانینیاندا چارەسەری دیاردەی کێـشکردنو جـوڵانی گەڕۆکـەکانی کردبـوو. ئـەوان باوەڕیـان وابـوو کەجوڵانـەوە دەرەنجامی بەریککەوتنی تەنەکانـە هەنـدێکیان بەهەنـدێکیان. بـەم شـێوەیە بونـەوەر لەتێڕوانینی دیکارتو کۆمەڵەکەی بریتی بوو لەئامێرێکی میکانیکی زەبەلاح کەملکەچـە بۆقانونە فیزیاییو بیرکاریەکان.

## جۆرج بیرکلـــی1596-1650 :ـ

جۆرج بیرکلی قەشـەیەکی ئینگلیکـانی ئێرلەنـدی بـوو، لـە ئـەمریکا دەژیـا. بیرکلـی لـەبارەی فەلـسەفەی دوانــەیی دیکارتــەوە دەڵــێ: "دیکــارت هــەوڵی داوە دیــاردە سروشتیەکان لەڕێگای ماددەو جوڵەوە شیکار بکات، وە بەوەش کـە خـودا بڕێکـی زۆر لەو ماددەو جوڵەیە دروستکردوەو ناچاری کـردون بـۆ کـار. لەبەرئـەوە دەسـتیانکردوە بەکارکردن بەبێ هیچ هاوکاریەك".

"بیرکلی" بـاوەڕی وابـوو کـە حەقیقـەت لـەڕێگای هەسـتەکانەوە دەگوازرێتـەوە بـۆ مێشكو دەردەکەوێ. هەستەکان بەتەنها دەتـوانن شـتەکان بکـەن بەڕاسـت. "بیرکلـی" پێی وایە بیر شتەکان دەناسێ پێش ئـەوەی هەسـتیان پـێ بکـات، کـاتێکیش هەسـتی پێکـردن لـە ڕێگـەی هەسـتەوەرەکانەوە، ئـەوا دەبێتـە ڕاسـتەقینە. بەشـێوەیەکی تـر دەتوانین بڵێین: "بـیر بریتیـە لـە خـودا کـە لـەپێش جیهـانی مـاددی بـوونی هـەبووە، جیهانی ماددیش هیچ نەبووەجگە لە قاڵب وەرگرتنی ئەو وێنەیـەی کـە لـەهۆشو بـیری خودا دا هەبووە، پێش دروستکردنی.

## ئیسحاق نیوتن 1642-1727 :ـ

"دیکارت" بەهۆی فەلسەفەکەیەوە ڕوبەڕووی بەربەرەکانی توندبوویـەوە، کلێـساش بڵاوکردنـەوەی کتێبەکـەی قەدەغـەکرد. بـەڵام بـەهۆی ئـەوەی دیکـارت لـە هۆڵنـداو فەڕەنسا بوو، دوور بو لەچنگی دادگاکـانی پـشکنین، ئـەو دادگـا دڕندەیـەی گالیلۆیـان لەماڵەکەی خۆیدا دەستبەسەرکرد.

ئەو کەش‌و هەوا ئازادەی کە ڕەخسابوو بۆ دیکارت، بۆ ئیسحاق نیتون یش- دەستەبەربوو. نیوتن لە کەشی ئازادی ئینگلیز توانی یاساکانی بونەوەر بدۆزێتەوەو بەبێ هیچ زەحمەتیەك بلاَوی بکاتەوە.

نیوتن لەیەکێ لەدێهاتەکانی ئینگلیزو لەخێزانێکی ئاسایی، لەو ساڵەی کە"گالیلۆ" مرد، ئەم لەدایك بوو. نیوتن لە شیکارکردنی هاوکێشە بیرکاریەکان هەر لە منداڵیەوە زرنگی‌و دەرئاسایی پێوە دیاربوو. ئەم زیرەکیەی لە گەورەبوونیشدا هەرلەگەڵ بوو کاتێك لەزانکۆی کمبرج سەرنجی مامۆستاکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. لەبەرئەوە لەتەمەنی بیست وحەوت ساڵی وەك مامۆستای زانکۆ دیاری کرا، بلیمەتی نیوتن بووەهۆی ئەوەی کە شاژن "ئان" نازناوی "ئەسپ"ی- پێبەخشی.

نیوتن تەواوکاری‌و جیاکاری لەبیرکاریدا هێنایە کایەوە، ئەمجا لەپاش لێکۆڵینەوەیەك کە بیست ساڵی خایاند، کتێبەکەی لەساڵی 1687 بلاَوکردەوە بە ناونیشانی "بنەماکانی بیرکاری بۆ فەلسەفەی سروشتی" دواتر ئەم ناوەی کورتکردەوە بۆ "پڕەنسیپ". دوای ئەوە نیوتن لەساڵی 1666بەهۆی ڕوداوێکەوە ڕووی کردە یاسای "کێشندە"، ئەمەش کاتێك لەو ساڵەدا بەهۆی بلاَوبوونەوەی نەخۆشی تاعون نیوتن مۆڵەت وەردەگرێ‌و دەگەڕێتەوە زێدی خۆی. ڕۆژێك لەڕۆژان نیوتن بەژێر درەختێکدا ڕەت دەبێ‌و سێوێك لە درەختەکە بەردەبێتەوە. بەربوونەوەی سێوەکە کاردەکاتە سەر نیوتن، لەمەوە لەم دیاردەیە دەکۆڵێتەوە، تادواتر یاسای کێشندە دەدۆزێتەوە بەوەی کە:" هێزی کێشندە لە نێوان دوو بارستە، گونجاو هاوکوفە لەگەڵ دەرچون وپێداکێشان‌و پێچەوانەکەی‌و ڕووبەری نێوانیان".

نیوتن بەم دۆزینەوەیەی ئەوەی ڕوون کردەوە کەهەسارەکان لەبونەوەرو لەخول خواردنی بەدەوری خۆردا، بەهۆی هێزی کێشندەوە هاوسەنگی خۆی ڕادەگرێ. بەمە نیوتن ئەو کێشەیەی چارەسەر کرد کە دیکارتیش بۆی چارەسەر نەکرا. خەڵکیش بەبێ هیچ ئەم لاولا کردنێك تێڕوانین‌و بیروبۆچونەکەیان وەرگرت. ماوەی سەردەمی "گالیلۆو

کیپلەر" بەس بوو بۆ ئەوەی کە گوێچکەکانی خەڵکی تیۆر وزانین و بیرۆکەی تازە وەربگرن کە لەسەر بناغەی زانستی فیزیایی و کیمیایی هەڵچنرابن. دۆزینەوەکانی کیپلەرو گالیلۆو دیکارت هۆکارێك بوو بۆ لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەکانی نیوتن.

زانای ئەڵمانی "ولهلم لایبنتز" تەواوکاری و جیاکاری دۆزیەوە لەهەمان ئەوکاتەی نیوتن دۆزیەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ژیاری خۆرئاوا لەم کاتەدا گەیشتبووە لوتکەی گەشەسەندن و پێشکەوتن. ئەم پێشکەوتنەش بەوەدا دیارە کە دوو کەسی هاوئاست لەڕووی ڕۆشنبیری و زیرەکی دەتوانن بگەنە یەك دەرەنجام لە لێکۆڵینەوەکانیاندا. لێکۆڵینەوەکانی نیوتن تەنها لەوەدا کورت نەبووبۆوە کە باسمان کرد، بەڵکو ئەم کەڵەزانایە لێکۆڵینەوەی کرد لەشەبەنگی خۆر وپێکهاتەی ڕوناکی و شکانەوەی، هەروەها تیۆری هەیدەرو دینامیك"دووجەمسەر"ی دارشت. ڕێگەی نیوتن بەڕاستی ڕێگەیەکی زانستی بوو، خۆی دەبینیەوە لەپیادەکردن وجێبەجێ کردنی بیرو تێڕوانینی ئەقلانی بەشێوەی تاقیکاری. ئەم ڕۆژگارە لەم کاتەوە ناونرا ڕۆژگاری ئاوەزگەری یاخود سەردەمی ئاوەزگەری.

## کریستنسن هیگن 1629-1695:-

کریستسن هیگن زانایەکی هۆڵندی بوو، لە بەناوبانگترین زانایانی فیزیایی سەردەمی خۆی بوو، هاوچەرخی نیوتن بوو. بەهۆی دەرهێنانی کاتژمێری سەماکار ناوبانگێکی ئەورووپی پەیداکرد. "هیگن" لە کتێبەکەیدا شتی زۆری خستە سەر لێکۆڵینەوەکانی گالیلۆ و دواتر لەساڵی 1672بڵاوی کردەوە. شەیدا بوونی بۆ هاوێنەو وردبین وای لێکرد "تەلیسکۆب" زیاتر بەرەو پێشەوە بەرێ. "هیگن" ئەوەی دەرخست کە ڕوناکی بەشێوەی شەپۆل شەپۆل دەڕوات.

## ئەستێرەناسی:-

لەنیوەی دووەمی سەدەی حەڤدە، ئەستێرەناسی وەکو بوارەکانی تر پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی. "ئەدمۆندهالی" 1656-1742، ئەستێرەی کلکداری دۆزیەوە، دواتر "هالی" بەدیارکەوتنەوەی دووبارەی ئەستێرەی کلکداری ڕاگەیاند لە ساڵی 1759، ئەمەش بەکردەیی ڕویداو ئەستێرەی کلکدار لەم ساڵەدا دەرکەوت. شیاوی باسە "هالی" دۆستی نیوتن بوو. هەروەها "جیمس بڕازلی " (1693-1762) لاری زەوی دۆزیەوە لەتەوەرەکەی دا. جگەلەمەش لە ساڵی (1729) لادانی ڕوناکی دۆزیەوە. هەروەها "ولیەم هەرشن" (1738-1823) لێکۆڵنەوەی لە بیرکاریدا دەکردو چاودێری ئەستێرەکانی دەکرد. هەروەك توانی تلیسکۆب زیاتر بەرەو پێشەوە بەرێتو پەڵەی خۆرو چیاکانی سەر ڕووی هەیڤو جەمسەری بەستەڵەکی سەر ڕووی مەریخی دۆزی یەوە. وە لە ساڵی (1781) هەسارەی ئۆڕانۆسی دۆزی یەوە. "هەرشل" کتێبێکی نووسی و تیایدا بزاوتنو جوڵانی کۆمەڵەی خۆری خستبووە بەرباس .

## فیــزیـــا:-

زانستی فیزیاش وەك بوارەکانی تر پێش کەوتنی بەخۆیەوەبینی. ئەمەش بە هەوڵو تێکۆشانی ژمارەیەك زانای ئەم بوارە. ئەم زانایانە هەستان بەچەندان دۆزینەوەی مەزن، لەوانە "تۆرشەلی" ئیتاڵی 1608-1648 توانی "بارۆمەتر" دابهێنێ ئەمەش بۆ پێوانەکردنی پەستانی هەوا. هەروەها " ئۆتۆفۆن جیرکی ئەڵمانی" (1602 – 1686) توانی "هەواکێش "دروستبکات. هەروەك زانایەکی تری ئەڵمانی بەناوی "فهرنهایت" توانی گەرمی پێوی جیوەیی چاکتر بکاتو گەرمی پێوی "فهرنهایت" بدۆزیتەوە کە بەشێوەیەکی بەرچاو لەلایەن "ئەنگلۆ سەکسۆنەکان" بەکارهێندرا. ئەم زانایە تاقی کردنەوەیەکی زۆری لەبواری کارەباو موگناتیسی دا بە ئەنجام گەیاند.

لەساڵی 1746 دوو مامۆستای زانکۆی "لیدن"، لە زەویەنزمەکان توانیان شوشەی "لیدن" بدۆزنەوە بۆ خەزنکردنی بارگەی کارەبایی. "بنیامین فراکلین" 1706 – 1790 بە بەکارهێنانی شووشەی لیدن توانی لە ساڵی 1753 دژە بروسك دابهێنێ.

**کیمیـــــا :ـ**

"ڕۆبەرت بویل"ی- ئێرلەندی 1627–1691 لە کیمیا دا شارەزاو بە سەلیقەبوو، لەم بوارەشدا ناوبانگی پەیداکرد. "بویل" لە ساڵی 1660 یاسای "بویل" دۆزیەوە، کە دەڵێ: "قەبارەی گاز هاوکوفە لەگەڵ دەرکردنو پەستانی هەوایی، ئەگەر بێتو پلەی گەرمی جێگیر بێت". بویل توانی ئاوێتەو تێکەڵەکان لەیەکترجوێ کاتەوەو فۆسفۆری کیمیایی ئامەدەبکات. هەروەها لە کەمۆڵەیەك کە ئاوی تێدابوو توانی هابیدرۆجین ئامادەبکاتو ماددەی کهولی لە دار دەربهێنێ. جگە لەمە "بویل" لێکۆڵینەوەی لە پێکهاتەی کریستاڵ دا دەکرد. لەو کتێبەی کە لە ساڵی1691 بلاوی کردەوە، لێکۆڵینەوەی کردبوو لەتیۆری ڕەگەزەکانی کیمیاو تێیدا ئامەژەشی دابوو بەتیۆری ئەتۆم.

هەروەها زانای ئینگلیزی "هنری کفندشن" 1731– 1810 گازی هایدرۆجینی دۆزیەوە. هەروەك ڕوونی کردەوە کە هەوا لە نایترۆجینو ئۆکسجین پێکهاتووەو ئاویش پێکهاتوە لە ئاوێتەیەك لە ئۆکسجینو نایترۆجین. بەهەمانشێوە زانایەکی تری ئینگلیزی بەناوی "پریستلی" 1733– 1802 گازی ئۆکسجینی دۆزیەوەو ئامەژەشی بەوەدا کە ئۆکسجین یارمەتی سوتاندن دەداتو هۆی هەناسەدانی شینایيە.

لەلایەکی ترەوە زانای فەڕەنسی "لافوزی"، کە بەناوبانگترین زانای کیمییایی سەدەی هەژدەبوو، تاقیکردنەوەی "بلاكو بریستلیو کفندش"ی دوبارەکردەوەو سەلماندنی. ئەم زانایە ئەوەی ڕوونکردەوە کە ماددە لە کارلێکی کیمیایدا بارەکەی دەگۆڕێ، بەڵام بڕەکەی وەك خۆی دەمێنێتەوە. ئەم شی کردنەوەیە مانای ئەوەی

دەبەخشی کە بنەماکانی نیوتن لە فیزیادا دەتوانرێ لە کیمیاشدا پیادە بکرێ. هەروەها زانای کیمیایی سویدی "شیلی" 1742- 1786 توانی کلۆر بدۆزێتەوەو کلیسرین ئامادە بکات.

## کانزاکـــاری:ـ

لەسەرەتای سەدەی هەژدە زانایان بەشێوەیەکی تێروتەواو بەبەردبوەکانو پەستانەکەیان شیکارکرد. بەناوبانگترین زانای جیۆلۆجی سەدەی هەژدە ""جیمس هەتن" ی سکۆتلەندی 1726-1797 بوو. "هەتن" هەروەك پاریزەربوو فیزیاویو کشتکاریش بوو. کشتاریەکەی لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە کێڵگەکەی بەڕێگەیەکی زانستی نوێ تۆو دەدا. "هەتن" لێکۆڵینەوەی دەکرد لەسەر تاوێرو گاشەبەردو سروشتو پێکهاتەی تاوێرو کانزاکانو بنچینەیان، بەمە گەیشتە تێگەیشتن لە ئەرز. ئەم زانایە سەرنج و تێبینیەکانی لەراپۆرتێکدا لە سالّی 1785 لە"ئەدنبرە"،پێشکەشی کۆمەڵەیی پاشایی کرد لەژێر ناونیشانی تیۆری زەوی. "هەتن" بەدرێژکردنەوەی تیۆرەکەی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەو گۆڕانکاریانەی کەلەسەر ڕووی زەوی دەیانبینین، ئەنجامی چەند هۆکارێکی داڕوتانو ڕامالّینو داخورانن، ئەمەش بەهۆی باو باران و ڕوبارو برکانەکانەوە بەدرێژایی مەلایین سالّ ڕوویان داوەو ڕووی زەویان گۆڕیوە. ئەم زەویەش بەم شێوەیەی ئێستای بەچەندین دەوری گەشەسەندنی یەك لەدوای یەکدا تێپەڕیوە. لەڕاستیدا ئەم تیۆرە شۆرشگێڕانەبوو، بەلاّم بەشێوەیەکی ناڕۆشنانە دارێژرابوو، نەبووە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی خەلّکی تاوەکو سەدەی نۆزدە.

## پزیشکیوزانستی زیندەورزانـــی:ـ

لەهەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە، بایۆلۆجیو پزیشکی گەشەکردنێکی مەزنو گەورەی بەخۆیەوەبینی. زانای ئیتالّی "مالّپیچی" 1628-1694 لە زانکۆی بولونا،

توانی لەڕێگەی توێکاری و بەکرهێنانی میکرۆسکۆبەوە سوڕی خوێن لەمووددەمارەکاندا بسەلمێنێ. هەروەها دورگەکانی مالپیێچی لە گورچیلەدا دۆزیەوە کە ئەم دوورگانە هەڵدەستن بەشی کردنەوەو پالاوتنی خوێن. "مالپێچی" لە سالی 1671 ئەوەی خستەڕوو کە ڕوەکەکان لە ڕێگەی گەلاکانیەوە هەناسەدەدات و لەڕێگەی پیتاندنەوە زیاد دەکەن. هەروەها "سیدن هام"ی ئینگلیزی 1624–1689 ئەوەی ڕوون کردەوە کە نەخۆش بەتایبەت گرانەتا، بریتیە لەهەوڵی نەخۆشەکە بۆ دەرکردنی تەنە بیانیە نەخۆشەکان لە لاشەدا. جگە لەمە شاعیری سویسڕی هالر 1707–1777 زانایەك بووە لەبواری توێکاریدا، هەروك فەیلەسوف بوو. شیاوی باسە هالر یەکێ بوو لە زانا دیارەکانی کارئەندامزانی. "بیکتی" فەڕنسیش 1771–1802، لێکۆڵینەوەی کردوە لە شانەکان و بناغەی زانستی شانەکانی دارشت. هەروەها "فان لوینهوك"ی- هۆڵندی 1632–1723 توانی بەکتریا بدۆزێتەوە. بەهەمانشێوە زانایەکی تری هۆڵندی بەناوی جان سوامردام 1637–1680 مێژووی زیندەوەرزانی نوسیەوە، پاشان بەشێوەیەکی فراوانتر لە سالی (1737)چاپی کردەوە لە ژێرناونیشانی "ئینجیلی سروشت". لەم کتێبەدا پەرەسەندنی زیندەوەرانی ڕوون کردبوویەوە هەر لە -گەرا- تاوەکو کرمی پێگەیشتوو. ئەمەش هەمان ئەو گەشەکردنەیە کەبەسەر کۆرپەلەدا دێت.

## ڕوەك ناسی:-

"جۆن ڕەی" ئینگلیزی 1627–1705 یەکەم زنجیرەی لە کتێبەکانی زانستی ڕوەکناسی بلاو کردەوە. "ڕەی"- پۆلێن کردنی ڕوەکی زیاتربەرەو پێشەوەبرد. پاش ئەوە لێکۆڵینەوەی کرد لە گیانلەبەران و لەمەدا توێکاری بەراوردکاری بەکارهێنا. لێکۆڵینەوەکانی ڕەی بووە هۆی پێشکەوتنێکی بەرچاو لە پۆلێنکردنێکی سروشتی بۆباڵندەو زیندەوەران.

**ئـــاژەڵ( ژیانەوەران )**

زانـستی ژیانـەوەران بەتوێژینـەوە کـردن لەسـەر ژیانـەوەرو ئاژەڵـە نامۆکـان، کـە کەوتبوونە بەرچاوی گەشتکارو گەڕیـدە ئەورووپیـەکان لـەدەریاو زەریاکانـدا لەسـەدەی حەڤـدە و هـەژدە پێـشکەوتنی گـەورەی بەخۆیـەوەبینی. زانینـی زانـستی ژیانـەوەران لەسەردەستی زانـای فەڕەنـسی "بـافۆن"1707-1788، گەیـشتە چڵەپۆپە. بـافۆن لەکتێبی "مێژووی سروشتی بۆ ژیانەوەران"، جیـاوازی ناکـات لـەنێوان مـرۆڤ وئـاژەڵو ژیانـــەوەرە نـــزم وکەمـــەکان، هـــەروەك دەڵـــێ: ئەگـــەر ئینجیـــل نەبوایـــە، دەگونجـــا بڵێین"مرۆڤو مەیمونو ئەسپو گوێ درێژ لە یەك ڕەگەزن".

ئـــەم دەســـتەبژێریە باســـمان کـــرد لـــەزانایان، کاریگـــەری زۆریـــان هـــەبوو لەســـەر هاوچەرخانیان، خـەڵکی ئاکـامی توێژینـەوەو لێکۆڵینـەوە زانـستیەکانیان وەردەگرت. ئەمانـە تـەنها بەتاقیکردنـەوەو توێژینـەوەی زانـستی ئۆقرەیـان نـەدەگرت، بـەڵکو لـە سروشتو بونەوەرو ئەودیو سروشتو خـودای دروسـتکاری سروشـت ڕادەمـانو بیریـان لێدەکردەوە. فەلسەفەی "ئەودیو سروشت" ببووە بەشـێك لـە زانـستە سروشـتیەکان، ئەمەش بەهۆی پەیوەستیو بەیەکەوە بوونی مەعریفەی زانستی سروشـتی وەك: فیزیـا بە فەلسەفە، ئەمانە بە پرسـیارکردنیان بـۆ دۆزینـەوەو دەرخـستنی ئـەودیو سروشـت، فەلسەفەیان کردە دژو نەیاری لاهوت، دوای ئەوەی لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە تـاوەکو سەدەی حەڤدە لەگەڵ لاهوت دا بەیەکەوە دەخوێنران.

لەبەشی پێشوو باسی دوو فەیلەسوفمان کرد لە ناو پێشەوایانی فەلسەفەی ئەودیو سروشـت، ئـەوانیش "جوردانـۆ برۆنـۆ"و فەلـسەفەی یەکیـەتی بـوون"وحـدە وجـود"، هەروەها "فرانسیس بیکن" لە گوتارەکانیدا. لە سەرەتای ئەم بەشەدا باسی دیکـارتو فەلسەفەی کارتیزمان کرد، لەگەڵ کاریگەری بەسەر ئاقاری ئەقڵانیو ئەودیو سروشـت. "بیرکازند"یش- 1650-1952 هاوچەرخی دیکارتی زانای بیرکـاری بـوو، سروشـتی بەشێوەکی سروشتی ڕاڤەکرد. هەروەك دەڵێ:" زانستو زانیاری پەیـدادەبێو پێکـدێت

لەڕێگەی هەستکردن بە ماددەو پاشان ڕەنگ دانەوەی لە هزردا". بەبڕوای ئەو ماددەی ئەتۆم نەدروست دەبێتو نە لەناودەچێت.

## کاریگەری ئاقاری زانستی لەسەر ئاین

ئاین بەشێوەیەکی تایبەتی کاریگەربوو بە پێشکەوتنی زانستیو فەلسەفی، ئەم کاریگەریە تەنها لەسەدەی هەژدە دیارو بەرچاو بوو، ئەگینا لەسەدەی حەڤدە فەیلەسوفانو زانایان هەر پەیوەست بوون بەئاینیان. جا ئەم زاناو فەیلەسوفانە چ سەر بە ئاینزای پرۆتستانتی بووبن یاخود کاسۆلیکیەت. ململانێ بەدرێژایی ئەم سەدەیە لەنێوان ئەوانو ئاینزاکانی پرۆتستانتی هەربەردەوام بوو، ئەمە لەکاتێکدا هەردوو ئاینزای سەرەکی نێردراوە مژدەدەرەکانیان لەدەرەوەی ئەورووپادا بەرەو لاوازی چووبوو.

## سەرهەڵدانی مەزهەب دنیا نەویستی:-

لەنیوەی دووەمی سەدەی حەڤدە لەنێو ڕیزەکانی پرۆتستانیزم مەزهەبێك سەریهەڵدا بەناوی مەزهەبی دنیانەویستی"الزهاد". ئەم مەزهەبە ئەوەندەی بەهۆی ناکۆکیو جەنگی نێوان ئاینزاکانی نێو ئاینی مەسیحیەت سەریهەڵدا، ئەوندە بەهۆی کاریگەری و ئاکامی پێشکەوتنی زانستیو فەلسەفی سەریهەڵنەدا. ئەم ناکۆکیو دووبەرەکیەی ببووە هۆی نارەزایی پەست بوونی بەشێکی زۆری خەڵکی. شوێنکەوتوانی ئەم مەزهەبە بە"دنیانەویست" ناسرابوون. ئەوان سوربوون لەسەر ئەوەی کە مەسیحیەکان خۆیان ڕابهێنن لەسەر مشتو مڕی ئاینیو بیروباوەڕ، وە لەسەر پارێزگاری(تقوی)و دنیانەویستی وسادەژینی و ژیان لەسەر مەسیح ئۆقرە بگرن. "فیلب سبنسەر" 1635–1795، یەکێ بوو لەدنیانەویستە لۆسەریە دیارە ئەڵمانیەکان، لەو کتێبەی کە لە ساڵی 1675 لەژێر ناوی "هەستی دڵ بۆ چاکسازی کلێسای ئینجیلی، ئەوەی کەخودا پێی ڕازیە" بڵاو کردەوە. لەم کتێبەیدا ئامۆژگاری

کۆمەڵەکـەی دەکـات، کـە دەمەتـەقێ ئاینیـە ئـاژەوە هێنـەکان وازلێبهێـنن‌و بـبن بەدنیانەویـستێکی کردەیـی. هـەروەك دەڵـێ: "پێویـستە ئـاین پەیوەنـدی بەتاکـەوە هەبێت، بۆئەوەی و گیانی پیرۆز جێگەی بگرێتەوە بگرێتەوەو هەموو باوەڕدارێك بەرەو دنیانەویـستی‌و پارێزگـاری بـچن". ژمارەیـەك لەلۆسـەری‌و کالڤنیـەکان هەسـتان بـە بلاوکردنەوەی بیروڕاکـانی سبنـسەر لـەناو جیلـەکانی دوای خۆیـان. ئەمـەش لـەماوەی سەدەی هەژدەو لە ئەوروپا بەتایبەت لەئەڵمانیا.

" ولهلـم لایپنتـز" یـەکێ بـوو لـەو دنیـا نەویـستانەی کەدەیانویـست کاسـۆلیکی‌و پرۆتستانت لەیەکتر نزیك بکەنەوە. بەهەمانـشێوە "ئیمانۆئیـل کانـت" یـەکێ بـوو لـەو کەسانەی کە لەنێو ژینگەی دنیانەویستان پێگەیشت.

لـە نێـو دنیانەویـستە بەرچـاوەکان لەکیـشوەری ئـەوروپا، "ئیمانۆئیـل سـویدنبرك" 1772-1688 بوو. "سویدنبرك" کـوڕی یـەکێ لـە مامۆسـتا لۆسـەرییەکانی زانکـۆی ئەپـسالا بـوو لـە سـوید. ئـیتر وەك زانایـەکی بـواری بیرکـاری‌و فیزیـا وجیۆلـۆجی‌و ئەندازیاری نـاوی دەرکـرد. لەسـاڵی1745 بانگەشـەی ئـەوەی کـرد کـە ئـەو ڕوونـاکی خوداو دەرکـەوتن(کـشف)ی دەسـتکەوتووە. ئـەم ژیـانی خـۆی تـەرخانکرد بۆنوسـینی ژمارەیـەکی زۆر لـە پیرۆزییـە ئاینیـەکان لـەدانایی(حیکمـە) وخۆشەوسـیتی خـودا. سویدنبرگ لەدوای مردنی کاریگەری بەجێهێشت‌و قوتابیەکانی کلێـسایەکیان دامەزرانـد بەناوی کلێسای سویدنبرگ یا قودسی نوێ.

## جۆرج فۆکس‌و کۆمەڵەی هاوڕێیان:-

لـەئینگلترا کۆمەڵـەی "هاوڕێیـانی دنیانەویـستی"سـەریهەڵدا، دامەزرێنـەری ئـەم بزوتنەوەیەش "جۆرج فۆکس"ی- ئینگلیزی 1624-1691 بوو. فۆکس خۆی خـۆی ڕۆشنبیرکردو پێگەیاندو بیروڕاکانی خۆی پێ زۆر تـەواو بـوو. ئـەم بـاوەڕی بەخورافـەو پڕوپوچی هەبوو. بەڵام زۆر دڵسۆزو دلگـەرم بـوو بـۆ بیروبـاوەڕی خـۆی دنیانەویـستی.

کڵێسا لە تێڕوانینی ئەودا دابەزیوە بۆ پۆخڵەواتی‌و نزمی کوفر. "فۆکس" جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئاین گیانێکە لە ڕێگەی ڕوناکیەکی نێودڵو خۆ پەروەردە کردنەوە پەیدادەبێت، ئەمەش پێویستی بەکڵێساو شوێنی پەرستن نییە. هەروەك دەڵێ: "سادەژینی‌و پەنابردن بۆ جەنگو دەستهەڵگرتن لەچەكو قسەنەرمی‌و سوێند نەخواردن تەنانەت لەکاتی پێویستیش، لە مەرجە سەرەکی وگرنگەکانی ئاینن".

ئەم کۆمەڵەیە ناسرابوون بە "کۆمەڵەی هاوڕێیان"، ئەوان ماوەیەکی زۆر بەنەویستراوی‌و دڵشکاوی مابوونەوە، تا ئەو کاتەی هەندێ لە ئەرستۆکراتیەکانی وەك "لیەم پین" 1644-1718 بەلایاندا چوون. بیروباوەڕەکانی ئەم کۆمەڵەیە تایبەت بوون بە لێبوردەیی‌و چەك هەڵنەگرتن‌و بەژداری نەکردن لەجەنگی دژی بە پرۆتستانتە ڕادیکاڵیەکان بەتایبەت باپتیستەکان"ڕاگیرکارەکان"و ئەبریشیەکان.

ساکاتێکیش کڵێسای ئینگلیزی پشتی بەست بەچینی ئەرستۆکراتی، هیچ بایەخی نەدا بەچینی گشتی‌و فەرامۆشی کردن. خەڵکی ڕووی کردە دنیانەویستی. لێرەوە یەکێ لەقەشەکان بەناوی "جۆن ویلزی" 1703-1791 هەلی قۆستەوە بۆ ڕاکێشانی تەواوی خەڵکی بەرەو بانگەشە تازەکەی کەناسرا بوو بە مەنهەجیەکان(میسۆدیست)

## بزوتنەوەی میسۆدیست( مەنهەجی ):-

جۆن ویلزی وەك ووتمان: دامەزرێنەری ئەم بزوتنەوەیە بوو. ویلزی کوڕی قەشەیەکی ئینگلیکانی بوو. ئەو کاتێك لەساڵی 1729 لە ئۆکسفۆرد دەیخوێند، بووبە سەرۆکی ژمارەیەك قوتابی، کەخۆیان ناونابوو"هاوەڵانی بانگەوازی پیرز"،پاشان ناوی"میسیۆدێست"یان- بەسەردابڕا، بەهۆی خۆگرتنەوەیان لە چێژو خۆشی ڕابواردنەکان‌و بەردەوام بوونیان لە دنیانەویست‌و چاکەکاری‌و دڵ گەرمیان بۆئاین. "ولزی" لەدوای ئەوە ئینگلتەڕای جێهێشت‌و ڕووی کردە هیندستان‌و جۆرجیا و، لەوێدا پەیوەندی کردبەمزدەرە(مبشیر) پرۆتستانە ئەڵمانەکان، لەوانیشەوە فێری

تەعالیمەکانی دنیانەویستەکانی ئەوروپا بوو. کاتێکیش گەڕایەوە ئینگلتەڕا لەساڵی 1738، گۆڕابوو بۆ کەسێکی دنیانەویست. ئاین لەتێڕوانینی ولزیدا "هەستو پەسندکردنێکی خودی کەسەکەیە". میسیۆدیستەکان بەهۆی بایەخ نەدانیان بە دروشمە ئاینیەکانو سۆزو دلگەرمی توندەڕەویانو نزیکیان لەخەڵکی، لە کلێسای ئینگلیزی جیابوونەوە. شیاوی باسە ئەم مەزهەبە بووبە مەزهەبێکی بەربلاوی ئینگلتەڕاو ئەمریکا.

## ئەبرشیەکــان:

ولزیو کۆمەڵەکەی "مسیۆدیستە دنیا نەویستەکان" کاریگەریان هەبوو لەسەر زۆرترینی ئەو پڕۆتستانتانەی کە لەگەڵ کلێسای ئینگلیزی دانەبوونو،لەولاتانی ئەنگلۆساکسۆنی بەربلاوبوون. دلگەرمیو پارێزگاری ودنیانەویستیان کاریگەری هەبووبەسەر باپتیستەکان"ڕاگیرکارەکان" و ئەبرشیو کلێسای سکۆتلەندی، هەروەك کاریگەریان دروست کرد لەسەر کلێسای ئینگلیزی. تەنانەت بزوتنەوەی ئەبریشی بوونە هۆی ئەوەی قوتابخانەکان لەڕۆژانی یەك شەممە بکرێنەوەو دەستبکرێتەوە بە سازکردنی هەڵمەتە مژدەدەریەکان.

## مۆلینوسو هادئین:-

بزوتنەوەی هادئی لەسەدەی حەڤدەو لە وولاتە کاسۆلیکەکان دەستی پێکرد. پێشەوای ئەم بزوتنەوەیە میکائیل مولینوس(1640-1697) بوو، "مولینوس" قەشەیەکی ئیسپانی بوو، لە ڕۆمادا نیشتەجێ بوو. بەبڕوای "مولینوس"و کۆمەڵە، پیرۆزی ڕاستو دروست پشت نابەستێ بەکلێسا یاخود بیروباوەڕو ئەقل، بەڵکو ڕاوەستاوە لەسەر پشت بەستنی بەندە بەخودا، ئەمەش بۆ ڕۆیشتنی ڕووناکی خودا بۆ نێو دەروون. پاپاو پیاوانی ئاینی بۆئەوەی ئەم بزوتنەوەیە کاریگەری دروست بکات بەسەر کاسۆلیکەکان، وەك چۆن بزوتنەوەی دنیا نەویستەکان کاریگەری دروستکرد

بەسەر پرۆتستانتەکان، پشتگیری ئەم بزوتنەوەیان کرد. ئەم بزوتنەوەیە لە فەرەنسادا بڵاوبویەوەو ئوسقوف "فینیلیون" (1651–1715) پشتیوانی لێ کرد. بەڵام لەساڵی 1687 پاپا "مولینیوس"ی– بە هرتقە تاوانبار کردو لەساڵی 1699 ڕەخنەی لە "فیلنیلون" گرتو، بزوتنەوەی هادیئیەکان کۆتایی پێهات.

## سەردەمی ئاوەزو ڕۆشنگەری

## ڕۆشنگەری یان ڕۆشنی:-

بیروفکرەی سەرەکیو ئەساسی ڕۆشنگەری، ئەو بیروباوەڕە بڵاوەو باوسەندوەیە کەپێی وایە ئاوەزی مرۆڤ توانای زانینی ئەو سیستەمە جیهانیەی هەیەو توانای تێگەیشتنی بنجو بناوانی ئەم بونەوەرەی هەیە،و باڵادەستە بەسەریداو دەتوانێ بۆسودو کەڵکی مرۆڤایەتی ڕامی بکات، بەبێ ئەوەی پەنا بەرێ بۆلاهوتو پەڕەجوو"معجیزە". ڕۆشنگەران دەیانویست خەڵکی دان بهێنن بەبنەماو بنچینەکانی زانستە سروشتیەکان و، ئەو بیرو فکرانەشی کەپەیوەندی پێیەوە هەیە، لەبوارەکانی فیزیاو ئاکار(صیفەت)و فەلسەفەو ئاینو مێژوو سیاسەتو یاسا[1].

ڕۆشنگەران بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، کە لە سروشتدا ڕێك وپێکیو گونجاوی هەیە، شڵەژاویو شەڕو دەمارگیرییو نەزانی بۆتە هۆی جەنگو چەسانەوەو ئازاردانو بڵاوبونەوەی خرافەو ئەفسانەو دابەزینی کۆمەڵگە بۆنزمیو پوچی. لەهەموو ئەمانەشدا سیستەمی سیاسیو کۆمەڵایەتی داسەپاووخۆسەپێن، بەرپرسیارە لەتەواوی ئەو خراپەکارییو شەڕو گەندەڵیانە. لەبەرئەوە پێویستە ئەم سیستەمە بە پێوەرێکی ژیرییو لۆژیك چارەسەر بکرێ، بە مەبەستی خێروخۆشی مرۆڤو ئاسودە بوونی.

---

1 white, op. cit: pp. 267-2993. Gottschalk, op. cit; pp.502-506;513-532.

ووردەکاریو تێبینیەکانی شۆڕشی هزری لەسەدەی هەژدە، دەتوانین لەچوار خاڵی سەرەکی دا گوزارشتی لێ بکەین:-

1-سروشت" شوێنی ئەو دیو سروشت" بگرێتەوە، هەروەها زانست شوێنی لاهوت بگرێتەوە، بەوەی کە جیهانی ماددی یاسای سروشت بەسەریدا زاڵە.

2- ناویان لێ نا ئاوەزی مرۆیی، ئەو ئاوەزەی پێویستە لە دۆزینەوەو دەرخستنی یاساکانی سروشت بخرێتەکارو ژیانی تاکەکەس هەر بەگوێرەی ئەم ئاوەزە ڕێکبخرێتو ساز بکرێ.

3- بەکارهێنانی ئەقڵو هزرو گوێڕایەڵی یاسا سروشتیەکان دەبێتە هۆی پێشکەوتنی خێرا، وە لە کۆتایشدا گەیشتن بە کەماڵو تێرو تەواوی.

4-گرنگی دان بەمافەکانی مرۆڤو هەوڵدانو کۆشش کردن لەپێناوی پێکهێنانی کۆمەڵگەی مرۆیی بالا.

ڕۆشنگەران هەموو دامەزراوەو ڕێکخراوەکانیان بەپێوەری ئاوزو لۆژیک لێک دەدایەوە، جا چ دامەزراوەیەکی سیاسی بووایە یان کۆمەلایەتی یاخود ئاینی. ڕۆشنگەران ئەمەیان دەخستە ژێر تیشکی ئاوەز، تا بزانن لەگەڵ ئەو پێوەرانەی کە دایان ناون کۆکە، لەگەڵ ئاوەزو لۆژیکو یاسا سروشتیەکان تەبایە.

## سەرهەڵدانی ئاینی سروشتی یاخود باوەڕ بە"خودای تاك"

## دروستکاری بونەوەرو سروشت

پێشکەوتنی زانستی لە سەدەی هەژدە کاریگەری تێکشکێنەری خستە سەر ئاینو کڵێسا. کڵێسا ڕووبەڕوی ڕەخنەی زانستی بوویەوە، ڕەخنەیەك پایەو کۆڵەگەکانی هەڵتەکاندو خەڵکی والێکرد لە ئاین یان بکەونە گومان، ئەمەش لەپرۆتستانتیەوە بۆ کاسۆلیك جیاوازی نەبوو. بەناوبانگترینی ڕەخنەگرانیش بریتی بوون لە:بیربایل-ڤۆڵتێر-هۆیلباخ- دالمبیرت-دیدرۆ- ئەوانی تر لەڕەخنەگران.

لەنیوەی دووەمی سەدەی حەڤدە مەزهەبێکی ئاینی نوێ سەریهەڵدا، کەبە ئاینی "سروشتی" ناسرا. ئەم مەزهەبە کاریگەر بوو بە پێشکەوتنە فەلسەفیو زانستیەکان، بەتایبەت زانستو فەلسەفەی سروشتی. هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم مەزهەبە گومان دارە، سێ هۆکاربوون:-

1–هەبوونی جیاوازی ناکۆکی زۆر، لەنێوان مەزهەبە مەسیحیە لێکجیاوازەکان.

2–چینی ڕۆشنبیرو خوێندەوار لەسەدەی حەڤدە، کاریگەر بوون بەوەی کە دۆزەرەوەکان لەووڵاتو شوێنە دوورە دەستەکان کەوتبووە بەرچاویان، لەبەربەریە ڕووت وقوتەکان، ئەوانەی کە بەسادە ژینی ژیان دەگوزەرێننو بەختەوەرو ئاسودەن، بەبێ هەبوونی ئاینو بیروباوەڕو دروشمە ئاینیەکان.

3–پێشکەوتنی زانستی سروشتیو فەلسەفی ڕاوەستا بوو لەسەر ڕاڤەکردنی شتەکان لە ژێرتیشکو پێوەری ئاوەزو لۆژیکو، گومان کردن لەهەموو شتێك. لەبەرئەوە دەیانپرسی: ئەگەر بونەوەر گوزارشتە لە ئامێرێکی زەبەلاحو، کاردەکات بەگوێرەی یاسای سروشتی، ئەوا ئاینیش وەك بونەوەر پێویستە سروشتی بێت. ئایە لە توانای ئاوەزی مرۆڤایەتی دانی یە کە ئاینێکی ڕاستەقینە بدۆزێتەوە، وەك چۆن بەبێ پەنابردنی بۆ پەڕجوو ئیستخارەو پاڕانەوە، یاسای کێش کردنی دۆزییەوە؟

بیرۆکەی ئاینی سروشتی لەم کاتەدا تازە نەبوو، بەڵکو پێشتریش بەشێوەیەك لە شێوەکان بوونی هەبوو، تۆمای ئەکوینی لەسەدەی سێزدە لەمەی کۆڵیوەتەوە. پێی وایە هەموومرۆڤێکی ژیر باوەڕی بە شتە ئەساسیەکان هەیە، لەباوەڕبوون بەخودا، وەبەنەمریو،پاداشتو سزا. مەسیحیەتیش شوێنکەوتەی ئاینی سروشتیەو لەگەڵیدا کۆکەو پێچوانەی نییە. وەلێ لە سەدەی حەڤدە لەگەڵ جەخت کردنەوەیەکی زیاتر لەسەر سروشتو یاسای سروشتی، بەڵام هەندێ لەپشتگیری کارانی ئاینی سروشتی لەمەسیحیەت لایانداو لەدژی ڕاوەستان. بەشێوەیەك کە ئەگەر شتێ لەئاینی مەسیحی کۆك بوایە لەگەڵ ئاینی سروشتی ئەوا بەلایانەوە زیادەبوو، خۆئەگەر پێچەوانەی بوایە، ئەوا بە پڕوپوچ دەیاندایە قەڵەم.

"هێربەرت ئـوف شـیربری"(1583- 1648)، یـەکێ بـوو لەکەسـە دیـارو بەرچاوەکانی ئـاینی سروشـتی. "شـیربری" لـۆردێکی ئینگلیـزی بـوو، لـە ئۆکسفۆرد سـەرقاڵی خوێنـد بـوو، وە لەڕێگـەی پەیوەنـدی کـردن بـەزاناو فەیلەسـوفەکانی ئـەو سەردەم، بەتایبەت "کازیند"ی- فەڕەنسی، بـووە کەسێکی گوماندار. بـەلآم بـەهۆی ئـەوەی لـە چـینی ئەرسـتۆکراتی بـوو، خـاوەنی پلەوپایـەو سـەروەت وسـامان بـوو، دلسۆزبوونی بۆ بنەماڵەی پاشایی خۆی پاراست لە دەربڕینـی بیروبـاوەڕە ئاینیەکـەی. "شـیربری" دوو گوتـاری بلآوکـردەوە، یەکـەمیان لـەژێر نـاوی " ڕاسـتەقینە وەکـو جیادەکرێتەوە لە کەشف وتواناو درۆ " لە ساڵی (1624) بـلآوی کـردەوە، دووەمیـان بەناونیشانی "ئـاینی بـت پەرسـتی" لەسـاڵی (1663) بـلآوی کـردەوەو تێیـدا دەڵـێ: کرۆكو ڕاستەیەتی ئاینی سەقامگیر دەبێـت لەسـەر هـستەکانی ئـەقڵی گشتی مرۆیـی. وەئاینی سروشتی باوەڕێکی ئاوەزگەریانەیە بەخوداو چاکەکاریو نەمری".

جگە لەمانە توێژینەوەی ڕەخنەگرانە لەهەمبەر کتێبی پـیرۆز سـەریهەڵدا، تەنانـەت هـۆبزی ئینگلیـزی نکوڵی لەتـەوڕات دەکـرد بـەوەی لـەلایان خـوداوە نیگـا کرابێـت بـۆ موسی"د-خ"، هەروەك گومانی هـەبوو لەڕاسـتیەتی مێـژوویی تـەوڕات. شـیاوی باسـە "سـپاینۆزای" فەیلەسـوفی هۆلنـدی گومـانی هـەبوو لـە ڕاسـتیەتی مێـژوویی تـەوڕات. هـەروەها توێـژەری فەڕەنـسی "ڕیـچارد سـیمن" لەسـاڵی(1680) ڕەخنـەی مێـژوویی کتێبی پیرۆز"ی نوسیو لە ساڵی(1689) کتێبێکی تـری خسـتە بەردیـدی خوێنـەران، بەناونیشانی "ڕەخنەی میژووی لەهەمبەر ئینجیل". ئیدی دوابەدوای ئەمانـە یرمەنـدان کەوتنـە گومـانکردن لـە پیرۆزیـەتی کتێبـی پـیرۆزو پـەڕەجووە نوسـراوەکان. لەسـاڵی (1792) "ئیفنس"ی ئینگلیزی نکوڵی کرد لەوەی ئینجیل کاری حەواریەکان بێت.

ئاینی سروشتی لە ئینگلتەڕا لەنێو سیاسـەتوانانو چـینی ئەرسـتۆکراتی و تەنانـەت لەنێو پیاوانی ئاینی ئینگلیـزیش بلآوبوویـەوە. خـۆ وەنـەبێ مەزهـەبی نـوێ ویـستبێتی ئاینی مەسیحی لەناوبەرێ، بەڵکو دەیویست چاکسازیەکی تێدا ئەنجام بـدات کـە ڕەگـو

ڕیشەی بگرێتەوە، وەك ڕەتكردنەوەی باوەڕبوون بە خوایەتی مەسیح و دابەزینی كتێبی پیرۆز لەلایەن خوداوە. لە جیاتی ئەمە باوەڕبهێندرێ بە خودای دروستكاری بونەوەرو سروشت و یاسای سروشتی و ئاوەزی مرۆیی. ئیدی لەمەوە "پەرستراویەتی سروشت" بووبە ئەوناوەی كە ئینگلیزەكان بەكاریان هێنا بۆ ئەم مەزهەبە تازەیەو ناویان لێی نا" خوایەتی سروشت". ژمارەیەك لەزاناو فەیلەسوفانی ئەو سەردەم ئەمەیان پەسەند كرد، وە ژمارەیەكی زۆر لەو خەڵكانەی كە دەیانویست سازبوونێك دروستبكەن لەنێوان مەسیحیەتو هەستە گشتیەكانو مەعریفەتی نوێ، ئەمەیان وەرگرتو پەسندیان كرد.

ئاینی سروشتی ئاینی ڕۆشنگەرانی سەردەمی ڕۆشنگەری بوو، باوەڕیان وابوو كە خودا بونەوەری دروست كردوە، بەلاَم هەڵسوڕاندنی خستۆتە ئەستۆی سروشت خۆی، بۆ ئەوەی كاربكات بەگوێرەی ئەو یاسایانەی كەخۆی داینـاون. ئاینی سروشتی لەئینگلتەڕاوە دزەی كردە فەڕنسا و تەواوی كیشوەری ئەوروپا، لەنێو باوەڕدارانی ئاینی سروشتی لە فەڕەنسا، "پیربایل" (1706-1647)بەناوبانگترنیان بوو، پیربایل كوڕی قەشەیەكی پڕۆتستانتی بوو، دواتر بووە كاسۆلیكی، بەلاَم لەسەر ئەم ئاینزایەش ئۆقرەی نەگرت و هاتەوە سەر ئاینزای پڕۆتستانتی، وەلێ لەدواتردا گومانی هەبوولەتەواوی ئاینەكان. "پیربایل" كاتێ بینی ڕەوشی هەرتەقە لەزۆربەی شوێنەكانی ئەوروپا لەمەترسی دایە، ڕووی كردە هۆڵندا، لەوێشدا و لەساڵی (1681)بوویە مامۆستای فەلسەفەو مێژوو لەزانكۆی ڕۆتردام، "پیر بایل" لایەنگری فەلسەفەی كارتیزیو ئاوەزگەری بوو، هەروەها پشتگیری دەكرد لە بیری ئازادیو لێبوردەیی. كاتێكیش كالڤنی وكاسۆلیكەكان ڕازی نەبوون بە ڕاڤە كردنەكەی، چونكە لێبوردەیی بەلایانەوە بەمانای چاوپۆشی دێت لە گومانكردنو هەڵە، هێرشیان كردە سەر نوسینەكانی، لەملاشەوە كاسۆلیكەكان هێرشیان كردەسەریو خستیانە نێو كڵپەی ئاگر. "بایل" لەساڵی(169)لەپۆستەكەی دەركرا، وەلێ ئەمە ورەی دانەبەزاند، بەڵكو هەر بەردەوام بوو لەنوسین. بەناوبانگترین كتێبی خۆی دەبینێتەوە لە "فەرهەنگی مێژووی ڕەخنەیی"، كە لە ساڵی (1697) چاپی كردو تێیدا شێوازی لێكۆڵینەوەی

زانستی تەواوی خۆی دەرخست لە جیاتی لایەنگری وسۆزداری، هەروەك گاڵتەدەكات بە باوەڕێكی لاسایی(تقلیدی)و لە تێڕوانینیدا ئەم جۆرە باوەڕە لە پڕوپوچیو خوڕافەوە گەشە دەكات.

## ماسۆنیەت :ـ

بڵاوبوونەوەی ئاینی سروشتی هۆكارێك بوو بۆ سەرهەڵدانو بڵاوبوونەوەی ماسۆنیەت. ماسۆنیەت لە سەرەتای سەدەی هەژدە لەئینگلتەڕا سەریهەڵدا، ئەمەش بۆ بەردەوامی دان بوو بەو كۆڕ(محفل)ە ماسۆنیانەی كە هەندێ دروشمی ڕوكەشی سەندیكاكانی بیناسازانی لەسەدەكانی ناوەڕاستەوە بۆخۆی پاراست بوو، ئەم سەندیكایانەش لەسەدەی شازدەوە بەرەو نەمانو لێكهەڵوەشانەوە چووبوون. كۆڕەماسۆنیەكان ئەوو ئەرستۆكراتیو ڕوشنەگەرانەی تێدابوونە ئەندام كە ئاینی سروشتیان هەبوو. ئیدی لێرەوە كۆڕە ماسۆنیەكان گۆڕانیان بەسەرداهات. باودۆخی ئەم كۆڕەماسۆنیانە هەروا نەمایەوە، بەڵكو دۆخەكەیان گۆڕاو ژمارەیەك لە كۆڕەكان لەساڵی(1717) بۆ پێكهانانی كۆڕێكی مەزن یەكیەتیەكیان پێكهێناو لەندەنیان كردە بارەگای گشتی خۆیان، ئەمجا لەژێر تیشكی گیانی ڕۆژگاری ڕۆشنگەری دەستورو دروشمەكانی خۆیان بژاركردو چاكسازیان تێداكردو دەستیان كرد بەبلاوكردنەوەی ماسۆنیەتی نوێ.

ماسۆنیەت لەژێر سەرپەرشتیاری كۆڕی مەزنی ئینگلیزی لە بەریتانیاو داگیرگەكانی بڵاو بوویەوە، پاشان لەساڵانی (1725-1736) دەستیان كرد بەدامەزراندنی كۆڕە ماسۆنیەكان لەئێرلەنداو سكۆتلەندا، ئەم كۆڕە ماسۆنیانە بەشێوەیەك بڵاوبوونەوەو پەرەیانسەند تا لەكۆتایی سەدەی هەژدە تەنها لە ئینگلتەڕا ژمارەی كۆڕەماسۆنیەكان گەیشتە هەزاروشەش سەد كۆڕ. هەروەها لەساڵی(1733) كۆڕە ماسۆنیەكان لە بۆستن دامەزران، دوواتر لە فیلادلفیاو شارەكانی تری ئەمریكا بەهەمانشێوە كۆڕە ماسۆنیەكان دامەزران. بەهەمانچەشن لە كەنەداو دورگەی هیندی خۆرئاوا لە

سالانی(1740-1742) کۆڕی ماسۆنیەت دامەزرا. وە لەسیەکانی سەدەی هەژدە ماسۆنیەت لەهیند بلاوبوویەوەو لەسالی(1730) کۆڕی ماسۆنیەت لەکیلیکتاو میدراس دامەزرێندرا.

پادشاو ئەرستۆکراتیەکان چوونەپال ماسۆنیەت، بەهەمانشێوە کەسە سەربازیەکان پەیوەنیان پێیەوە کرد، "بنیامین فرانکلین" یەکەم کەسێ بوو کە کتێبی لەبارەی ماسۆنیەت بلاوکردەوە لەسالی(1734)، هەروەها "جۆرج واشنتن" لەسالی(1753) پەیوەندی کرد بە کۆڕی ماسۆنیەتی فەرجێنیا.

لە ئەورووپاش یەکەم کۆڕی ماسۆنیەت لە فەڕەنسا سەریهەلداو لەسالی(1732)بەربڕاری فەرمی لەکۆڕی ئینگلیزی بەدەستهێناو ناوەکەیشی بوویە کۆڕی مەزنی خۆرهەلات. ئینجا لەهەریەکە لەئەلمانیاو ئیتالیا کۆڕی ماسۆنیەت دامەزرا، ئەمەش لەسالی(1763)، وەلەسالی(1773) لە سوید دامەزراو لەسالی (1771) لەڕوسیا کۆڕی ماسۆنیەت کرایەوە.

ئەم کۆڕە ماسۆنیانە پشتیوانی ئاینی سروشتیان دەکردو هەندێ لەپیاوانی ئاینی مەسیحی وێڕای جیاوازی ئاینزایان خستنیە ڕیزەکانی خۆی، ئینجا کۆڕی ماسۆنیەت ئەوەی لێ قەدەغەکردن کە مشتو مڕی مەزهەبی لەناو کۆڕی ماسۆنیەت ئەنجام بدەن، بەلکو تەنها داوایان لێ دەکردن کەبەشێوەیەکی ئاسایی‌و سادە باوەڕیان بەخودا هەبێت، بەوەی کە دروستکاری بوون‌و بونەورو سروشت‌و یاساکانی سروشتەو هیچ هاوبەشێکی نی یە. کلێسای کاسۆلیکی لە دژی ماسۆنیەت وەستاو ماسۆنیەت لەکیشوەری ئەورووپادا بووبە پەرگیرو ڕووەو گومڕای هەنگاوی نا. لەدوای کتێبەکەی "هۆیلباخ" سەبارەت بە سیستەمی سروشت لەسالی(1772) کۆڕی ماسۆنیەتی خۆرهەلاتی فەڕەنسی توشی دابەش بوون هات‌و لقی دوووەم لە کۆڕێ خۆرهەلات بوویە کۆڕێکی دەرچوو لەئاین(گومڕا).

لێرەدا دەردەکەوێ کە هۆکاری سەرنجڕکێشی ماسۆنیەت و ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا، دەگەڕێتەوە بۆ نهێنیی و نادیاریی و ئەوسوێندخواردنەی کەهەندێکی بەهەندێکی تر دەبەستەوە، جگە لەمانە هەریەکە لە"گۆتەو هیردەر" لەئەڵمانیا پەیوەندیان بەماسۆنیەتەوە کرد، دوای ئەوانە ماسۆنیەت بووبە مژدەدەریی و پیاوانی سیاسیی و داگیرکار تێکەڵاوی بوون.

## کۆتایی یەسوعیەکان لەسەدەی هەژدە:ـ

پێشتر لەباسی سیاسەتی ئاینی لۆیسی چواردە، تارادەیەك شرۆڤەی چەوساندنەوەی شوێنکەوتەکانی جانسینیەکان و هادیئیە پرۆتستانتەکانمان کرد، ئێستا پێویست بەباس کردنەوەیان ناکات، مەبەست لەم بیرهێنانەوەیە ئەوەیە کەبڵێین:لەهەموو ئەمانەدا یەسوعیەکان هۆکاربوون، تەنانەت ئەوان لەسەدەی هەژدەدا هێرشیان کردە سەر "فیزۆکرات"سروشتگەرەکان و، فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری. بەلام هەوڵەکانیا شکستی هێنا، چوونکە فەیلەسوفەکان بەهێزبوون و کاریگەریان زیاتر بوو. تێکشکان و کۆتایی یەسوعیەکان بەدەرکرانیان لە پرتوگال و لەساڵی(1795) دەستی پێکرد. لەدوای چەوساندنەوەی جانسنیەکان لەلایەن لۆیسی چواردەو پاپاوە، یەسوعیەکان زیاتر لەبەرچاوی خەڵکی بێزران و هەستی دژایەتی کرانیان زیار گەشەی کرد لەناو خەڵکیدا. کاتێکیش ڕێبازی جانسنی لەناو چینی دۆڵەمەندو خاوەن سامان بلاوبوویەوە، خەڵکی زیاتر لێ یان بەداخ بوون، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ئەوان دژی جانسنیەت بوون. لەملاشەوە پەرلەمانتارانی فەرەنسا پشتیوانی جانسنیەکان بوون ، کاتێکیش کڵێسا لەساڵی (1750) چەند ڕێنمایەکی لەدژی جانسنیەکان دەرکردو پەرلەمان ڕەتی کردەوە، ناکۆکی لەنێوان لۆیسی پازدەو پەرلەمان دروستبوو.

فەیلەسوفان و ڕۆشنگەران پشتیوانی پەرلەمانیان دەکرد، دواتر ناکۆکی درێژەی کێشاو ئەندام پەرلەمانەکان بەکۆمەڵ دەستیان لەکار کێشایەوە، پادشاش بۆ

دەرەوەی وڵات دووری خستنەوە. لەم نێوانەدا یەسوعیەکان شان بەشانی پادشا لەدژی پەڕلەمان ڕاوەستان، بەڵام پەڕلەمان پشتیگیری خەڵکی بەدەستهێنا، چونکە گەل ئارەزوی پیادەکردنی چەمکی لێبوردەیی دەکردو دژی پادشا ڕاوەستانو پشتگیری فەیلەسوفانو پەڕلەمانیان کرد. ئیدی فەیلەسوفانو پەرلەمان شان بەشانی گەل هێرشیان کردەسەر پادشاو یەسوعیەکان.

بەم شێوەیە بارودۆخەکان بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن، تا لە ساڵی1761 یەکێك لەباوکانی یەسوعیەکان بەتۆمەتی پێشبڕکێ کاری کە ببووەهۆی مایەپوچیو نابوت بوون پەلکێشی دادگاکرا، لەم کاتەشدا پەرلەمان ئەمەی بە دەرفەت زانی بۆ ئەنجامدانی پشکنینێکی گشتی یەسوعیەکان، وە هەروەها یەسوعیەکانی تۆمەتبار کرد بەوەی کە خەڵکانێکی بەکرێگیراوی دڵسۆزی پادشایەکی بیانین، داوای کرد یەسوعیەکان لە فەرەنسا هەڵبوەشێنرێنەوە. سەرەتا پادشا بەمە ڕازی نەبوو، بەڵام لەژێر فشارێکی بەردەوام لەساڵی1764 ناچارکرا ڕەزامەندی بنوێنێ لەسەر دەرکردنیان. پاش ئەویش ئیسپانیا وەك فرەنسا دەستیکرد بەدەرکردنیان، بەهەمانشێوە لە "ناپولیو بارما" دەرکران. وە لە ساڵی1773 پاپا فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی یەسوعیەکانی دەرکرد. یەسوعیەکان جگە لە ئەڵمانیای پرۆتستانتیو ڕوسیای ئەرسەدۆکسی هیچ پەناگەیەکیان شك نەدەبرد.

ئیدی لەدوای دەرکرانی یەسوعیەکان دەوری پەرلەمان دەستی پێکرد. بێگومان پەرلەمان تاکە دامەزراوەیەك بوو کە بەرەنگاری پادشای دەکردو دەیتوانی لە دەسەڵاتی دادوەریو یاسادانان دا کۆنترۆڵی پادشا بکات. جا هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان سەرکەوتن بوو بۆ پادشاو خۆسەپاندنی پادشا. فەیلەسوفانو بەشێکی گەلیش لایەنگری پەرلەمان بوون. کاتێکیش لۆیسی پازدە لەساڵی 1774 مرد، لۆیسی شازدە پەرلەمانی گێڕایەوە فەرەنسا. بەڵام هەمان بارودۆخ دووبارە بوویەوە، چونکە پەرلەمان دەیویست چاکسازی بکات لە دامو دەزگای وڵاتو سیستەمی باج چاك بکات.

## کاریگەری بزوتنەوەی ئاوەزگەری و ڕۆشنگەری

## لەسەر زانستەکۆمەڵایەتیەکان و سیاسەت

ئەو ساڵانەی کە جەنگی جێ گرتنەوەی نەمساوی تێدا بەڕێوەدەچوو(1748)، هەمان ئەو ساڵانە شاهیدی بینینی بزوتنەوەیەکی ڕۆشنبیری بوو، کەبە ڕۆشنگەری ناسرابوو. ئەوانەی کە پێشڕەوی ئەم بزوتنەوەیان دەکرد خۆیان ناونابوو فەیلەسوف. فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری هەڵیان دەدا لەمرۆڤو جیهان تێبگەن و ڕاڤەیەکی گشتگیری بۆبکەن، وەجەختیان دەکردەوە لەسەر لێکۆڵینەوە کردن لە پرسە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان و چاکسازی تیاکردنی، هەروەها پەیوەندی کردن بەتەواوی جەماوەر بۆ تێگەیشتن لە کێشەو گرفتەکانیان. بۆ ئەم مەبەستەش ئەم فەیلەسوفانە جەختیان دەکردەوە لە نوسینی توێژینەوە فەلسەفیو پرسە سیاسیو بابەتە زانستیەکان. زۆرینەی ئەم فەیلەسوفانە خاوەنی ڕەسەنایەتی نەبوون، بەڵام ئەوان بە حیکمەت ووردیەوە هەڵێنجانیان دەکردو بیروڕای خۆیان دادەڕشت. دەگونجێ ئەوان زیاتر بە کەسانێکی خاوەن توانستی ڕاگەیاندن دابنێنن، وەك لە فیلەسوف یان توێژەرانێکی ئەکادیمی. بەناوبانگترینی ئەم فەیلەسوفانەش بریتی بوون لە "تۆماس هۆبز، جۆن لۆك، ڕۆسۆ، ڤۆلتێر، مۆنتسکیۆو،....ئەوانی تر".

### تۆماس هۆبز( 1588- 1679 ):ـ

دامەزراوە سیاسیەکانی سەدەی حەڤدەو هەژدە، ببوویە ویردی سەرزاری بیرمەندانو فەیلەسوفان و، هەمیشە ڕەخنەی توندیان ئاراستەدەکرد. ناکۆکیو دووبەرەکی نێوان پادشاو پەرلەمان لەئینگلتەرا بوویەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئینگلیزی لەنیوەی سەدەی حەڤدە. پادشاکان لە فەرمانڕەوایی کردنیاندا پشتیان دەبەست بەتیۆری "مافی خودایی پاشاکان"، بەوەی کە پاشاکان دەسەڵاتیان

لەخوداوە پێدراوە. وەلێ پەرلەمان جەختی دەکردەوە لەسەر مافە سەرەتاییەکانو یاسای سروشتی، جا بۆ هەریەکە لەم دوو بیروباوەڕە پشتیوانو پشتگیری خۆیان هەبوو لە نوسەرانو بیرمەندان.

جا یەکێ لەوانەی پشتیوانی دەسەلاتی ڕەهای دەکرد، "تۆماس هۆبز" بوو. هۆبز لەکاتی هەلگیرسانی جەنگی ئارمادای نێوان ئیسپانیاو ئینگلترا لەسەردەمی ئیلابێس لەدایکبوو. لەزانکۆی ئۆکسفۆرد دەستی بە خوێندن کرد، پاشان بووە سکرتێری "فرانسیس بیکن"و کاریگەر بوو پێی. لەکاتی ناکۆکی پادشا لەگەلێ پەرلەمان، هۆبز لە پشتگیری پاشای دەکرد. لەبەرئەوە کاتێ هەستی بەسەر هەلدانی شۆڕش کرد، یەکەم کەس بوو کۆچی کرد بۆ کیشوەری ئەوروپا و، لە فەرەنسا نیشتەجێ بوو، هەر لەوێشدا "دیکارت"ی بینی. پاش نۆ سالێ لە کۆچکردنی لەسالێی (1651)،لە سەردەمی "ئۆلیڤەرکرمۆویل" گەڕایەوە ئینگلترا. دوای گەرانەوەی کتێبێکی بلاوکردەوە لەژێر ناوی "لیڤیاسانت،وەحشی زەبەلاح"، مەبەستیشی لەمە دەولەت بوو. هۆبز لە فەیلەسوفی ماددی گەرەکان بوو، بڕوای بەئاین نەبوو. پەرەی بە تیۆری ناسین داو ووتی:" دەرکو زانیاری مرۆڤ، ئەنجامی ئەو بیرانیە کە لەلای مرۆڤ لەدایك دەبن، ئەمەش بەکاریگەری هەستکردن بە دیاردە دەرەکیەکان، کە دواترئاسەوار لەسەر مێشك جێدەهێلن. ماددەو جولە دوو دیاردەی دەرەکینو بیرو ئاوەزیش لەوان وەردەگیرێن. بەهەمانشێوە خۆشەویستیو قین لە سۆزی مرۆڤ لەدایك دەبن. خۆشەویستو قین واتا دلخۆشیو خەمباری، چێژو ژان، ئومێدەواریو نائومێدی، ترسو ئازایی. ئاسودەیی مرۆڤیش بە بەدیهێنانی ئارەزووەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی بەردەوام دێتەدی. هێزو توانا، ئەو خەلاتەی مرۆڤ بەهۆیەوە ئارەزووەکانی دێنێتەدی، جا چ لایەنی ئاوەز بن یا ئاکارەکانی لاشە، یا پێگەیەکی کۆمەلایەتی یان سەروەتو سامانێکی زۆر یان هەمو ئەوانە یا هەندێکی.

مرۆڤەکان لەپێش بەدیهێنانی ئەم ئارەزووانە کێبڕکێی یەکتر دەکەن، وە بەگوێرەی لێهاتوویی‌و بەهرەداری، خەڵکی کێبڕکێی یەکتری دەکەن لە پشتی ئارەزووەکانەوە. جا ئەوانەی بەسەر بەرامبەریاندا سەردەکەون، لەڕووی لێهاتووی‌و بەهرەداری پێش ئەو کەسانە دەکەونەوە کە لەوان بێ تواناترن. ئیدی لەمەوە هاوسەنگی کۆمەڵایەتی بە سەرهەڵدانی جیاوازی نێوان خەڵکی‌و نەمانی یەکسانی‌و گۆڕانی تێدەکەوێ، ئەمەو سەرەڕای هەبوونی جیاوازی نێوان تاکەکان. بەم شێوەیە دەبینین خەڵکی لە خەباتێکی بەردەوام دابن بۆ بەدەستهێنانی پێداویستیەکان‌و هەموو ئەو شتانەی کە ئارەزووەکانیان تێردەکات، هەروەها دەستخستنی دان پێداهێنانی خەڵکی بە لێهاتوی‌و بەهرەداریان، وە وابکەن خەڵکی بە چاوێکی خۆزگەوە سەیریان بکەن‌و بەکەسانی سەرکەوتویان دابنێن. لەمەوە دەتوانین بڵێین بارودۆخی مرۆڤ تاوەکو ئەمڕۆش گوزارشت دەکات لە کێبڕکێی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ، لەپێناو ناوبانگ‌و شکۆداری.

ئاسودەیی یاخود ژیان . بارودۆخی مرۆڤ بوو لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان‌و پێش دامەزراندنی دەوڵەت ژیانیان ڕەق‌و بەربەریەت بوو. لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان هیچ جیاکاریەك نەبوو لەنێوان ڕەواو ناڕەوا، دادو ستەم، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هیچ پێوانەیەکی بڕیار بەدەست نەبوو لەلای خەڵکی بۆ جیاکردنەوەی چاکەو خراپە. پێوانەکان کە ئەو کاتە نەبوون، وەلێ دواتر هاتنە مەیدان، بەلاّم کاتێ هاتنە مەیدان مرۆڤ چوویە قۆناغی شارستانیەت‌و پێکهێنانی دەوڵەت. جا لەم کاتەشداچەند یاسایەك دارێژران بۆ جیاکردنەوەی ڕەواو ناڕەوا، دادو ستەم، دەسەلاّتی سیاسیش ئەم یاسایانەی داڕشت‌و پیادەی کردن. وەلێ پاشایەتی تاکەکەس لە کۆمەڵگەی سروشتی بوونی نەبوو، چونکە هەموو کەسێ وەك بەرامبەرەکەی ماف‌و یەکسانی خۆی هەبوو. مرۆڤ لە کۆمەڵگە سروشتی دا لەژێر دەسەلاّتی یاسایی سروشتی دا دەژیاو بە مافی سروشتی پاڵی پێوەدەنرا. وە بەگوێرەی مافی سروشتی تاکەکەس خاوەنی ئازادی

تەواوە لە کارکردن و، بەباشترین شێوە پارێزگاری دەکات لە قەوارەو ژیانی. وەك مرۆڤێك دەیەوێت بژیت‌و ئارەزووەکانی تێر بێت.

یاسای سروشتی گوزارشتە لە کۆمەڵێك یاساو بنەما، کە مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی هەڵپەو ئارەزووەکانی‌و پاراستنی بەرژەوەندیەکانی‌و دەستەبەرکردنی بەشێوەیەکی ئاقلانە هەڵسوکەوت دەکات، ئەم یاساو بنەمایانە ژیری مرۆڤ هەستی پێ کردو زانی، بەبێ ئەوەی خۆی داڕێژێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی ئەم دەستورە لە سروشتدا، ئەمەش بەشێکە لە یاسا ئەزەلی[1] و هەتاهەتایەکانی بونەوەر. دەبێ ئەوەش بزانین کە سۆزی مرۆڤ پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ بۆ ئەوەی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵبێت، هەر ئەمەش وادەکات مرۆڤ بە بەردەوامی لەگەڵ غەیری خۆی لە دووبەرەکی دابێت، وەلێ پاڵنەری ئاوەزی وای لێدەکات کە بە ئاشتی لەگەڵ کەسانی تر بژی، وە هەر ئەم ئاوەزەیە سنورێك بۆ خۆپەرستیەکەی دادەنێت‌و ژیانی دەپارێزێ. جابۆ ئەوەی بەئاشتی لەگەڵ کەسانی تر گوزەران بکات لەکۆمەڵگەدا، ناچارە دەستبەرداری هەندێ مافی خۆی بێت بۆ دەستەبەرکردنی هەندێ مافی تری. چونکە یەکسانی تاکەکان لە مافەسروشتیەکاندا لەکۆمەڵگەی سەرەتایی، دەبێتەهۆی جەنگکردن بەشێوەیەکی بەردەوام. ساکاتێکیش ژیانی مرۆڤ بەم شێوەیە بوو، واتا لەژیانێکی نادڵنیایی‌و نائەمینی دابوو، لێرەدا یاسای سروشتی ژیانی بۆ دەستەبەر دەکات، ئەمەش بەگەڕانی بە دوای ئاشتی‌و هەوڵدان بۆ دانانی سنورێك بۆ خۆپەرستی، ئەمەش مانای دەرچوونی مرۆڤە لە کۆمەڵگەی سروشتی‌و دەستەبەرداربوونی تاکەکانە لە مافەسروشتیەکانیان و، ڕادەستکردنی ئەم مافانەیە بۆ بەهێزترین کەسی کۆمەڵگەکەیان، بەپێی پەیمانێك کە بەپەیمانی کۆمەلایەتی دادەندرێت. ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت کەمرۆڤەکان پەیمان لە کەسێکی بەهێز وەردەگرن، لەسەر ئەوەی کە گیان و سەروەت و سامانیان

1 ئەزەلی: هەر هەبوو

بپارێزێتو ژیانیان بۆ فەراهەم بێنێ و هێمنی و ئاسایشیان بۆ دابین بکات. لەبەرامبەر ئەوەدا کەسە بەهێزەکە سودمەند دەبێت لەتەواوی ئەو دەسەلاّتانەی کە تاکەکان لە کۆمەلگەی سەرەتایدا خاوەنیەتی. ئیدی لێرەوە کۆمەلگەی سیاسی یاخود دەولّەت دێتە ئاراو، ئەو کەسەی تیایدا فەرمانڕەوایی دەکات بریتیە لەپادشا.

بەپێی ئەم پەیمانە سەرۆك یان پادشا دەبێتە خاوەنی دەسەلاّتی کۆتایی. پشتگوێ خستنی فەرمانەکانی پادشاو شۆڕشو کاری تێکدەرانە لەدژی دا دروست نییە هەرچەندە پادشا ستەم کاربێت، چونکە پادشا بەشێك نەبووە لە پەیمانەکەو پێویتیشی بەو پەیمانە نەبووە. کەواتە ئەم پێیەوە پابەند نییە، جا ئەگەر پادشا مەرجی پەیمانەکەش پشتگوێ بخات، ئەوا نابێتە پاساوێك بۆ ڕەوایی دان بە شۆڕش کردن.

بەم شێوەیە دەبینین "هۆبز" دەسەلاّتی ڕەها لە ئینگلتەڕا بەرز دەنرخێنێ، جا بۆ دەسەلاّتی ئۆلیڤەر بێت یان چارلسی یەکەم. هۆبز هیچ کات پشتیوانی شۆڕشی نەدەکرد لە دژی دەسەلاّتی ڕەها، چونکە لە تێڕوانینی ئەودا خەلّکی سەرپشکن لەنێوان دوو ڕێگە، یان دەسەلاّتی ڕەها هەلّدەبژێرن، کە ژیانو گوزەرانییان بۆ فەراهەم دێنێ، یان ئەوەتا کۆمەلگەیەکی پڕ ئاژاوەو بەربەریەت هەلّدەبژێرن کە حاکمی تێدا نییە.

بەبڕوای "هۆبز" تەنها یەك جار شۆڕش ڕەوایە، ئەمەش کاتێك فەرمانڕەوا نەتوانێت پارێزگاری بکات لەژیانی ژێردەستەکانیو نەیتوانی هێمنی و ئارامی سەقامگیر بکات، ئەگەر ئەمەش هاتەدی دروستە پادشا یان دەربکرێ یاخود بگۆڕدرێت.

لەڕاستیدا فەلسەفەی سیاسی هۆبز لەدژی پیۆریتانە دوندەڕەوەکان بوو، ئەوانەی کە شۆڕشیان لەدژی چارلسی یەکەم بەرپاکردبوو. کتێبەکەی هۆبز نەبووە جێگای سەرسامی پەرلەمانتاران، چونکە ئەمان باش دەیانزانی کە هۆبز کەسێکە لایەنگری پادشا دەکات. هەروەك پادشا ویستەکانیش بەلایانەوە سەیر نەبوو، چونکە هۆبز

پاکانەی بۆ دەسەلأتی ڕها کردبوو نەوەك بۆ پادشا. وەبەهۆی ئەوەی"هۆبز" دژی کلێسابوو، کلێساش پشتیوانی نەکرد. بەلأم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوەی کە لە خۆی گرتبوو لە گفتوگۆو بیری فەلسەفیو دەمەتقێی سیاسی، کاری گەری لەسەر بیریاران دروستکردو بووە هۆی هەژاندنی گیانی دەمەتەقێی سیاسیان.

"هۆبز" بۆ پشتیوانی کردن لەدەسەلأتی ڕها، لە مشتومڕەکەیدا پشتی بەست بوو بەپەیمانی کۆمەلأیەتی.

## جۆن لۆك (1632-1704):-

جۆن لۆك پزیشك بوو، پزیشکی لە ئۆکسفۆرد خوێندو بووبە سکرتێرو پزیشکی تایبەتی لۆردشافستبری" سەرۆکی پارتی "هویگز". کاتێك چارلسی دووەم لەساڵی(1680) پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە، ئەم لەگەڵ شافستبری رای کردە هۆڵندا. لۆك لە هۆڵندا کتێبە بەناوبانگەکەی لەژێرناوی (دەسەلأتی مەدەنی) نوسی، لەم کتێبەیدا ڕەوایی دەدات بە شۆڕشی "جەلیله"، دواتر لەساڵی (1690) بلأوی کردەوە. پاش ئەمە کتێبێکی تری نوسی لەژێرناوی "تێگەیشتنی مرۆڤو مەعریفەکەی". لۆك لەم کتێبەیدا تیۆری مەعریفە"ناسین" ڕاڤە دەکات و دەڵێ: "مەعریفەت بریتیە لە دەرك کردنی بیروبۆچونە هەمە جۆرەکان، کە مێشکی مرۆڤ کۆی دەکاتەوە، جا مەعریفەت یا لەگەڵ ئەم بیروبۆچونانەو دیاردە سروشتیانە تێك دەگیرێ، یان لەگەڵی دەسازێ. وە دەتوانرێ لەبارودۆخە تایبەتیەکاندا هەڵێنجان بکرێ، ئەمەش بۆ زانینی پەیوەندی نێوان بیروبۆچوونو دیاردە دەرەکیەکان".

زانیاری سروشتی بابەتێکی ووردو ئاڵۆزە بەدۆزینەوەی ڕاستیە تازەکان زانیاریە کۆنەکان پوچ دەبنەوە، لەبەرئەوە ئەم زانیاریانە لەکاتێکەوە بۆکاتیکی تر گۆڕانی بەسەردادێت. مرۆڤ باوەڕی بەبوون هەیە، لەبەرئەوە بوون سەرەتاو کۆتایی هەیە، لەمەوە پێویستە هۆکارێك هەبێت کە سەرەتاو کۆتایی بۆ سەرجەم شتەکان دانابێت، ئەم هۆکارەش پەروەردیگاری دروستکاری بونەوەرە.

هەروەها "لۆك" لەکتێبەکەی تری "دوو گوتار سەبارەت بەحکومەتی مەدەنی" دەڵێت: مرۆڤ بەسروشت ئاشتی ویستە وخێرو خۆشی بۆ غەیری خۆی دەوێت، مرۆڤ لە کۆمەڵگە سەرەتاییو سروشتیەکاندا بە گوێرەی یاسای سروشتی و ئاوەزی هەڵسوکەوتی دەکرد، ئەم یاسایە گوزارشتە لە کۆمەڵێك ڕێسا کە بۆ ئاکارو هەڵسوکەوت داندراوە، ئەم یاسایە ئاوەزی مرۆڤ دۆزیەوەو ڕاڤەی کرد، ئەم یاسایە جەخت دەکاتەوە لەسەر یەکسانی نێوان خەڵکی. مافی سروشتی بریتیە لە مافی ژیانو ئازادی خاوەندارێتیو گەڕان بەدوای ژیانێکی پڕ لەئاسودەیی.

پارێزگاری کردن لەژیان بریتیە لە پارێزگاری کردن لە خود لەبەرامبەر دژیەتیەکان، ئازادی مانای ڕزگاریە لەگشت کۆتو بەندەکان جگە لەوەی یاسای سروشتی دایناوە. یاسای سروشتی جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کە هیچ کەس هێرش نەکاتە سەر کەس، یا هێرش نەکاتە سەر ماڵ و سامانی، وە لەباری سەرپێچیدا پێویستە سزای تاوانکار بدرێت بەهۆی دەرچوونی لەیاسای سروشتی. زۆر لێکراو دەتوانێ بۆخۆی تۆڵەی خۆی بکاتەوە یا لەگەڵ کەسانی تر ڕێکبکەوێ بۆ تۆڵەسەندنەوە.

خاوندارێتی بەمانای مافی تاك لەدەستکەوتنی هەموو ئەو شتانەی کە بەردەوامی دەدەن بەژیانی. موڵکو سامان بۆهەمووان شتێکی هاوبەشە. خاوەندارێتی تایبەتیش ئاکامی ئەو هەوڵ وکۆششەیە کە مرۆڤ دەیدات بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی دەیەوێت. لەبەرئەوە پێویستە ڕێز لەم مافە بگیرێ چونکە بەشێکە لەمافە سروشتیەکان. ئەوەبوو مافی خاوەندارێتی کۆمەڵگەی سیاسی پێکهێنا.

جیاوازی تاکەکان بووە هۆی زاڵبونی بەهێز بەسەر بێ هێزو سەرهەڵدانی جەنگو بڵاوبوونەوەی ئاژاوەو دڕندەییو بەربەریەت، ئەمەش وایکرد خەڵکی بگەڕێن بەدوای میکانیزمێك بۆڕزگار بوونیان لە جەنگو پاراستنی گیان وموڵکی خەڵکی. ئائەوەش سەرەتای پێکهێنانی کۆمەڵگەی سیاسی بوو کە بە دەستبەردار بوونی گشت تاکەکان لەبەشێك لە مافەکانیان کۆمەڵگەی سیاسی پێکهات. ئەو مافانە فرمان دەدات

بەسزادانی سەرپێچی کار. ناگونجێت واز هێنان لەمافەکان بۆ تاکە کەسێك بێت بەڵکو دەبێت بۆهەموو کۆمەڵگە بێت. لەمەوە کۆمەڵگە دەبێتە سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسی، بۆ ئەوەی تاکەکان مافی ژیانو ئازادیو خاوەندارێتیو بەدواکەوتنی بەختەوەری بۆخۆیان دەستەبەربکەن. جا لەبەرئەمانە کۆمەڵگە بەم سێ مافە کۆت دەکرێ بەهەمانشێوە مافە سروشتی یەکان تاکو کۆمەڵ کۆت دەکات.

لەوەی کەلە سەرەوە باسمان کرد دەگەینە ئەوەی کە کەمینە ملکەچ دەکرێت بۆ ویستی زۆرینە. کۆمەڵگە هێزی زۆرلێکردن دەخاتە کار بەمەبەستی جێبەجێ کردنی یاساو ڕێساکانی، چونکە ئەمە بەشێکە لەم پەیمانە. ئەم هێزەش گوزارشتە لەخۆبەخشینی هەمووتاکێك لەکۆمەڵگەو بۆخزمەتی بەرژەوەندی گشتی وپیادەکردنی ئەو یاسایانەی کە کۆمەڵگا دایڕشتوون.

دەسەڵاتو سەروەری بۆ دەستەیەکی گشتی یە. ئەم دەستەیەش بریتیە لە حکومەت کە بەپێی پەیمانەکە پێکهاتووە. وەلەکاتی هەڵوەشانەوەی ئەم دەستەیە دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگە. حکومەت هەڵدەستێ بەچاودێریکردنی مافەکانی تاکو پارێزگاری لێکردنی. وەئەگەر حکومەت پێچەوانەی ئەم پەیمانە جولایەوە ئەوا گەل مافی شۆڕش کردنی هەیە دژی ئەم حکومەتەو دەتوانێ حکومەتێکی تری بخاتە شوێن، بەشێوەیەك کە حکومەتی نوێ پەیمان بدات بەپاراستنی مافەکان "مافی ژیانو خاوەندارێتیو ئازادی".

جۆن لۆك دەسەڵاتی یاسادانان بە بەرزترین دەسەڵاتی وولات هەژمار دەکات وپێی وایە دەسەڵاتی جێبەجێ کردن دروستە بەشداری بکات لە داڕشتنی یاساکان. نابێت دەسەڵاتی یاسادانان ڕەها بێت چونکە ئەوانەی پێی هەڵدەستن خاوەنی دەسەڵاتی ڕەها وکۆتایی نین، هەروەك نابێت پادشا لەسەر کار لابرێت مەگەر زۆرینە ڕەزامەند بێت. وە دەتوانرێ بە لێسەندنەوەی متمانە لێیان، دەسەڵاتی یاسادانان بگۆڕدرێت. دەسەڵاتی جێبەجێ کردن بەرپرسیارە لە بەرامبەر دەسەڵاتی یاسادانان هەروەها

ناگونجێ هەردوو دەسەڵات لەدەستی کەسێك دابێت چونکە دەبێتە هۆی نەمانی ئازادی.

بە کورتی: جۆن لۆك ئەوەی چەسپاند کە هەموو کەسێ خاوەنی مافی سروشتی خۆیەتی لە ژیانو خاوەندارێتیو ئازادی، ئامانجیش لە حکومەت چاودێری کردنی ئەم مافانەیە، جا ئەگەر شکستی هێنا لە جێبەجێکردنی ئەرکەکەی ئەوا گەل مافی سازکردنی شۆڕشی هەیە لە دژیو دەتوانێ بیڕوخێنێ. ئەمەش ئەوە دەگەینێ کە گەل خاوەنی دەسەڵاتو سەروەریەو گەل دەسەڵاتی ڕاستەقینەیە لەپشتەوەی حکومەت. لەمەوە جۆن لۆك دوو بنەمای هەڵێنجا:ـ

1. مادام گەل گوزارشتە لە تاکەکانو ئەوان ماف یەکسانیان هەیە، ئەوا دەبێ بڕیارە سیاسیەکان لەلای زۆرینە دابێ.
2. کاتێك ئامانجی حکومەت پاراستنی مافەکانی تاکەو پاراستنی ئازادیەکەیەتی، ئەوا پێویستە حکومەت دەست لە بیروباوەڕی وەرنەدات. لەمەوە ئەوە دەردەکەوێ کە لۆك بانگەشەی بۆ لێبوردەیی ئاینی دەکات.

بەم شێوەیە دەبینین جۆن لۆك پشتگیری پەرلەمانی ئینگلیزی کرد. " لۆك" کاریگەری دروستکرد کرد لەسەر زۆرێك لە بیریارانی ئەوروپاو ئەمریکای سەدەی هەژدە، لە بەناباںگترینی ئەوانەی کەوتنە ژێر کاریگەری لۆك بریتی بوون لە : ڤۆڵتێرو ڕۆسۆو تۆماس جیرفسن. ئەوان لۆك دادەنێن بە ڕاڤەکەری فەلسەفەی ئاوەزگەری باو.

### بایەروخ سپینۆزا 1632-1677:ـ

فەیلەسوفی یەهودی هۆڵەندی "بایەروخ سپینوزا"، یەکێ بوو لە باوەڕدارانی ئاوەزو گومان. سپینۆزا لەم بارەیەوە دەڵێ: هەموو شتێ بریتی یە لە جەستەو گیان، ئەمەش پێچەوانەی بیروڕای هۆبز"بوو، کەلای وایە هەموو شتێ ماددەیە.

لە بەرامبەر جەستەو گیاندا، سپینۆزا بۆشاییو فکرە، سروشتو خودایی دانابوو. "سپینۆزا" باوەڕی بە یەکیەتی بوون هەبوو، کەبەهۆیەوە خۆی خستە ژێر ڕقو قینی جولەکەکەکان.

لە ڕووی سیاسیەوە تێڕوانینی سپینۆزا لە جۆن لۆك نزیك بوو، کاتێ دەڵێ: "کاری سەرەکی دەوڵەت بەدەستهێنانی گوێڕایەڵی هاولاتیانە، ئەمەش بەدەست نایەت، تەنها بە دەستەبەرکردنی ئازادی نەبێت بۆ تاکەکان.

فەلسەفەی سیاسی "جۆن لۆك" کاریگەری هەبوو بەسەر نوسەرانی فەرەنسا، ئەوانەی بە ئەزموون بۆیان دەرکەوتبوو کە حکومەتەکەیان کەمو زۆر بە ئینگلترا ناچێ. چونکە لە کاتێکدا پادشایەتی لە ئینگلترادا کۆت کرابوو، پەرلەمان خاوەنی دەسەلاتو سەروەری بوو، حکومەت لەبەرامبەری بەرپرسیاربوو، دەستور ئازادی تەواوی بۆ تاکەکان فەراهەم کردبوو، وەلێ لە فەرەنسادا پادشایەتی ڕەها هەبوو، پەرلەمانو دەستور کاریگەری نەبوو بەسەریدا، هەروەك زەمانەتی ئازادی بۆ هیچ هاولاتیەك نەکرابوو. جا لەم جیاوازیە گەورەیەدا ژمارەیەك لە نوسەرە فەرەنسیەکان وریابوونەوەو جیاوازی ئەم دوو سیستەمەیان خستە بەرباسو لێیەوە بێداربوونەوە. لەناو ئەم نوسەرانە مۆنتیسکۆ بەناوبانگترینیان بوو.

## مۆنتیسکۆ 1755-1689

مۆنتیسکۆ پارێزەرو خانەدانێکی فەرەنسی بوو، موتالای زانستە سروشتیەکانی دەکردو سەرسام بوو بە جۆن لۆكو نیوتن. مۆنتیسکۆ لە کتێبەکانیدا سەلماندی کە ئەو نوسەرێکە لە شێوازی یەکەم. مۆنتیسکۆ لە کتێبی "نامە فارسیەکان" باسی خانەدانە فارسەکان دەکات کاتێك سەردانی شاری پاریسیان کردبوو بینەری شتە سەرسوڕهێنوسەمەرەکانی ولاتی فەرەنسا بوون، کاتێك دامەزراوەو شارو یانەی شەوانەو بیرو باوەڕی ئاینیو دابو نەریتو سەرجەمی ئەمانە جیاواز بوون لەوەی کە

لە وڵاتی فارسدا هەبوون. مۆنتیسکۆ بەم کتێبەی یاخود بەم نامانەی سەلماندی کە لە نوسەرە دیارو بەرچاوەکانە. شیاوی باسە مۆنتسکیۆ لەساڵی 1734 کتێبێکی مێژوویی دەرکرد لەژێر ناوی "ورد بوونەوە لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانو ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی"، بەڵام لەساڵی 1748 کتێبە بەناوبانگەکەی دەرکرد، لەژێرناوی "ڕۆحی یاساکان"،نوسەر لەم کتێبەدا هۆکارو کارتێکەرە مێژووییەکان لێکدەداتەوە. مۆنتیسکۆ کتێبی "ڕۆحی یاساکان"ی- لەژێر کاریگەری سێ تەوژمی فکری نوسیوە کە بریتین لە:

1. هەستو ئەزموون: ئەم تەوژمە جۆن لۆك ورووژاندی، جەختی دەکردەوە لەسەر تیۆری ناسینو کاریگەری دیاردە دەرکیەکان لەسەر مێشك، ئەمەش لەڕێگەی هەستەکان و، ڕەنگدانەوەی دوبارەیی.

2. تەوژمی سروشتی: ئەوەی کە باوەڕی وایە سروشتی مرۆڤو کێشەکانی دەتوانرێ ڕاڤە بکرێ بە ڕاڤەیەکی سروشتیانەو زانستیانە، بەبێ ئەوەی پەنابرێ بۆ ئەو دیوی سروشتو پەرجووەکان. لەمەشدا مۆنتیسکۆ کاریگەربوو بە "نیوتن" و، باوەڕدارانی ئاینی سروشتی.

3. تەوژمی ئازادی گەری: باوەڕبوون بەوەی کە پێویستە مرۆڤ لە چوارچێوەی یاسادا ئازاد بێت، مۆنتیسکۆ لەمەشدا کاریگەر بوو بە جۆن لۆكو دەستوری ئینگلیزی.

هزری سیاسیو ئازادی، لەڕێگەی نوسینو تووێژینەوەو لێکچەروە لە قاوەخانەو یانەکاندا، لە ئینگلتراوە گوازرایەوە فەرەنسا. هەروەها هزروبیر، دەگونجی بەکاتی ڕێگری لێ بکرێو قەدەغەبکرێ، بەڵام ناتوانرێ لەناو ببرێ. مۆنتیسکۆ لەبیری دانانی زانستێك بوو بۆ سیاسەت، ئەوەشی سەلماند کە ئەگەر بێتو تێگەیشتین لە بنەمای ڕاستو دروست بۆ سیاسەت، ئەوا دەتوانرێ پارێزگاری لە ئازادی بکرێ لە وڵاتێکی وەك فەرەنسا. مۆنتیسکۆ بیروڕاکانی سەبارەت بە ئازادی، نەك تەنها لە لێکۆڵینەوە مێژوویەکانو دەستوری ئینگلیزیو دامەزراوەکانی ئینگلیز هەڵهێنجا، بگرە لە

لێکۆڵینەوەی لە کتێبە یۆنانیو کلاسیکیەکانیشو سودی بینیو فکرەی لێوەرگرت. دەتوانین بڵێین: کەمۆنتسکیۆ وەك پارێزەرو مێژونوسو یاساناسێك لە زیادبوونی دەسەڵاتی ڕەهای پاشایانی فەڕەنسا دەترسا. دەترسا لەوەی کە ئازادی تاکەکان خەفەبکرێ، تەنانەت ئازادی چینی ئەرسۆکراتیش بکەوێتە ژێر مەترسی فەوتان. بەڕاستی مۆنتسکیۆ لە داهاتنی ئەم دۆخە دەترسا، نوسیینی کتێبی "ڕوحی یاساکان" ئاکامی ئەم ترسەیەتی.

مۆنتسکیۆ دەڵێ: "هەموو گەلێك یاسای ئەساسی خۆی هەیە، کە خاوەنی تایبەتمەندیو خەسڵەتی خۆیەتی، ئەمەش لەژینگەی سروشتیو دامەزراوەی تایبەتی خۆی وەرگیراوە". مۆنتسکیۆ سێ شێوە حکومەت دەستنیشان دەکات، کەبریتین لە: حکومەتی کۆماری، پاشایەتی، دیکتاتۆری. وەلێ مۆنتسکیۆ سەرسام بوو بەسیستەمی پاشایی دەستوری، لەسەر شێوازی سیستەمی ئینگلیزی، کەتێیدا ئازادیە سەرەکیەکان پارێزرابوون.

مۆنتسکیۆ دەستوری ئینگلیزی بەباش دەزانیو دەسەڵاتی جێبەجێ کردنو یاسادانانو دادوەری لەیەکتر جوێ دەکاتەوەو ڕێکیان دەخاتو هاوسەنگیان دەکاتو هەرسێ لایان هاوکاری یەکتری دەکەن بۆ دەستەبەر کردنی ئازادیەکان. ئەو ئازادیانەی کە لەگەڵ جەستەو بلیمەتی گەلی ئینگلیزی ئاوێتەبووە. لەگەڵ ئەوەی بیری هاوسەنگی نێوان دەسەڵاتەکانو ڕێکخستنو هاوسەنگ کردنیان شتێکی تازە نەبوو، بەڵکو نوسەرە کلاسیکیە پێشینەکان و کەسانی وەك" میکیاڤیللیو جۆن لۆکو بۆلینبورك" لەسەری دواون، بەڵام مۆنتسکیۆ جەختی کردەوە لەسەر دابەشکردنی دەسەڵاتەکان، بەمەش سیستەمی ئینگلیزیو سێ دەسەڵاتە لەیەکتر جیاو ڕێكو هاوسەنگەکەی بوونە نمونەیەك کە وڵاتە ئەورووپییەکانو ئەو وڵاتانەی کە بەزمانی ئینگلیزی دەدوان لاساییان کردەوە.

کاریگەری کتێبی گیانی یاساکان گەلێ زۆربوو بەسەر ئەورووپادا. ئەوەتە جۆن مورس" لەم بارەیەوە دەڵێ:" بەڕاستی مۆنتسکیۆ یەکەم کەسێ بوو کەڕێکای بەراوردکاری بەکارهێنا لەهەمبەر دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان، وەتێبینی کاریگەری هۆیە سروشتیەکانی کردوە لەسەر پەیوەندی ئەم هۆیە سروشتیانە لەگەڵ یاساکانی وڵات."

وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەین کە مۆنتسکیو زێدەڕۆی کردوە لەپیاهەڵدان بەدەستوری ئینگلیزی، چونکە وەك ئەم باسی لێوە دەکات، بەم شێوە نەبووە، هەروەك ئێمەش لەبەشەکانی پێشترکەوتە بەرچاومان. ئەم دەستورە کاری نەدەکرد بەشێوەیەکی دیموکراتی ڕاستو ڕەوان لەسەدەی هەژدە.

## ڤۆلتێر( 1694- 1778 ):-

بێ گومان تێکشکانی فەڕەنسا لەجەنگی حەوت ساڵە کاری کردە سەر هەرەسهێنانی پاشایەتی فەڕەنساو نەمانی شکۆو گەورەی ئەم دەسەڵاتە لەلای گەلی فەڕەنسی. ئەمەش بەڕوونی لەکتێبەکانی فەیلەسوفە فەڕەنسیەکان دەبینرێ. لە بەناوبانگترینی ئەوانەی کە بەگاڵتەجاڕیو بەسوك سەیرکردنەوە ئەم سەردەمەی شرۆڤە کردوە،"فرانسوا ماری"ە، ناسراو بە ڤۆلتێر.

باوکی "ڤۆلتێر"پیاوی ئیش وکاربووە، حەزی نەدەکرد کوڕەکەی مەیلی شیعرو وێژەی هەبێت، بەڵکو حەزی دەکردو دەیویست کوڕەکەی یاسا بخوێنێ، وەلێ ڤۆلتێر بەشوێن هیوایەتەکەی خۆیەوە بوو، هەمیشە گاڵتەی بەوەزیرانی دەوڵەتو گەوجی جێنشین"وەلی عهد" دەکرد، کە بەهۆیەوە لە باستیل زیندانی کراو دواتر بۆ ئینگلترا دوورخرایەوە. تەنانەت لەوێدا سێ ساڵ مایەوە (1726–1729). بەلام لەوێ کەوتە ناوەندی زاناو بیرمەندانی ئینگلیزو پێیان کاریگەر بوو. ڤۆلتێر سەرسام بوو بە نیوتنو جۆن لۆك، هەروەها بەو ئازادییە سیاسی و ئاینیەی کە لە ئینگلترادا هەبوو. ڤۆلتێر ژمارەیەك کتێبی بلاوکردەوەو تێیدا بیروڕاو ئەزمونگەریەکانی لۆكو تیۆرە زانستیەکانی

نیوتن‌و بیری ئازادانەی ئینگلیزی شرۆڤە کردبوو. هەروەها لەساڵی 1734 نامە ئینگلیزیەکانی بڵاوکردەوە. ڤۆلتێر لەم کتێبەدا گاڵتەی دەکرد بە کڵێساو کۆمەڵگە، هەروەها باوەڕی خۆی خستبووە ڕوو سەبارەت بە خودای تاك‌و خودای سروشت‌و بونەوەر و، سەلماندی کە نوسەرێکی بەتوانای فرە لایەنە.

حکومەتی فەرەنسی کتێبەکەی ڤۆلتێری یاساغ کردو فرمانی سوتاندنی دا، ئەوەبوو ڕای کردە دەرەوەی فەرەنسا. بەلام کتێبەکانی لەنێو خەڵکیدا بڵاوبوویەوە.

ڤۆلتێر زۆرینەی ژیانی لە "سێری" هەرێمی لۆرین بەسەر برد، کە جێگەی کتێب‌و تاقیگەو بەڵگەنامەکانی بوو. جگەلەمە ڤۆلتێر ماوەیەك لە بەرلین میوانی فردریکی گەورە بوو، بەلام کەمتەرخەمی نواندنی لەبەرامبەر پاشاو لادانی لە ئادابی دەربار، فریدرکی نیگەران وپەست کرد، لەبەرئەوە ڤۆلتێرلەترسی خەشمی ئەو پرۆسیای جێهێشت. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەردوکیان وەك دوو هاوڕێی نزیك‌و دۆست مانەوەو ئاڵوگۆڕی نامە لە نێوانیاندا تاکۆتایی ژیانیان هەر بەردەوام بوو. هەروەها ڤۆلتێر ماوەکیش لە جنێڤی سویسرا نیشتەجێ بوو. کاترینای دووەم قیصرەی ڕوسیا زۆر ڕێزی لێ دەگرت.

ناوی ڤۆلتێر وەك مێژوونوس‌و نوسەرێك وەکو مانگ دەدرەوشایەوە، بەلام لەدیدی هەندێکدا نوسینەکانی سادەو وەڕەسکەرن‌و بۆ ئەمڕۆ کەڵکی خوێندنەوەیان نی یە. لە کاتێدا لەسەدەی هەژدەدا خوێنەری گەلێ زۆربوو. ڤۆلتێر بەنوسینەپڕ لەچێژەکانی کاریگەری زۆری دروستکرد لەسەر ئەوروپیەکان. ڤۆلتێر گوزارشت لە بیروبۆچونی ڕۆژگاری ڕۆشنگەری دەکات، ئەمەش لەباوەڕبوونی بە ئاوەزو تێروتەواوی مرۆڤ بۆمان دەردەکەوێ. ڤۆلتێر فەلسەفەی ڕۆشنگەری وەك تیغێکی تیژو بڕندە لەدژی نائەقلانی‌و دامەزراوەو داموو دەزگا گەندەڵەکانی ئەو کاتە خستەکار. بەڕاستی ڕەخنەکانی ڤۆلتێر زیاتر ڕوخێنەربوون، وەك لەوەی بیناکەر بن. ئەم هێرشی دەکردە سەر داب‌و نەریت‌و دەسەلات‌و کۆمەڵ‌و ئاین، وە زۆر سەرسام بوو بە داموو دەزگای ئینگلیز. ڤۆلتێر هیچ

بیرێکی بنیات نەری دانەنا، وە ئەوەی ڕوون نەکردەوە کە چۆن کۆمەڵگەیەك بنیات دەنرێ بەشێوەیەك بتوانێ شوێنی کۆمەڵگەی کۆن بگرێتەوە. هەروەك ئەوەشی نەخستبوەڕوو کەچۆن دام دەزگای ئینگلیزی دەگوازرێتەوە فەڕەنسا.

ڤۆڵتێر ناوبانگی پەیدا کرد، چونکە نوسینەکانی بە جوانترین پەخشان بەزمانی فەرەنسی دارێژرا بوو. ئەم خۆی دەپاراست لە بەکارهێنانی زمانی چینی باڵای ڕۆشنبیر، ئەمەش بۆ تێگەیشتنی جەماوەر لە کتێبەکانی.

ڤۆڵتێر گەشبین‌و ڕوونبین بوو لە هەمبەر سەردەمەکەی، کاتێك مێژووی لویسی چواردەی نوسی، ئەو سەردەمەی کە دادەنرێ بە ڕۆژگاری جوانی‌و مەزنی فەرەنسا. بەڵام کاتێك مێژوی لویسی پازدەو مێژووی ئادەمیزادی نوسی، هەستی کرد ڕێڕەوی مێژوو بریتی یە لە ململانێی بەردەوامی نێوان هێزی ڕوناکی بەخش‌و هێزی تاریکی‌و نەزانی. وە ئەوەی دەرخست کە ڕووناکی‌و ڕۆشنی زاڵ دەبیٚ‌و هێزی تاریکی تێکدەشکیٚ‌و هەرەس دەهێنیٚ. مەبەست لە هێزی تاریکی کڵێسای کاسۆلیکیە. ڤۆڵتێر بانگەشەی دەکرد بۆ تێکشکاندنی کڵێسا، ئەو کڵێسایەی کە زۆرێك لە بێتاوانان بوونەتە قوربانی دەمارگیریەکەی. هەروەها بانگەشەی دەکرد بۆ نوسینی مێژوو بە شێوازێکی زانستی، کە ئامانجەکەی ڕاستی‌و حەقیقەتە. نەوەك بکرێتە هۆیەك بۆ پیاهەڵدانی سەرکردەو کەسایەتیە سەربازیەکان. هەروەك جەختی دەکردەوە لەسەر فرەلایەنی کۆمەڵایەتی‌و شارستانی. ڤۆڵتێر جەنگ‌و دوژمنایەتی بە قێزەون دادەناو بە بەرهەمی گەوجی‌و نەفامی مرۆڤی لەقەڵەم دەدا.

"ڤۆڵتێر" بە هێزترین دەنگی هەبوو لە ئەوروپادا. ئەگەر دژایەتی هەر کەسێکی کردبا ئەوا وێژەوانان‌و نوسەرانیش دژایەتی هەمان کەسیان دەکرد، هیچ نوسەرێك بەناوبانگ نەدەبوو مەگەر ڤۆڵتێر ویستی لەسەر بووایە بەناوبانگ بێت. ئەم بلیمەتە لە ساڵی 1764 "فەرهەنگی فەلسەفی" بڵاو کردەوەو تێیدا لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر زۆرێك لە بابەتە پڕ چێژەکان. ئەو باوەڕی وابوو کە مرۆڤ بەهۆی سەرکردە گەندو دام‌و

دەزگا گەندەڵەکان گومڕادەکرێو سەری لێ دەشێوێ، بەڵام ڕۆشنایی زانست و زانیاری هێزی گەند وخراپ تێکدەشکێنێ.

سەبارەت بە فەرنسا "ڤۆلتێر" باوەڕی وابوو کە فەرەنسا چاك ناکرێ بە پاشایەکی ڕۆشنبیرو ڕوناك ویستو بەهێزی وەك فردیکی گەورە نەبێت چونکە فەرەنسا هەرگیز بۆ دیموکراتیەت دەست نادات.

## جان جاك ڕۆسۆ(1712-1778):-

جان جاك ڕۆسۆ" لەشاری جنێف ی سویسرا لەدایك بووەو زۆرینەی ژیانی لەوێدا بەسەربردووە. ئەم بلیمەتە هەم خزمەت کارو هەم مامۆستاو مۆسیقاژەن بوو. ڕۆسۆ بەئەوروپای خۆرئاوادا گەڕاوە، هەریەکەلە تۆرینۆی ئیتاڵیاو پاریسو ڤیننناو لەندەنی بەسەرکردۆتەوە. ئەم پیاوە شکست خواردوبوو لەگەشتو کارەکانیداو، لەکۆتایی ژیانیدا ژیری تێکچوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانی فەلسەفەیەك بۆ خەڵکانی تر دابنێ. ڕۆسۆ زۆر حەزی لەبینینی سروشتو ئاسمانی ساماڵو کێڵگەو لەوەڕگای سەوزو درەختی بالاّ بەرزو دۆڵی چڕو لوتکەی بەفرین بوو، وەلە تێڕمانیدا هەستی بەچێژو ئاسودەیی دەکرد، سویسرا توانی بووی ئەم حەزەی ڕۆسۆ بەدی بێنی،وە خاوەنی هەموو ئەو شەقڵانەبوو. لەکاتێکدا ئاوەزگەرەکان سۆزو عاتیفەیان بەکەم سەیر دەکردو بەبێ بایەخ لێیان دەڕوانی، بەڵام رۆسۆ گرنگی پێدەداو بەبەشێك لەژیانی مرۆڤو قەوارەکەی لەقەڵەمی دادە. ئەم ناوازەیە فەیلەسوفی رشۆمانتیکیو خاونی هەستێکی شاعیرانەبوو، دامەزرێنەری ڕۆمانتیکی تازەیە. ئەم تەنها بایەخی بەسروشت نەدەدا بەڵکو بایەخی دا بەمرۆڤی سروشتی، مرۆڤی سروشتی بەدیدی ئەو خاوەنی وەفاو ڕاستگۆیو ڕەوشتە بەرز پەسەندەکانە. "ڕۆسۆ" یەکەم نوسینی دەرکرد لەژێرناوی"لێکۆڵینەوەیەك لە زانستو هونەر لە ساڵی 1749، تیایدا چاکەکاری مرۆڤی سەرەتاییو خراپیو گەندەڵکاری مرۆڤەی سروشتی خستبوە ڕوو، هەروەها وێنەی

ئاسودەیی‌و خۆش بەختی کێشابوو ئەمەشی بەستبوویەوە بە دیارنەمانی مەدەنیەت‌و گەڕانەوە بۆ سروشت، وەپێی وابوو بەگەڕانەوە بۆسروشت ئازادی‌و یەکسانی بەرقەرار دەبێ‌و خاوەنداریەتی هاوبەش دێتەکایە، چونکە خودا زەوی بۆهەموان فەراهەم هێناوە، ئیدی جەنگ‌و بکوژو کوژراو نامێنێت‌و باجی ستەم کارانە کۆتایی پێدێت، هەروەك ئەم یاسایانەی کە ئازادیەکان قەتیس دەکەن لەئارادا نامێنن. ئەم بیروباوەڕە خەڵکی بەلای خۆیدا کێش کرد، ڕۆسۆ بەهۆیەوە خەڵکی زۆری سەرسام کرد. جان جاك ڕۆسۆ لەکتێبێکی تر داو لەساڵی 1753 لەژێرناوی "نەمانی یەکسانی"، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن خراپەو هەڵپەو خۆپەرستی دڵ‌ودەروونی خەڵکی تێکدەدەن، هەروەها چۆن بەهێزەکان زەوی‌و زار دەکەن بەهی خۆیان و لاوازەکان ناچار دەکەن دان بنێن بەخاوەنداریەتی تایبەتی. هەموو ئەمانە لەڕوانگەی ڕۆسۆدا بنەڕەتی نەمانی یەکسانیە لەنێوان خەڵکی‌و چەوساندنەوەی بێ هێزە لەلایەن بەهێزەوە، ئەمانەش مانای سودمەندبوونی هەندێ هەڵپەکارەو بەکۆیلەکردنی مرۆڤو هەژار کردنیەتی. هەرچەندە ئەمەی ڕۆسۆ باسی کردبوو شتێکی تازەبوو، بەلام بەهۆی ئەوەی بەشێوەیەکی سەرنج ڕکێشانە نوسی بووی دڵانی بەلاوە کەمەندەکێش کردو وای کرد شەیدای بن.

هەروەها لەساڵی(11761) کتێبی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" بڵاو کردەوە. ڕۆسۆ لەم کتێبەیدا زۆرینەی بیروڕاکانی لەجۆن لۆك هەڵینجابوو، تێیدا کۆمەڵگەی سەرەتایی بەیەکسان وپاك لەقەڵەم دەدات. سەرەتا بەکۆمەڵە وشەیەکی بەناوبانگ دەست پێ دەکات‌و دەڵێ:" خەڵکی بەئازادی لەدایك بوون‌و یەکسانن لەمافەکان، هەژاری‌و دەردەسەری کاتێ دەستی پێکرد کە خەڵکی لەکۆمەڵگەی سەرەتایی دەرچوون‌و دەستیان کرد بە خۆبەخاوەن کردنی شتەکان، ئیدی خانەوادە پێك هات، جابۆ هاوکاری‌و هاودەستی کردنی یەکتری لەگەڵ یەك تێکەڵ بوون، کەبەهۆیەوە کێ بڕ کێ‌و بەربەرەکانی لەنێوانیاندا هاتەکایەوە، کەلەئاکامیدا بەرزبوونەوەی هەندێك‌و نزم

بوونەوەی هەندێکی تری لێکەوتەوە، هەروەك جیاوازی تاکەکان لەکاتی کارکردندا دەرکەوت، بێ هێز زۆرینەی کاتەکان کاری دەکردو دەوڵەمەند زۆرینەی بەرهەمی کۆدەکردەوە، بەمەش درزی نێوان هەژارو دەوڵەمەند فراوان بوو، جیاوازی کەوتە نێوان مرۆڤەکان.

خاوەنداریەتی زەوی سەرەتای کۆمەڵگەی شارستانی بوو، چونکە هۆیەك بوو بۆ جەنگو کێبڕکێو بڵاوبوونەوەی بەربەرەکانی کردن لەنێوان یەکتر. جابۆ خۆڕزگارکردن لەم ڕەوشە تاکەکەس خۆی خستەژێر دەسەڵاتی ویستی گشتی، (کۆی ویستەکانە کەهەموو تاکێك سەری بۆ دادەنەوێنێ)، ئەمەش مانای وایە هەموو تاکێك واز لەمافە سروشتیەکانی دەبێت بۆ کۆمەڵگە بەتێکڕایی. ئەم دەستبەرداربوونو وازلێهێنانە کەسایەتی سیاسی دروست کرد کەبە ژیانێکی تایبەتو ویستێکی سەربەخۆ بەهرەمەند بوو. ئەم کەسایەتیەش بریتیە لەدەوڵەت، ئەم سەروەریەش کە پێك دێت لەم پەیمانە پێویستە بەشی هەموو تاکێك یەکسان بێت لەگەڵ بەرامبەری. وەهەر بەگوێرەی ئەم پەیمانە تاك سەرجەم مافەکانی وەردەگرێتەوە کەبۆ کۆمەڵ وازی لێهێنابوو، ئەم جارە دەوڵەت ئەم مافانە دەپارێزێ، سەروەری دەسەڵات بەش بەش ناکرێو ناکرێتە بریکاری، چونکە دەسەڵات بەشێك نی یە لەم پەیمانە، بەڵکو بریکارێکی شوێنکەوتەی ویستی گشتیە بۆ دەوڵەت. لێرەدا ڕۆسۆ جیاوازی دەخاتە ڕوو لەنێوان دەوڵەتو دەسەڵات"حکومەت"، کاتێك دەوڵەت بەقەوارەیەکی سیاسی دادەنێت کەبەگوێری ئەم پەیمانە هاتۆتە ئارا، بەڵام دەسەڵات بریتیە لەکۆمەڵێك تاك کە کۆمەڵگە هەڵیدەبژێرێت بۆ پیادەکردنی ویستی گشتیو پاراستنی گیانی خەڵکیو موڵك وسامانو ئازادیە سروشتیەکانیان، وەئاین پێویستیەکە بۆ هاوڵاتیانی کۆمەڵگەی شارستانی.

پەیمانی کۆمەڵایەتی لە هەموو شوێنێکی ئەورووپا دەنگی دایەوە، چونکە خەڵکی بەسەر پێوەبوون بۆ وەرگرتنی سەروەری گەل، ئەو سەروەریەی ڕۆسۆ بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێشانەی ئەدەبی ڕۆمانتیکی ڕوونو ڕێك گوزارشتی لێکردبوو. ئیدی ڕۆسۆ

شوێنی بە جۆن لۆك چۆڵ کردو خۆی بوو بە پێشەوای دیموکراتی نوێو سیستەمی کۆماری. بانگەوازی ڕۆسۆ بۆ گەڕانەوە بۆ سروشت لە کتێبی ئیمێل ( 1762) کاریگەری گەورەی هەبوو لە بواری پەروەردەو فێرکردندا. ڕۆسۆ دەڵێت:پ"ێویستە بوار بۆ منداڵ بڕەخسێنرێ، بۆ ئەوەی ئارەزووە سروشتیەکانی بەدی بێنێت. هەروەك پێویستە فێری کاری سود بەخش بکرێن، نەوەك زمانی ئیغریقیو لاتینیو سەرقاڵ کردنیان بە فێرکاریە بێ کەڵکەکان". هەروەها لە دیرۆکی "هیلویز" ڕۆسۆ جەخت لەسەر لایەنی ڕەوشتی دەکاتو گرنگی هەستی شاراوەی بایەخداری ڕەوشتو ئاکار دەخاتە ڕوو. بڕوای وایە لەکۆتایدا گەورەییو فەزیلەت بەسەر بەد ئاکاریەکاندا زاڵ دەبێ، لەبەرئەوەی ڕۆسۆ باوەڕی بە سۆزە شاراوەکان هەبوو. وە سۆزە شاراوەکانی وەك ئاراستەکارو ڕێنوێنێکی کاریگەر لە قەڵەم دەدا. هەروەها وێنەی دەورەدانی سروشتی بەشێوەیەك جوانو مەزن کێشاوەو تیۆری هەستەکانی ڕەت دەکردەوە. هەروەك جەختی دەکردەوە لەسەر باوەڕبون بە خوداو ئایینو پاڵنەری ئاینی وەك ئاڕاستەکارێك بۆ خوو ڕەوشتی بەرز. جگەلەمانە ڕۆسۆ لە کتێبی "ئیمێلدا" جەختی دەکردەوە لەسەر سۆز، ئەم کتێبەی وەك کاردانەوەیەك بوو لەبەرامبەر بزوتنەوەی ئاوەزگەریو ڕۆشنگەری، کە گاڵتەیان بە سۆز دەکرد لە مرۆڤدا، ئەم کتێبەی ڕسۆ بوو بە بەردی بناغە لە بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی دا.

## ململانێ لە نێوان ڕۆسۆو ڤۆڵتێر:

فەیلەسوفەکان کۆمەڵێکی یەکگرتوو بوون ، ڤۆڵتێر یەکێ بوو لەوان و سەرسام بوو بە ڕۆسۆ، وەلێ لە کۆتاییدا ئەم دووانە تێکگیران. ڕۆسۆ باوەڕی وابوو کە مرۆڤ بە سروشت چاکە.

ڤۆڵتێر خۆی دەپاراست لە گوتووێژکردن لە بارەی ڕەوشتو ئاکار، کە لە فەلسەفەی نیوتنو لۆك بوونی نەبوو. بەلام فەلسەفەی سروشتی وەها نەبوو، بەڵکو

بەگوێرەی ئەو بونەوەر چاکەو خراپەی تێدایە، وە مرۆڤ لە توانایدا هەیە جیاوازی بکات لە نێوان ڕەواو ناڕەوا، ڕەوشتیو بیٚ ڕەوشتی، لەمەشدا هیچ پێویستی بە دەست تێوەردانی ئاسمان نی یە. تێکگیرانی نێوان ئەم دوو کەڵە پیاوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕوداوێکی ئاسایی. ئەمەش لەساڵی 1755 دا ڕویدا، کاتێک زەمین لەرزەو لافاو بەشێکی زۆری شاری لیشبۆنەی وێرانکرد، ڤۆڵتێر لە هەمبەر ئەم ڕووداوە گوتارێکی نوسیو تێیدا گومانی لە سۆزو بەزەیی خودا دەربڕی بوو، کاتێك سۆزو بەزەیی خودا ڕێگە دەدا بەکارەساتێکی هاوشێوەی لیشبۆنە بەمەش ڕۆسۆ نیگەران بوو، وە ڕەخنەی توندی لە ڤۆڵتێر گرت لەسەر ئەو کوفرەی کە ڕاشکاوانە دەری بڕی بوو، وە لەو گومانەی کە لە خوداو بەزەیی خودا نواندبووی[1]. هەروەك لۆمەی ڤۆڵتێری کرد لە

---

1 ئەگەر بێتو سەرنجێکی ئەو کارەساتو ڕووداوە جەرگ بڕانە بدەین کە بە درێژایی مێژوو لێرەولەوێ دووچاری کۆمەڵگەی مرۆیی بووە، سەرسام دەبینو دەپرسین: چۆن خودا بەم شێوەیە بە بەزەییەو ئەم کارەساتانەش سازدەکاتو سەدان هەزار مرۆڤ دەکاتە قوربانی؟! لەبەرامبەر ئەم پرسیارەدا سەعید نەورەسی لە سەرجەمی پەیامەکانی نوور لە بەرگی دووەم " مەکتوبات" لا 70 دەڵێت: وەك چۆن خودا سیفەتی "الرحمن، الرحیم" بە بەزەیی، بەخشندەی هەیەو بەردەوام ئەم دوو سیفەتەی لە بوونەوەردا دەدرەوشێتەوەو شوێنەواری بەزەیی خودا لە دروستکراوەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە، بەهەمانشێوە خاوەنی سیفەتەکانی القهار، المنتقیم ـە....هتد. کە پێویستە جاروبار ئەم دوو سیفەتەی خۆی لە ناو بوونەوەرەدا بدرەوشێنێتەوەو ڕادەی هێزو دەسەڵاتو گەورەیی خۆی نیشان بداتو قەدری بەخشندەیی ئەویش بە ئێمە نیشان بدات"قل هو القاهرو فوق عبادی". ئەم دوسیفەتەش ئەم کارەساتو ڕووداوانەی لێدەکەوێتەوە کە ئێمە لەبەرامبەری دەستەوستانین.

جگەلەمە،خۆشمان بەم شێوەیە وڵامی ئەو پرسیارە دەدەینەوەو دەڵێین: خودا پەروەردیگارەو هەموومان دانمان بە پەروەردیگاریەتی "ڕەب" دا هێناوە. پەروەدیگار یان "ڕەب"بە مانای خاوەن دێتو خوداش لەچەندین جێدا ئەمەی دووپات کردۆتەوە کە من خاوەنی بوونەوەرم بە مرۆڤیشەوە. جا مادام ئەم خاوەنو مشورگێڕو بەڕێوەبەرو ڕۆزیدەری دروستکراوەکانی بێت، مافی ئەوەی هەیە بە ویستو مەبەستی خۆی هەر جۆرە بڕیارێك دەربکات لەئاست دروستکراوەکانی بیٚ ئەوەی ڕەخنەی لیٚ بگیریٚ. چونکە خاوەن ماڵ مافی هەرجۆرە بڕیارێکی هەیە لە بەرامبەر ماڵەکەیو لەسەر بڕیارەکەی سەرزەنشت ناکریٚ..... وەرگێڕ.

گوتارێکی تردا کەسەبارەت بە لایەنی ڕەوشتی سەماگەکان نوسی بووی. لەبەرامبەر ئەمەدا ڤۆلتێر لە کتێبی "کاندید" بەرپەرچی دایەوە، کتێبی کاندید چیرۆکی پێکەنین ئامێز بوو، هەروەها نمایشێکی کاریکایتری بوو.

## کاریگەری ڕۆسۆ:-

ڕۆسۆ کاری کردە سەر ژمارەیەکی زۆری خەڵکی، لە هەردوو چینی بەرزو چینی ناوەڕاست. ئیدی گەڕانەوە بۆ سروشت بووە هەستی هەموو لایەك. تەنانەت پیاوانی دەربار ئەمەیان دەوتەوە، "شاژن ماری ئەنتوانێت" یەکێ بوو لەوانە. ڕۆسۆ بووە هاوڕێی فەیلەسوفی ئینگلیزی داڤید هیوم. جگەلەمە جێگەی سەرسامی گەلێ کەس بوو لە بیرمەندان، لەوانە "تۆماس پین". تەنانەت "پیین" بە شێوەیەك پێی سەرسام بوو کە لە کتێبەکەیدا "هەستە ساغەکان" زۆرینەی بیروڕاکانی لەو وەرگرت. هەروەها "هێردەر"و "کانت"ی ئەڵمانی بەهەمانشێوە بە ڕۆسۆ کاریگەر بوون. کاریگەری ڕۆسۆ سنوری بیرمەندانی بڕیو هاتە نێو خەڵکی، بەشێوەیەك هەزاران فەرەنسی "ئازادیو یەکسانیو برایەتیو دیموکراتیو سەروەری گەل یان" کردە دروشمێك. ئەمەش بلیمەتیو چاپوکی ڕۆسۆ دەسەلمێنێ. ئەم کەڵە بیرمەندە وەك فەیلەسوفێکی سیاسی ئەو سەردەم دەیویست سیستەمێکی حکومەتی دابمەزرێنێ، کە ڕاوەستاو بێ لەسەر معریفەی کۆمەڵگەو لە خزمەتی بەرژەوەندی کۆمەڵگە دابێت.

## ئینسکلۆپیدیەکان( موسوعیون ):-

ئینسکلۆپیدیای فەرەنسی بەڕاستی پرۆژیەکی مەزن بوو بۆ نوسینەوەی هەموو ئەو بوارانەی کە زانستو زانیاری پێی گەیشت بوو، هەروەها بۆ بلاوکردنەوەی بیروڕای سیاسی فەیلەسوفەکان. دیدرۆ خاوەنی ئەم پرۆژیەو سەرنوسەری بوو، خۆیشی زۆرینەی گوتارەکانی دەنوسی، بەتایبەت ئەو بابەتانەی پەیوەندیان بە تەنکنۆلۆجیاوە هەبوو. هەروەها "دالمبرت" هەستا بە نوسینی پێشەکی ئینسکلۆپیدیا. دیدرۆ بۆ

خۆپاراستنی لە گرفتو چاودێری پەنای بردە بەر فێڵو خۆپەنادان، کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دوو جار ڕێگری بڵاوکردنەوەیان لێکرد، پاش ئەمە لە ساڵی 1765 مۆڵەتی پێدرا، هەستا لە دوو تویی بیستو یەك بەرگدا بڵاوی کردەوەو دواتر لە سیو پێنج بەرگدا توانی تەواوی بکاتو لە ساڵی 1780 سەرجەمی ئینسکلۆپیدیاکەی بڵاوکردەوە. لەگەڵ ئەم سیو پینج بەرگەدا ژمارەیەك پاشکۆی تایبەت بە نەخشەو پێرستو لەوحەکانی چاپکرد. بەهەمان شێوە لە ساڵی 1771 ئینسکلۆپیدیای بەریتانی لە سێ بەرگدا چاپکرا.

بە هەزاران کەس داوای هاوبەشیان دەکرد لەم ئینسکلۆپیدیایەدا کە زۆرینەیان دەوڵەمەندو خاوەن سامان بوون. ئینسکلۆپیدیا پێداگری دەکرد لەسەر مافە سروشتیەکانو مافی ژیانو ئازادی خاوەنداریەتیو گەڕان بەدوای بەختەوەریدا بەبێ ئەوە جەخت بکاتەوە لەسەر یەکسانی. هەروەها پێداگری دەکرد لەسەر پەیمانی کۆمەلایەتی، ئەو پەیمانەی کە لەنێوان دەسەلاتو گەلدا دەبەسترێ، لەهەمان کاتیشدا پێویستی یاساو سیستەمی بە پێداویستیەکی سەرەکی دادەنا. ئینسکلۆپیدیا گوزارشتی دەکرد لە بیروڕای فەیلەسوفەکانی ڕۆشنگەری ئەوانەی خاوەنی زۆرترین گوتار بوون. ئەمانە داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی پاشایی کۆتکراویان دەکرد، کە تیایدا هەموو ئەو کۆمەلانەی دەبنە خاوەنی دەسەلاتی سیاسی کۆتبکرێن.

ڕێبازی فەیلەسوفەکان تایبەت بوو بە مافی سروشتی دوو لایەن. بەو مانایە لەلایەك بانگەشەیان دەکرد بۆ لەناوبردنی گەندەڵیو خراپەکاریو دەرەبەگایەتیو بەربژاریەکانی چینی ئەرستۆکراتیو کۆتایی هێنان بە کۆیلایەتی زەویو باجی گرانو باجە دەرەبەگیەکانو بێگاریو ...هتد، لەلایەکی تریشەوە داوای دامەزراندنی سیستەمی ئابووری کۆمەڵکاری دادوەرانەو لەناو بردنی پاوانکاری خانەدانانیان دەکرد، کەدەمێك بوو پۆستەکانی سوپاو شوێنە مەدەنیەکانیان بۆخۆیان قۆرخ کرد بوو.

فەیلەسـوفان بەمانـە دامـەزراوەکانیان چـاك دەکـردو دەسـەڵاتو بەربـژاری چـینی ناوەڕاستیان زیاد دەکردو کاریگەری ئەم چینەیان بەهێزتر دەکرد.

## هۆیلباخ:

لە نێو ئەوانەی کە لە ئینسکلۆپیدیادا بەشداریان دەکردو نوسینیان تیایدا هـەبوو، هۆیلباخی ئەڵمانی بـوو (1723-1789). هۆیلبـاخ خـەڵکی هـەرێمی پلانتینـات بـوو. دوای ئەوەی هاتە پاریسو بەهۆی ئەو سەروەتو سامانەی کە هـەیبوو تـوانی دەرگـای ماڵەکەی ئاوەلا بکات لەبەردەم فەیلەسوفانو ڕۆشنگەرانی وەك دیدرۆ دالمبرت، ترگـۆ، بـافۆنو داڤیـت هیـومی ئینگلیـزی. هۆیلبـاخ بیروبـاوەڕی خـۆی لـەو گوتارانـەدا ڕوون کردەوە کە لە ئینسکلۆپیدیادا نوسیبووی. لە گوتارەکانیدا دژایـەتی هـەموو ئاینـەکانی دەکـردو نکـوڵی لـە هـەبوونی گیـان دەکـرد. نوسـینە گـومڕا ئامێزەکـانی بوونـە هـۆی نیگەرانیو پەستکردنی ژمارەیـەکی زۆی خـەڵك تەنانـەت بـاوەڕدارانی ئـاینی سروشـتی وەك ڤۆلتێرو کۆمەڵەکەی لێی قەڵس بوون.

## بلاگستۆن:-

لە ئینگلتـەڕا ژمارەیـەك لەمافناسـانو کەسـانی یاسـایی کاریگـەر بـە "مۆنتـسکیۆ" سەریانهەڵدا. "سێرولیەم بلاکستۆن"(1723- 1780)، یەکێ بوو لەوانـە. بلاکستۆن مامۆستای یاسابوو لەزانکۆی ئۆکسفۆردو هەستا بەتوێژینەوە کردن لەسـەر سیستەمی یاسایی لەئینگلتەڕا. لەساڵی(1765) کتێبەکەی بلاوکردەوە لەژێرناوی"لێدوانێك" کـە نمونەیـەکی کلاسـیکی ئـەدەبی بـوو بـۆ توێژینـەوە کـردن لەیاسـای ئینگلیـزیو تێیـدا ئـەوەڕوون کردبوویـەوە کـە یاسـای ئینگلیـزی کۆکـە لەگـەڵ یاسـای کێـشندەوە هەریاسایەکی تری سروشت.

**بیکاریـــا:ـ**

سـیزار بونـسیا ناسـراو بـە بیکاریـا(1738– 1794)، یـەکێکیتر بـوو لـە کەسـە یاسایەکان. بیکاریا خانەدانێکی ئیتاڵی بوو، جگە لەمە مامۆستای یاسای بوو لەزانکۆی میلانۆ. ئەو کاتێ ناوبانگی پەیدا کرد کە کتێبەکەی بڵاوکردەوە سەبارەت بە "تـاوانو سزا"، ئەم کتێبەی وەرگێڕدرایە سەر چەندین زمانی جۆراوجۆر.

بیکاریا لەم کتێبەیدا پاڵنەرەکانی تـاوانو بنـەماکانی سـزادانی ڕوون کردبوویـەوەو داوای دەکـرد ڕەوشـی زیندانیـەکان چـاکبکرێو ئەشـکەنجەو سـێ دارەو دەسـتگرتن بەسـەر سـەروەت وسـامان نەهێڵـدرێو بـە مامەڵەیـەکی مرۆییانـە مامەڵـە لەگـەڵ زیندانیەکان بکرێ.

**ڕەخنەگرتن لەتیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی:ـ**

لەسەدەی هەژدەدا تیۆری پـەیمانی کۆمەڵایـەتی کەوتـە بـەر ڕەخنـەی ڕۆشـنبیران، بەوەی کە پەیمانی کۆمەڵایەتی لەدەرەوەی مێژوودایە، چونکە مێژوو هیچ شتێکی لـەم شێوەیەی لەخۆدا هەڵنەگرتوەو هیچ کاتێك ڕووی نەداوەو مێژوو باسی پەیمانێکی وەها ناکات کە لە نێوان دەسەڵاتدارو ژێردەسـتەکانی دا بەسـترابێت بەمەبەسـتی پێکهێنـانی دەوڵەت. تەنانەت ئەگـەر گریمانـەی هـەبوونی پـەیمانێکی لـەم شـێوەشمان کـرد، ئـەوا جیلی داهاتوو هیچ پەیوەندیەکی بەم پەیمانەوە نییە. لەم لاشەوە لایـەنگرانی پـەیمانی کۆمەڵایـەتی وڵامـی ئـەم ڕەخنـەیان دەدایـەوەو دەیـانگووت: "مەبەسـت لـەم تیـۆرە ڕووداوێکی مێژووی نی یە کـە ڕووی دابێـت، بـەڵکو یاسـایەکی لۆژیکیـە بـۆ پێکهێنـانی کۆمەڵگەیەکی سیاسی. "دیڤید هیـوم" یـەکێ بـوو لـەو کەسـانەی کـە هێرشـی تونـدی دەکردە سەر ئەم تیـۆرەو دەیگـووت: "ئەمـە ئەفـسانەو پروپـوچیە لەمێـژووداو ورێنـە کردنێکە لە لۆژیکدا، ئاوەزی مرۆڤی سەرەتایی زۆر کەمتر بووە لەوەی پەی بە پەیمانی کۆمەڵایەتی بەرێ. لەڕاستیدا ئەوە دابو نەریت بووە وایکردوە مـرۆڤ دەوڵـەت پەسـەند بکـات. خـەڵکی هـەر لـەو کاتـەوەی منـداڵ بـوون ڕاهـاتبوون لەسـەر ئـەوەی خۆیـان

بەملکەچی ببینن لەبەرامبەر دەوڵەت، وەهیچ کات گرنگیان نەدەدا بە زانینی چۆنیەتی دروستبوونی دەوڵەتو گەشەکردنی. مرۆڤیش لەدوای دروست بوونی دەوڵەت خاوەنی ئازادی تەواو نەبوو تاوەکو دەستبەرداری بێت چونکە خاوەنی هێز نەبوو". هەر لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێ:"لەڕاستیدا دەوڵەت لەسەر بنەمای سودو کەڵك دادەمەزرێ، وە هەر ئەم سودو کەڵکە هۆی خڕبوونەوەی مرۆڤە لەشوێنێك، نەوەك بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەك. کاتێکیش مرۆڤ بەبنەڕەت خۆپەرست وخۆویستە ئیدی پێویستی بە دەسەلاتێك دەبێت بۆ ئەوەی ئارامی بچەسپێنێو دوژمنکاریو ناتەبایی یەکتر قەدەغەبکات". هەرچەندە ئەوەی لەم بارەیەوە وترابێ ڕاستن، بەلام پەیمانی کۆمەلایەتیو مافی سروشتی گرنگی زۆریان هەبوو لە بلاوکردنەوەی چەمکی ئازادیو دیموکراتیو مافی مرۆڤو بەدیهێنانی دەسەلاتێکی دادگەرانە کە هێزەکەی لەگەلەوە بێت. هەروەها پەیمانی کۆمەلایەتی داواکاریەکانی خەلکی ڕاستو تەواو لەقەلەم دەدا، بەوەی کەخەلکی مافی ئەوەیان هەیە حکومەتی خۆیان دامەزرێنن، ئەوانەشی دەسەلاتدارن خۆیان دیاریان بکەنو دەسەلاتەکان لەیەکتری جیابکەنەوە.

## ئابووریی ئاوەزگەرەکان :-

پێشکەوتنی ئابووریو بازرگانیو کشتوکاڵی کاریگەری بەهێزی هەبوو لەسەر ئابووری. ئیدی هەندێ لە ڕۆشنگەران دەستیانکرد بەڕاڤە کردنی دیاردە ئابوریەکان بە ڕاڤەیەکی ئاوەزگەری. لە ڕاستیدا ئەو تێڕوانینو تیۆرانەی کە لە سەدەی شازدەوە سەریانهەلدابوو تا ئەو کاتەش باوبوون، ئەمەش تیۆری بانگەشەکارانی مەزهەبی بازرگانی بوو. ئەم مەزهەبە هەمان ئەو سیاسەتە ئابووریە بوو کە ئیسپانیاو پرتوگالو هۆلنداو فەرەنسای سەردەمی ریشیلیۆو کۆلبیێر گرتبوویانە بەر، وەبەشێوەیەکی گشتگیرو تەواو تیۆری بازرگانی وپاراستنی بازرگانیان پیادەکرد. بەهەمانشێوە ئینگلتەرالەسەردەمی کرۆمۆویلو چارلسی دووەم جەختیان لەسەری دەکردەوە ئەمەش بەدارشتنی یاسای کەشتیوانی، کەبەپێی ئەم یاسایە پێویست بوو کالاکان لەسەر کەشتی ئینگلیزی باربکرێن. بەلام لەسەدەی حەڤدە ئابووریە ئاوەزگەرەکان

پێداگریان دەکرد لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەم سیاسەتە ئابووریە. شیاوی باسە "سیرای ئیتاڵی‌و مونشیریتین ی فەڕەنسی‌و تۆماس مۆن ی ئینگلیزی" لەو کەسانە بوون کەداوای هەڵوەشاندنەوەی ئەم سیاسەتەیان دەکرد. تۆماس مۆن هەستا بەڕاڤەکردنی تەرازوی بازرگانی نێوان هاوردەو هەناردە و، ئەوەی خستەڕوو کە لە قازانجی گەل دایە ئەگەر بێت‌و هەناردەی زیاتر بێت لە هاوردە.

### ئامار:-

لەنیوەی سەدەی هەژدە زانستی ئامار سەریهەڵدا. یەکەم کەس کە هەستا بە ئامارکردنێکی ورد، بازرگانی ئینگلیزی جۆن کرانت بوو (1620- 1674). "کرانت" کاتە بۆشەکانی پڕدەکردەوە بە کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی مردن بەهۆکارە جۆراوجۆرەکان. کتێبەکەی لەژێر ناوی "سەرنجەکان" لە ساڵی (1662) بەچاپ گەیاند. پاش ئەمە هەڵبژێردرا بەئەندامی ئەکادیمیای پاشایی. هەروەها "ولیەم پیت" (1623- 1687) هەستا بەڕوپێوکردنێکی سەرتاسەری ئێرلەنداو بەشێکی ئینگلتەڕا. لەکتێبی "گووتارەکان" لەبارەی باجەکان ئەوەی ڕوون کردەوە کە نرخی کەلوپەل حکومەت ڕێکی ناخات بەڵکو ئاستی کارو خەرجی‌و بڕی پێویستی بۆ بەرهەمهێنانی نرخەکەی دیاری دەکات.

### فیزۆکراتەکان:-

لەسەدەی هەژدە نەگونجاوی مەزهەبی بازرگانی لەگەڵ پێشکەوتنی ئابووری دەرکەوت‌و زانیان کە لەگەڵ گەشەسەندنی ئابووریدا ناگونجێ. "ولیەم پین"ی- ئینگلیزی پێشتر ئاماژەی بەوەدابوو. "بیکاریا"ی- ئیتاڵی مامۆستای ئابووی‌و یاسا، هێرشیکردە سەر پارستنی بازرگانی. "بیکاریا" یاساکانی پەیوەندی نێوان گەشەسەندنی دانیشتوان‌و ئاستی گوزەرانی خەڵکی لەکتێبی "تاوان وسزا"دا ڕاڤەکرد، هەروەك "کار"ی بە بنەڕەتی سەرمایەداری دادەنا. لەنێو ڕۆشنگەرانی سەدەی هەژدە

کۆمەڵەیەك لە فەڕەنسا دەرکەوتن کە ناوی خۆیان نا "فیزۆکراتەکان" یاخود "سروشتیەکان"، ئەوانە شوێنکەوتەی دکتۆر "فرانسوا گینا"ی– بوون، کە لە دەرباری لۆیسی پازدەدا پزیشك بوو.

"گینای" سورخواردنی سەرمایەی وەك شێوەی سوڕی خوێن دادەنا. بەگوێرەی ئەمەش سیاسەتی پاراستنی بازرگانی سیاسەتێکی نا تەندروستو زیاندارە. "گینای" زیاد لەپێویست باوەڕی بەخۆی هەبوو، خۆی وەك زانایەکی گەورە دادەنا. ژمارەیەك لە ڕۆشنبیران لەدەوری کۆبوونەوە ناویان لەخۆیانا" فیزۆکراتەکان". گینای ئەوەی لەزەویدا هەبوو لەکانزاو بەهەمی کشتوکاڵی بە سەرچاوەی بنەڕەتی سامانی دادەنا، بە گوێرەی ئەمە کشتوکاڵ سەرچاوەی سەرەکی دهاتە، پیشەسازیو بازرگانیش لەڕوانگەی ئەودا سامان بەدی ناهێنن، بەڵکو یان دەیگوازنەوە یاخود دەیگۆڕن. لەبەرئەوە کۆت کردنی بازرگانیو پیشەسازی ناتەندروستەو دژی بەرژەوەندی ئابووری وڵاتە. لەمەوە پێویستە سیستەمی باج لەفەرەنسا بگۆڕدرێ وبازرگانیو پیشەسازی ئازادبکرێو ئابووری سەربەست بکرێ، هەروەها باج تەنها لەسەر زەوی دابنرێو شێوازی باج سەندن ئاسان بکرێ لەفەڕەنسا. "گینای" کتێبێکی لەژێر ناونیشانی " ئابووری" لەساڵی (1758) بلاوکردەوە. شیاوی باسە سیاسەتوانی بەناوبانگ "ترگۆ" لەنێو ئەو فیزۆکراتانە بوو.

## ئادەم سمیس (1723 -1790):-

"ئادەم سمیس" ئابووری ناسێکی سکۆتلەندیو مامۆستای فەلسەفەی ئەخلاق بوو لە زانکۆی کلاسکۆ. "سمیس" هۆگربوو بە فەلسەفەی ڕۆشنگەریو یاسای سروشتیو مافەسروشتیەکانو کاتێکی زۆری بەسەربرد لە توێژینەوە کردن لەیاسا سروشتیەکان، کە بەگوێرەی ئەم یاسایانە گەل دەتوانێ سامانی خۆی زیادبکات. ئەو ماوەیەك لەفەڕەنسا مایەوەو لەوێدا هاوڕێیەتی فیزۆکراتەکان بەگشتی و"گینای" دەکرد بەتایبەتی، تەنانەت زۆر لە بیروڕاو تێڕوانی ئەوانی وەرگرت. سمیس

لەکتێبەکەیدا"سامانی نەتەوەکان" کە لە ساڵی(1776) چاپی کرد، گوزارشت لە بنەماکانی بازرگانی چینی ناوەڕاست دەکان، ئەو بنەمایانە زیاتر جەخت دەکەنەوە لەسەر پرۆژە تاکە کەسیەکانو کێبڕکێی ئازادو چالاکی بازرگانی. وە ئەوەشی ڕوونکردەوە کە کاروباری ئابووری وەك تەواوی کاروبارەکانی تری مرۆڤ هەمان سیستەمی سروشتی بونەوەر حوکمی بەسەردا دەکات. "سمیس" ئەو بنەمایەی مەزهەبی بازرگانی ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێ:"بەرژەوەندی گەل پێویستی بە باڵادەستی دەسەڵات هەیە بەسەر کاروبارە بازرگانیەکانیدا". لە بەرامبەر ئەوەدا دەڵێ:"باشترین ڕێگە بۆ برەودان بە بەرژەوەندی گەل بریتیە لەپرۆژەی ئازاد، هەروها ئازادی تاکەکەس لە کڕینو فرۆشتنو بەکرێ گرتنو بەکرێ دان بەبێ دەست تێوەردنی حکومەت". هەروەك دەڵێ:"ئەگەرهاتو بوار ڕەخسێندرا بۆ تاکەکەس بۆئەوەی خۆی شوێن بەرژەوەندی خۆی بکەوێ بەگوێرەی بنەماکانی ئاوەزو ڕۆشنگەری، وە بەبێ دەست تێوەردانی دەوڵەتو دروست کردنی لەمپەر لەبەردەمیدا، ئەوا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وبەسروشتی خۆی بەهۆی کێبڕکێی ئازادەوە هاوسەنگی دروست دەبێ لەنێوان خواست وخستنە ڕوودا. بەم ڕێگەیە دەتوانرێ ڕووبەڕوی خستنەڕووی جیهانی ببینەوە بۆ بەرهەمهێنانو دابەشکردنی کاڵاکان بەباشترین شێوە". "سمیس" لە جیاتی بازرگانی وکشتوکاڵ جەختی لەسەر"کار" دەکردەوەو بەتاکەسەرچاوەی سامانی دەدایە قەڵەم، لەبەرئەوە بەپێویستی دەزانی کار دابەشکردن بێتەئارا. هەروەها داوای لە دەوڵەت دەکرد کە قۆرغکاری وکۆت وبەندەکان لەسەر بازرگانی وپیشەسازی لابەرێو بوار برەخسێنێ بۆخاوەن کارو بازرگانان، بەوەی کە خۆیان بە شوێن مومارەسەی کارو بەرژەوەندیە ئابووریەکانیاندا بچن، بەبێ ئەوەی دەوڵەت کۆسپ لەبەردەمیان دروست بکات، چونکە دەستی نەدیتراو برەو بەبەرژەوەندی نەتەوە دەدات.

لە جێگەیەکی تردا "سیمس" دەڵێ: "لە کاروبار بگەڕێ باخۆی ڕێڕەوی خۆی بگرێ". ئەم کتێبەی سیمس بووبە کۆڵەگەی سیاسەتی ئابووری ئینگلیز لەسەدەی نۆزدە. لەڕاستیدا سیمس بەپێچەوانەی فیزۆکراتەکان، لەنوسینەکانیداجەختی

دەکــردەوە لەســەر پەیوەنــدی ئاڵوگۆڕکــاری لــەنێوان زەوی‌و کــارو ســەرمایەدارو هۆکارەکــانی ســەرەڕۆیی‌و ســەرکەوتن لــە بەدەســت هێنــانی ســامان، لەکاتێــدا فیزۆکراتــەکان جــەختیان لەســەر زەوی وزار دەکــردەوە. بیروراکــانی سمــیس وەك بەشێکی گرنگ‌و پڕ بایەخ لە زانستی ئابووری نوێدامایەوە.

## پێشکەوتنی توێژینەوە جوگرافی وزمانەوانی‌و ڕەگەزیەکان:-

سەدەی هەژدە بەردەوامی دان بوو بە ڕۆژگاری دۆزینەوە جوگرافیەکان‌و ناسینی گەلە نەناسروەکان‌و وڵاتە نەدۆزراوەکانی جیهان. "کاپتن کوك" لە ساڵی(1769) توانی ئوستڕالیاو نیوزلەنداو هەندێ دوورگەی تر لە زەریای ئارام بدۆزێتەوە. جگەلەمە هەندێ لە دەریاگەڕانی تر توانیان ناوچە نەزانراوەکان بدۆزنەوەو ئەو گەلانە بناسن کە پێشتر نەناسراوبوون. ئەمجا بابەتگەلێکی زۆریان لەبارەی ئەوان‌و ئەو وڵات‌و ناوچانە نوسی، دواتر بەهۆیەوە توێژینەوەی نوێ لەبارەی زمانەکان‌و نەتەوەو ڕەگەزە مرۆییەکان سەریهەڵدا. هەروەك فەرهەنگی جۆراوجۆر پەیدابوو، وەك فەرهەنگی "جۆنسن" بۆزمانی ئینگلیزی لەساڵی(1755)، فەرهەنگی زمانی فەرەنسی لەساڵی(1694)، ئەمەو جگە لە فەرهەنگی "ئەدیلنك" لەبارەی زمانی ئەڵمانی لەنێوان (1774بۆ 1776).

گرنگی دان بەزمانەکان دەستی پێکرد، لەوانە "سیرولیەم جۆنز" لەزمانی عەرەبی وفارسی، دواتر دەستی بەتوێژینەوە کردن کرد لە "سانسکریتی"و پەیوەندیە زمانەوانیەکانیان بۆدەرکەوت لەنێوان زمانەکانی هیندی وئەورووپی"ئاری". لەم نێوانە پزیشکی ئەڵمانی "بلومین باك" (1752–1840)، کە لە توێژینەوەکردن لە فیسیۆلۆژی "کارئەندام زانی)"و دابەشکاری ڕەگەزە مرۆییەکان لەسەر بنەمای ڕەنگی پێست‌و ڕوخساری مرۆڤ قوڵ بووبوویەوەو توانی پێنج ڕەگەزی مرۆیی لەیەکتر جوێ بکاتەوە، کەبریتین لە: "ڕەگەزی سپی قەوقازی، ڕەگەزی ڕەنگ زەردی مەغۆلی، مالای

گەنم ڕەنگ یان بۆر، زنجی ڕەش ڕووخسار، هینـدی سـوری ئـەمریکی". شـیاوی باسـە ئەم پۆلێن کردنە تاماوەیەکی درێژ بەکارهێندرا.

## بـزوتنەوەی مرۆگـەری:-

ئەم بیروبۆچوونانەی کە لە ڕۆژگاری ئاوەزو ڕۆشنگەری بەربلاّو بوو، لـە ڕووخـساردا وەك بزوتنەوەیـەك خـۆی نیـشاندا کـەناونرا(بزوتنـەوەی مرۆگـەری)، کاتێـك ئـەم بیروبۆچونانە قیەمو ڕێزی مرۆڤیـان لەگـەڵ خۆیـان هەڵدەگرتو ئـارەزووی چـاککردنی ڕەوشی مرۆڤیان دەکرد. فەیلەسـوفانی ڕۆشـنگەری بانگەشـەیان دەکـرد بۆچـاککردنی کۆمەڵگەو دامو دەزگای فەرمانڕەوایی‌و سیستەمی سیاسی لـەژێر ڕۆشـنایی بیروڕاکـانی "لۆك‌و مۆنتسکیۆو ڕۆسۆو بنیسام‌و ئادەم سمیس‌و گینای....هتد"، ئەوانەی کەداوایان دەکرد دەست هەڵگرن لەداگیرگەکان‌و بازرگانی کۆیلـە هەڵبوەشـێننەوەو لەمرۆڤایـەتی بکۆڵنەوەو بارودۆخیان چاك بکەن. چاکسازی کردن لەڕوانگەی ئەم بیرمەندانـە، بریتـی بوو لـەئازادکردنی مـرۆڤ لەسەرشـۆڕی‌و کۆیلـەیی، بەشـێوەیەك هەسـت بکـات کـە ئـەم دروستکراوێکی ڕێزلێگیراوە، هەر ئەمەشە دەبێتە هۆی پێکهێنانی کۆمەڵگەیـەکی بـالاّو بەهۆیـەوە دەتـوانرێ ڕەوشـی ئابووریەکـەی چـاك بکـرێو بـەهاکانی مرۆڤـی تێـدا تـەواوبکرێ. دەگـوترێ:" کـە ئەگـەربێت‌و مـرۆڤ ڕزگـاربوو لـەکۆت‌و بەنـدەکان وپـشتی بـەخۆی بەسـت‌و ئـاوەزی خـۆی خـستەکار، کۆمەڵگەیـەکی تێروتـەواو دروسـتدەکات لەڕووی ئابووری‌و کۆمەلاّیـەتی‌و سیاسـی". لەڕوانگـەی ئەوانـدا پێویـستبوو چاکسازی یاساکان بگرێتەوە، بەتایبەت ئەوەی پەیوەست بـوو بـە سـزا، هـەروەها بەپێویـستیان دەزانی لەگەڵ تاوانبارانـدا بەمامەڵیـەکی مرۆیانـە مامەڵـە بکـەن‌و لـەم میانـەدا داوایـان دەکرد ئەشکەنجەو سێ دارە کۆتایی پێبهێندرێ. هەروەك هـانی حکومەتـەکانیان دەدا گـەلانی خۆیـان ڕۆشـنبیر بکـەن، بەتایبـەت چـینی هـەژارو کـەم دەرامـەت، ئەمـەش بەکردنەوەی قوتابخانەیەکی زۆر کە حکومەت خۆی خەرجی بکێشێ. لەلایـەکی تـرەوە

فەیلەسوفان داوایان دەکرد جەنگە سیاسیو داگیرکاریو ئاینیو ڕەگەزیەکان بوەستێندرێنو لەجێگایاندا ئاشتی سێبەر بەسەر جیهاندابکات.

## جیهانیەتی ڕۆشنگەران:-

"کۆزمۆپولیتانیا" یاخود جیهانیەتی، ئەو پرسە بوو ڕۆشنگەران بانگەشەیان بۆی دەکردو بەشێك بوو لە بزوتنەوەکەیان. ئەمە بریتی بوو لەداخوازی ڕۆشنگەران بۆ ئاشتی وبرایەتی نێوان گشت مرۆڤەکان. کاتێك مرۆڤ زیندەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، ئەم ڕەوشتەی مرۆڤ تەنها تایبەت نییە بەکۆمەڵگەیەکی بچوك، بەڵکو دەتوانرێ بۆ کۆمەڵگەیەکی زۆر گەورەش پیادە بکرێ. کەواتە بەختەوەرکردنی هەموو تاکێك لەتاکەکانی مرۆڤ ئەرکێکی مەزنە لەسەر شانی سەرجەم کۆمەڵگە. چونکە مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتری بران. ڕۆشنگەران داوایان دەکرد نەتەوەگەریەتیو هەرێم گەریەتی کۆتایی بێتو هەموو دەستبگرن بەنیشتیمانیەتی جیهانی(کۆزمۆپولیتانیە). زۆرینەی بیرمەندان سەرەڕای جیاوازی نەتەوەییان خۆیان بەئەوروپی یاخود جیهانی ناوزەد دەکرد، ئەوەتا "تۆماس پین" لەم بارەیەوە دەڵێت:"جیهان نیشتیمانمەو مرۆڤەکان برامن". هەروەها ڕۆسۆ هەرچەندە سویسری بوو بەڵام خۆی بەئەوروپی لەقەڵەم دەدا. ئەمە بیرکردنەوەی هەریەکە لە"ڤۆڵتێرو بنیسامو ئادەم سمیس"یش- بوو. ئەم بلیمەتو کەڵەپیاوانە توانیان کار لە فەرمانڕەوا خۆسەپێنەکان بکەن لەسوك کردنی دەسەڵاتی ڕەهایان.

بیری کۆزمۆپولیتانیە یاخود نیشتیمانیەتی جیهانی ڕێگر نەبوو لەبەردەم باوەڕبوون بەنەتەوایەتی. لە ڕوانگەی بیرمەندان دا نەتەوایەتی یەکیەتیەکی پێوانەییە بۆکۆمەڵگەی مرۆیی دابەشکراو بۆنەتەوە گەورەو بچوکەکان. هەندێکیان لە هەندێکی تریان لە زۆرێك لەشتەکان لەیەکتری جودان، وەلێ هەموویان بەژدارن لە تایبەتمەندیە گشتیەکان. بیری نەتەوایەتی لەکاتێکدا پرسێکی سیاسی بوو، لەکاتێکی تریدا پرسێکی

ڕۆشنبیری بوو، بەڵام بەگشتی بانگەشەی دەکرد بۆ مافی چارەی خۆنوسین‌و مافی تاك لە دامەزراندنی ئەو دەوڵەتەی کە ئارەزووی لێیەتی. لەو سەردەمەدا ئەو بیرو باوەڕە باو بوو کەدەڵێت:" ئەگەر خەڵکی ڕزگاری بوو لەو تەوقانەی کە داب‌و نەریت بەدرێژایی سەدەکان بەسەریدا سەپاندونیەتی، وەتوانی ئەو مافانەش بەدەست بهێنێت کەڕۆشنگەران بانگەشەیان بۆدەکرد، ئەو کاتە دەتوانن هەر هەموویان لەهێمنی‌و ئاسایش بژین‌و برایەتی لەنێوانیان بلاو دەبێتەوە".

ئەوەی جێگای هەڵوێستەکردنە ئەو داوایەی کەئەوان بانگەشەیان بۆدەکرد لەسەر بناغەی مرۆیی بینا کرابوو. کاتێك دەبینین ئەوان بیرمەندو چاکساز بوون‌و چاکەی مرۆیی‌و چاککردنی کۆمەڵگەی مرۆیان گەرەك بوو، هەروەها خۆیان بە دوور دەگرت لە کاری نامرۆڤانەی وەك: چەك‌و کوشتن‌و تۆقاندن‌و گرتن‌و ئەشکەنجە دان. ئەوان ئەمانەیان ناشیرین دەکردو لەپاشماوەی ناشارستانیەت‌و بەربەریەتیان لەقەڵەم دەدا. بەهەمانچەشن لەدژی دیکتاتۆریەت‌و دەسەلاتی تاکەکەسی ڕاوەستان، هەروەك داوای دیموکراسیەتیان دەکرد، وەك باشترین ئامراز بۆ کۆکردنەوەی هەریەکە لە ئازادی تاکەکەس‌و دەسەڵاتی سیاسی‌و خۆدوور گرتن لەکاری توندو تیژی‌و ڕێزگرتن لەبیروڕای یەکتری‌و پاراستنی پلەو پایەی مرۆڤ. ڕۆشنگەران هەبوونی دروستکاری بونەوەریان ڕەت نەدەکردەوە ( تەنها چەند کەسانێکیان نەبێت، ئەمانیش کاریگەریان کەم بوو). ئەمان لەگەڵ ئەوەی کەباوەڕیان هەبوو بە یاساکانی نیوتن لەفیزیاو بیرکاری، بەلام سەرسام بوون لەبەردەم مەزنی‌و گەورەیی پەروەردیگارو واقیان وڕمابوو لەتواناداری ئەو زاتە بەرزە.

## فەلسەفەی ڕۆشنگەری‌و نوسینی مێژوو:-

زانستە سروشتیەکان‌و بیرکاری کاری کردە سەر پێشکەوتنی زانستەکۆمەلأیەتیەکان‌و سیاسەت، بەتایبەت مێژوو کە دادەندرێ بەدایکی زانستەکۆمەلأیەتیەکان وسیاسەت. هەروەك دادەندرێ بەسەرچاوەیەکی ئەساسی بۆ هەڵێنجانی فکرەو حەقیقەتەکان. هەر دوو سەدەی حەڤدەو هەژدە بینەرو شاهێدی

پەرەسەندنی توێژینـەوەی مێـژوو بـوون، کـە پـشتی دەبەسـت بەڕەخنـەو لێکدانـەوە. توێـژەران جـەختیان دەکـردەوە لەسـەر ڕاسـتیو دڵنیـا بەخـشی بەڵگەنامـەکان و، ڕابردوویان بەشێوەیەکی بابەتیانە ڕڤەدەکرد.

جان بودانی فەڕەنسی یەکێ بوو لەو مافناسانەی کـە لـەبواری مێـژوودا تێدەکۆشـا، "بودان" لـە ئـانو سـاتی جـەنگی نێوخۆیـدا داوای پیـادەکردنی گیـانێکی زانستیانەی دەکرد لەنوسینەوەی مێژوودا. لە ڕوانگەی ئەودا لایەنی جوگرافیو ئاووهەوا کاریگـەری هەیە بەسەر داهاتوی گەلان، هەروەك کاریگەری هەستی نەتەوەییو ئـاینیو خـستەڕوو لەسەر توێژەری مێژوو، بەمەش ڕێگەی خۆش کرد لەبەردەم مۆنتـسکیۆ. بـەم شـێوەیە دەبینین جان بودان لەنێو ئەو پێشینانەدابوو کە ڕێگەی توێژینـەوەی مێـژوویان ڕۆشـن کردەوەو بناغەیان بۆی داڕشت. "سکالیرکری" هۆڵنـدیش لـەم ڕووەوە لـەبودان کـەمتر نەبوو، "سکالیرکری" خـاوەنی ئاسـتێکی بـەرزی زانـستو زانیـاری و بیرکردنەوەیـەکی قوڵ بوو، کەڕێگەی زانستی بۆ ڕەخنەیی مێژووی دمەزراند.

## جـان مابیلۆن (1632 - 1707):-

مابلیۆن دادەندرێ بەمەزنترین مێژوونوسو لێکۆڵیار لەسەدەی حەڤدە، کـە زۆربـەی ژیانی لەتوێژینـەوە کـردن لەمـەڕ بەڵگەنامـە مێژوویـەکان بەسـەربردو هەڵسا بـەدانانی بناغـەو بنـچینە بـۆ توێژینـەوە کـردن لەبەڵگەنامـەی مێـژوویی. بەمـەش کۆمەڵەکـەی "ڕەهبانی سەنتماور"ی هاندا بۆ ئەوەی بەڵگەنامە مێژوویەکان کۆبکەنەوەو ڕەخنـەیان لێ بگـرن پـێش ئـەوەی بـڵاوی بکەنـەوە. لەسـاڵی 1733 کۆمەڵـەی سـەنتماور سەرچاوەکانی مێژووی فەرەنسایان چاپ کرد. مابیلۆن وەك ڕەخنەگرو مێژوو نووس لە پێشینەپێشەنگەکانە سەرەڕای هەندێ کەمو کورتی.

هەروەها مێژوونووسی ئیتاڵی موراتوی(1672–1751) هەستا بەهەمان ئەوکارەی مابیلۆن پێی هەستابوو، ئەمەش لەمەڕ مێژووی ئیتاڵیا لەسەدەکانی کۆنو ناوەڕاست .

لەهەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە چەندەها کتێبخانەی گەورە پەیدا بوون‌و کتێبخانە کۆنەکانیش گەورە بوونیان بە خۆیانەوە بینی وەك کتێبخانەی ڤاتیکان‌و ئامبروز لە میلانۆ. هەروەها کتێبخانەی پروسیا کە دامەزرێنراو پاشان فراوان بوو. بەهەمانچەشن کتێبخانەی گشتی فەرەنساو مۆزەخانەی بریتانیا. ئەمەو جگە لە کتێبخانەی بۆدلیان لەزانکۆی ئۆکسفۆرد. هەموو ئەمانە لەم دوو سەدەیەدا گەورەو فراوان بوون.

ڕێگەی ڕەخنەگرتنی تازەش لەئیتالیا بۆ توێژینەوە مێژوویی لەسەردەستی ڤیکۆ سەری هەڵدا.

## کۆندروس:-

"مارکیزدی کوندروس" دادەنرێ بەکۆتا فەیلەسوفی ڕۆشنگەری. کوندروس زۆرێك لەبیروڕاکانی ڤۆڵتێری وەرگرت‌و کەمێکیشی لەڕۆسۆ. ئەو لەژمارەیەك لەگوتارە سیاسیەکانی ئەوەی ڕوونی کردەوە کە بەسەریەکدا کەڵەکەبوونی مەعریفەت لەڕێگەی هەستەوەرەکانەوە دەبێتە هۆی چاککردنی دامەزراوە مرۆییەکان‌و ڕەگەزی مرۆڤ وەك دروستکراوێکی زیندوو.

لە گوتارێکی تردا لەمەڕ کاریگەری شۆڕشی ئەمریکا لەسەر ئەوروپا، ڕۆڵەی گەلەکەی خۆی ئاگادارکردەوە لەسەر سوودەکانی یاسای سروشتی. هەروەك چۆن ئەم یاسایانە لەئەمریکا جێ بەجێ کراوە. کوندروس جەختی دەکردەوە لەسەر چاکسازی سەرتاسەری لە فەرەنسا. وە لە کتێبە بەناوبانگەکەی"خستنەڕووی سەرجەم مێژوو بۆ پێشکەوتنی فکرەی مرۆڤایەتی". ئەوەی ڕوونکردەوە کە شۆڕش خەڵکی دەگوازێتەوە لەقۆناغی ڕابردوو، واتا لەگەشەکردنی مێژووی کە بە شۆڕشی کارتیزی(فەلسەفەی ئاوەزگەری دیکارت) دەستی پێکرد، بەرەو قۆناغێکی تر کە تێیدا مرۆڤایەتی دەگاتە

تێرو تەواوی‌و چڵەپۆپەو لەسەروی هەموو ئەو مەترسیانە دەبێت کەهەڕەشەی لێ دەکەن.

کوندروس باوەڕی وابوو کە مرۆڤ پێشکەوتنی بۆ ڕێکخراوە، ئەمەش دێتەدی بەچاککردنی تایبەتمەندیە ڕەوشتی وهزری‌و تەنانەت بایەلۆجیەکانیش. بەم شێوەیە دەبینین بزرتنەوەی ئاوەزگەری‌و ئەزمونگەری‌و ئەخلاقی کەهەریەکە لەڕۆسۆو ڤۆڵتێرو لۆك گەشەیان پێدا، بەتیۆری "کوندروس" لەبارەی پێشکەوتنی کەماڵی مرۆڤ کۆتایی پێ دەهات.

## پاشماوەی کلاسیکی لەوێژەو هونەر لەسەردەمی ئاوەزو ڕۆشنگەری:ـ

ئەوروپیەکان لەهەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە وەك خۆیان مانەوەو هەر بەردەوام بوون لەدەستگرتن بەبیری کلاسیکیزم کە لە هەردوو سەدەی پێشتر سەریهەڵداو بڵاوبوویەوە. شارستانیەتی یۆنانی‌و ڕۆمانی باڵادەستی‌و ڕێزی خۆی سەپاند بەسەر چینی ڕۆشنبیر.

کلاسیکیزم هەژموونی کرد بەسەر وێژەو هونەرو پەروەردەو فێرکردن لە هەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە، بەشێوەیەك کەچینی ڕۆشنبیر هیچ سودێکیان بەدی نەدەکرد کە لە ڕۆشنبیری بیری سەدەکانی ناوەڕاست بیدورنەوە. سەردەمی "دانتی" بەلایانەوە سەردەمی بەربەریەت بووە. هەروەك شاعیرێکی ئینگلیزی بەناوی "ئۆلیڤەر گولد سیمپس" دەڵێت: هۆکاری ناوبانگی دانتی ناڕۆشنی نوسینەکانی بووە.

هۆکاری بەسوك سەیرکردنی سەدەکانی ناوەڕاست‌و دەستگرتن بەشارستانی کلاسیك، دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری لە ڕۆڵەو وەچەی مرۆگەرانی سەردەمی بوژانەوە بوون، هەربۆیە ئارەزوو مەیلی باب‌و باپیرانیان بەمیرات گرت کە گاڵتەیان بەسەدەکانی ناوەڕاست دەکردو شارستانی کلاسیکیان بەهەند دەگرت. فەیلەسوفان‌و ڕۆشنگەران ڕۆشنبیر دەبوون بە ڕۆشنبیریەکی کلاسیکی‌و زمانی

یۆنانیو لاتینیو وێژەو فەلسەفەی کلاسیکیان دەخوێندو دیراسەیان دەکرد. واژەو دەستەواژەکانی دیموستیسو شیشرۆن لە ووتارو نوسیندا بەکاردەهێنرا ئەمە جگەلە لەبەکارهێنانی شیعرەکانی هۆمیرۆسو فەرجیل.

هونەری هەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە بەردەوامیدان بوو بەهونەری سەردەمی ڕێنسانس. هونەرمەندانی تەلارسازی شوێنی ئاسەوارەکانی هونەرمەندانی سەردەمی ڕێنسانس دەکەوتن، وەك "میخائیل ئەنجلۆ". شێوازی کلاسیکی لە بیناکردنی کۆشكو خویندنگەو زانکۆکاندا بەکاردەهێنرا. ئەم شێوازە کلاسیکیە بەربڵاوەی هەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە بە"باروك" ناسرا.

لەفەرەنسا دا کۆشکی "لۆکسمبرگ" کە بۆ شاژن ماری میدتچی بیناکرا بوو، هەر لەسەر شێوازی کلاسیکی بوو. بەهەمانشێوە کتێبخانەی کاردینالْ مازارین و"ئەکادیمیای فەرەنسی ئەمڕۆ"، ئەنڤالیدی سەردەمی لۆیسی چواردە، شێوازو تەرزی کلاسیك لەخۆیاندابیشان دەدەن. فردریکی گەورەش لە "پوتسدام" لەسەر هەمانچەشن کۆشکێکی بنیاتنا.

لەئینگلتراش "کریستۆڤەر ڕین" 1632-1723 وەك تەلارسازێکی ڕەندو بە ووردەکاری ناوبانگی دەرکردو کلێساى سنت پۆڵی (1668-1715) بیناکرد. هەروەها "ڤان برو" کۆشکی بلیهام ی بۆ دۆق مارلبورو دروستکرد. هەروەك ژمارەیەك کۆشکی تریشی لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدە لەگۆڕەپانی کۆنکۆرد بیناکرد.

وەلە نیگاری زەیتی، "ڕۆبین" 1577-1640 لە بەناو بانگترینیان بوو. ڕۆبین نیگاری هنری چوارەمو هاوسەرەکەی ماری میدتچی کێشا، هەروەها وێنەی جیمسی یەکەمی پادشای ئینگلترای کێشا. هەروەها ڤان دایك (1599-1641) نیگاری جیمسی یەکەمو چارلسی یەکەمی کێشا. ئەمەو جگە لە "ڤلاسکویز" کە خۆ بەدەستەوەدانی شاری "بریدانی" هۆڵەندی وێناکرد، کاتێ لەبەرامبەر ئیسپانیەکان لە

کاتی جەنگی سی ساڵە خۆی بەدەستەوەدا. لە پاڵ کێشانی وێنـەی فلیپی چوارەمی پاشای ئیسپانیا.

لەسەدەی هەژدە کلاسیك لەهونەری هەریەکە لەئینگلتراو فرەنسا ڕەنگی دایەوە. لە ئینگلترا "تۆماس کیسنبور" ناوبانگی پەیداکرد لـە کێشانی وێنـەی ئەرستۆکراتیو ژنـەکانی ئـەم چینە. لەفرەنساش واتـۆ 1683-1721 ناوبانگی دەرکرد. "واتـۆ" وێنەی هەموو شتێکی جوانی نـاو کۆمـەڵی ئەرستۆکراتی دەکێشا. هـەروەها بوستـەر (1703-1770) لەسەر ڕەچەی واتۆ دەڕۆیشتو بـەناوبانگترین نیگارەکـانی نیگـاری مدام بمباردۆر بوو. جگە لە بوشەر هەریەکـە لـە فرانکونـارد (1732-1806)، کرویـز (1725-1805) لەسەر ڕەچەی واتۆ دەڕۆیشتن لە هونەری نیگار کێشاندا.

## وێژە لەسەدەی حەڤدەو هەژدە:-

بیری کلاسیکی لەهەردوو سەدەی حەڤدەو هـەژدە بـاڵی کێشابوو بەسـەر وێـژەدا. نوسین بەزمانی لاتینی دابووی لەکەمیو شێوازی بـاروك ی کلاسـیکیەت بـاڵی کێـشابوو بەسەر وێژەدا. ئەمەش بەکارهێنانی دەستەواژەی جـوانو ڕازاوە کـە داپۆشـرابوون بـە دەستەواژەیەك کە مانای لە خۆ نـەگرتبوو، ئـەم فکرەیـەش لـە هەریەکـە لـە ئسپانیاو ئەڵمانیاو ئیتاڵیا باو بوو. لە باناوبانگترین وێژەوانانو ئەدیبانی ئەڵمانیا لەم سەردەمەدا "مارتن ئۆبتز" بوو 1597-1639، کـە بەشـێوەیەکی تـەواو لاسایی کلاسیکیەکانی وێنەی فرجیلو هۆراسو سـنیکای دەکـردەوە. لـە ئیسپانیاش "کـادیرۆن" (1600-1681) ناوبانگی دەرکرد. شیاوی باسە ئەم ئەدیبـە خـاوەنی (لـۆب دیفکـا)یـە. بـیری تصوفـو نادیاری لە هەستی شاعیرو وێـژەوانانی ئیـسپانی ئـەم سـەردەمە سـەریهەڵدا. بەتایبـەت لـە وێـژەی میللـیو ڕیوایـەت. ئەمـەش لـە شیعرەکانی کـادیرۆن بەتـەواوی دەردەکـەوێ. وێـژەی ئیـسپانی نەگەیـشتە ئـەم جـوانیو سەرنجڕاکێـشیەی کـە "سـیرڤانتس" پێـی گەیـشت. لەملاشـەوە وێـژەی ئیتـاڵی لەسـەدەی حەڤـدە توشـی

ـنشوستی داڕووخـان هـات. کۆمـەڵێك لـە نوسـەرە ئیتاڵیـەکان لەسـاڵی (1690 ) پەیدابوون کەدەیانویست زمانو وێژەی ئیتاڵی لە ووشـەی بریقـەدار پـاك بکەنـەوە. بـۆ ئەمەش هەستان بەدامەزراندنی ئەکادیمیای "ئارکادیا"و دەیانویست لاسایی کلاسیکیە پێشینەکان بکەنەوە لەڕوونی ئاسانیدا، بەڵام شێوازەکەیان زۆرتر عاتیفەو سۆز بوو.

وەلێ فرەنسا وەهانەبوو، بەڵکو بۆڕی هەمووانی دایەوەو وێـژەی فرەنـسی گەیشتە لوتکە. ژمارەیەك وێژەوانی چاپووك پەیدابوو کەنغرۆ ببوون لەنازو نیعمەتو بەخششی لۆیسی چواردە. ئەوانە توانیان لە ئەدەبدا بەرهـەمێك بـدەن، کـە مەگـەر بلیمەتـەکانی مێژوو ئەم بەرهەمەیان دابێ، ئەگینا ئەوانەی هاوچەرخیان نەیانتوانی شان لـە شـانیان بدەن. بەناوبانگترینیان "مـولێر" 1622-1673 بـوو، کەئـەدەبی شـانۆیی‌و شـانۆی فەرەنـسی دانـا. مـۆلێر بەبلیمـەت تـرین شـاعیری فرەنـسی دادەنرێـت کـە فەرەنـسا بینیبێتی‌و بوو بە ئەستێرەیەکی درەوشاوە بەسەر ئاسمانی پاریس‌و کۆشکی ڤێرسای. ئەمەو جگە لە لە"کورنیلی" 1607-1684،ڕاسین 1639-1699، مـادام سـافینی (1626-1696)، نوسـەری داسـتان‌و کۆمیـدیاو هـەزەلی لاڤـونتین 1621-1695. ئەمانە بالآدەستبوون‌و سێبەریان کـرد بەسـەر خەڵکیـداو سـۆزی خـەڵکیان ڕادەکێشا، هەروەك چۆن سوپای لۆیسی چواردە بالآدەست بوو بەسەر مـوڵکی خـەڵکی. بەرهـەمی ئەدەبی ئەمانە بوو بە سامان‌و موڵکێك بۆ ئەورووپاو جیهـان. هـەروەك زمـانی فرەنـسی بووبە زمانی ئەدەبی لە ئەوروپا. ئینـگلترا لـەم ڕووەوە کـەمتر نـەبوو لەفرەنـسا. جـۆن ملتن (1608-1674) وەك شاعیرێك سەریهەڵداو لەدوای شکسپیرەوە دەهـات. ملـتن نوسـەری داسـتانی "فیردەوسـی وونبـوو"، شـعرەکانی زۆر سـەرنجڕاکێش بـوون. نوسینەکانی لەبارەی ئەدەبو بیری سیاسی بەشێوەیەکە کەم کـەس دەتـوانێ لاسـایی بکاتەوە. هەروەها نوسەرو شاعیر درایدن 1631-1700 توانی "بلوتاخ" بەجوانترین شێوە وەرگێڕێ، لەم لاشەوە ئەلیکسەندەر پـوپ 1688-1744، لەلوتکـەی شـعری ئینگلیزی دابوو لەسەدەی هەژدە لە ڕووی پاراوی‌و نەرمی‌و توانای گاڵتەکاری.

سەدەی هەژدە دادەندرێ بەسەردەمی پەخشان، نەوەك شیعر. بەهۆی ئەوەی ئەدیبان کاریگەر بوون بەزانستە سروشتیەکانو فەلسەفەی ئاوەزگەریو ڕۆشنگەری. ئەدیبان هەستیان کرد کە بەپەخشان چاکتر دەتوانن گوزارشت بکەن لەبیروڕاو باوەڕو تێڕوانینەکانیان، وە باشتر دەتوانن رەخنە لەدامو دەزگا داسەپاوەکان بگرن. بەلاّم کاریگەری کلاسیکی بەسەر نوسینەکانیان زۆر بە ڕوونی دیارە. یان وەك هەندێ نوسەر دەڵێن:شێوازەکانیان ڕازاوەو نەرمو ڕێك بوو کەبە ئاسانیو بەڕەوانی ڕێك دەخرا وبەهەندێ دەستەواژەی کلاسیکی ڕازابوویەوە.

لەنێو نوسەرە دیارەکانی ئینگلترا کەسەرجەم شێوە ئەدەبیاتانە بوون، جۆن لۆك ی نوسەرو فەیلەسوفی سیاسی، ئیدوارد گیبن ی مێژوو نووسو داڤید هیوم ی فەیلەسوفو مێژوو نووس ساموئیل جۆنز دانەری فەرهەنگی زمانی ئینگلیزیو بلاکستۆنو ئەدمۆند برك بولینبروك بوون. لەفرەنسا ژمارەیەکی زۆر لەکتێبو نوسینەکانی فەیلەسوفو وێژەزانانی هەبوو، فەیلەسوفو وێژەزانانی وەك ڤۆڵتێرو ڕۆسۆو دیدرۆو هۆیلباخ وڕینالّ، زۆربەی ئەوانە لەسەر لایەنی سیاسیو کۆمەلاّیەتیو فەلسەفەیان دەنووسی، وەهەندێ جاریش چیرۆكو داستانیان دەنووسی. ڤۆڵتێر کەیەکێ بوو لە فەیلەسوفە دیارو بەرچاوەکانی فرەنسا فەرهەنگی فەلسەفیو نامە ئینگلیزیەکانو مێژووی لۆیسی چواردەو مێژووی شارستانیەتیو مێژوویی چارلسی دوانزە پاشای سویدی نوسی، ئەمەو سەرەڕای نوسینی چیرۆکی (کاندید)پێکەنین ئامێز(کۆمیدی)، چیرۆکی زدیگ. هەروەها ڕۆسۆ ژمارەیەك کتێبی نووسی، وەك: پەیمانی کۆمەلاّیەتی، ئیمیڵ لەبواری سیاسەتو پەروەردەو فێرکردن، دان پێدانانەکانو چیرۆکی هلیوز.

کلاسیکیەت لە ئەڵمانیاش بەرەو بەرزبوونەوەو دەرکەوتن ڕۆیشت ئەمەش لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدە لیسسنگ لەم کاتەدا(1729–1782 ) بەناوبانگترین وێژەوانانی ئەڵمانیا بوو. لیسنیگ دووپاتی دەکردەوەو بەپێویستی دەزانی کەگەلی

ئەڵمانی بەزمانی خۆیان بنوسن‌و شێوازی خۆیان ڕاستەوخۆ لە کلاسیکیەوە هەڵێنجن، شێوەو شێوازی لیسنگ کلاسیکی تەواو بوو. لیسنگ ڕەخنەگرێکی مەزن بوو، ڕەخنەکانی نەك هەرتەنها لایەنی ئەدەبی گرتەوە، بەڵکو بواری فکری‌و ڕەوشتی یشی گرتەوە. ئەم ڕەخنەگرتنە نزیك بوو لەئەرستۆ، وە شێوازو ڕەخنەی ئەرستۆی لە نوسینەکانی پیادەکرد.

## بەردەوامی کاریگەری کلاسیك لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسی:-

کلاسیزم لە فرەنسادا مایەوەو کایگەر نەبوو بە شۆڕشی فرەنسی‌و ناپلیۆن. شۆڕشگێرە فەرەنسیەکان ڕۆشنبیر بوون بە ڕۆشنبیریەکی کلاسیکی‌و لەژێرکاریگەری ئەم کلاسیکەدامانەوە، ئەوان باوەڕیان وابوو کەنوێنەرایەتی گەورەیی‌و مەزنی شارستانی یۆنانی‌و ڕۆمانی کۆن دەکەن. ئەو هونەرەی کەلە سەردەمی ئەواندا گەشانەوەی بەخۆیەوە بینی هونەری کلاسیکی کۆن بوو، لەڕووی ئاسانی‌و ڕوونیەوە. کاتێکیش ناپلیۆن کاریگەر بوو بەهونەری کلاسیکی کۆن، زۆر لەو شتانەشی خستەسەر کەلە میسر بینی بووی(هەرەمەکانی میسر)، لەئەنجامی ئەوەدا هونەری تەلارسازی داتاشین‌و وێنەو نیگاری زەیتی‌و نەخشەسازی(زەخرەفە)بووبە شێوازو تەرزی کلاسیکی کۆنی ئاسان لەپاڵ هەندێ کاریگەری میسرکۆن بەسەریدا. پانسبۆن لەپاریس‌و گۆڕەپانی کۆنکۆرد بورجی میسری کۆنی لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکە. نمونەیەکن بۆئەم بەرهەمە کلاسیکیە کەلە دوای ناپلیۆن سەریهەڵدا.

## تەلارسازی:-

"فۆنتین" "1762–1853" دادەنرێ بە بەناوبانگترین هونەرمەندی سەردەمی شۆڕش‌و ناپلیۆن. فۆنتین لە ڕۆما خوێندی‌و لە ڕۆژگارەکانی شۆڕشی فەرەنسیدا لەئینگلترا نیشتەجێ بوو. کاتێکیش لەسەردەمی ناپلیۆن گەڕایەوە فرەنسا تەلاری "مالمیزون"ی بنیاتنا، کە بە هۆیەوە ناوبانگی پەیدابوو. هەروەك تاقی "کرۆسیل"ی-

دروستکرد. فۆنتێن بووبە تەلارسازی یەکەم لەساڵی 1813، ئەم ناوەی هەر بەردەوام بوو تا سەردەمی پاشاکانی بنەماڵەی بۆربۆن.

## داتاشینی کلاسیکی1 :

"هودن" (1740-1828) بەناوبانگترین پەیکەرتاشی سەردەم بوو، کە لەسەر شێوازی کلاسیکی کۆن کاری داتاشینی دەکرد. پەیکەری "کاترینای دووەم"ی- قەیصەرەی ڕووسیای لە مەرمەڕ داتاشی. هەورەها پەیکەری هەریەکە لە "دیدرۆ، دالمبرت، بافۆن، ڤۆلتێر، ڕۆسۆ"ی- داتاشی. لە کاتی چوونی بۆ ئەمریکا لەساڵی 1780، پەیکەری جۆرج واشنتنو تۆماس جیفرسۆن ی داتاشی. هەروەها نیوە پەیکەری هەریەکە لە"ناپلیۆنو جۆزفینو مارشاڵ نای" سازکرد.

## نیگار کێشانی کلاسیکی:-

بەناوبانگترین ئەوانەی کە لە وێنەو نیگارکێشانی زەیتی، بوون بەئەستێرە، "دیڤید" (1748-1825)بوو. "دیڤید" کاریگەر بوو بەگیانی کلاسیکی کۆنو هەستا بەکێشانی وێنەی "بتروس"ی بکوژی "یۆلیۆس قیصر" بە وێنەیەکی زۆرجوانو قەشەنگ لە ساڵی 1789. هەروەها نیگاری بەڵێندانی یاریگاری تێنسی کێشا، ئەمەو جگەلە کێشانی نیگاری پەنهانکوژکرانی "مارا" لەگەرماو لەلایەن "شارلوت". دیڤید لەگەڵ کوشتنی لۆیسی شازدە دابوو . لەسەردەمی ناپلیۆنیش وێنەی تاج لەسەرنانی دوایەمین ئیمپراتۆرو زۆرینەی جەنگەکانی ئەم ئیمپراتۆرەی کێشا.

لەدەرەوەی فەرەنساش "کانوڤان"ی- ئیتاڵی بەناوبانگ بوو، کە لە بواری داتاشین ناوبانگی دەرکرد، بەتایبەت لە پەیکەری ناپلیۆنو براو خوشکەکانی. بەهەمانشێوە

---

1داتاشین بەمانای هەڵکۆڵین دێت، کە لەسەر دیوارو لاپاڵ پەیکەریان داتاشی، واتا هەڵکۆڵینیان تێدا دەکرد وێنەیان لەسەر دەنەخشاند.(وەرگێڕ)

"سور والدسن"ی- دانیمارکی ناوبانگی پەیداکرد. "والدسن" لە داتاشینی پەیکەری کلاسیکی ناوبانگی پەیداکردو گۆڕی پاپا "پیۆسی حەوتەم"ی- لە ڤاتیکان داتاشی. کاتێك گەڕایەوە دانیمارك پەیکەری "قدیسانی" وێناکرد. بەناوبانگترین دەستکەوتەکانی "شێری لۆسرینە" کەپێشکەشی حکومەتی سویسڕای کرد، وەك یادەوەریەك بۆ لەناوچوونی پاسەوانە سویسڕیەکان، کاتێ بەرگریان دەکرد لەلۆیسی شازدەو ماری ئەنتوانێت.

لە ئینگلتراش تۆماس لۆریس(1769-1830) بەردەوام بوو لەسەر ڕەچەی مامۆستاکەی"ڕینۆڵد"، ئەمەش لە وێنەکێشاندا لەسەر شێوازی کلاسیکی. "لۆریس" وێنەی سەرکردەکانی چینی ئەرستۆکراتی ئینگلیزی کێشاو شا"جۆرجی سێ یەم" نازناوی "ئەسپ"ی- پێ بەخشی. لە کیشوەری ئەوروپاشدا هەستا بەکێشانی وێنەی نوێنەرانی دەوڵەتانی ئەندام لە کۆنگرەی ڤێنا. لە فەرەنساو کیشوەری ئەوروپاش شێوازی کلاسیکی لەهونەرو بەردەوام بوو تەنانەت لەدوای شۆڕشو سەردەمی ناپلیۆنیش بەردەوامی بەخۆی دا. ئەمە بەڕوونی لەو پەیکەرە داتاشراوانەی کە لەو کاتەدا لە ئینگلترا بۆ پاڵەوانانی جەنگەکانی ناپلیۆن داتاشراون دەردەکەوێ. وەك تاقی "ولنگتن" لە ساڵی(1828)، "نیلسن" لە گۆڕەپانی ترافلگار لەساڵی (1829-1843).

لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش دەتوانین بڵێین کە:

ئەندازیاری فەرەنسی "لێنفنت" داڕێژەری نەخشەی پایتەختی ئەمریکا"واشنتن" لەساڵی (1789-1791). هەروەها نەخشەی کۆشکی سپی بارەگای سەرۆکی ئەمریکای کێشا، ئەمەو جگەلە کۆنگرێسی ئەمریکی لەسەر شێوازی کلاسیکی.

سەرەڕای ئەوانە، ئێمە تەرزی کلاسیکی لەپەیکەری ئیمپراتۆر جۆزیفی دووەم ئیپراتۆری نەمسابە جلو بەرگی سەربازییەوە دەبینین. هەروەك لەپەیکەری جۆرج واشنتن هەستی پێ دەکەین کە هونەرمەند "گرینۆ" لەسەر تەرزی کلاسیکی دایتاشیوە، کە تەواو لەیەکێ لە خوداکانی ئیغریقەکۆنەکان دەچێ.

## بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی

لە سێیەکی کۆتـایی سـەدەی هـەژدە بزوتنەوەیـەکی پێچەوانە لەگـەڵ بزرتنـەوەی کلاسیکی سەریهەڵدا، کەناسرا بوو بە بزوتنەوەی ڕۆمـانتیکی "ڕۆمـانسی". بیروڕاکـانی ڕۆمانتیکیزم لە وێژەو هونەرو شـێوازی ژیـانی ڕۆژگـاری ڕۆشـنگەری پێگـەیی. تـەوژمی ڕۆمانتیکی لەژێر باڵی فەلسەفەو ئاوەزگەری بەشێوەیەکی شـاراوە دەڕۆی، وەلێ دواتـر بەڕوویدا تەقیەوەو لەژێر باڵادەستی هاتەدەر. لـە کاتێکدا شـوێنکەوتوانی فەلـسەفەی ئاوەزگـەری داوای ئـازادکردنی ئـاوەزو ژیریـان دەکـرد لـەکۆتو زنجـیری کـۆن، کەپێـشینەکانیان بەسـەریاندا سـەپاندبوون، ڕۆمانتیکـەکان دەیانویـست خـەیاڵو ئەندێشەو سۆزیان ڕزگاربکەن. لەبەر ئەوە جەختیان دەکردەوە لەسەر سۆزو عاتیفـەو ڕێزدانان بۆ سـەدەکانی ناوەڕاسـت. ئـەوان ئـەم سـەدانەیان بـەڕۆژگاری ڕۆمـانتیکیزمو خۆشەویستیو پاڵەوانیـەتی دەدایـە قەڵـەم. ئـەم بزوتنەوەیـە جـوانیو دڵڕفێنیـان لـە سروشتو کۆسارو دیمەنی سروشتو ژیانی سەرەتایی سادەو سـاکار وێنـا دەکـرد، کـە دێهاتیـە سـەرەتاییەکان تێیـدا دەژیـان. لەملاشـەوە گاڵتـەیان دەکـرد بـە ڕۆژگـاری ڕێنـسانسو هـەموو ئەوانەشـی کەبایـەخیان بـەم ڕۆژگـارە دەدا. لەبەرئـەوەی ئەوانـە ڕۆژگاری ڕێنسانسیان بە گەورە دەگرتو سەدەکانی ناوەڕاستیان بەسوك سـەیردەکردو جـەختیان دەکـردەوە لەسـەر کلاسـیك. ڕۆمانتیکـەکان دەیانویـست چاکسازی بکـەن لەکۆمەڵگەی نەریت ئامێز. دواتریش خەباتیان دەکرد لەدژی سیستەمی سیاسیو ڕنجو تەقەلایان بۆچاکسازی کردن بوو تێیدا. "جان جاك ڕۆسۆ" لە هەموو ئەمانـەدا پێـشەوا بووە وڕابەری ڕۆمانتیەکیزمی سیاسی بوو، هەروەك چۆن پێـشەوای ڕۆمـانتیکی وێـژەو هەستو سۆز بوو.

لـەڕووی هەسـتو سـۆزەوە، ڕۆمـانتیکیزم گوزارشـت بـوو لەشۆڕشـی گـەنجان دژی پـیری، هـەروەها کاردانـەوەی بیرمەنـدان بـوو لـە دژی دابو نەریتـە بـەربڵاوەکان، لـە کۆمەڵگەیەکی ڕۆچوو لە شارستانیەتی ئەم کاتـە. لەمـەدا شـێوەیەك لـە گـەرمو گوڕی

هەبوو بۆ "فێردەوسی وون لە مرۆڤی سروشتی". هەرچەندە ئەمانە باوەڕیان بەوە نەبوو کە فێردەوسێك هەبێت، وەلێ ئەوان وێڵی خۆشەویستیو خەیاڵو خەونو ئاواتە دڵبزوێنەکان بوون. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی فەرەنسیو ئەو چەرمەسەریانەی کە لەگەڵ خۆی هێنانی بەسەر خەڵکدا. لەبەرئەوە ئەم خەڵکانە گومانیان هەبوو لەوەی کە مرۆڤ بەسروشت بەلای چاکەوخێردایە. وولاتگریەکانی ناپلیۆن ئەم هەستەی زیاتر بەرەو ڕاستی برد، سەرەڕای بلاوبوونەوەی بنەماکانی شۆڕشی فەرەنسی لەڕێگەی ئەم وولات گیریانەوە.

ڕۆمانتیکی بریتی یە لەدیاردەیەکی دەروونیەو دروستدەبێت لە سۆزێکی هەڵچووی خۆڕاپێچکێنەر لە دەستی کۆتو بەندە داسەپاوەکانو بێ ئومێدیەك کە لە ئەنجامی نەمانی متمانە بە ئاوەزی مرۆییو هەوڵدان بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم نائومێدیەی کەبۆتە هۆی شکست هێنانی مرۆڤەکە. واتا: ئاوێتەیەکە لەنێوان ئەم دوو دۆخە دەروونیەدا سەرهەڵدەدا. لەهەموو ئەمانەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ڕۆمانتیکیەکان خاوەنی مەیلێکی دژیەكو بیرکردنەوەیەکی ناچونیەك بوونو لە گۆڕانێکی بەردەوامدابوون لەم مەیدەئەوە بۆمەبدەئێکی ترو هەرلەشێوەی سۆزو دەرونی دابوون. زۆرینەی ڕۆمانتیکەکان کەسانی بیرمەندی سیاسی واقیعی نەبوون، بەڵکو زۆرینەیان شاعیرو ئەدیبو رەخنەگر و فەیلەسوفی ڕۆمانتیکی بوون. زۆرینەیان نوسەر بوونو سیاسەتیان پیادەنەدەکرد. بەلام لەئەدەبدا بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی وەك ناڕەزاییەك لەبەرامبەر ئەو بنەماو بنچینە ڕەقو بەردینانەی کە کلاسیکەکان دایان ڕشتبوو دەستی پێکردبوو. ڕۆمانتیکەکان حەزیان بە کۆمەڵگەی شارستانی نەدەکرد ولایەنگری هەموو شتێکی نائەقلانیان دەکردو ئومێدی ئەوەیان دەکرد کە ئەو شتانەی حەزیان بۆی هەبوو لەوولاتە دوورە دەستەکانو گەلو نەتەوە سەرەتاییەکان بەدەستی بێنن، ئەم ناوچانەی کە شارستانیەت گەندەڵی نەکردووە. سەدەکانی ناوەڕاست سەرچاوەی لێکۆڵیەنەوەکانیان بوو، بەهۆی ئەوەی ئەم ڕۆژگارە پڕبوو لەداستانی خەیاڵیو شیعرو فۆلکلۆری میللی. سەدەکانی ناوەڕاست لەلای ئەوان سەردەمێکی زێڕین بوو.

ڕۆمانتیکیەت هەم شۆڕش بوو هەم کۆنپارێزی بوو. ئەوان لەلایەکەوە باوەڕیان هەبوو بە سەروەریی گەلو سەروەری پاشاکانو بەرگری کردن لە نەتەوەو برایەتی مرۆیی. لەلایەکی تریشەوە باوەڕیان هەبوو بەئازادی سیاسیو دیموکراتی ئازاد، کە بنەمایەکی ئاوەزگەریەو دەگونجیّ بەهۆی دادگەریو ڕێککەوتن بەدیانبهێنن.

بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی بەپلەی یەکەم کاری کردە سەر هونەرو ویژە. بەلاّم کاریگەری ڕۆمانتیکی بەسەر ویژدا زۆر زیاتر بوو، بەتایبەت ویژەی ئینگلیزی. ئەدیبو ویژەوانانی کاریگەر بوون پێی لەکیشوەری ئەوروپا. لەبەرئەوە باسی هەریەکە لەئینگلتراو ئەڵمانیاو فرەنسا دەکەین.

## ئینگلترا:-

بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی لە ئینگلترا بەڕوونی لە شعرو نوسینەکانی ژمارەیەك لە ئەدیبەکان سەریهەڵدا. ئەو ئەدیبانەی کەسروشتیان خۆش دەویستو گوزارشتیان لە جوانیەکەی دەکرد. شاعیری وەك: "توماس گریو جیمس توسن و، توماس پیرس"و کۆمەڵەیەك لە شاعیرانی ناسراو بە "ئۆسیان". بزوتنەوەیەکی ئەدەبی سەریهەڵدا کە هزروبیرو سۆزی لە مرۆڤی سادەو جوتیاری ئاسایی و سروشتی جوانو جوامێری وەردەگرت. ئەو جوامێریەی کەمرۆڤی سەرەتایی لێی بەهرەمەند بوو. هەموو ئەمانەش لە شیعرەکانی "توماس گری" هەستی پێدەکریت.

لەکۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە ڕۆمانتیکیەت لە ئینگلتراو تەواوی کیشوەری ئەوروپا بلاّوبوویەوە. "کولیریدج" کە یەکیّ بوو لەشاعیرەکان دەروونی پرجۆشو خرۆشی لە شیعرەکاندا دەردەبڕی. بەهەمانچەشن ولیەم وردسورس بەپیاهەڵدانێکی سۆزدارانە بەسروشت هەڵدەدات، ئەمەشی لە شیعرەکاندا دەردەکەویّ. بەلاّم بەناوبانگترین شاعیرانی ڕۆمانتیکی بریتین لە: "بایرین، شیلی،جۆن کیش". شیعرەکانی "جۆن کیش" ڕۆمانتیکی بوون، سەرەڕای کلاسیکیەکەی

بەتایبەت لەکۆمەڵە شیعرەکەی. جگە لە "جۆن کیش، شیلی" مەزنترین شاعیری ڕۆمانتیکی ئینگلیز بوو، شیعرەکانی شۆڕش ئاسابوون‌و جیادەکرێتەوە بە سترانی سۆزداری لە پێناوی ئازادی دژی یاخی بون‌و ستەمکاری.

ژمارەیەك لە نووسەرە ڕۆمانتیکەکان بەدیارکەوتن، وەك "لترسکوت" کە لە ساڵی (1814) دەستی لە شیعر هەڵگرت‌و دەستیکرد بەنوسینی گێڕانەوە مێژوویەکان‌و چیرۆکی دێرین کە گوزارشتیان دەکرد لە ژیانێکی ئەویندارى‌و سواری سەدەکانی ناوەڕاست. ئەمەش لە چیرۆکەکانی "کۆنتن، دروارد،و ئایڤنهۆ" دەردەکەوێ. هەروەها "جیمس کۆپەر" باس لەسەر کێشە دەریایەکان دەکات، لە نوسینەکانی "پایونیریس‌و پایلۆت".

ئەمەو جگەلە نوسین لەبارەی ژیانی هیندیە سورەکان‌و سەرکێشە ئەمریکیەکان. ئەم کتێبانە ورگێڕدرانە سەر زمانە ئەورووپیەکان‌و بەوپەڕی شەیدایی وخۆشیەوە لەماوەی سەدەی نۆزدەدا دەخوێنددرانەوە.

## ڕۆمانتیکیەتی ئەڵمانی:-

بیری ڕۆمانتیکی لە ئەڵمانیا وەکو شۆڕشێك سەریهەڵدا لە دژی زمانی فەرەنسی لەسەدەی هەژدەدا وە لەدژی کاریگەری کلاسیکی کە قوتابخانەی فەرەنسی نوێنەرایەتی دەکرد. شیاوی باسە زمانی فەرەنسی لە ئەڵمانیا باوبوو، هەربۆیە ڕۆمانتیکیەت بووبە شۆڕش‌و لەدژی وەستا. ڕۆمانتیکەکان ڕوویان کردە ئینگلترا وەك سەرچاوەیەك بۆ ئیلهامیان. ئیدی "شکسپیر و، ملتن" کۆمەڵە شیعری "ئوسیان" موتالآ کرد. "کلوستیك" (1724-1803) هەستا بەڕێکخستنی داستانە شیعر، کە جۆن ملتن لە "فیردەوسی وون بوو" لاسایی کردەوە. هەروەك نوسەری ئەڵمانی "لیسنیگ" کە بەناوبانگ بوو بەبیری کلاسیکی کەوتە ژێرکاریگەری بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی ئینگلیزی. وە لە نوسینەکانی مینافون برنهلم (1767)و ئامیلیا گاتی

(1772) دەرگای خستەسەر پشت لەبەردەم شوێنکەوتوانی بۆ بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی نەتەوەیی ئەڵمانی.

## هێردەر 1744-1803:-

## گۆتە 1749-1832. شیلیر.

هەرچەندە هێردەر پێشەوای ڕاستەقینەی بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی ئەڵمانیە کە کۆمەڵەی شیعری "ئوسیان"ی بەتەواوی لەبەرکرد، وەلێ هێردەر سەرسام بووبە ڕۆسۆ. هێردەر لە خۆیدا سادەژینیو مرۆگەریەتی کۆکردبویەوەو تێکەڵی کردبوو لەگەڵ هەستی خۆشەویستی بۆ فۆلکلۆری میللیو ئەدەبی میللیو دابو نەریتی میللی. هێردەر شعرو گۆرانی فۆلکلۆری میللی کۆنی لە ساڵی 1778 بلاوکردەوەو کاریگەری لەسەر شیلرو گۆتە دروستکرد.

"ژانی ڤێرتر"و هەندێ کتێبی تری گۆتە ڕۆمانتیکیی ساف بوون. گۆتە بەکتێبی "فاوست" گەیشتە لوتکەی ناوبانگ. "فاوست" دادەنرێ بەمەزنترین کتێب لە ئەدەبی خۆرئاوای نوێ.

جگەلە گۆتە، شیلیر بەهەمانشێوە ڕۆمانتیکی بوو، وە لە کتێبی "دز" دا بەتەواوی ڕۆمانتکیەتی خۆی دەرخست بوو. بەلآم ئەمانە هەر بە کلاسیکی دەیاننوسی. بۆ نمونە "گۆتە" کاتی لە ئیتاڵیا مایەوە گەڕایەوە سەر ئیغریقی کۆنو کتێبە کلاسیکیەکەی "ئیخینج ئوف ئورس"ی لەساڵی 1787 بلاوکردەوە. بەهەمانچەشن شیلیر کتێبی "دون کارلوس"ی لەسەر شێوازی کلاسیکی نوسی.

هەروەها هەردوو شاعیری ئەڵمانی (هاین)و (ئولاند) لە بەناوبانگترین شاعیرە ڕۆمانتیکیەکان بوو، لەوانە بوون کە شعری گۆرانیو داستانی میللی یان دادەنا. ئولاند هۆنراوەی نیشتیمانی ئەفسانەی سەدەکانی ناوەڕاستو داستانی میللی سەدە زۆر کۆنەکانی بلاوکردەوە.

**فەرەنسا:-**

"شاتوو بریانی" لە فەرەنسادا کتێبێکی ڕۆمانتیکی لەبارەی باسی سروشتو هیندیە سورەکانی ئەمریکا نوسی. هەروەها (مادام دی ستایل) کچی نیکەری وەزیری دارایی لۆیسی شازدە چەند چیرۆکێکی ڕۆمانتیکی هەست بزوێنی نووسی وەك (دیل مینین)1802، ڕین 1807. ئەم دوو کتێبانە ناوبانگێکی بەرفراوانی لەسەردەمی خۆیدا پەیداکرد. (مادام دی ستایل) ماوەیەکی زۆر لەتەمەنی لەتاراوگە بەسەر برد. ڕۆمانتیکیەت لە فەرسادا بلاوبوەوەو تەنها لەدوای سەردەمی (مەتەرنیخ)دانەبێ. کلاسیکیزم لەئەدەبدا بەشێوەیەکی گشتی بەسەر ئەدەبدا سێبەری دەکرد،(ڤۆڵتێر) کلاسیکیەکەی زۆر کاریگەر بوو لەفەرەنسادا. هەروا ئاسان نەبوو کلاسیکیەتی ڕگو ڕیشەدار لە ئەدەبی فەرەنسی ئەوروپا بگۆڕدرێ. هەرچەندە ڕۆسۆ ئەو کەسە بوو کە بزوتنەوەی ڕۆمانتیکیەتی لە ئەوروپادا بەدی هێنا، وەلێ بزوتنەوەی هزری کلاسیکی تا ماوەیەکی درێژ مایەوە

## مۆسیقای کلاسیکیو ڕۆمانتیکی

## لەهەردوو سەدەی حەڤدەو هەژدە

**ئیتاڵیا:-**

ئیتاڵیا وەکو ناوەندێکی مۆیسقی ئەوروپا لەسەدەی حەڤدەدامایەوەو ناوبانگی دەرکرد بە ئۆپراو مۆسیقای بەکاردەهێنا بە شێوازێکی دراماتیکی هەست بزوێن بەتایبەت لە بواری مەرگەسات(الماسات) لەسەر تەرزی کلاسیکیەت.

بەناوبانگ ترین ژەنیاری مۆسیقای ئۆپرای کلاسیکی تراژیدیا "کلۆدیو مونتیڤیدی" (1568-1643)بوو. کە توانی ئۆپرای ئۆرفیس ئاریانا لە سەدەی حەڤدە لە ڤینیسیا بژەنێو ئەم جۆرە ئاوازە وەباربێنێ. ئیدی بەدوای ئەوە ئۆپرا لەئیتاڵیا

بڵاوبوویەوەو تاوەکو ساڵی 1700 نزیکەی (350) ئۆپرا بەرهەم هات. هەروەها لەهەریەکە لەناپولیو پۆلۆنیاو ڕۆما، ئۆپرا سەریهەڵداو لەکۆتایی سەدەی حەڤدە ئۆپرا لەناپولی پەیدا بوو. "ئیسەندەر سکالاتی" (1659-1725) بەناوبانگترین ژەنیارو دانەری مۆسیقی بوو، کە توانی مۆسیقای جیاجیا بچڕێ، سەرەڕای چەندین مۆسیقای گۆرانیو ئاینی.

## فەرەنساو ئینگلتراو ئەڵمانیا:-

مۆسیقا لەئیتاڵیاوە گوازرایەوە فەرەنساو ئینگلتراو ئەڵمانیا. لولی (1632-1687) کە ژەنیارێکی فلۆرەنسی بوو زوو کۆچی کرد بۆ پاریسو لەوێدا لەگەڵ مۆلێر ڕێککەوت و توانی سۆزو سەرنجی لویسی چواردە ڕابکێشێ. ئەم ئۆپرا کلاسیکەکانو ئەوانی تریشی دەچڕین، بوو بەنمونەیەك لە دەربارەی لویسی چواردەو لاسایی دەکرایەوە. هەروەها هنری پارسیل (1659-1695) لەسەردەمی چارلسی دووەمو جیمسی دووەم لە "ویستمنسر" دا- مۆسیقای دەژەنیو توانی ئۆپرای "دیدۆ ئیناس" دابنێ. هەروەك لەساڵی 1686 سەنتەری ئۆپرای ئینگلیزی دامەزراند.

لەئەڵمانیاش یەکەم کەس کەئۆپرای نوسی یەوە، "جۆرج فردریك هاندل" (1685-1759)بوو. هاندل کۆچی کردە ئیتاڵیاو سێ ساڵ لەوێ مایەوەو بووبە مۆسیقاژەنی بنەماڵەی میدیتچی لە فلۆرەنسا، دواتر گەڕایەوە هانۆڤەری ئەڵمانیا. "هاندل" بۆ شانۆو دەربارەی پادشاییو جیهان، مۆسیقایەکی کلاسیکی نوسی کە لەوپەڕی خۆشی دابوو. ئەم ژەنیارە بەناوبانگە لەساڵی 1795 کۆچی دوایی کردو لەگەڵ گەورەو خاوەن ناوەکان لە"ویستمنسرئەبی"دا- بەخاك سپێردرا.

### باخ:-

"کەمان" لەئیتاڵیا زیاتر بەرەو پێشەوە چوو، لەفەرەنساش پیانۆ زیاتر پەرەی سەند. دوو بنەماڵەی ئیتاڵی "ئاماتی- ستراديڤاری" بەدروستکردنی کەمان لەکۆتایی

سەدەی حەڤدە ناوبانگیان دەرکرد. لە سەرەتای سەدەی هەژدە یەکێ لەمەزنترین ژەنیاری مۆسیقاو ئەرگۆنی لە تەرزی یەکەم سەریهەڵدا. ئەم ژەنیارە مەزنەش "یوهان سیباستیان باخ" (1685–1750) بوو. "باخ" لە خانەوادەیەکی ئەڵمانی مۆسیقاژەن لە دایکبوو. ئەم وەك کەسێکی خاکیو خۆبەکەم زان پێگەییو بوو بە باوکی بیست منداڵ .

"باخ" زۆربەی مۆسیقاو ئاوازەکانی ئاینی بوون، لەبەرئەوە زۆر بەناوبانگ نەبوو لەسەردەمەکەیدا، چونکە خەڵکی ڕۆژگاری ڕۆشنگەری حەزیان بەم جۆرە ئاوازە نەدەکرد، هەربۆیە خەڵکی ڕووی کردە مۆسیقاکانی هاندل. بەلاّم باخ بێ ڕێزو بێ بایەخ نەمایەوە، بەڵکو جیلەکانی دواتر بەبایەخەوە ڕێزی مۆسیقاکانی ئەویان دەگرت.

### هایدن (1732-1809):-

هایدن مۆسیقاژەنێکی کرواتی بوو، لە خزمەتی بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراتی مەجەڕی بوو، کە مۆیسقای بۆ دەژەنین. سەرەڕای هەندێ گەشتکردنی بۆ ئینگلتراو ڤیێننا، کە ماوەیەکی کورتی خایاند، بەلاّم لە ڤیێننا لە دنیا دەرچوو.

"هایدن" جگە لە دانانی سوناتاو کونسێرتو ئۆپرا، سیمفۆنایەکی زۆری لەسەر شێوازی کلاسیکی دانا. بەلاّم لە کۆتاییەکانی ژیانی ڕووی کردە ڕۆمانتیکی لە مۆسیقا.

### موتسارت (1756-1791):-

موتستارت دادەنرێ بەمەزنترین مۆسیقاژەنو دانەری ئاوازی مۆیسقی لەسەدەی هەژدە. ئەو نەك هەرخۆی، تەنانەت خانەوادەکەشی بەمۆسیقا بەناوبانگ بوون. "موتستارت" تەمەنی کورتی خۆی لەخزمەتی مۆسیقادا بردەسەر. ئەو هەر لەتەمەنی هەژدە ساڵی دوو سەد پارچە مۆیسقای دانابوو، کاتێکیش گەیشتە تەمەنی (35)ساڵی (600)جۆر لە ئاوازی مۆسیقی لە سیمفۆنیاو تونسیرتوو سونات‌و کورتین،.....هتد لە ئۆپرای جیهانی داهێنا.

ئاوازەکانی لەوپەڕی خۆشیو جوانی دابوون کە هەستی دەبزواندو دڵانی دەخرۆشاند. لە قوڵایی خەیاڵ دابوو سەرنجی زۆری بۆلای خۆی کێش دەکردو لە هەموویاندا بلیمەتی موستارتی دەگەیاند. تەنانەت مۆسیقای سەدەی حەقدەو هەژدە لە موتستارتدا ڕەنگی دایەوەو لە ئەودا هونەرەکەی گەیشتە لوتکە. بلیمەتی ئەو لەوەدابوو کە ئاوازەکانی تەنها لە ڕبردوودا هەڵنەدێنجا، بەڵکو موتستارت خۆیشی نوێکەرەوەو داهێنەر بوو بۆ داهاتوو. بەم شێوە ژیانی لە خزمەت مۆسیقادا بەسەر برد تا لەنەمساو بەهەژاری کۆچی دوایی کرد.

## بیت هۆڤن (1827-1770):-

لود ڤیك ڤان بیت هۆڤن، یەکێکە لە گەورەترین مۆسیقاژەنانو دانەری ئاوازی مۆسیقی لەمێژوودا. بیت هۆڤن لە خانەوادەیەکی باشوری زەوییە نزمەکان کە بەناوبانگ بوون بە ژەنینی مۆسیقا لە دایك بووە. دواتر کۆچی کرد بۆ ئەڵمانیاو زۆربەی ژیانی خۆی لە ڤیێننادا بەسەر بردو کۆششی خۆی چڕکردەوە بۆ دانانی ئاواز.

"مۆتستارت"ی- مۆسیقاژەن زۆر کاریگەری بەسەرداهەبوو، بەشێوەیەك پێی سەرسام بوو کە بەردەوام بوو لەدانانی ئاوازی کلاسیکی. بەڵام شێوازێکی ڕۆمانتیکی تایبەتی داهێناو بە هونەر تیادا نواندنی شێوازێکی ڕۆمانتیکی تەواوی لێ دەرچوو. سیمفۆنیای پێنجەمی کەلە ساڵی(1806) داهێنا، گوزارشتبوو لە نەتەوایەتی ئەڵمانیا کەتازە ژیلەمۆکەی دادەگیرسا.

سیمفۆنیای حەوتەمی بەبۆنەی کۆتای هاتنی دیکتاتۆریەتی ناپلیۆن بوو لە ساڵی (1814). وە لە ساڵی (1824) سیمفۆنیای نۆیەمی چڕی کەلە لوتکەی مۆسیقاژەنین دابوو. جگەلەمە "بیت هۆڤن" ژمارەیەك لە کونسیرتۆو سوناتاوی داهێنا کە هیچ یەکێك لە مۆسیقاژەنان نەیان دەتوانی شان لەشانی بدەن.

## شوبرت ،ویبرو موندلسن:-

لەگەڵ ئەوەی مۆسیقای ڕۆماتیکی بەهۆی بیت هۆڤن گەیشتە لوتکەی جوانیو هەست بزوێنی، وەلێ ژمارەیەك ژەنیارانی هاوچەرخی بیت هۆڤن هۆکارێك بوون بۆ بلاْبوونەوەی مۆسیقای ڕۆمانتیکی.

"کارل ماریا ڤون ویبەر" (1786-1826) ئاوازێکی نیشتیمانی داهێنا لەمەڕ جەنگو سەرکەوتن هەروەها ئۆپرایەکی داهێنا بە بۆنەی کەرنەڤاڵی ساڵانەی جەنگی واترلۆ. هەروەك فرانز شوبرت کە خەڵکی شاری ڤیێنا بوو، سەرسام بوو بەشکسپیرو لۆرد باین، ئاوازێکی مۆسیقای دەچڕی کە لە چڵەپۆپەی چێژو جوانیو هەست بزوێنی دا بوو گوزارشتێکی تەواوبوو لە ڕۆمانتیکیەتی بەربلاْوی ئەوسا. بەهەمانشێوە "فلیکس موندلسن" پارچەیەکی ئاوازی داهێنا وەك دەروازەیەك بۆ گێڕانەوەکەی شکسپیرلە "خەوێك لەنیوە شەوی هاوین دا".

بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی وەکو کاردانەیەك لەدژی کلاسیکیەتی بەربلاْوی ئەوروپا سەریهەڵدا. زۆرێك لە بیریارانی فەلسەفەی ئاوەزگەریو ڕۆشنگەری بێ ئومێد بوون بەهۆی بینینی ئەو کارەساتو مەرگەساتانەی کە شۆڕشی فەرەنساو ڕۆژگاری تۆقاندنو جەنگەکانی ناپلیۆن بەسەر خەڵکیاندا هێنا. وایان لێهاتبوو کە باوەڕبوونیان بە پێشکەوتنو ئاوەز لەڕابردوودا شتێکی ، بەڵکو گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە مرۆڤ تەنها بەئاوەز بەڕێوە ناچێ بەڵکو سۆزو عاتیفەش ڕۆڵی گرنگ دەگێڕێ لە هەڵسو کەوتی مرۆڤ دا. ئەمەش ئەو کەمو کورییەبوو کەلە ڕۆژگاری ئاوەزو ڕۆشنگەری پەیدابوو. هەندێ لەبیرمەندان لەشانو شکۆی فەلسەفەی ئاوەزگەری یان کەم کردەوەو ووتیان: ئەو بەرەو پێش چوونە زانستیو هزرییە نەبووە هۆی لەناوبردنی نەزانیو وەنەشبووە هۆی بەدی هێنانی خۆشبەختی مرۆڤ کەدەمێکە چاوەڕێیە، بەڵکو بووە هۆی پەیدابوونی جەنگو توندو تیژیو تۆقاندن، لەبەر ئەوە ڕۆمانتیکەکان زۆر زیاتر لەعەقڵ جەختیان لەسەر سۆز دەکردەوە.

جوانی سروشت و شکۆی شاخ و دۆڵ و چڕی دارستان و خوڕەی ڕووبارو مەندی دەریاکان بوون بە سەرچاوەی ئیلهامیان. هەندێ لەفەیلەسوفانی ئەڵمانی بەتایبەت (فیختە-هێگڵ) کاریگەری گەورەیان هەبوو لەسەر بەهێزکردنی بزوتنەوەی ڕۆمانتیکی، وەکاریان کردە سەر خرۆشاندنی نەتەوایەتی ئەڵمانی و ڕزگارکردنی نیشتیمانی ئەڵمانیا لەدەسەڵاتی ناپلیۆن. تەنانەت هیگڵ جەختی لەسەر گیانی نەتەوەیی و هەژاندنی هەستی نەتەوایەتی ئەڵمانی دەکردەوە. سەرهەڵدانی نەتەوایەتی و بڵاوبوونەوەی ئەم هەستە کاریگەری هەبوو لەسەر بەهێزبوونی ڕۆمانتیکی. شۆڕشی فەرەنسی و جەنگەکانی ناپلیۆن بوونە هۆی بڵاوبوونەوەی بزوتنەوە نەتەوایەتیەکان لە خرۆشاندنی هەستی نەتەوایەتی لە (ئەڵمانیا-ئیسپانیا-فەرەنسا-ئیتاڵیا-سربیا-یۆنان-پۆڵندا-فنلندا-نەرویج) ئیدی بەشان و شکۆی نەتەوەکانیان هەڵدەداو لەتۆمارە مێژووەکانی خۆیان دەگەڕان بۆ زانینی پاڵەوانەکانیان و ئەو ڕۆڵەی کە نەتەوەکانیان گێڕاویانە لەسەر شانۆی مێژوو. بەهۆی ئەوانەوە مێژووی نەتەوەیی سەریهەڵداو کاریگەری دروستکرد لەسەر بڵاوبوونەوەی ڕۆمانتیکی.

# ناوەڕۆك